■ بیرەوەری

# باریکەڕێیەکانی ژیان

## بیرەوەرییەکانی موکەڕەم تاڵەبانی



■ ئامادەکردن و پێشەکی:
د. سیف عدنان القیسی

■ لە عەرەبییەوە:
لوقمان باپیر

# باریکەڕێیەکانی ژیان

## بیرەوەرییەکانی موکەڕەم تاڵەبانی

نووسەر: موکەڕەم تاڵەبانی
ئامادەکردن و پێشەکی: د. سیف عدنان القیسی
لە عەرەبییەوە: لوقمان باپیر
بەرگ و ناوەڕۆک: ئیبراهیم ساڵح
بڵاوکار: ناوەندی ئاشتی
نرخ : ١٢٠٠٠
نۆبەی چاپ: یەکەم
تیراژ: ١٠٠٠
ساڵی چاپ: ٢٠٢٣

ژمارەی سپاردن ٤٧٢ ی ساڵی ٢٠٢٣
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان

# پێڕست

# پێشدەستی

سەربردەی خۆ نووسین، تەنێ بیرۆکەی سیاسییەکان نەبووە، بەڵکو توێژێکی فراوانی ئەدیب و نووسەر و هونەرمەند و خەڵکی دیکەیشی گرتووەتەوە. ڕاستییەکەی، ئەو کتێب و یادداشتنامانەی هەندێ کەسایەتیی سیاسی و ئەدەبیی عێراقی زۆری کەمەندکێش کردووم، ئەوان تیشکیان خستووەتە سەر هەندێ قۆناغی گرنگی ڕێوانی پیشەیی خۆیان، سەرباری ئەوەی ئاماژەیان بۆ هەندێ ڕاستیی پشتی پەردەش کردووە کە نە بەڵگە فەرمییەکان و نە کتێبە مێژووییەکانیش سەروبەریان نەکردووە و، ئەو سەر و سەربردانە وێنەیەکی ڕوونتری ئەو ڕووداوانەی پشت پەردەمان دەدەنێ کە لێکۆڵەران نەیانتوانیوە بگەنە هەندێ ڕاستیی ئەو ڕووداوانە.

لەو سەربردە و یادەوەرییانەی تا ڕادەیەک کارم لەسەر وێناکردنەوەی وێنە سادەکانیان کردووە، ئەو کۆمەڵە دیدارانەن کە لەگەڵ بەڕێز عەزیز محەمەدی سکرتێری پێشتریی حیزبی شیوعیی عێراقیدا کردوومن، کە زۆری خۆ لەوەی دەبوارد بە یادەوەری و یادداشتنامەیان دابنێ و، بەردەوام دووبارەی دەکردەوە: "من کێم، تا یادەوەریم هەبێ" بەڵام من، کە هێشتا قوتابیی دکتۆرابووم، توانیم هەندێ قسەی لێ وەدەنگ بێنم سەبارەت بەو شاراوەیی و نهێنییانەی ئەو، چونکە لە ساڵی ١٩٦٤ تا ١٩٩٣ سکرتێری حیزبی شیوعی

بووە، ئیدی بەشـێک بووە لەو شـتە شـاراوە و نهێنییانە و، توانیم لەژێر ناوی "عەزیز محەمەد دەدوێ" بڵاوی بکەمەوە و، هەوڵەکانیشـم هەر بەوەندەی کۆتاییان نەهات، بەڵکو توانیم کۆڵکاری لە هەندێ یادەوەریی دیکەش بکەم کە گرنگییان لە یادەوەرییەکانی عەزیز محەمەد کەمتر نییە و، ئەوانیش یادەوەرییەکانی مامۆستا مستەفا عەلییە، سیاسی و ئەدیب ، کە لە سـەروبەندی شـۆڕشـی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ لە حکوومەتەکەی عەبدولکەریم قاسـم وەزیری داد بووە. کە ئەو یادەوەرییانەش کەرەسـتەیەکی زانسـتیی گرنگە بۆ ئەو توێژەرانەی بەدوای ڕاسـتییەکانی سـەردەمی پاشـایەتی و کۆماریدا دەگەڕێن و، ناویشـم لێناوە "بیرەوەرییەکانی مستەفا عەلی، لە نەیارییەوە بۆ وەزیری".

بیرۆکەی بڵاوکردنەوەی یادەوەرییەکانی هەندێ سـیاسـی یەخەی خەیاڵی بەرنەدەدام؛ نەخاسـمە، کە دەسـتنووسـەکەی بەڕێز موکەڕەم تاڵەبانیم خوێندەوە، تێیدا ڕۆژانەی ژیانی تـایبەتی خۆی لە بەراییەکـانی ژیـانیڕا تۆمـارکردووە تـا دەگـاتە ئەو نزیکـانەی لەکـاتی ئامادەکردنی نامەی دکتۆراکەم سەردانم کرد و، ئەویش بە سوپاسەوە دەقە ئەسڵییەکەی دامێ کە بە خەتێکی جوان ناونیشانەکەی نووسیوە و دەڵێ "ژیان هەمیشە بە ورشەیەکی ناسـکەوە ڕانابووریێ". ئەو دیدارە لە سـاڵی ٢٠١١ بوو و بیرۆکەی سـەروبەرکردن و بڵاوکردنەوەشی هەر لە خەیاڵدانی توێژینەوەمدا مابوو، نەخاسمە دوای ئەوەی پێشنیاری کەسـایەتیی بەڕێز موکەڕەمم وەک بابەتی نامەی ماسـتەر بۆ "ئەحمەد عەلی سـەبع"ی توێژەر کرد، کە نـامەکەش لە کۆلێژی ئـادابی زانکۆی بەغـدا گفتوگۆی لەسـەر کرا و، دوایەش کرایە کتێب و لە خانەی کاروباری ڕۆشنبیری چاپ کرا.

بەڵام لاپەڕە و یـادەوەرییەکـانی ڕۆژانە بەهـای خۆیـان هەر دەمێنێ، بەتـایبەتییش ئەو شـتانەی توێژەرەکان و ئەوانەی لەسـەر کەسـایەتیی موکەڕەم تاڵەبانییان نووسـیوە، نەیاندیتووە و ئێسـتا دەتوانن هەموو ئەو شـتانەی تێدا هەڵێنجن کە موکەڕەم تاڵەبانی بە دەسـت و خەتی خۆی، لە ڕێوانێکی حەفتا سـاڵ پتری خاياندووە، نووسـیویەتی و، تێیدا بیرەوەریی منداڵی و سـەرەتای نەشـونمای سـیاسـی و فیکریی خۆی و چوونە ناو کاری سـیاسـی و پیشـەیی خۆی تۆمار کردووە و، دوایەش دێتە سەر ساڵانی زیندانیکردنی کە بەسەر ئەو هاواڵە سیاسییانەشی ڕاگەیشت بیرۆکەی چەپ و شیوعییان هەبوو، تا دەگاتە ئەوەی، وەک نوێنەری حیزبی شـیوعیی عێراقی و لە سـەروبەندی هاوپەیمانیی بەرەیی "حیزبی شـیوعی _ حیزبی بەعس"دا لە ١٩٧٣ پۆسـتی وەزارەتی ئاودێری و دواتریش پۆسـتی گواسـتنەوە و گەیاندن وەرگرێ. دواتریش دەبێتە گەواهیدەری سـەر مەوادایەکی هەرە گرنگ و ئاڵۆزی مێژوویی کە مێژووی ئەو سـەردەمەی عێراقی پێدا تێپەڕیوە و لە بەرایی ١٩٧٩ بە شکستی هاوپەیمانیی بەرەیی و لێکترازانی کۆتاییهات.

راســـتییەکەی، دوای لێکترازانی هاوپەیمانیی بەرەییش، ڕۆڵی موکەڕەم تاڵەبانی کۆتایی نەهـات. ئەو زۆرجـاران پێنـاوی نێوان ڕژێمی بەعس و حیزبە نەیـارەکـان بوو. چونکە، بەهۆی نیازپاکی و خستنەڕووی بابەت و پەنجە خستنەسەر کێشەکان ودوور لە ئاسۆی حیزبی و ئایدیۆلۆژیی خۆی، کەسایەتییەک بوو لای هەمووان جێی ڕەزامەندی بوو.

دوای خوێندنەوەیەکی تێروتەســەلی ئەو شــتانەی تاڵەبانی تۆماری کردبوون، دیتم کاری بڵاوکردنەوەی ئەو شــتانەی تاڵەبانی تۆماری کردوون ئەرکێکی زانســتییە و ئیدی لەڕێی ئاشـــتی عەتا تاڵەبانیی برازایەوە، کە جێی ســـوپاســـە، توانیم ڕەزامەندیی تاڵەبانی بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو دەســتنووســە وەربگرم ، ئەویش دوای ئەوەی شــەن و کەوم کرد و ڕێکم خســت و ئەوەی دووبارەبوون لامبرد و ئەو زانیارییانەیشــم لادا کە ڕەنگە، هەندێ کـات لەبەر بەرفراوانییەکەی، بۆ خوێنەر گران بێ و بەڕێز ئـاشـــتییش ڕۆڵی لە وەدەســـتهێنانی ئەو ڕەزامەندییە زۆربوو. لەکۆتاییدا، هیوادارم ئەو لاپەڕە و بیرەوەرییە ڕۆژانانە جێیەکی گرنگ لە کتێبخانەی مێژوویی عێراق بگرن، چونکە، هەر گەواهیدەرێکی ســـەر ژیانی تایبەتی و حیزبیی خۆی نەبووە، بەڵکو شـــایەدێکی ڕاســـتگۆی ڕووداو و گۆرانکارییە ســـیاســـییەکانی چەندین ســـاڵی دووررودرێژی عێراق بووە کە لە دووتوێیدا زۆری ئالۆزی و گۆڕانکاریی ســـیاســـی و کودەتای ســـەربازی و حیزبی هەڵگرتووە و شوێنەوارەکانیشیان تا ڕۆژی ئەوڕۆمان هەر ماوە.

**سەیف عەدنان ئەلقەیسی**

# پێشەکی

ژیانی من، هەمووده‌می ژیانێکی خۆش و ڕووالەتی نەبووە، بەڵکو پڕی ڕووداوی هەمەجۆر بووە، ڕووداوی سیاسی و کۆمەلایەتیی ناو جەرگەی ململانێی نەتەوەیی و چینایەتیی توندوتیژ. من لەو ڕووداوانە دوور نەبوویمە، بەڵکو بەشێکی ئەو ڕووداوانە بوویمە و، ڕووداوەکانیش بێ ویستی خۆی بەسەر بنیادەمیدا دێ و، ئەو قەتی ئەندازە بۆ دانەناون. بەلام، دەبێ بە دروستی لە ڕووداوەکان تێبگا و بابەتییانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکا.

ئەو ڕووداوانەی لەو یادەوەرییانەدا دەیانگێڕمەوە، ئەو ڕووداوانەن کە مێژووی ولات و گەلی ئێمەیان پێکهێناوە، هەرچییش بکرێ مێژوو هەر بە ئاراستەی خۆیدا دەڕوا، بەلام هەمیشە بە ورشەیەکی ناسکەوە ناڕوا، بەڵکو زۆری کۆسپ و تەگەرە دینەپێش.

ڕێی مێژووش تەنیا بە هەوڵی جەماوەری والادەبی و، ئەگەر بشلێین بێ کار و کردار و تێکۆشانی ئێمە و بێ قوربانی و ئازار و کارەسات ئەو کارە فەراهەم دەبێ، ئەوە قسەیەکی پووچە. ئاخر خەڵکێک هەیە هەوڵدەدا ڕەوڕەوەی مێژوو لەوجێی خۆی ڕاگرێ، چونکە بەرژەوەندییە چینایەتییەکانی دەیخوازێ.هیی واش هەیە، کە بەرژەوەندییەکانی دەبوێرێ، هەوڵدەدا بیباتەوە دواوە. ململانێی ڕاگرتن و گێڕانەوەپاشی مێژوو لەلایەک و بەرەوپێش پاڵنانی لەلایەکی دیکەوە ، ئێمە دروستمان نەکردووە و داماننەهێناوە بەڵکو ئەوە سوننەتی ژیانە ئەوکارەی دەکا و لێناگەڕێ ژیان هەر لەجێی خۆی پێیان لە عاردی بکوتێ و کاری وەستاندنی مێژووش مەحاڵە.

نازانم داخوا، ئەو ڕووداوە سەیرانە بوون ڕاپێچیان کردم تا لەگەڵ ڕێوانی مێژوودا بڕۆم، یان وشیاری وایلێکردم، لەگەڵ خەڵکێکی دەزانن چ دەکەن و بەرەو کوێ دەچن، بە ئاراستەی ڕێوانی مێژوو خۆ باوێمە ناو ئەو ڕووداوە توندانە. ڕەنگە هەردووکیشیان بێ؛ توندیی ململانێیەکان و وشیاریی سیاسی و کۆمەلایەتییش.

مرۆ لە ڕێوانی ژیاندیدا سەریش دەکەوێ و شکستیش دەخوا، جا شانازی بە سەرکەوتنەکانییەوە دەکا و لەوەش ناترسێ دان بە شکستەکانیدا بنێ و، ڕەنگە هەڵسەنگاندنەکانیش ئەرێنی یان نەرێنی بن، بەلام دەبێ لەو هەموو کارەیدا دڵسۆز و ڕاشکاوبێ، هەتا، هەرچەندجارێ لە ڕێیە ڕاستەکەی کەلی بوو، بتوانێ بێتەوە سەر ڕێیە دروستەکە.

لەسەردەمی منداڵی و گەنجی و پیریم، ڕێکەوتی گەلێ ڕووداوم کرد و نرخی بەشداریکردنی ئەو ڕووداوانەیشم بە سالانی بەندی و دوورخستنەوە و بێبەشی دا و، چونکە باوەڕیشم بە دروستیی کارەکانم هەبوو ئیدی گوێم بە لۆمەی لۆمەکاران نەدا.

که گەیشـــتمە ئەو قۆناغەی، بە پۆســـت و بەرپرســـیاریی وەزارەتان، شـــان بدەمە بەر بەرپرسـیاریی بەشـداریکردن لە بنیاتنانی وڵاتدا، ئەرکی خۆم بەو شـێوەیە جێبەجێکرد کە باوەڕم، وەک شــــیوعییەک، لێیدەخواســـتم و دەبێ بەرژەوەندیی گەل لەســـەر هەموو بەرژەوەندییەکەوە بێ.
لە هەندێ قۆناغی ژیانمدا، وەک پارێزەر، لەبەردەم دادگا سەربازی و مەدەنییەکان داکۆکیم لە تێکۆشەران کرد، تا ناچارکرام خۆیشم لەناو شیشەبەندی ئەو دادگایانە راوەستم و، بێ ئەوەی لەوە بترسێم دووبارە بمگرنەوە بەرگری لە بیروباوەڕەکەم بکەم.
پێویستە لێرە باسی ئەفسەری نیشتمانی، عەمیدی ڕوکن "ڕەمزی عەبدولقادر" بکەم کە بێ ئەوەی ســـڵ لە ســـزای حکوومەت بکاتەوە لایەنگیریی ئەو نیشـــتمان پەروەرانەی دەکرد ڕاپێچی ئەنجوومەنی عورفیی ســـــەربازیی کەرکووک کرابوون. ئەو کارەشـــی وایکرد لە سەرۆکایەتیی دادگای لادەن و ئەفسەرێکی دیکەی لەجێ دانێن تا دەستە دەستە نیشتمان پەروەران ڕەوانەی بەندیخانە بکا. بەشـــێکی تایبەتم بۆ گێڕانەوەی ئەو دادگاییانە تەرخان کردووە تا ببێتە نموونەیەکی ئازایەتیی خۆڕاگریی تێکۆشـەران دژی دەسـەڵاتی پاشـایەتیی کۆنەپەرســـتی دژەگەل. حەزم دەکرد پتر و پتر باســـــی تێکۆشـــــانی ناو بەندیخانەی تێکۆشەران بکەم، بەڵام کتێبێکم، سەبارەت بە قوربانی و خۆڕاگریی ئەو پاڵەوانانە، بەناوی "خوێنی پشت شیشەبەندان" بڵاوکردووەتەوە و بۆ هەر ڕووداوێکی دیاریش نووسینێکی تایبەتم بە بەڵگەنامەوە تەرخان کردووە، لەوانەش کتێبێک بەناوی "تاقیکردنەوەی بەرەی نیشـتمانی و نەتەوەیی پێشـکەوتنخوازی نێوان حیزبی بەعسـی عارەبیی سـۆسـیالیسـت و حیزبی شـیوعیی عێراق"، وەکچۆن کتێبیکی تایبەتیشـم بە ناوی"نامەکانی سـەدام حوسـێن لەپێناو ئاشتی و دیموکراسی و ئاشتبوونەوەی نیشتمانی لە عێراق" نووسیوە و، کتێبێکیش سـەبارەت بە کێشـەی تورکمانان و، کتێبێکی دی دەربارەی مافە نەتەوەییەکانیان و هەندێ کتێبی دیکەی بڵاوکراونەتەوە و هەندێکی وا لەڕێی بڵاوکردنەوەدان و، هەموو ئەوانەشـــم بۆ ئەوەیە کە هـاکەزایی بەســـــەر هەندێ مەســـــەلەی گرنگ و ڕووداوی وروژێنەردا ڕانەبوورم، کە بە بەشـێکی گرنگی ئەو مێژووە دادەندرێن بزووتنەوەی نیشـتمانیی عێراق ڕوونووسی کردوون. ئەو ڕووداوانە لەمن دوور نەبوون و بگرە بەشێک بوون لە ژیانی من و ژیانی دەسـتە دوای دەسـتەی ئەو تێکۆشـەرانەی بەنرخترین شـتی خۆیان بەخشـییە گەلەکەیان، لەپێناو ژیانی میللەتیشـــدا ســـڵیان لە مردن نەکردەوە تا نەبەردییان ببێتە نموونەیەک بۆ نەوەکانی دادێن.
لە ژیانی ئەرک و فەرمانمدا، چاوم بە ژمارەیەکی زۆری سەرکردەی بیروڕا جیاوازی دنیا کەوتووە، دەبووایە ڕاســتیی بیرکردنەوەی ئەوانەش بخەمەڕوو. بەرانبەر بەرپرســیارێتیی

دەوڵەتیش، بە پشــــتبەســــتن بەو باوەڕ و ئەو هێزانەی مامەڵەم لەگەڵدا دەکردن یان لەڕیزەکانیاندا کارم دەکرد، هەڵوێستی چەسپاو و جێگیرم هەبووە و، ئەو بیروبڕوایەشم ئەو چرایەی ژیانم بووە کە لەچاوی بزووتنەوەی سۆڕشگێڕیی عێراق و دنیاش شاراوە نەبووە.

هەرچی ژیانی تایبەتیمە، سەرباری ئەوەی شانازی بە پاکییەکەیەوە دەکەم، بەڵام بەرانبەر بەو کارانەی لەگەڵ تێکۆشــەرە نەتەوەیی و دیموکرات و شــیوعییەکاندا تێیاندا بەشــدار بووم، ئەوا شتێکی زۆر چکۆلەیە.

پێویستە وەبیر خوێنەرانی بەڕێزی بهێنمەوە، کە من، بە ڕێنوێنی و چاوڕوونیی ئەو باوەڕە ڕۆشنانەی پەیوەستیان بوویمە، سەبارەت بە کێشــەی کورد چەندین کتێبم نووسیوە و گەلێ وتــارم بڵاوکردووەتەوە و چەنــدین دیــداریشــــم کردووە. لەوانە، کتێبێــک بە ناوی"کوردســتان، یەکێتییەکی ســەرپشــکانە نەک پێبەندییەکی بە تۆبزی" و، کتێبێکی دیکە بەناوی "پەرەســـەندنی فیکری و ســــیاســــیی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی" و "بەرەو چارەسەرێکی دروستی کێشەی نەتەوەیی کوردی لە عێراق". لە خستنەڕووی کێشەکانی پەیوەست بە گەلی کوردیش، ڕاشکاو و ڕاستگۆ بوویمە.

هەروا بەڕاگوزەری بەسەر هەندێ ڕووداوی مەترسیداری بەسەر عێراقدا هاتووە گوزەرم نەکردووە، بۆ نموونە، داگیرکردنی کوێت، بە هـاوکـاریی هەنـدێ ســــەرکردەی یەکێتیی سۆڤیەت هەوڵمداوە سەدام رازیکەم بێ شەڕ لە کوێت بکشێتەوە و شەرعییەتی بداتەوە. کتێبێکم بە ناونیشـانی "شـەڕ.... ئەرێ یەکەمین بژاردەی چارەسـەری قەیرانی کوێت بوو؟" نووسی، هیوادارم بەو زووانە بکەوێتە بەردەستی خوێنەران.

لەجیاتیی ئەوەی نەوت و زۆریی نەوت لە کوردســــتان ببێتە هۆکارێکی پێشـــکەوتن و بەختەوەریی گەلی کورد، بووەتە بەڵای ســـەری و، چونکە وڵاتانیش چاویان بڕیوەتە ئەو خێروبێرە، ئەوا لەجیاتیی ئەوەی سوودی لێ ببینێ باجێکی زۆریشـی بۆ داوە. جا کتێبێکم بەناوی"نەوت و کێشـــەی کورد" نووسـیوە و هیوادارم ئەویش لەو زووانە بگاتە دەســـتی خوێنەران.

من، سوپاسی هەموو ئەوانە دەکەم کە لەکاتی لەسەر ڕاستیبوون لەگەڵمدابوون و، هەموو ئەوانەشـــی لەکاتی هەڵەڕێبوونمدا ڕاســـتیانکردوومەوە، خۆ مرۆ هەڵەش هەر دەکا، ئاخر ئەوەی هیچ نەکا هەڵە ناکا، هەڵەیش شـوورەیی نییە، بەڵام سـووربوون لەسـەری، لۆمەی لێ دەکەوێتەوە.

دەبێ ئاماژە بەو فەرموودە پیرۆزەش بکەم کە پێغەمبەر "د. خ" دەفەرموێ: " بنیادەم لە ژیانیدا کار بۆ سێ شتان دەکا، کۆکردنەوەی سامان و، وەدەستهێنانی خزم و برادەر و ،

کرداری چاک. ئەو دوانەی بەرایی دەیگەیەننە دوا مەنزڵگای و دەگەڕێنەوە، بەڵام کرداری چاک هەر دەمێنێ*

کرداری چاکیش تەنێ جێبەجێکردنی فەرزە ئایینییەکان نییە، بەڵکو ئەو کردارانەیە سوودی بۆ کەسانی دی هەبێ و، کەسانی دیکەش واتە گەل. ئەوەی خێری بۆ گەل هەبێ ناوی بە چاکە دەهێنرێ و ئەوەی خراپەیشی بۆ گەل هەبێ بە نەفرەتەوە باسی دەکرێ، دادوەری نێوان خێر و خراپەش هەر گەلە.

## خانەوادەی تاڵەبانی:

خانەوادەی تاڵەبانی سەر بە هۆزی "زەنگەنە"یە[1]، کوردن و نیشتەجێی دۆڵی زێی "ئاوەسپی"ی ناحیەی قادرکەرەمی قەزای دووزی[2] سەر بە کەرکووکن، کە دواتر حکوومەتی سەدام حوسێن، بۆ بچووککردنەوەی پارێزگای کەرکووک و ئاسان بەعەرەبکردنی، خستییە سەر پارێزگای سەلاحەدین.
ئەو خانەوادەیە، بە یوسف ئاغای کوڕی ڕۆستەم ئاغا دەستپێدەکا، کە میر ئیسماعیلی مام و خەزووری دەیکاتە قایمقامی "قەرەداغ" و، ئەمارەتەکەی میر ئیسماعیلیش هەتا قەرەداغ وکفری و دووز درێژ دەبووەوە. کە بەرەی یەکەمی خانەوادەی بابانەکانیش لە هەندێ ناوچەی ئێران دەرکەوتن، ئەو لەترسی فراوانبوونی دەسەڵاتی ئێران لەسەر سنووری نێوان ئەو دوو دەوڵەتە، پشتی عوسمانلییەکانی گرت و، دەسەڵاتی میر ئیسماعیل تخووبی میرنشینییەکەی تێپەڕاندبوو و بگرە ساڵح بەگی زەنگەنەی موتەسەڕیفی کەرکووکێش، کە لەبەر ئەوەی یەکەم ئیمتیازی نەوتی ناوچەکەیان وەرگرت بە خانەوادەی "نەفتچی" دەناسران، عوسمانلییەکان بە ڕاوێژکردن لەگەڵ میر ئیسماعیل کردیانە موتەسەڕیف.
زستانان، بنکەی ئەو میرنشینییە شارۆچکەی "نەوجوول" بوو و، هاوینانیش هاوینەهەواری "خۆرنەوەزان". دوای مردنی میر ئیسماعیل، میرنشینەکە لەنێوان هەرسێ کوڕەکەی

---

[1] _ هۆزی زەنگەنە، بەرلەوەی داکشێنە کوردستانی باشوور، نیشتەجێی ناوچەی کرماشانی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوون .(ئامادەکاری ئەو بیرەوەرییانە، وەک هەر غەیرە کوردێکی سەر بە نەتەوەی باڵادەست، لەژێرکاریگەریی ئەو بیروبۆچوونە باوانەی نەتەوەی سەردەستە و پێیانوایە ئەو پارچەپارچەکردنەی کوردستان شتێکی ئاساییە، بۆیە دەڵێ کوردستانی خۆرهەڵات و کوردستانی باشوور، لەکاتێکدا کوردستان یەک کوردستانە و وەک هەر وڵاتێکی دیکە هەرچوار لای هەیە، باکوور و باشوور و خۆرهەڵات و خۆرئاوا. ل- ب) لەوێ میرنشینی خۆیان هەبوو و، بە "میرنشینی عەلی خانی زەنگەنە" دەناسرا، بەڵام میرنشینەکە کەوتە بەر هێرشی دەوڵەتی سەفەویی ئێران و لە ئەنجامدا بەشی هەرە زۆری ئەو هۆزە داکشانە ناوچەی گەرمیانی سەر بە عێراق و بەدیاریکراویش هاتنە گوندی "قەیتوول" و لەوێ دووەمین میرنشینی خۆیان بە ناوی "میرنشینی زەنگەنە لەقەیتوول" دامەزراند و دامەزرێنەرەکەی "میر نەوشیروان بەگی کوڕی عەلی خان بەگی زەنگەنە"بوو و، عەلی خان بەگ لە سەردەمی شاعەباسی دووەمی سەفەوی لەئێران وەزیری دارایی بووە. ململانییەک دەکەوێتە نێوان "موحەمەد بەگی کوڕی نەوشیروان بەگ" ی سەرکردەی هێزە سەربازییەکانی میرنشینییەکە و برازایەکەی"میر ئەحمەدی کوڕی میر ئیسماعیل"، چونکە دوای مردنی میرئیسماعیل برایەکەی دەیەوێ سەرۆکایەتیی ئیمارەتەکە وەرگرێ چونکە ئەو سەرکردەی هێزە چەکدارەکان بووە، بەڵام "میر ئەحمەدی کوڕی میر ئیسماعیل دەسەڵات وەردەگرێ و دەبێتە میری میرنشینی زەنگەنە. هۆزی زەنگەنە نیشتەجێی کەرکووک و موسڵ و خانەقین و بۆ زانیاریی پتریش، بڕوانە موحەممەد عەبدولڕەحمان زەنگەنە، مێژووی هۆزی زەنگەنە،"بەکوردی"، چاپخانەی ئەندەلووس، بەغدا، ١٩٨٠.

[2] _ تووز بە تورکییە و واتە خوێ. بەلاسم ناوی ڕاستەقینەی ئەو شارۆچکەیە "خوورماتووە" واتە پایتەختی خوورییەکان. کە سەرەڕێی باروبارخانەی بەرەو ئاسیای گچکە بووە تورکەکان بەوێدا خوێیان بردووەتە ناوجەکانی خۆیان و توزەکەیان بۆ ناوەکەی زیادکردووە.

دابەشبوو، چونکە کێشەیان کەوتە نێوان، کە خانەوادەی بابانیش بوونە هاوکاری دەوڵەتی عوســـمانلی و میرنشـــینیی بابانیان دامەزراند و، ســـەرەتا بنکەکەی لە قەلاچوالان بوو و دوایەش سولەیمانی، کوڕەکانی میر ئیسماعیل پەنایان بۆ بابانەکان برد ومیرنشینییەکەیان درایە پاڵ میرنشینیی بابانی لە باشووررا هەتا کفری درێژ دەبووەوە.
مەحمودی کوڕی یوســـف ئاغای، ئەودەمای باوکی قایمقامی قەرەداغ بووە ئەو لەوێ لەدایکبووە و، کە دەشـــگاتە تەمەنی مێردمنداڵی باوکی دەینێرێتە قوتابخانەیەکی ئایینی ئەوێ تا قورئانی پیرۆز بخوێنێ. دوای مردنی باوکیشـــی، بۆ فێربوونی زانســـتەکانی شـــەریعەتی ئیســـلام لەو قوتابخانەی دەچێتە ئەو قوتابخانە و، دوای ئەوەی بڕوانامەی زانسـتیش وەردەگرێ دەگەڕێتەوە گوندی "ڕەمەزان مامکە"ی ناوچەی زەنگەنە، تا لەسـەر مەزەبی شافیعی دەست بە ئیرشادی ئایینی ئیسلام بکا.
تەسـەوف لە بەشـی هەرەزۆری ناوچەکانی کوردسـتان بڵاببووەوە، تەریقەتی بەربڵاویش تەریقەتی قادری بوو، کە بەناوی شـێخی شـکۆدار عەبدولقادری گەیلانییەوە ناونراوە و، تەریقەتەکەیشـی گەیشـتبووە هیندسـتان و پاکسـتان و عێراق و کوردسـتان و باکووری ئەفریقیا و، یەک لە نەوەکانیشـی کە "شـێخ ئەحمەد لاهوریی کوڕی شـێخ عەبدولڕەزاق"ە، لاهور بەجێدێڵێ و ڕوو لە کوردســتان دەکا. لە گوندی"ســورداش"ی نزیک ســولەیمانی دەگیرســێتەوە. لەوێ دەگاتە دیداری مەلا مەحمودی زەنگەنە تا زانســتی تەســەوفی لەســەردەسـتی بخوێنێ، کە ڕێوشـوێنەکانی تەریقەتی قادرییش تەواودەکا، شـێخ ئەحمەد داوای لێدەکا تەریقەت بدا نەک تەریقەت بگرێ، واتە ئیرشـادی سـۆفیگەری بکا و ئەویش ئەو کارەی دەکا. شـــێخ ئەحمەدی لاهووری لە بارودۆخێکی مژاوی دەکوژرێ و مەلا مەحمود لە گوندی ســـورداش دەیشـــارێتەوە و مەرقەدەکەی بووەتە مەزاری پەیڕەوانی تەریقەت. تەریقەتی قادری بە ئیرشـادی مەلا مەحمود بەرفراوان دەبێ و، ئەوەش ترسـێک لای شـێخانی دیکەی تەریقەت دروسـتدەکا، کە مەلا مەحمودیش دەمرێ شـێخ ئەحمەدی ئیرشـاددەری کوڕی لە کەرکووک دەینێژێ و ئیدی مەرقەدەکەی دەبێتە سـەرەتایەک بۆ بنیاتنانی تەکییەی قادریی تاڵەبانی.
لەژێر فشـــاری ئیرشـــاددەرانی تەریقەتەکانی دیکە، شـــێخ ئەحمەد ناچاردەبێ گوندی ســووررداش بەجێبێڵێ و بچێتە گوندی تاڵەبانی نزیک چەمچەماڵ، تا لە مەرقەدی باوکی لە کەرکووک نزیک بێ و، لێرەوە، شـێخ ئەحمەد نازناوی تاڵەبانی وەردەگرێ و نازناوی ئەو خانەوادەیەش لەو نیشتەجێبوونەی شێخ ئەحمەد هاتووە لە گوندی تاڵەبان، بەڵام بنەچەی ئەو خانەوادەیە دەچێتەوە سەر هۆزی ناسراوی زەنگەنە.

شێخ ئەحمەد یازدە کوڕی هەبووە و ئەوانیش: شێخ عەبدولڕەحمان و شێخ عەبدولغەفور و شێخ عەبدولعەزیز و شێخ عەبدولفەتاح و شێخ عەبدولکەریم و شێخ محێدین و شێخ حوسێن وشێخ موحەممەد ساڵح و شێخ موحەممەد عارف و شێخ عەبدولقادرن. هەریەکەیان لە ناوچەیەکی کوردستان ئیرشادیان کردووە، لە "کۆیە"ڕا هەتا قەزای خانەقین و، زۆربەی تاڵەبانییەکانیش لە قەزای ناوەندی کەرکووک نیشتەجێ دەبن ، منداڵەکانی شێخ عەبدولڕەحمانیش لە شاری کەرکووک نیشتەجێ دەبن و لەوێ مزگەوت و تەکییەی تاڵەبانی دروستدەکەن کە هەتا ئێستاش هەر ماون.
ئەوانەی لە گوندی قادری سەروکاری ئیرشادیان کردووە، بریتین لە هەر یەک لە مەلا مەحمودی زەنگەنەی لەلایەن شێخ ئەحمەدی لاهووری ڕێی ئیرشادی دەدرێتێ و شێخ ئەحمەد تاڵەبانیی کوڕی و شێخ عەبدولڕەحمان و شێخ عەبدولغەفور و شێخ عەبدولعەزیز وشێخ عەبدولفەتاح و شێخ عەبدولکەریم و شێخ محێدین و شێخ حوسێن و شێخ موحەممەد ساڵح و شێخ عەبدولقادر و شێخ موحەممەد عارف و، دوای ئەوانیش کور و نەوەکانیان ئیرشادیان کردووە.
ئەوخانەوادەیە تەنیا بە ئیرشادی ئاییني نەناسراون، بەڵکو زۆر ڕێچکەی دیکەی ژیانیان گرتووە. شێخ حەمیدی کوڕی شێخ عەبدولعەزیز و منداڵەکانی و شێخ مەجیدی شێخ ڕەزا و شێخ لەتیف و شێخ موحەممەد نان کەور و شێخ فەیزوڵلا و شێخ جەماڵ و شێخ تالیب و شێخ عەتا وەک پیاوی عەشیرەت لەناو شێخەکاندا دیار و دەرکەوتوون.
ئەو خانەوادەیە پیاوی دەوڵەت و سیاسەتیشیان تێدا هەڵکەوتووە، جەلال تاڵەبانیی "مام جەلال" سکرتێری گشتیی حیزبی یەکێتیی نیشتمانی، بووەتە سەرۆکی کۆماری عێراق. حەسەن تاڵەبانی و منیش پۆستی وەزارەتمان وەرگرتووە. شێخ حەبیب تاڵەبانی ئەندامی ئەنجوومەنی دامەزرێنەری دەوڵەتی عێراقی بووە و دوایەش بووە ئەندامی پەرلەمان. شێخ عەبدولوەهاب و شێخ فایەقی شێخ محەممەد ڕەئووف و شێخ قادر مەنسور و شێخ حەبیبی کوڕی و شێخ فازڵی شێخ فەیزوڵلا و خاتوو ئالا تەحسین تاڵەبانی بوونە ئەندامی ئەنجوومەنی عێراقی و، دکتۆر نووری تاڵەبانییش بووە ئەندامی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان.
هەر لەو خانەوادەیەش، هەریەک لە حەسەن تاڵەبانی[3]و سوعاد حەبیب تاڵەبانی وعارف تاڵەبانی بوونەتە موتەسەریف"پارێزگار"، وەکچۆن هەریەک لەشێخ محەممەد ڕەئووف و

---

[3] _ حەسەنی کوڕی شێخ عەبدوڵلای کوڕی شێخ ڕەزای تاڵەبانی سیاسییەکی عێراقیی کوردە، لە ١٩١٣ لە بەغدا لەدایکبووە. لە عێراق و لە هەردوو سەردەمی پاشایەتی و کۆمارییش گەلێ پۆستی وەرگرتووە. لە ١٩٣٤ کۆلێژی مافی تەواوکردووە. پارێزەریی کردووە. ساڵی ١٩٤٦ لەجێی مەعروف جیاووک بووەتە موتەسەرِیفی لیوای سلێمانی.

شێخ حەبیب و شێخ فازڵ فەیزوڵڵا بوونەتە سەرۆکی شارەوانیی کەرکووک و، بەڕێز نەجم عەبدولواحید تاڵەبانی بووەتە سەرۆکی دادگا و، چەندین کەسیشیان پۆستی بەڕێوەبەری و زانستیان وەرگرتووە و، لەوانەی پێگەیەکی زانستیان لە زانکۆکان بەدەستهێناوە خاتوو لامیعەی شێخ جەماڵ تاڵەبانی و خاتوو ناهیدە و دکتۆر گێلاس موکەڕەم تاڵەبانی لە زانکۆکانی عێراق و کوردستان بوونەتە مامۆستای زانکۆ.

---

دواتری موتەسەڕیفی هەشت ویلایەت بووە. لە ١٩٥٨ بووەتە بەڕێوەبەری گشتیی ڕێنوێنی و رادیۆی عێراقی، کە چاپەمەنی و ڕۆژنامەوانییشی رەگەڵ درابوو. دوای دووەم هەموارکردنەوەی وەزاریی حکوومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم لە ٧ی شوباتی ١٩٥٩بووەتە وەزیری گەیاندن و کار و جێی بەڕێز باباعەلیی شێخ مەحمودی گرتووەتەوە و، تا ١٣ی تەمموزی ١٩٥٩لەو پۆستەدا دەمێنێتەوە. لە ٢١ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٠ لەجێی عەبدولوەهاب ئەلئەمین دەبێتە وەزیری کاروباری کۆمەلایەتی و، لە ١٩٦١ بەوەکالەت دەبێتە وەزیری گەیاندن. حەسەن تاڵەبانی تا کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ لە پۆستەکەیدا دەمێنێتەوە. لە ساڵی ٢٠٠٠ کۆچی دوایی دەکا. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: جەمال بابان، اعلام کرد العراق، مطبعة شڤان، السليمانية، ٢٠٠٦، ص ٢٣٥.

## خێزانەکەم و لەدایکبوونم:

من لە بەهاری ١٩٢٣ لە شـــاری کەرکووک لە دایک و باوکێکی کورد لەدایکبوویمە، باوکم شێخ جەماڵی شێخ محەممەد عەلیی کوڕی شێخ عەلیی کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی شـــێخ ئەحمەدی تاڵەبانیی کوڕی شـــێخ مەلا مەحمودی زەنگەنەی کوڕی یوســـف ئاغای زەنگەنەیە و، دایکیشـــم حاجی شـــوکرییە خانمی کچی جەلال ئەفەندیی کوڕی مەلا مەعروفی کوڕی مەلا عەبدوڵلا خدریی کوڕی مەلا سلێمان خدرییە، کە نازناوی خدریی لە گوندی خدر ڕێحانی ناوچەی زەنگەنەی ســـەر هەردوو بەری زێی ئاوەســـپیی ســـەر بە قەزای دووز خوورماتوو وەرگرتووە. خوشـــکێکم هەبوو دووســـاڵ لەمن گەورەتربوو و نـاوی عـادیلە بوو و دواتریش بووە خێزانی شـــێخ عەبدوڵلای تاڵەبانیی ئەفســـەر، خوا لێیخۆشبێ، کە یەک لە یاوەرانی مەلیک غازی بوو.

دانیشتووانی شاری کەرکووک کورد و تورکمانن وهەر هێندەی ژمارەی پەنجەی دەستان عارەبی تێدابوو و، ئەوانیش، بەژن و ژنخوازی، یان بوونە کورد یان بوونە تورکمان.

بـاوکم، برایەکی لەخۆی گەورەتری هەبوو و نـاوی شـــێخ محەممەد جەمیل بوو، کە لە ئیرشـــادی ئایینیی تەریقەتی قادریی تەکییەی تاڵەبانیی کەرکووکێ هاریکاریی شـــێخ محەممەد عەلیی باوکیی کردووە ودوایەش، پاش مردنی باوکی تا ســـاڵی ١٩٦١ خۆی ئیرشادی کردووە، لەو ساڵەدا ئەمری خوا دەکا و دەچێتەوە بەر دلۆڤانیی خودا. باوکم لە بەڕێوەبردنی موڵک و ماڵدا هاوکاریی باوکی دەکرد کە داهاتەکەی بۆ خانەوادە و ناندانی هەژارانی تەکییەکە خەرج دەکرا.

گرنگترین ڕووداوی کەرکووک هەڵگیرســـانی شـــەڕی یەکەمی جیهانی بوو کە ســـوپای ئینگلیزان لە ١٩١٨ گەیشـــتنە دەوروبەری کەرکووک و کورد و تورکمان تا ســـاڵی ١٩٢٥ چوونە بن ڕکێفی داگیرکەری بەریتـانی، کـاتێکی کە بە کـاریگەریی بەریتـانیـا کۆمەڵەی نەتەوەکان بڕیارێکی دەرکرد و بێ ویســـت و ئارەزووی خەڵکی کوردســـتان و، لەوانەش کەرکووک، درانە پاڵ حکوومەتی بەغدا

هەڵوێســـتی خەڵکی کەرکووکیش، هێ لە ژمارەیەکی کەمی کەســـایەتییەکان، ئەگەر دژی ئینگلیز و هاریکارانیشیان نەبووبێ، ئەوا هەڵوێستێکی نەرێنی بوو.

ئەودەمای یەکەیەکی ســـەربازیی هاریکار لە کەرکووک هەبوو، ئەویش هێزەکانی 'لیڤی'[4] بوو و زۆربەی خەڵکەکەی لە ئاشـــوورییەکان بوون. خەڵکەکە مامەڵەیان لەگەڵ نەدەکردن

---

[4] _ هێزەکانی لیڤی: لەسەردەمی کۆیخایەتیی بەریتانی لە عێراق ١٩٢١- ١٩٣٢ پێکهێنرا و، دوای کۆنگرەی قاهیرەش لە ١٩٢١ هێزی ناوخۆیان لێ دروســـتکرا وەک جێگرەوەی ســـوپای بەریتانیا کە لە عێراق کشـــابووەوە و، ئەوانی بۆ

و له چێشتخانه و قاوەخانان نان و ئاویان نەدەدانێ. ئەوەش وایکرد له ساڵی ١٩٢٤ لەگەڵ خەڵکی کەرکووکێ تێکبگیرێن و شەڕەتەقە دروستبێ که پازدەکەس له خەڵکی شاری بوونه قوربانی.

خاتوو ڕەفیعەی کچی شەفیق بەگ، که بەکالۆریۆسی له ئاداب هەبوو، له ١٩٧٢[5] خواستم و بووە هاوسەرم و دوو کوڕ و کچێکمان بوو، ئەوانیش هەریەک له دکتۆر ئاراس، که پزیشکی تایبەتمەندە له نەشتەرگەریی گشتی و دکتۆر ڕێنار ی پسپۆڕی نەخۆشییەکانی چاو و نەشتەرگەریی چاو و دکتۆر گێلاسی کچم که مامۆستای زانکۆیە.

---

کارە سەربازییەکانی دژی بزووتنەوەی نیشتمانی بەکاردەهێنا، که بریتی بوو له بزووتنەوەکانی کوردی نێوان ساڵانی ١٩٢٢- ١٩٣١. هەر لەو ماوەیەشدا و له ساڵی ١٩٢٦ ڕا بەریتانیا لەبەر هۆی ئابووری ئەو هێزانەی کەمکردەوە، ئەو هێزەش تا بەستنی پەیمانی ١٩٣٠ ی نێوان عێراق و بەریتانیا بەردەوام بوو و، ئیدی ئەو یەکانە وەک یەکەی جەنگاوەر ڕۆڵیان نەما و ئەرکیان ئەوەبوو پاسەوانیی فرۆکەخانەکانی بەریتانیایان له عێراقدا دەکرد. دواترێ ئەوانە له حکوومەتی عێراقی ڕاستبوونەوە و بەڕوویدا وەستان، نەخاسمە دوای یاخیبوونەکەی ١٩٣٣ی ئەو هێزە، که سوپای عیراق توانی بەسەریاندا زاڵبێ و ڕێیدا ئەوانەی دەیانەوی وڵات بەجێبێڵن بڕۆن و زۆربەیشیان ڕوویان له سووریا کرد. بۆ وردەکاریی پتر بنۆڕە ریاض رشید ناجی الحیدری، الاثوریون فی العراق ١٩١٨-١٩٣٦ ط١ القاهرة، مطبعة الجیلاوی،ص ١٩٧. یاسین طه یاسین: قوات اللیفی عهد الانتداب البریطانی علی العراق بین عامی ١٩٢١- ١٩٣٢، مجلة دراسات تاریخیة- جامعة البصرة، العدد ١٥، ٢٠١٥.

[5] – موکەڕەم تاڵەبانی، چونکه له نیوەی دووەمی سییەکانی "سەدەی ڕابردووەوە" سەرقاڵی کاری نهێنی بووە تا له ١٩٧٢ بووە وەزیری ئاودێری، ئەوا له بەرایی گەنجییدا ژنی نەهێناوە، که دواتر خانەوادەی خاتوو ڕەفیعە دەناسێ و دەیبینێ و دەچێتە خوازبێنیی، که سەرباری ئەوەی هیچ ڕێچکەیەکی سیاسییان نەبووە، خانەوادەیەکی ناسراو بوون و، شەکراو و مارەبڕینەکەش له ٢٣ی ئابی ١٩٧٢ له سلێمانی بەڕێوەچووە و، ژمارەیەک کەسایەتیی دەوڵەتی عێراق و هاوڕێیانی موکەڕەم له حیزبی شیوعیی عێراقی ئامادەی ئاهەنگەکە دەبن، سەرباری ژمارەیەک له ئەفسەرانی سوپاش. ئاهەنگەکەش له سلێمانی له ماڵەکەی خۆیاندا بەڕێوەچوو و، ئێستا سێ منداڵیان هەیە، لەوانەش جمکەیەکی که هەریەک له ئاراس و گێلاسن.

## شارەکەم کەرکووک:

کەرکووک شـاریکی کۆنە، لەسـەر بانێکی بڵندی فراوان بنیاتنراوە و شـوورایەکی گەورەی لەدەورەیە و چەندین دەروازەی هەیە. ئەوەش وەک قەڵایەکی قایم بووە تا لە داگیرکاریی هێرشـــی بێگانان بیپارێزێ. ئاو لە کەرکووک لە بیری قوول دەردەهێندرا کە دەرهێنانی کارێکی گران و ناخۆش بوو و، شــارەکەش لەســەر لێواری "خاســە"یە، کە بێســتانەکانی دەوری قەڵای ئاودەدا، ئەوەش ســـــەرباری ئەو کاذیاوانەی پێیدەڵێن "بۆلاغ" و دەکەونە خۆرهەڵاتی شارەکە. زۆربەی خانووەکانی شارەکە لە قایە "بەرد" و گەچ دروستکراون کە لەو زنجیرە چیایەی لە خۆرهەڵاتی شـــارەکەدا درێژدەبێتەوە دەردەهێنرێن. جاران ئەو غازە ســـروشـــتییەی لە ناوچەی بابەگوڕگوڕ دەردەهێنرا گڕی دەگرت، ئیدی خەڵکەکە ئوســـتوورە و باوەڕێکی زۆریان لەبارەوە چنی. ئەو ژنانەی داوایان دەکرد کوڕیان ببێ ڕووی خۆڵەکەیان دەڕنی و دەیانگوت" بابەگوڕگور بەگوڕ هاتم بۆ کوڕ هاتم". نەوت لە "دۆڵی نەوت" بەشێوەیەکی سروشتی دێتەدەرێ و لەبەری دەڕوا، خەڵکەکە دەریاندەهێنا و بە شـێوەیەکی ســـەرەتایی دەیانپاڵاوت و بۆ خۆگەرمکردنەوە و چرافانۆســـان بەکاریان دەهێنا. خۆرهەڵاتی شــــارەکەش جیوە و چەندین کانزای دیکەی لێیە و باکووریشـــی قیڕ و......تاد. زەوییەکانی دەوروبەری شـــارەکە زەویی بەپیتن و دانەوێڵە و ســـەوزە و داری میوەیان لێ دەچێندرێ و، بەهاران گیا و گوڵە کێویلە دەوروبەری شـارەکەی دادەپۆشـن. بەشـێوەیەکی ئاسـاییش، خەڵکەکە بۆ سـەیران و کات بەسـەربردن دەچنە ئەو جێیانە و خەریکی بازبازێن و غاردانێ دەبن و، ژنـان خواردن و چا بۆ بەســـەربردنی ڕۆژێکی تەواوی ئەو جێیە جوانە ئامادەدەکەن. عوسـمانلییەکان پردێکیان لەسـەر ئاوەکەی خاسـە دروسـتکردبوو و زۆرجارانیش لە وەرزی لافاوی زسـتان و بەهاران مەترسیی رووخانی لێ دەکرا.

ناوە دێرینەکانی وەک "خاســە، باوەگوڕگوڕ، باوە قەتال،بلاغ" ئاماژە بەوەی دەکەن کە ئەو ناوچەیە ناوچەیەکی کوردییە و، تووشی داگیرکاری و نیشتەجێبوون و گۆڕانی دیمۆگرافی بووە. ئەوەی جێی گومان نییە ئەوەیە، دانیشـتووانی ڕەسـەنی ناوچەکە کورد و کلدانن و بەدرێژایی مێژوو قەومی دیکەی بۆ هاتووە و بوونەتە بەشـێک لە ئاکنجییانی ئەو شــارە، بەڵام زۆربەی هەرەزۆری دانیشتووانی گوندەکانی دەوروبەری شارەکە کوردن.

گۆڕی دانیال پێغەمبەر و ئەبرەشـییەی گاورە کلدانەکان و چەند مزگەوت و تەکیە لەسـەر قەڵای شـــارەکەن. لە ســـەردەمەکانی دواتریش، کورد و تورکمان و جوو لە ناوچەکانی دەوروبەری قەڵا نێشـــتەجێ بووینە، لەو جێیانەش "بەرتەکیە" و"بۆلاغ" و ئیمام قاســـم و گەڕەکی جوولەکان و موســـەڵلا و قۆریە و.....تاد. کۆنترین جێی ســـۆفیگەرییش تەکییەی

تاڵەبانییە، کە دووسەد ساڵ دەبێ دروستکراوە و گۆڕی ئەو شێخە تاڵەبانییانەی تێدایە کە ئیرشادیان لەسەر تەریقەتی قادریی تاڵەبانی کردووە و، تەکییەی کۆنی دیکەش لەوشارە هەن وەک تەکییەی بەرزنجی و تەکییەی شێخ حوسامەدین و تەکییەی شێخ عەبدولخالق. زۆربەی موریدانی تەکیەی تاڵەبانیی کەرکووک تورکمانن و، موریدە کوردەکانی زۆربەیان خەڵکی کوردستانی خۆرهەڵاتن"خۆرهەلاتی کوردستان- ل . ب" وەک مهاباد و موکریان و هەورامان. لە سەردەمانی دواتریش هەندێ شاعیر لەوێ دەرکەوتوون، وەک شێخ عەبدولڕەحمان و هەردوو کورەکەی، شێخ ڕەزا و شێخ عەبدولقادر"فائیز" و مەلا سادق سەنەوی.

لە دەیەکانی ، قەلای سەربازی"قشلە" و بەڕێوەبەرایەتییەکانی دەوڵەت "سەرا" و بەڕێوەبەریتیی شارەوانی و نەخۆشخانە و قوتابخانە دروستکران.

هۆزەکانی تاڵەبانی و جەباری و شوان و زەنگەنە و .... تاد دەوری شارەکەیان داوە، کە هۆزی کوردن و لە چەند خێزانێکیش بترازێ شارەکە هیچ عارەبێکی تێدا نەبووە و، ئەوانیش بۆ قەسابیی مەڕومالات لە موسڵێڕا هاتبوون و لەدەرەوەی شاری چەند ماڵێکیان هەبوو کە لە دەماڵ تێنەدەپەڕی و لە هۆزی حەدیدی بوون، هەرچیی زۆرینەیە، کورد و تورکمان و کەمینەکانی کلدان و ئاثوری و ئەرمەنی و جوو بوون.

لەگەڵ باوکم، لە یەکەم بەهاری تەمەنم شارەکەم بەجێهێشت و، ساڵی ١٩٣٢ هاتمەوە شاری تا لە خوێندنی سەرەتایی و لەژێر چاودێریی شێخ محەممەد عەلیی باپیرم درێژە بە خوێندن بدەم.

## باوکم بۆ ویستیی بچێته گوندی زەرداو؟:

باپیرم براگەورەی برایانی بوو و پیاوێکی ئایین پەروەر و بەخشـــندەبوو و، تەکیەی تاڵەبانییش سەرباری جێبەجێکردنی ڕێوشوێنە ئایینییەکان و سۆفیگەری، پێشوازیی لە کەسایەتییە کوردییە ناسراوەکان دەکرد و، هەژار و نەداریشی دەحەواندەوە و خواردنی دەدانێ. باپیرم ، بە سەخاوەتەوە پارەی بۆ میوان و ناسیاوان خەرج دەکرد و، بە پارە و شتومەکیش هاوکاریی خەڵکی نەدار و دەستکورتی گەڕەکی بەرتەکیەی دەکرد.
چونکە باپیرم کارەکانی بەڕێوەدەبرد، شێخ جەمیلی مامم خەریکی ئیرشادی ئایینی دەبێ و گەلێ چێژ و خۆشیی دنیای لەخۆی حەرامکردبوو و لە کونجێکی تەکییە پەرگیر ببوو و رازی نەبوو بچێتە ناو شارەکەش. ئیدی دەروێش و مورید و پیاوانی ئایین دەوریاندابوو، کەچی هەرچی کەسایەتییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانستییەکان بوون، ئەوا سەریان لە دیوەخانەکەی باپیرم دەدا و، باوکم کاروبارەکانی میوانداری و بەڕێوەبردنی موڵک و ماڵی کردبووە پیشە. بەڵام ئەو موڵکانە زەویی کشتوکاڵیی دەوروبەری کەرکووک بوون، وەک ناوچەی "چوارباخ" و "یارووەلی" و "سـۆنەکولی" و " گوندی "قەرەدەرە"ی نزیک ناحیەی دووبزی باکووری کەرکووک. داهاتی ئەو زەوییانەیش بە حاڵ بەشـی ژیانی باپیرم و خانەوادەکەی و ئەرکەکانی میوانداریی میوانانی دەکرد.
ئێستا باوکم خاوەن ژن و خاوەن دوو منداڵ بوو و، ئەرکی سەرداری خێزانییش هەر خواردن و جلوبەرگ نەبوو، کە ئەویش هەر بەخێری باپیرم دەستدەکەوت. بۆیە، دەبوایە بەهەر جۆرێک بێ کاروبارەکانی خێزانەکە ڕێکبخا. ناوچەی زەرداو وەقفی تەکیەی تاڵەبانی بوو، یەک لە ئەندامانی خانەوادەی گەیلانی، لە بەرانبەر ئەو خانووەی هیی شێخ عەبدولڕەحمانی باپیرە گەورەمان بوو و، هێشتا لەبەردەم دەرگای سەرەکیی مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بەپێوەبوو، ئەو زەوییانەی وەقفی تەکیەی تاڵەبانی کردبوو.
باپیرەم، کە خۆی و موریدەکانی سەردانی مەرقەدی شێخی گەیلانییان کردبوو، ئەو خانووەی کڕیبوو و وەک وەقفیش پێشکەشی حەزرەتی گەیلانیی کردبوو تا ببێتە دیوانی نەقیبی ئەشرافەکانی شار و، ماڵێک بۆ نیشتەجێبوونی خانەوادەکەی.
عەبدولکەریم وادی ئاغای وەکیلی باپیرم ئەو ناوچەیەی بەڕێوەدەبرد، بەڵام کە ئینگلیزەکان عێراقیان داگیرکرد، عەبدولکەریم ئاغا لە بەرایی ئەوکەسانەبوو کە هاوکارییان کردن و، ئەوانیش کردییانە بەڕێوەبەری ناحیەی زەنگەنە و ئیدی بە بەریتانییەکانەوە لەخۆی بایی بوو و هیچ گوێی بە باپیرم نەدەدا و، بگرە کە باپیرم سەردانی گوندەکەی کردبوو ئەو ڕووی گرژ کردبوو و بەڕەقی قسەی لەگەڵ کردبوو.

جا باوکم شـوێندی خواردبوو، بەهەر نرخێک بێ، دەبێ لە گوندیی دەربکا، ئیدی ناوە ناوە بەخۆ و بە چەند پیاوێکی کەرکووکەوە ســـــەریان لە گوندەکە دەدا و، پەیوەندیی لەگەڵ هەندێ جووتیاری گوندەکە پەیداکرد و، ئیدی بێ ئەوەی پرس بە عەبدولکەریم ئاغا بکا کرێی زەوییەکانی لە جووتیارەکان وەردرگرت.

جووتیــارەکــانی گونــدەکە ســـــەربە چەنــدین هۆزی جودابوون، زەنگەنەی لایەنگری عەبدولکەریم ئاغا و ســــتووری و ئۆمەربل و داودە و.....تاد، یەکەمین جووتیارەکانی لای باوکمیان گرت ئەوانەبوون کە زەنگەنە نەبوون. جووتیارەکان لەدەسـت سـەرانە و زوڵمی عەبدولکەریم ئاغا و برا و کورەکانی تالآویان چەشـــــتبوو، بۆیە ئەوەندە بۆ باوکم گران نەبوو جووتیارەکان بەلای خۆیدا ڕاکێشـــێ و عەبدولکەریم ئاغای پەرگیر بکا. ئیدی ئەو کابرایە ناچاربوو ڕەو بکا و بچێتەوە ناوچەی زەنگەنە و گوندەکە بەجێبێڵێ.

## گواستنەوە بۆ گوندی زەرداو:

گوندی زەرداو دەکەوێتە باشـــووری کفری و ٢٣ کیلۆمەتری لێ دووره و، ئەو ڕێیەی پێیدەڵێن "سوڵتان- شاری" بەناو زەوییەکانی ئەو گوندەیدا دەڕوا و ڕووبەری زەوییەکانی گوندەکەش ١٣ هەزار دۆنمە، جۆگە ئاوێکی شـــۆری تێدایە چونکە لە دۆڵێکی خوێیاوی هەڵدەقوڵێ، هەر ئەو ئاوە ســـەرچاوەی ئاوی خواردنەوە و ئاودانی ئاژەڵ و داچاندنی ڕووبەرێکی کەمی ســـەوزەی هاوینان و گەنم و جۆی زســـتانانە. گوندەکەش، بۆیە ناوی لێنراوە زەرداو چونکە جۆگەکەی سەرواڵە و با قرشوقاڵی پەرێز و کۆدەران بۆناو ئاوەکە ڕادەماڵێ و ئاوەکە ڕەنگی زەرد دەبێ. هەرچی ئەو زەوییانەشن کە بەنۆرە گەنم و جۆیان لێ دەچێنن، ئەوا پشـت بە باران و ســەرکردنی ئاوی دۆڵەکان دەبەستێ کە دوای ئەوەی کۆدەبنەوە بەکفریدا ڕەتدەبن و دەڕژێنە ناو ڕووباری عوزێم. گوندییەکان بەنداوی خۆڵ دروست دەکەن تا ئاوەکە گلدەنەوە و دوایەش بەو جۆگانەی ئامادەیان کردوون کێڵگەکانی گەنم و جۆیان پێ ئاودەدەن، بەڵام ناوچەکە ســاڵانی بێ بارانیی یەک لە دوای یەک بەخۆوە دەبینی کە هەژاری بەڵا بۆ خەڵکی گوندەکە دێنێ، بەڵام کە ســاڵانی دواتری بارانێکی باش دەباری ئیدی دەبووژێنەوە و ژیان و خۆشی دەگەڕێتەوە گوندەکە.

ساڵانی بێ بارانی بارودۆخی گوندەکە زۆر ئەستەم دەبێ، سەرەتای پاییزێ جووتیارەکان دەســـــت بە کێڵانی زەوی دەکەن ودانەوێڵە تۆ دەدەن و، تەنێ برێکی کەمی بۆ خواردن هەڵدەگرنەوە و چاوەڕێی بارانێ دەکەن تا تۆوەکان ســـەوز ببن. لە ســـــاڵانی بێ بارانی ئەگەر ســــەرەتا باران بەدرەنگ بکەوێ و تۆوەکان شـــین نەبن یان ئەگەر باران بباریێ و کێڵگە ســەوزبن و دواتری باران ببڕێ، ئەوا بنەتۆ و ماندووبوون و زەوی کێڵانیان دەبێتە زەرەر و لە ڕزقی ساڵێکیان بێبەش دەبن. ڕەنگە وشکەساڵییش چەندین ساڵ بخایەنێ و جووتیار هەرچیی هەیەتی لەدەستی بچێ. هەرکە تۆوەکان شـین دەبن و لاسکی گەنم و جۆ بـاڵا دەکەن و، دواتری کە پەژموردە دەبن، ڕوخســــاری جووتیـارەکـانیش لەگەڵ پەژموردەبوونییان پەژموردە دەبن و لەگەڵ زەردهەڵگەرانی گەڵای گەنمیش ڕوخســاریان زەردهەڵدەگەڕێ. ئاخر بە تاقیکردنەوەی پێشتری دەزانن چ ژیانێکی تەنگ چاوەڕێیان دەکا و، چۆن قەرزی سـووخۆرانیان لەسـەر کەڵەکە دەبێ ودەبنە نێچیری هەشتپێیەکی، مەگەر ســـــاڵێ هات و بەبارانی بەدوادابێ، دەنا ناتوانن لەدەســـــتی دەرباز ببن. ئیدی ئاوا لە بازنەیەکی بەتاڵدا خول دەخۆن.

باوکم گوندەکەی بەڕێوەدەبرد، گوزەرانی ئێمە لە خەڵکەکەی دیکە باشــــتربوو، بەڵام کە وشـــکەســاڵی ڕیزیان دەبەســت، ئەواهەر ســاڵێک بەرگەمان دەگرت، دواتری گوزەرانمان

لەگەڵ جووتیارەکان بەرەو خراپی دەچوو و قەرزی خاوەن دووکان و سووخۆرە عەللافەکانمان لەسەر کەڵەکە دەبوو.
ئەو جووتیارانەی بە سەلامەتی لە بەڵای وشکەساڵی دەردەچوون ئەوانەبوون کە هەندێ دانەوێڵەیان هەڵگرتبوو و ڕانەمەڕێکیشیان هەبوو و کە باراشیان تەواو دەبوو هەندێ سەرمەڕیان دەفرۆشت تا باراشی پێ بکڕن. هەرچی هەژارەکان بوون، بۆ ماوەیەک گوندیان بەجێدەهێشت و لە ڕێگەکێشان و هێڵی شەمەندەفەر یان ناوچە بەراوەکانی "زەنگاباد" کاریان دەکرد.
گوندی زەرداو قوتابخانەی نەبوو تا منداڵانی جووتیارەکان تێیدا بخوێنن و، سەرباری بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و پەتای وەک تیفۆ و مەلاریا و کۆکەڕەشە و نەخۆشییەکانی چاویشەش، کەچی نەخۆشخانەی تێدا نەبوو، تاکە نەخۆشخانەی هەشبوو نەخۆشخانەی کفری بوو، بەڵام دەرمانی کەم بوو. دکتۆر فەکت، کە تاکە پزیشکی قەزایەکەبوو، لە وەڵامی پرسیاری پشکنەری وەزارەتی تەندروستی، داخوا کە دەرمان نامێنێ چ دەکا؛ وەڵامەکەی ئەوەبوو کە گوتی: "نووشتە بۆ نەخۆشەکان دەنووسم".
مزگەوتێک لە گوندەکە هەبوو و وەک خانووەکانی گوندیش هەر لە خشت و قوڕ دروستکرابوو و نوێژکەر نوێژیان تێدا دەکرد و "مەلا"یەک ، بەرانبەر زەکات و سەرفیترە و یارمەتیی جووتیاران، پێشنوێژیی بۆ دەکردن، بە بەرانبەرێکی کەمیش منداڵی جووتیارەکانیشی فێرە قورئان دەکرد، جا چ پارە بووایە یان هەر پێداویستییەک. زۆربەی کاتیش، لە گوندەکانی کوردستان، مەلا تاکە سەرچاوەی بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی ئایینی و نەتەوەیی بووە.
جووتیاران ئازووخە لە کەندووی لەقوڕ دروستکراو هەڵدەگرن و ڕۆنیش لە "هیزە" هەڵدەگرن، کە لە کەندوویکی قوڕدا هەڵدەگیرێ و پێیدەڵێن هیزەدان، ئەو خانەوادانەی دەستیان بڕۆیشتبا سەندووقی داریان هەبوو و شەکر و چا و شتی دیکەی تێدا هەڵدەگیرا و، ڕووەکەی بە ئاوێنەیەک دەڕازێندرێتەوە و زاوا، لە مارەیی، لەگەڵ هەندێ ڕایەخ و لێفەی خوری پێشکەشی بووکێی دەکا.
ناوەندی ژووری هەر خانەوادەیەکیش چاڵێکی لێیە و سێ پێچکەی ڕوو لەسەرەوە یان سێ بەردی ڕێکی لەسەر لێواری داندرایە و پێیدەڵێن کوانوو"ئاگردان، کوانووش بۆ خۆگەرکردنەوە و چێشتلێنان و ئاو گەرمکردن و شیر و چایە .
ئەو کوانووە مانا و داتاشراوی زۆری لای کوردان هەیە و وشەی "وەجاغ"یشی لەجیاتی بەکاردێ کە وشەیەکی تورکمانییە. ئەو وشەیە لە زۆر پەندی کوردی بەکارهاتووە، بۆ نموونە بۆ پیاوی ڕژد و چنۆک دەڵێن: "مریشک دەتوانێ هێلکەی لە وەجاغیدا بکا"، ئەوەش

مانای وایە چێشـــت لێنانێ و نانی ناداتە کەس. بۆ ئەو کەســـەی کوڕی نەبێ یان کوڕێکی خراپ و نابەڵەدی هەبێ، دەڵێن : "وەجاغی کوێرە" ئەگەر وەسـفی کەسـێکی لێوەشـاوە و شکۆدار و بە جێ و ڕێ بکەن، دەڵێن: "خاوەن ئاگردانە" ئەگەر بشیانەوێ تەشەر لەیەکێک بدەن، دەڵێن: "وەجاغت کوێربێتەوە" ئەوەش نزا و تووکی مردنە و کەسیشی لەپاش بەجێ نەمێنێ. زۆر جارانیش شـــوێند بە وەجاغ دەخۆن و دەڵێن :"بە هەقی ئەو وەجاغەی"ڕەنگە ئەوەش پاشماوەی بڕوای مەجووسییان بێ.

باوکم، زۆربەی کات لەگەڵ پیاوە بە وێڵەکانی گوندی لە دیوەخان دادەنیشـــت. دیوەخان هۆڵێکی درێژە و لە خشـــت و قوڕ دروســـتکراوە و ســـەری بە دار و قامیش گیراوە و ئاگردانێکی گەورەی لە لای پێشـەوەی هەیە کە زسـتانان بۆ خۆگەرمکردنەوە و قاوەلێنان بەکـاردێ و ئەوەنـدەیشـــی ئـاگر لێ کراوەتەوە لەبەر دووکەڵ میچ ودیواری هەموو رەشـبووە. ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە شـێخی گوندی جێگە و پێگەیەکی هەیە و بەخشـندەیە. ئیدی جووتیارەکانی لێ کۆدەبوونەوە و بەزۆرییش ئەوانە دەهاتنە دیوەخان کە زۆریان کار نەدەکرد و شەوانە باسی کاروبارەکانی ژیان و کشتوکاڵ و بابەتی دیکەیان دەکرد و چا و قاوەیان لەلای شێخ دەخواردەوە.

پەیوەندییەکانی باوکم لەگەڵ جووتیاران لە هیی ئاغاکانی دیکەی ناوچەکە جودابوو. ئاخر باوکم لە تەکییەی تاڵەبانی و لەسەر ڕەوشتی دروست و مامەڵەی باش و سادەیی و ڕووخۆشی و بەخشندەیی پەروەردە ببوو. جووتیارەکان ئێمەیان وەک نموونە دەهێنایەوە و دەیانگوت : "ماڵی جووتیارەکانیان پێنازانن"ئەوەشـیان وەک ڕەوشـت پاکیی ئێمە دەگوت و، کە یەکێکیشـــیان نەخۆش بکەوتایە هانایان بۆ باوکم دەهێنا، باوکیشـــم، ئەگەرچی زانیارییەکی کەمی لەو بابەتانەدا هەبوو، بەڵام بەدەمیانەوە دەچوو و ســـەرپەرشـــتیی نەخۆشـــەکانی دەکردن و لەو دەرمانانەی دەدانێ کە لە نەخۆشـــخانەی کفری دەیهێنان. زۆربەی نەخۆشـــەکـانیش ئەوانەبوون کە تووشـــی مەلاریـا و تەراخۆمـا ببوون و چارەســـەریشـیان دیار و دیاریکراوبوو. جاری وا هەبوو جووتیارێک لە قســـەیەکی کاتی تووڕەیی باوکم زویر دەبوو، ئیدی پەشـــیمان دەبووەوە و بەخۆی دەچووە ماڵەکەی تا ئاشتی بکاتەوە و دڵنەوایی بکا و، ئەگەر یەکێکیشیان تووڕەبووایە و بۆ گوندێکی دی باری بکردبـایە، خۆی دەچوو و دەبووە میوانی و داوای لێبووردنی لێ دەکرد و دەیهێنـایەوە گوندی.

گوندەکە نزیکەی ســـەد ماڵ دەبوو، هەندێ جووتیاری دەوڵەمەند لە گوندی هەبوون و گوزەرانیان لەخەڵکی دی باشـــتربوو. جووتە ئێســـتریان بۆ جووتی هەبوو، کە بەهێزترین ولاغی جووتییە لە کوردســـتان. ئێ واش هەبوو چەند ســـەد ســـەر مەڕ و بزنی هەبوو و

چەند مانگایەک و ئەسپێکی سواری و چەندین مریشک و چەکێکی باشیش ٚچ دەمانچە و چ . تفەنگ ٚ.

هەرچی جووتیارەکانی دیکە بوون، دوو کەریان بۆ جووتی هەبوو و چەند ســـەر مەڕ و مانگا و هەندێکیان تفەنگیشــیان هەبوو، چەک لای خەڵکی گوندەکان وەک پاشــەکەوتە، کە پارەی هەبوو چەکێک دەکڕێ تا خۆی و ســەروماڵی پێ بپارێزێ و، کە تەنگدەســتیش بوو دەیفرۆشێتەوە و کە باری داراییشی باشبووەوە دەیکڕێتەوە. جا کە دەڵێن کورد کە پارەی هەبوو یــان ژنێ دێنێ یــان چەکی دەکڕێ، ئەوە ئەو قســـەیە لەوەیرا هــاتووە. هەرچی نەدارەکانیش بوون، بەپێی ئەو دۆخەی باوبوو، بەرانبەر هەندێ بەروبووم، لای خەڵکی دی کاریان دەکرد.

خۆراکی جووتیاران، دەوڵەمەندەکانی لێ دەرچێ، بەحاڵ تێری دەکردن. خواردنی باویش نان و چا یان نان و ماست بوو، زۆر بەکەمی گۆشتیان دەخوارد، مەگەر لەبۆنەکانی وەک جەژن یان کە خێرۆمەند خێریان بکردایە، جا ڕۆنی ئاژەڵ و کەرە و هێلکە جێی گۆشــتیان دەگرتەوە.

## له سه‌فه‌رێ، ڕێگر ڕییان لێ گرتین:

له‌و ڕووداوه سـه‌یرانه‌ی  له‌و  سـالآنه‌دا به‌سـه‌رمان هات، ئه‌وه‌بوو که له سـه‌فه‌رێکی له زه‌رداوه‌وه بۆ که‌رکووک ده‌چووین، ڕێگر به چه‌که‌وه له نزیک که‌رکووک ڕێیان لێ گرتین
.

ئه‌وزاره‌کانی گواستنه‌وه له بیسته‌کان"سه‌ده‌ی رابه‌دوو"ژماره‌یه‌کی که‌می ئۆتۆمۆبیل بوو، که ئه‌وده‌مای هه‌بوون و له‌ناو خه‌ڵکه‌که پێیان ده‌گوترا "ئوم لۆکه" ئۆتۆمۆبیلی جۆری فۆرد بوو ، سـه‌رمیچه‌که‌ی قوماشـبوو و له دوولاوه ده‌کرایه‌وه، چه‌رخه‌کانی له دار و ئاسن دروسـتکرابوو و دو گێڕی هه‌بوو یه‌ک بۆ پێشـه‌وه و یه‌کیش بۆ دواوه، به‌گوڕترین خێراییشـی ٢٥ کیلۆمه‌تربوو له سـه‌عاتێکدا، زۆرجاران تێکده‌چوو و تایه‌ی ده‌رده‌چوو و ده‌یانخسـته‌وه جێی خۆی، ئه‌وه‌ش کاتێکی زۆری ده‌برد. سـه‌فه‌ری نێوان گونده‌که‌مان و که‌رکووک ڕۆژێکی ته‌واوی ده‌برد. جا ده‌بووایه زوو به‌ڕێکه‌وین و خۆ له سـه‌رما و گه‌رمای ڕێ بپارێزین و، ده‌بووایه بایی ڕۆژێکیش خواردن و ئاو له‌گه‌ڵ  خۆمان ببه‌ین و، سه‌رباریش ده‌بووایه خۆ له ڕێگران بپارێزین.
ڕووداوه‌که‌مان ئه‌وده‌می به‌سـه‌رهات که دایکم له‌به‌ر له‌دایکبوونی عه‌تای خوالێخۆشـبووی برام نه‌خۆشکه‌وت، جا قه‌زای کفرییش له پزیشکێک و برینپێچێک و سسته‌ریکی نه‌شاره‌زا پتری لێ نه‌بوو، ئیدی نه  پزیشـکی پسـپۆڕی نه‌خۆشـیی ژنان و نه ئیی دیکه‌ی لێبوو. تاکه خه‌سـته‌خانه‌ی کفرییش ئه‌و خانووه‌بوو که هیی سـه‌ید سـه‌لمانی باوکی سـه‌ید یاسـین ئه‌لهاشـمی بوو و دیوه‌خـانه‌که‌ی بۆ پزیشـکه‌که کردبووه عه‌یـاده‌ی ده‌ره‌کی و له حه‌ره‌مسـه‌راش ته‌نیا چوار قه‌ره‌وێڵه‌ی دانابوو، زۆرجارانیش ده‌رمانیان لێ ده‌بڕا و جۆری ده‌رمـانه‌کـانیش زۆر دیـاریکراوبوون. ئیـدی خه‌سـته‌خـانه‌که بێ ده‌رمـان ده‌بوو و شارۆچکه‌که‌ش هیچ ده‌رمانخانه‌یه‌کی لێ نه‌بوو ده‌رمان بفرۆشێ.
باوکم ئۆتۆمۆبیلێکی فۆرد" ئومۆللوکه"ی به‌کرێ گرت، کاره‌کانی سـه‌فه‌ری ئاماده‌کرد و له‌گه‌ڵ گه‌ردی به‌یانی له‌گوندی چووینه‌ده‌رێ، ئه‌وده‌می ته‌مه‌نم دوو ساڵ بوو و، منداڵ له‌و ته‌مه‌نه ڕووداوه‌کـانی به ته‌واوی به‌بیرنـایه‌ته‌وه ، به‌ڵکو ئه‌و ڕووداوانه‌ی به‌بیردێته‌وه که دڵخۆشیان کردووه یان تۆقاندوویانه و، ره‌نگه دواترێ هه‌ندێ برگه‌ی دیکه‌ی ڕووداوه‌کانی گوێ لێبێ و پێیوابێ دیتوویه‌تی.
دایکم هیلاک و نه‌خۆش بوو و عه‌تای سـاوای برامی له باوه‌ش بوو،عادیله‌ی خوشـکیشـم له‌ته‌نیشـتی بوو که ته‌مه‌نی چوار سـاڵ بوو. باوکم له‌سـه‌ر کورسـیی پێشـه‌وه و له‌ته‌نیشـت شوفێره‌که دانیشتبوو وتفه‌نگێکی له‌و تفه‌نگانه به‌ده‌سته‌وه‌بوو که سوپای تورکان به‌کاریان ده‌هێنا و، منیش له باوه‌شی بووم.

ڕێی نێوان کفری و کەرکووک قیرتاو نەکرابوو، زۆرجاران لەبەر باران و ئاوەڕۆی زستان سەفەر نەدەکرا و سەر دۆل و رووبارەکانیش پردیان نەبوو، دەبوایە ئۆتۆمۆبیل بەیارمەتیی ئەو پیاوانە لە دۆڵ و ڕووبارەکان بپەڕێتەوە کە بەرانبەر برەپارەیەک پاڵیان بە ئۆتۆمۆبیلەکانەوە دەنا.
سەفەرەکە ڕۆژێکی تەواوی خایاند، درەنگی ئێوارێ گەیشتینە سەر رووباری خاسەی باشووری کەرکووک، دنیا تاریک داهاتبوو. بنکەیەکی پۆلیس لەسەر گردێکی نزیک جێی پەڕینەوە بۆ پاراستنی ڕێبواران داندرابوو، بەشی هەرەزۆریی ڕێیەکەش لەباوەشی باوکم نووستبووم، بەدەنگی تەقە و نەڕاندنی باوکم بەئاگاهاتم"کوڕە کێن". تفەنگەکەی بەدەستەوەبوو و دوو فیشەکی تەقاند، ئەوجا ئۆتۆمۆبیلەکە لایدا تەنیشت ڕێیەکە و ڕاوەستا. ئەو دیمەنەم لەبیرە چونکە لە تاریکی و لە بلاچەی ئەو تەقانەش دەترسام کە لێیان دەکردین و بەرگریی باوکیشم. لە سەروبەندی ئەو ڕووداوەی دایکم گوتی منداڵەکەی لەباوەشی بەربووەتەوە و کەوتووەتە دەرێی ئۆتۆمۆبیلەکە.
پێدەچوو ڕێگرەکان باوکمیان بە دەنگی ناسیبێتەوە، ئیدی تەقەیان ڕاگرت و دوور ڕاوەستان وچاودێرییان دەکرد. باوکم و شوفێرەکەی گاورێکی کلدانی کەرکووک بوو و ناوی "بەسراوی" بوو، لە ئۆتۆمۆبیلەکە دابەزین و خەریکبوون لەبەر ڕووناکیی تەڵە شقارتان لە منداڵە ساوایە ونبووەکەی دەگەڕان، واتە عەتای برام. کە ئەشقیایەکانیش بەوەیان زانی، ئەوانیش لێی دەگەڕان، ئیدی عەتای برامیان دیتەوە و کە تەمەنی چەند ڕۆژێک بوو و خوێنیش لە سەری و لە دەموچاوی دەهاتەخواری. بەڵام ئیستا چ بکەین؟ ئۆتۆمۆبیلەکە چەند گوللەیەکی پێکەوتبوو و پەکی کەوتبوو، وەک زانیشم "عەزیز بەرقی" ڕێپێدراوی پۆلیس کە ڕۆڵەی خانەوادەیەکی تورکمانی کەرکووک بوو، لەگەڵ چەند پۆلیسێک گەیشتبووە جێیەکە و ئەوجا لە مەخفەری پۆلیسەوە بە تەلەفۆن پەیوەندیی بە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی کەرکووکەوە کرد، ئۆتۆمۆبیلێکیان بۆ ناردین و ئێمەی گەیاندە نەخۆشخانەی کەرکووک تا چارەسەری دایکم و عەتای برام بکەن. دیمەنێکی دیکەشم لەبیرە و دێتەوە بەرچاوم، من وعادیلەی خوشکم چەند ترسابووین ئیدی عەزیز باقیی موفەوەز ئێمەی بردە لای شەکەرات فرۆشێک و هەندێ نوقڵی بۆ کڕین و هێوری دەکردینەوە و ترسی دەڕەواندینەوە دەیگوت هەموو شتێک باشە و دایک و باوکتان دێنەوە.
دوایە دەرکەوت شەقاوە ڕێگرەکان سەر بە یەک لە تاڵەبانییەکانی گوندێکی نزیک کەرکووک بوون. ئیدی دەنگی باوکمیان ناسیبووەوە و دەستیان لە تەقە هەڵگرتبوو و ئەو

تاڵەبانییەش برادەرایەتییەکی بەهێزی لەگەڵ باوکم هەبوو"خوا عەفووی بکا و لە گوناهانی ببووریٚ".

ژنانی خۆشگوزەران هەندیٚ خشڵی زێڕیان هەڵدەبژارد و وەک پێشەکیی مارەیی پێشکەشیان دەکرا، دایکیشم بڕە خشڵێکی باشی هەبوو و لەناو کیسەیەکی قوماشی دانابوو و لەگەڵ خۆی هێنابوویە ناو ئۆتۆمۆبیلەکە، بەڵام لە هەرای ئەو ڕووداوە و لەبەر نەخۆشییەکەی و لەترسی ئەوەی نەکا ساوایەکەی لیٚ ونبیٚ، زێڕەکەی لەبیرکردبوو. ڕۆژی دواتریٚ، کە شوفێرەکە ئۆتۆمۆبیلەکەی چاککردبووەوە و دایکیشم لە نەخۆشخانە دەرچوو، شوفێرەکە کیسەکەی هێنایەوە و گوتی: "دەزانم ئەو کیسەیە زێڕی تێدایە، بەڵام خوا ئاگادارە نەمکردووەتەوە و نازانم چەندی تێدایە. چۆن بووە ئاوام بۆ هێناونەتەوە". باوکم ویستی لەپای دەستپاکییەکەی خەڵاتی بکا، بەڵام ڕەتیکردەوە و گوتی: "ئەگەر ئێوە نەبوونایە شەویٚ دینیٚ ڕێگرەکان دەیانکوشتم، خوا لەسایەی ئێوە ڕزگاری کردم و ئەوەندەشم بەسە".

## کۆمەڵەی ئازادیی کوردستان:

کۆمەڵەی ئازادیی کوردستان[6] لە سلێمانی دامەزرا و، گەیشتە بەشی هەرەزۆری شارەکانی کوردستان و، کەسایەتییە دیارەکانی لە سلێمانی دایانمەزراند بریتیبوون لە بەڕێزان جەماڵ بابان و محەممەد عەبدولڕەحمان و شێخ محەممەد کولانی و عەلی باپیر ئاغا و باوکیشم یەک لە موڵکدارە ڕۆشنبیرەکانی قەزای کفری بوو و، هەندێ ڕۆشنبیریی لای مەلاکانی کەرکووک وەرگرتبوو و، لەسایەی باوک مامەکانیشیدا ژیابوو و تەکییەی تاڵەبانیی کەرکووکیش، سەرباری ئەوەی جێی خواپەرستی و زیکر و سۆفیگەری بوو، پێگەیەکی زانا و شاعیر و ئەدیبانیش بوو و، هەر ئەو خانەوادەیەش شاعیری دیاری لێ هەڵکەوتووە، وەک زانا و سۆفی و شاعیر شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی و شێخ عەبدولقادری کوڕی "فائیز" و شێخ محەممەد خاڵسی.

باوکم، کە گواستییەوە بۆ زەرداوی قەزای کفری، پەیوەندیی لەگەڵ پیاوە دیارەکانی ئەو قەزایە دروستکرد. محەممەد جافی کرابووە نائیبی کفری، لە دۆستە هەرە نزیکەکانی بوو و، محەممە بەگیش، چونکە پەیوەندیی بە زۆربەی نائیبە کوردەکانی پەرلەمانی بەغدا هەبوو، ئیدی ئاگای لە دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە هەبوو، ئیدی لەگەڵ باوکم و شێخ جەماڵ تاڵەبانی ڕێککەوت لقێک لە ناوچەی کفری بکەنەوە و هەستی نەتەوایەتی لە ناوچەکەدا بڵاوبکەنەوە. سەرەڕای ئەو دووەیشیان، دیارترین ئەندامەکانی لقەکەی کفری بریتیبوون لە سەعیدەفەندیی موفتیی زانای ناسراوی ئایین و سەعید وەنداوی و وەستا ساڵحی بەرگدروو.

ئەو کۆمەڵەیە، لە ساڵی ١٩٢٩ڕا و دوای ئەوەی کوردستان بەیەکجاری بەعێراقەوە لکێندرا و عێراق بووە ئەندامی کۆمەڵەی نەتەوەکان ، دەستی بە چالاکییەکانی کرد. ئیدی ئۆتۆنۆمی بووە ئامانجی سەرەکیی ئەو کۆمەڵەیە و، بۆ ئەو ئامانجەش شەش نائیبی ئەنجوومەنی نیشتمانی نووسراوێکیان دایە حکوومەتی عێراق و تێیدا داوای ئەوەیان کردبوو یەکە بەڕێوەبەرییەکانی زۆربەی دانیشتووانی کوردن یەکبخرێن، لیوایەکانیش بریتیبوون لە سلێمانی و هەولێر و کەرکووک و قەزا کوردەکانی لیوای موسڵ و قەزای خانەقینی لیوای دیالە و، یان ئۆتۆنۆمییان بدرێتێ یانیش بەڕێوەبردنی لامەرکەزی. ئەو

---

[6] _ کومەڵەی ئازادیی کوردستان : لە ١٩٢٩ دامەزرا و بنکەی سەرەکیی لە سلێمانی بوو جەمال بابان بە سەرۆکی ئەو کومەڵەیە هەڵبژێردرا. ئامانجی سەرەکیی سەربەخۆیی کوردستان بوو، هەر خێراش کەسایەتییە ڕۆشنبیرەکان و ئەفسەرانی بەلای خۆیدا راکێشا، بەلام دوای ئەوەی حکوومەتی عێراقی داواکارییەکانی ڕەتکردەوە و پەیمانی ١٩٣٠ی مۆرکرد، کومەڵەکە شکستی هێنا. بۆ زانیاریی پتریش بڕوانە : لازاریف و کەسانی دی، مێژووی کوردستان، وەرگێڕانی لە ڕووسیڕا ، عەبدی حاجی، چاپی ١ ٢٠٠٦ ، دهۆک، ل ٢١٧-٢٢٥.

شـەش نائیبەش ئەندامی کۆمەڵەی ئازادیی کوردسـتان بوون و بریتیبوون لە هەریەک لە: "جەماڵ بابان، محەممەد جاف، ئیسـماعیل ڕواندزی، سـەبغەتوڵلا موفتی و، حازم شـەمدین ئـاغـا". کەچی حکوومەت داوایەکەی ڕەتکردەوە و ڕووی لەوەی بوو ئەو کۆمەڵەیە هەلوەشـێنێتەوە و ئەوەیشـی بە هەوڵی پۆست بەخشـینە ئەندامەکانی کرد و بەرژەوەندیی تایبەت و فەرمانبەریی حکوومەتی بە ئەندامەکانی نیشـاندا. دواتری جەماڵ بابان کرایە وەزیر و زۆربەی ئەندامەکانیشـی پۆسـت و فەرمانبەریی حکوومەتیان درایە و، کە گەورەش بووم، باوکم بەجەخارەوە قسـەی بۆ دەکردین و زانییشـی من و ژمارەیەک قوتابی کۆمەڵەیەکمان بەناوی "دارکەر" دامەزراندووە و، ئەو کۆمەڵەیەش دواترێ و پاش ساڵێک تەمەنی، بووە حیزبی هیوا.

ئەندامە دیارەکانی کۆمەڵەی ئازادی لە شـارەکانی دیکە بریتیبوون لە ئیسـماعیل بەگی ڕواندزی و حـازم شـەمدین ئـاغـای زاخۆیی و ڕەئووف بەگی جەلالیی کەرکووک و محەممەد جەودەت و سـەبغەتوڵلا موفتیی هەولێر.

## قەزای کفری:

کفری ناوەندی قەزایەکی فراوان بوو، لەلای باکووررا لەنزیک شـــارۆچکەی دووزەوە درێژدەبووەوە و ناحیەکانی قەرەتەپە و ســـەرقەڵا و پێبازی دەگرتەوە. ئەو قەزایە لەلای خۆرهەلات دەگەیشـــتە ســـەر تخووبەکانی چیای قەرەداغ و لە باشـــووریش تا گولالە"قەرەخـان" و لە خۆرئـاواشـــرا تـا زنجیرە چیـای حەمرین دەچوو.. زۆربەی دانیشتووانی ئەو قەزایەی کوردبوون و هۆزەکانیشی جاف و تاڵەبانی و دەلۆ و هۆرمزیار و زەنگەنە و هۆزی دیکەی بچووک بوون. تورکمان لە ناحیەی قەرەتەپە دەژیان و هۆزی جبوور و لهێبیش لە هەندێ گوندی نزیک حەمرین هەبوون.

کفری گەلێ خانەوادەی دیاری لێبوو، وەک خانەوادەی بابان و دیارترین کەسـایەتییشـی جەمیل بەگی کوڕی مەجید پاشـای بابان بوو و لەسـەردەمی عوسـمانلییان کە ناوچەکە بەشـێ بووە لە میرنشـینیی بابان، مەجید پاشـا قایمقامی شـارۆچکەکە بووە. خانەوادەی سـەیدیش لە شـارۆچکەکە هەن و پێدەچێ لە خانەوادەی بەرزنجەی ناسـراوبن و ئەوانە نەوەی شـێخ موحسـینن کە لە قەزای دووز شـاردراوەتەوە و پێشـترێ لەسـەر مەزەبی ئەهلی هەق بووینە و، سەید سەلمانی باوکی سەید یاسینی هاشمییش لە دانیشتووانی ئەو شـارە بووە و ئێسـتاش خانووەکەی ماوە و سـەید یاسـین هاشـمییش وەک پیرۆزییەکی خانەوادەی هاشـمیی"مەلیک فەیسـەڵی یەکەم" کە کراوەتە پاشـای عێراق و سـەید یاسـینی کوڕی سەید سەلمان و سەید تەهای برا، کە ئەفسەری سوپای عوسمانلی بووینە، لەگەڵیدا دەبن، ئیدی نازناوی هاشمیی دەدرێتێ.

خانەوادەی وەنداوییش لە خانەوادە دیارەکانی کفرین، وەک دیاریشـە جێی دروسـتبوونی ئەو خانەوادەیە گوندی "قەڵاوەندای"ە لەسـەر تخووبەکانی قەرەداغ. دیارترین کەسـایەتیی ئەو خانەوادەیەش بەڕێز عومەر نەزمیی کوڕی حاجی حوسێن و محەمەد حاجی عوسمان و سـەعید وەنداوین لەگەڵ خانەوادەی مووسـابەگ و عەزوابەگ و عەبدولکەریم وەنداوی. عومەر نەزمی زۆر پۆســـتی بەڕیوەبردنی وەرگرتووە، لەوانەش، پێش ئەوەی لە زۆربەی وەزارەتەکـانی عێراق ببێتە وەزیری نـاوخۆ، بووەتە موتەســـەڕیفی لیوای کەرکووک و پاشـان بووەتە جێگری سـەرۆکوەزیران و جەماڵ نەزمیی کوڕیشـی هەر بووەتە وەزیر و، هەندێ لە ئەندامانی خانەوادەکە پێیانوایە بنەچەیان تورکمانە.

لەسـەردەمی عوسـمانلیدا، زۆربەی تورکمانەکانیش خاوەنی ڕۆشـنبیری بوون، ئاخر ئەوان زمانەکەیان دەزانی و عوسـمانلییەکانیش پشـتیان بە تورکمانەکان دەبەسـتا، بۆیە زۆربەی ڕۆشـــنبیرەکانی شـــارۆچکەکە تورکمان بوون یان ئەوانە بوون کە تورکمانییان دەزانی و ژمارەیەکی زۆری خانەوادەکانیش لە بنەچەڕا کوردن.

ئەو شـــارۆچکەیە پشـــت بە بازرگانی دەبەســـتێ، بەتایبەتیش بازرگانیی دانەوێڵە و مەڕومالات و بەرهەمەکانی مەڕومالات و، زۆربەی دانیشتووانی هەردوو ناحیەی سەرقەڵا و پێباز لە هۆزی جاف و زەنگەنەن و ئەوانە زۆریان مەڕومالات هەیە و دەشـــتەکانیش دانەوێڵەیان لێ دەچێندرێ، بەتایبەت گەنم و جۆ، بازاڕێکی گەورەش لە شـارۆچکەکە هەیە و گوندییەکان چ کالایەکیان بوێ لەوێ دەســـتیان دەکەوێ، بڕێکی زۆری گەنم و جۆ و خوری و پەنیر و هێلکە و مریشک ڕەوانی بەغدا دەکران و لەوێشەوە بۆ دەرەوەی عێراق.
ئەو قەزایە تاڕادەیەک جێی کینەی حکوومەت بوو، لە ١٩٢٠ بە ســـەرکردایەتیی ئیبراهیم خان دژی ئینگلیزان ڕاپەڕین و، جێگری حاکمی سەربازیی سیاسیی بەریتانیی تێدا کوژرا، دواترێ کەوتە بەر هەڵمەتێکی ســـەربازیی زۆری ئازاری خەڵکەکە دا و، حکوومەتیش هەمیشە کەسایەتییە بەهێزەکانی دەکردە قایمقامی ئەو قەزایە، وەک بەڕێز ماجید مستەفا[7] و سەعید قەزاز[8] و جەمیل ڕەوحی و ناجی هورمزی.
ئەو ڕێیەی پێیدەڵێن"ســـوڵتانی- شـــاری"، بە نزیک شـــاری کفریدا دەڕوا. ئەوەش ڕێیەکی ســـتراتیژیی ناســـراوە و عێراق بە تورکیاوە دەبەســـتێتەوە و ئێســـتا پێیدەڵێن" ڕێی نێودەوڵەتی" و بەزاخۆدا دەڕوا و دوو لقی لێدەبێتەوە، یەکیان دەچێتەوە موســـڵ و ئەوجا بۆ بەغدا و ئەویدییان هەولێر و پردێ و کەرکووک و تازە و دووز و کفری و قەرەتەپە و گولاڵە و قزرابات "ســـعدية" وشـــارەبان و باقووبە و ئەوجا بەغدا. بۆ پاراســـتن و

---

[7] _ کەسایەتییەکی سیاسی و سەربازیی کوردی عێراقە، ساڵی ١٨٩٦ لە سلێمانی لەدایکبووە، لە ماوەی نێوان ١٩٣٩ _ ١٩٤٢ دا ئەندامێکی ســەرەکیی حیزبی هیوا بووە. خوێندنی لە قوتابخانەی ڕوشـدییەی سـلێمانی تەواوکردووە و پاشـــان بۆ تەواوکردنی خوێندن دەچێتە ئەســـتەمبوڵ و دەچێتە قوتابخانەی حەربییە، خوێندن تەواو دەکا و دەبێتە ئەفســـەر لە ســوپای عوســمانلی. وازی لە پێگەکەی ســوپای عوســمانلی هێناوە و چووەتەپاڵ شـۆرشـەکەی شـێخ مەحمودی حەفید لە سلێمانی. لە ناوچەی مەرگەی نزیک بنگردی سەر بە قەزای دووکان ٢٠٠ چەکداری لەبن دەستیدا بووە. لە زۆر نزیکەکانی شـێخ مەحمودی حەفید بووە و لە ١٩٢٧ بۆ دیداری مەلیک فەیسـەڵی یەکەم لەگەڵی چووەتە بەغدا، لەسەر ڕاسپاردەی شێخ مەحمودیش، مەلیک فەیسەڵ هەر ئەو ساڵە دەیکاتە بەڕێوەبەری ناحیەی عەزیزییەی لیوای کووت. لەسـەردەمی پاشـایەتیدا زۆر پۆسـتی وەرگرتووە، لە ٢ی ئابی ١٩٧٤ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕسـتانی غەزالییە شـاردراوەتەوە. نقلا عن میر بصـری، علام السیاسـة فی العراق الحدیث، ٢٠ جزءا، دار الحکمة، لندن، ٢٠٠٥، ج١، ص ٢٠٠-٢٠١.

[8] _ سەعید قەزاز: لە ١ی کانوونی دووەمی ١٩٠٤ لە سلێمانی لەدایک بووە. لەسەردەمی پاشایەتی دا چەندین پۆستی وەزاریی وەرگرتووە. دوای شـــۆرشـــی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ گیراوە و ڕەوانەی دادگای ســـەربازیی بالا کراوە "دادگای گەل" زۆری تۆمەت دراوەتە پاڵ، لەوانەش سەندنەوەی ڕەگەزنامەی عێراقی لە ژمارەیەک عێراقی و فەرمانی تەقەکردن لە خۆپیشـاندەرانی کە دژی سـاختەکاریی هەڵبژاردن خۆپیشـاندانیان کردووە، لە ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٥٩ لە سـێدارە دراوە. بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: خالد احمد الجوال، موسـوعة اعلام کبار سـاسـة العراق الملکی (١٩٢٠- ١٩٥٨) دار الشءوون الثقافیة العامة، بغداد ، ٢٠١٣، ص٢٩٣.

دوورەهەرەشەیی ئەو ڕێیەش گەلێ دەستە تورکمان لە زۆر سەردەمی جودا لەو ناوچانە نیشتەجێ کراون و باوەڕ وایە ئەوکارەش لە سەردەمی دەسەڵاتی سەلجووقییەکانڕا دەستی پێ کردبێ و دواتریش سەردەمی دەوڵەتی عوسمانلی. بۆ هەرەشەلێکردنی ئەو ڕێیەش، سەفەوییەکانی ئێران ژمارەیەک هۆزی تورکمانیان بەرانبەر ئەو ڕێیە نیشتەجێ کرد.

لە خانەوادەی بەڕێز سەلمان و منداڵەکانی بترازێ، واتە هەردوو بەڕێزان یاسین ئەلهاشمی و تەها ئەلهاشمی، کە هەردووکیان لە سەردەمی پاشایەتی بوونەتە سەرۆکوەزیران، مەگەر خوا، دەنا هیچ خانەوادەیەکی عارەب لەو شارەی نییە. خانەوادەیەک هەیە کە هەندێکیان بوونەتە کورد و هەندێکیش تورکمان، ئەویش خانەوادەی سەید ماڵەڵلای کوڕی سەید خەلەفە، پێشترێ لە باشووری کفری ژیاون و دوایە لەسەردەمی عوسمانلییان هاتوونەتە کفری، ئیدی سەید مستەفای بە "ڕیخەری" ناسرابوو خۆی و منداڵەکانی بوونە تورکمان و موبارەکی برایشی بەخۆ و بە منداڵەکانییەوە بوونە کورد.

هەرچی خانەوادەی سەید موحسین ئاغا و عومەر ئاغاشن، ئەوان دەچوونەوە سەر ساداتی بەرزنجە. پێدەچێ لەسەر مەزەبی ئەهلی هەق بووبن کە ئایینی تایەفەی کاکەییە و، ئەو خانەوادەیە ڕێورەسمی تازیەبارییان لە عاشوورا پەیڕەو دەکرد"ڕۆژی دەی موحەڕڕەم".

## شۆڕشی ئیبراهیم خان:

گرنگترین ڕووداوی ســـەدەی بیســـتەمی ئەو شـــارۆچکەیە ودەوروبەری ڕاپەڕینەکەی ئیبراهیم خان بوو.ئیبراهیم خانی کوڕی ســاڵح خان بەوەی دەناســرێ کە ســەر بە هۆزی دەلۆی کوردە و، ئیی واش هەیە پێیوایە ســەر بە هۆزی هۆرمزیاری لووڕە. بەشــێکی ئەو هۆزە لەناوچەکانی ســـــەر تخووبی هەردوو هۆزی دەلۆ و داودەی باکوور و خۆرهەڵاتی کفری نیشـــتەجێن و، بەشـــی هەرەزۆریشـــیان لە گوندەکانی باکووری شـــاری کەرکووک دەژین و، بەتایبەتیش میللیی کوردی. بەڵام نازانم چ پەیوەندییەکیان بەو هۆزانەوە هەیە و، یەک لە کەســایەتییەکانی ئەو هۆزەش، کە لیوا تاهیر یەحیایە، لەســەردەمی ســەرۆکایەتیی کۆماری هەردوو برا، عەبدولســەلام و عەبدولڕەحمان عارف، پۆســـتی ســـەرۆکوەزیرانی وەرگرتووە.ڕاپەڕینەکەی ئیبراهیم خانیش سەرەداوەکانی دەچێتەوە سەر شۆڕشی بیستی دژی بەریتانییەکان و، بەڵگەنامەکانیش ئاماژە بەوەی دەکەن کە پەیوەندیی بە ڕاپەڕینی خەڵکی تەلەعفەر و مووســڵەوە هەبووە و ، ئیبراهیم خانیش پەیوەندیی بە ســەرکردەکانی ئەو بزووتنەوە دژە بەریتانیانەوە هەبووە. ئاخر کە لە کفری هۆزەکانی دەلۆ و فەرفەتی ڕوغزایی هۆزی جاف هێرشـــیان کردە ســـــەر شـــــارۆچکەکە توانییان داگیری بکەن و "سیلمەن"ی ئەفسەری سیاسی بکوژن و بۆ ماوەی ٢٣ ڕۆژیش فەرمانڕەوایی شارۆچکەکە بکەن، بەڵام بەریتانییەکان، بەیارمەتیی شێخ حەمید تاڵەبانی، توانییان جارێکی دی کفری و دەوروبەری داگیرکەنەوە و شێخ محەممەدی شێخ ڕەزای تاڵەبانیی تێدا بکەنە قایمقام.
شـــێخ محەممەد پیاوێکی ڕۆشـــنبیر و شـــاعیر و ئەدیب بوو، یەکەم کاری لە کفریی کرد دامەزراندنی قوتابخانەی ســـــەرەتایی بوو لە شـــــارۆچکەکە. ئەوە یەکەم قوتابخانەی ئەو قەزایە بوو و ترووسکاییەکانی بەرایی هۆشیاریی نەتەوەیی بوو لەو شارۆچکەیە. ساڵی ١٩٢٩، کە لقی کۆمەڵەی ئازادیی کوردستان لە لایەن شێخ جەماڵی باوکم ومحەممەد بەگی جـاف دامەزرا و پـاشـــــانیش لقی حیزبی هیوا، لەلایەن من و محەممەد قەرەداغیی خوالێخۆشبوو کرایەوە و دوایەش لقی ئەو حیزبە لە هەریەک لە کەلار و زەرداو و، یەکەم بوونە ئەندامی ئەو حیزبەش شـــێخ ئەحمەدی شـــاکەلی بوو کە شـــاعیر و ئەدیب بوو. دوایەش مســتەفا بەگی کەریم جاف، دواتریش ئەو لقەی حیزب کەریم بەگ و داود بەگ و محەممەدئەمین کەریم بەگ و ئەحمەد بەراحمەی گرتەخۆ.هەرچی لقی زەرداو بوو، شـــێخ عەتا تاڵەبانیی برام یەکەم کەس بوو پەیوەندیی پێوەکرد، دواتر حەبیب حاجی محەممەد و ئەوجا شـــێخ محەممەد نەجیب تاڵەبانی و لە گوندی "دوازدەئیمام"یش عەبدولڕەحمان و محەممەد عەلی ئاغای زەنگەنە و فارس عەبدولڕەحمان هاتنە ناو حیزب.

## خوێندنی سەرەتایی:

باوکم، بە پێوەرەکانی ئەوسـەردەمی، ڕۆشـنبیر بوو. ئەو، لە تەکیەی تاڵەبانیی کەرکووک ژیابوو و پەروەردە ببوو حەزیشـی لێبووە هاودەمیی ڕۆشـنبیران بکا و بیروڕای ڕۆشنبیری و سیاسییان لەگەڵ شەن و کەو بکا.

ژمارەیەک ڕۆشـنبیر لە کفری هەبوون و زۆربەیشـیان تورکمان و کوردی بووە تورکمان بوون و، یەک قوتابخانەی سـەرەتاییشی لێبوو. لە سـاڵی ١٩٣٠، دوای کۆتاییهاتنی وەرزی کێڵان و تۆدان، خانوێکی لە کفری بەکرێ گرت تا زستانەکە لەوێ بەسـەرببەین، ئەودەمی پێنج سـاڵان بووم و ئەو تەمەنەش بۆ وەرگرتن لە قوتابخانە دەسـت نادا. بەڵام وەک ڕێزێک بۆ باوکم، بەڕێوەبەریی قوتابخانە ڕازیبوو وەک قوتابیی گوێگر وەرمگرێ و منیش حەزم لە قوتابخانەبوو تا لەجیاتیی ئەوەی لەماڵەوە بمێنمەوە لەوێ لەگەڵ منداڵەکان یاری بکەم، ئیدی چەند مانگێکم لە قوتابخانە بەسـەربرد، بەڵام وەرگرتنم وەک قوتابییەکی بەڕێوجێ کەوتە سـاڵی ١٩٣١. چوومە پۆلی یەک و بەبیریشـم دێ برادەرەکانی ئەودەمیم مسـتەفا کەریم بەگ جاف بوو، کە پاشـان لە سـەرۆکایەتیی هۆزی جاف جێی باوکی گرتەوە و، حەسـەن محەممەد ئەمین بوو، کە دواترێ بووە بەڕێوەبەری قوتابخانەی گوندەکەمان لە زەرداو.... تاد، منیش یەکەمی پۆلەکەبووم.

بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان مامۆسـتای بەڕێز ڕەشـید عاکف هورمزی بوو، کە خەڵکی کەرکووک بوو و لە مامۆستایەکانیش حەکیم مستەفا و عەبدوڵلا موسا بەگی وەنداوی و مەلاحوسـێن و خلووسـی بەگ ، کە ڕاکردووێکی دەسـتی کەماڵییەکان بوو و عەسـکەر مەحمود بوو کە دواترێ بووە ئامر لیوا بە پلەی عەمید و پاشـان بووە وەکیل وەزیری وەزارەتی کاروباری باکوور، لەگەڵ مامۆستایەکی عارەبیش.

قوتابخانەکە، بینایەکی کۆن بوو کە شـێخ محەممەد تاڵەبانی، ئەودەمی لە١٩٢٠ قایمقامی کفری بوو دروستی کردبوو و، لە کاتی کردنەوەی گوتبووی:

برباشـدە دماگ ئۆلمدیە باش بلەبوو..... قەدەر ئەگەر سـەر بەرنگارییەکی تێدا نەبێ سـەر نییە بر دیلدە مەعارف ئۆلمەدەنە بنجە کوتو کەدەر..... ئەگەر زمان ماریفەتێکی پێ نەبوو ئەنـدامێکی پەککەوتەیە کفری کەبەن بەریردە بو مەکەببەت نە بیۆ کەدەر..... چونکە ئەو قوتابخانەیە بۆ جێیەکی وەک کفرییە، ئای چەند مەزنە

سـاڵی ١٩٣١ چوومە قوتابخانە و تا کۆتایی سـاڵی خوێندنیش لەوێ مامەوە، پاشـان چوومەوە کەرکووک و کەوتمە ژێر چاودێریی شـێخ محەممەد عەلیی باپیرم و، باوک و دایکیشم لە گوندی زەرداو دەژیان، ئیدی لە پشووەکانی بەهار و هاوین دەچوومەوە لایان.

باپیرم پیاوێکی پیربوو و گوێی گران بوو و لە گەنجی گوللەیەکی بە قولەپێی کەوتبوو و دەشەلی وگۆچانی بەدەستەوەبوو. ئەو پیاوێکی بەخشندە و ڕووخۆش بوو و کەیفی بە ڕۆشنبیری دەهات و زۆرجاران پێیدەگوتم: "بخوێنە، کە خوێندنیشت لێرە تەواوکرد، ڕەوانەی ئەستەمبۆلت دەکەم تا وەک منداڵەکانی محەممەد پاشا داغستانی بچییە کۆلێژ".
محەممەد پاشای داغستانی سەرکردەیەکی سوپای عوسمانلییان بوو، کە ئینگلیزەکان هاتنە شوعەیبەی بەسرا، کرایە سەرکردەی ئەو هێزە عاشایەرییانەی دژی بەریتانییەکان جەنگان و، پێش ئەوەی بچێتە بەرەی جەنگیش ماڵ و منداڵەکانی ، واتە ژنەکەی و هەرچوار کچەکەی و کوڕەکەی ڕەوانی کەرکووک کرد تا لەژێر چاودێریی برادەری هەرەنزیکی بن کە ئەویش شێخ محەممەد تاڵەبانی بوو، بەڵام محەممەد پاشا لەوێ شەهید بوو و ماڵ و منداڵەکەی چوونە تورکیا و دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقیش هاتنەوە عێراق.
ڕێکەوتی سەیر ئەوەیە کە ساڵی ١٩٥٦، کاتێ حەوت ساڵی بەندیم تەواوکرد و ڕەوانەی شارۆچکەی بەدرەی سەر سنووری ئێران کرام و دواتریش بۆ نیشتەجێی زۆرەملێ گواسترامەوە کفری، ویستیان بە پۆلیس ڕەوانەی ئەوێم بکەن، بەڵام ملم نەدا؛ چونکە ئەوە پێچەوانەی یاسابوو و ئەوەی پێویست بوو دەبووایە وەک کارێکی یاسایی بچمە ئەوێ و لە تۆماری پۆلیسیش ڕێکەوتی گەیشتنەجێم تۆمار بکەم. لیوا وەجیە یونس داوای کردم تا ڕازیم بکا بەوەی ئەوکارە شکۆ شکاندن نییە و پیادەکردنی ڕێوشوێنی یاساش ڕووشکێنی نییە. دیتم ئەفسەرێکی بە پلەی عەمید ڕوکنی لەلایە، کە لە وەجیە یوونسیشییەوە زانی ناوم موکەڕەم جەماڵ محەممەد عەلی تاڵەبانییە، بەبیری هاتەوە باپیرم پێش چل ساڵ چۆن دڵی پێیان سووتابوو، هەستا و هاتە تەنیشتم دانیشت و گوتی: "دەزانی ئێمە ئامۆزاین، بەڵام یەکدیمان نەناسیوە؟ گوتم: جەنابت کێی؟ گوتی من غازی داغستانیی کوڕی محەممەد پاشا داغستانیم" ئەوجا لە ئەندامانی خێزانی شێخ محەممەد عەلیی پرسی و هەمووانی دەناسی، مامم و باوکم و میمکەکانم، ئەوجا ڕووی قسەی لە بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس کرد: "بەڕێز موکەڕەم ئامۆزامە، ئەگەر بە بەڵێنی من ڕازیبن ئەوا من بەڵێن دەدەم بەئازادی بچێتە کفری و ناوی خۆی لە تۆماری پۆلیس لەوێ تۆمار بکا و من کەفالەتیی دەکەم". جا بەڕێوەبەری گشتی گوتی: "ئەگەر ئەوە ئارەزووی جەنابتانە ئەوا تۆ ئەمردەکەی و لە ئیستاوە ئەو ئازادە لە چوونە کفری. ئەوجا بانگی ئەفسەری پۆلیسی کرد و فەرمانی پێکرد کەلوپەلەکانم لە ڕاگیرخانە وەرگرمەوە و یەکسەریش بەرمبدەن. خوالێخۆشبوو شێخ عەتای برام بە ئۆتۆمۆبیلەوە چاوەڕێی دەکردم، ئیدی گەیاندمیە لای ئۆتۆمۆبیلەکە و بۆ ماڵئاوایی دەستی کردە ملم، بەڵام بەڕێوەبەری گشتی داوای لێکردم

بەلای بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرکووکدا بڕۆم، کە موقەدەم حوسێن فەرید بوو، تا یەکدی بناسین و سەبارەت بە چاودێریی پۆلیسیش ڕێوشوێنەکانم بداتێ.
هەتا ساڵی ۱۹۳۳ لەژێر چاودێریی باپیرم لە قوتابخانەی "ناوەند"ی سەرەتایی مامەوە و لەو ساڵیدا باپیرم، کە تەمەنی لە نەوەت ساڵ بەسەرەوە بوو و، کەچی چاپووک بوو و نیشانەی پیریی پێوەدیارنەبوو، بە نەخۆشیی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد. باپیرم سواری ئەسپ دەبوو و دەچووە ڕاوێ و ڕقی لە سواری ئۆتۆمۆبیل دەبووەوە. بۆ کۆچی باپیرم زۆر خەمبار بووم، دوای ئەویش، شێخ محەممەد جەمیلی کوڕی بۆ ئیرشادی ئایینی جێیگرتەوە، ئەگەرچی میانەیان لەگەڵ باوکم خراپ بوو، کەچی باوکم ئامۆژگاریی دەکردم تا لەژێر سەرپەرەشتیی مامدا بم، چونکە لەپێگەی باوکمە و، ئەویش خۆشیدەویستم، بەڵام حەزی لێبوو واز لە قوتابخانە بێنم و شەریعەتی ئیسلامی بخوێنم تا ببمە پیاوی ئایین"مەلا" ئیدی لە لەوێ لە تەکییەی تاڵەبانیی کەرکووک لەژێر چاودێریی مامم مامەوە. لەوێبوونیشم کاریگەرییەکی دیاری لەسەر هەڵسوکەوتم هەبوو و، خوێندنی ناوەندی و ئامادەییم تەواوکرد و لە کاری خراپ و شتی خراپیش دووربووم. من، سوپاس بۆ خوا، بەدرێژایی ژیانم ئارەقم نەخواردووەتەوە و جگەرەم نەکێشاوە و قومارم نەکردووە و زینام نەکردووە.
خوێندن لە قوتابخانەی سەرەتایی لە کەرکووک و لە کفری بە زمانی تورکمانی بوو، بەڵام بەپێی یاسای زمانە ناوچەییەکان دەبووایە بە کوردی بێ، کەچی لەبەر ئەوەی زۆربەی مامۆستایەکان تورکمان بوون و ئەو کەسانەبوون کە لە سەردەمی عوسمانلییان چکێ خوێندنیان بە زمانی تورکی خوێندبوو، ئیدی خوێندن کرابووە ئەو زمانە، بۆیە دەبووایە لەگەڵ زمانە کوردییەکەی خۆمان فێری تورکی و عارەبییش ببین، جا ئێستا دەزانم کە لە منداڵی فێری زمانی دیکە ببی، ئەگەرچی گرانیش بوو، چ سوودێکی هەیە.
ڕووداوێکی خۆشم لەبیرە، ڕەشید عاکف هورمزیی بەڕێوەبەری قوتابخانە زمانی تورکیی پێدەگوتین و، لە وانەی ئیملا قوتابییەکی تورکمان پەڕەکەی خۆی وەرگرتەوە و دە نمرەی وەرگرتبوو، ئەوجا من چووم پەڕەکەی خۆم وەرگرتەوە، جا بەڕێوەبەر گوتی ڕەوا نییە قوتابییەکی تورکمان دەنمرە وەرگرێ و موکەڕەمی کوردیش ئیملای تەواوبێ و هەر دە نمرە وەرگرێ، بۆیە شایانی یازدە نمرەیە و چونکە خەتیشی زۆرجوانە ئەوا دەبێ دوازدە نمرە وەرگرێ و لەبەر پاکی و ڕێکیی دەفتەرەکەیشی دەبێتە سێزدە نمرە.

## دوا شۆڕشی شێخ مەحمودی حەفید:

لە ساڵی ١٩٣١ کە قوتابیی پۆلی یەکی سەرەتایی بووم، هەستم لە شۆڕشی شێخ مەحمودی حەفید ڕاگرتبوو[9] چونکە شارۆچکەی کفری چاوەڕێبوو، ئەوشەو نا شەوی دادێ هێزەکانی دێنە ناو شارۆچکەکە، هێزی سەرەکیی شێخیش لەو ناوچەیەیدا هێی عاشیرەتی جاف بوو، کە شێخ کەریم فەتاح بەگی جاف دابوویە پاڵ بزووتنەوەکەی شێخ مەحمود و، مستەفا جافی کوڕیشی لەگەڵ ئێمە و لە هەمان پۆل قوتابی بوو.
ویلایەتی موسڵ ناوی لێندرا کوردستانی باشوور، کە لیوای موسڵ و کەرکووک و هەولێر و سلێمانیی دەگرتەوە و لیوای دهۆکی ئێستایش بە قەزا و ناحییەکانییەوە سەر بە ویلایەتی موسڵ بوو و، ناوچە کوردییەکانی دیکەیش، وەک خانەقین و مەندەلی و بەدرە و ئەو جێیانەی سەر بەو شارۆچکانەبوون لەدەرەوەی ویلایەتی مووسڵی عوسمانلییان بوون و، ناوی مێژوویی ئەو ویلایەتەش "ویلایەتی شارەزوور" بوو و ناوەندەکەشی شاری کەرکووک بوو و، ئەدەمای پێیدەگوترا "موتەسەللیمییە" ، شێخ ڕەزای شاعیری بەناوبانگ لە سەفەرێکی بۆ ئەستەمبۆڵ لە قەسیدەیەک باسی مەرقەدی شێخ نورەدینی بریفکانی دەکا، کە پێیدا تێپەڕیوە و، دەڵێ:
عزم دیار روم جو کردم ز شهرزور افتاد در دیار بریفکان مرا عبور
واتە: کە لە شارەزوور ڕا سەفەری وڵاتی ڕۆمم کرد، لەڕێگا گەیشتمە وڵاتی بریفکان.
دیارە کە شێخ ڕەزا خەڵکی کەرکووکە و، لە کەرکووکرا و لە شارەزوور دەستی بەو سەفەرەی وڵاتی ڕۆم کردووە، بەڵام عوسمانلییەکان لەوەی دەترسان دەسەڵاتی میرنشینیی بابان لە ویلایەتی موسڵ فراوان بێ، ئیدی لیوای کەرکووکیان دایەپاڵ والیی موسڵ و میرنشینیی بابانی سلێمانییشیان دایە پاڵ والیی بەغدا.
دوای شەڕی یەکەمی جیهانی"١٩١٤- ١٩١٨" بەریتانیا دەوڵەتی کوێخای سەر عێراق بوو، عێراقیش دوو ویلایەت بوو، بەسرا و بەغدا، تخووبەکانی باکووری شارۆچکەی بێجیی

---

[9] _ شێخ مەحمودی حەفید: ڕێبەرێکی سیاسیی کوردە، لە ١٨٨١ لە سلێمانی ، لە خانەوادەیەکی خاوەن دەسەڵاتی ئایینی و عەشایەری لەدایکبووە. حەفید بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی داگیرکەری ئینگلیزی لە عێراق و هێزەکانی ڕووسیای قەیسەرییش، سەرکردایەتیی بزووتنەوەی چەکداریی کوردی کردووە و لە ١٩١٩ سەربەخۆیی ڕاگەیاند، کەچی هەوڵەکانی بۆ سەربەخۆیی کوردەکان لەگەڵ ڕەتکردنەوەی ئینگلیزان یەکانگیر بوونەوە، نەخاسمە دوای پێکهێنانی دەوڵەتی نوێی عێراق. ئیدی چەند جاران بەندکراوە و دوورخراوەتەوە. لە ٩ی تشرینی دووەمی ١٩٥٦ کۆچی دوایی کردووە. بۆ زانیاریی تر، بڕوانە: عبالرحمن صالح ادریس البیاتی، الشیخ محمود الحفید هگفرزنجی و النفوذ البریطانی فی کردستان العراق حتی عام ١٩٢٥، دار الحکمة، لندن، ٢٠٠٥، ص٩.

بەری خۆرئاوای زێی دیجلە بوو، بەڵام بەریتانییەکان دەیانویست ویلایەتی مووسڵیش بە عێراقەوە گرێدەن کە هەشت لە دەی دانیشتووانەکەی کوردبوون.
دوای دامەزراندنی مەملەکەتی عێراق لە ٢٣ی ئابی ١٩٢١، بەپێی دوا بڕگەی ماددەی سێی پەیمانی لۆزانی لە ١٩٢٠ جێی پەیمانی سیڤەری[10] گرتەوە، کێشەی کوردستانی باشووریان "ویلایەتی مووسڵ" هەناردە کۆمەڵەی نەتەوەکان، ئیدی کۆمەڵەی نەتەوەکان بڕیاریدا لیژنەیەک لە سێ کەس پێکبهێنرێ و ڕێنماییەکانی خۆیان بدەنەوە کۆمەڵەی نەتەوەکان[11].
تورکیا پێشنیاری ڕاپرسییەکی کرد تا ڕای دانیشتووان بزانرێ، تورکیا پشتی بەوەی خۆشبوو کوردەکان ڕقیان لە بەریتانییەکانە، ئەوانەی لێنەگەڕان بەپێی ڕێککەوتنی سیڤەری ١٩٢٠ دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ دامەزرێ، بەریتانیا ئەو پێشنیارەی بەو هەنجەتەی ڕەتکردەوە کە کارەکە پەیوەندیی بە کێشانی سنووری نێوان عێراق و تورکیاوە هەیە نەک زانینی ویست و ئارەزووی دانیشتووانی ناوچەکە. هەریەک لە عێراق و تورکیا و بەریتانیا هەندێ ژمارەیان سەبارەت بە پێکهاتەی دانیشتووانی هەرێمەکە خستەڕوو کە هەموویان دووپاتیان دەکردەوە کورد زۆرینەی هەرەزۆری دانیشتووانی ئەو ویلایەتە پێکدێنن. ئەو کارەش وای لە کۆمەڵەی نەتەوەکان کرد لیژنەیەکی سێ قۆڵی بۆ زانینی ڕای دانیشتووان و لێکۆڵینەوەی ناوچەکە لەرووی ئابوورییەوە پێکبێنن، بەڵام بابەتەکە، بەپێی ئارەزووی بەریتانیای سووربوو کوردستانی دەوڵەمەندی نەوت بە دەوڵەتی عێراقی نوێوە بلکێنی، هەر لەدەوری هێڵی سنووریی نێوان عێراق و تورکیا دەخولایەوە.
لە ڕاپۆرتی لیژنەکەدا هاتووە: "نابێ ئەو ناوچە کێشە لەسەرە بە بەشێکی عێراق دابندرێ و ناکرێ بشکوترێ بەشێکی ئەو ناوچەیە بەشێکی ئەو وڵاتەیە" بەڵام پێشنیاری ئەوەی کردووە لەڕووی ئابوورییەوە بە عێراقەوە بلکێندرێ، بەو مەرجەی بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ لەژێر کوێخایەتیی بەریتانیا بێ و خوێندن لە قوتابخانە و زمان لە دادگاکان کوردی بێ،

---

[10] _ ئاواتەکانی کورد بۆ سەربەخۆیی، لەڕاستیدا لە وەیدا بوو کە سەربەخۆیی ناوچە کوردییەکان خرابوونە ناو پەیمانی سیڤەری ١٠ی ئابی ١٩٢٠، کە لەنێوان تورکیا و وڵاتانی هاوپەیمان مۆر کرابوو و بە دەق تێیدا هاتووە: "پرۆژەی سەربەخۆیی سەنتراڵیی ناوچە کوردییەکان کە خۆرهەڵاتی فورات و باشووری خۆرئاوای ئەرمینیا و باکووری سنوورەکانی تورکیای هاوتخووبی سووریا و عێراق، دادەندرێ" ئەو پەیماننامەیە مۆر کرا و پێش دروستکردنی حکوومەتی عێراقیش وادەی سەربەخۆیی درا کوردەکان، بەڵام ئەوە لەسایەی ئەو بەڵێنانەی هاوپەیمانانەوە بوو تا لە تورکیا جیاببنەوە و، دواترێ بە دروستکردنی مەملەکەتی عێراق کارەکە گۆڕا و ڕەهەندێکی دیکەی وەرگرت، ئەویش پاراستنی ئەو ناوچانەبوون کە لە دەوڵەتی عوسمانلی دابڕێندرابوون. بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی، العراق فی دوری الاحتلال و الانتداب، دار الرافدین ، بغداد، ٢٠١٣، ص٢٦٩.

[11] _ بۆ زانیاریی پتری سەبارەت کێشەی مووسڵ بڕوانە: فاضل حسین، مشكلة الموصل (دراسة فی الدبلوماسیة العراقیة- الانكلیزیة- التركیة و فی الرآی العام)مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٦٧.

بەڵام لیژنە فەتوای ئەو کێشانەیان نەدا کە لەو بەزۆر پێوەلکاندنە پەیدا دەبێ، گوتی: "ئەو کەڵک و سوودانەی لە بەعێراقەوە گرێدانی ئەو ناوچە کێشە لەسەرانە سەرهەڵدەدەن، کێشەی سیاسیی مەترسیداریان لێ دەکەوێتەوە" لیژنە دووپاتیشی کردەوە ئەوانە نە عارەبن و نە تورکن و نە فارسن. دەڵێ: "ئەگەر وەک بنچینەیەکی دەرەنجامان پشت بە لایەنی ڕەگەزی و نەتەوەیی ببەسترێ، ئەوا دەبێ دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ دابمەزرێندرێ، چونکە کورد حەوت لە هەشتی دانیشتووان پێکدێنن"، بۆ ڕیشەکەندنی ناڕەزایی دەوڵەتە ئیستیعمارییەکانی دیکەش، بەریتانیا چەندوچوونی لەگەڵ کۆمپانیا نەوتییە ئەمریکی و فەرانسی و هۆڵەندییەکان کرد تا لە دەستکەوتەکەدا پشکداریان بکا، کە نەوتی کەرکووک بوو و، لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥یش کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ناوچەکەدا پەردەی لەسەر کێشەی کورد دادایەوە و، بڕیاریدا کوردستانی باشوور بە عێراقەوە بلکێنێ. ئەگەر کوردەکانیش ئارەزووی سەربەخۆیی بکەن، کە هێشتا عێراق لەژێر کوێخایەتیی بەریتانیایە، ئیدی بەریتانیا دەتوانێ لەبەر ئەو ئارەزووە حکوومەتێکی سەربەخۆ لە بەڕێوەبردن لە ناوچە کوردییەکان دامەزرێنێ، وەک جارجار دەستی پێ هەڵدەشەقاند. بەریتانییەکان ئامادەبوون، لەو ناوچانەی زۆرینەی دانیشتووانن، ئۆتۆنۆمی بدەنە کوردەکان، بەڵام بەو مەرجەی دەستبەرداری ئەو ناوچانەبن کە زۆریان نەوت تێدایە وەک کەرکووک و خانەقین و زوممار.
سەرباری ئەوەی شێخ مەحمود لە سلێمانی کرایە "حوکمدار"و، ئەوان حوکمداریان بە موتەسەڕیف لێکدەدایەوە، بەڵام شێخ مەحمود داوای یەکخستنی لیوایە کوردییەکانی کەرکووک و سلێمانی و هەولێری دەکرد و، لیوایەکیش لە قەزا کوردییەکانی موسڵ لە دهۆک دروستبکرێ و، مافی چارەی خۆ نووسینیش بدرێتە کوردان. بەریتانییەکان، سەرۆک هۆزەکانی لایەنگری خۆیانیان هاندەدا تا سەرکردایەتیی شێخ مەحمود ڕەتکەنەوە، ئەو کارەش وایکرد چەند جاران شۆڕش لەدژی بەریتانیا و حکوومەتی عێراقی ڕاگەیەنێ، کە دواجاریان لە ١٩٣١ بوو و  بۆ ئەوە بوو دەست بەسەر کەرکووکدا بگرێ.
شێخ مەحمود کەرکووکی بە دڵی کوردستان دادەنا، ئاواتیشی ئەوەبوو بیکاتە پایتەختی کوردستانێکی سەربەخۆ، بەڵام شێخ پشتی بە پشتیوانیی عەشیرەتە لایەنگرەکانی دەبەستا و زۆربەی سەرۆکەکانیان پەیوەندییان لەگەڵ بەریتانیا دروستکردبوو، ئەو بەریتانیایەی نەیدەویست کەرکووک لەناو سنووری کوردستان بێ چونکە نەوتی تێدابوو.
کە نییەتی ئەوەی هێنا دەست بەسەر کەرکووکدا بگرێ، عەشرەتی تاڵەبانی، لەبەر دوژمنایەتییەکی عەشایەریی نێوانیان، کە یەک لە پیاوانی دیاری تاڵەبانییانی تێدا کوژرابوو، بوونە کۆسپی بەردەمی، دوو کوژراوەکەش شێخ عەبدولسەمەدی کوڕی شێخ

عەبدولعەزیزی کوڕی شێخ ئەحمەد و شێخ حوسێنی قەرەچێواری بەرزنجی بوون. شێخ جەلالی حەفید و شێخ بابەعەلیی کوڕی بۆ سولح ناردە لای تاڵەبانییان، بەڵام کارەکە سەری نەگرت، ئەگەرچی هەندێکیشیان دایانە پاڵ شێخ مەحمود، لەوانەش شێخ مەجید تاڵەبانیی گوندی ئاوباریک.

ئەو هێزە عاشایەرییانەی لە ناوچەکەدا هیوای پێیان هەبوو، عەشیرەتی هەمەوەندی ناوچەی چەمچەماڵ و عەشیرەتی جافی هەردوو ناوچەی هەڵبجە و کفری و عەشیرەتی جەباریی قەزای ناوەندی کەرکووک بوون. بەڵام بزواندنی ئەو عەشیرەتانە دژی ویستی بەریتانییان هەروا ئاسان نەبوو، ئیدی، بۆ دەستەبەرکردنی هاریکارییان تا بەسەر کەرکووکدا بدەن، قسەی ئەوەی لەناویاندا بڵاوکرایەوە گوایە بەریتانیا لاریی لەو کارە نییە.

هەڵویستی ڕۆشنبیرانی کورد لەگەڵ شێخ مەحمود جودابوو، زۆربەیان پێیانوابوو تەنێ بەریتانیا[12] دەتوانێ یارمەتیی کوردان بدا تا مافە نەتەوەییەکانیان وەدەست بێنن، جا لەدەرەوەی دەوڵەتی عێراق بێ یان لەناو دەوڵەتەکەدا و، ئەو کێشانەیشیان لەگەڵ شێخ نەدەشاردەوە، بۆیە شێخ ڕێوشوێنی توندی بەرانبەریان دەگرتەبەر، وایلێهات ئەوانە بیر لە دامەزراندنی ڕێکخراوی تایبەت بکەنەوە تا لەناو جەماوەری کورددا بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتیان پشتیان بگرێ. ئیدی بۆ ئەو مەبەستە کۆمەڵەیەکی سیاسییان لە سلێمانی بەناوی "کۆمەڵەی ڕزگاریی کوردستان" دامەزراند و جەماڵ بابانیان وەک سەرۆک هەڵبژارد.

هڵویستی بەریتانییەکان، کاتێ توانییان جوولەی عەشیرەتە لایەنگرەکانی شێخ مەحمود یەک بخەن، یەکلاکەرەوە بوو، کە ئەوانیش هەردوو عەشیرەتی هەمەوەند و جەباری بوون و، سووسەیان بۆ سەردارانی جافیش نارد لە شۆڕشەکە بکشێنەوە. ئیدی هێزەکانی شێخ هەر چەند سەد کەسێک مانەوە و ئەوانیش پێویستیان بە چەک و زەخیرە بوو. کە

---

[12] _ بەڕێوەبەرایەتیی سەربازیی بەریتانی لە ئارەزووی سەربەخۆیی سیاسیی کوردان تێگەیشتبوو، کاتێ بڕیاریان دا شێخ مەحمودی حەفید بکەنە فەرمانڕەوای سلێمانی، شێخ لە ئارەزووەکانی خۆی تێپەڕاند و بەوەی وەلامیدانەوە کە خۆی وەک مەلیکی کوردستان ڕاگەیاند و، ئەوانیش بەو کارە ڕازی نەبوون و ئەویش دژیان دەستی بە شۆڕش کرد. ئەوکارەش کاردانەوەی نەرێنیی لای بەریتانییەکان دروستکرد و ئیدی دوژمنایەتییان کرد و کاریان بۆ خامۆشکردنی شۆڕشەکەی دەکرد. نوئێلی ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە سلێمانی، کە لە تشرینی دووەمی ١٩١٨ دایانمەزراند و بگرە دوای دامەزراندنی شێخ مەحموودیش بە حوکمدار هەر کاری بۆ پەتەوکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتەکەی دەکرد. لەراستیدا ئەو کردنە حوکمدارییە وەک ئەوە نەبوو کە باسی دەکرێ و لە یەک لە ڕاپۆرتەکانی باسی ئەوەی دەکا: "خەریکم دەسەڵاتی بەریتانی ببەمەوە ناو عەشیرەتە کوردەکان و نیزام و شەرعییەت بسەپێنم، ئەوەی گومانیشی تێدا نییە ئەوەیە کە بەریتانییەکان سەرەتا هەندێ سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، ئاخر دروشمی کوردستان بۆ کورد بڵاوبووەتەوە ومەبەستیش لێی ئەوەیە لەژێر چاودێریی بەریتانیا بێ"

حکوومەتیش فەوجێکی پیادەی وەڕێخســـت لەگەڵ چوار تۆپی چیایی لەپشـــتی ئێســـتران بارکرابوون و فڕۆکەکانیش چەند بۆمبێکیان بەســـەر دیوەخانەکەی شـــێخ مەجیدی گوندی ئاوباریکدا بەردایەوە، هێزەکەی شـێخ مەحمود پەرتوبڵاوبوون و، ئەویش خۆی ڕادەســتی دەســـــەڵاتی عێراق کرد و ئیدی بۆ ناســـــرییە دوورخرایەوە تا لەوێ لەژێر نیشـــــتەجێی زۆرەملێ بێ و، دوایەش بۆ بەغدا تا دەســـــاڵ لەوێ لە دوورخراوەیی بەســـــەربردا(١٩٣١-١٩٤١) و ئەوجا لە بەغداوە بۆ گوندەکەی، داریکەلیی لیوای ســـــلێمانی، لەو کاتەی ئەو حکوومەتی بەرگریی نیشـــــتمـانییە ی ڕەشـــــید عـالی گەیلانی دایمەزراندبوو ڕایکرد و بەریتانییەکان لە ١٩٤١ دیسان عێراقیان داگیرکردەوە.

## کوڕانی جەعفەر سوڵتانی ڕاپەڕیوی کورد پەنا بۆ باوکم دێنن:

سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتیی سەردەمی شایە قاجارییەکان لەئێران هاوشێوەی سیستەمە دەرەبەگییە سەربازییەکەی دەوڵەتی عوسمانلی بوو، هەر سەرۆک عەشیرەتێک میری ناوچەکەی خۆی بوو و شا نازناو و خەڵاتی دەدانێ، بەتایبەتیش ئەو ناوچانەی دەکەوتنە سەرسنووری ئێران و دەوڵەتی عوسمانلی.

جەعفەر سوڵتان"کوردەکان پێیدەڵێن سان" میری ناوچەی هەورامانی لهۆن بوو و، دەسەڵاتیشی دەگەیشتە شاری هەمەدانی کوردستان. بەڵام کە سەرمایەداری گەشەی کرد، بەتایبەتی هیی دەوڵەتانی خۆرئاوا، وا پێویستی دەکرد بازاڕ یەکبخرێ و ئەو سنوورە دەرەبەگییە باوە بڕووخێندرێ تا جوولەی کاڵا و وەبەرهێنان ئاسان بێ.

وەزیری بەرگریی حکوومەتەکەی ئەحمەد شای قاجارئەو ئەرکەی گرتە ئەستۆ، کاتێ شا لە وڵات نابێ و سەردانی فەرانسە دەکا، ئەو کودەتایەکی سەربازی دەکا و دەست بەسەر دەسەڵاتدا دەگرێ. ڕەزاشا باوەڕی بە دیموکراسی نەبوو، بەڵام هەوڵیدا بە لەناوبردنی سیستەمی دەرەبەگایەتی هەندێ چاکسازیی کۆمەڵایەتی بکا و هەندێ پێشکەوتنی سەپاند تا وڵات بگەیەنێتە کاروانی ئەو سیستەمەی لە خۆرئاوا باوبوو و ئەو گۆڕانکارییانەشی لەگەڵ واقیعی وڵاتەکەدا نەدەگونجان. بەڵام ئەو سەپاندنە لەڕێی شێوازەکانی زوڵم و زۆر و سەرکوتکردنەوە دەکران کە هیچ توێژێکی گەلی لێ دەرباز نەدەبوو، چ جای ئەوەی کە لە نەتەوەیەکی دیکەی غەیری نەتەوەی فارسیش بن. جا بۆ لەناوبردنی میرنشینییەکان سوپای بەکارهێنا، لەوانەش میرنشینە کوردەکانی لووڕستان و کەڵهوڕ و ئەردەڵان و لەوانەشدا هەورامانی جەعفەر سوڵتان و کوڕەکانی فەرمانڕەوای بوون.

جەعفەرسوڵتان لە چیا سەختەکانی هەورامان بەری لە هێزەکانی ئێران گرت، بەڵام هەر زوو دەستی لە بەرەنگاری هەڵگرت و داوای پەناهەندەیی سیاسیی لە عێراق کرد و، کە پرسیاری شکستهێنانەکەیشی لێ کرا، کە ئەو لە چیا سەختەکانی هەورامان خۆی دامەزراندبوو، وەڵامیداوە: "حکوومەتەکان گوتیان بەرگری مەکە" گوتیان: "سان کە تۆ شەڕت لەگەڵ حکوومەت بوو ئەرێ گوێت لە حکوومەت گرت؟" گوتی: "پێتانوایە ئەو حکوومەتە کامەیە؟" گوتیان :" ئەدی ئێران نییە؟" گوتی: "ئەرێ عەجەم حکوومەتن؟" گوتیان : " ئەدی کێیە؟ ئەرێ عێراق داوای لێ کردی؟" گوتی: " بۆ عارەب حکوومەتن؟" گوتیان : "ئەدی ئەو حکوومەتە کێیە؟" گوتی: "بەریتانییەکان داوایان لێکردم بەرگری نەکەم و پەنام بۆ عێراق هێنا".

حکوومەتی عێراق پەناهەندەیی "حافر سان"ی قبووڵ کرد، وەک کوردەکان ناویان لێناوە و، خانوێکیان لە گەڕەکی بەرتەکیەی نزیک تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک بۆ بە کرێ گرت

تا لەوێ بژی. هەرچی کوڕەکانی جەعفەر ســـوڵتان بوون کە ملیان بۆ فەرمانەکانی ئەو حکوومەتە نەدا، ئەوا ڕەزا شـــا توانیی بەســـەر بەرگریکردنیاندا زاڵ بێ، چونکە خەڵکی عەشـیرەتەکە لە بەرگری کردن لە سـیسـتەمە پڕ زوڵم و زۆرەکەیان ئەوەندە گەرموگوڕ نەبوون کە دژی ڕۆڵەکـانی عەشــیرەتەکەیـان بوو. دەگێڕنەوە ئەگەر لە کەســێکی عەشــیرەتەکەیان تووڕەببوونایە دەیانخســتە ناو حەوزی ئاوەوە و فەرمانیان پێ دەکرد بەداران لەخۆی بدا، ئەگەر ڕازییش نەبووایە ئەوا تەقەیان لێ دەکرد و لەناو حەوزەکە دەیانکوشت.

کە ئەوانە ناوچەی هەورامانیان بەجێهێشـــت، حکوومەتی عێراق داوای پەناهەندەیی ڕەتکردنەوە، دڵنیاشــبوون ڕەزاشـا وەک ئەو کارەی لەگەڵ سـەرۆکانی دیکە کردبووی ، ئەوانیشــی لە سـێدارە دەدا. ئاخر حوسـێن قولی خان لە لووڕسـتان و حاجی عەلی خان ئەکبەری لە کەڵهوڕ و سمکۆ و خەڵکانی دییش ڕاپەڕیبوون.

جەماوەری جووتیاران لەنێوان دوو ئاگران بوون، ســـتەم و چەوســـاندنەوەی میرە کوردەکان و شــەڕو داگیرکارییەکانیان، کە تەنێ بەڵا و ئازاری بۆ ئەوان هەبوو و، ئاگری ئەو ســـەرکوتکردن و تەمبێ کردنانەی حکوومەتی تاران دەیانکا و ئەو تاڵان و بڕۆ و کوشـــتارەی ســـوپای ئێرانی دەیانکا. بۆیە، جەماوەری جووتیارانی عەشــیرەت لە بەرگرییەکی جەربەزەیی گەرموگوڕ نەبوون و تـا دەســـەڵاتی میرەکـان بپـارێزن و لایەنگیریی حکوومەتیشــیان نەدەکرد، ئیدی خۆیان دابووە دەســت خودا و ئەو شـــتەی دوارۆژ بۆی هەڵگرتوون.

ئیدی کوڕەکانی جەعفەر ســوڵتان ناچاربوون ناوچەکە بەجێبێڵن و دوو ڕێیشـیان لە پێش بوو؛ یان خۆیان بدەنە دەســـت دەســـەڵاتی ئێران، کە یان مردن چاوەڕێی دەکردن یان دەبووایە چەندین ســـاڵ لە بەندیخانەی قاجاری تۆقێنەر بەســـەر ببەن، کە ئەوکارەیان بەرانبەر حاجی عەلی خان ئەکبەریی ســـەرۆکی کەڵهوڕ کرد. یانیش بەرەو عێراق هەڵبێن، کەچی حکوومەتی عێراق ڕازی نەبوو مافی پەناهەندەییان بداتێ.

شـــێخە تاڵەبانییەکان، لە ئێران، پەیوەندیی ڕۆحییان لەگەڵ بەشــێکی زۆری ناوچە کانی کوردستانی خۆرهەڵات هەیە و، تەکیەی قادریی تاڵەبانیش لقی لە هەورامان و کرماشان و پاوە و موکریان و ســابلاغ و جێی دیکە هەیە، مامە شـێخم، مورشـیدی تەریقەتی قادریی تـاڵەبـانی ژنێکی هێنـابوو، کە لە خـانەوادەیەکی ئـاییینی هەورامـان بوو، ئیدی شـــتێکی ئاســـاییبوو کە نێوانگیری لای حکوومەتی عێراقی بکا تا پەناهەندەیی خانەوادەی جەعفەر سوڵتان قبووڵ بکەن و لە کەرکووکیان نیشتەجێ بکەن. هەرچی کوڕەکانینە، کە لە چیا و دۆڵەکانی هەورامان بەرگرییان دەکرد و ناچاربوون بە نهێنی لە ناوچەی هەڵەبجە بێنە

ناو خاکی عێراق، ئیدی باوکمیان لە گوندی زەرداو دەســـــتنیشـــان کردبوو کە تا مافی پەنابەرییان دەدرێتی دەیانحەوێنێتەوە و دەیانپارێزی، ئەو کوڕانەش هەریەک لە مســـتەفا بەگ و محەممەدئەمین و سالار و ئەفراسیاب بوون.

لە ڕۆژێکی پشـــووی بەهاری چوومەوە لای کەســـوکارەکەم بۆ گوندی زەرداو، تا چەند ڕۆژێکی پشوویان لەگەڵ بەسەر ببەم. دیتم چەند کەسێک میوانی باوکمن و جلی کوردیی ناوچەی هەورامانیان لەبەردایە و لەنێوان خۆیان بە دیالێکتی گۆرانی"هەورامانی" قســـــان دەکەن. باوکم نەیدەهێشـــت بکەونە بەرچاوان و نەدەبوا، لە کەســـێکی جێی متمانە بترازێ کە ناوی حەمادی سمایل بوو، کەسیان بەسەروەبچێ و، هاتنیشیان لەگەڵ چەندین ساڵی بێ بارانی ڕێکهاتبۆوە و هەموو خەڵکی گوندەکە و باوکیشـــم پێوە تووشـــی تەنگدەســـتیی گوزەران ببوون، بەڵام باوکم هەندێ مافووری ئێرانی و هەندێ تفەنگی فرۆشـــــت تا بە ئەرکی خانەخوێیی هەســـتێ، ئیدی ئەوانە ماوەیەک مانەوە و هەندێکیان لە ســـاڵێکیشـــیان تێپەراند تا مافی پەنابەریی ســـیاســـییان بۆ دەســـتەبەر بوو و، ئەوجا چوونە کەرکووک تا لەوێ لەژێر چاودێریی پۆلیســـی عێراقی بژین. دەســـەڵاتە حکوومییەکانی کفری هەســـتیان بەوەی کردبوو چەند کەسی غەوارە لای باوکمن لە گوندی زەرداو. کە لێیشیان پرسیبوو گوتبووی هەندێ لە خاڵەکانی لە مەهابادرا بۆ ســـەردانی هاتبوون و پاشـــان جووبوونەوە جێی خۆیان، ئەو وەڵامە دەســـەڵاتی ڕازی نەدەکرد، بەڵام دەســـەڵاتی باوکم و پەیوەندییە باشەکانی لەگەڵ بەرپرسانی ناوچەکە هاریکار بوون تا لێیان بێدەنگبن.

کە لە کەرکووک بووم، جەعفەر ســــــوڵتانم دەدیت زۆرجاران بۆ نوێژی جەماعەت دەهاتە تەکیە، پیاوێکی ســـــادە و ســـــاکار و بە ڕەوشـــــت و دیندار بوو، هەرچەند جاری لە تەکیە بیدیتبام قسەی لەگەڵ دەکردم، مەنسووری کوڕیشی لە قوتابخانە لەگەڵ **ئێمە** قوتابی بوو، بەڵام کێشەی لەگەڵ عارەبی هەبوو و نەیدەزانی. ئەفراسیاب بەگی ئامۆزای ساڵ و نیویک میوانی باوکم بوو، ئەو لە هەڵســـــوکەوتی بە جەعفەر ســـــوڵتانی دەچوو، کاتی خۆی بە نوێژکردنێ بەســـەردەبرد و جارجارەش لەگەڵ"حەمادی ســـمایل"ی دەچووە ڕاوێ. هەرچی کورەکانی جەعفەر سوڵتانی بوون لە گوندی زەرداو، جانتای بە پشتوێنەوە بەستراوی پڕ لیرەی زێڕیان هەڵگرتبوو و کاتیان بە یاریی پۆکەر بەســـــەردەبرد. حکوومەتی عێراقی، دوای چەند مانگێک بە داوای پەناهەندەیی کوڕەکانی جەعفەر ســــوڵتانی ڕازیبوو، ئیدی چوونە کەرکووک تا لەوێ بژین. هەرچی ئەفراســـــیاب بەگە، ماوەیەکی درێژ لای باوکم مایەوە و ئەوجا گەرایەوە یەک لە گوندەکانی خۆی لە قەزای هەڵەبجەی نزیک ســـــنووری ئێران.

## مەحمود خانی دزڵی، ئەو پیاوە ئوستوورییە:

کە شـــێخ مەحمودی حەفید لە لیوای ســـلێمـانی کرایە "حوکمدار"، بەریتـانییەکـان، بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی، ژمارەیەک ڕاوێژکاریان بۆ دامەزراند. بەڵام، ویســـتی شـــێخ مەحمود و ئەو دەســـتە ڕۆشـــنبیر و بازرگانانەی لە دەوری بوون، لە حوکمداری ئەولاتر بوو. ئەو ئاواتی یەکخســـتنی هەموو کوردســـتانی باشـــوور بوو(ویلایەتی موســـڵ) لەژێر پێشـــەوایەتیی خۆی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی تێیدا، لە کاتێکدا بەریتانییەکان ئامانجیان ئەوەبوو تەنیا بیکەنە موتەســـەڕیفێک لە لیوای ســـلێمانی و لەژێر فەرمانی ئەوانیشدا بێ. ئەوان سەرۆک عەشیرەتەکانی هەولێر و قەزایە کوردەکانی لیوای موسڵیان دنەدەدا پێشەوایەتیی شێخ مەحمود ڕەتکەنەوە و، سەرباریش قەزای هەڵەبجە ڕاستەوخۆ لەلایەن بەریتانییەکانەوە بەڕێوە ببردرێ.[13]

بەریتانییەکان هەر لە بەراییڕا بڕیاریان دابوو کوردســـتانی باشـــوور بە عێراقەوە بلکێنن. ئەوەش لەو گفتوگۆیەیڕا ئاشکرا دیارە کە لەنێوان لوید جۆرجی سەرۆکوەزیرانی بەریتانیا و جۆرج کلیمەنسۆی سەرۆکوەزیرانی ئەودەمای فەرەنسا کراوە و، تێیدا داوا لە فەرەنسا دەکا دەســـت لە ویلایەتی موســـڵ هەڵگرێ و بیداتە بەریتانییەکان تا بە عێراقیەوە بلکێنن. هەندێ کەس لۆمەی شـــێخ مەحمود دەکەن گوایە لەگەڵ بەریتـانییەکـان نەرم نەبووە و پەیوەنـدیی بەتورکـانەوە هەبووە، لەکـاتێکـدا بەریتـانییەکـان ســـەرقـاڵی ئەوەی بووینە حکوومەتێکی بۆ دروست بکەن. بەڵام شێخ مەحمود لە ئامانجە شاراوەکانی بەریتانییەکان تێدەگەیشـــت، ئیدی پەیوەندەیی بە یەکێتیی ســـۆڤیەتەوە کرد و داوای یارمەتیی لێ کردن، بەڵام ســـۆڤیەت خۆی تووشـــی دەســـتتێوەردانی چواردە دەوڵەت ببوو تا شـــۆڕشـــی سۆشیالیستی هەر لەناو بێشکەڕا بخنکێنن، لە دۆخێکدا نەبوو بیر لەوەی بکاتەوە یارمەتیی کوردان بدا، ئەو کارەش وای لە شـــێخ مەحمود کرد هەوڵ بدا هاوکاریی هەر لایەنێک بکا

---

[13] _ بەریتانییەکان لە گرنگیی ئابووریی ناوچە کوردییەکان تێگەیشتبوون و دەیانزانی چ ڕۆڵێکی لە سەقامگیرییەکەیدا هەیە. ئەوان بەو جاوەس تەماشـــای کوردەکانیان دەکرد کە هێزێکن وازیان لەوەی نییە لە بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی عێراقیی یەککگرتوو بەشـــداربن. پێدەچێ بەریتانییەکانیش هەر چاویان لەوەی بووبێ تا ئەو کارتە لەکاتی پێویســـتدا بەکار بهێنن، راســـتیی کارەکە ئەوەیە کە بەریتانیا لەبەر ئەوە گرنگیی بە ناوچە کوردییەکان دابوو چونکە ئامانجی وەبەرهینان نەوت بوو و تا پاشـــانیش بیکاتە بنکەیەک بۆ فراوانخوازیی دادێ ە بەرەکانی باکوور و خۆرئاوا و خۆرهەڵات و ، کاریس بۆ ئەوە بکا چۆن بە بزووتنەوەی عارەبیی، کە لە عێراق خۆی تەواو گرتبوو، ڕووبەڕووی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی ببێتەوە کە تازە خەریکبوو دروست دەبوو و دواتریش پتەوکردنی دەسەڵاتی بەریتانیا لە هەموو ولاتدا. ئەو پلانانەس لە قۆناغی جودادا هەر هەموویان جێبەجێ کران.سیف عدنان ارحیم. الادارة العسكرية البريطانية و موقفها من القوميات و الاقليات الدينية فى العراق"١٩١٤-١٩٢١"مجلة كلية التربية للبنات- جامعة بغداد، المجلد ٢٨، العدد ١، آذار ٢٠١٧.

که دژی بەریتانییەکان بێ و، شـێخ مەحمودیش لەو جۆرە کەسـانە نەبوو بە هاسـانی دەستەمۆ بکرێ، ئیدی بەریتانییەکان حاکمێکی سیاسییان ڕەوانەکرد، ئەویش مێجەر سۆن بوو.
سۆن، لە کاتی دەسەڵاتی عوسمانلییان، بارێکی ژیانی بە شاراوەیی لە کوردستان بەسەر برد و کاری بۆ هەوالگریی بەریتانیا دەکرد. ئیدی هەندێ پەیوەندیی پتەوی لەگەڵ کۆمەڵێ سەرۆک عەشیرەت دروستکردبوو، لەوانەش سەرۆک عەشیرەتی جافان لە هەڵەبجە و سـەرۆک عەشـیرەتەکانی پشـدەر و هەمەوەند و هیی دیکەش و، چەقاوەسـوویی و لەخۆباییبوونەکەی بەسـبوون تا شـێخ مەحمود تووڕەکەن و کارێکی تەمێکردن بەرانبەر بەریتانییەکان بکا.
کە مێجەر سـۆن گەیشـتە دەوروبەری شـاری سـلێمانی، دەسـەڵاتی خۆجێیی تاسـلوجە پێشوازییان لێکرد و لەبەرایی هەموویشیانەوە خودی شێخ مەحمود، کەچی مێجەرسۆن هەر لەگەڵ یەکەم سـاتی گەیشـتنەجێی دژاتەتیی خۆی بەرانبەر شـێخ مەحمود ڕاگەیاند، شێخ مەحمودی تەواو پشتگوێ خست و تەوقەی لەگەڵ پێشـوازیکەرەکانی دیکەی کرد و، هەر یەکسـەریش دەسـتی بە بەڕێوەبردنە فەرمییەکـان کرد و پەیوەنـدیی بە هاریکارەکانییەوە دەکرد لە قەزا و ناحیەکان. ئەوەش وای لە شـێخ مەحمود کرد بیر لە پەرچەکردارێک بکاتەوە، جا دەرەنجامەکەی چ دەبێ با ببێ.
لە هەورامان عەشـیرەت دووبەشـن، دزڵی و لەهۆن، سـەرۆکی دزلی "مەحمود خان" بووکەسایەتییەکی بەهێز و دۆستێکی دڵسۆزی شێخ مەحمود بوو. شێخ نامەیەکی نهێنیی بۆ هەنارد و داوای لێکرد بەخۆ و بە گەورەترین هێزی چەکدارەوە بێتە سـلێمانی و وای نیشـاندا هاتووە زیارەتی مەرقەدی کاکەحمەدی شـێخ بکا، بەڵام ئامانجی ڕاسـتەقینەی ئەوەبوو بەهێز سـلێمانی داگیر بکا و، هەموو بەریتانییەکانیش دەسـگیر بکا و لەوانەش مێجەر سۆنی حاکمی سیاسی.
مەحمود خان بەخۆ و بە سێسەد سوارە و سێسەد پیادەوە و بە جۆرەها چەکەوە هاتبوو و ئۆردوویان لە چیای گۆیژە خست. مێجەر سـۆن هەستی بە کارەکە کرد و پرسـیی بۆ هاتووە، پێیڕاگەیاند کە هاتوون سـەردانی مەرقەدی کاکەحمەدی شـێخ بکەن، ئیدی مێجەر سـۆن داوای لێکردن دەسـتە دەسـتە بێنە زیارەت و چەکەکانیان لای هاوەڵەکانیان دابنێن، بەڵام ڕەتیـانکردەوە گوێی بـدەنێ، ئیـدی فەرمـانی بە هێزەکـانی "لیڤی" دا کە لە کورد و ئاثورییان پێکهاتبوون، ئەگەر هەوڵی هاتنەناوشار بدەن ڕێیان لێ بگرن، خۆیشی، لەحاڵێکدا ئەگەر مەحمود خـان ملەی بکـا، خۆی بۆ هەڵاتن ئامـادەکردبوو. ئیدی پێکدادان لەنێوان هێزەکانی مەحمود خان و هێزە خۆجێیەکانی بەریتانیا ڕوویدا و لە نیوسـەعات پتریان خۆ

نەگرت و هێزەکانی مەحمود خانی هاتنەخوارێ و بەشـــاری وەربوون. ئیدی هەموو راوێژکارە بەریتانییەکان دەستگیر کران مێجەرسۆنی لێ دەرچێ، کە شەوێ بەدزییەوە . و بە هاوکاریی هەندێ کوردی لایەنگری ڕایکردبوو. شـــێخ مەحمود رایگەیاند مەلیکی کوردســـتانە و ئاگاداری کردنەوەیەکیشـــی دایە بەریتانییان کە دەبێ هەموو ناوچەکانی کوردســـتان بەجێبێڵن"ویلاتەتی موســـڵ"، تا بەپێی بەندەکانی تایبەت بە کوردســـتانی ناو پەیماننامەی ســـیڤەری ١٩٢٠ دەوڵەتێکی کوردیی ســـەربەخۆی تێدا دابمەزرێندرێ و، ئاگادارییەکیشی بۆ حاکمی پاشایی گشتیی بەغدا هەنارد.
بەریتانییەکان هەڵمەتێکی ســـەربازیی گەورەی چەند لیوایان ئامادەکرد و تۆپخانە و زرێپۆش و فڕۆکەش هاریکاریان بوو و هەندێ میری کوردیش هاوکارییان کردن وەک"مشـیر مام سـلێمان" ی دکتۆر کەماڵ مەزهەر ئەسـتۆپاکیی دەداتێ چونکە ناوی لە بەڵگەنامەکانی ئەودەمای بەریتانیا نەهاتووە، لەکاتێکدا کوردەکان و لەوانەش خودی شـێخ مەحمود کە لەپشت بەردە قارەمانی بریندار ببوو دیتبوویان، شێخی نیشانیدان و گرتیان و مەحمود خان و خەڵکی دیکەیشـــیان گرت و، ئەودوانەیان ڕەوانەی بەندیخانەی بەغدا کرد و، دواترێ شێخ مەحمود ڕەوانەی هیندستان کرا تا لەوێ فەرمانی لەداردانی دەرکەن و پاشـــان فەرمانەکەی گۆڕا و کرایە بەندیی تا هەتا و ســـەربردەی چۆنیەتیی هێنانەوەی شـــێخ مەحمودیش درێژە، ئەو کاتەی بەریتانییەکان نەیانتووانی بەبێ ئەو ناوچەکەی بەڕێوە ببەن.
بۆیەش ئەو ســـەربردەیەم وەک پێشـــەکییەک گێڕایەوە تا خوێنەری بەڕێز کەســـایەتیی مەحمود خان بناسێ و بزانێ بۆ گیراوە و پەیوەندیم پێیەوە چ بووە.
لەســـاڵی ١٩٣٧ڕا یەکێک لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی "داربڕ" بووم، کە دواترێ لە ١٩٣٨ گۆڕا و لە یەکەمین کۆنگرەی کۆمەڵەی لە کەرکووک لە ١٩٣٨ گیرا بووە حیزبی هیوا. مەحمود خان چەند ساڵ بوو لە بەندیخانەی کەرکووک بوو و، ئەو خزمەتکارێکی دڵسۆزی هەبوو و ناوی محەممەد ســـەعید بوو. ئەو کابرایە کرێکاریی دەکرد و لە تەکیەی تاڵەبانی دەژیا تا دەسهەقەکانی پاشەکەوت بکا و جلوبەرگ و پێداویستی و خواردن و تووتنی بۆ مەحمود خانی گەورەی پێ بکڕێ. وەک گوتیشـــم، خانەوادەی تاڵەبانی پەیوەندییەکی رۆحییان لەگەڵ ناوچەی هەورامان هەبوو و، مامە شـــێخ محەممەد جەمیلم، وەک پێشـــتر باسـم کرد، کچێکی لەوان خواستبوو. سەرباری ئەو شتانەش مامم سۆزی بۆ مەحمود خان هەبوو چونکە دژی ئینگلیزان خەباتی کردبوو، زۆرجاران دەمدیت کە محەممەد ســـەعیدی خزمەتچیی مەحمود خانی دەدیت پرسـیاری خانی لێدەکرد و، ئەویش بەڕێزەوە بەرانبەر شێخی ڕادەوەستا و جا شێخ دەیپرسی:"حەمەسەعید، خان حاڵوباڵی چۆنە؟" جا

وەلامی دەداوە:"یاشـێخ مادام نزای تۆی هەیە ئەو باشـە"جا مامم ڕووی لە قیبلە دەکرد و دەیگوت: " بۆخاتری جاهی پێغەمبەری نازدار و قیبلەی پیرۆز خوایە لە بەندیی ڕزگارکەی" مامۆژنیشم لەڕێی محەممەد سەعیدیڕا هەندێ یارمەتیی بۆ دەنارد.
کاتێ بە ڕاستیی ئەو پیاوە ئوستوورییەمان زانی و زانیمان چەندین ساڵی دوورودرێژە لە بەندیخانەیە، ئیدی یارمەتیدانی ئەوم گرتە ئەسـتۆ و هەندێ باروبوومان لەڕێی حیزبی هیواوە بۆ کۆدەکردەوە، جا من و کاکەحەمەی خانەقا و مارف بەرزنجی ئەو کارەمان بە نهێنی دەکرد نەکا حکوومەت پێی بزانێ و باروبووەکەیشمان بە حەمەسەعیدیدا دەنارد. لە یەک لە دیدارە مانگانەکان کە هەندێ پارە و خواردن و میوەم پێبوو، حەمەسـەعیدم دیت، ئەویش پێیناسـاندم و ئەودەمی گەنجێکی بەگوڕ بووم، ئیدی چاوەکانی بۆ چارەنووسـی خێزانەکەی لە هەوارامانی ژێر دەسـەڵاتی ڕەزاشـای دیکتاتۆری دڵڕەق پڕ ئاوبوو. ئەو یارمەتییانەی ئەو پیاوە هەر بەردەوام بوو تا ڕۆژێک گوێمان لێبوو، مەحمود خانی چەندین ساڵی لە بەندیخانە بەسەر بردبوو، بەردەبێ. ئیدی مامم دەستەجلێک و عابایەکی بۆ هەنارد و بەربوو، بووە میوانی تەکیەی تاڵەبانی، لەبیرمە مامم بەخۆ و بە کۆمەڵێ موریدەوە لەبەردەرگای تەکیە پێشـوازیی لێ کرد و ژوورێکی تایبەتی بۆ تەرخان کرد تا لەوێ نان بخوا و ، بەشـێکی زۆری کاتی خۆی بە نێرگەلەکێشـان لە دیوەخانی شـێخی بەسـەردەبرد. پیاوێکی سـەنگین و کەمدوو بووبە دیالێکتی هەورامانی دەدوا. دوای ئەوەی سـاڵێک میوانی تەکیە بوو وەک پەناهەندەی سـیاسـی وەرگیرا و حکوومەت خانوێکی لە گەڕەکی ئیمام قاسمی نزیک تەکیە بۆ بەکرێ گرت و توانیی ژنەکەی و هەندێ منداڵی بێنێ و کوڕە گەورەکەی هەر لە هەورامان بوو و ناوەناوە سـەری لێ دەدا. کە لەشـەڕی دووەمی جیهانییش هاوپەیمانان ئێرانیان داگیرکرد ئیدی بەندییە سیاسییەکان بەردران و، مەحمود خان گەرایەوە هەورامان تا لەوێ بچێتەوە بەر دیوانی خودا و یادی ئەو مرۆڤە ئوستوورییە هەر لە یادەوەری و ویژدانی مندا بمێنێ.

## فەریق بەکر سدقی لە کەرکووک:

بەکر سـدقی، خەڵکی گوندی عەسکەری سـەر بە ناحیەی ئاغجەلەرە "قەڵاسێوکە"، لەوێرا نازناوی عەسکەریی وەرگرتووە. پێچەوانەی جەعفەر پاشای عەسکەری، کە خەڵکی هەمان گوند بوو، بەڵام نکووڵیی لە کوردبوونی خۆیشی دەکرد، بەکر سدقی سەردانی گوندەکەی دەکرد و سەری لە خزمەکانی دەدا.

بەکر سـدقیی عەسـکەری، کە ئەودەمی پلەی لیوای هەبوو، کرایە قائید فیرقەی دووەم و بنکەکەیشـی لە کەرکووک بوو و، نـاوچەی کـارکردنیشـی هەموو کوردسـتـانی دەگرتەوە"ویلایەتی مووسڵی جاران". بەکر سـدقی ئەفسـەری سـوپای عوسـمانلی بووە و لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق دێتە ڕیزی سوپای عێراق، چونکە ئەفسەرێکی باشیش بووە پلە بەپلە بەرزبووەتەوە تـا گەیشـتووەتە پلەی لیوا ڕوکن و، دواتریێ کراوەتە فەرماندەی فیرقەی دووەمی زۆربەی کارمەندەکانی کوردبوون. بەکر سـدقی زۆردەهاتە سـەردانی شـێخ حەبیب تاڵەبانیی مامم، کە ئەودەمی سـەرۆکی شـارەوانی بوو و، دیوەخانێکی هەبوو بەرپرسانی دەچوونێ و ئەو لەبەر پێگە خێزانییەکەی و کاسایەتییەکەی بەدەسـەڵاتترین بەرپرسـی دەوڵەت بوو. وادیارە بەکر سـدقی، لەبەر ئاواتە تایبەتەکانی و پەیوەندیی بە کەسـایەتییە کوردەکانی نـاوچەکەوە، نموونەیەکی نیگەرانیی حکوومەت بووبێ. هەر ئەوەش وایکرد حکوومەت ماڵەکەی مامە شـێخ حەبیبم بخاتە ژێر چاودێریی پۆلیس. پۆلیسـێکیان هەر لە گەڕەکەکە ڕاسـپارد تا ئەو کارە بکا و ئەویش ناوی"عەتا خەلیفە ئەحمەد" بوو و، کە بەکر سدقی سەردانی مامی بکردایە ئەو قاوەی دەهێنا.

کە لەماڵی مامم بوومایە، تێبینیم دەکرد بەکر بە تورکمانی قسەیان لەگەڵ دەکا، ئەوەی لە ماڵی مامیشـم دەچووە دیداری، شـێخ قادر تاڵەبانی بوو "شـێخ قادرسـی مەنسـور". بەکر ژمارەیەک پلەداری سـوپای ڕەوانەی خولێک کرد کە هەموویان کوردبوون و بە پلەی مولازم دەرچوون و لە فیرقەی دوو خزمەتیان کرد.

لەو بەڵگەنامانەی لەبەردەسـتن، وا دەردەکەوێ کە "جەماعەتی ئەهالی" پلانیان هەبووبێ کودەتایەک لەسـەر حکوومەتەکەی یاسـین ئەلهاشـمی بکەن و بەکر سـدقییشـیان دیاری کردبوو ئەو کارە بکا، ئیدی لەڕێی حیکمەت سـلێمانەوە پەیوەندییان پێوەکرد. حیکمەت سـلێمانیش زڕبرای ژەنەراڵ مەحمود شـەوکەت بوو، کە لە تورکیا، دژی سـوڵتان عەبدولحەمید، سـەرکردایەتیی کودەتـای ئیتیحادییەکـانی کرد. حیکمەت پەیوەندییە تایبەتییەکانی خۆی لەگەڵ بەکر سـدقی قۆسـتەوە و پلانێکیان دانا تا کودەتایەک لەسـەر حکوومەتەکەی یاسـین ئەلهاشـمی بکەن و حکوومەتیکی ئیئتیلافی دامەزرێنن کە ئازادییە دیموکسـییەکان بداتە گەل و هەڵبژاردنێکی ئازادی ئەنجوومەنی نوێنەرانیش بکا. حیزبی

شـــیوعیی عێراقییش، هەر بۆ ئەو مەبەســـتە، لە ســـەرەتای دامەزراندنیدا پشـــتگیریی ئەو حکوومەتەی کرد و بە دوو کەســـایەتیی نیشـــتمانیش بەشـــداریی کرد، ئەوانیش محەممەد جەعفەر ئەبو تمەن و کامل چادرچی بوون، بەڵام ڕووداوەکان بە ئاراســـــتەی ئاواتەکانی گەل بەردەوام نەبوون. ســـەرەتای کودەتا هەندێ ســـەندیکا و ڕێکخراوی میللی و پیشـــەیی دامەزران و، ڕێگە بە کۆبوونەوە و خۆپیشـــــاندانان درا، بەڵام پێکهاتەی ئایدیۆلۆژیی دوو کەســـــایەتیی هەرە دیاری حکوومەتی کودەتا، بەکر ســـــدقیی  پێگەی ســـــەرۆکی ئەرکانی سوپای بۆ خۆی دانا و حیکمەت سلێمانی بە بنەچە تورک بوو و، بووە ســەرۆکوەزیران، تایبەت بوو و، ئەو دووە هەڵگری بیرۆکەی بیرۆکەی چاکســـــازیی وەک بیرۆکەی مســـــتەفا کەماڵ ئەتاتورک و ڕەزاشـــای ئێران بوون، تا لەڕێی یاسـا و مەرسـووومان پەرە بە کۆمەڵگە بدەن نەک لەڕێی خودی گەلەوە. ئیدی، دوای ماوەیەک نیەتی خۆیان ئاشـــکرا کرد و دەســـتیان بەسەر دەسەڵاتدا گرت، ئەوەش وایکرد جەعفەر ئەبو تمەن و کامل چادرچی لە حکوومەت بکشێنەوە.

لەســاڵی ١٩٣٦، کە  قوتابیی پۆلی شـــەشـــی ســـەرەتایی بووم، بۆ پێشـوازیی شـێخ جەمیل تاڵەبانیی مامم، کە لەحەج دەهاتەوە، لەگەڵ باوکم چووومە بەغدا و، بە حوکمی خزمایەتییش چاوم بە شـــێخ حەســـــەن تاڵەبانی کەوت. ئەودەمی ئەو لە 'جەمەعاتی ئەهالی' نزیک بوو، ئیدی حکوومەتی کودەتـا کردبوویـانە فەرمـانبەر لە وەزارەتی نـاوخۆ. چـاوم بە شــــێخ عەبدولقادر تاڵەبانییش کەوت، کە ئەودەمی لە کەرکووک بوو و برادەری بەکر سدقی بوو، ئیدی لە پەرلەمانی نوێدا وەک نوێنەری کەرکووک کرابووە نوێنەر. دەشگوترا، کودەتایەکە بە ڕێککەوتنی بەکر سدقی و مەلیک غازی لەدژی حکوومەتەکەی یاسین ئەلهاشمی کراوە، چونکە ویســــتبووی دەســـــەڵاتەکانی مەلیک کەمکاتەوە و بیکاتە مەلیکێکی دەســــتووریی پارێزراوی نـا بەرپرس و، دەشـــــگوترا بەکر پەیوەندیی بە بەریتـانییەکـانەوە هەبووە و گوتراش پەیوەندیی بە ئەڵمانەکانەوە کردووە.

جا بیروڕایەکان دەربارەی بەکر ســــــدقی هەرچییەک بن، بە جوداکردنەوەی بزاوتەکانی 'جەماعەتی ئەهالی'ی ئەوێ دەمی و، ئەو کێشانەی لە ١٩٣٥ لە باکوور و باشوور تووشی حکوومەتەکەی یاسین ئەلهاشمی ببوون و ئەو گۆرانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی لە تورکیا و ئێران دەکران ، ناکرێ بگەینە ڕاســـتیی ئامانجەکانی هەریەک لە بەکر ســــدقی و حیکمەت سلێمان.

بەلام، ڕێچکەی تاکەکەسیی هەریەک لە فەریق بەکر سدقی و حیکمەت سلێمان، کارێکی کرد لە گەل و هێزە سیاسییەکان داببڕێن، ئەوەش، ئەو کاتەی لە ١٩٣٧[14] لە موسڵ-کاری غافڵکوژکردنی بەکر سدقیی سەرکردەی کودەتا ڕێکخرا، وایکرد لەناوبردنی ئاسان کردن. چەندین دەستەی بەریتانی و نەتەوەیی ناو سوپا لەو کارەدا بەشداربوون و دوو ئەفسەری کورد جێبەجێیان کرد ئەوانیش هەریەک لە محەممەد خورشید داودی و عەبدولعەزیز یامولکی بوون. بە کوژرانی بەکر سدقییش، حیکمەت سلێمان دەست لەکار کێشسانەوەی حکوومەتەکەی لە ١٧ی ئابی ١٩٣٧ پێشکەش کرد و، دواتریش، لە سەردەمی حکوومەتەکەی نووری سەعید[15]، بە وەی تاوانبار کرا گوایە پیلانی غافڵکوژ کردنی مەلیک غازیی دارشتووە، کە دەیویست تۆڵە لە حکوومەتی کودەتا بکاتەوە چونکە دەستیان لە کوشتنی جەعفەر عەسکەریی ژن خوشکیدا هەبووە کە لە بەرەبەیانی ڕۆژی کودەتا کوژرابوو و، ئیدی تۆمەتی کودەتا ئاراستەی کۆمەڵێک لەو کەسانە کرا کە بەشداریی کودەتای ١٩٣٦یان کردبوو، لەوانەش شێخ عەبدولقادر تاڵەبانیی مامم، کە دوای ئەوەی حوکمی بەندکردنی درا چەندین ساڵی لەو خێوەتگەیەی لە حەویجە دروستکرابوو بەسەربرد و، لەوێ لە هەڵکەندنی ئەو نۆکەندە کاریان پێ دەکردن کە بۆ نیشتەجێکردنی عەشیرەتی ئەلعوبێدی عارەب لەو ناوچەیە هەڵیان دەکەند و، ئەو ناوچەیەش سەدان ساڵ بوو پاوانی عەشیرەتە کوردەکان بوو، زەکی خەیریی سەرکردەی شیوعییش، ساڵێکی بەندیی لەو خێوەتگا زۆرەملێیە نامرۆڤانەیە بەسەر برد کە لەژێر قورسایی کاری زۆرەملێ بەشێکی زۆری بەندییەکان مردن و ژمارەیەکی زۆریشیان، کە هەوڵی راکردنیان دەدا تا لەو مامەڵە نامرۆییانەی لەگەڵیان دەکرا دەربازبن، کوژران.

---

[14] _ غافڵکوژکردنی بەکرسدقی و محەممەد عەلی جەواد لە بنکەی سەربازیی مووسڵ، لەو کاتەی دەچوون ئامادەی مانۆڕی سەربازی بن لە تورکیا، ڕێکخرا و ، لە ١١ی ئابی ١٩٣٧ هەردووکیان لەناوبردران. دوای بەکر سدقی، مەلیک غازی، جەمیل مەدفەعیی راسپارد لە ١٧ی ئاب وەزارەتی چوارەم پێکبێنێ، کە بەرانبەر ئەو ڕووداوانەی لەگەڵ کودەتای بەکر سدقی هاتنەپێش سیاسەتی "پەردە دادانەوەی" پەیڕەو کرد و، ئەو ڕق و کینانەی ئەو سەردەمیی لەبیر کرد. بۆ زیاتر بنوارە: جعفر عباس حمیدی. تاريخ العراق المعاصر "١٩١٤- ١٩٦٨" ، مكتبة عدنان، بغداد، ٢٠١٥، ص ١٥٣.

[15] _ نووری سەعید، دوای دەست لەکارکێشانەوەی وەزارەتی چوارەمی جەمیل مەدفەعی، لە ٢٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٨وەزارەتەکەی خۆی دامەزراند. جعفر عباس حمیدی. سەرچاوی پێشوو ص ٥٧.

## شەڕی دووەمی جیهانی ١٩٣٩:

هەوری شەڕی دووەمی جیهانی لە ئاسمانی دنیایە پێکدادەهاتن. ڕاستییەکەی، ئەودەمەی ئیتاڵیا حەبەشەی داگیرکرد و دەستی بەسەر لیبیادا گرت و، ئەڵمانیای هیتلەری چیکسلۆڤاکیای داگیرکرد، ئەو شەڕە پێش هەڵگیرسانی بەرپابوو. بەڵام دەوڵەتە ئیستیعمارییەکانی دی خۆیان لە بەرەورووبوونەوەی هێزی سەربازیی ئەڵمانیای نازی و ئیتاڵیای فاشیستی و ژاپۆن لادەدا. کە ئامانجیان دروستکردنی بەرەیەکی دیکەبوو لەدژی دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی پێشتری و، وڵاتانی تەوەر دەیانویست کۆلۆنییەکان دابەشبکرێنەوە.

لەو بوارەیدا، پێشبینییەکانی لینین[16] سەبارەت بە ئیمپریالیزم گرنگیە مەزنەکەی دەردەکەوێ، کاتێ لە کتێبەکەیدا بەناوی "ئیمپریالیزم، دوا قۆناغی سەرمایەداری" سەرنجت بۆ دەربڕینێک رادەکێشێ کە لە سایەی ئەو ماجەرایانەی ئەوڕۆ لە دنیادا روودەدەن، دەلالەتێکی گەورەی هەیە، مەبەستیشم کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم و بەراییەکانی سەدەی بیست و یەکە و، دەربڕینەکەش دەڵێ: "ململانێیەکان لەسەر وڵاتانی نیمچە کۆلۆنیالی دەکرێن، چونکە وڵاتە کۆلۆنیالەکان دەمێکە دابەشکراون" جا دەکرێ پیاو بپرسێ، ئەرێ ئەو قسەیەی لینین ئێستا ئەو وڵاتانە ناگرێتەوە کە دوای شەڕی دووەمی جیهانی سەربەخۆییان وەرگرتووە؟ بەتایبەتیش ئەوەی ئێستا پێیدەگوترێ "جیهانگەرایی"؟. دەربڕینێکی لە کتێبی ناوبراودا هەیە و وەڵامدانەوەی کارڵ کاوتسکیی مارکسیستی پێشترییە کە گوتبووی: "کارتێلە جیهانییەکان، کە ڕواڵەتێکە لە ڕواڵەتە هەرە دیارەکانی سەرمایەداری، ڕەنگێکی جیهانیی پێ دەگرێ ونامەیەکە بۆ دنیا سەبارەت بە بەرقەراربوونی ئاشتیی نێوان گەلان".

لینین ئەو قسەیەی بە پووچ وەسف کردووە، چونکە مۆنۆپۆلە جیهانییەکان دەریدەخەن مۆنۆپۆلە سەرمایەدارییەکان ئێستا لە چ ئاستێکدان و، دیاریشە دەوڵەتە سەرمایەدارەکان بۆ چ مەبەستێک ململانێیانە. کارە هەرە گرنگەکەش لە لایەنی کۆتاییدایە؛ چونکە هەر ئەوە

---

[16] _ ڤلادیمێر ئیلیچ ئۆلیانۆڤ "لینین" لە ٢٢ی نیسانی ١٨٧٠لە سمبرسک لەدایکبووە، کە ئەوڕۆ پێیدەڵێن ئۆلیانۆفسکی. باوکی پشکنەری قوتابخانەی سەرەتایی بووە. لینین توانیی ئاڵقەیەکی سۆسیالیستی لە دەوری خۆی کۆکاتەوە و ڕۆژنامەی "ئالاسکیرا"ی دەردەکرد و، توانیی سەرکردایەتیی ئەو شۆڕشە بکا کە لە شەشی تشرینی دووەمی ١٩١٧ دەست بەسەر بەڕێوەبەرایەتییەکانی دەوڵەتدا بگرێ و، بووە سەرۆکی حکوومەتی نوێ لە رووسیا. لە گۆرکیی نزیک مۆسکۆ و لە ٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٢٤ کۆچی دوایی کرد. بڕوانە جاد بروها تاریخ الاتحاد السوفییتی. ترجمة ولیم خوری، موءسسة النوری للتوزیع والنشردمشق، د ت ص١١؛ ابراهیم حداد .الشیوعیة و الدیمقراطیة فی الشرق و الغرب، دار الثقافة، بیروت، ١٩٥٨ ، ص٨١؛ الان پالمر، موسوعة التاریخ الحدیث ١٧٨٩-١٩٤٥، جزءان، ترجمة: سوسن فیصل السامر، یوسف احمد امین، دار المامونللترجمة و النشر، بغداد، ١٩٩٢، ص ٤٣.

واتای ڕووداوە مێژووییە ئابوورییەکانمان بۆ دەردەخا، چونکە شـــکڵ دەکریَ بگۆڕیَ و هەمیشـەش بەپێی هەندیَ هۆکاری جیاوازی، کە شـێوازیان تایبەتە و تا ڕادەیەک کاتین، لە گۆڕاندایە. لەکاتێکدا ململانیَ و شـــێوازە چینایەتییەکەی تا چینەکان مابن ناگۆڕێن، چونکە شێوەی ململانیَ و شێوازە کاتییەکەی گۆڕان ئەو دوو خاڵەن کە سەرنج ڕادەکێشن.
لەکاتی هەڵگیرســـانی شـــەڕدا لەو تێبینییانە نەدەگەیشـــتم. ئەودەمی قوتابیی دوا پۆلی خوێندنی ناوەندی بووم، نەتەوەییەکی بۆرژوازی بووم، واتە ئەندامێکی ســـەرکردایەتیی حیزبی هیوای نەتەوەیی بووم وکەسێکی بەسەرخۆدا داخراوی شارەزای بیروڕای زانستی نەبوو تـا ڕووداوەکـانی پیَ لێکـداتەوە. هەر بۆ مێژووش دەڵێم: یـاســـین تەلەعفەریی مامۆســـتای مێژوو تاکەکەس بوو کە ئیحای ئەوەی دەداینیَ شـــەڕ لە ئەنجامی دژبەرییە ئامبازی یەکدی بووەکانی نێوان ولاَتانی ســـەرمایەدار ڕوویداوە. بەلاَم ئەو بیروڕایانە لەســـەرەوەی توانای تێگەیشـــتنی ئێمە بوو، چونکە خویندن شـێوەیەکی مژاویی دوور لە ڕاسـتیی هەبوو، هەر بۆ نموونە، لە کتێبی مێژوو دەمانخوێندەوە کە شـەڕی نێوان ئەڵمانیا و فەرانســـە ی ســـاڵی ١٨٧٠ لەبەر ئەوەی ڕوویداوە چونکە برووســـکەیەکی ڕاوێژکاری ئەڵمانیا گەیشـتووتە دەسـت لویس پۆناپارتی پاشـای فەرەنسـا دوای ئەوەی لە گەرماوی هاتۆتە دەری و ئەودەمی توورەبووە، ئیدی شەڕ هەڵگیرساوە، واتە ئەگەر لویس پۆناپارت توورە نەبوایە شـــەڕ هەڵنەدەگیرســـا. مامۆســـتا یاســـین تەلەعفەری دەیتوانی ڕاســـتیی ڕووداوەکـانمـان تێبگەیەنیَ، بەلاَم ئەوە قەدەغە بوو، چونکە بەریتـانییەکـان دوای بزووتنەوەی مایسی ١٩٤١عێراقیان داگیرکردبووەوە و ئەفسەر حوکمی ولاَتیان دەکرد و ســـەرپەرشـــتیی خوێندنیشـــیان دەکرد. یەک لەو مامۆســـتایانەی ئەودەمی درکیان بە ڕاسـتییەکان دەکرد، مامۆسـتا مەتتی زەکۆ بوو، ئەو لە پێشـکەوتنخوازە دێرینەکان بوو و، ڕۆژێکیان دە دانەی ڕۆمانی "دایک"ی[17] ماکسـیم گۆرگیی تەرجەمەی عەرەبی کراوی دامیَ

[17] _ ڕۆمانی "دایک"ی گۆرگی ، بەڕاستی لەو دەقانەیە کە ڕێیان بۆ بەرپابوونی شـۆڕشـی ڕووسـیا خۆشـکرد. لەگەڵ ئەوەشدا دەبیَ لێرەدا باسی ئەوەی بکەین کە ئەلیکسیَ بشکۆف "١٨٦٨- ١٩٣٦" کە ئەوە ناوی ڕاستەقینەی ماکسیم گۆرگییە، هەرهێندەی پێشبینییەکەی بەڕاست گەڕا و شۆڕشی ۆلشەویی ڕووسی لە ساڵی ١٩١٧ هەڵگیرسا، ئیدی ئەو هەڵوێسـتێکی نەرێنیی بەرانبەری هەبوو، چونکە دیتیی زیاد لە پێویسـت میللەی و دیماگۆجییە، هەندەشـی پێنەچوو لە ١٩٢١ ڕووسـیای بەجێهێشـت. هەتا ١٩٢٨ نەگەرایەوە ، کە گەڕانەوەکەیشـی لەسـەر داوای خودی سـتالین بوو، کە زۆری چاو لێبوو و سـاڵی ١٩٣٤ گەیاندییە پۆسـتی سـەرۆکی نووسـەران. لەگەڵ ئەوەشـدا،سـەرباری ئەو شـکۆیە دەسـەلاَتییەش، هەندەی نەبرد و هەر دوای دووسـاڵ گورکی لەهیکرا ئەو دنیایەی ئێمەی بەجێهێشـت. هەتا ئەوڕۆش کۆمەڵێ گومان دەوری مردنەکەیان داوە، داخوا هەر بەڕاســـتی بەو دەردەی ســـییەکانی مرد کە تووشـــی ببوو، یان دەیـانـگـوت تـووشـــــی بـووە، یـان بە فەرمـانـی ســــتـالـیـن ژەهـرخـوارد کـراوە؟ بـۆ زیـاتـر: بـڕوانە ttp://www.terezia.org/section.php.

تا بیفرۆشم و، منیش خوێندمەوە ، بەڵام لێی حاڵی نەبووم هێندە نەبێ سەرسامی دایکە بەجەرگەکە بووم و، ئێمەش ئەودەمای پێویستمان بە دایکانی ئاوەها هەبوو.
شەڕ لە بارودۆخی بێ هەڕمێنیی ئابووری و قەیرانی خنکێنەری وڵاتانی سەرمایەداری و وڵاتانی پاشکۆیان هەڵگیرسا، لەوانەش عێراق. عێراق وڵاتێکی کشتوکاڵییە و نزیکەی ٨٠٪ی خەڵکەکەی لەو بوارەدا کاردەکەن، ئیدی نرخی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان داڕووخان و، وایلێهات نرخی فەردەیەک گەنمی پەنجا کیلۆیی بووە سەد و پەنجا فلس و جۆ بووە سەد فلس. ئەگەرچی عێراق نەشبووە گۆڕەپانی شەڕ، بەڵام قورسایی جەنگ خەڵکی ماندوو کرد. زۆربەی کاڵاکان لە بازاڕدا نەمان، شەکر و چا و سابوون و قوماش لەبازاڕدا شوێنەواریکیان نەما. ئیدی حکوومەت ناچاربوو هەندێ شتومەک بە پسووڵەی خۆراک دابەش بکا. بەڵام زۆربەی ئەو شتومەکانە بە دەستی فەرمانبەرە گەندەڵەکان بەقاچاخ دەبردرایە ئێران. گوتیشیان ژمارەی دانیشتووانی عێراق بەپێی پسووڵەی خۆراک گەیشتە ٢٠ ملیۆن کەس، لەکاتێکدا تەنیا سێ ملیۆن کەس دەبوو. دەتدیت زۆربەی جووتیاران جلێکی لە کیسەی "جنفاس" دروستکراویان لەبەربوو، خەڵکی شاریش ناچاربوون چادرەکۆنەکان خم و ڕەنگ بکەن و چاکەت و پانتۆڵی لێ بدروون. پەرداخی ئاو و پیاڵەی چای لە بازاڕدا نەمان، ئیدی خەڵکەکە بوتڵیان دەبڕییەوە و دەیانکردە پەرداخ و ئیستیکانی چایان لە قوڕی سوورکراوە دروست دەکرد. ئەفسەر و سەربازە بەریتانییەکان هەندێ کاڵایان لە کۆگاکانی سوپای بەریتانی دەدزی"نافی" و لە بازاڕی ڕەش دەیانفرۆشتەوە، لەوانەش تایەی ئۆتۆمۆبیل ، کە نرخی یەک تایە گەیشتبووە سێ سەد دینار.
دەبووایە حکوومەتی عێراق تێچووی بژێویی سوپای دەیەمی بەریتانی بدا کە ئۆردوویان لە عێراق بوو و، ئەو سوپایە دووڕیانی ستراتیژیی کفریی کردبووە بنکەی سەرەکیی خۆی و، حکوومەت جووتیار و موڵکدارەکانی ناچار دەکرد نیوەی بەرهەمی گەنمی خۆیان بە نرخی فەرمی بفرۆشنە ئەو سوپایە تا نانی سوپای بەریتانی دابین بێ. بەڵام ئەو نرخە لە نرخی بازاڕ بەرزتر بوو، بۆیە بازرگانانی شەڕ ئەو بابەتەیان قۆستەوە تا بەروبوومی جووتیاران بە نرخێکی کەم بکڕن و هەر بەناوی ئەوانیش بە نرخی فەرمی بیفرۆشن، چونکە دەبووایە جووتیار چەندین ڕۆژ چاوەڕێ بکا تا حکوومەت بەروبوومەکەی لێ وەردەگرێ و، بۆ کورتکردنەوەی کاتەکەش ناچاربوو بەرتیلێکی زۆر بداتە فەرمانبەرانی بژێوداری"اعاشە" تا بەرهەمەکەی لێ وەرگرن. بۆیە پێی باشتربوو بە نرخێکی کەمتر بیفرۆشێتە بازرگانێک و لەو دۆخە دەربازبێ.
هەرچی بازرگانە بچووکەکان بوون، سەرقاڵی بەقاچاخ بردنی شتومەک بوون بۆ ئێران. لەو شتومەکانەش هەردوو کانزای مس و ئەلەمنیۆم و شەکر و چای دزراوی دەستی

موڵکدارەکانی سەدان ناوی وەهمی یان مردوویان دەنووسی تا بەشی ئەو شتومەکانەیان وەرگرن و، فەرمانبەرانی بەڕێوەبەری و تفاق و ئازووخەش لەو فێڵەدا بەشداربوون.
ڕاوێژکارە سیاسییە بەریتانییەکان خۆیان لە هەموو کاروبارێکی وڵات هەڵدەقورتاند، بۆ نموونە، عەقید "کۆرنێڵ" لاین دەسەڵاتداری ڕاستەقینەی هەموو کوردستان بوو، ئەو ئەفسەرێکی هەواڵگریی بەریتانیا بوو و پێش ئەوەی شەڕ دەستپێبکا کرابووە سەرۆکی دەستەی یەکلاکردنەوەی مافەکانی موڵکداری لە ناوچەکە و، لەو ڕێیەوە پەیوەندییەکی فراوانی لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتەکان دروستکردبوو و زمانی کوردییشی دەزانی. لە مەودای کارکردنیدا زۆری زەویی جووتیار و چووکەڵە موڵکدار دابووە موڵکدارە گەورەکانی سەرۆک عاشیرەت بوون. جووتیارەکانیش، ئەو کاتەی زەوییەکانی لەدەست دەردەهێنان تا بیانداتە موڵکدارە گەورەکانی وەک سەرۆک عاشیرەتەکان، دەورەیان لێ دەدا و نەیشییان دەزانی ئەو "برادەرە" کوردی دەزانێ، ئیدی جووتیارێک گوتبووی: " ئای ئێستا بەرچیغێکی لە تەپڵی سەری نەدەی! مێشکی بکەویتە ناو دەمی"، جا لاین سەری بەرزکردبووەوە و زۆر بە هێمنییەوە گوتبووی: "بۆ، باوەکوشتەتم؟".
یاریدەدەرەکەی لە کەرکووک ناوی "مێژەر کینگ" بوو، مێژەر کینگ سەری لە قوتابخانە و مزگەوت و پەرستگا و دیوەخانی کەسایەتییە گەورەکان دەدا تا هەندێ دیارییان بداتێ، بەبیریشم دێ، دوو سەعاتی زێڕینی دایە دوو قوتابیی یەکەمی خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی، ئەو دووەی خەڵاتەکەیشیان وەرگرتبوو دوو قوتابیی کورد بوون و ئەوانیش "وەحیدەدین کەتانە"ی خەڵکی دهۆک بوو و لە کەرکووک دەیخوێند و"من" بووم لە خوێندنی ئامادەیی، چونکە یەکەمی ناوەندی و ئامادەیی بووین، تائێستاش ناومان، لە لیسی قوتابییە زیرەکەکان، لەخوێندنی ئامادەیی "ناوەندی" کەرکووک هەڵواسراوە.
هەر بۆ مێژووش دەڵێم: هەریەک لە مورشیدی تەکیەی تاڵەبانی، مامە شێخ محەممەد جەمیل تاڵەبانیم و ئەحمەدی خانەقا هیچ پارەیەکیان بە ناوی هاریکاریی هەژاران لە تەکیە و خانەقایەکەیان وەرنەگرت. بەڵام سێینە ناسراوەکەی کەرکووک، مەلا ڕەزای واعیز و مەلا مەجیدی قوتب و مەلا ئەحمەدی حەکیم، بەردەوام سەریان لە کۆرنێڵ لاین دەدا.
مەلا محەممەدی جەلیزادەی لە کۆیەڕا بۆ سەردانی ڕاوێژکاری سیاسی هاتبووە کەرکووک و، میوانی سەید ئەحمەدی خانەقابوو، دەگێڕێتەوە کە خۆی بۆ دیدەنیی ئامادەدەکا، سەید ئەحمەد بەگاڵتەوە پێیدەڵێ "ئێمەت لەبیربێ"، پێش ئەوەی قسەکەیشی تەواو بکا مەلا محەممەد وەڵامیدەداتەوە و دەڵێ: "لای خواکەت". ئەو قسەیەش لەو ئایەتە پیرۆزە وەرگیراوە کە دەفەرموێ: "اذکرنی عند ربک"، واتە لای خواکەت منت لەبیربێ و باسم بکە.

## ڕەشید عالی گەیلانی و هاتنەوەی بەریتانییان:

ڕەشــید عالی گەیلانیی خوالێخۆشــبوو، لە خانەوادەی گەیلانییە کە لە عێراق و دەرەوەش ناســراون. ئەو خانەوادەیە پێگەیەکی شــکۆداریان هەبووە و ســەرۆکەکیشــیان بە نەقیبی ئەشــرافی شــار هەڵدەبژێردرا، کە بەریتانییەکانیش لە شــەڕی یەکەمی جیهانی عێراقیان داگیرکرد، پەنایـان بۆ ســـەیـد عەبـدولڕەحمـانی نەقیـب برد تـا لە بەڕێوەبردنی وڵاتـدا هاریکارییان بکا، ئیدی کردیانە یەکەم ســـەرۆکوەزیرانی عێراق و کوڕەکەی، ســـەید مەحمودی نەقیب، لە نەقیبیی خانەوادەدا جێی گرتەوە و پاش ئەویش سەید عاصم گەیلانی بووە نەقیب.

ســەید ڕەشــید عالی گەیلانی لە هەڵکشــانی پۆســتە فەرمییەکاندا کەســێکی چەلەنگ بوو و ماوەیەک وەک وانەبێژ لە کۆلیژی مافی بەغدا کاری کرد و، لە چەندین وەزارەتیش کاری کرد بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی ســیاســـەت و پێکهاتەی ئەو وەزارەتانە چییە. و کاتێ فەریق بەکر سدقی ٢٩ی تشرینی یەکەم کودەتای کرد و حکوومەتەکەی یاسین ئەلهاشمیی ڕووخاند، ڕەشـید عالی لەو دووەم حکوومەتەی یاسـین ئەلهاشـمیی بووە وەزیری ناوخۆ و، نووری سەعیدیش وەزیری دەرەوە بوو.

لە مەودای شــەڕی دووەمی جیهانیدا، ســەید ڕەشــید عالی گەیلانی، لەڕێی ، دکتۆر فریتز گرووبای باڵیۆزی بەغدایانەوە ، پەیوەندیی لەگەڵ ئەڵمانیا پەیداکرد. ئیدی لە دەســـتەی ئەفســەرە نەتەوەییەکان نزیکبووەوە، کە عەبدولئیلاهی "وەســی"ش لەســەر کورســی ڕایکرد تا خۆ لەبن باڵی بەریتانییەکان بنێ، ڕەشـــید عالی گەیلانی دامەزراندنی حکوومەتێکی ڕاگەیاند کە بە "حکوومەتی بەرگریی نیشـــتمانی" ناســـراوە و، لە ٣٠ی نیســـانی ١٩٤١ دایمەزراند.[18] ئەو حکوومەتە یەک لە ئەندامانی خانەوادەی هاشـــمیی کردە "وەســـی" و ئەویش "الشــریف شــرف" بوو و جێی عەبدولئیلاهی گرتەوە.بەڵام ئەو حکوومەتە زۆری نەخایاند، لە ٢ی مایســـی ١٩٤١ هێزەکانی بەریتانیا بە هاوکاریی هێزە ئوردونییەکان لە بنکەی ســـەربازیی حەبانییەڕا داکشـــان تا عێراق داگیرکەنەوە و وەســی بێننەوە ســەر تەخت، ئیدی حکوومەتێک بە سەرۆکایەتیی جەمیل مەدفەعی دامەزرا.[19]

---

[18] ـ بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، الاسرار الخفية لحركة سنة ١٩٤١ التحررية، دار الشؤون الثقافية، بغداد، ١٩٩٠، ص١١٤.

[19] ـ جەمیل مەدفەعی ئەو وەزارەتە نوێیەی، پێنجەم وەزارەت، لە دووی حوزەیرانی ١٩٤١ پێکهێنا، ئەویش دوای گەڕانەوە بەغدای وەســـی و کۆڵەگەکانی دەســـەلات و دوای پێکهێنانی وەزارەتەکەش حوکمی عورفییش ڕاگەیەندرا. عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات، ج٦، ص٩-١٠.

ســــەر باری ئەوەی بەریتانییەکان، وەک مەودای شــــەڕی یەکەمی جیهانییان نەکرد و ڕاستەوخۆ فەرمانڕەوای سیاسییان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری عێراق دانەمەزراند، بەڵام لە زۆربەی لیوایەکانی عێراق "ڕاوێژکار"ی هێزەکانی بەریتانیایان دامەزراند، کە ئەفسەری هەواڵگری بوون و فەرمـانڕەوای راســـتەقینەی عێراقیش بوون و، زۆربەی خەڵکەکەش پێیاندەگوتن حاکمی سیاسی.

لە کوردســـتان، ڕاوێژکاری ســـیاســـیی هێزەکانی بەریتانیا عەقید "کۆرنێل لاین"بوو و، هاووڵاتییە بەڕێوەبەرییەکان بە ئاماژەی ئەو دادەمەزران و دەگواســـترانەوە و، لە هەموو کارێکی بەڕێوەبردنیش دەچوونەوە لای ئەو. چەند ئەفســـەرێکی بەریتانییش لە کەرکووک و هەولێر و موسـڵ و سـلێمانی هاریکارییان دەکرد. هەرچی سـوپای عێراقیش بوو، ئەوا ژەنەراڵ "ڕنتن" بەناوی پشـکنەری گشـتی تێیدا بالادەسـت بوو، ئەگەر ئەڵمانیا هێرشـی بکردبا سەر ناوچەکە، ئەو سوپایەکەی ئامادە دەکرد.

کاپتن شووتەر، لە سلێمانی دامەزرا و ئەو کاپتنە سەر بە هەواڵگریی بەریتانیا بوو و پێش بزووتنەوەی ڕەشید عالی، لە کەرکووک مامۆستای ئینگلیزی بوو، کە ئەو بزووتنەوەیەش شـــکســـتی خوارد، شـــووتەر بە ســـەرکرداتەیتیی کەتیبەیەکی زرێپۆش بەشـــداریی داگیرکردنەوەی ناوچەکەی کرد و ئەوجا کرایە ڕاوێژکار لە سلێمانی.

کە بزووتنەوەی ڕەشـــید عـالی گەیلانی ڕوویـدا، حکوومەت خەڵکەکەی نـاچـارکرد بۆ پشـتیوانیی بزووتنەوەکە بێنە دەرێ و خۆپیشـاندان بکەن، ئەوەندەی لە کەرکووک بووم تەنێ یەک جارم خۆپیشـــاندان دیت، ئەویش ئەو کاتەبوو کە بزووتنەوەی مایســـی ١٩٤١ ڕوویدابوو.ســـەید ڕەشـــید عالی گەیلانی، دوای هەڵاتنی عەبولئیلای وەســـی، حکوومەتی یەکێتیی نیشـتمانیی پێکهێنا. لە یەک لە خۆپێشـاندانەکانیش خۆپیشـاندانێکی ئایینی بوو و پیاوانی ئایین و دەروێش و کەشیش و جوو تێیدا بەشداربوون و، زۆربەیشیان بە ناچاری هاتبوون، لەو خۆپیشـاندانە هێمنەشدا لەگەڵ قوتابییان بەشـداریم کرد، کەژاوەی جووەکان کەژاوەیەکی بچووک بوو و حاخام بەپێشـیان کەوتبوو و دروشـمی دەگوتەوە و دەیگوت: "هذا الگاع ما ننطینو رشید عالی حاکم بینو" واتە ئەو خاکە نادەینە کەس، ڕەشید عالی تێیدا فەرمانڕەوایە، بەڵام هەرهێندەی گەرموگوڕی کەوتە ناو خۆپیشاندەرە موسڵمانەکان، ئیدی جووەکان بزربوون.

حیزبی هیوا، لە کوردســـتان ڕێکخســـتنێکی فراوانی هەبوو. ســـەرباری ئەوەی گەلی کورد زۆری ڕق لە بەریتانییەکان دەبووەوە چونکە بە بەرپرسی ئەو بەڵایانەی دادەنان بەسەری هاتبوو و ئەوان لێنەگەڕابوون مافە نەتەوەییەکانیان دەستکەوێ. بەڵام حیزبی هیوا لەگەڵ بزووتنەوەی ڕەشـــید عالی نەبوو و هاوکارییشـــی نەکرد، لە ســـلێمانی، ئەودەمەی ڕەفیق

حیلمیی سەرۆکی حیزبی هیوا پشکنەری لیوایەکانی سلێمانی و کەرکووک و هەولێر بوو، پەیوەندیی لەگەڵ "شۆتەر"ی ئەفسەری بەریتانی پەیداکردبوو و ئەو پەیوەندییەش کاریگەریی لەسەر دواڕۆژی حیزب و دواڕۆژی سەرۆکایەتیی حیزبی بەڕێز ڕەفیق حیلمییش هەبوو.

## سوپای بەریتانی لە کوردستان:

دوای لەناوبردنی بزووتنەوەی مایسی ١٩٤١ی ڕەشید عالی گەیلانی، بەریتانییەکان دیسان عێراقیان گرتەوە. بەریتانییەکان بەپێی پەیمانی عێراق- بەریتانیای ســـالّی ١٩٣٠، هێزێکی زۆریان لە عێراق دانابوو، نەوەکا هێزەکانی ئەڵمانیا بگەنە قەفقاس و تورکیاش بەلای ئەڵمانیادا کێلیکاتەوە. جا شارۆچکەی کفری جێگەی ستراتیژیی مۆڵبوونی ئەو هێزانە بوو. زۆربەی یەکەکانی ســـوپای دەی بەریتانیی لە گەلانی کۆلۆنیالەکانی بەریتانیا پێکهاتبوون، لە شـــارۆچکەی کفری لە هەردوو گوندی "کارێز و کنگریان"مۆڵیان خواردبوو. هەر ئەو جێیە بوو کە ســـوپای بەریتـانیـا لە شـــەڕی یەکەمی جیهـانیـدا لەوێ بوو و هێڵی شەمەندەفەریشیان لە بەغداڕا ڕاکێشابوو.

وەک پێشتری باسم کرد، بەریتانییەکان چەند ئەفسەرێکیان بە ناوی" ڕاوێژکاری سیاسیی هێزەکانی بەریتانیا" دامەزراندبوو و، ئەو ئەفسـەرانەش پەیوەندیی پتەویان لەگەڵ زۆربەی سـەرۆک عەشـیرەتە کوردەکان و کەسایەتییە کوردە دیارەکانی ئوروستوکراتی شـاری و پیاوانی ئایین و بازرگانان دروستکردبوو. هەر بۆ نموونە، "کۆرنێل لاین" ببووە مەرجەعی ئەو شێخ و ئاغایانە و خۆی فەرمانڕەوای کوردستان بوو.

لە بەزمی ئەو پەیوەندییانەش، کە لە ١٩٤٦ بوومە پارێزەر، عەباســـی مامەنداغای ئاکۆ هاتە نووســـینگەکەم و، لەســـەر جۆگە ئاوێک کێشـــەی لەگەڵ هەندێ ئاغەی دیکە هەبوو، ئیدی داوای لێکردم برووســـکەیەکی درێژی ســـەبارەت بە شـــکاتکردنەکەی بۆ ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ بۆ بنووسـم، کە مستەر "ئەدمۆنز" بوو و بەریتانی بوو. بێهوودە هەوڵمدا تێیگەیەنم کە "ئەدمۆنز تەنیا ڕاوێژکارێکی وەزارەتە و، واباشـــترە برووســـکەکە بۆ خودی وەزیر بنووسرێ، بەڵام ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی "ئەدمۆنز"ی ڕاوێژکار فەرمانڕەوای ڕاستەقینەیە و هەموو شتێکی بەدەستە!!

لە خۆ تێهەڵقورتاندنەکانی ئەفسەرە بەریتانییەکان لە کاروباری وڵاتدا وەک پێشتر باسم کرد، مێژەر "کینگ" لە کەرکووک دوو سەعاتی زێڕینی بۆ یەکەمەکانی ئامادەیی و ناوەندی تەرخان کرد.

لەبیرمە سوپای دەی بەریتانی بە بەشداریی سوپای ئوردونی، مانۆڕێکی لە ناوچەی کفری کرد، سـوپای ئوردونیش پتر بە سـوپایەکی غەیرە نیزامی دەچوو، ئەوان هەموویان بەدوو بوون و جلی عارەبییان لەبەردابوو، واتە کاکی و یەشـــماغی ســـووری ســـەرســـەریان. مانۆڕەکەیشـــیان ڕووبەرێکی زۆری داچێندراوی گوندەکانی دەوروبەری وێران کرد و، لیژنەیەکیان بۆ تێنۆڕینی ســـکاڵای خاوەن موڵکەکان پێکهێنا تا قەرەبووی زیانەکانیان بکەنەوە، هاتنە گوندەکەی ئێمەش، کە شێخ عەتای بەهەشتیی برام بەڕێوەی دەبرد، داوای

قەرەبوومـان نەکردەوە، هەر بەوەنـدەی دەســــتبەرداربووین قەرەبووی جووتیـارە زیـان لێکەوتووەکان بکەنەوە. ئەگەرچی بە گوندەکەی ئێمەیان دەگوت "گوندە شیوعییەکە"، بەڵام لەوانەیان پتر ڕێز لێدەنایـن کە هەمیشـــە بۆ بەرژەوەندی بەدوایانەوەبوون. بۆیەش ناویان لە گوندەکەمان نابوو شـیوعی چونکە عەتای خوالێخۆشـبوو لە دیوەخانەکدا کتێبخانەیەکی چکۆلەی هەبوو و هەنـدێ کتێبی مـارکســـیی تێدابوو و پەیکەرێکی لینینیش لەســـەر کتێبخانەکە داندرابوو، جا هەرچەند جاری بۆ کارێک بهاتبانا لای ئەو دیمەنەیان دەدیت.

## کوردەکان لە قوتابخانە خەڵاتی یەکەمی وەردەگرن:

کە لە پۆلی پێنجی ئامادەیی بووم"دواپۆلی ئامادەیی بوو"، بەڕێوەبەریی قوتابخانە دوو خەلاتی بۆ یەکەمەکانی دواپۆلی ناوەندی و ئامادەیی تەرخان کردبوو. خەلاتەکەی دواپۆلی ئامادەیی "کە سەعاتێکی زێڕین بوو" بەبەر من کەوت، چونکە من یەکەمی پۆلەکە بووم و، خەلاتی دووەمیشـــیان بووە هیی وەحیدەدین کەتانی، کە کوردێکی دهۆک بوو و لەگەڵ حوســـین عەونی کەتـانیی مـامی لە کەرکووک دەژیـا. بەڕێوەبەری قوتـابخـانە، لە کۆبوونەوەیەکی ئاهەنگ ئامێزدا هەردوو خەلاتەکەی پێشـکەش کردین و ئەوەش هەستی هەندێ تورکمانی ڕەگەزپەرستی وروووژاند.

پێش پێشکەشکردنی خەلاتەکەش، مامۆسـتا فاتیح مستەفا هاتە پۆلەکەمان و پرسـیی کێ یەکەمی پۆلە، پێیانگوت موکەڕەم یەکەمی پۆلە، جا لەجیاتیی ئەوەی پیرۆزبـاییم لێ بکا دەستی بە سەرزەنشتی قوتابییە توکمانەکان کرد و گوتی: "ئێوە کاتی خۆتان لە قاوەخانان بەســەردەبەن و کوردێک لە گوندێرا دێ و دەبێتە یەکەمی ســەرتان" ئیدی دەســتی لێ بە جنێوان کردن. منیش ناڕەزاییم دەربڕی و گوتم: "ئەرێ باوکت پێش باوکم لە کەرکووک بووە؟ ئەو قسـانە چییە دەیکەی؟ لەجیاتیی ئەوەی لەسـەر مکوڕیی خویندنم پیرۆزباییم لێ بکەی، دێی ئەو قسـانەم پێدەڵێی؟" گوتی: "من مەبەســتم تۆ نییە و پیرۆزباییت لێ دەکەم" گوتم: "جا بەوشێوازە پیرۆزباییم لێ دەکەی؟"

لە کۆبوونەوەی بەیادیانی هەموو پێنجشـــەممەیەک لە گۆڕەپانی قوتابخانە، بەڕێوەبەر ناوی ئەو قوتابییانەی دەخوێندەوە کە خەلاتکرابوون و ئەوانەشـــی کە ســـزادرابوون. دووبـارەی دەکردەوە، ئەوانەی خەلاتکراون موکەڕەم جەمـاڵ تـاڵەبـانی و وەحیـدەدین کەتانین، سـزادراوەکانیش فڵان و فلان و فلانن، جا لیسـتێکی درێژی ئەوانەی دەخوێندەوە کە سزادرابوون.

ڕووداوێکی خۆشـــی هەڵبژاردنە ئـازادەکـانی قوتـابخـانە هەیە و دەبێ بـاســـی بکەم. بەڕێوەبەری قوتابخانە کردمییە چاودێری گشـــتیی قوتابخانە و چاودێری پۆلەکەشـــمان. ڕۆژێکیان، مامۆســـتایەک داوای کرد هەڵبژاردنێک بۆ چاودێری پۆل بکرێ. جا بەشـــی هەرەزۆری قوتابییەکان تورکمان بوون و تورکمانێکیان هەڵبژارد کە بە شـــەڕانگێزی و تەمبەڵی بەناوبانگ بوو، ناڕەزاییم دەرنەبڕی، ڕۆژێکیان بەڕێوەبەر ســـەبارەت بە کارێکی پۆلەکە بەدوویـدا هەنـاردم، منیش گوتم من چـاودێر نیم و فلان چـاودێرە. گوتی: کێ کردوویەتییە چاودێر؟ گوتم؛ مامۆستا فلان. چووە پۆلەکە و ئەودەمی مامۆستایەکە وانەی مێژووی دەگوتەوە. بەڕێوەبەر لێی چووە ژووری و پێیگوت: ئەوە چۆن ئەوکـارەت کردووە؟ گوتی : قوتـابییەکـان ئەو قوتـابییەیـان بۆ تـاقیکردنەوە هەڵبژاردووە. بەڕێوەبەر

گوتی: جا هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەران ئازادە، تا ئەو هەڵبژاردنەش ئازادبێ؟ جا فەرمانی پێکردم، لەگەڵ چاودێریی قوتابخانە چاودێریی پۆلەکەش وەرگرم. کاری چاودێری گشتییش هەر ئەوەندەبوو بەیانیان بە قوتابییەکانی دەگوت بڕۆنە پۆلەکانتان و کێشەی نێوان قوتابیانی چارەسەر دەکرد و، ئەگەر چارەسەریش نەبووبا دەیبردنە بەڕێوەبەری تا چارەسەر بکرێ و دەبووایە بەخۆی دواکەس بێ بچێتە پۆل تا دڵنیابێ هەموو قوتابییەکان چوونەتە پۆلەکانیان و، ئەگەر مامۆستایەکیش دوابکەوتایە دەبوایە ئاگاداری بکاتەوە.

حکوومەت خووی پێوەگرتبوو، دوای گواستنەوەی ڕەفیق حیلمیی بەڕێوەبەی کورد، بەردەوام بەڕێوەبەری عارەبی بۆ ئامادەیی "ناوەند"ی کەرکووک دادەمەزراند و، زۆربەیشییان خەڵکی موسڵ بوون. جا مامۆستا نەجمەدین چلمێرانی دامەزراند کە بەبنەچە کوردبوو و لە موسڵ ببووە عارەب و پاشان بەهجەت نەقیب و ئەوجا کەماڵ سدقی.

## سەرەتای هۆشیاریی نەتەوەیی:

بارگەکانی بەرایی هۆشیاریی نەتەوەییم لە باوکم وەرگرت، کە بە چەمکە باوەکەی ئەودەمی باسی مەسەلەی نەتەوایەتیی دەکرد و، خاڵەکانی لە خانەوادەی شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینی بوون، کە لە سەدەی نۆزدە شۆڕشی دژی هەردوو ڕژێمی ئێرانی و عوسمانلی کردبوو، بەڵام لە بەدەستهێنانی ئامانجەکانی شۆڕشەکەدا شکستی خواردبوو، ئیدی بۆ مەککە دوورخرابووەوە تا ئەو ژیانەی ماویەتی لە ماڵی خودایدا بەسەرببا. هەرچی شێخ عەبدولقادری شەمزینیی کوڕیەتی، بەشدارییەکی کاریگەری لە بڵاوکردنەوەی وشیاریی نەتەوەیی لە کوردستان هەبوو و، لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی"تەعالی و تەرەقیی کوردستان" و ڕێکخراوی دیکەیش بووە کە داوای مافی چارەی خۆ نووسینی کوردانی ناو ئیمپراتۆریای عوسمانلییان دەکرد و، دەسەڵاتداریی تورکیی ئیتیحاد و تەرەقیی تورکی دەستی بەسەردا گرتبوو، لە سێدارەی دا.
دوای گواستنەوەی باوکم بۆ گوندی زەرداوی قەزای کفری، بە هاوکاریی محەممەد فەتاح بەگێ جافی هاوڕێی، لقێکی کۆمەڵەی ئازادیی کوردستانیان دامەزراند کە لە ١٩٢٩لە سلێمانی دامەزرابوو. کە بەڕێز ماجد مستەفاش کرایە قایمقامی کفری و برادەری باوکم بوو، زۆرجاران دەهاتە گوندەکەمان و کاتێکی لەگەڵ باوکم بەسەردەبرد، باسی کاروبارەکانی کوردیان دەکرد.
لە ڕۆژەکانی کۆتایی ژیانیدا باوکم خەمی لەوەی دەخوارد کە زۆربەی ڕۆشنبیر و کەسایەتییە کوردەکان کێشەی نەتەوەیی کوردیان کردبووە کەرەستەیەک و پۆست و پایەی حکومییان پێ پەیدادەکرد. مەحمود جەودەتی ئەفسەری نەتەوەیی، هاوبەشی ئەو خەم و ئازارەی بوو، ئەگەرچی ئەودەمی تەمەنم بچووک و بیرکردنەوەیش بایی ئەوەندە نەبوو، بەڵام ئەو قسانەی لە ئاخاوتنەکانی سەبارەت بە کێشەی نەتەوەیی کورد دەکران هەستێکی وەهایان لا دروستکردبووم بزانم کە کورد نەتەوەیەکی چەوساوەن.
کە خوێندنی سەرەتاییم تەواوکرد و چوومە قۆنناغی ناوەندی، چوومە قوتابخانەی دواناوەندیی کەرکووک و ئەوێ تاکە قوتابخانەی دواناوەندیی کوردستان بوو، ئیدی ببووە جێی کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆری قوتابییانی ناوچەکانی کوردستان. کە ساڵی ١٩٣٧ چوومە ئەو قوتابخانەیە ژمارەیەکی زۆری نەتەوەپەروەرانی کوردم لەوێ ناسی، لەوانەش یونس ڕەئووف"دڵدار" و بورهانی حامیدبەگی جاف وجەلال جافی برای و کاکەحەمەی خانەقا و دواتریش مستەفا عومەر"دەبابە" و کەریم قەرەنی و مارف بەرزنجی و حوسێن بەرزنجی.

دوای هەرەسی بزووتنەوەکەی شێخ مەحمودی حەفید، کوردستان بە سستییەکی سیاسیدا تێدەپەڕی، شـێخ بۆ باشـوور دوورخرابووەوە، لە ١٩٣٢ بارزانییەکان بەسـەرکردایەتیی شێخ ئەحمەدی بارزانی بزووتنەوەکەیان شکستی هێنابوو و، پێش ئەوانیش شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران و شۆڕشی ئیحسان نووریی ئارارات و جەعفەر سوڵتانی هەورامان سـەرکەوتوو نەبیوون و، کۆمەڵە و حیزبە سـیاسـییەکانی باشـووری کوردسـتان لەبەین چووبوون و باشـووری کوردسـتان بێ ویسـت و ئارەزووی کوردی، کە داوای مافی چارەی خۆ نووسـینی دەکرد، بەیەکجاری درابووە پاڵ دەوڵەتی عێراق. لەو کودەتایەی بەکر سدقی کردی هەندێک هەستی کوردی بووژایەوە ، کە تاپۆی شەڕی دووەمی جیهانی لە دنیا دەرکەوت هێشـتا شـوێنەواری بەڵا و پەژارەی شـەڕی یەکەمی جیهانی لە زەینی خەڵکدا مابوو.

لە بەرانبەر ئەو بارودۆخەدا، ژمارەیەک قوتابیی کوردی دواناوەندیی "ناوەند"ی کەرکووک بیریـان لە دامەزرانـدنی کۆمەڵەیەکی نهێنی بەنـاوی "داربڕ" کردەوە و ئەوەش وەک لاسایەکی "کۆمەڵەی ڕەژیکەرییان"ی ئیتاڵیا کە ڕۆڵێکی گەورەی لە یەکخستنەوەی هەرێمە ئیتـاڵییە پارچەپارچەبووەکانـدا هەبوو و، دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیەش کاردانەوەی ئەو چالاکییەی نەتەوەپەرستانی عارەبان بوو کە لە سەردەمی مەلیک غازی داڕژابوونە عێراق و هەموویان سـووریایی و لوبنانی و فەلەسـتینی بوون و سـەر بە کۆمەڵەی "یانەی موثەننـا"ی نەتەوەیی ڕاسـتڕەو بوون کە قێزیـان لە نەتەوە و کەمەنەتەوەکـانی دیکە دەبووەوە. بە هاوکاریی یوونس ڕەئووف، یەکێک بووم لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی داربڕ، کە ئەو، لەگەڵ کاکە حەمەی خانەقا و بورهان جاف، بزوێنەری سەرەکیی دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە بوون. دواتریش ئەو کۆمەڵە بچووکەی قوتابیان بووە حیزبێکی سـیاسـیی گەورە، بە سەرۆکایەتیی ڕەفیق حیلمیی بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان و ئەو حیزبە ڕۆڵێکی مەزنی لە هەردوو ڕاپەڕینی بارزانییەکانی هەردوو ساڵی ١٩٤٣ و ١٩٤٥دا هەبوو.

**پەیوەندییە کوردییە- تورکمانییەکانی کەرکووک:**

بەدرێژایی مێژوو، نەتەوە و کەمە نەتەوەکانی کەرکووک بە تەبایی و خۆشـەویسـتییەوە ژیاون و، هیچ شـتێک ڕوونیی ئەو پەیوەندییانەی شـلوێ نەکردووە و، زۆربەی خانەوادە تورکمانییەکان دەروێش و موریدی تەکیەی تاڵەبانی بووینە و ئەوان مەرقەدی شـێخەکانی تاڵەبانییان بە پیرۆز دەزانن و خۆشـیـاندەوێن و هەردەم دێنە کۆڕی زیکری تەکیە و، کەسـایەتیی دووەمی تەریقەتی تاڵەبانی کە شـێخ حوسـام عومەرە، تورکمانە و، کتێبێکی بەناوی"الانفاس الرحمانية فی السـلسـلة القادرية الطالبانية" نووسـیوە، پەیوەندیی ژن و

ژنخاوازییش لەنێوان کورد و تورکماندا هەر هەبووە و وایکردووە زۆر ئاسـایی هەندێ خانەوادەی کورد ببنە تورکمان و هەندێ خانەوادەی تورکمانیش ببنە کورد.
ئەو پەیوەندییە باشـە تەنێ لەنێوان کورد و تورکمان نەبووە و، هەندێ خانەوادەی کلدانیی ناو قەلای کەرکووک پەیوەندیی دۆسـتایەتیی گەرمیان لەگەڵ کورد و تورکمانان هەبووە. کە شـێخ مەحمودی حەفیدیش پێکهێنانی حکوومەتێکی کوردیی لە باشـووری کوردسـتان ڕاگەیاند، شـێخەکانی ئەلعوبێدی عارەبی "شـێخ عاصـی الحسـین و شـێخ عاصـی العلی"سـەردانیان کرد و ڕایانگەیاند عەشـیرەتەکەیان، ئەگەرچی عارەبە، بەلام لە خاکی کوردستان دەژی و چارەنووسیان بە چارەنووسی کوردانەوە بەستراوەتەوە.
بەلام تورکیا، ڕۆڵی لەوەیدا هەبوو لێنەگەڕێ کورد، بەپێی ماددەی ٦٤ی پەیماننامەی سیڤەر، لەتورکیا جودا ببنەوە و بگەنە مافەکانیان. ئەو کارەش بووە هۆی ئەوەی چەندین شـۆڕشـی کوردی لە کوردسـتانی باکوور "تورکیا" لە دژی حکوومەتی مسـتەفا کەماڵ ئەتاتورک هەڵبگیرسـێ و، کاریگەرییەکانیشـی لەسـەر پەیوەندیی نێوان کورد و تورکمان ڕەنگیدایەوە، ئەوەی قورەکەیشی خەستتر کرد ئەوەبوو، تۆفیق ڕوشدی ئاراسی وەزیری دەرەوە گەشـتێکی بە ناوچەکەدا کرد بۆ ئامادەکاریی پەیمانی سـەعدابادی برگەیەکی هاوکاریی تیدابوو بۆ سەرکوتکردنی هەر بزووتنەوەیەکی کوردەکان دژی هەر دەوڵەتێکی ناوچەکە و گەشـتەکەی عێراقیشـی گرتەوە . کە وەزیرە تورکییەکەش، بە ڕاسـپاردەی حکوومەتی بەغدا، بە کەرکووکدا تێپەڕی، تورکمانەکان پێشـوازییەکی زۆر گەرمیان لێکرد و ئاواتی ئەوەیان پێوە دیاربوو دەیانەوێ ناوچەکە بدرێتەوە تورکیا. ئەوەش وایکرد کوردەکان ئەوەندە هەڵبچن بیر یان لەوەی کردەوە کارێکی تیرۆر ئاسـا دژی وەزیرە تورکەکە بکەن. لەوەشـدا کوردەکان ڕێکخراوێکیان بەناوی"داربڕ" هەبوو کە لە کەرکووک دامەزرابوو و لەپێناو مافی چارەی خۆ نووسینی گەلی کورد کاری دەکرد.
کە بەریتانییەکان، دوای ئەوەی لە حوزێرانی ١٩٤١ بەسـەر بزووتنەوەکەی ڕەشـید عالی گەیلانیدا زاڵبوون و، دیسـان عێراقیان داگیرکردەوە، دوورکەوتنەوە و هەسـتیاریی نێوان کورد و تورکمانیش زیادی کرد. ئاخر ئەوان کلکەلەقێیان بۆ تورکیا دەکرد نەوەکا لە جەنگی جیهانیی دووەمدا بچێتە پاڵ ئەڵمانیای نازی و، ئەو کلکەلەقێیەش چالاکیی تورکمانەکانی کەرکووکیشی گرتبووەوە.
لەبیرمە، جارێک لەو جارانەی قوتابیانی ناوەندی و دواناوەندییان بۆ دیتنی فیلمی پڕوپاگەندەیی بنکەی ڕۆشـنبیریی بەریتانی دەبرد، کە فیلمێکیان سـەبارەت بە مانۆڕی سوپای تورکی نیشاندا و لەوێ مانۆڕی زستانەیان لە چیاکانی کوردستانی باکوور دەکرد، تورکمانەکان زۆریان چەپڵە لێدا و کورد و ئەرمەنەکانیش ناڕەزاییان دەربڕی، کەماڵ

ژنخاوازییش لەنێوان کورد و تورکماندا هەر هەبووە و وایکردووە زۆر ئاسـایی هەندێ خانەوادەی کورد ببنە تورکمان و هەندێ خانەوادەی تورکمانیش ببنە کورد.
ئەو پەیوەندییە باشـە تەنێ لەنێوان کورد و تورکمان نەبووە و، هەندێ خانەوادەی کلدانیی ناو قەڵای کەرکووک پەیوەندیی دۆسـتایەتیی گەرمیان لەگەڵ کورد و تورکمانان هەبووە.
کە شـێخ مەحمودی حەفیدیش پێکهێنانی حکوومەتێکی کوردیی لە باشـووری کوردسـتان ڕاگەیاند، شـێخەکانی ئەلعوبێدی عارەبی "شـێخ عاصـی الحسـین و شـێخ عاصـی العلی" سـەردانیان کرد و ڕایانگەیاند عەشـیرەتەکەیان، ئەگەرچی عارەبە، بەڵام لە خاکی کوردستان دەژی و چارەنووسیان بە چارەنووسی کوردانەوە بەستراوەتەوە.
بەڵام تورکیـا، ڕۆڵی لەوەیدا هەبوو لێنەگەڕێ کورد، بەپێی مـاددەی ٦٤ی پەیمـاننـامەی سـیڤەر، لەتورکیا جودا ببنەوە و بگەنە مافەکانیان. ئەو کارەش بووە هۆی ئەوەی چەندین شـۆڕشـی کوردی لە کوردسـتانی باکوور "تورکیا" لە دژی حکوومەتی مسـتەفا کەماڵ ئەتاتورک هەڵبگیرسـێ و، کاریگەرییەکانیشـی لەسـەر پەیوەندیی نێوان کورد و تورکمان ڕەنگیدایەوە، ئەوەی قورەکەیشی خەستتر کرد ئەوەبوو، تۆفیق ڕوشدی ئاراسی وەزیری دەرەوە گەشـتێکی بە ناوچەکەدا کرد بۆ ئامادەکاریی پەیمانی سـەعدابادی بڕگەیەکی هاوکاریی تێدابوو بۆ سەرکوتکردنی هەر بزووتنەوەیەکی کوردەکان دژی هەر دەوڵەتێکی ناوچەکە و گەشـتەکەی عێراقیشـی گرتەوە . کە وەزیرە تورکییەکەش، بە ڕاسـپاردەی حکوومەتی بەغدا، بە کەرکووکدا تێپەڕی، تورکمانەکان پێشـوازییەکی زۆر گەرمیان لێکرد و ئـاواتی ئەوەیـان پێوە دیـاربوو دەیـانەوێ نـاوچەکە بـدرێتەوە تورکیـا. ئەوەش وایکرد کوردەکان ئەوەندە هەڵبچن بیر یان لەوەی کردەوە کارێکی تیرۆر ئاسـا دژی وەزیرە تورکەکە بکەن. لەوەشـدا کوردەکان ڕێکخراوێکیان بەناوی"داربڕ" هەبوو کە لە کەرکووک دامەزرابوو و لەپێناو مافی چارەی خۆ نووسینی گەلی کورد کاری دەکرد.
کە بەریتانییەکان، دوای ئەوەی لە حوزێرانی ١٩٤١ بەسـەر بزووتنەوەکەی ڕەشـید عالی گەیلانیدا زاڵبوون و، دیسـان عێراقیان داگیرکردەوە، دوورکەوتنەوە و هەسـتیاریی نێوان کورد و تورکمـانیش زیـادی کرد. ئـاخر ئەوان کلکەلەقێـان بۆ تورکیـا دەکرد نەوەکـا لە جەنگی جیهـانیی دووەمـدا بچێتە پـاڵ ئەڵمـانیـای نـازی و، ئەو کلکەلەقێیەش چـالاکیی تورکمانەکانی کەرکووکیشی گرتبووەوە.
لەبیرمە، جـارێک لەو جـارانەی قوتـابیـانی نـاوەنـدی و دوانـاوەنـدییـان بۆ دیتنی فیلمی پڕوپاگەندەیی بنکەی ڕۆشـنبیریی بەریتانی دەبرد، کە فیلمێکیان سـەبارەت بە مانۆڕی سوپای تورکی نیشاندا و لەوێ مانۆڕی زستانەیان لە چیاکانی کوردستانی باکوور دەکرد، تورکمـانەکـان زۆریـان چەپڵە لێدا و کورد و ئەرمەنەکانیش نـاڕەزاییـان دەربڕی، کەمـاڵ

سـدقیی بەڕێوەبەری قوتابخانەی لایەنگری بەریتانییان لە هەموو بۆنەیەک لای تورکمانەکانی دەگرت، لەکاتیکدا کەس لە بەڕێوەبەریی قوتابخانە هەوڵی ئەوەی نەدا ناوبژی بکا یان هەوڵدا پەیوەندیی دۆستانەی نێوان کورد و تورکمانەکان دروستکاتەوە و، کەسیش لە کورد و تورکمانەکان ئەو کارەیان نەکرد.

ڕۆژێکیان دەمەقاڵەیەکی توند لەنێوان قوتابییەکی کوردی سلێمانیی لە دواناوەندیی"ناوەند" دەیخوێند و ناوی کەریم قەرەنی بوو لەگەڵ چەند قوتابییەکی تورکمانی شـەڕفرۆش دروستبوو، ئێمەی لاوی هەڵەشەش، بڕیارماندا شەڕ بە قوتابییە تورکمانە شەڕفرۆش و بەڕێوەبەرایەتیی قوتابخانەش بفرۆشین. شەویکیان من و شەهید مارف بەرزنجی و عومەر دەبابەی خوالێخۆشبوو، ماڵی ئەو قوتابییەمان دا بەر گوللە کە شەڕی بە کەریم قەرەنی فرۆشتبوو، ئەوەش دەسەڵاتی حکوومی و بەریتانیی نیگەران کردبوو و، کۆمەڵێک قوتابیی کوردیش چووبوون بەڕێوەبەری قوتابخانە تەمبێ بکەن، بەڵام لە دەستنیشانکردنەکەیان سەرچیغ چوبوون و لە جەلال سدقیی ئەفسەری برایان دابوو بێ ئەوەی هیچ گوناهێکی هەبێ.

پێش ئەو ڕووداوانەش، واتە لە ساڵی ١٩٣٧، کە یاریی وەرزشی لەنێوان قوتابخانەکانی شارە کوردستانییەکان لە کەرکووک بەڕێوەچوو و، بەڕێز عەزیز سامی بەڕێوەبەری مەعارف بوو و بە بنەچە عارەب بوو و ببووە تورکمان و، بەڕێز ڕەفیق حیلمیش بەڕێوەبەری دواناوەندیی"ناوەند"ی کەرکووک بوو، لە گۆڕەپانی یاریدا ببووە دەمەقاڵەیان و حکوومەت گواستنیەوە باشووری عێراق، ئیدی کوردەکان ناڕەزاییان دەربڕی و داوان کرد ڕەفیق حیلمی بگەڕێندرێتەوە کەرکووک و، تورکمانەکانیش لای خۆیانەوە داوای هێنانەوەی عەزیز سامییان دەکرد.

تێبینییش دەکرێ، ئەوکاتە کێشە لەنێوان کورد و تورکمانەکان دروستبوو کە ڕێکخراوی نەتەوەیی کورد و تورکمان پەیدابوون و، ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی بۆرژوازیی دژی یەکدییان هەڵگرتبوو.

## لەگۆڕنانی فیتنەی نێوان کورد و تورکمان:

حیزبی هیوا لە ١٩٤٢ لە قەزای کفری چالاکییەکی فراوانی هەبوو و زۆربەی ڕۆشنبیران و کاسبکاران و سەرۆک عەشیرەتەکان هاتبوونە ڕیزی حیزب، لەبەر سستیی بازرگانیی هۆیەکەی شەڕی دووەمی جیهانی بوو و چرانی ڕێیە جیهانییەکان، بازرگانیی نێوان عێراق و ئێران هەرە بە هەرمێنەکە بوو و قاچاغیش بەشی هەرەزۆریی ئەو بازرگانییەبوو.زۆربەی بازرگان و کاسبکاران خەریکی قاچاغچیەتی بوون و، کالای هەرە بە هەرمێنیش لە ئێران شەکر و چا و ئەلەمنیۆم و تەلی مس و پێداویستییەکانی کارەبا بوو. بازرگانەکان، ئەو کەلوپەلانەیان لە بەغدا دەستدەکەوت و بە نهێنی و لەڕێی چاوساغیی فەرمانبەرانی شەمەندەفەر لە کفری و کەلارەوە دەچووە سنووری ئێران و، چونکە سەر بە حیزبی هیواش بوون بۆیە ئەو سەرۆک عەشیرەتانەی سەر بە حیزب بوون بازرگانییەکەیان بۆ دەپاراستن.

ئەندامانی حیزبی هیوا خەڵکێکی نەتەوەپەرست بوون و بیرکردنەوەیان بەرانبەر تورکمانەکانی کفری شۆڤێنییانەبوو، چونکە ئەودەمی وشیارییەکی پێشکەوتنخوازیی ئەوتۆ لە ناوچەکەدا نەبوو و، لەبەرانبەریشدا شۆڤێنییەتی تورکمان هیچی لە شۆڤێنییەتی کوردان کەمتر نەبوو.

لالووتییەکی سیاسی و فیکرییان لەبەینێدا بوو. بازرگانیی تورکمانەکانیش هەر سست بوو، جا تورکمانەکانیش، وەک چاولێکەریی کوردەکان، کۆمپانیایەکیان بۆ قاچاغی ئێران دامەزراند و ناویان لێنا "بازرگانیی یەککگرتوو"، بەڵام بازرگانییەکەیان، کە بە ناوچە کوردییەکاندا دەڕۆیی، کوردەکان تالانیان دەکرد. ئەوەش وایکرد ململانێی سیاسیی نابابەتییانەیان بکەوێتە بەینێ، کە لەبنجڕا هۆکارەکەی ئابووری بوو.

ئەو ڕۆشنبیرانەی لەژێر کاریگەریی بیری پێشکەوتنخوازیدا بوون، بەو کارەی دژی تورکمانەکان رازی نەبوون، بەڵام کارەکە بەهاوکاریی بازرگانەکان و سەرۆک عەشیرەتەکان دەکرا و، ئەوانیش دەسەڵاتیان لەو ڕۆشنبیرانە پتر بوو کە ژمارەیان لە قەزای کفری دیاریکراو بوو و لە هەندێ مامۆستا و مەلا تێپەڕی نەدەکرد.

زۆر پێویست بوو دۆخەکە چارەسەر بکرێ و فیتنەکە لە کەرکووک زیندەبەچاڵ بکرێ، ئیدی بڕیاردرا کۆبوونەوەیەکی گەورە لە قاوەخانەیەکی کفری بکرێ و ڕیش سپییەک قسەی تێدا بکا و ئەو کەسەش کەریم بەگی جاف بوو، چونکە هەرە بەدەسەڵات و هەرە بەتەمەن بوو و هەموو دەستەبەرییەک دەداتە تورکمانەکان و دەریدەخا کورد و تورکمان بران و پێویستە هۆیەکانی دابڕانیان وەلانێن.

بڕیاردرا شێخ قادر تاڵەبانی چەند کەسایەتیی دیکەش ئامادەبن، ئەوانیش شێخ محەممەد نەجیب و شێخ عەبدولوەهاب تاڵەبانی و ئەحمەد بەگی بابان و محەممەد عەلی ئاغای زەنگەنە و حەمید عەبدولعەزیز ئاغای زەنگەنە و شێخ ئەحمەد شاکەلی و مستەفا کەریم بەگی جافبوون و، سەرباریش کاسبکار و بازرگان و ڕۆشنبیران.
ئەو ڕۆژی هەینییەی، بڕیاربوو کورد و تورکمان لە چەند قاوەخانەیەکی نزیک یەکدیی دەروازەی بازاڕی کفریی سەرگیراو کۆببنەوە، ژمارەیەکی زۆری کورد و تورکمان کۆبوونەوە و تورکمانەکان نەیاندەزانی ئەوەندە کوردە بۆ لە نزیک ئەوان کۆبوونەتەوە.
کۆبوونەوەکە بە هوتافکێشانی برایەتیی نێوان کورد و تورکمان دەستپێکرد و ئیدی تورکمانەکان سەریان سوڕمابوو چونکە لەگەڵ ئەو هەڵوێستەی کوردان ڕانەهاتبوون.ئیدی کەریم بەگ لەناو چەپڵەڕیزانی ئامادەبووان هەستایەوە تا هەموو دەستەبەرییەک بداتە تورکمانەکان و هەموو کارێکی دەبێتە هۆی دابران و دوورکەوتنەوەش، وەک لەگەڵی پێکهاتبوون، ڕووزەرد بکا. بەڵام ئامادەبووان چاویان زەق بووەوە، دیتیان کەریم بەگ چووە سەر کەرەوێتێک و گوتی: "هێی تورکمانەکانی کفری، شوێند بە فەخری عالەم دروودی خوای لەسەربێ و بە قەبری فەتاح بەگی باوکم هەرچی لەو شارەی بە نان بڵێ ئەکمەک وەکو کار سەری دەبڕم". ئیدی بە پێکەنینەوە لە کەرەوێتەکە هاتەخوارێ.
ئەگەرچی شێخ عەبدولقادری تاڵەبانی و شێخ عەتای تاڵەبانی و مامۆستا محەممەد قەرەداغی دڵنیاییان دایە تورکمانەکان و گوتیان سوورن لەسەر پاراستنی برایەتیی نێوان کورد و تورکمان، بەڵام تورکمانەکان هەڵوێستی خۆیان لەسەر قسەکانی کەریم بەگی جاف هەڵنا و، پتریان ترس و گومان لا دروست بوو.

## مردنی باوکم ڕێچکەی ژیانی گۆڕیم:

له ١٩٤٣، ئامادەییم بە پلەیەکی بەرز تەواوکرد، باوکم ئارەزووی لەوەی بوو پزیشـــکی لە ئەســـتەمبۆڵ بخوێنم. ئەو کۆلێژی پزیشـــکیی ئەوێی لە هیی عێراق بەباشـــتر دەزانی. ئیدی داوای لێکردم کـــاروبـــاری ســـــەفەری تورکیـــا جێبەجێ بکەم و، ئەوەش پێویســـــتی بە پشـــتڕاســـتکردنەوەی بڕوانامە و دەرهێنانی پاســـەپۆرت و ڕەزامەندیی وەرگیرانی زانکۆی ئەســـتانبۆڵ هەبوو.لوتفی قەردار، والیی ئەودەمی ئەســـتانبۆڵ بوو و برازای حاجی جەمیل قەرداری کەرکووکێ بوو. ئەو خانەوادەیەش حەزیان لە چاکەبوو، لەگەڵ خەڵک بە گشـــتی و لەگەڵ برادەران بە تـــایبەتی، کە گوێیـــان لێبوو بە نییەتم لەوێ بخوێنم، نـــامەیەکیـــان بۆ بەڕێز لوتفی قەردار هەناردبوو و داوایان کردبوو ڕەزامەندییەکی بەرایی کۆلێژی پزیشکیی ئەوێم بۆ وەرگرێ. ئیدی ئەویش بەدڵخۆشـــییەوە کارەکەی کردبوو و هەواڵیشـــی دابوونێ کە تا جێگیر دەبم لەماڵەکەی خۆیدا میوانداریم دەکا.

خزمەتی ســـەربازی و نەگەیشـــتنە تەمەنی یاســـایی کۆســـپی بەردەم ســـــەفەرم بوون و، ئەوســـــاش، جەودەت محەممەد عەلی یەعقووبی قایمقامی کفری بوو و، لە خانەوادەیەکی ناســـــراوی هەولێرێ بوو. کە بۆ ئەو کارەش ســــەردانیم کرد، رایســـــپارد هەواڵدارییەکی "اخبارية" بۆ بنووسرێ گوایە موکەڕەم ئێستا لە تەمەنی خزمەتی سەربازیدایە و بانگێشت نەکراوە. کە هەواڵدارییەکەم بۆ نووســـــی بانگی ئەفســـــەری ســـــەربازگریی کرد "تجنيد" و داوای لێکرد ڕێکەوتی لەدایکبوونم کە لە شـــوناســـەکەم نووســـرابوو لە ١٩٢٥ بکاتە ١٩٢٣. ئەفســـەرەکە پێیگوت ئەوە لەگەڵ یاســـا ناگونجێ، گوتی "بۆ هەموو کارەکان بەپێی یاســـان؟ بەپێی یاســـــابێ یان نا بڕۆ ئەو کارە جێبەجێکە"ئەوەیشـــــی بۆ ئەوە کرد تا پاســـــەپۆرتم بدرێتێ.

چوومە بەغدا تا پاســـەپۆرت دەربێنم، کە ســـەرقاڵی ئەو کارەبووم، تەلەفۆنێکم لە کفرێرا بۆ کرا کە باوکم ئەمری خوای کردووە و دەبێ یەکڕاســـــت بگەڕێمەوە. بە شـــــەمەندەفەر هاتمەوە کفری تا بچمەوە زەرداو، لە وێســـــتگەی شـــــەمەندەفەر پێیانگوتم تەرمی باوکم بردراوەتە کەرکووک تا لە گۆڕســـــتانی خانەوادە لە تەکیەی تاڵەبانی بنێژرێ. ئەودەمای گەنجێکی هەڵەشـــە بووم و ســـووربووم کە دەبێ باوکم لەتەک باپیرانی، شێخانی تەریقەتی قادریی تاڵەبانی بنێژرێ، بەڵام شــــێخ جەمیلی مامم بەوەی ڕازی نەبوو، گوایە باوکم ئارەقی دەخواردەوە و لەوەشـــــدا لەســـــەر هەق بوو، بەڵام من هەڵوێســـــتەکەیم بەهەند وەرنەدەگرت، کە ئێســـــتا بەڕاســـــتی دەزانم و ڕازی نەبووم لە جێیەکی دیکەی جودا لە مەرقەدی باپیرانی بنێژرێ، تەرمەکەم هێنایەوە زەرداوی کە بەشـــــی هەرە زۆری ژیانی لەوێ بەسەربردبوو. ئیدی لە گۆڕستانی گوندەکە شاردمانەوە و هەر لەوێش تازیەمان بۆ

دانا، له کاتێکدا مامم تازیەی له تەکیەی تاڵەبانیی کەرکووک دانابوو. پەیوەندیی نێوان ئێمە و مـامم تێکچوو چوکە دەیویســـــت گوندی زەرداو، وەک زەویوزارێکی وەقفی تەکیەی تاڵەبانی، وەرگرێتەوە. ئەوەش وایکرد چاو له سـەفەری دەرەوەی عێراق بپۆشـم و بڕیارم دا قانوون و ســــیاســـــەی کۆلێژی مافی بەغدا بخوێنم. ئیدی ئەوەش ڕێچکەی ژیانی له پزیشکییەوە گۆڕیم بۆ پارێزەری و دواتریش سیاسی.

## هەندێ ڕووداوی کۆلێژی ماف:

کە چوومە بەغدا تا لە کۆلێژی ماف بخوێنم، لە یانەی "پێشکەوتن"ی کوردی وەک ئەندامی دەستەی کارگێڕی و وەک نوێنەری حیزبی هیوا لەگەڵ شێخ مەسعودی بامەڕنی، لە چالاکیی ئاشکرای نەتەویی بەردەوام بووم. چوونە بەغداشم ڕێکەوتی هەندێ کێشەی ڕێکخراوەیی ناو حیزبی کرد و کێشەکان لە نێوان دەستەی سەرکردایەتیی حیزب و، کە زۆربەیان قوتابیی کۆلێژێ ماف بوون، مامۆستا ڕەفیق حیلمیی سەرۆکی حیزبدا بوو، جا سەرکردنی ئەندامێتیی ڕەئووف دڵدار و کاکەحەمەی خانەقا و بورهان جافی لێ کەوتبووەوە و، سەرۆکی حیزبیش وەک پشکنەر گواسترابووەوە ناوچەی باکوور و بنکەکەی لە شاری سلێمانی بوو. ئیدی دەستەی سەرۆکایەتی تەنیا هەندێ بەرپرسیارێتیی ڕێکخراوەیی سنووردارییان هەبوو و. بڕیار و فەرمانەکان لە سەرۆکی حیزبەوە و لە سلێمانی دەردەچوو.

لەو ماوەیەی لە بەغدا بووم هەندێ کەسایەتیی کوردم ناسی، لەوانەش سەرکردەی سەربازی و مێژوونوس محەمەد ئەمین زەکی بەگ، کە سەرۆکی کۆمەڵەکە بوو و، مەعرووف جیاووکی یاساناس، کە سەرپەرشتیاری گشتیی کۆمەڵەکەبوو و لە ماوەی جوداش هەریەک لە بەڕێزان تۆفیق وەهبی و جەماڵ بابان و عەلی کەماڵ و میرزا فەرەجی بازرگان و عەبدوڵڵا لوتفیی پیشەساز و عەبدولڕەحیم فەیزی و ماجد مستەفا و حازم شەمدین و من بووینە سەرپەرشتیار.

سەرباری ئەوانەی ناویان هات، خەڵکی چالاکی دیکەی حیزبی هیوا هەبوون، لەوانەش، جەوهەر دزەیی و کانەبیی برای و فوئاد عارف و ئەوجا فازڵ فەیزوڵڵا تاڵەبانی و کەریم زەند و مستەفا نەریمان و فایەق هۆشیارو ڕەشید باجەلان و جەلیل هۆشیار و ڕەشید عەبدولقادر و نافیع یونس و میرحاج ئەحمەد.

حیزبی هیوا جێی ململانێی فیکری و سیاسی بوو و شێخی دەرەبەگ و مەلا و گەورە ئەفسەر و فەرمانبەر و قوتابیی لە ڕیزەکانیدا کۆکردبووەوە. هەندێکیان هەڵگری بیری نەتەوەیی ڕاستڕەو بوون، هیی دیکەیان هەبوو هەڵگری بیری دیموکراتیی پێشکەوتنخواز بوو و، هەندێکیشیان فیکری مارکسییان هەبوو. بۆیە، دژبەری کەوتە ناو ڕیزەکانی حیزب وئەوەش لە ١٩٤٥ بووە هۆی پەرتەوازەیی، چونکە حیزب نەیتوانی پشتگیرێکی کاریگەری شۆڕشی کوردبێ کە سەرەتا لە ناوچەی بارزان هەڵگیرسا و دوایە ناوچەکانی دیکەی کوردستانی داگرت، کەچی شۆڕشیش، چونکە سەرکردایەتییەکی بەدەست و مستی نەبوو تا فراوانتری بکا و پشتیوانیی بۆ پەیداکا، شکستێ هێنا.

سەرباری ئەو چالاکییەی لە حیزبی هیوا هەمبوو، پڕ بیرۆکەی نەتەوەییش بووم، بەڵام لە ڕووی فیکرییەوە ئامادەیی ئەوەم تێدابوو بیرۆکە شۆڕشگێڕییە نوێیەکان وەرگرم. حیزبیش جێی ململانێی فیکری و سیاسی بوو و، تۆوی لێکهەڵوەشان و جودابوونەوە تێیدا چەکەرەی دەکرد.

لەوەتەی هاتبوومە بەغدا، لە نزیکەوە چاودێریی ڕووداوەکانم دەکرد، بەتایبەتیش چالاکییە ڕاگەیاندنییەکان و سیاسییەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی.

چونکە یەکێتیی سۆڤیەتیش لە شەڕی دووەمی جیهانیدا چووبووە بەرەی هاوپەیمانان، ئیدی ڕێ دەدرا کتێبی مارکسی-لینینی بێتە عێراق و کتێبخانە و شۆستەکان پڕی کتێب بوو و جا ئەوەی لەتوانامدا بووایە دەمکڕی و دەمخوێندەوە. ئەوەندەی لەگەڵ بابەتەکانیشی هاوسۆزبووم ئەوەندە تێیان نەدەگەیشتم. زۆربەی گەنجە کوردەکانی حیزبی هیوا هەمان ڕێچکەی منیان گرت و، دیارترینیان ساڵح حەیدەری و نافیع یونس و جەماڵ حەیدەری و عومەر عەلی شێخ و ڕەشید عەبدولقادر و جەلیل هوشیار بوون.

من، لە دەرەوە و ناوەوەی حیزب، لە ڕۆشنبیرە پێشکەوتنخوازەکان نزیکتربووم و، هەندێ بڵاوکراوەی نهێنیی شیوعیم دەگەیشتە دەستی. بەڵام هیچ پەیوەندییەکی ڕێکخراوەییم لەگەڵ هیچ باڵێکی شیوعی نەبوو و بەوردیش بیرۆکەی باڵەکانم لێکنەدەکردەوە.

گوێم لێدەبوو حیزبێکی نهێنی بەناوی "حیزبی شیوعیی عێراقی" هەیە و ڕۆژنامەیەکی نهێنییش بەناوی"القاعدة" دەردەکا و چالاکییەکی فراوانی لەناو کرێکاران و قوتابیان هەیە. زانیشم دەستە و خەڵکی وا هەن بیرۆکەی مارکسییان هەیە، وەک کۆمەڵی"وحدة النضال"[20] و کۆمەڵەیەکی لە دەوری داود السائیغ کۆبووینەوە، کە پارێزەرێکی دەوروبەر موسڵ بوو و لەگەڵ خەڵکێکی دیکەی لەگەڵ مامۆستا عەبدولفەتاح ئیبراهیم و عەبدوڵڵا مەحمود قەرینیی پارێزەر و زەنون ئەیوب بوون و، دەستەیەکی دیکەی لەدەوری مامۆستا عەزیز شەریف بوون. حیزبی شیوعیی کە هاوڕێ یوسف سەلمان یوسف "فەهد" دایمەزراند، لەگەڵ ئەوانەدا لە ململانێیەکی فیکریدا بوو. ئێستا، پێموایە ئەو دەستە و کۆمەڵانە لەسەر مارکسیزم دادەنیشتن و وەک گەلێ حیزبی بۆرژوایی بچووکی دوای شەڕی دووەمی

---

[20] _ ڕێکخراوی"وحدة النضال" لە پاشماوەی باڵی ئەمامییەکان و شەرارەی نوێ دروستبوون، ڕێکخراوێکی جیابووەوەی دیکە بوون کە عەبدوڵلا مەسعود قەرینی لە ١٩٤٢ سەرکردایەتیی دەکردن و، ئەوانە لەگەڵ جووە مارکسییەکان بە "مؤتمرین" ناسرابوون و، سەرکردەکانیان یوسف زەللوف و ساڵح حەیدەری و سەلیم یەعقووب و ئیبراهیم شمێل و نەعیم بەدەوی و عەبدولجەبار وەهبی و ساسۆن دەلال بوون و، بڵاوکراوەیەکیان، بە هەردوو زمانی عارەبی و کوردی بەناوی "وحدة النضال" دەردەکرد. دوای گەڕانەوەی فەهدی سکرتێری حیزب لە دەرەوە، ئەو کۆمەڵەیە بڕیاریدا بێتەوە ناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی. بۆ زیاتر ، هەمان سەرچاوە، ص١١٣-١١٤.

جیهانی ئەو دەربڕینەیان خستبووە بەرنامەی کاریانەوە گوایە "حیزب سوود لە مارکسیزم دەبینێ" بەڵام پەیڕەوی مارکسیزمیان نەدەکرد. ئاخر بیرۆکەی سۆشیالیستی دەسەڵاتێکی فراوانی لەناو ئەو توێژ و کۆمەڵانە پەیداکردبوو.
ئەودەمی بۆمن گران بوو لە کێشە فیکری و سیاسییەکانی ئەو دەستە و کۆمەڵانە تێبگەم، بۆیە پەیوەندییەکی ئاساییم بە هەموویانەوە هەبوو و، لە پەیوەندیی کەسی و خوێندنەوەی ئەو بڵاوکراوانە تێنەدەپەڕی کە بڵاویان دەکردنەوە.
ئەو ململانێ فیکری و سیاسییانە لەو کۆلیژی مافیش ڕەنگیدابووەوە کە تێیدا دەمخوێند، ئاخر کەماڵ نەزمی عومەری قوتابیی سەربە دەستەی مامۆستا عەزیز شەریف بوو و ڕەخنەی لە ڕێچکەی ئەوانیدی دەگرت و، مۆریس یەعقوبی قوتابیی جوولەکە، کە لە شەقامی ڕەشید کتێبخانەیەکی هەبوو و کتێبی مارکسیی دەفرۆشت، هاورای دەستەکەی داود ئەلسائیغ بوو، نافیع یونس و ڕەشید عەبدولقادر و جەماڵ حەیدەرییش لە دەستەی "وحدة النضال" بوون. دوای ململانێی فیکری و سیاسی، زۆربەی دەستەی " وحدة النضال" چوونە ناو حیزبی شیوعیی عێراقی.
لە کۆلێژ،هەریەک لەو دەستە و کۆمەڵانە، بڵاوکراوەی نهێنیی تایبەتی خۆیان دابەش دەکرد.جیا لەوانەش حیزبی دیکەش هەبوون و چالاکبوون، لەوانەش حیزبی ئیستیقلال کە کەسی دیاری محەممەد مشحن حەردان بوو و کوڕی سەرۆک عەشیرەتێکی دلێم بوو و دەستە یان کۆمەڵەی ئەهالیی کامل چادرچی سەرۆکایەتیی دەکرد، کۆمەڵەیەکی دیکەی چالاکیش هەبوو و پشتیوانیی باڵی نەتەوەیی دەکرد و سەرۆکەکەی سامی شەوکەتی بەڕێوەبەری ماعاریف بوو و، تورکێکی بەبنەچە مەماڵیک بوو و، ڕۆژنامەی بەعسی قەومییش دەردەچوو کە لەژێر دروشمی"ئەوەی باوەڕمان پێ دەکا لەئێمەیە" بانگەشەی بۆ یەکێتیی عەرەب و تواندنەوەی ئەو نەتەوە و کەمە نەتەوانە دەکرد کەوتبوونە ناو وڵاتە عارەبییەکان. زۆرجاران، شەڕەقسە لەنێوان ئەو دەستە و کۆمەڵانە دروستدەبوو و، هەندێ جاریش بۆ چالاکییەکی سیاسیی هاوبەش لە هەندێ بۆنەی گشتیدا ڕێکدەکەوتن، وەک بەڵێنی بەلفۆر و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی عێراق- بەریتانیا.
زۆربەی مامۆستایەکانی کۆلێژ میسری بوون. عەمیدی کۆلێژ دکتۆر حامد زەکی بوو " لە ١٩٤٢-١٩٤٣" بووە عەمید و میسری بوو و دوایە لە میسر بووە وەزیر، پاشان دکتۆر عەبدولحەکیم ڕوفاعی هات و ئەو لە ئابووریناسە بەناوبانگەکانی میسر بوو و، مامۆستا میسرییەکان بیروڕای جیاوازیان هەبوو، لەکاتێکدا دکتۆر جابر جادعەبدولڕەحمان لە بواری ئابووریدا دژی بیروڕایەکانی کارل مارکس بوو، دکتۆر عەلی گریتلی لە گوتنەوەی ئەو ماددەیەدا هاوڕای مارکس بوو، بەڵام گفتوگۆ تا ڕادەیەکی زۆر ئازاد بوو.

لەبیرمە، لە وانەیەکی ئابووریی سیاسی، دکتۆر نیزامەدین زەکیی مامۆستای دارایی قوتابییەکی ڕاسپارد وانەیەک لە پۆلدا بڵێتەوە و، قوتابییەکانیش لەسەر بابەتەکە گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن و، قوتابییەکەش محەممەد جەوادعەبووسی بوو و، دواتریَ بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرت و پاشان لە سەردەمی عەبدولسەلام عارف بووە وەزیری ئابووری و، لە چەمکی سۆشیالیستیدا هەڵگری بیروڕای نازییەکان بوو. ئیدی هێرشی کردە سەر هەموو بیروڕا سۆشیالیستییەکان و لایەنگری"سۆشیالیستیی نیشتمانی" بوو کە ئەودەمی هیتلەر بانگەشەی بۆ دەکرد. من و کەماڵ عومەر نەزمی و محەممەد ساڵح بابان ڕەدمان دایەوە و بیروڕایەکانیمان ڕەتکردەوە، ئێمە ئاگامان لە بیروڕا مارکسییەکانی پەیوەستی سۆشیالیزم هەبوو و، ڕۆژی دواتریَ کەماڵ نەزمی نووسینێکی لە ڕۆژنامەی "الشعب" بڵاوکردەوە، کە حیزبی "الشعب" دەریدەکرد و، ناونیشانی نووسینەکەشی "گۆبلز لە کۆلێژی ماف"بوو. گۆبلز وەزیری پڕوپاگەندەی ڕژێمی نازیی ئەلمانیابوو، عەمادەی کۆلێژ منیان بە بڵاوکردنەوەی ئەو نووسینە تۆمەتبار کرد و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردم. پاشان وەزیری مەعارف داوای کردم، کە ئەودەمی ئیبراهیم عاکف ئالوسی بوو و، لێپرسیم لە کۆلێژی ماف چ ڕوویداوە. ئیدی بۆم ڕوونکردەوە ئەوەی ڕوویدابوو هەر لە چوارچێوەی پرۆگرامی خوێندن بووە و، گفتوگۆی لەو شێوەیەش دەکریَ بیَ ئەوەی بارودۆخی کۆلێژ شلویَ بکا و، ئیدی بابەتەکە بەوەندەی کۆتاییهات.

لەو لێکۆڵینەوەیەی لە کۆلێژیش کرا و، حوسێن عەلی ئەعزەمیی جێگری عەمیدی کۆلێژ، کە خوێندنی شەریعەتی ئیسلامیی تەواوکردبوو و وانەی فیقهی ئیسلامی و باری شارستانیی دەگوتەوە "ژنهێنان و وەسیەت و میرات"، لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کردم و، هەردوو مامۆستای میسری جابر جاد عەبدولڕەحمان و حەسەن جاد ئامادەی بوون. تۆمەتەکەیش شیوعیبوون بوو، نکوڵیم لەوەی کرد شیوعی بم، کەچی گوتی: "ئێوەی شیوعی هەر بە ڕوخسارتانڕا دەناسرێنەوە". وەڵاممان دایەوە: "بۆ وێنەی چەکوچ و داسمان لەسەر ڕوخسارییە؟"ئەوجا جابر جاد خۆی تێهەڵکرد و گوتی ئێوە چ لە سۆشیالیزم و دیموکراسی دەزانن هەتا ئەوەندە پابەندی بن؟ گوتم ئێمەی کورد کە زۆربەمان قورئان دەخوێنینەوە و لە مانای ئایەتەکان ناگەین، بەڵام کوردەکان باوەڕدارن و پابەندی شتێکی دروستن، ئێمەش هەروا. بۆشم دووپاتکردنەوە هیچ پەیوەندیم بە ڕۆژنامەی "الشعب"ەوە نییە و، ئاگام لەو نووسینەس نییە تێیدا بڵاوکراوەتەوە. ئیدی لێپرسینەوەکە، بیَ ئەوەی هیچ سزایەکم بدەن، کۆتاییهات.

لە کاتی وانەی ئابووریی سیاسی، دکتۆر جابر جاد چاوی لیَ دەگێڕاین تا گەرموگوڕییەک بدەینە گفتوگۆیەکە و، دەیگوت: "شیوعییەکان لەکوێن؟ بۆ بێدەنگن؟" دەمانگوت: "کە

تاوتوێی بیروڕایەکانتان دەکەین ئێوە تەنگەتاو دەبن و لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکەن و دەڵێی تاوانمان کردووە" جا دەیگوت: "ئێوە ، هەندێ جار بە بیروڕایەکانتان بێزارم دەکەن، بەڵام گفتوگۆ بێ ئێوە گەرم نابێ". ئیدی بەو جۆرە ئێمە، من و کەماڵ عومەر نەزمی و محەممەد ساڵح بابان، لای بەڕێوەبەریی کۆلێژ و قوتابییانیش وا ناسرابووین کە شیوعیین، لەکاتێکدا هیچ پەیوەندییەکمان بە حزبی شیوعییەوە نەبوو.

قوتابییان لە کۆلێژی ماف، کۆبوونەوە تا خۆپیشاندانێک لە دژی تەقەلێکردنی قوتابییانی زانکۆی قاهیرەی میسر بکەن، کە لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٦ناڕەزایەتییان بەرانبەر نوێکردنەوەی پەیمانی میسری- بەریتانی دەربڕیبوو، کە بە پەیمانی (سدقی-بیڤن) ناسرابوو، ئەوکاتەی ئیسماعیل سدقی پاشا سەرۆکوەزیرانی میسر بوو و، مستەر بیڤنیش وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بوو. ئەودەمای شتێک لە ئازادیی دیموکراتی لە عێراقدا هەبوو و چەند حیزبێک مۆڵەتیان درابوێ و ڕێگە بە دەرچوونی هەندێ ڕۆژنامە درابوو. لەبەر داواکارییە میللییەکانی لە وڵاتانی عارەبی داوای هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکانی لەگەڵ وڵاتانی ئیستیعماری مۆرکرابوون دەکرا، ئیدی حکوومەتە عارەبییەکان و بەریتانیاش ویستیان بە جێبەجێکردنی ئەو داوا میللییانە و هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکانی پێشترێ لە بیستەکان و سییەکانی سەدەی بیستەم سەپێندرابوون، نوێی بکەنەوە، واتە ئەو پەیماننامانەی ئەو کاتەی بەریتانیا لەلایەن کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە کرابووە کوێخای هەندێ وڵاتی عارەبی و، شێوازی کوێخاییش شێوازێکی بەئەدەبانەی جێگرەوەی ئیستیعمارە. کە قوتابییەکانیش ویستیان خۆپیشاندانی ناڕەزایی بکەن، قوتابییە کوردەکان ڕازی نەبوون بەشداری بکەن و لە پۆلەکانیان مانەوە، چونکە نەیاندەزانی چ پەیوەندییەک لەنێوان بزووتنەوەکانی ڕزگاریی نیشتمانی و بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردیدا هەیە.

ساڵح حەیدەری[21]، کە قوتابیی کۆلێژی ماف بوو و پەیوەندییەکی لەگەڵ حیزبی شیوعیدا پەیدا کردبوو، داوای لێکردم کوردەکان هانبدەم بەشداری بکەن، کە زۆربەیان ئەندامی حیزبی هیوای نەتەوەیی کوردی بوون و، منیش پەیوەندییەکی پتەوم بە گەنجە کوردەکانەوە هەبوو. نایشارمەوە کە منیش، لەبەر ئەوکردارە سەرکوتکەرییانەی حکوومەت لە کوردستان لە دژی بارزانییەکان پیادەی دەکرد، هەڵوێستم نەرێنی بوو. ئاخر

---

21 _ ساڵح حەیدەری: لە ١٩٢٣ لە هەولێرێ لەدایکبووە ، بڕوانامەی مافی وەرگرتووە، لە ١٩٤٣ چووەتە ناو حیزبی شیوعی. لە سەرەتای دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٤٦ ڕازی نەبوو بچێتە ڕیزەکانی ئەو حیزبە و لە ١٩٥٧ چووەپاڵ ئەو حیزبە و کرایە بەرپرسی ناوخۆی هەولێر و لە ١٩٥٩ بووە ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی حیزب. بەڵام لە کۆنگرەی چواری حیزب لە ٤-٧ ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٩ لە حیزب دەرکرا. لە ساڵی ٢٠٠١ لە هەولێر کۆچی دوایی کرد. نقلا عن حنا بطاطو الشیوعیون و االبعثیون و الضباط الاحرار. ترجمة عفیف الرزاز، مؤسسة الابحاث العربیة، بیروت ،١٩٩٢،ج٣،ص١٣، حسن لطیف الزبیدی، المصدر السابق، ص ٣٣٤- ٣٣٥.

قەزایەکان دابندرێ و ئۆتۆنۆمی یان شـتێکی هاوشـێوەی ئۆتۆنۆمییان بدرێتێ، ویسـتی هەندێ ڕێوشـوێنی بەڕێوەبردن لە کوردسـتان بگرێتەبەر. نوری سـەعید لەوەی دەترسـا بیرۆکەی دیموکراتی و سۆشیالیستی لە کوردستانی ئێرانڕا دزە بکەن، کە سوپای سوور ناوچەی ئازەربایجان و بەشـێکی کوردسـتانی داگیرکردبوو و، کورد و ئازەربایجانی ئەوەیان قۆسـتەوە و ڕێکخراوی میللییان دامەزراند و گەیشـتە ئەوەی هەریەکە و کۆمارێکیان لێ دامەزرێنن. بەلام عەبدولئیلای وەسـی و زۆربەی ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی لە گەورە دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەتان پێکهاتبوون، لەگەڵ ئەو کارەی نوری سـەعیدی نەبوون نەوەکا گەل لە بەشـەکانی دیکەی عێراق داوای ئەو چاکسـازییانەی باسکران بکا. لەو ڕاپۆرتەی نوری سەعید لەگەڵ دەست لەکارکێشانەوەکەی بەرزیکردەوە، ترسی خۆی لەوەی بەدیاردەخا ئەو بیرۆکە پێشـەوتنخوازییانە دزەبکەنە ناو کوردسـتانی عێراق. ڕیزەکانی حیزبی هیوا ململانێی فیکری و سیاسیی تێدابوو، سەعید لەوەی دەترسا چەپڕەوەکان باڵ بەسـەر سـیاسـەتی حیزبدا بکێشـن و بیرۆکە و باوەڕیان دزە بکاتە لای ئەو ئەفسەرە کوردانەی ئەندامی حیزب بوون و زۆریشیان هەڵگری بیرو باوەڕی مارکسی بوون و، ئەوان بەدزییەوە سـەریان لە مهاباد دەدا کە سـەرکردایەتیی سـوپای سـۆڤیەتی لەوێ مۆڵ ببوو. لەبەر ملنەدانی وەسـی و پەرلەمان بۆ پێشـنیارەکانی نوری سـەعید، کە تێیدا هاتبوو مەلا مسـتەفای بارزانی لە ناوچەکە دووربخرێتەوە و ئەو ئەفسـەرانەی داویانەتە پاڵ بزووتنەوەی کوردی بهێندرێنەوە یەکەکانیان و لە سـوپا دوور بخرێنەوە و، کەسـە میانڕەوەکانی ناو حیزبی هیوا لە پۆستی بەڕێوەبردن دابمەزرێندرێن و دەسـەڵاتی سـەرۆک عەشـیرەتە کوردەکان لە ناوچەکەدا کەمبکرێتەوە، کە بەوکارەش دەکرێ کەسـە چەپەکانی حیزب تەریک بکرێن و کەسایەتییە ڕاستڕەوەکانی زۆربەیان ڕۆڵەی مولکدار و سەرۆک عەشیرەتەکانن بەدەولەتەوە ببەسترێنەوە و، بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی لەبار ببردرێ.

پەیوەندیم لەگەڵ بەڕێز سـالح حەیدەری پتەوبوو، بەتایبەت دوای ئەوەی لە حیزبی هیوا دەرکرام و، ئەو حیزبەش، لە بارودۆخی هەڵگیرسـانی شـۆڕشـی نیشـتمانیی کوردی بە سـەرۆکایەتیی "لیژنەی ئازادیی کوردان" بە سـەرکردایەتیی مەلا مسـتەفای بارزانی و دەستەیەک لە ئەفسەرە پێشکەوتنخوازەکان، نەیتوانی ببێتە پێشڕەوی گەلی کورد.

حیزبی شـیوعی، داوای دەکرد دەسـتوور بە دەق و ناوەڕۆکەوە جێبەجێ بکرێ، داوای ئازادییە دیموکراسـییەکانی دەکرد، هەندێ حزب مۆڵەتیان لە وەزارەتی ناوخۆ درابوێ، ئەوانەش حیزبی ئیسـتیقلال و وەتەنیی دیموکراتی و حیزبی شـەعب و ئیتیحدی وەتەنی بوون و ئەو حیزبانە ڕۆژنامەیان بە ئاشـکرا دەردەکرد، بەلام "ماددەی ٨٩ آ" چالاکیی

شیوعیی قەدەغە کردبوو. ئەو ماددەیە بڕگەی ئەوتۆی تێدایە شیوعییەکان بە سێدارە سزا دەدا. بۆ ئەوەی فشـاریش بخاتە سـەر حکوومەت تا ڕێ بە حیزب و بە سـەندیکا کرێکارییەکان بدا بەئاشـکرا کاربکەن، حیزبی ناوبراو شـەپۆلێک مانگرتنی کرێکاری و خۆپیشـاندانی جەماوەریی کرد. ڕۆژێک، سـاڵح حەیدەری، داوای لێکردم بەشـداری لە خۆپیشـاندانێک بکەم کە حیزبی ڕزگاریخوازی ئیشـتمانیی بێ مۆڵەت پیادەی دەکا، وەک ڕواڵەتێکی دەرەوەی حیزبی شـیوعیی قەدەغەکراو بەکاردەهات، کە حسـین محەممەد شبیبی سەرۆکی بوو. ئیدی لە خۆپیشاندانەکەدا بەشداربووم و لەگەڵ دەیان سەرکردەی حیزبی ڕزگاریخوازی نیشـتمانی و سـەرۆکی سـەندیکاکانی کرێکاران دەسـتگیر کرام، لە بەندیخانە چاوم بە حوسێن محەممەد شبیبی و سالم عوبێد نوعمان و عەبدولئەمیر بەهییە و چەندانی دی کەوت. کە بردراینە بەردەم دادگای سـزای بەغداش، بڕیاری بەندکردنی ژمارەیەک سـەرکردەی حیزبی ناوبراو و سـەرکردەی سـەندیکاکانی دا و چەندین پارێزەریش خۆبەخشـانە هاتبوون بەرگریمان لێ بکەن، ئیدی دادگا ژمارەیەکی زۆری دەسـتگیرکراوانی بەردا و منیش یەک لە بەردراوەکان بووم، بەڵام پەیوەندیم بە شـیوعییە دیارەکان پتەو بوو.

لەو ماوەیەی لە کۆلێژی ماف بووم و لە گەرمەی ڕووداوەکان، چەند جارێک و لەگەڵ چەندین کورد دەسـتگیر کرام و ئەوانیش کاکە حەمەی خانەقا و جەلیل هۆشـیار و کانەبی و جەوهەر دزەیی و شێخ عەلائەدین سەجادی و عەبدولقادر قەزاز بوون.

## حیزبی هیوا لەبەردەم ئەنجوومەنی عورفیی عەسکەری لە ١٩٤٥:

ساڵی ١٩٤٣، بە یارمەتیی شێخ مەحمودی حەفید، مەلا مستەفای بارزانی لە نیشتەجێی زۆرەملێ لە سلێمانی، بە ئێراندا رایکردەوە ناوچەی بارزان و، لەژێر پەردەی چلەکێشیش، ٧٠٠ بارزانی پێش ئەو چووبوونە چیا و ئەو چەکە کۆنانەیان دەرهێنا کە لە ئەشکەوتەکاندا شاردبوویانەوە. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کێشەیەکی چەکداری لە ناوچەکەدا دروست ببێ.حکوومەت ماجد مستەفای کردە ناوبژیوان و بزاوتە چەکدارییەکان کۆتاییان هات و مەلا مستەفا بۆ دیداری بەرپرسان هاتە بەغدا، لەوانەش عەبدولئیلای وەسی. بڕیاری لێبووردنی گشتیی بارزانییەکان درا و، پەیمانی ئەوەیشیان دانێ گرنگی بە ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکەیان بدرێ و کێشەکانیان چارەسەر بکرێن.
وەک پێشتر باسم کرد، ساڵی ١٩٤١ شێخ مەحمود سوودی لە شڵەژانی دۆخەکە و هەلاتنی حکوومەتەکەی ڕەشید عالی گەیلانی وەرگرت. تاقیکردنەوە تاڵەکەی بەریتانییان لەگەڵ شێخ مەحمود ولە مەودای ئەو ساڵە دووردوودرێژانەش، بۆی سەلماندبوون شێخ ئەو کەسایەتییە نییە بەپێی بەرژەوەندیی ستراتیژیی بەریتانیا لە ناوچەکەدا دەستەمۆ بکرێ. بەڵام بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی هەیە و دەیان هەزار ڕۆشنبیر و ئەفسەر و سەرۆک عەشیرەت و مەلا و کاسبکاری تێدایە و، ئەویش حیزبی هیوایە. بەراییەکانی ڕزگاری لێرەولەوێ لە سەرکردایەتییە تاکڕەوییە لاوازەکەی ئەو حیزبە دەرکەوت، دەبووایە سەرکردایەتی پتر گوێڕایەڵی بەریتانییان بێ و پتریش کەمەندکێشی هەڵچوونی گەنجان بێ، بۆ بزووتنەوەکە پەیدانکرێ. لە بواری عەشایەری کەس لە مەلا مستەفای بارزانی شایانتر نەبوو و، لە بواری ڕۆشنبیرانیش ماجد مستەفا دەستنیشان کرا.
گەنجە گەرموگوڕەکانی ناو ڕیزەکانی حیزبی هیوا، ماجد مستەفا سەرسامی نەدەکردن، بەڵام سەرسامی ئەو قوربانییانەبوون ، لە شۆڕش و گیران و ئاوارەیی، کە بارزانییەکان لە ساڵی ١٩٣١ڕا تا ئێستا پێشکەشیان کردبوو. لەلایەک ئەو بێنەوبەردەیەی نێوان حیزبی هیوا لە عێراق و قازی محەممەد لە مهاباد و، بێنەوبەردەی بەریتانییەکان و حکوومەتی عێراقی و ماجد مستەفای نوێنەریان لەلایەکی دیکە، وایکرد مەلا مستەفا لە یارییەکەی بەریتانییان دوور بخرێتەوە. ئەوەش وای لە ژەنەراڵ ڕنتنی پشکنەری گشتیی سوپای عێراق کرد هەڕەشە بکا و بڵێ: "من دەستی چەپم لە شەڕەکانی باکووری ئەفریقیا لە دژی ڕۆمێل لەدەستداوە، پێموایە دەستی ڕاستیشم لە کوردستان لەدەست دەدەم".
لە ١٩٤٥، کە دیسان تەق و تۆق کەوتە نێوان بارزانییەکان و هێزە حکوومییەکان، حیزبی هیوا دەسەڵاتێکی فراوانی لەناو فەرماندە و ئەفسەر و سەربازانی فیرقەی دوو هەبوو کە لەبنجڕا بۆ شەڕی کودستان ئامادەکرابوو. ئیدی حیزبی هیوا ڕێنمایی بۆ فیرقەکە دەرکرد

لە کوردان نەدەن و، حیزب بەیاننامەیەکی بەناوی سەرکردەکەی دەرکرد کە خۆبەزل زانی و شایی بەخۆبوونیکی زۆری پێوە دیاربوو و، داوای لە سوپا دەکرد لە حکوومەت یاخی بێ و شەڕی کوردان نەکا. بەیاننامەکەیش زۆر بە فراوانی بڵاوکرایەوە و لەوانەش بەغدای پایتەخت. ئیدی حکوومەت لێی ڕوون بوو کە شـــکســـتی ســـوپا لەشـــەڕەکاندا لەبەر ئەو ئاڵۆزییانەیە کە لە هەســـتی نەتەوەیی بەربڵاوی ناو یەکەکانی ســـوپاوە دێ. جا هەندێ ڕێوشوێنی سەرکوتکردنی گرتەبەر، لەوانەش دەستگیرکردنی کۆمەڵێک ڕۆشنبیر، ئەوانیش: کاکەحەمەی خانەقا و جەوهەر عەزیز دزەیی و کانەبی عەزیز دزەیی و جەلیل هۆشـیار و عەبدولقادر قەزاز و شێخ عەلائەدین سەجادی و من.

ڕەشنووسی بەیانی ناوبراو لەماڵەکەی کاکە حەمەی خانەقا دۆزرایەوە، هەندێ نامەش دۆزرانەوە، کە ســەرۆک میرحاج و ســەرۆک مســتەفا خۆشــناو، کاتێ وەک دوو نوێنەری حیزبی هیوا بەنهێنی ســـەریان لە ناوچەکە دابوو، لە مهابادڕا، ئەوکاتەی کۆماری مهاهاباد هێشتا مابوو، نامەکانیان ڕەوانە کردبوو. ئەوەش وایکرد مستەفا خۆشناو ڕابکا و میرحاج و کۆمەڵێ ئەفسەری دیکەی کوردیش گیران.

کە هەریەک لە جەوهەر و کـانەبی دزەیی گیران، چەنـدین دانەی بەیـاننـامەکەیـان بە چاپکراوی لا دۆزرایەوە کە دەیانویست لە ناوچەی ئەعزەمییە بڵاوی بکەنەوە.

تا نەتوانین پەیوەندی بەیەکدییەوە بکەین، هەریەکە و لە بنکەیەکی پۆلیس بەندیان کردین و، لە بەڕێوەبەرایەتیی لێکۆڵینەوەکـانی تـاوان لێکۆڵینەوەیـان لەگەڵ کردین و، بـایی ئەوەندەیان بەڵگە کۆکردەوە تا بتوانن ڕەوانەی ئەنجوومەنی عورفیی ســـەربازیمان بکەن، کە لە ســایەی بڕیارە عورفییەکانی ئەودەمی لە عێراق باوبوو، دادگایی خەڵکی ســیاســی دەکرد.

تۆمەتی ئەوەمان درابووەپاڵێ کە"سوپامان هانداوە یاخیبێ و هەڵگەڕێتەوە" و سزایەکەیشی ســـێـدارەبوو، بەڵگەی تەواوی تـاوانبـارکردنی هەموومـان یـان لانیکەم زۆربەمـان لەبەردەستدابوو. لە سەربازگەی وەشاش لە ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی دانیشتنێکی بەرایی کرا تا تۆمەتمان ئاڕاستە بکرێ، بەڵام زۆربەمان سەر بە خانەوادەی ئەوتۆ بووین کە دەسەڵات و پێگەیەکی لە کۆمەڵگا و دەوڵەتدا هەبوو، ئیدی خدر ئەحمەد پاشای دزەیی، کە ئەودەمی لە ئەنجوومەنی نوێنەران ئەندام بوو وشێخ عەبدولوەهاب تاڵەبانی، کە ئەویش هەر نوێنەر بوو و ســەید ئەحمەدی خانەقا، کە پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ شـێخ جەعفەر ئەبو تمەن هەبوو، هەر خێرا هاتن تا فشار بخەنە سەر حکوومەت و دادگاییەکە ڕاگرێ و لێخۆشـــبوونمـان بۆ دەرکـا و داوایەکەش دابخـا و، ئەوانیش لە بەرانبەردا بەڵێننـامە و کەفالەتێک بدەنە حکوومەت تا بەرمان بدەن.

دوای کۆتاییهاتنی لێکۆڵینەوە، هەموومانیان لە بەندیخانەی گشتیی راگیراوانی بابولموعەززەم کۆکردەوە، رۆژێکیان پێش دەستپێکردنی دانیشتنی دووەمی ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی، داوایان لێکردین ئامادەبین تا چاومان بە جەلال بابانی وەزیری داد بکەوێ. کە چووینە نووسینگەکەی، هەستایەوە و بەرەوڕوومان هات و لە ناو و پیشەی یەکەبەیەکەمانی پرسی، شێخ عەلائەدین سوجادی نەبێ کە پێشنوێژی مزگەوت بوو و عەبدولقادر قەزاز کە فەرمانبەر بوو، دەنا ئەوانیدی هەموومان قوتابیی کۆلێژی ماف بووین . ئیدی ڕووی قسەی تێکردین و گوتی: "کوڕەکانم، ئێوە قوتابیی کۆلێژن و ماوەیەکی کەمتان ماوە و دەردەچن، تکام وایە خەریکی خوێندنی خۆتان بن و سیاسەت بۆ **ئێمە** لێگەڕێن، کە خوێندن تەواودەکەن و بڕوانامەی بەرز وەردەگرن، ئەودەم بواری سیاسەت و ژیان بەڕووتاندا دەکرێتەوە. ئێستا کە ژوورەکەم بەجێدێڵن هەمووتان دەچنەوە لای کەسوکارتان، نامەوێ جارێکی دیکە بەو شێوەیە بتانبینمەوە، فەرموون بڕۆنەوە ماڵەکانتان" ئەوجا بەریاندانین و کێشەکەش داخرا.

## چۆن چوومە ڕیزی حیزبی شیوعیی عێراقی؟:

لە ١٩٤٥ حیزبە خاوەن مۆڵەتەکان و بێ مۆڵەتەکان زۆریان هاریکاریی یەکدی دەکرد بۆ داوای ئازادیی دیموکراسـیی پتر و، هەڵوەشـاندنەوەی پەیماننامەی عێراق- بەریتانیا و، دەرچوونی هێزەکا نی بەریتانیا لە بنکە سـەربازییەکانی عێراق و، هاتنەدەرەوەی عێراق لەناو دەسـتەی ئیسـتەرلینی و چارەسـەرکردنی کێشـەی گوزەرانی هاووڵاتیان. جا هەر حیزبە و لە کاری سـیاسـیدا شـێوازی خۆی هەبوو. حیزبی وەتەنیی دیموکراسـی لە چوارچێوەی ئەو ئازادییانە کاری دەکرد کە لە دەقی یاسـا باوەکاندا هاتبوون. کەچی حیزبی ئیتیحادی وەتەنیی عەبدولفەتاح ئیبراهیم سەرۆکی بوو و حیزبی "شەعب"ی عەزیز شەریف سەرۆکی بوو خەریکی فشار بوون تا ئەو یاسایانە بگۆڕن کە ئازادییەکان کۆت و بەند دەکا. هەرچی هەردوو حیزبی شـیوعی عێراقیی یوسـف سـەلمان یوسـف"فەهد" سـەرۆکی بوو و حیزبی"التحرر الوطني"ی حوسـێن محەممەد شـبیبی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حیزبی شیوعی سەرۆکی بوو، خەریکی کاری جەماوەری بوون، وەک مانگرتن و خۆپیشـاندان و ملەیان لەگەڵ ئەو یاسـایانە دەکرد کە ئازادییەکانی کۆتکردبوو و دەیانویسـت داواکارییەکان بەسـەر حکوومەتدا بسـەپێنن و، کاریان بۆ ڕووخاندنی حکوومەت دەکرد تا حکوومەتێکی نیشتمانیی دیموکراسی دامەزرێ و بەدەم دواکارییەکانی گەلەوە بێ.

لەبیریشـمە حیزبەکان، بەبۆنەی بەڵێنی بەلفۆر، لەسـەر ئەوەی ڕێککەوتن مانگرتنێکی سیاسیی گشتی بکەن تا توانای هێزە نیشتمانییەکان دەرخەن. ئیدی بەیاننامەیان دەرکرد ومانگرتنەکە هەموولایەکی گرتەوە. سەرباری ئەوەش، حیزبی شیوعیی عێراقی و ڕزگاریی نیشـتمانی خۆپیشـاندانێکی جەماوەرییان کرد و لەگەڵ هێزەکانی پۆلیس لێکیاندا، کە ئەوەش، بەهەنجەتی پاراسـتنی پیرۆزیی مـانگرتنەکە، نـاڕەزایی حیزبەکـانی دیکەی لێ کەوتەوە. هەر لەو سـەروبەندیشـدا سـکرتێری گشـتیی حیزبی شـیوعیی عێراقی "فەهد" نامیلکەکەی خۆی بەناوی"پێداویسـتییەکانی تێکۆشـانی نیشـتمانیمان"ی بڵاوکردبووەوە و، تێیدا، لە شـەڕی نیشـتمانیدا، بەرگریی لە ڕەوایی بەکارهێنانی هەمووشێوازێکی تێکۆشـان دەکرد و، ڕوونیکردبووەوە کە هەر حیزبێک و شـێوازی خۆی هەیە و ئەو شـێوازانەش دژی یەکدی نینە، بەڵکو هەرشـێوازێکیان تەواوکەری ئەویدییە. لە ڕاسـتیشـدا، حیزبە ئاشکرایەکان لە دوو شت دەترسان، یەکەمیان بەرفراوانبوونی دەسەڵاتی حیزبی شیوعی لەناو جەماوەردا، بەتایبەتیش کرێکاران و قوتابیان، دوەمیشـیان، نەکا حکوومەت پەنا بۆ هەڵوەشـاندنەوەی مۆڵەتەکانیان ببا و ئیدی چالاکیی سـیاسـییان نەمێنێ و گۆڕپانەکە بۆ حیزبی شـیوعیی عێراقی چۆڵ ببێ، کە بەنهێنی کاری لە ڕێکخسـتنەکانیدا دەکرد، بەڵام بە

ئاشكرا ڕووبەڕووی ئەو یاسایانە دەبووەوە کە لە کاری سیاسی و ڕاگەیاندنی مانیفێستیدا ئازادییەکانی لێ کۆتوبەند دەکرد.
لە ١٩٤٦دا، ئەرشەد ئەلعومەری[22] سەرۆکایەتیی حکوومەتی وەرگرت، کە پیاوێکی نیمچە شێت بوو، تا بەر بە بزووتنەوەی نیشتمانی بگرێ و چالاکیی سەندیکاکان بەرتەسک بکاتەوە، ئیدی شەپۆلێکی مانگرتن و خۆپیشاندان وڵاتی گرتەوە. لە حوزەیرانی ١٩٤٦ خۆپیشاندانێکی جەمارەریی گەورە کرا و لەگەڵ پۆلیس تێکگیران و و تەقەیان لە خۆپیشاندەران کرد و کەسێک شەهیدبوو[23]، پاشان، لە ئەیلوولی هەمان ساڵدا، خۆپیشاندانێکی گەورەی دیکەی بەدواداهات و لەگەڵ پۆلیس تێکگیران و پۆلیس محەممەد حوسێن شبیبی و سالم عوبێد ئەلنوعمان و سەرۆک سەندیکاکان و ژمارەیەک کرێکار و قوتابیی گرت، منیش لەناو گیراوەکان بووم، ئەگەرچی من ئەندامی حیزبی شیوعی نەبووم و لە حیزبی هیوای نەتەوەیی کوردییش هاتبوومە دەرێ، ئەگەرچی بڕیارێک بە بێگوناهی و بەشداری نەکردنیشم لەو خۆپیشاندانە دەرچوو، کەچی ئیبراهیم عاتف ئالوسیی وەزیری مەعارف فەرمانێکی دەرکرد تا لە هەردوو خولی تاقیکردنەوەی کۆتایی بێبەشم بکا و، ئەوەش مانای دەرنەچوونم بوو و دەوامی ساڵێکی دیکەی خوێندن.
لەبیرمە، چوومە لای شێخ بابەعەلیی شێخ مەحمودی حەفیدی وەزیری ئابووری و، بابەتەکەم بۆ باسکرد، ئیدی بۆ دیداری ئەرشەد ئەلعومەریی سەرۆکوەزیران لەگەڵم هات و زۆر بە نامەردی پێشوازیی کردین و گوتی: "ئەگەر دەستیشم ببڕن لێناگەڕێم تاقیکردنەوە بکا".

---

[22] _ ئەرشەد ئەلعومەری: ساڵی ١٨٨٨ لەدایکبووە و لە قوتابخانەی ئەندازیارانی مەلەکیی باڵا لە ئەستەمبۆل لە ١٩١٢ خوێندنی تەواوکردووە. لە دەوڵەتی عوسمانلیدا زۆری پێگەی ئەندازیاری وەرگرتووە، لە ١٩١٩گەڕایەوە مووسڵ و چەندین پۆستی وەرگرت، یەکەم جاریش لە وەزارەتەکەی عەلی جەودەت ئەیووبی لە ٢٥ی ئابی ١٩٣٤ بووە وەزیری ئابووری و گەیاندن و، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی مانگی سووری عێراقی، چەند جاران بووەتە وەزیر و یەکەمجاریش لە حوزێرانی ١٩٤٦ وەزارەتی پێکێنا و دووەم جاریش لە ٢٩ی ئابی ١٩٥٤. بڕوانە: باقر امين الورد. اعلام العراق الحديث. منشورات دار التربية. بغداد ١٩٨٤. ص١١٥- ١١٦.

[23] _ لە ئەنجامی بڕیاری وەزارەتی ناوخۆ لەسەر داخستنی کۆمەڵەی نەهێشتنی زایۆنیزم، کە پێیانوابوو پێویستە ئاستی هێزی جەماوەرییان بۆ ڕای گشتی وەدەرخەن، ئیدی کۆمەڵەکە بە پشتیوانیی حیزبی شیوعی، لە ٢٨ی حوزێرانی ١٩٤٨ بۆ ڕووزەردکردنی ئەوکارەی ناویان نابوو"تیرۆری وەزارەتی ئەرشەد عومەری" داوای خۆپیشاندانی کرد. خۆپیشاندانەکە لە شەقامی ڕەشید دەستیپێکرد و لەگەڵ هێزەکانی پۆلیس تێکهاڵان و لە ئەنجامدا پتر لە ٤٥ شیوعی گیران و لەو خۆپیشاندانەش شائوول تەویقی ئەندامی حیزبی شیوعی لەنزیک باڵیۆزخانەی بەریتانی بەگوللەی پۆلیسی مەلیکی کوژرا. ئەو پۆلی پێنجەمی ئامادەیی بوو وهەر دەیگوت : " نە ڕێککەوتن و نە سەرشۆڕی، عێراقێکی سەربەخۆ و ئازادمان دەوێ". بۆ زیاتر بڕوانە:الحزب الشيوعي العراقي، شهداء الحزب، شهداء الوطن، ١٩٣٤-١٩٦٣، مطبعة الرواد المزدهرة، بغداد، ٢٠٠٨، ص١٤.

ڕاستییەکەی، کۆلێژی ماف جۆرە سەربەخۆیی و شکۆیەکی هەبوو و، کە ئیبراهیم عاتف ئالووسیی وەزیری مەعارف فەرمانی دابوو لە تاقیکردنەوە بێبەش بکرێم و لە قۆناغی چوار بە دەرنەچوو دابندرێم، دەبوایە بۆ ساڵی پێنجەم دەوام بکەم و، هەر بەڕاستییش دوو مانگم دەوام کرد و سەرم لە بەڕێوەبەریی کۆلێژ دەدا تا بڕیارەکەی وەزیری مەعارف هەڵوەشێتەوە، عەمیدی ئەوسای کۆلێژیش مامۆستا مونیر ئەلقازی بوو ومەلا بوو و، بابەتی گۆڤاری ئەحکامی دەگوتەوە کە لە سەردەمی عاسمانلی وەک یاسای شارستانی دەردەچوو، لەبەرئەوەی لە توێژی دەسەڵاتدار نزیکبوو کردبوویانە عەمیدی کۆلێژ.

مامۆستا مونیر ئەلقازی ڕازی نەبوو کێشەکەم بخاتە بەردەمی ئەنجوومەنی کۆلێژ. بەڵام من داوایەکەم بە ١٣ کۆپی بە ژمارەی ئەندامانی ئەنجوومەنی کۆلێژ پێشکەش کردبوو و، هەر ئەندامێک ڕاستەوخۆ داوایەکەم دابوێ. ئەوەش وایکرد هاوڕابن لەوەی دەبێ ئەنجوومەنی کۆلێژ کۆببێتەوە و کێشەکە تاوتوێ بکا. عەمید ملی بۆ داوای ئەندامانی ئەنجوومەن دا و، لە یەکەم کۆبوونەوەش ئەو بڕیارەی خوارەوەیان دا: "چونکە بڕیارەکەی وەزیری مەعارف لە پێش دەستپێکردنی پشوو و لەکاتی دەوامدا دەرچووە، کەواتە تێنۆڕیی چارەنووسی قوتابییەکە تەنیا کاری ئەنجوومەنی کۆلێژە. چونکە قوتابی، موکەڕەم جەماڵ تاڵەبانی، بە بەشداریی خۆپیشاندانی دژە حکوومەت تۆمەتبار کراوە و دادگای تایبەت ئەستۆپاکی کردووە، ئەوا ناکرێ دووجار لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکرێ، لەبەر ئەوەی پشت بە بڕیاری دادگاش دەبەسترێ، بۆیە دەبێ وایدانێین بڕیاری وەزیری مەعاریف تێپەڕاندنی دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی کۆلێژە و ئەنجوومەن بڕیاریداوە پابەندی ئەو بڕیارە نەبێ و ڕێگە بە قوتابیی ناوبراو بدرێ بەشداریی تاقیکردنەوەکان بکا، چونکە تاقیکردنەوەکانیش بە هەردوو خولییەوە کۆتاییان هاتووە، ئەوا ئەنجوومەنی کۆلێژ پێشنیاردەکا تاقیکردنەوەیەکی تایبەتی لە هەموو وانەکاندا بۆ بکرێ" تەنیا مونیر ئەلقازیی عەمیدی کۆلێژ بەو بڕیارە ناڕازی بوو و، تاقیکردنەوەکەم کرد و لە هەموو وانەکاندا دەرچووم.

دوای ئەو خۆپیشاندانە، ئێوارەیەکیان ساڵح حەیدەری بردمی و گوتی لەگەڵم دێیتە جێیەکی کەسایەتییەکی گرنگی حیزبی شیوعیی عێراقی دەبینم، ئیدی بردمییە ماڵێکی تۆزێک لاچەپی کەڕادەی خۆرهەڵات، تا لەگەڵ کەسێک یەکدی بناسین کە دواتر زانیم زەکی محەممەد بەسیمی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حیزبە، لە حەوشەی ماڵەکە دانیشتین و، گڵۆپەکان کوژابوونەوە، کە خەریکی قسان بووین دیتم کەسێکی بەژن کورتی تێکسمڕای بەسەر دیواری کەوت و ئاودیو بوو و هات لەگەڵمان دانیشت، لە هەڵسوکەوتی زەکی

بەسیمیرا ئەوەم خەملاند کابرا کەسایەتییەکی لەوی گەورەترە و بە "هاوڕێ" بانگی دەکرد. دوای کەمێک زانیم ئەوە"فەهد"ی سکرتێری گشتیی حیزبی شیوعیی عێراقییە. لێیپرسیم داخوا ئارەزووی ئەوەی دەکەم بێمە ڕیزەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی! ڕەزامەندیم دەربڕی، ئەودەم فەهد ئاماژەی قبوولکردنی منی دا و پیرۆزبایی ئەوەی لێکردم کە شکۆی ئەندامێتیی حیزبم پێ براوە و، گوتی: "من بۆ ئەندامیی حیزب دەستنیشانی دەکەم" ڕەنگە من لەو ژمارە کەمەی ئەندامانی حیزب بووبم کە سکرتێری گشتیی حیزبی شیوعیی عێراقی دەستنیشانی کردوون. لەو سالانەی دواییش، بەهادین نووری بیرەوەرییەکانی نووسیوەتەوە و وەهای وەسفکردووم کە"وەک هاوڕێ فەهد دەڵێ، لە شیوعییەکانی سالۆنانە" ئیدی لە وەلامیدا نووسیومە من بارتەقای تەمەنی حیزبیی ئەوم لە سالۆنەکانی زیندانی بەغدا و باقووبە و نوگرە سەلمان بەسەربردووە، بە دڵنیاییشەوە "هاوڕێ"ش لە شیوعییەکانی سالۆنان مەبەستی من بووە، چونکە خۆی بۆ ئەندامێتیی حیزب دەستنیشانی کردم و لەسەر قسەی ئەویش کرامە ئەندامی حیزب.

هاوڕێ فەهد پێشنیاری کرد لەبوارە ئاشکرایەکە کاربکەم و لەجێی یەک لە ئەندامەکانی ، کە نەخۆشی لێنەدەگەڕا چالاکییەکانی وەک پێویست جێبەجێکا، بچمە دەستەی دامەزرێنەری حیزبی ڕزگاریی ئیشتمانی. داوایشی لێکردم هەوڵدەم مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامەیەک وەرگرم و گوتی: "ئەگەر سوود لە دەسەلاتی مامەکانیشت وەرگری قەیدی نییە و، بگرە ئەگەر بەرتیلیش بدەی هەر قەیدی نییە". بەلام من کە خوێندنم تەواوکرد بەلایەکیدیدا چووم و کەوتمە ناو چالاکیی سیاسیی ئاشکراو نهێنی.

شیوعییەت بۆ من نەنیاس نەبوو، کە لە کەرکووک قوتابیی ئامادەیی بووم لەبارەیەوە گوێم لە هەندێ شت ببوو و ئەو کتێبی مارکسیی دەستیشم بکەوتایە، کە لە کتێبخانەکان دەەفرۆشران، دەمخوێندنەوە. جا ژمارەیەک کتێبم کۆکردبووەوە. ئەو گۆڤارانەی هەندێ حیزبی شیوعیی ولاتە عارەبییەکان دەریاندەکرد دەگەیشتە عێراق، لەوانەش "الغد"ی حیزبی شیوعیی فەلەستینی دەریدەکرد و، ڕێکخراوە مارکسییەکان و حیزبی شیوعیی عێراقیش هەندێ بلاوکراوە و ڕۆژنامەی نهێنییان دەردەکرد و بە شێوەیەکی فراوان بلاودەکرایەوە، ئیدی مرۆ دەیتوانی بۆخۆی خۆی بە ڕۆشنبیریی مارکسی ڕۆشنبیر بکا و، منیش هەر ئەو کارەم دەکرد.

کە لە بەغدابووم، نەچوومە ناو هیچ بازنەیەکی نهێنیی حیزب، چونکە بڕیاربوو لە ڕووکاری دەرەوەی حیزب کار بکەم. ئیدی پەیوەندیم بە محەممەد حوسێن شبیبییەوە بوو

که سەرۆکی دەستەی دامەزرێنەری"تەحەڕوری وەتەنی"[24] بوو، ئەو حیزبە جەماوەرییەی حیزبی شـیوعی پێکیهێنابوو تا ببێتە حیزبی ئاشـکرای ڕێگەپێدراو، بەڵام حکوومەت، بەو هەنجەتەی ئەو حیزبە ڕووی دیاری حیزبی شـیوعییە، مۆڵەتی نەدایە. جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ڕووی ئاشـکرای حیزبی شـیوعی و حیزبی "تەحەڕوری وەتەنی"ی شـیوعییەکان سـەروکاریان دەکرد هەیە. حیزبی "تەحەڕور" ئەگەرچی حکوومەت ڕاویدەنان، بەڵام لە بۆنە نیشتمانی و نەتەوەییەکان و ڕێکخستنی خۆپیشاندانی جەماوەری، بەیاننامەی بەناوی خۆی بڵاودەکردەوە.

دوای ئەوەی حیزبی"تەحەڕوری وەتەنی" نەیتوانی مۆڵەتی کـارکردنی دەسـتکەوێ و هەریەک لە حوسـێن شـبیبی و محەممەد حوسـێن ئەبولعیس و سـاڵم عوبێد نوعمان و گەلێکی دیکە لە سـەرۆک سـەندیکا گیران، وازم لەو بیرۆکەیە هێنا و بڕیارم دا دوای دەرچوونم لە کۆلێژی ماف بچمەوە کەرکووک.

[24] _ تۆفیق سـوەیدی لە ٢٨ی شـوباتی ١٩٤٦ وەزارەتی پێکهێنا و نەوەیەکی نوێی سـیاسـییەکانی تێدابوو، ئەوانەی حیزبە سـیاسـییەکان چاویان لێبوو سـەردەمێکی نوی دروسـتکەن جودابێ لەوەی لە سـیاسـییە دووسـەردەمییەکانی دیتبوو. تۆفیق سـوەیدی ڕەنگوڕواژای سـیاسـەتی ناوخۆی خۆی بە کۆتایی هاتنی بارودۆخە نابەڵەدەکەی وڵات و هەڵوەشـاندنەوەی حوکمی عورفی و داخسـتنی بەندیخانەکان و بواردانی حیزبە سـیاسـییەکان، دەسـتپێکرد. حیزبی شـیوعیی عێراقییش پێشـوازیی لەو کارە کرد ئیدی خەریکی ڕێکخسـتنی پێکهاتەیەکی حیزبی بووتا حیزبێکی ئاشـکرا دامەزرێنێ وپێکهاتەکەش بریتیبوون لە هەریەک لە "حوسێن محەممەد شبیبی و مەحمود ساڵح ئالسەعید و محەممەد حوسێن ئەبولعیس و یوسف عەبود و عەبدولجەبار حەسون جارەڵلا و محەممەد عەلی یوسف ومحەممەد خەلەف و محەممەد عەلی زەرقا و سالم عوبێد نوعمان". داوای مۆڵەتەکە پێشکەشکرا، بەڵام حکوومەت مۆڵەتی حیزبی ئەحرار و ئیستیقلال و وەتەنیی دیموکراتی و ئیتیحادی وەتەنی و شەعب و کۆمەڵەی لەناوبردنی زایۆنیی دا کە شیوعییەکان تێیدا باڵادەسـت بوون، مۆڵەتی حیزبی تەحەررووری وەتەنی ، کە ناوی ئاشـکرای حیزبی شـیوعیی عێراقی بوو، ڕەتکرایەوە، ئیدی دەسـتەی دامەزرێنەر پەنایان بۆدەرکردنی نامەی سـالانە برد بەناوی نامەکانی ڕزگاری و، هەوڵیدا ئامانجەکانی حیزبیان تێدا ڕوونکاتەوە، وەک "سـەربەخۆیی و سـیادەی نیشـتمانی" و" بەرەی نیشـتمانی".بۆ زیاتر بڕوانە: سیف عدنان آرحیم القیسی، الحزب الشیوعی العراقئ من اعدام فهد حتی ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨، دار الحصاد، دمشق، ٢٠١٢.

## عەریف حوسێن محەممەد ڕەحیم و موفەوەز سەفا:

ساڵی ١٩٤٥ هێشتا قوتابیی کۆلێژی ماف بووم و، ئەودەمی وازم لە حیزبی هیوا هێنابوو، بەڵام هەرچەند جاری لە کوردستان شەڕ لەگەڵ ئەندامانی ئەو حیزبە ڕوویدابا من ڕاوەدوو دەندرام. کەچی سووربووم لایەنە ئەمنییەکان نەزانن پەیوەندیم بەو حیزبەوە نەماوە و، بگرە هەر لەو ساڵە لەگەڵ سەرکردەکانی ئەو حیزبە تا نزیک پەتی سێدارەش چووم.

هاوینی١٩٤٥، دوای ئەوەی "فەهد"ی سکرتێری گشتیی حیزبم دیت، چوومە ڕیزی حیزبی شیوعیی عێراقی و، چەندین کتێبی مارکسیم پەیداکردبوو و چەندین ژمارەی ڕۆنامەی "القاعدة" ڕۆژنامەی نهێنیی حیزبی شیوعیی عێراقی. بنکەی پۆلیسی عیوازییە لەپشت ماڵمان بوو و عەریفی بنکەکەش حوسێن محەممەد رەحیم بوو و کوردێکی عاشیرەتی "کیز" بوو کە لە ناوچەی نارینی باشووری شارۆچکەی کفری دادەنیشن. هەرچی عەریف حوسێن و عەلیی برای بوون لەگوندی زەرداوی ئێمە دادەنیشتن و برایەکەی خەریکی کشتوکاڵ بوو. عەریف حوسێن هەستێکی نەتەوایەتیی هەبوو و هاوسۆزی ئێمەبوو چونکە ئێمە شێخی گوندەکەی بووین و زۆرجاران سەری لێدەداین و هەندێ جاریش نانی لەگەڵ دەخواردین. لێکۆڵینەوەکانی تاوان، لە پشکنینی ماڵان و گرتنی گومانلێکراوان، پەنایان بۆ پۆلیس دەبرد، عەریفیش، لەو لێکۆڵینەوانەی بەنیازبوون لەدژم بیکەن، هەواڵی دەدایێ. ڕۆژێکیان هەواڵی دامێ کە لێکۆڵینەوەی تاوانەکان بەنیازن ماڵەکەمان لە گەڕەکی عیوازییە بپشکنن و، داوای لێکردم چاپکراوە قەدەغەکان بشارمەوە یان لەناویان ببەم. چونکە ئەو چاپکراوانەش خۆشەویستبوون لەلام داوام لێکرد ڕێیەک بۆ پاراستنیان بدۆزێتەوە. کۆمەڵێک بەیاننامە و ڕۆژنامەی نهێنیی حیزبی شیوعیم دایە، ئەویش بردی و لە دۆڵابێکی بنکەی پۆلیس شاردنیەوە تا دۆخەکە کۆتاییهات و بۆی هێنامەوە و دەیشیزانی چاپکراوی شیوعین.

هەرچی کتێبە مارکسییەکان بوون، دامنە دەست برادەرێکم، ئەویش مامە عەبدولکەریمی تووتنچی بوو و لە گەڕەکی حەیدەرخانەی دوکانێکی تووتن و جگەرە فرۆشتنی هەبوو و بردبوویەوە ماڵەکەی، کە زانیبووشی کتێبی شیوعییانە هاویشتبوونیە ناو تەنوور و سووتاندبوونی.

موفەوەزێکی پۆلیس لە بەغدا هەبوو ناوی سەفا بوو، ئەو ئەرکەی پێیدەسپێردرا ئەوەبوو هێرش بکاتە سەرخۆپیشاندانەکان و بە زەبری هێز بڵاوەیان پێ بکا. ئیدی ئەو کارەی زۆر بە دڵسۆزییەوە بۆ حکوومەت دەکرد. سەفا سەری لە کتێبخانەی دارولحیکمە دەدا، کە لەبنجرا هیی حیزبی شیوعیی عێراقی بوو و، شیوعییەکان بەزۆری لەوێ یەکدییان

دەدیت، وەک حوسێن محەممەد شبیبی و سالم عوبێد ئەلنوعمان و عەزیز عەبدولهادی وحەمزە سەلمان و ئیی دیکەش. ئەوانە هەڕەشەی ئەوەیان لە سەفای دەکرد لەبەر دژایەتیکردنی شیوعییەکان ڕۆژێک دێ دەیکوژن. سەفاش دەیگوت من دژایەتیی کەس ناکەم، بەڵام من فەرمانبەرم و ئەو فەرمانانە جێبەجێ دەکەم کە دەردەچن و لێیشیان تێناپەڕێنم. هەر بۆ نموونە ، دوێنێ داوایان لێکردم کەسێکی شیوعی بگرم، منیشماڵێکم پشکنی کە پێموابوو لەوێیە، لەوێ هەندێ کاغەزم دیت ئامادەکرابوون تا ڕۆژنامەی "القاعدة"ی لەسەر چاپ بکەن، بەڵام حکوومەت داوای لێنەکردبووم بەدوای چاپخانەی "القاعدة"دا بگەڕێم، بەڵکو گوتیان کابرای ناوبراو بگرم. ئیدی نە بە حکوومەتم گوت چیم دیوە و نە ماڵەکەم مۆر لێدا. ئامادەبووان بەدرۆیان دەخستەوە و قسەکەیان ڕەتدەکردەوە. کە موفەوەز سەفاش لەوێ ڕۆیی حوسێن محەممەد شبیبی گوتی ڕاستدەکا، ئیدی بە هەندێ هاوڕێی گوت یەکسەر چاپخانە و کاغەزەکان بگوازنەوە جێیەکی دی.

**تەواوکردنی خوێندنی کۆلێژی ماف و نیشتەجێبوون لە کەرکووک:**

دوای ساڵانی خوێندنی کۆلێژی ماف، کاتی دەرچوونم هاتبوو و بەڵگەنامەی دەرچوونم بردە لای مونیر ئەلقازیی عەمیدی کۆلێژ و ئیمزای کرد و ئەوجا پێیگوتم: "ئێستا تۆ خوێندنت تەواوکردووە و هیچ پەیوەندییەکت بە کۆلێژەوە نەماوە، بەڵام بە شەرەفت پرسیارت لێ دەکەم، بەشداریی خۆپیشاندانەکانت نەدەکرد؟". گوتم؛ " مادام شوێندی شەرەفت دام، بەڵێ بەشداریی خۆپیشاندانەکانم دەکرد و، ئەوەش کارێکی ڕەوایە و، پێشترێش قوتابییەکان بەکۆمەڵ چوونەتە خۆپیشاندان و بۆنەکان و، ئەوە لادان نەبووە لە یاسا". گوتی: "ئێستا کارەکە پەیوەندیی بەخۆتەوە هەیە، تۆ ئازادی دەتەوێ ببیە شیوعی، ئەرمەنی، ئاشووری، تۆ ئازادی".

کە لە دوادواییەکانی ساڵی ١٩٤٦ کۆلێژی مافم تەواوکرد، بڕیارم دا لە کەرکوک بژیم؛ ئەو شارەی تێیدا لەدایکبوویمە و جێی خانەوادەی تاڵەبانییەکانە و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییشم لەوێ تەواوکرد. کە بەجێمهێشت ئەندامێکی سەرکردەیی حیزبی هیوای نەتەوەیی بووم ودەچمەوە ئەوێ و من ئەندامێکی حیزبی شیوعیی عێراقیم.

ئەودەمی، سەعید قەزاز موتەسەڕیفی کەرکووک بوو.

دواترێ بووە وەزیری ناوخۆ و، لەوێ لیژنەیەک بەسەرۆکایەتیی ئەو هەبوو و گەنمی لە موڵکدارەکان دەکڕی و دەیدایە فڕنی و نانەواخانەکان. بەڵام لیژنەکە لە گەورە موڵکداران پێکهاتبوو، وەک حوسێنی خانەقا و عەبدوڵڵا ئاوچی و ئیبراهیم نەفتچی و، ئەوانەش گرنگییان بە بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەدا.

ڕۆژێک سەعید قەزاز داوای کردم و، داوای لێکردم بەرپرسیاریی ئەو کارە بگرمە ئەستۆ و گوتی: "ئەدی داوای نان ناکەن بۆ میللەت؟ من ئەرکی دەستەبەرکردنی ئەو ماددەیە بەتۆ دەسپێرم و، بۆت هەیە کێت بوێ بۆ کار ڕێکخستنی کڕین و دابەشکردنی گەنم بەسەر فڕنی و نانەواخاناندا دایمەزرێنی" داواشی لێکردم سەردانی کۆگایەکانی گەنم بکەم تا لەنزیکەوە ئاگام لە دۆخەکە بێ. کە سەردانی کۆگاکانم کرد دیتم پڕ تۆزوخۆڵە و کەمی گەنم تێدایە. ئاخر بەرپرسانی کۆگا گەنمەکەیان دەدزی و خۆڵیان لەگەڵ گەمەکەی دەمایەوە تێکەڵ دەکرد. ئەوەی دیتبووم بە موتەسەڕیفم ڕاگەیاند و، مەرجی ئەوەم دانا ئەوانە لابدرێن و کۆگایەکانیش پاککرێنەوە تا گەنمی خاوێنیان لێ وەرگرین و شایانی ئەوەی بێ دابەشی سەر فڕنی و نانەواخانەکانی بکەین. بەڵام بەوەی ڕازی نەبوو چونکە پێیوابوو ئەوەی لە کۆگاکان هەیە ئەنجامی دەست تێکەڵکردنی ئەندامانی لیژنەی باڵایە". ئەو موڵکدارانەی گەنمیان دەفرۆشتە حکوومەت و فەرمانبەرەکانی بەڕێوەبەریی ئازووخە"، جورئەتی ئەوەی نەکرد هەموویان لادا و، بنکەی کۆمەلایەتیی حکوومەتیش ئەو موڵکدارانەبوون، لەبەر ئەو بڕیارەش قەناعەتم بەوەی هات لە بارودۆخێکی ئاوادا ئەو بەرپرسیارییە وەرنەگرم.

حکوومەت، بەڕێوەبەرایەتییەکی دامەزراند تا لە سالانی شەڕ و دوای شەڕیش کاڵاهێنان لە دەرەوەرا ڕێکبخا و هەندێ کاڵاش بەسەر هاووڵاتییاندا دابەش بکا. لەو بەڕێوەبەرایەتییانەش، بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی هێنان و ئازووخە بوو، گەندەڵیش لەو بەڕێوەبەرایەتییانە وەها تەشەنەی کردبوو بەرگەی نەدەگیرا، شکۆ و ناوبانگی شیوعی و مارکسییەکان سووسەی ئەوەی دابووە حکوومەت لەو بەڕێوەبەرایەتییانەیان دامەزرێنێ تا ڕەگی گەندەڵی ببڕێ. بە ئاماژەی خودی نووری سەعید، مامۆستا نازم زەهاوی کرایە بەڕێوەبەری گشتیی ئەو بەڕێوەبەرییە و، شەریف ئەلشێخی پارێزەریش، کرایە پشکنەری گشتیی بەڕێوەبەرایەتییەکە و، کار و دەستپاکییان جێی شانازیی خەڵکەکەبوو.

لە لیژنەی ناوخۆی کەرکووکی حیزبی شیوعیی عێراقی، نافیع یونس، سکرتێری لیژنە بوو و دەرچووی کۆلێژی ماف بوو و، یوسف حەننا و فوئاد بەهجەت و مەجید ڕەئووف، کە لە کرێکارانی کۆمپانیای نەوت بوون و منیش، ئەندام بووین. بەڵام بارودۆخی کاری نهێنی و منێکی ڕوخسارێکی ئاشکرای ناسراوی شیوعی، بۆیە پەیوەندیکردن بەمنەوە تایبەت بوو و تەنیا لە نێوان من و نافیع یونسیش دەکرا.

## مانگرتنی کرێکارانی نەوت لە کەرکووک "گاورباغی":

لە کەرکووک و لە سالّی ١٩٣٦ و لە بارودۆخێکی ، دوای کودەتایەکەی بەکرسدقیی ئەو ساڵە، کە بزووتنەوەی نیشتمانی و کرێکاریی تێدا لە باڵاکردندابوو، یەکەم مانگرتنی کۆمپانیای نەوتم دیت "L. P G". ئەودەمی پۆلی شەشی سەرەتایی بووم.

بە دروستی نازانم کێ سەرکردایەتیی مانگرتنەکەی دەکرد و ڕێنوێنیی دەکرد، بەڵام مانگرتنەکە ڕەمەکی نەبوو و بگرە ڕێکخراویش بوو، ڕەنگدانەوەی داواکاریی کرێکاران بوو. ئەوەندەی منیش بیزانم زیادکردنی کرێ و گواستنەوەی کرێکاران بوو بە هێنان و بردنیشەوە و، سەعاتەکانی کاریش بکرێتە هەشت سەعات و سووتەمەنییشیان بدرێتێ و لیگەڕێن سەندیکایەک دامەزێنن بەرگری لە مافەکانیان بکا.

کۆمپانیای نەوت، بە هاوکاریی دەزگا ئەمنییەکانی حکوومەت، هەوڵی دەدا کۆتایی بە مانگرتنەکە بهێنێ. کە دەزگا ئەمنییەکانی ئەوکاتیش هاریکاریی پۆلیسی نەوتیان نەدەکرد، ئیدی کۆمپانیا، لە هەوڵی شکاندنی مانگرتنەکە پەنای بۆ دەستە چەتە تیرۆریستەکان برد تا کرێکاران بتۆقێنی و هەڕەشەی ئەوەیان لێ بکا کە پێویستە بچنەوە سەر کارەکانیان. بەڵام لەوەیان سەرکەوتوو نەبوو، هێ لەوەی سەندیکایەکی بۆ دامەزراندن، ناچار بوو بەدەم زۆربەی داوایەکانی کرێکارانەوە بێ. پۆلیسی نەوتیش، بۆ شکاندنی مانگرتنەکە، زۆری پشت بەو سەرباز و ئەفسەرانەی لیڤی دەبەستا کە ئاسووری بوون.

هەرچی مانگرتنێکی دیکەی کۆمپانیاکانی نەوت بوو، دەساڵ دوای ئەوەی یەکەم کرا، واتە لە سەرەتای تەمموزی ١٩٤٦، ئەو کاتەی بزووتنەوەی سیاسیی بەگشتی و کرێکاری بەتایبەتی، لە عێراق چالاک ببوو. کرێکارانی بەندەر و هێڵی ئاسن و جێی دیکەش مانیان لە کارکردن گرت و داواکاریی ئابووری و سیاسییان هەبوو و حیزبی شیوعیی عێراقی پێشڕەویی دەکردن، کە کرێکارانیش ئامادەی خەبات بوون، ئیدی حیزبی شیوعی ئەو خەباتەی ڕێکخست و سەرکردایەتییەکی ئاشکرای لە خودی کرێکاران بۆ دانا، لەکاتێکدا لە حیزبی شیوعی بترازێ هیچ ڕێکخراوێکی دیکە لەناو کرێکاراندا نەبوو، لەناویشیاندا حەننا ئەلیاس و حەننا جوبرائیل و حەکمان فارس ڕوبەیعیم دەناسین و، سەرکردایەتیی نهێنیی حیزبی شیوعی هاوڕێیەکی لە بەغداڕا ڕەوانە کردبوو و ناوی"حامد" بوو و ئەوەش ناوی ڕاستەقینەی نەبوو وناوی حیزبییشی نەبوو، بەڵکو ناوێک بوو خەڵک بۆخۆیان بەکاریان دەهێنا. ئاڵقەی گەیاندنیش لەنێوان ئەو و سەرکردایەتییە کرێکارییەکە هاوڕێ یوسف حەننا بوو، کە کادیرێکی حیزبیی نیمچە شاراوەبوو.

وەک لەبیرم بێ، مانگرتنەکان لە سەرەتای مانگی تەممووزێ و دوای ئەوەی کۆمانیاکانی نەوت داواکارییەکانی کرێکارانیان ڕەتکردەوە، کە درێژکراوە و پەرەسەندنی داواکارییەکانی١٩٣٦ بوون، مانگرتنەکان دەستیان پێ کرد. داواکارییەکان، بریتیبوون لە دەستەبەری کۆمەڵایەتیی کرێکاران بۆ کاتی نەخۆشی و پیری و و خانوویشیان بۆ دراستبکرێ.

کرێکارەکان هەمووئێواران لە بێستانێکی چۆلی لای خۆرئاوای شار کۆدەبوونەوە تا گوێیان لە ئەنجامی گفتوگۆیەکانی نێوان نوێنەرەکانی خۆیان وبەرپرسە حکوومییەکان و کۆمپانیا بێ. حکوومەت و کۆمپانیا بەوەی ڕازیبوون زۆربەی داواکارییەکان جێبەجێکەن و هەوڵیان دەدا لە دوو داوادا بەرتەنگیان بکەنەوە کە زیادکردنێکی کەمی کرێ و گێڕانەوەی ئەوانەبوو بۆ سەر کار کە لەبەر هۆی سیاسی یان چالاکیی کرێکاری دەرکرابوون. وەک هەموو جارێکیش، کۆمپانیا چەلاوخۆرەکانی خۆی بۆ شکاندنی مانگرتن بەکاردەهێنا و، سووسەی ئەوەی دەدانێ لە کارکردن بەردەوام بن و، چەتەکانی پاسەوانی کۆمپانیایشی بۆ تۆقاندنی کرێکاران بەکاردەهێنا و، کرێکارە چالاکەکانیشی دەردەکرد. جا حکوومەت زۆربەی سەرکردە کرێکارییەکانی گرت و لە بەندیخانەی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی پەستان.

دستبەسەرەکانی بەندیخانە، داوایەکیان پێشکەشی دادوەری سزا کرد تا بەریان بدا. کەچی دادوەری سزا داوایەکەی ڕەتکردەوە، ئیدی دوایەکەیان لای سەرۆکی دادگای تەمیز کردەوە و، ئەودەمی دادوەرەکە عەبدولکەریم جەمیل بوو، کە بە ڕاستگۆیی پاکی و دادپەرستی ناسرابوو. هەر یەکسەر بڕیاری بەردانی دەستبەسەرەکانی دەرکرد، کەچی پۆلیس نەهاتەڕاێی و بەرینەدان. کرێکاران سەردانی سەرۆکی دادگایان کردەوە تا پێیراگەیەنن پۆلیس بڕیارەکەی دادگای جێبەجێ نەکردووە، پێیگوتن:"ڕۆڵەکانم، پۆلیس تەنیا دەزگای جێبەجێکردنی بڕیاری دادگاکانە ، جا ئەگەر ڕێزی بڕیار و یاسایەکان نەگرێ، ئەوا ئێوەن کە بڕیاری دادگا جێبەجێ دەکەن، دەتوانن بچن بەریاندەن".

ئەوەش، دەستکردنەوەی کرێکاران بوو تا بڕیاری دادگا جێبەجێکەن و، بگرە ئەگەر پێویستی بە بەکارهێنانی هێزیش بێ. کە ئەو قسەیە گەیشتە ئەو کرێکارانەی لە ناوچەی گاورباغی کۆبووونەوە، بە خۆپیشاندانێکەوە هاتن کە نزیکەی شەش هەزار کرێکار بەشداریان تێیدا کردبوو و ڕوویان لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس کرد، کە هاواڵەکانیان لەوێ بەندکرابوون و پاسەوانەکانیان ناچارکرد دەرگای گرتووخانەکە بکەنەوە و هاواڵەکانیان لەسەر ملان هێنادەرێ و هاواریان دەکرد: "هەق و ناهەق، سەرکردەکانی خۆمان گەرەکە".

که حکوومەت بەو کارەی زانی، فەرمانی دا بەڕێز عەبدولقادر جەمیل بگوازرێتەوە بەسرا، دوایەش دەرکەوت بڕیاری دابوو لە کرێکارەکانیش بدا و خۆپیشاندانەکەیان بشکێنێ.
ڕۆژی دووەم، واتە لە ١٣ی تەمووزی ١٩٤٦، کە کرێکارەکان لە شـــوێنی ئاســـایی"واتە گاورباغی" کۆبببوونەوە تا گوێ لە ڕێوشـــوێنەکانی ڕێکخســـتنی مانگرتنەکە بگرن، خەڵکە کۆبووەوەکە ژمارەیەکی زۆری پۆلیســـی ســـوارە و پیادەیان دیت بۆلای ئەوان دەهاتن و، دیاریش بوو پۆلیس لەپشـــت جۆگە و چۆمەکان خۆیان دامەزراندبوو بەتەمای تەقەکردن بوون.
ئەو کاتەی پۆلیسی سوارە هێرشیان کردە سەر کرێکارەکان و بە تۆبز و دەستەندووان لێیاندان و، کە کرێکارەکانیش بە شـــەقام و کۆلاناندا پەرتبوون، پۆلیس تەقەی لێکردن و وەک من بزانم ١٣ کەســـی لێ کوشـــتن و گەلێکیشـــی بریندار کردن، ئەوجا ســـەرکردە دیارەکانی مانگرتنەکەی گرت و لە بەندیخانەی پەســـتان، یەک لە گیراوەکانیش هاوڕێ یوسف حەننا "ئەبو حیکمەت" بوو.
ڕۆژی دواتری، بۆ شـاردنەوەی شـەهیدەکانیان و ڕووزەردکردنی ئەو تاوانەی حکوومەت دەربارەیـان کردبووی، خۆپیشـــاندانێکی گەورەیـان کرد و، حیزبە نیشـــتمانییەکانیش تاوانەکەیان ڕووزەرد کرد و داوایان کرد بەرپرسـانی تاوانەکە ڕاکێشـرێنە دادگا و سـزای خۆیان وەرگرن.
ئەو تاوانە دڕندانەیە، توورەییەکی گشتیی لە عێراق دروستکرد، ئیدی جەماوەر و ڕۆژنامە و حیزبەکان و ســـەندیکاکان داوای ســـزادانی بەرپرســـیارانی ئەو تاوانەیان کرد و، حکوومەتیش بەیـاننـامەیەکی تژی درۆی دەرکرد: "کـاتێ کرێکـاران لە گـاوربـاغی لە کۆبوونەوەیەکی بێ مۆڵەت کۆبوونەوە و، پۆلیس بەناوی یاســـاوە داوای لێکردن پەرت بن، کەچی ئەوان ملیان بۆ یاسـا نەدا و دەسـتدرێژییان کردە سـەر پۆلیس و، ئیدی پۆلیس ناچاربوو بۆ بەرگری لەخۆ کردن تەقە بە ئاســـماندا بکا و، هەندێ ڕووداوی کە جێیداخن ڕوویـانـدا. بۆیە، حکوومەت بڕیـاریـدا لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکە بکرێ و خراپەکـارانیش ڕاکێشرێنە دادگا".
حکوومەت، داوای لە ئەشـرافی شـاری کەرکووکیش کرد بەیاننامەیەک دەرکەن و "پشـێوی نانەوە"ی کرێکاران شەرمەزارکەن و، بشڵێن دەبێ حکوومەت پابەندی یاسا بێ! تەنیا چەند کەسـێک بەسـەرڕووی خۆیاندا بازدا و بەیاننامەکەیان مۆر کرد و تا تاوانەکانی دەسـەڵات بشـــارنەوە ئابڕووی خۆیان برد. دەبێ شـــانازییەکیش بۆ بنەماڵەی نەفتچی لە مێژوودا تۆمـاربکەم، چونکە ڕەتیـانکردەوە بەیـاننـامەکە مۆربکەن و، زۆر بەتونـدیش تـاوانەکـانی حکوومەتیان دژی خەڵکە بێ وەیەکە شەرمەزار کرد.

ئیدی كۆمپانیای نەوت، لە بەیاننامەیەكیدا، وادەی ئەوەی دا بەدەم زۆربەی داواكارییەكانی كرێكارانەوە بێ، لە زیادكردنی كرێ و دەستەبەری كۆمەڵایەتی و نیشتەجێ و گواستەنەوە و، بابەتی پێكهێنانی سەندیكایەكیشی بۆ كرێكارانی نەوت خستە بەردەستی لایەنە پەیوەندیدارەكانی حكوومەتی عێراق و، جا مانگرتنەكە كۆتاییهات.

موتەسەڕیفی ئەودەمی كەركووكێ حەسەن فەهمی مەدفەعی بوو، كە بەبنەچە كورد بوو و ببووە عارەب، ئەو ئەفسەری پۆلیسەی فەرمانەكانی دژی كرێكاران جێبەجێ كرد، نەقیب حەسەن عەونی بوو و لەگەڵ قادر چاوەشی سەروانی"ڕەئیس عورەفا" پۆلیسی سوارە ، كە توركمانێكی خەڵكی كەركووك بوو.

## شیوعییەکان، لە دادگای سزای کەرکووک، بەرگری لە کرێکاران دەکەن:

ساڵی ١٩٤٧، کە حکوومەت هێرشی کردە سەر هەموو لایەکی بزووتنەوەی نیشتمانی و دیموکراسیی وڵات، دوای ئەوەی بە کەفالەت بەریدان، بڕیاری دا سەرکردەکانی مانگرتنی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی عێراق بداتە دادگای سزای کەرکووک و، لەوانەش، هەموو ئەوانەی پێشتریش ناوم هێنابوون. ئەودەمی پارێزەر بووم و لە کەرکووک کاری پارێزەریم دەکرد و لە خانوێکدا دەژیام لە گەڕەکی بەگلەری لای قۆریە بوو، ئەو کرێکارانەی درابوونە دادگا لە کۆمپانیا دەرکرابوون. جا هەریەکە و لە بوارێکی دیکە کاریان دەکرد و لە شارێکی دیکەی عێراق هاتبوونە کەرکووک. ئیدی هاتنە ماڵەکەی من و هەریەک لەپارێزەران شەریف ئەلشێخ و کامیل قەزانچی وعەبدولجەباری عوبەیدیش هاتبوون تا بەرگری لە کرێکاران بکەن کە منیشیان لەگەڵدابووم و، ئەوانیش هەر هاتنە ماڵەکەی من.
مامۆستا جیهاد وەنداوی، دادوەری سزای دادگای کەرکووک بوو، کە لە ساڵانی کۆتایی ژیانی بووە ئەندامی حیزبی شیوعیی عێراقی.
وەزیری داد ساڵح جەبر[25] بوو و لە دووشت دەترسا؛ یەکەمیان دادگا کرێکارەکان تۆمەتبار نەکا و ئیدی لە سزا دەربازبن، دووەمیان دادگایی و بەرگرییەکان ببنە خۆپیشاندانێکی سیاسی و پشێوییەکانی کۆمپانیای نەوت نوێببنەوە. پێش دادگاییەکە، پەیوەندیی بە جیهاد وەنداویی دادوەرەوە کردبوو و، پێیگوتبوو ئەگەر نەتوانێ کرێکارەکان تۆمەتبار بکا و حوکمیان بدا، ئەوا نییەتی ئەوەی هەیە دادگاییەکە بگوازێتەوە دادگای سزای باقووبە. بەڵام، دادوەر بەڵێنی بە وەزیری داد دابوو یاسا و دادپەروەری جێبەجێ بکا. وەزیریش ئەو قسەیەی وا لێکدابۆوە گوایە دادوەر ئامادەیە حوکم بۆ کرێکارەکان ببڕێتەوە.
لە وادەی دادگا و بەرگریدا، خەڵکێکی زۆری کرێکارانی نەوت لە گۆڕەپانی سەرای کۆبوونەوە، لە ترسی سەرهەڵدانەوەی پشێوییەکانیش، حکوومەتیش ژمارەیەکی زۆری پۆلیسی لە سەرای و لەو شەقامانەی دەچوونەوە سەر سەرای کۆکردبووەوە. کرێکارەکان

---

[25] _ ساڵح جەبر، لە ١٨٩٦ لە لیوای مونتەفیق لەدایکبووە، زۆری پۆستی بەڕێوەبردن و وەزیری وەرگرتووە. گرنگترین ڕووداوی کەوتە کاتی پێکهێنانی وەزارەتەکەی لە ١٩٤٧ مۆرکردنی ڕێککەوتنی بەریتانیا بوو، کە بە پەیماننامەی پۆتسمۆث ناسراوە و بووە هۆی پشێوییەکی گشتی لە هەموولایەکی عێراق و، ئەوەش بووە هۆی ڕووخانی حکوومەتەکەی لە ٢٩ی کانوونی دووەمی١٩٤٨ و لە ١٩٥٧ لە بەغدا کۆچی دوایی کرد. بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: فاطمة صادق عباس السعدی، صالح جبر و دوره السیاسی فی العراق حتی عام ١٩٥٧. دار الشؤن الثقافية ، بغداد ، ٢٠٠٨.

خرانە ناو شیشەبەندی تاوانباری و، و پارێزەرەکانیش چوونە جێی خۆیان. سەرەتا دادگا گوێی لە گەواهیدانی بەرپرسـان ڕاگرت، بەڵام سـاڵێکی نەبرد موتەسـەڕیف بە نۆرەی دڵ مرد و، قادر چاوەشـی سـەروانیش لە ئەسـپەکەی گلا و مرد، ئیدی دادگا تەنێ گوێی لە پۆلیسـەکان و خوێندنەوەی گەواهیی مردووەکان ڕاگرت و هەردووکیشـیان دووپاتیان دەکردەوە ئەوان گوێڕایەڵی ڕێوشـوێنە یاسـاییەکان بووینە و سـێ جاران داوایان لە کرێکاران کردووە پەرتەی لێ بکەن، ئەوجا کرێکارەکان دەسـتدرێژییان کردووەتە سـەر پۆلیسەکان و، ئیدی پۆلیس ناچاربووە بەرگری لەخۆی بکا.

دادوەر لە پۆلیسـەکانی دەپرسـی داخوا "بورزەن"یان پێبووە یان نا. دەسـتەواژەی"بۆڕزەن"یش لە بڕبڕەی یاسـای کۆبوونەوەکاندا هاتووە، کە حکوومەتی عێراق لە سـەردەمی عوسـمانلیرا بە میرات بۆی مابووەوە. "بۆڕزەن"یش کەرەنایەکی گەورەکردنی دەنگ بوو، چونکە ئەودەمای مایکرۆفۆن نەبوو تا ئەوانەی کۆبوونەتەوە گوێیان لە ئاگادارکردنەوەی پەرتەکردنێ ببی و، ئیدی پۆلیسەکان سەریان لەو پرسیارەی دادوەری سوڕدەما و دەیانگوت"بۆڕزەن"یان پێ نەبووە.

دوایەش دادگا گوێی لە گەواهیی شـایەدی دیکە گرت کە لە جێی ڕووداوەکە بوون؛ لەوانەش،موقەددەم ئەحمەد فەخریی بەڕێوەبەری تەجنیدی کەرکووک، کە کوردێکی خەڵکی سلێمانی بوو و بە راسـتگۆیی و پاکی و بێ خەوشـی ناسـرابوو، ئیدی گەواهیدانەکەی یەکلاکەرەوەبوو، چونکە ڕووداوەکانی لەسـەربانی ماڵەکەیدا دیتبوو کە بەسـەر گۆرەپانی گاورباغیدا دەڕوانی[26]. گێڕایەوە کە پۆلیس چۆن خۆیان قایم کرد، ئەوەش نیشـانەی ئەوەبوو نیازیان وایە تەقە بکەن. دووپاتیشـیکردەوە کرێکارەکان پەرتەیان کرد، بەڵام پۆلیس هێرشـی کردە سـەریان و شـەلم کوێرم تەقەی لێ کردن، ئیدی، سـەرباری ژمارە زۆرەکەی کرێکارانی کەوتنە شـەقام و کۆڵانان و هیچ چەکێکیان پێ نەبوو، چەندین کەسی تەماشاکەربوون، گوللەیان بەرکەوت.

ڕاپۆرتە پزیشـکییەکانیش هاورای قسـەکانی موقەددەم ئەحمەد فەخری بوون و گوتیان زۆربەی ئەوانەی گوللەیان بەرکەوتووە لە پشـتەوەڕا لێیاندراوە، ئەوەش بەڵگەی ئەوەی بوو کە کرێکارەکاز بێ ئەوەی ئاساییش شلوێ بکەن پەرتەیان لێ کردووە.

---

[26] _ گاورباغی:مەبەستمان مانگرتنی کرێکارانی نەوتی کەرکووکە لە ١٢ی تەممووزی ١٩٤٦، کە دوای ئەوەی پۆلیس بەگژ خۆپیشـاندانە هێمنەکەدا چوو، ژمارەیەک خەڵکی لێ بووە قوربانی و، لەبەر ئەوجێیەی لێی ڕوودابوو ناوی لێنرا قەسابخانەکەی گاورباغی و، وەک نموونەیەکی سەرشۆڕیی ناوەندە دەسەڵاتدارەکانی ولاتانی خاوەن نەوتی پاشکۆی مۆنۆپۆلە بیانییەکانە. بۆ زانیاریی پتر، بڕوانەض: کمال مظهر احمد، صفحات من تاریخ العراق، مکتبة البدلیسی، بغداد، ١٩٨٧، چ١٣١- ١٣٤.

بەرگریی پارێزەران، پتر لەسەر مافی دامەزراندنی سەندیکای کرێکاران چڕ دەبووەوە، ئەگەر داوا ڕەواکانیشیان لەڕێی دانوستانەوە جێبەجێ نەکرێ، ئەوا مافی خۆیانە مان بگرن تا داواکانیان جێبەجێ دەکرێ. بەڵام حکوومەت، لەجیاتیی ئەوەی پشتگیری مافە ڕەوا و یاساییەکانی کرێکاران بێ، بۆ بەرگری لە بەرژەوەندیی کۆمپانیا نەوتییە ئیستیعمارییەکان ئەو قەسابخانەیەی بەرپاکردووە، لە یاساشکێنی و نادادپەروەرییشدا حکوومەت ملهوڕیی کردووە. جا پارێزەرەکان پۆلیس و بەرپرسانی لیوایان تۆمەتبار کرد و داوای بێتاوانیی کرێکارانیان کرد و، داواشیان کرد بەرپرسانی لیوا لەپای تۆمەتی کوشتنی کرێکارە بێ گوناهەکان راکێشرێنە بەردەم دادگا.
دادگاییەکە دووسەعات دواخرا، ئەوجا بۆ خوێندنەوەی حوکم و بڕیارەکە، کەوتەوەکار. لەهەمووی نازدارتر ئەوەبوو مانگرتنەکەی بە کارێکی یاسایی دانا و، گوتی مافی کرێکارانیشە بۆ دەستکەوتنی مافی ڕەوای خۆیان پەنای بۆ ببەن و، ڕوونیشی کردەوە کە مانگرتن و کۆبوونەوەکە بەجۆرێک کراوە کە ئاسایشی شلوێ نەکردووە و، پۆلیسیش ، بێ ئاگادارکردنەوەیان، فەرمانی تەقەلێکردنیانی دراوەتێ و، زۆربەی ئەنگاوتنەکانیش لە پشتەوەڕابووە. ئەوەش بەڵگەیە کریکارەکان بێ ئەوەی ئاسایش شلۆق بکەن پەرتەیان لێ کردووە . سەرباری ئەوەی کرێکارەکان هاتوونەتە بن باری بانگەشەی پۆلیس و پەرتەیان لێ کردووە، سەرباری ئەوەی کۆبوونەوەکە ئاشتییانە و هێمنانە بووە وبۆ تاوتوێی گۆڕانکارییەکانی مانگرتن بووە و، جێی کۆبوونەوەکە دوورەشاربووە و، ترسی پشێویی ئاسایش و ئارامیی هاووڵاتییانی لێ نەکراوە، کەچی پۆلیس، بۆ کوشتن و تۆقاندنیان، سووربووە تەقە لە کرێکارەکان بکا.
لەبەر ئەوە، دادگا بڕیاری بێتاوانیی کریکارانی دا و، داوایشی کرد بەرپرسانی بەڕیوەبردن و پۆلیسی بەرپرسیاریی ئەو ڕووداوەیان لە ئەستۆیە بدرێنە دادگا تا سزای کارە تاوانکارییە دوور لە یاساکانیان وەرگرن. لێرەدا، کرێکارەکانی کۆببوونەوە هاواریان کرد: "بژی دادپەروەری.... مردن بۆ بکوژان"، هاوڕێ تۆمەتبارکراوەکانیشیان لەسەرشان هەڵگرت و لە خۆپیشاندانێکی ئاشتییانە لە بالەخانەی سەرای چوونەدەرێ.

## ڕابوونی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ و بزووتنەوەی نیشتمانیش هێرش دەکاتەوە:

ڕۆژنامەیەکی پێشکەوتنخواز "ڕێککەوتنی "پۆرتسمۆث"ی ١٩٤٨ بەو پووشەی دادەنێ کە پشتی وشترێی شکاند. خراپەکارییەکانی حکوومەتە یەک لەدوای یەکەکان و ئەوخیانەتە ئاشکرایانەی لە گەلیان دەکرد لەسەریەک کەلەکەبوون و، کار گەیشتە ئەوەی جەماوەر، لەگەڵ ڕاگەیاندنی مۆرکردنی پەیماننامەی نێوان عێراق و بەریتانیای لە پۆرتسمۆثی بەریتانیا مۆرکرا، بتەقێتەوە. ئیدی گەلی عێراق لە باکوورییەوە تا باشووری، دژی پەیماننامەکە و دژی ئەو حکوومەتەی ئامادەی کردبوو و مۆری کردبوو، ڕاپەڕی. ئەو کارەش، حکوومەتەکەی سالح جەبری ناچارکرد دەست لە کار بکێشێتەوە و، عەبدولئیلای وەسی ڕایگەیاند ئەگەر پەیماننامەکە بەرژەوەندیی عێراق دەستەبەر نەکا ئەوا پێیڕازی نابێ و، بانگێشتی سەید محەممەد سەدری[27] سەرۆکی ئەنجوومەنی ئەعیانی کرد، تا بۆ هێورکردنەوەی دۆخەکە حکوومەت پێکبێنێ.

بزووتنەوەی نیشتمانیی ئەودەمی، سەرکردایەتییەکی لێزان و بەدەستی نەبوو، سەرکردەکانی حیزبی شیوعی لە بەندیخانەی کووت بوون و، سەرکردەکانی سەندیکاکان چەندین ساڵیان لە بەندیخانە بەڕێدەکرد و سەرکردایەتیی حیزبە بۆرژوازییەکانیش، بە هەموو باڵە ناجێگیرەکانیانەوە، " تێکۆشانێکی وەرزییان دەکرد، واتە کاتێ شتێک لە دیموکراسی هەبووایە. هەر جوولانەوەیەکیش ئەگەر لەجێی خۆی لنگەکوتێ بکا ئەوا دەتوێتەوە و دەمرێ، بزووتنەوەی نیشتمانییش، دوای ئەوەی بە کارە جەماوەرییەکانی لە ڕاپەڕینی کانوونی ١٩٤٨ حکوومەتی بەزاند، لە جێی خۆی لنگەکوتێی دەکرد و، هەلێکی دایە دوژمن تا خۆی لەپشت پیاوانی ئایینی وەک محەممەد سەدر قایم بکا و، پاشان هێرشێکی دیکە بکاتە سەر نەیارەکانی.

لە ١٩٤٨، کاتێ حکوومەتە عارەبییەکان لەژێر فشاری ڕای گشتیی عارەبی هێزەکانیان هەناردە فەلەستین، حکوومەتی عێراق دۆخەکەی قۆستەوە تا بە ئەنجەتی پاراستنی هێڵی

---

[27] _ محەممەد ئەلسەدر: لە پیاوانی ئایین و سیاسەت بوو و، باوکی سەید حەسەن ئەلسەدرە "١٨٥٦ – ١٩٣٥"مەرجەعێکی ئایینی سەردەمی خۆی بوو. محەممەد سەدر لە سەرکردەکانی هەستانەوە دادەندرێ و یەک لەوانەیە کە کۆبوونەوە و خۆپیشاندانیان بۆ سەربەخۆیی دەکرد. لە دیالە چەکی هەڵگرت و دوایەش لە فورات، دوای لەناوبردنی شۆڕشی بیست چووە سووریا و لەوێشرا چووە قاهیرە و ئەوجا بۆ حیجاز، دوای ڕاگەیاندنی لێبووردنی گشتی لە ١٩٢١، لەگەڵ ئەمیر فەیسەڵی یەکەم گەڕایەوە و محەممەد سەدر ئەندامی ئەنجوومەنی ئەعیان بوو و چەندین ساڵیش سەرۆکی ئەنجوومەنەکە بووە. یەکجار وەزارەتی پێکهێناوە و، لە ١٩٥٦ کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: خالد احمد الجوال، المصدر السابق، ص ١٠٦- ١٠٩.

دواوەی سوپا حوکمی عورفی دەرکا، بەڵام پاراستنی هێڵی دواوەی سوپا لە کێ؟! ئەرێ لە بزووتنەوەی نیشتمانی بیپارێزێ، کە داوای پشتگیری و پشتیوانیی بۆ بەرگریی گەلی فەلەستین دەکرد دژی زایۆنیزم و ئیستیعمار؟
حکوومەت، دادگای سەربازیی لە هەریەک لە کەرکووک و بەغدا و بەسرا دامەزراند، تا دەستی بەسەر هەموو عێراقدا ڕابگا. ئیدی دەستە دەستە کرێکار و جووتیار و قوتابی و کاسبکار و ڕۆشنبیرانی ڕاپێچی بەردەم ئەنجوومەنە عورفییەکان دەکرد، تا لەوێڕا کۆمەڵ کۆمەڵ ڕەوانەی بەندیخانانیان بکا، بەڵام بەئاشکرا دەستی لەگەڵ ئیستیعمار تێکەل دەکرد و خیانەتی لە کێشەی فەلەستین دەکرد. ئەنجوومەنی عورفیی کەرکووک دەینۆڕییە ئەو کێشە سیاسییانەی لە ناوچەی کوردستانەوە بۆی دەنێردران "لیوای موسڵ و هەولێر و سلێمانی و کەرکووک".

## دیدارێک لەگەڵ محەممەد سەدری سەرۆکوەزیران و جەمیل مەدفەعیی وەزیری ناوخۆ:

ئەو پەیماننامەیە نوێیەی حکوومەتی ساڵح جەبر ئیمزای کرد، دۆخە گشتییەکەی تەقاندەوە. بۆ هێورکردنەوەیەکی کاتیی دۆخەکە و خۆ ئامادەکردن بۆ هێرشێکی نوێی سەربزووتنەوەی نیشتمانی، وەسی، سەید محەممەد سەدری راسپارد ، کە خانەوادەی مەلەکی کردبوویانە بزماری ئەمانی کاتە شلۆقەکان، تا حکوومەتێک، دوای ئەوەی ساڵح جەبر، پێکبهێنێ.

سەرکردایەتیی حیزبی شیوعی لە بەندیخانەی کووت بوون و، بزووتنەوەی نیشتمانییش بەهەموو دەستە و باڵەکانییەوە، سەرکردایەتییەکی لێوەشاوە و بەدەستی نەبوو تا پێشڕەویی جەماوەرە هەڵساوەکە بکا و، بەرەو سەپاندنی حکوومەتێکی نیشتمانیی ئەوتۆیان ببا پشت بە گەل ببەستێ و، داواکارییەکانی لە ئازادی و سەربەخۆیی و چارەسەری کێشە سیاسی و کۆمەلایەتییەکان بۆ دەستەبەر بکا. ئەودەم، سەرکردایەتیی ماڵک سەیف – یەهوودا سدیق لە سەری سەرەوەی حیزب بوو. هەرچی حیزبە بۆرژوازییە نیشتمانییەکانیشە، وەک هەردوو حیزبی ئیستیقلال و حیزبی نیشتمانیی دیموکراسی، حکوومەت "وەزارەتی ئازووخە"ی دایە محەممەد مەهدی کوببەی سەرۆکی حیزبی ئیستیقلال و ئەو حیزبەی خەڵەتاند. ئیدی ئەو حیزبە چووە ڕیزی ئەوانەی ئەو جەماوەرەیان تووڕەدەکرد کە داوای نان و ئازادییان دەکرد. حیزبی نیشتمانیی دیموکراسییش، ئەوەندە بەدەست و بەخۆدا راپەرموو نەبوو، ئیدی ئەوەی جەماوەر چاوەڕێی بوو ئەوە رووی نەدا، هەموو چالاکییەکەی لەو کەژاوانەدا کورتکرایەوە کە سەردانی گۆڕی شەهیدانی دەکرد و، داوای لە حکوومەتی سەدر دەکرد هەندێ داواکاری جێبەجێکا.

محەممەد مەهدی جەواهیریی شاعیر سەروتارێکی لە ڕۆژنامەکەی خۆی"الرآی العام" لەژێر ناونیشانی "سونگییەکانی ئینگلیزان لەژێر ڕدێنی سەدرڕا سەردەردێنن" نووسیبوو و، لەوێ پەردەی لەسەر ئامانجی راستەقینەی هێنانی سەدر لەو بارودۆخەدا هەڵدابووەوە و، داوای کردبوو پێی هەڵنەخەڵەتێن و بۆ هێنانی حکوومەتێکی نیشتمانیی ئاواتەکانی گەل دێنێتە دی، هەنگاو بەرەو پێشەوە بنێن، بەڵام ئەوە رووینەدا. نوری سەعید و عەبدولئیلا پیلانێکی نوێیان دادەنا تا بزووتنەوەی ئیشتمانی سەرکوت بکەن و، لەپای تۆڵەی ڕاپەڕینەکە سەرکردەکانی ڕەوانەی بەندیخانە و بەر سێدارە بکەن.

ئەودەمی، لە کەرکووک پارێزەربووم . جەماوەری کفری برووسکەیەکیان بۆ سەرۆکوەزیران هەناردبوو و شێخ عەتای برام ئیمزای لەسەر کردبوو و، برووسکەکە باسی نالەباریی دۆخی گوزەرانی ناوچەکەی دەکرد، بەو دەربڕینە کۆتاییم پێهێنا " دەوڵەتی سەرۆکوەزیران، برسییەتی کافرە، ناچارمان مەکە بەهێز پارووەنانەکە دەستەبەر بکەین" لەو بارودۆخەش، وەفدێکی لیوای کەرکووکی لە محەممەد جەمیل ڕۆژبەیانی و سامی ئەسعەد ئەلنائیب و من پێکهاتبوون، هاتنە دیداری بەڕێز محەممەد سەدر تا کێشەکانی گوزەرانی لیوایەکەی بخەنە بەردەم.

دوای چاوەڕوانییەکی کورت لە ژووری یاوەری هەرەلەپێشی سەرۆکوەزیران، سەرۆکوەزیران پێشوازیی لێ کردین. ئەو پیاوێکی قۆزی دەموچاو پانی چاوڕەشی چاو گەورەیە و ڕیشێکی درێژی پەرداخت. خەتی پیریی لە هەردوولاچەناگەیدا دیارە و کە دیتم حەزێری ئەبو عەزیزی گۆرانیبێژم بیرکەوتەوە: " بۆ هەدارمان هێنابووی، لەسەرمان بوویە فەرعۆن---- ئەتۆ چیت بەسەرهێناین، بڵێ دەی ڕدێن نایلۆن"، کە لەسەر ئەو گۆرانییە ڕەوانەی بەندیخانە کرا. کێشە مەترسیدارەکانی گوزەرانمان خستە بەردەمی و ئەویش بە ئەدەب و خاکەڕاییەوە پێشوازیی کردین و گوتی گرنگی بەو بابەتە دەدا و حکوومەتەکەی لە خەمی چارەسەری کێشەکانی گوزەرانە و سووسەی ئەوەی دایە وەزیری ناوخۆ خێرا کێشەکە چارەسەر بکا.

پێمگوت: "شکۆداریی سەید، با ئەو پۆستە پێت لەبەرخۆ نەبا، پێگە ئایینی و سیاسییەکەت لەوەی باڵاترە. لێرەبوونت لەو پێگە فەرمییە بۆ خزمەتی گەل بقۆزەوە و، بۆ دەستەبەرکردنی داواکارییەکانی و چارەسەری کێشەکانی." ئەویش وادەی ئەوەی دا و ئەودەمی هۆشیاریی سیاسیمان لە خەڵکەکەی دیکە باشتر نەبوو و، پێمانوابوو بەو شێوازە دەتوانین هەندێ داواکاری بەسەر حکوومەتدا بسەپێنین.

لەسەر داوای سەرۆکوەزیران، چووینە دیداری جەمیل مەدفەعیی وەزیری ناوخۆ لە نووسینگەکەیدا. دیتمان کابرایەکی بێڕێزە و ئەوەندەی شایستەیی نییە و گەل بەکەم دەزانێ وبۆنی تۆڵەی لێ هەڵدەستی. دۆخە خراپەکەی گوزەرانی لیوایەکەمان خستە بەردەمی و، گوتمان نان و ئازووخەی پێویستی ژیان لە ناوچەکانی لیوایەکەدا نەماوە.

وەڵامیداوە کە هەندێ جۆ و خورما بۆ ناوچە بەڵاگیر و برسییەکان دەنێرێ، گوتمان ئەو دوو شتە بۆ ئالیکی ئاژەڵان بەکاردێن نەک خواردنی بنیادەم، بەتووڕەیی گوتی: "چیتان دەوێ؟ لەو دوو شتە بترازێ هیچی دیکەمان نییە"

کە لای ئەو هاتینەدەرێ نەفرەتمان لەو جۆرە حکوومەتە دەکرد و لەو جۆرە کەسایەتییانەش کە بەو جۆرە تەماشای گەل دەکەن و بە ئاژەڵیان دادەنێن.

## دادگاییکردنی خۆپیشاندەران لەبەردەم ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی:

حکوومەت تــاقمەکرێکــارێکی دیکەی گرت تــا لەبەردەم ئەنجوومەنی حوکمی عورفیی ســـەربازی[28] دادگاییان بکا. عەرەب و کورد و تورکمان و ئاســـووری و موســـڵمان و مەسیحی و سابیئەبوون، ئەگەرچی تۆمەتبارەکان لەو پێکهاتە فراوانەی نەتەوە و ئایینەکان بوون، کەچی ئاســـایش بە پشـــێوی نانەوە و کێشـــەی دووبەرەکیی نێوان هاووڵاتیان تاوانباری کردبوون.

لە ڕۆژی دادگاییدا قســـەی تۆمەتباران تۆمارکرا، یوســـف حەننای بەرپرســـی لیژنەی ناوچەیی حیزبی شـــیوعیی عێراقییشـــیان لەگەڵدابوو، ئەوجا بەیاننامەی تۆمەتبارکردن خوێندرایەوە کە داواکاری گشـــتیی ســـەربازی پێشـــکەشـــی کرد. پوختەکەیشـــی ئەوەبوو تۆمەتبارەکان لەو شـــیوعییانەن کە بیرۆکەی شـــیوعی بڵاودەکەنەوە و، هەوڵدەدەن سیستەمی فەرمانڕەوایی بگۆڕن و بەهێز سیستەمی کۆمەڵایەتی بگۆڕن.

ئیدی گوتی ئەوانە دووبەرەکی دەخەنە ناو هاووڵاتییان و خۆپیشاندانیان کردووە و مانیان گرتووە. جا داوای کرد دادگایی بکرین و بەپێی بڕگەکانی ماددەی "٨٩آ"ی یاسای سزادان حوکم بدرێن.

ئەوجا، یەک لەدوای یەک بانگی شـــایەدەکانیان کرد و ئەوانیش قســـەکانیان پیت بە پیت وەک یەک بوو، ئەوەش بەڵگەی ئەوەی بوو کە پێیـــانگوتراوەتەوە و. قســـەکـــانیـــان

---

[28] _ پێکهێنانی حکوومەتی کاتی دوای شۆڕشی ١٩٢١بوو و، ئیدی، لەڕێی ڕاگەیاندنی حوکمی عورفی لەو ناوچانەی تووشـی پشـێوی و کاری لەوجۆرە دەبوون، خەریکی چارەسـەری حالەتە هەڵاوێردەکان بوو. وەک ئەوەی لە ١٩٢٤ لە هەردوو قەزای زاخۆ و ئامێدی ڕوویدا، کە دوای ئەو ڕووداوانەی لەو دوو ناوچەیە ڕوویاندا، ئیرادەی مەلەکی ، دوای ڕەزامەنـدیی ئەنجوومەنی وەزیران، حوکمی عورفیی ڕاگەیـانـد. لەبەر گرنگیی حوکمی عورفی و بوونەهۆی گەرووگرتنی ئازادییەکان و شـــکۆشـــکاندنی مافی مرۆڤ، ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق دوای دامەزراندنی حاڵەتی ڕاگەیاندنی حوکمی عورفیی لەیاســـای بنەڕەتیی عێراقی، واتە لە یەکەم دەســـتووری لە ١٩٢٥ دەرچوو، تاوتوێ کرد. حوکمی عورفی لە بڕگەی هەشتی ماددەی ٢٦ی بەندی دووەمدا هاتووە پەیوەندیی بە مەلیک و ئەو مافانەوە هەیە کە دەســـتکراوەیی ئەوەی داوەتە مەلیک دوای ڕەزامەندیی ئەنجوومەنی وەزیران حوکمی عورفی ڕاگەیەنێ. لە بەندی دەیەمی ماددەی گشتیی لەخۆگرتووە ماددەی "١٢٠" ئەو لایەنانەی ڕوونکردووەتەوە کە دەکرێ حوکمی عورفیی تێدا ڕابگەیەندرێ و هۆیەکانیشـی داناوە. ئەو ماددەیەی ســـەرەوەش ڕێیداوە ئەو یاســـایانەی لە وڵات کاریان پێ دەکرێ لەکاتی ڕاگەیاندنی حوکمی عورفی ڕابگیرێن و ئەوانەی دەبێ حوکمە عورفییەکان جێبەجێکەن دەکەونە بن ئەو بارە یاســـاییانەی پەیوەســـتی کارەکانیانە تا ئەو کاتەی ئەنجوومەنی گەل یاســـایەک بۆ لەســـەر کار لادانیان دەردەکا. بەڕێوەبەرایەتیی ئەو ناوچانەی حوکمی عورفییشـــیان تێدا ڕادەگەیەندرێ بەپێی ئیرادەی مەلەکی دادەمەزرێندرێن. بۆ زانیاریی پتر: صلاح عبدالهادی حلیحلالاحکام العرفیه فی العراق، دراسة تاریخیة لمرحلن النشوء و موجبات الاصدار ١٩٢٥ – ١٩٣١، مجلة لارک للفلسفة و اللسانیات. جامعة واسط، المجلد٨، ٢٠١٢، ص١٠٢.

بەوجۆرەبوو کە تاوانبارەکان هەڵگری بیروباوەڕی ڕووخێنەرن و ئەوانەن کە بیرۆکەی ڕووخێنەری شـــیوعییـانە بڵاودەکەنەوە و هەوڵـدەدەن بە زەبری هێز ســـیســـتەمی فەرمانڕەوایی بگۆڕن. کە قســەی شـایەدەکان دووبارەبووەوە و ڕێک وەک یەکدی بوون، بە سـەرۆکی دانیشـتنەکەم گوت داخوا دەبینن گەواهیدانەکانی شـایەدەکان ڕێک پێکدەچن! ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە پێیانگوتراوەتەوە. کە شـــایەدێکی دیکەیش هات و هەمان گەواهیی شـایەدەکانی پێشـتریی دووبارەکردەوە، سـەرۆکی دادگای عورفی لێی هاتەقسـان و گوتی: "دەڵێی ئایەتەلکورسییە و ڕێک ئەزبەرییان کردووە".
یەک لە شایەدەکانی موفەوەزی لێکۆڵینەوەی تاوان بوو لە کەرکووک، سەبارەت بە یوسف حەننا گوتی: "ئەو لە شیوعییە مەترسیدارەکانە، چونکە پەیوەندیی بە موکەڕەم تاڵەبانییەوە هەیە، ســـەرۆکی دادگا". ســـەرۆکی دادگا بە پێکەنینەوە ئاوڕیکی لێ دامەوە و گوتی: "بێگومان مەبەستی تۆ نییە، ڕەنگە کەسێکی دی بەو ناوەی هەبێ".
ناڕەزاییم بەرانبەر گەواهیی شـــایەدەکان دەربڕی و، گوتم: ســـەرۆکی بەڕێز، هەموو شـایەدەکان گوزارشـتی "تۆمەتبارەکان بیروڕای ڕووخێنەری شـیوعییانە بڵاودەکەنەوە" دووبارەدەکەنەوە، بۆ ئەو دانیشـتنە بەڕێزەیشـی ڕوون ناکەنەوە ئەو بیروڕایانەی ئەوان ناوی شیوعییانەی لێدەنێن چین. لەڕووی شەرع و یاساوە، یەک لە کۆڵەگەکانی گەواهیدان ئەوەیە کە شـایەد گەواهیدانەکەی لەســەر یەک لە هەســـتەکانی بخاتەڕوو، وەک ئەوەی بڵێ"دیتم" یان "گوێم لێبوو" یان "دەســـتم لێدا" تاد.... "کە دەڵێ دیتم یان گوێم لێبوو فڵان بیروڕای شـیوعیی بڵاودەکردەوە، دەبێ بزانێ ماهیەتی شـیوعی چییە تا گەواهیدانەکەی یاسـایی بێ، بۆ نموونە کەسێک بڕە پارەیەک دەداتە کەسێکی دی، جا شایەدێک گەواهیی ئەوەی دەدا و دەڵێ فڵانم دیت پارەی فڵانی دزی، ئەوا ئەگەر شـــایەد نەزانێ دزی واتە بردنی پارەی خەڵک بێ ئەوەی ڕوخســـەتی لێ وەربگرێ مـانـای وایە گەواهیـدانەکەی دروســـت نییە، بۆیە لەو حالەتەدا دەبێ بە تەواوی مانای گەواهیدانەکە بزانێ، واتە دەبێ بزانێ تۆمەتبـار چ بیروبـاوەڕێکی بڵاودەکردەوە. ئەدی دادپەروەرانە نییە کە بەڕێزتـان پرسیارێکی ئاوا بکەن یان ڕێگە بدەن من پرسیارێک لەو بارەیەوە بکەم؟
ســـەرۆکی دادگا گوتی: چۆن ئەو پرســـیارە بکەین کە ئێمە نازانین ماهیەتی بیروباوەڕی شـــیوعی چییە؟ گوتم: ئەدی دادوەر چۆن حوکمێکی دادپەروەرانە دەدا ئەگەر مـاهیەتی تاوانەکە نەزانێ؟ گوتی: جا لەکوێوە بزانین؟ گوتم: ئەگەر ئارەزوو بکەن ئامادەم هەندێ کتێبی ســـادەتـان بدەمێ تـا بنەمـا ســـەرەتـاییەکـانی ئەو بیروبـاوەڕانە بزانن و تـا لە حوکمدانەکانتان بە هەڵەدا نەچن". ئیدی هەمووان پێکەنین و سەرۆکی دانیشتنەکەش گوتی: "هەر ئەوەندە ماوە ئەندامانی ئەنجوومەنی عورفیی عەســـکەرییش بکەنە شـــیوعی. گوتم:

"ســـــەرۆکی بەڕێز ئەگەر ئەو بیروبـاوەڕانە تـاوان بن ، ئەوا بێگومـان پـارێزبەنـدییەکی فیکریتان بەرانبەر تاوانان هەیە، چونکە مرۆڤی مافناس، لە کۆلێژی ماف بە دووروودرێژی دەربارەی تاوانەکانی کوشـــتن و دزی و ئازاردان لەگەڵ بنەمایەکانی تاوان دەخوێنێ، تا ببێتە پارێزەر یان دادوەر و نەبێتە بکوژ یان دز.

ســەرۆک ئاوڕێکی وەســەر ئەندامەکاندا دایەوە و بە گاڵتەوە گوتی: "چ دەڵێن ، ئامادەییتان تێدایە ببنە شیوعی؟"

ئەوجا ســـــەرۆک داوای لێکردم بەرگرییەکەم زارگۆیی و بەکورتی پێشـــکەش بکەم و، ئەوکاتەی داوای لێکردم بەرگرییەکەم بە کورتی پێشـــکەش بکەم قەناعەتێکی لا دروســـت ببوو و، چونکە قەناعەتی بەوەی هێنابوو تۆمەتبارەکان بێ گوناهن و، بڕیاری بێتاوانییان دەردەکا، ئیدی بەرگرییەکی کورتم پێشکەش کرد و گەواهیدانی شـایەدەکانم ڕەتکردەوە و بەرگریم لەو کارە جەماوەرییانە کرد کە جەماوەری هەموو شـــارەکانی عێراق پیادەیان کردووە و، داوای ئـازادی و دیموکراســـــیی پتریـان کردووە و دەیـانەوێ ولات تەواو سەربەخۆبێ.

دوای پرسوڕایەکی کورت، دانیشتنەکە کرایەوە، بڕیاری بێتاوانیی تۆمەتبارەکانیان دەرکرد و، پاسـاویشـیان ئەوەبوو کە ئەو خۆپیشـاندانانەی کرابوون ئاسـایشـیان تێکنەدابوو و، هەموو جـارێکیش بێ هیچ ڕووداوێـک پەرتەیـان لێ کردبوو، وەکچۆن داواکـارییش بڵاوکردنەوەوی بیروبـاوەڕی شـــیوعیی بەدرۆخســـتەوە، چونکە ئەو دروشـــمـانەی هەڵکرابوون هیچ ئاماژەیەکی بیروباوەڕی شـــیوعییان پێوە نەبوو، ئیدی ئەوە نەســـەلمێنرا کە تۆمەتبارەکان بیروباوەڕی شیوعییان بۆ هیچ کەسێک باسکردبێ، لەبەر ئەوە دانیشتنی دادگا بڕیاری بەردانی دان.

دوای ئەو دانیشـــتنە بەهادر عەبدولمەجیدی موقەدەم روکن پەیوەندیی پێوەکردم و، داوای هەندێ کتێبی مارکسیی لێکردم و بۆ ئەوەی زانیاریی زیاتربێ، چیی ویست دامێ.

**دادگاییکردنی کاندیدی حیزبی "تەحەڕور وەتەنی" بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران:**

ســاڵی ١٩٤٨، حکوومەت ڕایگەیاند هەڵبژاردنێکی ئازاد و پاکی ئەنجوومەنی نوێنەران دەکا. ئەگەرچی هێزە نیشـــتمانییەکان گومانیان لە درۆی حکوومەت و ڕاگەیاندنە ڕیابازییەکانی نەبوو، بەلام ویســـتی پروپـاگەنـدەی هەڵبژاردن بکـاتە ئەوزار و کەرەســـتەیەک بۆ ئامادەکردنی جەماوەر تا لەپێناو ئازادییە دیموکراســـییەکان تیبکۆشـــێ، لەوانەش ئازادیی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەران. حکوومەت، دەســـەڵاتی بەســـەر زۆربەی ناوچەکانی عێراقەوە نەمابوو، بۆیە نووری ســـەعید پێش هەڵبژاردنەکان بە ڕۆژنامەکانی ڕاگەیاند

پێشبینی دەکا پێنج لە سەدی ئەنجوومەن بگۆڕێ. واتە ئۆپۆزسیۆن لە چەند کورسییەک پتر ناباتەوە.
هەڵبژاردنەکان بە دوو پلە و بە شێوەیەکی ئاڵۆز بوو. لەهەر گەڕەکێک مۆختارەکانی گەڕەک و دەستەی پیاوماقووڵان پێنج کەسیان هەڵدەبژارد. یان دەستەی پشکنینەکان یان دەستەی سەرپەرشتیاری هەڵبژاردنەکان ئەو پێنج کەسەیان هەڵدەبژارد. ئەو دەستانەش لەناوخۆیان دەستەیەکی باڵایان هەڵدەبژارد کە لە قۆناغی دووەمی هەڵبژاردنەکان قسەی یەکلاکەرەوە هیی ئەو دەستەیەبوو. لە قۆناغی یەکەم پاڵێوراوە لاوەکییەکان هەڵدەبژێردران و، بەشێوەیەکی ئاساییش ئەوانە سەۆک عەشیرەتە بەدەسەڵاتەکانی گوندەکان و فەرمانبەران و هەندێ بازرگانی شارەکان بوون. ئیدی دەنگدەران هیچ کارێک یان پەیوەندییەکیان بە کارەکانەوە نەبوو و فەرمانبەرەکان کارتەکانی هەڵبژاردنیان لە بنکەکانی هەڵبژاردن پڕدەکردەوە. لە قۆناغی دووەمدا، دەنگدەرە لاوەکییەکان لە بنکەکانی هەڵبژاردنی شارەکان کۆدەبوونەوە تا دەنگ بدەنە پاڵێوراوەکانی حکوومەت، زۆرجاران حکوومەت بە هەڕەشە و گوڕەشە پاڵێوراوە ناحکوومییەکانی ناچاردەکرد لە هەڵبژاردن بکشێنەوە، ئیدی زۆربەی پاڵێوراوەکان، چونکە ڕکابەریان نەبوو، هەر بە پەسنی دان سەردەکەوتن. لە هەندێ ناوچەش، بەتایبەت لە شارە گەورەکان ڕکابەری دەکەوتە نێوان هەندێ پاڵێوراوی لایەنگیری ئەم وەزیر یان ئەو وەزیربوون، بەڵام لایەنگریی ڕاستەقینەیان هەر بۆ حکوومەت بوو.
لە سلێمانی، حیزبی شیوعی و حیزبی"تەحەڕوری وەتەنی" پشتیان بەو پشتگیرییە جەماوەرییە بەستابوو کە لەو شارەدا هەیانە. جا بڕیاردەر گوتی با لەو دوو ناوچەیەی هەڵبژاردن دووپاڵێوراوەکە من و مەحمود هەمەوەند بین، بەڵام دیاربوو مەرجەکانی خۆپاڵاوتن لەمندا نەبوو، چونکە بەپێی یاسا سی ساڵی تەمەنم تەواو نەکردبوو، ئیدی شەریف ئەلشێخی پارێزەر کرایە پاڵێوراو، کە خەڵکی "ڕاوە"ی بوو و لە سلێمانی بوو ئەگەر چی ئەو پالاوتنە بێ خەوش نەبوو بەڵام خەڵکی سلێمانی ڕازیبوون بکرێتە پاڵێوراو.
یەک لە حیزبە نیشتمانییەکانی دی، پارتی دیموکراتیی کوردستان بوو لەژێر دەسەڵاتی ئیبراهیم ئەحمەد و، کە هاوسۆز و هاوکاری حیزبی شیوعی نەبوو و، پاڵێوراوێکی بەردەوامیش هەمیشە هەر شێخ ڕەئووفی شێخ مەحمودی حەفید بوو، شێخ ڕەئووف دەرچووی کۆلێژی ماف بوو، بەڵام هیچی لە ماف و لە سیاسەت نەدەزانی . بنکەیەکی بەهێزی دیکەش شێخ لەتیفی شێخ مەحمودی حەفید بوو کە دەسەڵاتە ئایینی و سیاسییەکەی لە شێخ مەحمودی باوکییەوە بۆ مابووەوە کە سەرکردەی شۆڕشەکانی کورد بووە، ئیدی خانەوادەی حەفید و حیزبی دیموکراسیی کوردی بوونە هاوپەیمان تا

هەریەک لە شـــێخ لەتیف و ئیبراهیم ئەحمەد وەک دوو ڕکابەری شـــەریف ئەلشـــێخ و مەحمود هەمەوەند بیانپاڵێون، ئیدی حکوومەت هەر ئەوەندەی بۆ مایەوە لایەنگیریی شێخ لەتیف و ئیبراهیم ئەحمەد بکا تا لێنەگەڕێ هەردوو پاڵێوراوە شیوعییەکان دەربچن.
هەڵبژاردنی ئەو پێنج پاڵێوراوە کرا، شـیوعییەکان سـەرکەوتنێکی بێ وێنەیان هێنا. ئەوجا دەنگدانی دەسـتەی سـەرپەرشـتیاری هەڵبژاردنیش بۆ هەڵبژاردنی پاڵێوراوە لاوەکییەکان کرا کە "١٣٠" پاڵێوراوی لاوەکی بوون.
شـیوعییەکان "١٠٥" دەنگیان هێنا و هاوپەیمانیی شـێخەکانی حەفید و پارتی دیموکراتیی کوردسـتانیش "٢٥" دەنگەکەی دیکەیان بردەوە. ئیدی حکوومەت لێی ڕوونبوو هەردوو پاڵێوراو، شەریف ئەلشێخ و مەحمود هەمەوەنە هەردوو کورسییەکەی سلێمانی دەبەنەوە، بۆیە حوکمی عورفی ڕاگەیەندرا و بۆ ڕزگارکردنی هەڵوێستەکەش هەردوو پاڵێوراوەکەی حیزبی شـیوعی گیران و، هەموو ڕێوشـوێنەکانیش هەڵوەشـێندرانەوە تا هەڵبژاردنەکان وەک جاری جاران بکرێ و نە پاڵێوراوەکانی پارتی دیموکراتیی کوردی سـەرکەون و نە پاڵێوراوە ئاساییەکانی حکوومەتیش.
شەریف ئەلشێخ بە بەندکراوی ڕەوانەی بەغدا کرا و مەحمود هەمەوەندیش بە بەندکراوی ڕەوانەی کەرکووک کرا تا بە تۆمەتی پشێوی نانەوە و هەرا دروستکردن و بڵاوکردنەوەی بیری شیوعی، لەبەردەم ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی دادگایی بکرێن.
سـەرۆکی ئەنجوومەن ئاگای لەو تۆمەتە هەڵبەسـتراوانە هەبوو، ئیدی هەموو گومانەکانی لە بەرژەوەندیی تۆمەتبارەکان لێکدەدایەوە، هەموو ئەو کێشانەش بەرانبەر ئەمین ڕەشیدی مامی، کە ماوەیەکی زۆر نوێنەری قەزای چەمچەماڵ بوو پڕ گومانی یاسـایی بوون و دوای دادگایەکی هاکەزایی ئەنجوومەن بڕیاری بێ تاوانیی دا و بەردرا.

## گواستنەوەی سەرۆکی ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی:

حکوومەت دڵنیابوو، عەقید روکن، ڕەمزی عەبدولقادری سـەرۆکی ئەنجوومەنی عورفیی سـەربازی تەواو لەگەڵ بزووتنەوەی نیشـتمانی هاوسـۆزە، ئیدی بۆ حوکمدانی تاوانباران، لە گۆڕینی پێکهاتەی ئەنجوومەن بترازێ، چارەیەکی دیی نییە. ئیدی سەرۆکەکە و هەردوو ئەنـدامە مەدەنییەکە، واتە هەردوو دادوەر محەممەد حەسـەن و ڕەشـاد عـارفی بە سەرڕاستی و پاکی ناسرابوون، گواسترانەوە و لەجێی ئەو عەمید حەسیب ڕوبەیعی کرایە سەرۆکی ئەنجوومەن و دوو دادوەری دیکەی خەڵکی ناوچەکە نەبوون کرانە ئەندام.
سـەرۆکی نوێ پیاوێکی پاک بوو، بەڵام هەمیشـە دووبارەی دەکردەوە" هەموو کەسـێک خۆی و ئەو بەڵگانەی لەسـەریەتی". ئاشـکراش دیاربوو ڕێچکەی ئەنجوومەن گۆڕاوە چونکە حکوومەت خۆپیشـاندانە نیشـتمانییەکانی دژە ئیسـتیعماری دەخسـتە قاڵبی "کاری تێکدەر و پشـێوی و تێکدانی باری ئاسـایشـی گشـتی" و لە سـاختەکاریی ڕاسـتەکان و تۆمەت هەڵبەستن و بەڵگەی درۆ دەستی کورت نەبوو.
ئەو خۆپیشاندانانەی پێشترێ ئەنجوومەن بە کاری نیشتمانیی دادەنان، حەسیب ڕوبەیعی پرسـیاری ئەوەی لەسـەر دەکردن داخوا خۆپیشـاندەران مۆڵەتیان وەرگرتووە تا کۆبوونەوەیەکی گشتی بکەن و، ئەو دروشمە نیشتمانییانەی پێشترێ کە دەخرانە بەردەم ئەنجوومەن ئێستا بۆ خۆپیشـاندەران دەبێتە بەڵگەی تاوان و گەواهیدانی پیاوانی ئاسـایش ببووە بەڵگەی فەرمیی ئەوتۆی ڕەتنەدەکرایەوە. جا ئێسـتا بەرگریکردن لە نیشـتمان پەروەران لەبەردەم ئەنجوومەن ئەرکێکی سـەخت و گران بوو. بەڵام گیراوە نیشـتمانپەروەرەکان بە خۆڕاگرییەوە ڕووبەرووی ئەو دۆخە بوونەوە و ڕازیبوون بچنە بەندیخانە، بەڵام سەر بۆ شمشێری تۆقاندن و سەرکوتکردن دانەنوێنن.

## دادگاییکردنی ئەوانەی بە سووتاندنی ئەنجوومەنی ڕۆشنبیریی بەریتانی تۆمەتبار کرابوون:

دوای نوشوستی بزووتنەوەی مایسی ١٩٤١ی دژی بەریتانییان، بەریتانییەکان، بەهێزی سوپا و بە هاریکاریی سوپای ئوردنیی، کلۆب پاشا"ئەبو حنیک"، سەرکردایەتیی دەکرد، دیسان عێراقیان داگیرکردەوە و، حاکمە سیاسییەکانیان لە لیوا و ناوچەکان دامەزراندەوە، بەڵام لەژێر ناوێکی دیکە، ئەویش راوێژکاری سیاسیی هێزەکانی بەریتانیا بوو، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوان فەرمانڕەوای راستەقینەی وڵات بوون. ئەلمیر کینگ، کرایە ڕاوێژکاری کەرکووک و کاپتن شووتەر ، کە چەندین ساڵ لە کەرکووک مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو، لە سلێمانی بووە ڕاوێژکار. کۆرنێل لاینیش، کە بە ناوی سەرۆکی لیژنەی یەکلاکردنەوەی مافداریی زەویوزار لە ناوچەکەدا کاری دەکرد، ئێستا ببووە راوێژکاری هەموو ناوچەی باکوور و بنکەکەی لە کەرکووک بوو. جا لەو داگیرکارییەدا بەریتانیا کونسوڵخانەی لە هەموو شارە گرنگرکان دانا و، بنکەی ڕۆشنبیریی لە زۆربەی لیوایەکان دامەزراند، لەوانەش سلێمانی.

ئەو بنکانە لەژێر پەردەی فێربوونی زمانی ئینگلیزی کاریان دەکرد و، تا گەلی عێراق ئاشنای ڕۆشنبیریی گەلی بەریتانیابن، فیکری ژاراویی خۆیان بڵاودەکردەوە و دەستەی فراوانی ڕۆشنبیرانیان دەکردە پاشکۆی ڕەوڕەوەی ئیستیعماری بەریتانی. ئیدی، کارەکە گەیشتبووە ئەوەی نیشانەی پرسیار بخرێتە سەر هەر کەسێکی سەری لەو بنکانە بدابووایە و، زۆربەی ئەوانەی دەچوونە ئەو بنکانەش داوایان لێ دەکرا راپۆرت لەسەر چالاکییە نیشتمانییەکان و نیشتمان پەروەران بنووسن.

خەڵک لە چالاکییە سیخوڕی و تێکدەرەکانی ئەو بنکانە بێزار ببوون. خۆیان بۆ هەلێک دانووساندبوو تا بەسەریاندادەن و لایاندەن. لە سلێمانی، کە نیشتمان پەروەران دڵنیابوون ئەو بنکانە لەپشت بڵاوکردنەوەی دووبەرەکیی ناو هاووڵاتییانن و، ئەو بەیاننامە دوژمنکارانانەی بڵاو دەکرانەوە سەرچاوەکەی بنکەی ڕۆشنبیریی بەریتانی بوو، ئیدی هەلەکە هەڵکەوتبوو. لە یەک لە خۆپیشاندانەکانی دوای ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ کە هەموو وڵاتی گرتبووەوە، خۆپیشاندانێک لەخۆوە بەرەو بنکەی ڕۆشنبیریی بەریتانی ملی نا، جەماوەر لێی چوونەژووریێ و ئاگریان تێبەردا و ئەوانەی بەڕێوەیان دەبرد دەرکران.

ئەودەمای، حکوومەت هیچ دەستەوەکەرییەکی پاراستن و تۆڵەکردنەوەی لەدەست نەهات. پێدەچێ پیاوانی ئاسایش و بەرپرسانی بەریتانیی بنکەکان وێنەی فۆتۆگرافیی

خۆپیشـــاندانەکان و ئەو خەڵکانەیان گرتبێ کە بەســـەر ئەو بنکانەیان دادابوو، تا دواتریێ وەک بەڵگەی تاوانبارکردن دژی خەڵکە خۆپیشـــاندەرەکە بەکاری بهێنن و، ڕەنگە ئاگایان لەوەش بووبێ وڵات چیی تێدا دەگوزەرێ و، ڕەنگە هەر خۆیشـــیان، دوای ئەوەی کاری پەیماننامەی ۱۹۳۰ کۆتاییهات و لە تێپەڕاندنی پەیماننامەیەکی نوێدا شـــکســـتیان خوارد، پلانی هێرشکردنە سەر بزووتنەوەی نیشتمانییان دانابێ.

دوای ڕاگەیاندنی حوکمی عورفی، کۆمەڵێک نیشـــتمانپەروەر بە تۆمەتی ئاگر تێبەردانی بنکەی ڕۆشـــنبیریی بەریتـانی دەســـتگیر کران و زۆربەیـان گەنج و قوتـابی بوون. ڕاســتییەکەی ئەوانە پلانیان بۆ دەســتبەســەرداگرتن و ســووتاندنی ئەو بنکەیە دانەنابوو، بەڵام تووڕەیی جەمـاوەر پاڵی پێوەنـان و، بێ پلانێکی پێشـــتر داندرابێ، ئەو کـارە کرا. پێدەچێ لایەنە حکوومییەکان و لە پشـــتیشـــیانەوە بەریتانییەکان، نەیانویســـتبێ ئەو تۆمەتبارانە، بە هەمان پێکهاتەی پێشـــتریی لەگەڵ نیشـــتمانپەروەران هاوســـۆزبوو، بدەنە ئەنجوومەنی دادگای عورفی، بەڵام دیتییان ئێشتا کارەکان لە پێشتریێ ڕێکترن، بۆیە ئێستا ئەوانە دایە دادگا.

لە ڕۆژی دادگاییکردندا، پاســـەوانییەکی توندیان بۆ قشـــڵە دانا، کە ئەنجوومەن لەوێ دانیشتنەکانی دەبەستا و، ڕێیەکانی دەچوونەوە سەر قشڵە چاودێرییەکی توند دەکران و، خەڵکێکی زۆری سـلێمانی، کە زۆربەیان خزم وکەس و برادەری تۆمەتبارەکان بوون، لەو جێیە ئامادەبوون.

تۆمەتبارەکانیان بە کەلەپچەکراوی هێنایە هۆڵی دادگا و، لێنەگەڕان لەوان زیاتر کەسی دی بێتە ناو باڵەخانەکە. من کە بۆ پاســـەوانەکان ناســـراوبووم و عابای پارێزەریم لەبەربوو، ڕێیاندام بچمە ژوورێ و، دواتریێ شـــوناســـی تۆمەتبارەکانیان تۆمارکرد کەمن زۆربەیانم دەناسی و لەوانەش ڕوشدی ئەحمەد سەعید و کەماڵ میرزا غەفوور.

بانگی شایەدەکان کرا، کە زۆربەیان ئاسایش و پۆلیس بوون و، هەموو گەواهیدانەکانایان بەو جۆرە بوو کە "ئێمە ئەو تۆمەتبارانە دەناســـین و ئەوانە شـــیوعین، لەو مانگانەی پێشـــتریێ پشـــێوییان ناوەتەوە و تێکدەرن و خەڵکیان هانداوە دژی حکوومەت بجوولێنەوە و، بەزۆر خەڵکیان ناچارکردووە خۆپیشـــاندان بکەن و دروشـــمی دژە حکوومەتیان بەرزکردووەتەوە و هوتافی برووخێ حکوومەتیان دەگوتەوە و، یەک لە کردەوەکانیشـــیان ئەوەبوو بەزۆر دەستیان بەسەر بنکەی ڕۆشنبیریی بەریتانیدا گرت و دەستدرێژییان کردە سەر کارمەندەکانی و دواتر ئاگریان لە کەلوپەلەکانی بەردا".

شـــایەدەکان دووپاتیشـــیان دەکردەوە ئەوان هەموو تاوانبارەکانیان بەو جلوبەرگەی ڕۆژی خۆپیشاندانەکە لەبەریان بووە و، بە ڕوخساریانەوە دەستنیشان کردووە.

ئێستا کەڵکی ئەوەی نەبوو داوا لە ئەنجوومەن بکرێ سەیری دروشمەکان بکەن، چونکە لەتێڕوانینی ئەنجوومەوە خۆپیشاندانەکە لەرووی یاساییەوە مۆڵەتی نەبووە، ئیدی نیشتمان پەروەریی دروشمەکان شتێک لە بارە یاساییەکەی ناگۆڕێ، وەکچۆن پێکچوونی گەواهیدانەکانیش گومانی ڕاستی و دروستیان لەسەر دروست ناکا، چونکە ئەوە قسەی هەندێ فەرانبەری فەرمییە کە ئەرکە وەزیفییەکەی خۆیان دەکەن. ئیدی هیچی دیم بۆ نەمابووە وە ئەوندە نەبێ بچمە ڕیزی تۆمەتبارەکان و هێرش بکەمە سەر سیاسەتی دژەگەلی حکوومەت و سەرشۆڕکردنی تەواویان بۆ ئیستیعماری بەریتانی.
یەکەم شایەدیان ئەفسەرێکی ئاسایشی سلێمانی بوو و، دوای ئەویش موفەوەزێکی ئاسایش هات و، هەردووکیان وەسفی بەرگوباری تۆمەتبارەکانیان دەکرد لەو کاتەی لەناو خۆپیشاندانەکەی بەردەم بنکەکە بووینە و خەڵکیان هانداوە لێیان وەژوورکەون. دوای مۆڵەت وەرگرتن لە سەرۆکی ئەنجوومەن، ئەو پسیارەم لە موفەوەزەکە کرد: "تۆ لە سلێمانییەوە لەگەڵ ئەفسەرەکەی ئاسایش چوویە کەرکووک و لەوێ لەبەردەم دەرگای ئەنجوومەن لەگەڵی ڕاوەستای و قسەشتان کرد، داخوا ئێستا دەتوانی بۆ ئەنجوومەن باسی بەرگوباری ئەفسەرەکە بکەی، ڕەنگی جلەکەی و کراسەکەی و بۆینباخ و پێڵاوەکەی؟"
موفەوەزەکە گەرووی گیرا، ئەوجا دەستی بە باسی ڕەنگ و شێوەکان کرد. داوام کرد قسەکانی بنووسنەوە و ئەوجا بانگی ئەفسەرەکە بکەن بزانن داخوا وەسفەکانی ڕێکدێنەوە. جا کە ئەفسەرەکەیان هێنا ئەو وەسفانەی موفەوەزەکە کردبوونی لەگەڵی ڕێک نەدەهاتنەوە، ئەوجا ڕووی قسەم لە سەرۆکی ئەنجوومەنەکە کرد و گوتم: بەڕێزی سەرۆک، پیاوانی ئاسایش لەو بارودۆخانە هەمیشە دەشڵەژێن، زۆریش ئەستەمە کەسەکان و ڕەنگی جل بەو وردەکارییە دەستنیشان بکرێ کە لە گەواهیدانی ئەواندا هاتووە، لەکاتێکدا نەیتووانی ئەو کارە لەگەڵ ئەو برادەرەی بکا کە لە سلێمانیڕا لەگەڵی هاتبوو و لە بارودۆخێکی ئاساییشدابووینە، ویستم ئەو ڕاستییە بخەمە بەردەمی ئەنجوومەنی بەڕێز تا ئەو گەواهیدانانە هەڵسەنگێنن و ئیدی سوپاس.
تۆمەتبارەکان ، دژی حکوومەت و دژی ئیستیعماری بەریتانی پتر و پتر گەرم دەبوون و، کە قسەیشیان لێ وەرگرتن هەموویان دووپاتیانکردەوە لێناگەڕێن بنکەیەکی ڕۆشنبیریی بەریتانی لەشارەکەیاندا بکرێتەوە، چونکە بنکەیەکە بۆ سیخوڕی و تێکدان و بڵاوکردنەوەی بیری ئیستیعماری.
کە سەرۆکی ئەنجوومەنەکەیش پرسیاری ئەوەی لێکردم داخوا بەرگرییەکەم ئامادەیە! گوتم زارگۆیی بە نووسەری دادگای دەڵێمەوە . هەوڵیدا بە نووسراوی و بێ خوێندنەوە

پێشــــکەشــــی بکەم، بەڵام من ڕازی نەبووم و گوتم مافی ئەوانەیە کە بریکاریانم بزانن ناوەرۆکی بەرگری لێکردنیـان نـاوەرۆکەکەی چییە، ئەوەش لەگەڵ یاســـــای پارێزەری ڕێکدێتەوە. ئیدی ناچاربوو بەوەی ڕازیبێ.
بەرگرییەکەشم ئاوابوو:
بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەنی سەنگین، ئەندامانی قەدرگران
من، لە دواناوەندیی کەرکووک قوتابی بوویمە و، لە مایســـی ١٩٤١ لە ڕیزی لاواندا بووم، ئێوارەیەکیان دوو فڕۆکەی بەریتانی هێرشـیان کردە سـەر کەرکووک، دیتم خەڵکەکە، بێ ئەوەی کەس داوایان لێ بکا، چوونە ســـەربانەکانیان و تفەنگە تورکییە کۆنەکانیان پێبوو. هەر هەمووان تەقەیان لە فڕۆکە هێرشـهێنەکان دەکرد. ئێمەی لاویش بەرپرسـی پاراستنی ئاسـایشـی کووچە و کۆڵانەکان بووین، زۆرمان هەوڵدا نەهێڵین تەقەبکەن، چونکە بەرانبەر فڕۆکەی جەنگیی"ویلینگتن"ی زرێدار ســـوودێکی نەبوو، بەڵام ئەوان ســـووربوون و دەیانگوت ئێمە ماڵێک لە بەهەشـــتێ بۆخۆمان دروســـت دەکەین، بیروباوەڕی خەڵکی کەرکووک ئاوابوو، شاری سلێمانیش پتر پابەستی ڕێوشوێنەکانی ئایینە و، پتریشیان ڕق لە بەریتـانییـانە، چونکە لەســـەردەمی شـــێخ مەحمود کەوتەبەر بۆردومـانی فڕۆکە بەریتانییەکان، زۆربەی خەڵکی ســلێمانیش پێیانوایە کاتێ بەریتانییەکان ئەو بنکەیەیان کردەوە ئامانجیان ئەوە نەبوو ڕۆڵەکانیان فێری ڕۆشــنبیری و زانســـت بکەن، بەڵکو ئامانجیان بڵاوکردنەوەی بیری دژە باوەڕی ئایینی و نیشـــتمانی و نەتەوەیی ئەوانە و، دەیانەوێ، بە گێڕانی ئاهەنگی ســەما و ســەرخۆشــی، بەدکاری و ترازانی ڕەوشــت لەناو گەنجان بڵاوکەنەوە.
خەڵکەکەش، هەرهەمووی و بێ هەڵاوێردن، چاوەڕێی ئەو ڕۆژەیـان دەکرد دەرگـای ئەو بنکەیە بۆ تاهەتا دابخرێ و، هەر خۆیشـــیان و بێ دنەدانی کەس ئەگەر بۆیان بڕەخســـێ ئامادەن ئەو کارە بکەن.
بوونی بنکەی ڕۆشنبیریی بەریتانی لە شـارێکی وەک سلێمانیش، وروووژاندنی بیروباوەڕە ئـایینی و نەتەوەیی و نەریتە ڕەگـازۆیەکـانی خەڵکەکەیە، جەمـاوەرەکە خۆی لەوە پتری بەرگە نەگرتووە، ئەوانەی بەرگرییـان لێ دەکەم دنەیـان نەداون و ئەوان هەر لەبنچڕا پێویسـتیان بە دنەدان نییە، هەریەک لەو خەڵکە، کە ئەو بڵاوکراوە ژاراوییانەیان هەڵداوەتە ناو ئاگر، ویســـتوویەتی ماڵێک بۆخۆی لە بەهەشـــت دروســـت بکا و، ئیدێ هاوکاریی یەکدییان کردووە تا ئەو شـــوورەیی و شـــەرمەزارییەی شـــارەکەیان بســـڕنەوە و، بەدڵنیاییشـــەوە ڕازی نابن ئەو ئابڕووچوونە بە شـــارێکەوە بلکێندرێ کە "کاکەحمەدی شێخ"ی تێدا شـاردراوەتەوە و نەوە دوای نەوەش کەڵە ئەدیب و زانا و شـاعیری هێناوەتە

دنیا. ئیدی داوا دەکەم گەواهیی شایەدەکان ڕەتکرێتەوە و فەرمانی بێگوناهیی ئەوانە بدرێ کە بریکاریانم.

بەهیچ کلۆجێک پێشبینیم نەدەکرد ئەنجوومەن بڕیاری بێتاوانییان بدا و، وەک گوتیشم هیچ چارەیەکم نەمابوو ئەوە نەبێ لە گەرموگوڕییە نیشتمانییەکەیان بچمە پاڵیان. ئەنجوومەن بڕیاری دووساڵ بەندیی بۆ هەندێ تۆمەتبار بڕییەوە و بۆقوتابییە بچووکەکانیش یازدەمانگ بەندیی بێ جێبەجێکردن. کە پۆلیس حوکمدراوەکانی بە زنجیرکراوی لە باڵەخانەی قشڵە بردە باڵەخانەی سەرای، کە بەندیخانەی لێبوو، دەنگی سروودی لێ بەرزبووەوە:

ئازادیخوای کوردین ئێمە شوورەی پۆلا و بەردین ئێمە

جەماوەرەکەی کۆبووەوە هاواران دەکرد و چەپڵەیان بۆ ئەو ئازادیخوازانە لێدەدا.

## دوو جوو لەبەردەم ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی:

وەک وەڵامێکی ئەو شمشێری تۆقاندنەی لەسەر گەردنی گەلی عێراق بوو و، ڕاگەیاندنی حوکمی عورفی بۆ ئەوەی هەزاران نیشتمانپەروەر ڕاپێچی بەندیخانان بکەن، جەماوەری سلێمانی خۆپیشاندانێکی گەورەیان کرد و خەڵکێکی زۆری هەموو چین و توێژەکانی گەل بە جیاوازیی بیروباوەڕی سیاسی و ئایینی تێیدا بەشداربوون، وەک هەموو جارێکیش، پۆلیس دەیان کەسی لێ گرتن تا بیانباتە بەردەم ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی و لەوێ دادگایی بکرێن و دوایەش ڕەوانەی بەندیخانە بکرێن. لەناو ئەو کەسانەی گیرابوون دوو جوویان تێدابوو، ئەوانیش قەسابێک و شاگردەکەی بوون و ناویان "سیمان" و "ئاولی" بوو. وەک خۆپیشاندەران گوتیان ئەو دووە هەر لە خۆپیشاندانەکەش نەبوون، لەناو دووکانەکەی خۆیان گیرابوون و، پێشدەچێ کرابنە ئامانج تا تۆمەتی هەڵبەستراو بدرێتە پاڵ ئامانج و دروشمەکانی خۆپیشاندانەکە. دروشمەکان داوای بەردانی دەستبەسەرکراوانی دەکرد و هەڵوەشاندنەوەی حوکمە عورفییەکان و بەگەڕخستنی ئازادییە دیموکراسییەکانیش. پێشتریش لە بەغدا جوویێکی دەوڵەمەندی ناوی"شەفیق عەدس"[29] بوو حوکمدرابوو و، بەوەی تۆمەتبار کرابوو گوایە خەرجیی ڕێکخستن و بزووتنەوە زایۆنییەکانی بەغدا دەدا و، حوکمی لەداردانی درا و دواتریش حوکمەکەی جێبەجێکرا.

کە تاوانبارەکان هێندرانە ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی، داواکاری گشتی تۆمەتێکی فیشاڵی دانەپاڵ، گوایە ئەو خۆپیشاندانە بۆ ئەوەبووە داوای بەردانی"عەدس" بکەن و، بەڵگەی ئەوەش بەشداریی"سیمانە و ئاولی"یە لەو خۆپیشاندانەیدا، جا داواکاری گشتیی داوای ئەوەی کرد توندترین سزا بدرێن. وەک هەموو جارانیش، کارمەندانی ئاسایش و پۆلیس گەواهییان دا و گوایە ئەو دووە هوتافیان بۆ گیانی "عەدس" لێداوە و، ئەوەی

---

29 _ شەفیق عەدس: بازرگانێکی جووی ناسراو کە زۆری گومان و پرسیار دەربارەی چالاکییە بازرگانییەکانی لەسەربوو، ئەو بە بنەچە سووری بوو و لە ١٩٠٠ لە حەلەب لەدایک ببووئەوجا هاتبووە عیراق و لە بەسرا گیرسابووەوە. ئەو لە گەورە بازرگانانی بەسرابوو و نمایندەی کۆمپانیای فۆردی ئۆتۆمۆبیلی ئەمەریکا بوو و بنکەی کاریشی لە کەناری عەششار بوو.هاوبەشە بازرگانەکەشی، بازرگانی ناسراوی عێراق "ناجی خضری" بوو. ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی تۆمەتی ئەوەی ئاراستەکرد گوایە پشماوەی ئامێرەکانی سوپای بەریتانی لە شوعەیبە دەکڕێ و دەیاننێرێتە ئیتاڵیا، تا دواتریش لەوێڕا ڕەوانەی ئیسرائیل بکرێن. لە ١٩٤٨ شەفیق عەدس دەستگیر کرا بێ ئەوەی هاوبەشە کارەکەی "ناجی ئەلخضری" بگیرێ. هەردوو باڵیۆزخانەی بەریتانی و ئەمریکی لە بەغدا زۆریان هەوڵدا بەربدرێ، بەڵام لەژێر فشاری شەقامی عیراقی لەبەردەم ماڵەکەی خۆی و لە ٢٣ی ئەیلوولی ١٩٤٨ لەدار درا. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: صادق حسن السوداني، مختصر تاريخ يهود العراق ١٩١٤ ١٩٥٢، مؤسسة ثائر العصامي، بغداد، ٢٠١٥، ص٧٤- ٧٥.

سەیریش بوو ئەوەبوو ئەو دوو جووە ئاگایان لە مەسەلەی حوکمدانی شەفیق عەدسی نەبوو و، پێیانوابوو مەبەست لە عەدس ئەو نیسکەیە کە شۆربای لێ دەکرێ و هەر زۆر سادە و بێ ئاگابوون.

لە گفتوگۆیەکانی سەرۆکی ئەنجوومەنی عورفیی سەربازیی لەگەڵ تۆمەتبارەکانی دەکرد، بەتایبەت دوو جووەکە، دیاربوو ئاراستەی کارەکە بۆ ناردنە بەندیخانەیانە و، دووریش نییە ئەنجوومەن سووسەیەکی لە دەسەڵاتە باڵایەکانڕا بۆ کرابێ، بۆئەوەی ڕێ لە خۆپیشاندانەکانی داوای هەڵوەشاندنەوەی حوکمی عورفییان دەکرد بگرن و، زۆرترین خۆپیشاندەر ڕەوانەی بەندیخانە بکا. زۆربەی پرسیار و داوای ڕوونکردنەوەکان سەبارەت بە مەسەلەی شەفیق عەدسی جوو بوو کە هیچ پەیوەندییەکی بە سلێمانی و بە حیزبە نیشتمانییەکانەوە نەبوو، ئەگەرچی لەداردانی عەدس هەر بۆتوندکردنی تیرۆر و ترساندنی حیزبە نەیارەکان بوو.

کە سەرۆکی ئەنجوومەنیش داوای لێکردم داوای بەرگریکردن لە تۆمەتباران بە نووسراوی و بێ خوێندنەوە پێشکەش بکەم، بەو ئەنجەتەی بەرگریکردنەکان ڕۆژانە بەدوای یەکدا دێن و ئەوەندەم کات بۆ نایەڵنەوە تا نووسراوەکانی بەرگری ئامادەکەم، نەخاسمە کە کێشەکان هەر لەو ڕۆژیدا یەکلادەکرێنەوە ، ئیدی سەرپێیی بەرگرییەکەم پێشکەش کرد.

تێیدا گوتم: بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەنی قەدر گران ... بەڕێزان ئەندامانی قەدرگران
لە هۆیەکانی، ڕاگەیاندنی حوکمی عورفیی پێویست کردووە، حکوومەت ڕایگەیاندووە گوایە ئەو حوکمەی بۆ پاراستنی بەرەی دواوەی سوپای عێراق ڕاگەیاندووە کە بۆ پشتیوانیی گەلی عارەبیی فەلەستین چووەتە فەلەستین، بەڵام ئێمە پێمانوایە تەواو پێچەوانەیە، ئەوانەی هەموو ڕۆژێ لەبەردەم ئەنجوومەنی بەڕێزی ئێوە دادگایی دەکرێن دوژمنی هەرە سەرسەختی ئیستیعمار و زایۆنیزمن، ئەوەش پرسیارێک دەورووژێنێ، ئەرێ کێ هەڕەشە لە بەرەی دواوەی سوپای عێراق دەکا؟ بڵێی ئەو نیشتمانپەروەرانە هەڕەشەکە بن کە ژیانی خۆیان بۆ بەرگریی سەربەخۆیی وڵات و شکاندنی کۆتوبەندی پەیمانە کۆیلەکەرەکان تەرخان کردووە و ئەوانەی داوای بەرهەڵدانی وزەی جەماوەر دەکەن تا بەڕاستی بتوانین بەشدارییەکی کاریگەر لە شەڕی دژە ئیستیعماری بەریتانیدا بکەین، کە

بە ئاشکرا دەست لەگەڵ چەتەکانی "هاگانا"[30] و "شتیرن"[31] ی زایۆنی تیکەڵ دەکا، یان ئەوانە مەترسیی سەر بەرەی دواوەی سوپای عێراقن کە خیانەت لە بەرژەوەندییەکانی گەل دەکەن و بۆ کەلەپچەکردنی گەل دەستیان لەگەڵ ئیستیعمار تێکەل کردووە؟
لەو بەڵگانەی بەرێز داواکاری گشتی خستنیەروو و شایەدەکانی پیاوانی ئاسایشبوون و دووپاتیان کردەوە، ئەوەبوو کە گوایە ئەو خۆپیشاندانانە دەستی زایۆنی دەیانجوولێنێ و ئەوەتا دوو جووش لەناو تۆمەتبارەکانن، باشە با بەگریمانە بڵێین لەناو خۆپیشاندانەکە بوون، من زۆرم خۆپیشاندانی پشتیوانی دیتووە کە حکوومەت لە زۆر بۆنەدا هێناویەتە سەرشەقام، بانگێشتی هەموو تایەفە ئایینییەکانی دەکرد تا لەگەڵ کۆمەڵەکانی دیکە بەشداری لە کەژاوەکاندا بکەن و، لەوانەش تایەفەی جووەکانی کەرکووک، ئیدی مالمی جووان و پیاوانی ئایینی جوو بەپێش کەژاوەکە دەکەوتن و ئەو دروشمانەیان دەگوتەوە کە پێیان ئەزبەرکرابوو.
ئەو خۆپیشاندان و کەژاوانە چ بوون؟ هەر لەبەر ئەو ژمارە زۆرەی جووەکانی ئەو کەژاوانە، ئەرێ بەراستی زایۆنییانە بوو. هیچ کەسێک وای نەگوتووە، جووە عێراقییەکان هێشتا هەر عێراقین و هەموو مافێکیان هەیە کە دەستوور و یاساکان بۆیان دابین کردوون و، ئەو ئەرکانەشیان لەسەرە کە لەئەستۆی هەموو عێراقییەکانە.

---

[30] _ هاگانات: وشەیەکی عیبرییە و مانای بەرگری دەدا، ڕێکخراوێکی سەربازیی زایۆنیی نیشتەجێکردن بوو، دوای ئەوەی لیژنەی گشتیی هیستدرۆت ئیمزای دامەزراندنی ڕێکخراوێکی نهێنیی کرد لەژێر ناوی "بەرگری و کار" لە ۱۹۲۰ لە قودس دامەزرا، دواترێ وشەی کاری لێکرایەوە، چونکە گرنگییە سەرەکییەکەی لە پیادەکاریی کاری سەربازی بوو و، ڕاپەڕینی ۱۹۳٦ – ۱۹۳۹ی فەلەستین هاوکارییەکی گەورەی نێوان هاگانات و هێزەکانی داگیرکەری بەریتانیی لێکەوتەوە، بۆیە بەریتانیا هاریکاری دامەزراندن و ڕاهێنانی هێزی دەستوەشێنی هاگانات بوو بە ناوی "بالماخ". پێش ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئیسرائیلیش ژمارەی هاگانات نزیکەی ۳٦هەزار کەس بوو و سێ هەزار کەسی بالماخیش سەربار. کە بنیاتە ڕێکخراوەییەکەیشی تەواوبوو کردییە سوپایەکی یەککگرتووی پیشەگەر. داود بن گوریۆنی یەکەم سەرۆکوەزیران لە ۳۱ی ئایاری ۱۹٤۸ ڕایگەیاند هاگانات هەڵوەشێنرایەوە و کرایە سوپای بەرگریی ئیسرائیل. بۆ زیاتر بڕوانە: عبدالوهاب المسیری و سوسن حسین. موسوعة المفاهیم و المصطلحات الصهیونیة، مرکز الدراسات السیاسیة و الاستراتیجیة بالاهرام، القاهرة، ۱۹۷٤،ج۷،ص۱٤۲-۱٤۳.

[31] _ ڕێکخراوی شتیرن:ڕێکخراوێکی زایۆنییە و ئەبراهام شتیرن لە ۱۹٤۰ دایمەزراندووە و ناوی ئەوی هەڵگرتووە. ئەبراهام یەک لە دامەزرینەرانی ڕێکخراوی ئەرگون بوو و دوایە لەبەر ڕەتکردنەوەی بڕیاردانی ڕێکخراوەکە، گوایە، مادام شەڕ لەگەل نازیزم بەردەوامە، پێویستە ڕێککەوتنێکی دۆستانە و شەڕراگرتن لەگەل بەریتانیا مۆر بکرێ. مەرجی شتیرن بۆ قبوولکردنی ئاگربەست ئەوەبوو بەریتانیا بەدرێژایی شەڕ و بێ قەید و مەرج، دەرگای فەلەستین بۆ کۆچی جووان بکاتەوە، بەڵام سەرکردەکانی ئەرگون ئەو مەرجەیان ڕەتکردەوە، ئیدی ئەویش لێیان جودا بووەوە تا تیرۆر بکاتە ئامراز و ئەوزارێک بۆدامەزراندنی دەوڵەتی جووی، بۆ گەیشتنە ئامانجی خوازراو باوەڕی بە توندوتیژی هەبێ. بۆ زیاتر بڕوانە: هیثم لکیلنی، المذهب العسکری الاسرائیلی، مرکز الابحاث، بیروت، ۱۹٦۵، ص۸۸.

ئەو دوو تۆمەتبارەش دووپاتیان کردەوە بەشــداریی خۆپیشــاندانەکەیان نەکردووە، بگرە ئەگەر بەشــدارییشــیان کردبێ ئەوا ســیفەتی خۆپیشــاندانەکە ناگۆڕێ، چونکە ئامانج و ناوەرۆکی خۆپیشـــاندانەکە بەو دروشـــمانە دیاری دەکرێ کە تێیدا بەرز دەکرێنەوە. لەســەرەتای خۆپیشــاندانەکەیڕا و هەتا پەرتەکردنیشــی کارێکی وا نەکراوە ئاســایش تێکدا، حکوومەتیش لە هەوڵی پەرتەپێکردنیــان ئەو هەنگــاوانەی نەگرتۆتەبەر کە لە یــاســـــای گردبوونەوەکاندا هاتووە، ئەگەرچی یاســایەکە هیی پاشــماوەی ســەردەمی عوســمانلییە و، لەگەڵ گیانی سەردەم ناگونجێ.

بۆیە، داوادەکەم بڕیاری بەردانی هەموو ئەو خەڵکە بدەن کە من نمایندەیانم و بەرگرییان لێ دەکەم و سوپاستان دەکەم.

ئەنجوومەن بڕیاریدا تۆمەتباران بۆ ماوەیەک بەند بکرێن کە لەنێوان دوو ســاڵ و شــەش مانگدابوو و ڕەوانەی بەندیخانە کران.

## ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی دەبێتە هاوسۆزی نیشتمان پەروەران:

ئەنجوومەنی عورفیی سـەربازیی کەرکووک لە سێ ئەفسـەری پلە بەرزی سـوپا و دوو دادوەری مەدەنی پێکهاتبوون. سەرۆکی ئەنجوومەن زەعیم ڕوکن "ڕەمزی عەبدولقادر"بوو کە تورکمانی کەرکووک بوو، بەڵام ژیانی لەکاتی خزمەتی سـوپادا لە ناوچە عارەبییەکان بەسـەر بردبوو. لەڕووی سـیاسـی و ڕەوشـتەوە ئەفسـەرێکی پاک بوو، لە پەیوەندیی بە خەڵکەوە بەڕێزبوو، هاوسـۆزی نیشـتمان پەروەران بوو، ڕێزی خۆی دەگرت. ئەندامەکەی دیکەیان بەهادرعەبدولمەجیدی موقەدەم ڕوکن بوو، بە بنەچە کورد و دایکی تورکمان بوو وبەشـی هەرەزۆری ژیانی لە کەرکووک بەسـەربردبوو، ئەو هاوسـۆزی بەهاییەکان بوو، ئەو دەستە ئایینیيە سیاسییەی لەڕێی هیندستان و ئێرانەوە داخزابوونە عێراق. ئەندامەکەی دیکەش پلەی موقەدەم بوو و هاوسـۆزی نیشـتمان پەروەران نەبوو، بەڵام دژایەتییشـی نەدەکردن، ئەو لەگەڵ ڕاسـتی و دادپەروەری بوو. هەرچی دوو ئەندامە مەدەنییەکە بوون، یەکیان محەممەد حەسـەنی دادوەر بوو، دادوەرێکی خەڵکی بەغدا بوو، هاوسـەردەمی بزووتنەوەی نیشـتمانی و ئەو خۆپیشـاندانانەبوو کە لە چلەکان لە کۆلێژی مافەوە دەردەچوون و، پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ زەعیم ڕوکن ڕەمزی عەبدولقادری سـەرۆکی ئەنجوومەن هەبوو و، کاریگەرییەکی گەورەی لەسـەر خۆی و لەسـەر بەڕێوەچوونی دادگاییەکانی ئەنجوومەن هەبوو، منیش پەوەندیی برادەری و هاوسـۆزیی نیشـتمانیم لەگەڵیدا هەبوو.

حکوومەت، سـەدان سـیاسـیی ڕێچکە جیاوازی دایە ئەنجوومەنی عورفیی سـەربازی و، لە هەموولایەکی ناوچەکانی باکووری هێنابوون. بگرە بەندیخانەکان جێی نەدەبووەوە و قوتابخانەی قۆریەی سـەرەتایی بۆ کردنە بەندیخانە و دەوری بە تەلدڕک گرت و پۆلەکان پڕ دەسـتگیرکراو بوون و، ئیدی دەسـتە دەسـتە دەیناردنە بەردەم ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی تا دادگایی بکرێن و ڕەوانەی بەندیخانان بکرێن.

ئەنجوومەنی عورفیی سـەربازی، هەموو ڕۆژێ لەو هۆڵەی لە نهۆمی دووەمی کۆنە ئۆردووی سەربازی"قشلە"، کە لەسەردەمی عوسمانلییان بنیاتنرابوو، بۆی تەرخان کرابوو، کۆدەبووەوە. لێشـنەدەگەران لە ئەندامانی ئاسـایش و تۆمەتباران و پارێزەران بترازێ کەسی دی بچێتە ژوورێ.

**دادگاییکردنی ئەوانەی لە هەولێر جەژنی نەورۆزیان کردبوو:**

هەردوو حیزبی شـــیوعیی عێراقی و پارتی دیموکراتی کوردســـتان"پارتی" ڕێککەوتن، بەبۆنەی نەورۆزەوە، کە جەژنێکی نەتەوەیی کوردانە، ئـاهەنگێکی هـاوبەش لە هەولێر بگێڕن. ویستیان بۆنەکەش بکەنە ئامڕازێکی وشیارکردنەوەی جەماوەر و ڕۆشنبیرکردنیان ســەبارەت بە مەســەلە نەتەوەیی و نیشــتمانییەکان. بەڵام ئەوە بەدڵی کۆنەپەرســتانی ناوچەکە نەبوو، ئیدی پیاوانی ئایین بەرەنگاریان بوونەوە و لە بەرایی هەمووشـــیانەوە شـــێخ محێدینی بەرزنجی، ئەو شـــێخی تەریقەتی قادری بوو و لە گەورە موڵکدارەکانی زەویوزار بوو و، پەیوەنـدییەکی تونـدی لەگەڵ چینە دەســـەڵاتـدارەکەش هەبوو. ئیدی دەروێشــی بۆ ئەو مەبەســتە کۆکردەوە و دەفیان لێدەدا و ئاڵایان هەلکردبوو و لەســەری نووسرابوو"کوشتنی کافران" و بە شەقامەکانی هەولێردا دەسوورانەوە.
شــێخ محێدین، نامە و برووســـکەی بۆ هەموو لایەکی کوردســـتان هەنارد و، داوای لە پیاوانی ئایین دەکرد لە ڕووی ئەوانەدا بوەســـتن کە ناوی لێنابوون" ئاگرپەرســـتانی مەجووس" و بەرگری لە ئایینی ئیسلام بکەن.
ڕوون و ئاشـــکرا دیاربوو، ئەو دوو حیزبە، وەک ئەوە نەبوون کۆنەپەرســـتان بۆی چووبوون و، ئەوان لە دژی ئایینی ئیســـلام نەبوون و، بەڵکو هەڵوێســـتیان پەیوەســـتی کەلتووری نەتەوەیی بوو. حیزبی شـــیوعیی عێراقیی، لەو چـالاکییەی دژی جەژنی نەورۆزەدا بە پلەی یەکەم ئەو کرابووە ئامانج، دژی ئایین نەبوو و هەرگیز مارکســـیزمی لەجێی ئایین دانەدەنا، بەڵام چاوی لەوەش نەدەنووقاند کە کۆنەپەرســـتی ڕەنگە هەموو هەستێکی ئایینی دژی هەر پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتی و گۆڕینی سیستەمی چەوسانەوەی کۆمەڵایەتی بەکاربێنێ.
حەســەن تاڵەبانیی موتەســەڕیفی هەولێرێ، کەوتبووە نێوان چەکوچ و زندانێ، لە لایەکەوە حکوومەت و هەموو کۆنەپەرستان داوایان دەکرد سنووورێک بۆ چالاکیی سیاسیی حیزبە نەیـارەکـان دابنێ و، لە لایەکی دیکەشـــەوە نەیـدەتوانی لەڕووی ڕەوتە نەتەوەییەکەی بزووتنەوەی جەماوەریی کوردیدا بوەستێ. ئیدی، خۆی لەوەی لادا لەگەڵ شوێنکەوتەکانی شێخ محێدین تێکبگیرێ کە هەموویان خەنجەر و شمشێریان پێبوو و، سووسەی ئەوەی دا ئـاهەنگەکە لە گۆڕەپـانی فڕۆکەخـانە بگێڕدرێ و، دەســـتەی پۆلیس لێنەگەڕێن شوێنکەوتووانی شێخ محێدین لە شوێنی ئاهەنگەکە نزیک ببنەوە.
ئاهەنگەکە، بۆ ناڕاســتیی قســەکانی شــێخ محێدین گوایە ئەو جەژنە هیی مەجووســییانە، بەخوێندنەوەی قورئانی پیرۆز دەســـتی پێکرد و، وتاردەرانیش بەڵگەی بنەبڕیان هێنایەوە کە ســەرکردە موســـڵمانەکان و لەوانەش عەلیی کوڕی ئەبو تاڵب، ئاهەنگی بەو بۆنەیەوە گێڕاوە و، ئیدی ئاهەنگەکە بێ هیچ ڕووداوێک کۆتاییهات.

که حوکمی عورفی ڕاگەیەندرا، ئەگەرچی ئاهەنگەکە بەڕەزامەندیی دەسەڵاتە ناوخۆییەکانیش بەڕێوەچووبوو، کۆمەڵێک لەوانەی بەبۆنەی نەورۆزەوە ئاهەنگیان گێڕابوو، گیران. تۆمەتبارەکانی بەتۆمەتی"دووبەرەکی و پشێوی نانەوە" دەستگیر کرابوون سەر بە هەردوو حیزبی شیوعی و پارتی بوون و هەندێکیشیان بێلایەن بوون و، لەوانەش مەلا عەبدولواحیدی ئاهەنگەکەی بە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز کردبووەوە و، ئەودەمی پیاوانی ئاسایش هەندێ دروشمی لەسەر قوماش نووسراویان لێکردبۆوە و وەک بەڵگەی تۆمەتبارکردنی گیراوان خستانە بەردەم داگا.

لە ڕۆژی دادگاییکردندا تۆمەتبارەکانیان هێنایە هۆڵی دادگا و، منیش خۆم وەک بەرگریکاریان **پێشکەش** کرد و سەرۆکی ئەنجوومەن نوێنەرایەتییەکەمی پشتڕاست کردەوە و، ئەوجا دەستی بە تۆمارکردنی شوناسی تۆمەتباران کرد و پرسیاری ئەوەی لێکردن داخوا تۆمەتبارن یان نا. دانیان بەوەیدا نا کە بەبۆنەی جەژنی نەورۆز ئاهەنگیان گێڕاوە، بەڵام تاوانبار نین. ئەوجا بانگی شایەدەکان کرا کە زۆربەیان پیاوانی ئاسایش و دەروێشەکانی شێخ محێدین و ئاغاکانی دزەیی بوون، ئاغاکان کە بەقورئانیان سوێند دان نکوڵییان لەوەی کرد ئاگایان لە هیچ شتێک بووبێ، کەچی پیاوانی ئاسایش و دەروێشەکان هەموو لەسەر ئەو ڕایەی بوون ئەوانە دوژمنی ئایینن و، ئەو جەژنەش هیی مەجووسییانە و، ئەو شیوعییانەش پشێوی و دووبەرەکی لەناو ڕۆڵەکانی گەل بڵاودەکەنەوە.

داوام لە سەرۆکی ئەنجوومەن کرد دروشمە لوولدراوەکانی هێنرابوونە دادگا بکاتەوە. یەکەمیانی کردەوە، نووسرابوو"ئیستیعمار و پیلانەکانی لەسەر تاوێری یەکێتیی عارەبی-کوردی وردوخاش دەبێ". لێرەدا سەرۆکی ئەنجوومەن لە شایەدەکانی پرسی داخوا یەکێتیی کورد و عەرەبیان لە دژی ئیستیعمار دەوێ یان نا، ئەرێ ئێوە چیتان دەوێ، بۆ بەرژەوەندیی ئیستیعمار یەکدی کوشتنی کورد و عارەبتان دەوێ؟ ئەوجا دروشمی دووەمی کردەوە، نووسرابوو"بژی عێراقی سەربەخۆ و دیموکراسی"، ئەوجا دادوەر لێپرسین ئەدی ئێوە چیتان دەوێ؟ عێراقێکی کۆیلە و داگیرکراوتان دەوێ؟

سەرۆکی ئەنجوومەن لەوەندەی ڕاوەستا و گوتی " ئێستا دیارە و پێویست ناکا دروشمی دی بکەنەوە"ئەوجا بە زمانی تورکی لە مەلا عەبدولواحیدی پرسی: مەلا تۆ لە ئاهەنگەکە چیت کرد؟ مەلا گوتی: لە دەستپێکی ئاهەنگەکە دە ئایەتی قورئانم خوێندەوە، ئەگەر بشمزانیبایە قورئان خوێندنەوە لای حکوومەت قەدەغەیە و قورئان خوێن ئەوەندە ئازاری جەستەیی ودەروونی دەچێژێ و دەگیرێ و زەلیل دەکرێ، ئەوا بە درێژایی ژیانم قورئانم نەدەخوێندەوە، ئەوجا بە تورکی گوتی "جامرە باتسایدی بو قرآن" واتە قورئان خوێن ئازاردەدرێ و تۆڵەی ناکرێتەوە".

ئەوجا سەرۆکی ئەنجوومەن داوای لەمن کرد بەرگرییەکەم پێشکەش بکەم، منیش منیش سەرپێی پێشکەشم کرد، گرنگترین شتی گوتبم: "سەرۆکی بەڕێز، بەڕێزان ئەندامانی ئەنجوومەنی قەدرگران، ئەو تۆمەتبارانەی لە بەردەمتانن بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە ئاهەنگیان گێڕاوە، کە کورد لە دێرزەمانەوە ئەو ئاهەنگە دەگێڕێ و، ئەوەش جەژنی بەهار و خۆشەویستییە ، لە جەژندا خەڵک لە کینە پاک دەبنەوە و دۆستایەتی و برایەتییان دەکەوێتە نێوان. ئاهەنگەکە، لە هەولێر بە ڕەزامەندیی دەسەڵاتەکان و لە جێیەکی بۆ بۆنەی ئاوەها دەستنادا، کراوە، مەبەستم گۆڕەپانی فڕۆکەخانەیە. بەڕێز موتەسەریف وای پێ باشبووە ئاهەنگەکە لەوجێیەدا بکرێ تا لە دەمارگیریی کوێرانەی شوێنکەوتووانی شێخ محێدین بیانپارێزی کە خەنجەر و شمشێریان بەدەستەوە بووە و، بەبەرچاوی پۆلیس و ئاسایشانەوە تەپڵی کینە و دووبەرەکییان لێدەدا و بە شەقامەکانی شاردا دەسوورانەوە.

ئەوانە، توێژە دواکەوتووەکانی کۆمەڵگان و، دەمارگیرییش تا ئەو رادەیە کوێری کردوون کە کینەی خۆیان بەسەر ئەو کەسەشدا دەرێژن لە ئاهەنگەکەدا قورئان بخوێنێ، چونکە وشیاریی خەڵک وادەکا لەدەوریان نەمێنن، لەکاتێکدا ئەوان لەسەر چەوساندنەوەیان دەژین.

هەرچی پیاوانی ئاسایشن، ئەوان بەخۆیان پاسەوانیی ئەو ڕێپێانەیان دەکرد کە دەچووەوە جێی ئاهەنگەکەی، نەوەکا شوێنکەوتووانی شێخ محێدین بەسەریاندادەن و دەستدرێژی بکەنە سەر خەڵکەکە، بەڵام ئێستا ئایەتەکە پێچەوانە بووەتەوە.

سەرۆکی بەڕێز...بەڕێزان ئەندامانی ئەنجوومەنی قەردگران، بنیادەم پێویستی بە زیرەکییەکی ئەوەندە زۆر نییە تا درک بەو مەغزایەی بکا بۆچی گرتووخانەکان بە نیشتمان پەروەران پڕ دەکەنەوە، ئەو نیشتمانپەروەرانەی بەرەوڕووی ئەوانە ڕاوەستانەوە کە دەیانەوێ، بە پێی پەیمانی پۆرتسمۆثی بەدناو، نیو سەدەی دیکەش وڵات کۆتوبەند بکەن. هەر ئەوانەن بەرووی سیاسەتی "پەرتکە و زاڵبە"دا وەستانەوە، ئەوانەن کە بەرگرییان لە سەربەخۆیی وڵات و شکۆمەندییەکەی کرد، باشە ئەو تۆمەتبارکردنەیان ئاڵقەیەکی کاری تۆڵەکردنەوە نییە لەدژیان دەکرێ؟

کردەوەکانی ئەوانەی منیان کردووەتە نمایندەیان، دژی یاسا و سیستەمەکان نییە و، ئامانجیان پتەوکردنی یەکێتیی وڵات وگەل و بڵاوکردنەوەی دۆستایەتی و هاوکاریی نێوانیان بووە، ناکەونە بن باری هیچ ماددەیەکی سزادانیش، بۆیە داوادەکەم فەرمانی بێتاوانییان بدرێ و هەر هەموویان بەربدرێن، ئیدی سوپاس.

دوای مـاوەیەکی کورتی راوێژی نێوان ئەنـدامـانی ئەنجوومەن، ســـــەرۆکی ئەنجوومەن بەردانی هەموو تۆمەتبــارەکــانی ڕاگەیــانـد. چونکە ئەنجوومەن بۆی دەرکەوت ئەوانە ئاسایشیان نەشێواندووە ودووبەرەکییان لەناو هاوولاتیان بڵاونەکردووەتەوە.

## دادگاییکردنی ئەو خۆپیشاندەرانەی گوایە جنێویان بە نوری سەعیدی سەرۆکوەزیران داوە:

لەو دادگاییکردنە سەیرانەی هێنرایە بەردەم ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی لە کەرکووک، کە سەرۆکەکەی عەمیدی روکن ڕەمزی عەبدولقادر بوو، دادگاییکردنی کۆمەڵە گەنجێکی خەڵکی سلێمانی بوو و زۆربەیان قوتابی بوون و خۆپیشاندانێکیان کردبوو و هوتافیان دژی نوری سەعید لێدابوو. نوری سەعید، دوای وەزارەتەکەی محەممەد سەدر هات، تا دەست بەسەر ئازادییە دیموکراسییەکاندا بگرێ و بەندیخانەکان بە ئازادیخوازان سیخناخ بکا.

ڕۆژێک پێش دادگاییکردنەکە، چاوم بە دەستگیرکراوەکان کەوت تا بزانم داخوا تۆمەتی هوتاف لێدانی دژی نوری سەعید ڕەتدەکەنەوە یان نا، تا لەسەر ڕۆشنایی ئەو شتە منیش بەرگرییەکەم بنیات بنێم. ئەوان گوتیان نکوڵیی لێ ناکەن و ئامادەشن لە هۆڵی دادگای ئەنجوومەنی عورفیی سەربازییش ئەو هوتافانەی لە دژی لێدەن. بۆیە، مێژووی ژیانی نوری سەعیدم لەو کتێب و بڵاوکراوانە کورتکردەوە کە لەبەردەستم بوون، ئیدی پێشوەختە بەرگرییەکەمم نووسی تا ڕۆژی دواترێ، لەبەردەم ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی بیخوێنمەوە.

چووینە هۆڵی دادگا، ئەوجا سەرۆک دەستی بە تۆمارکردنی شوناسی تۆمەتبارەکان کرد، پاشان داواکاری گشتی تۆمەتەکانی خوێندەوە و گوتی تۆمەتباران خۆپیشاندانێکی بێ مۆڵەتیان کردووە، دروشمی دژە حکوومەتیان بەرزکردووەتەوە و، بەئاشکرا جنێویان بە شکۆمەندیی نوری سەعیدی سەرۆکوەزیران داوە، کە ئەو کارەشیان ماددەی سزادانی لە یاسای سزاکان لەسەرە، ئەوجا داوای کرد دادگایی بکرێن و حوکم بدرێن.

هەموو تۆمەتبارەکان، دانیان بەوەیدا نا خۆپیشاندانیان بۆ پشتیوانیی یەکڕایی گەلی عێراق لە ڕەتکردنەوەی پەیماننامەی پۆرتسمۆث و دەستەبەر کردنی داوا ڕەوایەکانی بەرهەڵداکردنی ئازادییە دیموکراسییەکان کردووە و، ئەوان دژی نوری سەعید هوتافیان لێداوە.

شایەدەکان، هاوڕای ئەو تۆمەتانەبوون کە لە بەڵگەنامەی داواکاری گشتیدا هاتبوو و، تۆمەتبارەکانیان دیاریکرد. ئەوجا سەرۆکی ئەنجوومەن داوای کرد بەرگرییەکە پێشکەش بکرێ و، ئیدی بەرگرییە نووسراوەکەم خوێندەوە و، کورتەکەی ئەوەبوو کە ژیانی نوری سەعید پڕتاوانی دژە بەرژەوەندیی گەلی عێراق و سەربەخۆیی وڵاتە. ئاخر ئەو هەموو توانای خۆی خستبووە بەردەستی ئیستیعماری بەریتانی و، خۆی بۆ ئەوە تەرخان

کردبوو عێراقییەکان بخاتە بن دەستی ئیستیعمار. بۆ ئەوەش پووچترین ئەوزاری بەکارهێنا، لەوانەش لەداردان و کوشتن و بەندکردن و تۆمەتی درۆ هەڵبەستن و ساختەکردنی رووداوەکان و، رێکخستنی پیلان و دەهۆ. کەسێکی ئەوە سەربردەی ژیانی بێ، تەنیا شایانی ئەوەیە گەل جنێوی پێبدا و نەفرەتی لێ بکا. بۆیە، کردارەکانی ئەوانەی بەرگرییان لێ دەکەم ناچنە خانەی تاوانەوە و، داوادەکەم ئازاد بکرێن.
ئەوەی سەیربوو سەرۆکی ئەنجوومەن دەیویست بەرگرییەکەم نەخوێنمەوە و چونکە نووسرابووەوە هەر بە نووسراوی بیاندەمێ، ئاماژەم بۆ ماددەیەکی دەستوور کرد" کە لەبەرەتدا هەر نییە" کە ناکرێ رێ لە بەرگری بگیرێ، چونکە ئەوە لە چوارچێوەی بەرگرییە، ئیدی سەرۆکی ئەنجوومەنی عورفی بێدەنگ بوو و رێیدام خوێندنەوەکەم تەواوکەم.
پاشترێ، رەشاد عارفی دادوەر پرسیاری ئەو ماددەیەی لێکردم کە ئاماژەم پێ کردبوو و، گوتی من هەموو دەستوورم خوێندووەتەوە، ماددەیەکی لەوجۆرەم نەدیوە. گوتم گرنگ ئەوەیە من بەرگرییەکەمم بە ئاشکرا خوێندەوە. دوای پرسوڕای نێوان ئەندامانی ئەنجوومەن، دانیشتنەوە تا رایگەیەنن بڕیاری بێتاوانی تۆمەتباران بدەن و بڕیارەکەیش لەسەر ئەو بنەمایانە هەڵچنرابوو:
دوای وردبینی، دەرکەوت ئەو خۆپیشاندانەی شەقامەکانی سلێمانی پێش راسپاردنی نوری سەعید بووە بۆ پێکهێنانی وەزارەت و، کردارەکانی تۆمەتبارەکانیش زێدەرۆیی نییە بۆ سەر مافی گشتی، ئیدی ئەو ماددە یاساییەی بەسەردا ناسەپێندرێ، لەبەر ئەوە ئەنجوومەن بڕیاریدا بەریان بدا و، ئەگەر لەسەر کێشەیەکی دیکە دەستگیرنەکرابن و بەند نەکرابن ئازاد بکرێن و، شکۆداریی نوری سەعیدیش، دەتوانێ داوایەکی تایبەتیان لە دادگای تایبەتمەند لەسەر تۆمار بکا و داوای قەرەبوویان لێ بکا.
هەر بۆ زانین کاتی دادگاییکردنەکە نوری سەعید سەرۆکوەزیران بوو.

## کێشەیەکی سیاسی لەبەردەم دادگای سزای هەولێر:

شـــوێنکەوتەکانی شـــێخ محێدین بەرزنجی، بە ژێربەژێر لەگەڵ ئاســـایش، تۆمەتێکی هەڵبەســـتراویان دژی ژمارەیەک نیشـــتمان پەروەر ورووژاند کە ناوەرۆکەکەی ئەوەبوو: "ڕۆژێکیان لە هەولێر، کە لە گەرماوێکی گشتی خۆیان دەشووشت، گوێیان لێبوو کەسێک لەبەردەم حەوزی ئاوەکە بنەماکانی شـــیوعیەتی بۆ هەندێ کەس باســـدەکرد و ئەوانیش سەریان بۆ دەلەقاند!!".

ئەو شایەدانەی دەروێشی شێخ محێدینی بوون، لەبەر ئەو دەمارگیرییە کوێرانەیەی شێخە سەنگینەکەیان مێشکی پێ ئاخنیبوون، لەوەی نەدەپرینگانەوە سەیرترین درۆهەڵبەستن. ئەرێ ئەو نیشتمان پەروەرانە لە گەرماوی گشتی بترازێ جێیەکی دیکەیان نەدۆزییەوە تا کۆبوونەوە شـــیوعییانەکەی خۆیانی بە ڕووتی تێدا بکەن تا بنەماکانی شـــیوعییەتی تێدا بەخەڵک بڵێن؟! ئەوە مایەی پێکەنین و گاڵتەجاڕی بوو، بەڵام کێشەیەکی سزادانی بەردەم دادگای سزای هەولێریش بوو. دادوەری سزاش مامۆستا عومەر میران بوو، هاوسۆزی شیوعییەکان نەبوو، بەڵام نەیشیدەگوت دژیانە.

لە ڕۆژی دادگایی، سەفەری هەولێرم کرد تا لەبەردەم دادگای سزا بەرگری لە تۆمەتباران بکەم. پێش دەســـتپێکردنی دادگاییەکە ســـەردانی دادوەرم کرد و پێمگوت بۆچی هاتووم، چونکە لەمێژ بوو پەیوەندییەکی برادەرایەتی لەنێوان هەردوو خانەوادەکەماندا هەبوو. ئیدی زۆری بەخێرهێنام و بانگی سەرۆکی نووسەرانی کرد کە ناوی میرزا بوو و خەڵکی کۆیە بوو و زۆر شارەزای یاسا و ڕێوشوێنی دادگاییکردنان بوو.

دادوەر پێیگوت؛ شـێخ موکەڕەم هاتووە تایبێتە نمایندەی تۆمەتبارە شـیوعییەکان و، تۆش دەزانێ پێگەی خۆی و خانەوادەکەی لای ئێمە چۆنە، جا بەو خوایە ئەگەر ئەوانە نوری سەعیدیشیان سەربڕیبێ حوکمی بێتاوانییان دەدەم.

بەرانبەر ئەو بەدەمەوە هاتنەی دادوەر، شـــتێکم نەدۆزییەوە پاســـاوی ئەوەبێ بە بەرگرییەکی ســـیاســـی لەبەرچاوی ئاســـایش دادوەر وەگیربێنم. دادوەر لە هەموو شـــایەدەکانی دەپرســـی داخوا ئەو بنەمایانە چ بوون کە تۆمەتبار بۆ خەڵکەکەی باس دەکرد، کە دەشیانگوت هیچ لە بنەمای شیوعی نازانین، بەڕوویاندا هەڵدەشاخا و بەکوردی دەیگوت: "سەگباب ئەدی کوو زانیت ئەمە دەرسی شیوعییەتیان پێدەڵێ؟".

لە بەرگریکردنم لە تۆمەتبارەکان، باسی ئەو دەمارگیرییە کوێرانەیەی ئەو شایەدانەم کرد، کە تەنیا بۆ ڕازیکردنی شێخ محێدینی شێخیان، سوێندی بە درۆیان بە قورئان خواردووە و پێیانوایە ئەوە ئەرکێکی ئاینییە. جا داوام کرد گەواهیدانەکانیان ڕتکرێتەوە و حوکمی بێتاوانیی تۆمەتبارەکان بدرێ.

جا دادوەر، حوکمی بێتاوانیی تۆمەتبارەکانی دا و فەرمانی دا بەریان بدەن.

## وازهێنان له‌ به‌رگریکردن له‌ عه‌ونی یوسف و جووه‌کان:

مامۆستا عه‌ونی یوسفم له‌ ڕێی جه‌لال هۆشیاری برایه‌وه‌ ناسی، که‌ له‌ کۆلێژی ماف براده‌رم بوو و پێکه‌وه‌ له‌ حیزبی هیوای کوردی کارمان ده‌کرد. عه‌ونی یوسف له‌ موسڵ حاکم بوو، حکوومه‌تیش له‌ هه‌موو جێیه‌ک بارزانییه‌کان و خانه‌واده‌کانیانی ڕاوده‌نا. سه‌دان پیاویان، له‌وانه‌ش سه‌رۆکه‌کانیان، له‌ به‌ندیخانه‌ و دوورخراوه‌یی بوون و، خێزانه‌کان لێره‌وله‌وێ په‌رته‌وازه‌ ببوون، پۆلیس به‌دوایانه‌وه‌بوو نه‌وه‌کا له‌ جێیه‌کی جیا له‌ واری خۆیان بڵاوببنه‌وه‌. عه‌ونی یوسف دادوه‌ری لێکۆڵینه‌وه‌ بوو، ئه‌وده‌می ئه‌و له‌ نه‌ته‌وه‌ییه‌ دیاره‌کان بوو. ئیدی ده‌بوایه‌ تووشیان ببێ و مه‌ودایه‌کی گه‌وره‌ش بکه‌وێته‌ نێوان دادوه‌رێکی نه‌ته‌وه‌یی کوردی لایه‌نگری کوردانی چه‌وساوه‌یه‌ و حکوومه‌تێکی ڕقێکی تیژی به‌رانبه‌ر ئه‌و بارزانییانه‌ هه‌یه‌.

مامۆستا عه‌ونی یوسف، وه‌ک دادوه‌ر گواسترایه‌وه‌ هه‌ولێر و ڕاپۆرتگه‌لێکی نهێنیی زۆری به‌دواوه‌بوو که‌ له‌مووسڵ لێی نووسرابوو، چونکه‌ له‌ خانه‌واده‌یه‌کی ئایینی و قه‌زایی ناسراوی هه‌ولێریش بوو، باوکی قازی بوو، ئیدی لێره‌، په‌یوه‌ندییه‌کی له‌وه‌ی موسڵ فراوانتری له‌گه‌ڵ کورده‌کان هه‌بوو. موته‌سه‌ڕیفی هه‌ولێریش مسته‌فا یه‌عقوبیی برای مه‌جید یه‌عقوبیی موته‌سه‌ڕیفی موسڵ بوو و، دووریش نییه‌ ڕاسپارده‌یه‌کی سه‌باره‌ت به‌ عه‌ونی یوسف بۆ هاتبێ.

موته‌سه‌ڕیفه‌کانیش، ده‌سه‌ڵاتێکی هه‌لاوێرده‌یان هه‌بوو تا له‌به‌ر هۆی سیاسی خه‌ڵکێک بگرن و دووریان بخه‌نه‌وه‌. ئیدی فه‌رمانی دا بیگرن و ڕه‌وانه‌ی به‌ندیخانه‌ی عیماره‌ی بکه‌ن. له‌ گرتووخانه‌ی قوتابخانه‌ی پۆلیس که‌ به‌ره‌و ئه‌وێ به‌ڕێوه‌بوو بۆ چه‌ند ده‌قیقه‌یه‌ک چاوم پێیکه‌وت. پاشان دوای به‌ربوونی له‌ به‌غدا دیتم. ئه‌و نه‌ته‌وه‌ییه‌کی توندڕه‌و بوو، به‌ڵام له‌ گرتووخانه‌ چاوی به‌ که‌سایه‌تیی کوردی ناسراو، مه‌لا سه‌ید عه‌بدولحه‌کیم، ده‌که‌وێ و ئه‌و وایلیده‌کا تۆزێک نه‌رمیی سیاسی وه‌رگرێ.

له‌ ١٩٤٨، که‌ حکوومه‌ت بڕیاری دا هه‌ڵبژاردنێک بۆ ئه‌نجوومه‌نی نوێنه‌ران بکا و ، ده‌یشیگوت هه‌ڵبژاردنه‌که‌ ئازاد ده‌بێ، عه‌ونی یوسف وه‌ک نوێنه‌ری لیوای هه‌ولێر خۆی پاڵاوت، به‌ڵام حکوومه‌ت حوکمی عورفیی ڕاگه‌یاند، تا هه‌ڵبژاردن له‌سایه‌ی ئه‌و حوکمه‌ بکرێ و فه‌رمانی ده‌ستگیرکردنی هه‌ندێ پاڵێوراویشی دا که‌ به‌ پشتیوانیی هێزه‌ نیشتمان په‌روه‌ره‌کان خۆیان پاڵاوتبوو. تا له‌ ده‌ستگیرکردنێش دووربێ، عه‌ونی خۆی له‌به‌رچاوی ئاسایش و پۆلیس ونکرد. په‌یوه‌ندییه‌کی باشیشی له‌گه‌ڵ عومه‌ر نه‌زمیی وه‌زیری ناوخۆ هه‌بوو، ویستی سه‌فه‌ری به‌غدا بکا تا هانا بۆ ئه‌و به‌رێ، پێشیوابوو تاکه‌ ڕێگای ده‌ربازبوون له‌ده‌ست ئاسایش و پۆلیس خۆ شاردنه‌وه‌یه‌ له‌ جلوبه‌رگی ژنانه‌دا و تا

بەوجۆرە لە هەولێر دەرچێ. هەر لەگەڵ دەرچوونی لە دەروازەی قەڵای هەولێری ئاسایش چاودێرییان دەکرد و داوایان لە ژنە پەچەدارەکان دەکرد پەچەکانیان لادەن تا بزانن ژنن، ئیدی داوایان لەویش کردبوو و هەر خێرا خۆی ئاشــــکرا دەکا، ئاســــایش ئەوەی بۆ ئـابڕووبردنی قۆســــتەوە، ئیـدی هەنـدێ وێنەیـان بە جلی ژنـانەوە بۆ گرت و لەنـاو بەرپرســـەکاندا بڵاویان کردەوە و، دانەیەکیشــیان خســتە ناو دۆســییەی کێشــەکەی لە ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی لە کەرکووک.

لە ئەنجـامی ئەو بڕیـارە دوای یەکـانەی بێتـاوانیی لە ئەنجوومەنی عورفیی ســــەربـازی دەردەچوون، خەڵک بـاوەڕیـان بەوەی هێنـابوو هەر داوایەکی من بەرگریی تێدا بکەم بە بێتاوانیی تۆمەتباران کۆتایی دێ. حکوومەتیش، ئەودەمای ئەو جووانەی ئاشــــکرا دەبوو پەیوەندییان بە ڕێکخراوەکانی زایۆنییەوە هەیە، دەیهێنانە بەردەم دادگا تا حوکمیان لەسەر بدا. زۆریان هاتنە لام و پارەیەکی زۆریان خســــتە بەردەمم تا لە ئەنجوومەنی عورفی بەرگرییــان لێ بکەم، بەڵام من ئەوەم ڕەتکردەوە، چونکە لەگەڵ بیروبــاوەڕی دژ بە زایۆنیی من ڕێکنەدەهاتەوە و دەبوایە ناوبانگی سیاسیشم بپارێزم.

لەبەر ئەو برادەرایەتییەی چەندین ســاڵبوو لەنێوانماندابوو، نیەتم وابوو بەرگری لە عەونی یوســــف بکەم، بەڵام عەمید ڕوکن، ڕەمزی عەبدولقادر، ڕۆژێک پێش دادگاییکردنەکەی بانگی کردم و بە ئامادەبوونی ئەندامانی ئەنجوومەنی عورفی قسەی لەگەڵ کردم و، گوتی: "مامۆســــتا موکەڕەم ، من و ئەندامانی ئەنجوومەن ڕێز و قەدرێکی زۆرمان بۆ تۆ هەیە، چونکە دەزانین تۆ، بە خۆبەخش و لەبەر باوەڕە نیشــتمانییەکەت، بەرگری لە کێشـــەکانی بەردەم ئەنجوومەن دەکەی و بێ ئەوەی هیچ بەرژەوەندییەکی مـادیت هەبێ. بۆیە، ئێوە ناوبانگێکی باشــــتان هەیە و دووبارەبوونەوەی ســــەرکەوتنەکانیشـــتان لەو داوایانە هیچ خراپییەکی بۆ ناوبانگی ئێمە نەبووە. ئێمەش، سەرۆک و ئەندامانی ئەنجوومەن هەموومان، تکایەکمان لێتان هەیە و تکایە بەرگری لە جووان مەکەن، لەبەر ئەوەی نا کە جوونە، بەڵکو لەبەر ئەوەی خەڵکەکە هەموو دەزانن ئێوە هاوســــۆزی زایۆنییان نینە، ئیدی بەرگریتان لەوان بە ســــوودی ماددی لێکدەدرێتەوە و، **ئێمەش** دەزانین ئەگەر بەرگرییان لێ بکەی ئەوان ئـامـادەن هەزاران دینـارت بـدەنێ و، ئەگەر ئەنجـامی دادگاییەکەیش بێتـاونیی هەر یەکێکیان بێ ئەوا بڕیارەکانمان و ڕێزمان بۆ تۆش بە ســــوودی ماددی لێکدەدرێتەوە و هەڵدەســــەنگێندرێ، ئێمەش ئەوەمـان نە بۆ تۆ و نە بۆخۆمـان نـاوێ. ئیدی ئەودەمی ناچاردەبین وەک هەر پارێزەرێکی دی مامەڵەت لەگەڵدا بکەین، بە دڵنیاییشــــەوە وەک پارێزەرێکی لە پێناوی دەستکەوتنی پارە گوێ بە ناوبانگە نیشتمانییەکەی نادا.

بـابەتی دووەمیشـــمـان تکـایەکە تـا بەرگری لە عەونی یوســـف نەکەی، ئێمە هیچ دوژمنکارییەکمان لەگەڵیدا نییە و دژی بیروباوەڕە سیاسییەکانی نیین. بەڵام ئەو مرۆڤەی بە تەواوی ئیرادەیەوە بڕیاردەدا خەبات لەپێناو بیروباوەڕەکانی و گەلەکەی بکا، دەبێ ئامادەیی تەواوی تێدابێ ئەو قوربانییەی پێویستە بیدا. عەونی، وەک نەیارێکی حکوومەت، خۆی بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران پاڵاوتووە و پشتی بە پشتگیریی خەڵک بەستووە، باشە ئەگەر حکوومەت ڕێ نەدا هەڵبژێردرێ یان فەرمانی گرتنی بدا چ دەبێ؟! کە خەڵک متمانە دەدەنە کەســـێک، لەبەر ناوەکەی نییە بەڵکو لەبەر ئەو ســـیفەتانەیە کە هەڵیگرتوون و گرنگترینیشیان پیاوەتییە، بنیادەمێکی بانگەشەی نیشتمان پەروەری بکا و، دوایەش لەوەی بترسێ چەند ڕۆژێک بگیرێ و دەستبەرداری پیاوەتیی خۆی بێ و بە جلی ژنانەوە بگیرێ، ئیدی چ بەهایەکی دەمێنێ؟! ئەوجا لە دۆسییەی دادیەکەی وێنەیەکی ئەوی دەرهێنا بە جلی ژنانەوەبوو. گوتی: ئەو کەســـە بایی چەندە؟ هەر بۆ پاراســـتنی نیشـــتمان پەروەری و پیاوەتیی خۆتان تکایە بەرگریی لێ مەکەن.

بەڵێنم دایە بەرگری لەو جووانە نەکەم کە بە تۆمەتی چالاکیی زایۆنی تۆمەتبار کراون و، بەرگری لە کێشەی عەونی یوسفیش نەکەم، بەڵام ژمارەیەک جووی لەبەر بەشداریی ئەو خۆپیشـاندانانە گیراون کە وڵاتی تەنیوەتەوە وهیچ پەیوەندییەکیان بە زایۆنیزمەوە نییە و بگرە دژیشینە، بۆیە خۆبەخشانە بەرگری لەو تۆمەتبارانە دەکەم و لەناویشیاندا جووەکان. دواترێ عەونی یوسف درایە دادگا و فەرمانی بەندکردنی درا.

## سەرکردەکانی حیزبی شیوعیی عێراق، فەهد - حازم - صارم، لەبەردەم دادگا لە بەغدا:

وەک پێشتریش ڕوونم کردەوە، هاوڕێ فەهدی سکرتێری گشتیی حیزبی شیوعیی عێراقیم لە حوزێرانی ١٩٤٥ لەڕێی سالح حەیدەریی براوە ناسی و، حوسێن محەممەد شبیبیشم هەر لەڕێی ئەوەوە ناسی و، چەندین جاریش لە کتێبخانەی دارولحیکمەی ئەوشەقامەی دەچووەوە سەر دادگاکان چاوم پێی کەوتبوو.
لە گرتووخانەی گشتیشدا، کە لە خۆپیشاندانێکی دژی حکوومەتی ئەرسەد عومەری لە ١٩٤٦ گیراین، چاومان بە یەکدی کەوت. ئیدی هاوڕێ فەهد داوای لێکردم لەگەڵ دامەزرێنەری حیزبی تەحەروڕی وەتەنی کاربکەم و، هەوڵدەم، دوای تەواوکردنی کۆلێژ و بە دەستدانەبەری خزمە بە دەسەڵاتەکانم لە حکوومەتدا، ئیمتیازی دەرکردنی ڕۆژنامەیەک وەرگرم. بەڵام وەک پێشتر باسم کرد، لەهیکرا دیتموەزیری مەعاریف بڕیاری داوە لە تاقیکردنەوە بێبەش بکرێم.
لە ١٩٧٠ حکوومەت هەڵمەتێکی تۆڵەکردنەوەی دژی بزووتەوەی نیشتمانی دەستپێکرد. پێشتریش دادگای سزای بەغدا شەش مانگ بەندیی بۆ بەڕێز کامل چادەچیی سەرۆکی حیزبی نیشتمانیی دیموکراتی بڕیبۆوە و خرابووە بەندیخانەی بەغدا.حکوومەت هێرشێکیشی کردبووە سەر دەستەی دامەزرێنەری حیزبی تەحەروڕی وەتەنی و سەرکردەکانی خرابوونە بەندیخانە. سەرکردەکانی سەندیکاکانی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی کەرکووک و هێڵی ئاسن و بەندەر و چاپخانەکان گیران و، حکوومەت بە گرتنی هەردوو هاوڕێ، فەهد و حازم چەندانی دی ئەوکارانەی گەیاندە چڵەپۆپە، کە لە ماڵێکی گەڕەکی کەڕادەی مریەمی هیی دکتۆری دەرمانسازی شیوعی "ناجی شمیل" بوو و، لە ئەنجامی دانپێدانان و زمانلێدانی کەسێک بوو، ئاسایش لێنەگەڕا بزاندرێ کێیە.[32]
نافیع یونسی ئەودەمی بەرپرسی لیژنەی ناوخۆی کەرکووک بوو، پێیراگەیاندم بچمە بەغدا تا لەبەردەم دادگای سزای بەغدا بەرگری لە سەرکردەکانی حیزبی شیوعی بکەم، ئەوەش لە هاوینی ١٩٤٧ بوو و هەر ئەوکاتی سەرکردەکانی سەندیکای کرێکارانی نەوت لە کەرکووک ڕەوانەی بەردەم دادگای سزا کرابوون بە ڕووداوەکانی گاورباغی تۆمەتبار کرابوون.

---

[32] _ لە جەنگەی ئەو چالاکییە سیاسییانە حیزبی شیوعیی سەرگوڕەپانی نیشتمانی، یوسف سەلمان یوسف"فەهد"ی سکرتێری حیزب و هەردوو ئەندامی مەکتەبی سیاسی حوسێن محەممەد شبیبی و زەکی محەممەد بەسیم لە ١٨ی کانوونی دووەم ی ١٩٤٧ کە لەماڵێکی گەڕەکی سالحییە بوون گیران. بۆ زیاتر:صالح الخرسان. صفحات من تاریخ الحرکة الشیوعیة فی العراق. دار الفرات.بیروت. ١٩٩٣.ص٥١.

چونکە تازە لە کۆلێژی ماف دەرچووبووم، ئیدی مافی یاسـاییم نەبوو بەرگریی داوای تاوانان بکەم. چوومە دیداری "نەجیب ڕاوی"ی نەقیبی پارێزەران و کارەکەم بۆ باسـکرد، نەقیبی پارێزەران ڕازیبوو لەگەڵ پارێزەرانی دیکە بچمە ناو دادگاییەوکەوە. پێیانڕاگەیاندم دادگاییکردنی هاوڕێ فەهد لە دادگای سـزای بەغدا لەبەردەم دادوەری ئەودەمی دادگاکە "عەبدولعەزیز خەیات-ئەلئەعرەج"دەسـتپێدەکا، کە مرۆڤێکی دڕ و زمان پیس بووو دژی هەموو نەیارانی حکوومەت بوو، چەندین سـاڵ دواتریش نوری سـەعید کردییە نوێنەر لە پەرلەمان تا جنێو بەو کەسـانە بدا کە لەناو گتوگۆیەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران دژی خۆی وسـیاسـەتەکانی ڕادەوەسـتان. ئەو دادوەرە بە دژایەتیکردنی شـیوعییەت و دیموکراسـییەت ناسـرابوو. ئەو بەپێی سـووسـەکردنی ئەفسـەری لێکۆڵینەوەکانی تاوان دەجوولایەوە کە زۆرجـاران دەچووەلای و ڕێنمـایی دەدایە. دادگـایەکەش لە نهۆمی خوارەوەی باڵەخانەی دادگایەکان بوو لە کۆتایی شـەقامی موتەنەبی. تەواو لەبیرم نییە لەکاتی دادگاییەکە داواکاری گشـتی کێ بوو، بەڵام ئەفسـەری لێکۆڵینەوەکانی تاوان عەبـدولڕەزاق عەبـدولغەفوور بوو، کە بەڕێوەچوونی دادگـاییەکەش هەر بەدەسـت ئەوەوەبوو. نۆ پارێزەر دەسـتەی بەرگری بوون و، وەک لەبیرم بێ هەریەک لە پاێزەران شەریف ئەلشێخ و کامل قەزانچی و عەزیز شەریف و عەبدولمەجید بەهییە و عەبدولجەبار عوبەیدی و تۆفیق مونیر و من و هەندێ پارێزەری دیکەبووین و هەموو خۆبەخشـانە بەرگرییان لە تۆمەباران دەکرد و، نەجیب ڕاویی ئەودەمی نەقیبی پارێزەران بوو بەرگریی لە ئیبراهیم ناجی شمێلی دەرمانساز دەکرد کە یەک لە کادیرانی حیزب بوو.

تۆزێک پێش وادەی دادگـاییەکە سـەرکردەکـانی حیزبی شـیوعی و سـەرکردەکـانی سـەندیکاکـانی کرێکـاران و ژمـارەیەکی زۆری کـادیرانی حیزبیـان هێنا، کە ژمـارەیەک ژنیشـیان تێدابوو و، هەرهەموویشـیان کەلەپچەکرابوون. هاوڕێ فەهد و زەکی محەممەد بەسین"صارم" کە ببەبنەچە تورکمان و لە عاشیرەتی بەیات بوو، لەپێشەوەبوون و هاوڕێ حوسـێن محەممەد شـبیبییش "حازم" و سـالم عوبێد نوعمان لەدوایانەوە بوون و ئەوان لەسـەر کێشـەیەکی دیکەی سیاسـی گیرابوون و، لەدوای ئەوانیشـەوە تۆمەتبارەکانی دیکە هاتن. چەند ژنێک لەناو تۆمەتبارەکاندا هەبوون و لەوانەش ژنەکەی ئیبراهیم ناجی شـمێل و سەعیدە مشعل"سوعاد خەیری" و عموومە میر مەسری و، لە حەوشی دادگا کۆکرانەوە و دوایە خرانە شـیشـبەندی تۆمەتباریی دادگای سزای بەغدا و ئەوجا بانگی پارێزەرەکان کرا.

دادگا دەستی بە تۆمارکردنی شەناسی تۆمەتباران کرد و ئەوان لە "٥٠" کەس تربوون و، دوایەش هاتنەسـەر ئەوەی داخوا ارێزەرەکان بۆ بەرگری گونجاون. من، کە هەر سـاڵێک

دەبوو خوێندنم تەواوکردبوو هێشـــتا ماوەی یاســـایی ئەوەم تەواونەکردبوو بچمە ناو داوایەکانی تاوان، بەڵام عەبدولعەزیز خەیاتی دادوەر ێشترێ لە کەرکووک دادوەر بوو و ێگەی خانەوادەکەی ئێمەی دەزانی، ئیدی کارەکەی بوارد و دروستیی مافی بەرگریی منی پشتڕاست کردەوە و، دەربارە رسیاری تۆمەتبارانیش داخوا تۆمەتبارن یان نا، هەموویان نکوڵییان کرد تاوانبارین و گوتیان یاسا ستەمکارەکان ناتوانن تۆمەتی تۆمەتبار بسەلمێنن.
دوای کۆتـاییهـاتنی دانیشـــتنی یەکەم، داوامـان لە دادوەر کرد ڕێمـان بـدا ەیوەنـدی بە تۆمەتبارانەوە بکەین تا ســـەبارەت بە بنەمای بەرگریلێکردنیان پرســـوڕایەکیان لەگەڵ بکەین و، ئەویش ڕێی داینێ. ئیدی فەهد و زەکی محەممەد بەسـیم و حوسـێن شـبیبی و ســـاڵم عوبێد نوعمان و محەممەد حوســێن ئەبولعیس و ســـەرکردەکانی ســـەندیکاکانی کرێکاران و ژن و کچەکانیشمان دیت و، پرسوراامان لەسەر ڕەتکردنەوەی ئەو دانپێدانانانە کرد کە بە ئەســـکەنجە لە هەندێ تۆمەتباریان دەرکێشـــابوو و، هەندێکیان ماوەی بەندیی کێشـــەیەکی دیکەی بەســـەردەبرد و، لە بەندیخاڕا هێنابوویانن تا لەگەڵ ئەوانیدی دادگایی بکرێن، لەوانەش محەممەد حوسـین شـبیبی و ســاڵم عوبێد نوعمان و محەممەد حوسـێن ئەبولعیس و کەسانی دیکەش.
لە دانیشـــتنی دووەمی دادگا گوێمان لە نووســـراوی داواکاری گشـــتی گرت کە جێگری داواکاری گشـــتی خوێندییەوە و، لەو بازنەیە دەخولایەوە گوایە تۆمەتباران، پێچەوانەی یاســـا عێراقییەکان، بەبێ مۆڵەت حیزبی شـــیوعییان دامەزراندووە و، ئەو حیزبەش کاری تێکدانی ئاساشیان کردووە تا بەهێز سیستەمی دەسەڵات و سیستەمی کۆمەڵایەتی بگۆڕن.
ئەوجا دەستی بە گێڕانەوەی ئەو کارانە کرد کە تۆمەتبارا کردوویانە لە مانگرتنی کارگە و دامەزراوەکان و ئەو خۆپیشاندانانەی لە شەقامەکان کران و ئەو بەیاننامانەی بڵاوکرانەوە و کە ئەو بە کاری ئاژاوەغێڕیی ناوبردن و، لە کۆتایی نووســـراوەکەیدا داواکاری گشـــتی داوای کردبوو تۆمەتباران بەپێی برگەی "٣"ی ماددەی "٨٩آ"ی ســـاڵی ١٩٣٨ ی یاســـای سزادانی بەغدایی سزا بدرێن، کە سزای سێدارە دەداتە ئەوکەسانەی بانگەشە بۆ بیروڕای شـــیوعی و ســـۆشـــیالیســـتی دەکا. لەو بەڵگانەی لەبەردەســـتی داواکاری گشـــتی بوون، پەیماننامەی نیشـتمانی و سـیسـتەمی ناوخۆیحیزبی شـیوعیی عێراقی بوون کە کۆنگرەی یەکەم لە ١٩٤٥ بڕیاری لەســـەردابوو و، کۆمەڵێک بەیاننامە و بڵاوکراوەی نهێنیی حیزبی شـــیوعی و حیزبی تەحەڕوڕ وەتەنی و کۆمەڵەی نەهێشـــتنی زایۆنیزم لە بۆنەی تایبەت دەریکردبوون. داوامان لە لێکۆڵینەوەکانی تاوان کرد هەریەکە و دانەیەکیانمان بداتێ تا لە بەرگریکردن لە تۆمەتباران ئاماژەیان پێ بکەین. دادوەر بەو مەرجە ڕازی بوو کە دوای ئەو دانیشتنەی دادگا سەر لە لێکۆڵینەوەکانی تاوان بدەین.

## گوتەکانی هەردوو هاوڕێ فەهد و زەکی محەممەد بەسیم:

ئەوجا دادگا گوتەکانی تۆمەتبارانی تۆمارکرد، لە گوتەکانی سکرتێری گشتی حیزبیشیوعییەوە"فەهد" کە سەری قسانی بەوەی دەستپێکرد: "من ڕەوتێکی تایبەتم لە بزوتنەوەی نیشتمانیدا هەیە وبە شیوعییەت ناسراوە. من پێش ئەوەی ببمە شیوعی نیشتمان پەروەر بووم. پێش بوونە شیوعیم پاس بوونە شیوعییشم شتێکی جیاوازم لە باوەڕە نیشتمانییەکەم نەدیت، ئەوەندە نەبێ دوای ئەوەی بوومە شیوعی هەستم کرد بەرپرسیارییەکەم بەرانبەر نیشتمان و گەلەکەم گەورەتر بووە"[33].

دادوەر دەیویست قسەکانی پێ ببڕێ و داوای دەکرد گوتەکانی لەو تۆمەتەدا کۆکاتەوە کە بەرەوڕووی کراوەتەوە نەک بانگەشە بۆ شیوعییەت بکا. بەڵام فەهد وەک وەڵامی داوایەکەی دادوەر لەسەر قسەکانی ڕۆیی بەوەی پێویستە ڕوونیکەمەوە بۆچی بوومە شیوعی تا ڕاستییەکانی شیوعی بخرێتە ڕوو.

ئەوجا دادوەر لێپرسی: دروشمتان چییە؟. هاوڕێ فەهد گوتی: نە ئێستا و نە پێشتریش، لە ئاڵای عێراق بترازێ، هیچ دروشمێکی دیکەمان نەبووە". دادوەر پێیوابوو دەڵێ دروشممان چەکوچ و داس و ئاڵای سوورە.

ئەوجا دادوەر لێپرسی: "کێ خەرجیتان دەدا؟"ئامانجیشی ئەوەبوو تانە لە نیشتمان پەروەریی حیزب بدا و ئەوەی بباتە مێشکی خەڵکی یەکێتیی سۆڤیەت خەرجییان دابین دەکا. هاوڕێ فەهد گوتی: "گەلی عێراق و بەپلەی یەکەمیش چینی کرێکارانی عێراق خەرجیمان دابین دەکەن". دادوەر گوتی: "بە چ دەژیی؟" فەهد گوتی: "من خۆم بۆ کاری حیزبی تەرخانکردووە، حیزب بژێویم دابین دەکا". دادوەر پێیوابوو گوزەرانێکی خۆش دەژیا، لێپرسی: "حیزب مانگی چەندت دەداتێ؟" فەهد گوتی: "دە دینار". دادوەر گوتی: "ئەو هەموو ماندووبوون و مەترسییە بۆ دە دینار؟"، هەموومان لەبەر ئەقڵ تەنکیی دادوەر دەستمان بە پێکەنین کرد.

کە دادوەر تۆمەتی مانگرتن و خۆپیشاندانەکانی دایەپاڵ حیزبی شیوعی، هاوڕێ فەهد گوتی: "جێی شانازیمانە کارە نیشتمانی و جەماوەرییەکان بدرێنە پاڵ حیزبەکەمان، بەڵام ێمە لە مەیدانی تێکۆشانی نیشتمانیدا تاک نیین و حیزبە نیشتمانییەکانیش ڕۆڵیان لە خەباتە نیشتمانییەکاندا هەیە و، ئێمە، بە حوکمی جەماوەریبوونی حیزبەکەمان ڕۆڵێکی ناوازەمان هەبووە".

---

[33] ـ بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە: وقائع محاكمة الرفيق فهد امام محكمة بغداد، نقلا عن الفكر الجديد"جريدة بغداد"، العدد ١٤، ١٩٧٦/٢/١٧٨.

هاوڕێزەکی بەسیم داوای دانەیەک لە پەیماننامەی نیشتمانیی حیزبی شیوعیی کرد تالەناو گوتەکانیدا لە بەرانبەر دادگا ئاماژە بە ماددەکانی بکا. دادوەر دانەیەکی دایە و، ئەویش دەستی بە شرۆڤەکردنی ماددەکانی پەیماننامەکە کرد و، دەتگوت لە کۆبوونەوەی سانەکانی حیزبە و ئەوەی بۆکادیرەکانی حیزب شرۆڤە دەکا، باسی ئامانجەکانی حیزبی کرد لە تەواوکردنی سەربەخۆیی وڵات و هەڵوەشاندنەوەیپایماننامەی ١٩٣٠ و ستەمکارانە و پەرەپێدانی ئابووریی نیشتمانی. ئەوجا باسی ئەوەی کرد پێویستە ئازادییە دیموکراسییەکان دابین بکرێن وەک ئازادیی ڕۆژنامەگەر و بڵاوکردنەوە و کۆبوونەوە و مانگرتن و، پێکێنانی حیزب و سەندیکا و بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی ئازاد و ڕاستەوخۆی ئەنجوومەنی نوێنەران و، لە بەرانبەریشدا حکوومەت چ ئەرکێکی لەسەرە. لەبواری پەیوەندییەکانی کشتوکاڵییش باسی ئەو باجە نایاسایی و نامرۆڤانانەی کرد ە دەرەبەگەکان لەسەر جووتیارانی دەسەپێنن. لێرە دادوەر داوای لێکرد قسەکانی ڕاگرێ و پێیگوت: "تۆ لەناو هۆڵی دادگادا شیوعییەت بڵاودەکەیەوە، بۆیە لێناگەڕێم قسە بکەی".

ئەوجا قسەکانی تۆمەتبارەکانی دیکە تۆمار کران کە زۆربەیان نکۆڵییان لە تۆمەتەکەیان کرد. لەسەر قسەی داوای هاوڕێ محەممەد حوسێن ئەبولعیس و هاتنە دەنگ لەسەر قسەکانی داواکاری گشتی گوایە تۆمەتبارەکان پێشتری بە تۆمەتێک حوکمدراون، لە داواکاری گشتیم پرسی: "ئەو ماددەیەی لە یاسای سزاکانی بەغدایی حوکم بڵاوکردنەوەی بنەماکانی شیوعییەت دەدا ماددەی "٨٩ آ"ە بە هەموو بڕگەکانییەوە، داخوا هیچ کام لە تۆمەتبارەکان پێشتری بەپێی ئەو ماددەیە حوکم دراوە؟ ئەوتۆمەتبارانەی پێشتری حوکمدراون بەپێی ماددەکانی یاسای گردبوونەوەی عوسمانلی حوکمدراون و هیچ پەیوەندییەکی بە شیوعیبوونەوە نییە.

## دانیشتنی دووەم و دەستگیرکردنی کامل قەزانچی:

لەبەر تۆمارکردنی گوتەکانی تۆمەتباران، دادگاییەکە بۆ ڕۆژێکی دیکە دواخرا و، ئێمەی پارێزەرانیش سەردانی لێکۆڵینەوەکانی تاوانەکانمان کرد تا بڵاوکراوە و ئەدەبیاتی حیزبی شیوعیمان دەستکەوێ تا لە بەرگریی تۆمەتباران بەکاری بهێنین، کە ئەفسەری تاوانەکانیش ئەوەی داوامکردبوو دایمێ، داوای لێکرد واژوو لەسەر پسوولەیەک بکەم هەموو ئەو پەڕە و نووسینانەی تێدا تۆمارکرابوو. واژووم کرد و منیش داوام لێکرد مۆری لێکۆڵینەوەکانی تاوان لەسەر هەموو نووسین و بڵاوکراوەکان بدا و ئەویش کردی.
لە هۆڵی دادگا ئامادەی دانیشتنی دووەم بووین و، هەمیشەش لە نزیک تۆمەتبارەکان دادەنیشتین تا پرسوڕایان لەگەڵ بکەین و بابەتەکانیان لەگەڵ تاوتوێ بکەین.
دادوەرەکە زۆری جوولەی مندالانە بەرانبەر تۆمەتبارەکان دەکرد، ئەو کارەش کامل قەزانچیی پارێزەری بە پێکەنین هێنا، ئیدی دادوەر لێی توورەبوو و گوتی: "مامۆستا کامل، هەمو پارێزەرەکان وەک فریشتە دانیشتوون تەنیا تۆ نەبی، تۆ جوولە دەکەی و پێدەکەنی".
کامل گوتی: "تەنیا پرسورابوو لەگەڵ تۆمەتبارەکەم". لێرەدا، عەبدولڕەزاق عەبدولغەفووری ئەفسەری لێکۆڵینەوەی تاوانەکان هەستایەوە و چەند وسەیەکی چرپاندە گوێی دادوەرەکە. دادوەرەکە گوتی تۆش شیوعیی، جانتایەکەی بپشکنن بڵاوکراوەی شیوعیی تێدایە. عەبدولڕەزاق عەبدولغەفوور هێرشی کردە سەر کامل قەزانچی و جانتایەکەی پارێزەریی لێستاند و، بەستەیەک بڵاوکراوە و بەیا ننامەی لێ دەرهێنا کە وەک ئێمە لە لێکۆڵینەوەکانی تاوانی وەرگرتبوو، بەڵام داوای لێ نەکردبوون مۆری لێدەن و واژووی لەسەر بکەن و، ئەوانیش ئەوەیان دەزانی. کە قەزانچی گوتی بە فەرمانی دادوەر لە لێکۆڵینەوەکانی تاوانی وەرگرتووە، عەبدولڕەزاق عەبدولغەفوری ئەفسەری لێکۆڵینەوەکانی تاوان نکۆڵیی لەوەی کرد و گوتی: "موکەڕەم تاڵەبانیی پارێزەر چەندین نووسین و بڵاوکراوەی شیوعییەکانی لە ئێمە وەرگرت ومۆرمان لێداوە و واژوومان لەسەر کردووە، بەڵام هیچ شتێکمان نەداوەتە کامل قەزانچی و، ئەولاپەرانەس هیی لێکۆڵینەوەکانی تاوان نییە چونکە مۆر و واژووی لەسەر نییە".
دادوەر بڕیاری دەستگیرکردنی کامل قەزانچیی پارێزەری دا و، لەبەر ئەوەی بڵاوکراوەکانی شیوعیی لەلابووە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکرێ.

**دەست لەکارکێشانەوەی پارێزەران و بڕیاری لەداردانی "فەهد – صارم"**

بڕیاری دەستبەسەرکردنی کامل قەزانچیی پارێزەر بە ورووژاندنێکی ڕوونی پارێزەران دادەندرێ تا تۆمەتبارەکان لە بەرگریی پارێزەرەکانیان بێبەش بن و تەنیابمێننەوە و بەپێی ویستی دەسەڵاتە باڵاکانی دەوڵەت مامەڵەیان لەگەڵ بکەن. دوای پرسورای پارێزەرانیش،

بڕیارمان دا وەک نارەزاییەک بەرانبەر لادانی دادوەر لە ڕێوشوێنی دادگاییکردن و پێدرێژیی سەر مافی پارێزەری، هەر هەموومان دەست لەکار بکێشینەوە.
پێموایە دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەم پارێزەرەکان پەلەیان لەو کارەدا کرد، دەبوایە نارەزاییەکی دەستەجەمعی بەشێوەی نووسراوێکی بەکۆمەڵ پێشکەشی وەزارەتی داد و سەندیکای پارێزەران بکەن، نەخاسمە کە نەقیبی پارێزەرانیشیان لەگەڵ دا بوو و، دەبووایە لە ئەرکە یاسایی و نیشتمانییەکانیان بەردەوام بوونایە تا بەرگری لە تۆمەتبارەکان بکەن.
کە ئەو تۆمەتەی هەواڵەی تۆمەتبارەکانیش کرابوو تاوانێکی دەرەوەی دەسەڵاتیدادگای سزا بوو و دادگایەکە تەنیا دەسەڵاتی هەواڵەکردنیی هەبوو بۆ دادگای سزای باڵا، ئیدی کێسەکەی بۆ هەواڵە کرد و، کە نارەزاییەکەی ئێمەش لە دەستلەکارکێشانەوەمان بۆ ئەوەبوو کامل قەزانچیی هاوەڵمان بەربدرێ، ئەاو لێکۆڵینەوەکانی تاوان بۆ ساڵێک بۆشارۆچکەی بەدرەی دوورخستەوە. دوای دادگاییەکی کورتیش، دادگای سزای باڵا حوکمی سێدارەی بەسەر هەریەک لە هاوڕێیان سەلمان یوسف سەلمان و زەکی محەممەد بەسیمدا دا و، کاری قورسیشی بۆ ئەوانیدی بڕییەوە کە لەنێوان بەندیی تا هەتا و چەندین ساڵدا بوو.[34]
دوایە هەندێ پارێزەر هاتنەوە سەر بەرگری لێ کردنیان و من یەکێکیان بووم. نووسراوێکی تەمیزیان دایە دادگای تەمیزی عێراق، سەرۆکەکەی "بریگار"ی حاکمی بەریتانی بوو و تێیدا ئەو تۆمەتانەیان بە درۆ خستبووەوە کە درابوونە پاڵ تۆمەتبارەکان، گوایە ویستوویانە بە زەبری هێز سیستەمی فەرمانڕەوایی و سیستەمی کۆمەڵایەتی بگۆڕن و، داوامان کردبوو ئەو هێزە دیاری بکرێ کە گوایە دەیەوێ سیستەمی دەسەڵات بگۆڕێ. داخوا هیچ کامیان چەکێکی پێ گیراوە؟ گردبوونەوە و مانگرتنەکانیش یاسایین و ئەوانەی کردبووشیان پێشتری دادگایی کرابوون. ئیدی داوادەکەین حوکمەکان هەڵوەشێنەوە و تۆمەتبارەکان بەربدرێن.
بۆ پرۆتستۆی پێدریژی کردنە سەر مافی مرۆڤ لەعێراق، خۆپیشاندان لە زۆر پایتەختی عارەبی و ئەورووپی کران و، "ویلیەم گلاشێر"ی نوێنەری شیوعیی پەرلەمانی بەریتانی

[34] _ لە ٢٣ی حوزەیرانی ١٩٤٧، دادگا حوکمی سێدارەی بۆ هەریەک لە فەهد و زەکی محەممەد بەسیم و ئیبراهیم ناجیی دەرمانساز دەرکرد، کە فەهد لە ماڵەکەی ئەودا گیرابوو، سەرباری سێزدە شیوعیی دیکەی بە کاری قورس و بۆ ماوەی جیاجیا حوکمدرابوون، لەبەر فشاری نێودەوڵەتی و نەخاسمە حیزبە سۆسیالیستییەکانی حوکمەکەیان شەرمەزار کرد، لە سێزدەی تەمووزی ١٩٤٧ حوکمەکان هەموارکرانەوە. حوکمەکەی فەهد بووە کاری قورسی تاهەتا و زەکی محەممەد بەسیم کرایە ١٥ ساڵ کاری قورس و گواسترانەوە بەندیخانەی کووت.بۆ زیاتریش: حنا بطاطو، المصدر السابق، ج ٢، ص١٩٨-١٩٩.

بابەتەکەی لەبەردەم پەرلەمان وورووژاند و داوای لە حکوومەتی بەریتانی کرد دەســـت باویتە ناو کارەکە و ئەو سزایانە هەڵوەشێنیتەوە. وەزیری دەرەوەی بەریتانیا وەلامیدایەوە و گوتی: "عێراق دوڵەتێکی ســـەربەخۆیە و ناکرێ دەســـت لە کاروبارە ناوخۆییەکانی وەردەین". گلاشـــێر وەلامی دایەوە و گوتی: "ئەدی عێراق دەوڵەتێکی ســـەربەخۆ نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا سوپای بەریتانی لە ١٩٤١ بە زەبری هێز داگیری کرد؟باشە ئەدی هەر بۆ نموونە ئەگەر کۆماری بولگارســـتانی میللی ڕۆژنامەیەکی نەیای دەوڵەت دابخا، ئەرێ حکوومەتی بەریتانی هەڵویستی چ دەبێ؟ ئەرێ دنیای لێ پڕ ناکا؟، باشە ئەدی بولگارستان دەوڵەتێکی سەربەخۆ نییە؟".

لەبەرانبەر فشاری ناوخۆیی و عارەبی و جیهانیدا، حکوومەت ناچاربوو سووسەیەک بداتە دادای تەمیز تا ســـزای ســـێدارەی تۆمەتبارەکان بکاتە بەنیی تاهەتا و بەندکراوەکانیش ڕەوانەی بەندیخانەی کووت بکا.

## پەیوەستبوونی حیزبیم دوای گرتنی سەرکردەکانی حیزب:

کە لە کەرکووک بووم و، لەبەر ئەوەی ڕوخسـاریکی ئاشـکرای حیزبی شـیوعی بووم، وەیوەسـتی بازنە نهێنییەکانی کەرکووک نەبووم، بەڵکو هاوڕێ یوسـف حەننا ئەلقەس پەیوەندیی پێوە دەکردم و، تا بەئاسـانییش پەیوەندی بە ڕێکخسـتنەکانی حیزبەوە بکەم، نووسینەیەکم لە نووسینگەی پارێزەریی خۆم بەناوی سکرتێر بۆ ڕێکخست. دۆخەکە بۆ شـیوعییەکانی ئەودەمی وابوو ئەگەر هیچ چالاکییەکی جەماوەری یان حیزبیی وەک بڵاوکردنەوەی بەیاننامە یان بڵاوکراوەیەکی گومان لە کەسـیک بکرێ بڵاویکردبێتەوە وەگەرنا حکوومەت کەسـی نەدەگرت. منیش لە خانوێک دەژیام هیی پوورم بوو و لە گەڕەکی بەگلەری نزیک قۆریە بوو. هاوڕێیەک لە بەغداوە هەناردرابوو تا لە ڕاوەدونانی پۆلیس دوورکەوێتەوە و وابزانم جوو بوو، چونکە منیش لە ماڵەکەدا بەتەنیا دەژیام، ئیدی لای خۆم شـاردمەوە. پۆلیس، لەبەر ئەو دیدارانەی لەگەڵ یوسـف حەننا م هەبوون خەریکبوو چاودێریی ئەوانەی ئەو کەسـانەی دەکرد کە دەهاتنە نووسـینگەکەم چونکە یوسف لەبەر چالاکییەکانی لای ئەوان ناسـراوبوو. کە ترسـی ئەوە هەبوو بگیرێ وئیدی ناچاربوو خۆی بشارێتەوە و بە نهێنی پەیوەندیم پێوە بکا، دەشمزانی ماڵەکەی لەکوێیە و ئەگەر پێویستی بکردایە بەشەو سەرم لێدەدا.

لە کاری پارێزەریدا بەردەوام بووم، بەڵام زۆربەی ئەو کێشـانەی بەرگریم تێدا دەکردن، کێشەی سیاسی بوون، لە یەکێک لەو کێشانە، کە دەستگیرکراوەکە شیوعی بوو، لەبەردەم دادگای سـزای کەرکووک دادگایی کرا و دادوەرەکەش ڕەشـاد عارف بوو و کوردێکی خەڵکی کۆیە بوو، دادوەر دەیزانی ئەوەندە نییە لەوکارەدام و بۆم نییە لە داوایەکی ئاوادا ببمە بەرگریکار، ئیدی شوناسی شارستانیمدایە"دەفتەر نفوس"، دادوەر سەیری لاپەڕەکانی دەکرد و زانی مەبسـتم چییە، ئیدی بە بەرگرییەکە ڕازیبوو، ئەوەش لەکەرکووک کرابووە قسەوقسەڵۆک و دەیانگوت من پاسی چەک هەڵگرتنم داوەتە دادوەر.

دوای گرتنی هاوڕێ فەهد و ئاواڵەکانی، نەمدەزانی کێ لە بەغدا بووەتە بەرپرسی یەکەمی حیزب، دواتری دەرکەوت یەهودا سـدیق بۆماوەیەکی کورت ئەو بەرپرسـیارییەی وەرگرتبوو و دواتری بە ئامازە و سـووسـەی سـەرکردایەتیی بەندیخانەی کووت ئەسـپاردەی ماڵک سـەیفی کردبوو. ڕۆژێکیان ماڵک سـەیف هاتە کەرکووک و دەیویست بەرپرسی کەرکووک ببینێ و، ئەودەمی نافع یونس بەرپرس بوو و جا چ پێویست بوو تا بیبینێ کردم.

نافیع یونس داوای لێکردبووم بچمە بەغدا تا لە دادگاییکردنی فەهد و ئاواڵەکانی ئامادەبم و، ئەو، تا بۆ دادگایی فەهد یان کاری حیزب، راســـتەوخۆ لە ماڵەکەم یان لەڕێی یوســـف حەنناوە پەیوەندیی پێوە دەکردم.
هەندێ وانەی ڕۆشنبیریم دەدایە حیزب کە.بۆ ڕۆشنبیرکردنی ڕێکخراوەکانم دەنووسین، یەکێکیان بەناوی"بەرەی میللی" بوو و ئەودەمی مشـــتومڕێکی دروســـتکرد، ئاخر بەرەی میللی پێشـــنیار دەکا بەرەکە بەســـەرکردایەتیی حیزبی شـــیوعی بێ. منیش پێموابوو، دانپێدانانی حیزبەکانی دیکە بە پێشـــڕەویی حیزبی شـــیوعی ئەگەر فەرمییش نەبێ ئەوا کارێکی ئاشکرا و دیارە و، ئەو حیزبانەش، کاتێ حیزبی شیوعی بەهێزە و ئازادییەکان لە شـــەقام دەســـەپێنێ، چالاکییەکانیان بە ئاشـــکرا دەکەن، بەڵام کە حیزبی شـــیوعی بەر دەکەوێتە بەر هەڵمەتی دەسەڵات ئەوانیش چالاکیی دیموکراسییان نامێنێ، نموونەش دوای دەستگیرکردنی سەرکردەکانی شیوعییە لە ١٩٤٧.
یەک لەو نامیلکانە دەربارەی ئازادیی ژنان بوو و، من ئاڵقەی پەیوەندیی نێوان حیزب و ڕێکخراوی ژنان بووم کە زۆربەی ئەندامەکانی قوتابییانی دواناوەندی بوون، ســـەرباری ئەوەی گەنج بووم و زگورتیش بووم،بەڵام پەروەردەی خێزانی و ناوبانگم ومانیان لە من و لەو کچەس دووردەخستەوە کە دەمدیت و، کچەکان باوەڕیان بە ڕەوشتم هەبوو و، کە حیزبیش داوای کەسێکی بۆ ئەو ئەرکە کرد لەناو خەڵکدا بە ڕەوشتی سەنگین و ناوبانگی باس ناسرابێ، تا هیچ گومانێکی غەیرە سیاسی دروست نەکا و ئەوەش بۆ کچەکان گرنگ بوو، ئیدی من دەستنیشان کرام.

## سەرکردایەتیی یەهودا- ماڵک و دانپێدانانی عەبدولوەهاب عەبدولڕەزاق:

کە فەهد و ئاواڵەکانی گیران، ســـەرکردایەتیی لیژنەی مەرکەزی بەرپرســـیارێتیی یەکەمی بەشـــێوەیەکی کاتی دایە یەهودا ســـدیقی[35] ئەندامی لیژنەی مەرکەزی. دوای ماوەیەک هاوڕی فەهد لە بەندیخانەی کووتەوە سووســە و ئاماژەی ئەوەی ناردبوو بەرپرســیاریی یەکەم بدرێتە"ماڵک سـەیف" و، ماڵک سـەیفیش، وەک پێشـتریَ گوتم، سـەردانی کەرکوکی کرد تا لەگەڵ  لیژنەی لقی کوردســـتان کۆببێتەوە و، دوای ماوەیک حیزب ژمارەیەک کادیری هەنارد، ئەوانەی فرمانی دەســـتگیرکردنیان بۆ دەرچووبوو، تا لە ناوچەی ئێمە بیانشـــارینەوە، لەوانەش"عەبدولوەهاب عەبدولڕەزاق"ی لەگەڵ یەهودا سـدیق تێکهالابوو و دواتریَ زمانی لە یەهودا دابوو.

عەبدولوەهاب عەبدولڕەزاق مامۆستا ئامادەییبوو و ڕۆشنبیرییەکی سیاسیی باڵای هەبوو، بەلام بیَ ســـەنگ و چەنەبـاز بوو. چونکە زۆربەی ئەو کـادیرە حیزبییـانەی خۆیـان شـاردبووەوە دەیناسـین و پەناگەکانیشـی پێدەزانی، ئیدی حیزب پێی باشـبوو لە بەغدای دوور بخاتەوەز ســـەرەتا ڕەوانەی کەرکووک کرا و لە ماڵی یەک لە شـــیوعییەکان لە ویسـتگەی شـەمەندەفەری کەرکووک خی شـــاردبووەوە، تا ڕیشـــەی چەنەبازییەکیشـی هەڵکێشریَ، بڕیار درا بنێردرێتە گوندی زەرداوی قەزای کفری، تا لەووی لەژێر چاودێریی شـێخ عتا تاڵەبانیی برام بیَ، ئێوارەیەکیان لە ماڵی، کرێکارە شـیوعییەکەی نازانم ناوی چ بوو و لە هێڵیَ شـــەمەندەفەربوو، هەڵمگرت و بە ئۆتۆمۆبیلی برادەرێک، کە حاجی جەبار بو، بردمە گونـدەکەمـان. لەویَ ژمـارەیەک جوتیـار و ئـاشـــەوانێکی شـــیوعیی لێبوو، قوتابخانەیەکیش لە گوندەکە هەبوو چەند مامۆســـتایەکی لێبوو و مزگەوتێک و مەلایەک. بەلام ئەو لە چەنەبازی و خۆدەرخســـتنەکانی هەر بەردەوام بوو و، ئەوەش وایکرد خۆی لای مامۆستایەکان و مەلا و زۆربەی  خەڵکی گوند ئاشکرا بکا و خۆی بە کەسایەتییەکی شـــیوعیی گرنگ دانابوو و گوایە لەبەر ڕاوەدوونانی پۆلیس لە بەغدا ڕایکردووە و، ئیدی مشتومڕی سیاسـیی لەگەڵ  دا کردبوون، ئیدی دەنگۆ بڵاوبووەوە کە شیوعییەکی گەورە لە بن باڵی شـێخ عەتایە، کەچی دەســـەلاتە خانەوادەیی وعەشـــایەرییەکەی شـێخ عەتا لیناگەڕیَ پۆلیسی ناوچەکە هێرس بکەنە سەر گوندەکە و ئەو شیوعییە مەترسیدارە بگرن،

---

[35] _ یەهودا سـدیق: لە ١٩١٤ لە شـاری سـەماوە لەدایکبووە خوێندنی لە پەیمانگەی باڵای مامۆسـتایان تەواوکرد، سـالی ١٩٤١ هاتە ناو حیزبی شـیوعی، لە ١٩٤٩ فەرمانی لەسـێدارەدانی درا و لەداردرا. لە حەننا بەطاطۆوە ڕاگوێزراوە. المصدر السابق، ج٢، ص١٧٦- ١٧٧.

بگرە پۆلیسیش لە عەتای برامی پرسیبوو داخوا کەس خۆی لای ئەو شاردووەتەوە؟ ئەویش نکۆڵیی لێ کردبوو، بەڵام دزەکردنی هەواڵەکە بۆ کەرکووک یان بەغدا بەس بوو تا گوندەکە لێکۆڵینەوەی تاوانی بچێتێ و عەبدولوەهاب و شێخ عەتا بگیرێن.
عەبولوەهاب نزیکەی ساڵێک لە زەرداو مایەو و هەمیشەش مەترسیی گرتنی هەبوو. دوای پرسوورا لەگەڵ سەرکردایەتیی حیزب لە بەغدا، زۆر پێویستبوو بۆ جێیەکی دیکە دووربخرێتەوە، ئیدی بڕیاردرا بنێردرێتە خانەقین و ناونیشانێکی ئەوێی درایە تا پەیوەندیی پێوە بکا، بەڵام لەجیاتیی ئوەی بچێتە خانەقین چووبوەوە بەغدا و پەیوەندیی بە سەرکردایەتیی حیزبەوە کردبوو. دوای ئەوەی پەیوەندیی بە یەهودا سدیقەوە دە، کە جێی خۆشاردنەوەی پێدەزانی، جا لەجیاتیی ئەوەی بچێتە خانەقین و لەوێ داوا بکا حیزب ڕێی بدا بێتەوە بەغدا و چالاکییەکانی بکا، کەچی چووبووە لێکۆڵینەوەکانی تاوان تا چ زانیارییەکی حیزبی لایە بیانلێ و حەسارگە و کادیرەکانیشی ئاشکرا بکا.
دواترێ عەبدولوەهاب عەبدولڕەزاق ونبوو و کەس نەیدیتەوە، گوتیان بە ناوێکی دیکە و لەسەر داوای خۆی ڕەوانەی ئێران کراوە گوتیشیان ماوەیەک لە لێکۆڵینەوەکانی تاوان ماوەتەوە تا سوود لە زانیارییەکانی وەرگرن و، دواترێ، تا سەرچاوەی ئەو هەڵمەتە بشارنەوە کە کرایە سەرحیزبی شیوعیی عێراقی، لەناویان برد.
ئیدی لێکۆڵینەواکانی تاوان ئەو حەسارگەیەی گەمارۆدا کە یەهودا سدیقی لێبوو و گیرا و بۆسەیەکیشیان بۆ ئەوانە داناباوە کە سەریان لەو جێیە دەدا و ژمارەیەکی زۆری سەرکردە شیوعییەکان کەوتنە ناو بۆسەکە و لەوانەش مالک سەیف و هادی عەدولڕەزا و کەسانی دییکەش.
لێکۆڵینەوەکانی تاوان نەیاندەزانی داخوا مالک سەیف[36] چ بەرپرسیارییەکی حیزبیی هەیە. بەڵام یەهوداسدیق لەژێر ئەشکەنجە داڕووخا و دانی بەوەدا نا کە مالک سیف بەرپرسی یەکەمی حیزبە و، دانپێدانانەکەیشی بەو نامەیە پشتڕاستکردەوە کە لە شەرواڵەکەیا شاردبوویەوە وهیی هاوڕێ فەهد بوو و لەبەندیخانەڕا ناردبووی و فەرمانی ئەوەی تیدابوو بەرپرسیارییەکە بداتە مالک سەیف.
کە دانپێدانانەکانی یەهودای بەرەوڕووکرایەوە، مالک سەیف ئەوەندەی خۆڕانەگرت و ئەویش داڕووخا و ناوێ گەلێ بەرپرس و کادیری شیوعیی ئاشکراکرد، لەوانەش لیژنەی

---

[36] _ مالک سەیف: لە ١٩١٧ لە عیمارە لەدایکبووە، خوێندنی لە پەیمانگەی مامۆستایانی سەرەتایی تەواوکردووە. لە ١٩٤١ بووەتە شیوعی، لە ١٩٤٨ دوای ئەوەی لەبەردەم یکۆلینەوەکانی تاوان داڕووخا و حەسارگە و ڕێکخستن و سەرکردەکانی حیزبی ئاشکراکرد، وازی لە حیزب هێنا. نقلا عن حنا بطاطو، المصدر السابق ج٢، ١٧٦- ١٧٧.

لقی کوردســـتان و لیژنەکانی ناوخۆی لیوایەکان. لێکۆڵینەوەکانی تاوان هەڵمەتێکی خێرا و یەکســەری و چڕی کرد تا کادیرەکان بگرێ و هەوایش بوو و گیران، ئیدی دانپێدانانەکانی فراون بوو و ژمارەیەکی زۆری ســـەرکردەکانی حیزب و لیژنە ناوخۆییەکانی لیوایەکانی گرتەوە، ئیدی ئەوانەی رووخان ژمارەیان زیادی کرد و لەوانەش فقئاد بەهجەت و مەجید ڕەئوف و جاسم تەعان و ئیدیکەیش .

مالک ســەیف، کە پێشــترێ ســەردانی کەرکووکی کردبوو، ئەو ماڵەی پێدەزانی کە هاوڕێ نافیع یونس خۆی تێدا شــاردبووەوە. دەبێ دان بەوەشــدا بنرێ وریایی کادیران لاوازبوو و لەجیاتیی ئەوەی جێی خۆشــــاردنەوەی کادیرەکان بگۆڕن هەر لەجێی خۆیان مانەوە. لەوەس واوەتر، کۆبوونەوەیەک لەنێوان نافیع یونســـی بەرپرســـی کەرکووک و جەماڵ حەیدەریی بەرپرســـی هەولێر و ئەحمەد غەفوری بەرپرســـی ســلێمانی لە ماڵەکەی نافیع یونس لە گەڕەکی ســـاترلووی کەرکووک کرا، لەکاتێکدا لێکۆڵینەوەکانی تاوان، دوای هەرەسی یەهودا سدیق و مالک سەیف، هەڵمەتی گرتنی شیوعییەکانی فراوان کردبوو.

لیژنەی لقی کوردســتان، کە نائیل حاجی عیســای ئەفســەری لێکۆڵنەوەکانی تاوان گەیشــتە ســـەریــان و دەســـتگیری کردن، لە کۆبوونەوەدا بوون. لیژنەی نــاوخۆی کەرکوکیش بریتیبوون لە یوســـف حەننا ئەلقەس و فوئاد بەهجەت و مەجید ڕەئوف و من. ئیدی جگە لەمن ئەوانیدی هەموو گیران و منیش ئاگام لێ نەبوو گیراون.

## لەبن چەنگی لێکۆڵینەوەکانی تاوان:

ئاگام لە ڕووداوەکانی بەغدا نەبوو، نەشـــمدەزانی لە کەرکووک چ بووە، چونکە ئەوانیدی لەکاتی پێویستدا هیوەندییان پێوە دەکردم و، من نەمدەزانی ماڵیان لەکوێیە.
ئێوارەیەکیان لە شـــەقامی مەجیدییەی کەرکووک پیاســـەم دەکرد، ڕێکەوتی مامۆســـتا ئیسماعیل قیرداری دادوەری لێکۆڵینەوەم کرد، ئەو برادەرێکی خەڵکی کەرکووک بوو. ئەو سـلاوی لێکردم و بەناوە نهێنییە حیزبییەکەم بانگی کردم و گوتی: "ئەسـوەد چۆنی؟ ئەرێ ئێوە هەموو شـــتێک بەرەواژ دەکەنەوە؟تۆ ســـپیی و ناویان لێناوی ڕەش. وەڵامم‌دایەوەو گوتم : ئیی وەک تۆش نـاو لێدەنێی ئـازا. لێم نزیکبووەوە گوتی: پێتوایە گـاڵتەت لەگەڵ دەکەم؟ نافیع یونس و جەماڵ حەیدەری و ئەحمەد غەفوور لە ماڵێکی گەڕەکی شـــاترلوو گیراون و، لێکۆڵینەوەکانی تاوان ناوی تۆیشیان دەهێنا.
ئەو زانیارییانە بەسبوون تا لەدەست ئاسایش دەربازبم و دەشمتوانی ئەوەی بکەم. بەڵام نا وشـیاریی شـۆڕشـگێڕی چوارسـاڵ بەندیخانە و سـێ سـاڵ نیشـتەجێی زۆرەملێی لێ ئەستاندم.
نازانم بۆ خۆم لەبەرجاوان ون نەکرد، هەر وەکو خۆم خەریکی پارێزەری بووم وبە پان و درێژی لە شـــەقامەکانی کەرکووک دەســـووڕامەوە، بەیانییەکەی ڕۆژێکی ١٩٤٨، کە ســـەردەکەوتمە نووســـینگەکەم و وادەم لەگە کابرایەکی ئەرمەنیی "کارۆ" ناو هەبوو تا بۆ کارێکی پیشـــەیی ببمە پارێزەری، عەبدولڕەزاق عەبدولغەفوری ئەفســـەری لێکۆڵینەوەکانی تاوان، کە دووکارمەندی لێکۆڵینەوەکانی تاوانی لەگەڵدابوو، لای دەرگاکە بانگی کردم. ک پێشتریش، کاتێ قوتابیی کۆلێژی مافی بەغدا بووم، چەندجاران گیرابووم، ئیدی دەمناسی. پێیگوتم: "مامۆسـتا موکەڕەم تکایە دەققەیەک بوەسـتە، ئەوجا ئاماژەی بۆ کەسـێک کرد ، ئەویش ئۆتۆمۆبیلێکی هێنا و بردمیانە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی کەرکووک.
ئەفسەرەکە داوای لە دادوەری لێکۆڵینەوە کرد نووسراوێکی دەستگیرکردنم بۆ دەربکا، تا بتوانێ بمباتە بەغدا. دادوەرەکە مامۆستا "نوری یەکتا"بوو و خەڵکی سلێمانی بوو. دادوەر ڕازی نەبوو بێ نووســـراوی لێکۆڵینەوە و زانینی مـاهیەتی تۆمەتەکە بمگرێ، ئیـدی ئەفســـەرەکە، لە ژووری موفەوەزی لێکۆڵینەوەکانی تاوا، خســـتمیە چاوەڕوانی، ڕێی نەدا هیچ کەسـێک بمبینێ، بەڵام هەرکەسـێکی بیویسـتبا بمبینێ دادوەر نووسـراوێکی دەدایە و لەســـەری نووســـرابوو"ڕێ بە فلان بدرێ موکەڕەم تاڵەبانیی پارێزەر ببینێ"، ئیدی پۆلیش ملی بۆ فەرمانەکە دەدا.
من ســـێ کەســـم لەبیر ناچێ کە چوونە لای دادوەر و فەرمانی دیتنی منیان لێ وەرگرت، بورهان جەلالی خوالێخۆشـــبوی خاڵم و عادل شـێخ نەجیبی ئامۆزام و کەســـێکی دیکەی

برادەرایەتییەکی ڕاستگۆی ئاساییمان لەبەینێ بوو وناوی"خەلیل"بوو. ئەوانە سەریان لێدام و هەرچیی پێویستم بوو بۆیان هێنام. خەلیل ئۆتۆمۆبیلێکی تایبەتی هەبوو، بەدرێژایی ئەو ماوەیەی لەوێ بووم دەرگای بنکەی پۆلیســـی بەرنەدا و، کە عەبدولڕەزاقی ئەفســـەریش لەوەی نائومێد بووبڕیاری دەســتگیرکردنی منی دەســتکەوێ، پەنای بۆ مامۆســتا سـەلمان بەیاتی دادوەری لێکۆڵینەوەی بەغدا بردبوو. بە شـــەمەندەفەربرمیانە بەغدا و خەلیل تا ویستگەی شـەمەندەفەر لەگەڵم هات و لەوێ بە خەمبارییەوە ماڵئاوایی لێ کردم. من ئەو مرۆڤەم لەبیر ناچێ و کەمن ئەوانەی لەبەردەرگای بەندیخانەدا دەیانبینی. دوای شـۆڕشـی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ کە خزمێکی خەلیل گیرابوو هانای بۆ من هێنا و، منیش بۆ ئەوەی هەندێ قەرزی بدەمەوە، ڕەزامەنـدیی بەردانی شـــاکر شـــوکریی خزمیم وەرگرت و بەسەربەرزییەوە چووەوە سەر فەرمانبەرییەکەی.

## له بەڕێوەبەرایەتیی لێکۆڵینەوەکانی تاوان:

بەهجەت عەتییە لە ســـــەری ســـــەرەوەی بەڕێوەبەرایەتیی لێکۆڵینەوەکانی تاوان بوو و، دیارترین بەڕێوەبەریشـــی نائیل حاجی عیســـا بوو، بەوەش ناســـرابوو لەگەڵ گیراوە سیاسییەکان دڵڕەقە و ئەو کەسـەی لە لێکۆڵینەوەدا بەردەوام لە ئەشـکەنجەدان لەگەڵی بوو عەبدولڕەزاق عەبدولغەفوور بوو و ئەوەی گیراوەکانیشی ئەشکەنجە دەدا ئەفسەرێک بوو بە "محێ یەکچاو" ناسـرابوو.لێکۆڵینەوەکانیش لە باڵەخانەیەکی سێ نهۆمیی شـەقامی ڕەشـــید بوو، بەڵام دواترێ و دوای ئەو خۆپیشـــاندانانەی دوای ڕاپەڕینی ١٩٤٨ کران، نەوەکا جەماوەر هێرشـی بکاتەسـەرێ، بردیانە باڵەخانەیەکی دیکەی کوڵانێکی ئەوسـەری دەرنەدەچوو و لە گەڕەکی مورەببەعە.

لەگەڵ گزنگی خۆرێ گەیشـتمە بەڕێوەبەرایەتیی لێکۆڵینەوەکانی تاوان و، هێشـتا زۆربەی فەرمانبەرەکانی نەهاتبوون، گیراوێکم دیت بەزنجیر بە پەنجەرەیەکەوە بەســـترابووەوە، لەبەر ئەوەی لێیدرابوو و لێنەگەڕابوون بخەوێ لەهۆش خۆی چووبوو و، دوانی دیکەش دەسـتیان کەلەپچە کرابوولەسـەر دوو سـەکۆی ناو حەوشـەی فەرمانگەکە دانیشـتبوون، پێدەچوو لەو کەسـانە بووبن کە شـەوی پێشـترێ گیرابوون و هێشتا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دا نەکرابوو. هەرکە گەیشـتمەجێیش، دوو پۆلیسـەکەی لەکەرکووکێڕا لەگەڵم هاتبوون بە نووسـراوی بەڵگەییەوە ڕادەسـتی ئەفسـەری ئێشـکگریان کردم، ئیسـی لەتنیشـت دوو گیراوەکەی دیکە دەستیان بە ئاسنی سەکۆیەکەوە بەستامەوە و، پۆلیسە ئاسایشەکانیش، بێ هۆ، هەر جارێکی بەتەکماندا ڕەتببوونایە بە پۆستاڵە قورسەکانیان لە پێیان دەدایین.

ئەو ژوورەی گیراوەکەی لە پەنجەرەی بەســـترابووەوە ژمـارەیەک گیراوی تێدابوو و پێدەچوو بە قۆناغی لێکۆڵینەوەدا ڕۆیشـتبن و لەوەشـدا هاریکاریی ئاسـایشـیان کردبێ، چونکە ئەوان بە ئازادی دەهاتنەدەرێ و دەچوونەوە ژوورێ و، دەیان ژنیش، هەبوو دایکی گیراوەکان بوو، لەبەر دەرگای فەرمانگەکەدا ڕاوەســـتابوون وخواردن و جلوبەرگیان بۆ کوڕەکانیان هێنابوو.

تا دوای نیوەڕۆ لە لێکۆڵینەوەکانی تاوان مامەوە، بۆ نیوەڕۆ ژەمە خواردنێکیان داینێ"نان و کەباب" بوو، هیچم لێ نەخوارد. گیراوێکم لە تەنیشـت بوو بەڕوخســـاریدا دیاربوو چل ســـاڵ پترە، کە دیتی هیچم نەخواردووە، گوتی ئەگەر نایخۆی بیدەرە من، منیش دامێ و پێچایەوە و لەگیرفانی چاکەتی خۆی نا.

## لە گرتووخانەی ئەبو غرێب:

بێ هیچ پرسیار و لێکۆڵینەوەیەک، لەگەڵ دەستگیرکراوەکانی دیکە بە ئۆتۆمۆبیلی تایبەت بە گواستنەوەی گیراوان و سەربازان ولەژێر پاسەوانییەکی توندا ئێمەیان بەرەو ئەبوغرێب برد، کە لە ئەنتێنایەکانی ئێزگە ڕەتبووین ئۆتۆمۆبیلەکان بەلای راستدا بەرەو گرتووخانەیەک کێلیانکردەوە کە پێشتر لە لیوای پاسەوانی مەلەکی بۆ سەرکردەکانی بزووتنەوەی مایسی ١٩٤١ دروستکرابوو.
کە گەیشتینە گرتووخانەکەی دەوری بە تەلدڕوو گیرابوو و زرێپۆش بەخۆ و بەتۆ و ڕەشاشەوە پاسەوانییان دەکرد، ئێمەیان هێنا خوارێ و چونکە دەستیشیان بەستابووین زۆربەمان بەربووینەوە سەرزەوی و سەربازەکانیش پاڵیان پێوەدەنایین و ئەوجا فەرماندەی گرتااخانەکە لە ئەبوغرێب، نەقیب حەمدوون سەعید ، کە ئەفسەرێکی سوپای مەلەکی بوو، سەیری شوناسەکانی کردین و لە گرتووخانە ڕێوشوێنەکانی لێکۆڵینەوەکانی تاوانی لە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵماندا جێبەجێ دەکرد. کە منیان بردە بەردەمی، پشکنیمی و هەموو کەلوپەلەکانی بردم، چاویلکە وقەڵەم و تەنیا بەتانییەک و سەرینێک و بیجامەیەکی بۆ بەجێهێشتم و ئەوجا بردمییە ڕاڕەوێکی هەردوو بەری کرابووە ژووری بەرانبەر یەکدی و خستمیە ژوورێکی تاریکی پەنجەرەی تێدا نەبوو و تەنیا دەلاقەیەکی بەرزی تێدابوو و دەرگایەکەی لەسەر گاڵەدام.لە درێژی پانیی ژوورەکەی گەڕام و دەرکەوت زیندانێکی دوو بە یەک ونیو مەترە و تەنەکەیەکی بۆ خۆبەتاڵکردن تیدایە و ئەوجا شەربەیەکی ئاویان بۆ هێنام، چونکە تەنیا نیوەڕوانیش ژەمێک نانیان دابەس دەکرد ئیدی لە شێو و نانی بەیانیی ئەو ڕۆژە بێبەش بووم.
ژوورەکەم لە ژوورەکەی حەمدوون سەعیدی فەرماندەی گرتووخانەکە نزیک بوو و هەندێ جار گوێم لە تەلەفۆن کردنەکانی دەبوو و زۆرجاران گوێم لێیدەبوو، سەبارەت تاژییەکانی لەگەڵ وەسیی سەر کورسیی پاشایەتی قسەی دەکرد. پێدەچوو ئەو ئەفسەرە بەرپرسی راهێنان و خزمەتکردنی تاژییەکانی ڕاوی عەبدولئیلا بووبێ. ڕۆژێکیان لە کونێکی بچووکی پەنجەرەوە هاوڕێ فەهد و چەند کەسێکی دیکەم دیت کە نەمتوانی بزانم کێن لە ئۆتۆمۆبیلێکیان هێنانەخوارێ.
گرتووخانەکە کارەبای نەبوو، کارەکان لەبەر ڕووناکیی فانۆسان دەکران، چونکە تازەش هاتبوومە ئەوێ هێشتا فانۆسیان بۆ نەهێنابووم. ویستم گیاوەکانی ژوورەکانی تەنیشتم بناسم، بەڵام نەمتوانی. کە دوایەش فانۆشم بۆ هات دەسکی هەڵواسینەکەیم وەک هاندڵی ئیشپێکردنی ئۆتۆمۆبیل لێکرد و بێ ئەوەی بهێڵم دەنگی لێوەبێ دەستم بە کونکردنی دیوارەکە کرد. کە دیوارەکەشم دوای چەند سەعاتێک کون کرد، دیتم دراوسێیەکەم ' زێڕۆ

ئاغا"یە و ئەو لەو گیراوە ئازەربایجانییانە بوو کە دوای ئەوەی حکوومەتی "شا"ی کۆماری کوردســـتان و ئازەربایجانی داگیرکردبووەوە و دوای ڕووخانی کۆماری مهابادیش قازی محەممەد و ئاواڵەکانی لەسێدارەدابوو. یەکترمان ناسی، بەڵام ئەوان وەک ئێمە نەبوون و ئازادبوون، بەڕۆژ دەچوونە حەوشـــەی گرتووخانەکە. هەرچی ئەوەی لای ڕاســـتم بوو دەرکەوت مەجیدی شێخ جەلال قەرەداغییە و لە گیراوەکانی کەرکووک بوو.

نیوەڕۆ دووەم ڕۆژی گیرانم، بۆ دابەسکردنی خواردن دەرگا کرایەوە و، خواردنەکە سێ کولێرەی بچووک و قاپێک شۆرباوی"بربین" بوو کە گیایەکی خۆڕسکە لەگەڵ بیست دنکە خورما، دەیان بۆ شێو و دەیان بۆ نانی بەیانی. ئەوەی سەیربوو، عومەر عەلی شێخی سەرکردەی شیوعی خۆی بە دابەسکردنی خواردنەکەوە ماندوو نەدەکرد و هەمووی بە ژەمێک دەخوارد و ٢٤ سەعات چاوەڕێی ژەمێکی دیکەی دەکرد.

دوای چەند ڕۆژێک بۆ لێکۆڵینەوە بردمیانە لێکۆلینەوەکانی تاوان. لێکۆلینەوەکە ئاســـایی بوو و ئەشـکەنجە و جنێوی تێدا نەبوو. وەهام خەملاند کە مامەکانم شـتێکیان کردووە و لێنەگەڕاون ئەشکەنجە بدرێم. قسەکانیشم، کە بە خەتی خۆم نووسیم، هەر دێڕ و نیویک دەبوو و تێیـدا نکۆڵیم لەوەی کردبوو ئـاگـام لە هیچ هەبێ و پەیوەنـدیم بە حیزبی شـــیوعییەوە هەبێ. یەک لە ئەفســـەرە ئازەربایجانییەکانی ناوی"ئەســـەدۆڤ"بوو و بە ئازەربایجانی قســـەی دەکرد، ئامۆژگاریی کردم کە دەمبەنە لێکۆڵینەوە نکۆڵی لە هەموو شتێک بکەم و، ئەوکارە بۆ خۆم و بۆ حیزبیش باشترە و منیش وامکرد. لە ئینسکلۆپیدیای تاوانەکانی تایبەتی حیزبی شیوعیی عێراقی کرابوو، قسەدانەکانی من هەر ئەو دێڕ و نیوە بوو"هیچ پەیوەندییەکم بە حیزبی شـــیوعییەوە نییە و نازانم بۆ گیراوم"، ئەوجا هێنرامەوە گرتووخانەکە و لە زیندانە تاکەکەسییەکەوە بردرامە بینایەکی بەرانبەر کە کرابووە ژووری گەورەتر و پەنجەرەیەکی بڵندی تێدابوو و هەر ژوورێکیش هەشـت گیراوی تێدابوو. لەوێ ژمارەیەک هاوڕێم ناسـی، بەڵام کە نەمدەزانی لە لێکپڵینەوەدا هەڵوێستیان چ بووە ئیدی خۆم لە قسە لەگەڵ کردنیان گرت.

## جارێکی دیکەش لە لێکۆڵینەوەکانی تاوان:

ڕۆژێکیا داواکرام بجمە لێکۆڵینەوەکانی تاوان، وام دانا لێکۆڵەران بە قسەدانەکەی پێشترێم وازیان نەهێناوە و پێی رازی نەبووینە، ئدی پتریان دەوێ. کە گەیستمە ئەوی بردمیانە ژووری دادوەری لێکۆڵینەوە ی "عەبدولباقی متەوەلی" بوو و ژمارەیەک گیراویش لەوێبوون، لەوانەش یەهودا سدیق و یوسف زەلوف و هادی عەبدولڕەزا. هاتنیسیان بۆ پشتڕاسکردنەوەی قسەدانەکانیان بوو لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوە. کە یوسف زەلوف ویستیی بڵێ ئەو قسەدانانەیلەژێر ئەشکەنجە لێ وەرگیراوە، عەبدولڕزاق عەبدولغەفووری ئەفسەرلەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوە تێیبەربوو و لێیدا، دادوەر نەیتوانی بەری بگرێ، ئیدی **ناچاری** کرد بە دانپێدانانەکانی ڕازیبی کە زۆر لێی وەرگیرابوو و پشتڕاستیان بکاتەوە.

کە سەرەش گەیستە من، دادوەر لێیپرسیم داخوا بۆچییان هێناومەتە ئێرە، ئەو نووسینانە **هیچ** پەیوەندییان بە منەوە نییە. ئیدی ئەفسەرەکە بەبیریهاتەوە منیان بۆ دیداری کەسوکارەکەم هێناوە و بەهەڵە لەگەڵ ئەوانەیان هێناومەتە ژووری. ئیدی بردمیانە دەرێ و بردمیانە ژوورێکی شێخ عەبدولوەهاب تاڵەبانیی خزمم لەوێ کە لە ئەنجوومەنی نوێنەران نوێنەری کەرکووک بوو لەگەڵ عەتای برام، دوای ئەوەی جوبوونە لای گەلێ کەس چاوەڕێیان دەکردم.

زانیشم جووبوونە لای لیوا عەلی حیجازیی بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس وداوای یارمەتییان لێ کردبوو تا بمبینن و ئەویش گوتبووی: "بە زیندوویی نایبیننەوە"، شێخ عەتاش گوتبووی: "ئەگەر ژیانی پەیوەستی ئیرادەی تۆ بێ، ئێمەس نامانەوێ بیبینین". بەڵام شێخ عەبدولوەهاب توانیبووی ڕەزامەندی لە وەزیری ناوخۆ وەرگرێ و هەندێ جلوبەرگ و خواردنیان بۆ هێنابووم، ئەوەش یەکەم و دوا دیداری پێش دادگاییکردن و حوکمدانم بوو.

لە لێکۆڵینەوەکانی تاوان، پێش ئەوەی بمانبەنەوە گرتووخانەکە، لەسەر سەکۆیەک لە تەنیشت یەهودا سدیقیان دانام. لێمپرسی کە پێشترێ لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردووە ئێستا بۆ هێناویانەتەوە بۆ لێکۆڵینەوە. گوتی: "دەیانەوێ دانبەوەدا بنێم هاوڕێ فەهد لە بەندیخانەوە لەڕێی ماڵک سەیفەوە سەرکردایەتیی حیزبی کردووە و هەر ئەویش لە بەندیخانەوە سەرکردایەتیی راپەڕینی ١٩٤٨ی کردووە"، گوتم: "زمانی لێدەدەی و دانی پێدا دەنێی؟"، گوتی: " بۆ نکوڵیکردن سوودی هەیە؟ ماڵک سەیف دانی پێداناوە" گوتم: "پێتوایە بەو دانپێدانانە خۆت لە پەتی سێدارە دەرباز دەکەی؟" گوتی: "نا...من دەزانم لە سێدارەم دەدەن، من بەری لەداردان دەگرم، بەڵام بەری ئەشکەنجەی دیکە ناگرم، زۆرم بەرگەگرت، دەمەوی لەسە تەختەی لەداردانداا بمرم نەک لەژێر ئەسکەنجەدان"، پێیگوتم: "لەبەرچاوم

کەسێکیان هەتا مردنێ ئەشکەنجەدا، هەوڵمدا رازیی بکەم، بەڵام هەموو جارێ بەرەورووم دەبووەوە و دەیگوت خۆت ماندوو مەکە قسەکانت سوودیان نییە".
کە هێنامانیانەوە گرتووخانەکە، ئێوارەیەکیان لە کونی پەنجەرەوە دیتم هاورێ فەهد و حازم و صارمیان هێنا و دای دادگاییەکی هاکەزایی زانیمان حوکمی لەسێدارەدانیان داون و عەبدولئیلا ڕەزامەندیی لەسەر حوکمەکە داوە و ئیدی حوکمەکە جێبەجێ دەکرێ. لەبەر ئەو پەیوەندییانەی بۆ مانگرتن لە خواد کردم، بەڕێوەبەریی گرتووخانەکە بە یەک لە هاندەرانیان دانام و جارێکی دی بردمیانەوە زیندانە تاکەکەسییەکەی پێشتری، ئەگەرچی ئەو ژوورەشم لە ژوورەکەی فەهد و هاوڕێیەکانی دووربوو، دەمزانی چ دڕندەییەکمان لە دأیدا دەکەن، تەنانەت هەر لەبەر ئەوەی ئاوی نەمابوو و داوای ئاوی کردبوو، زۆریان لە عەزیز ئەلحاج دا و، لەبەر پووچترین هۆکاریش بەندییەکانیان دێنا دەرێ و لێیاندەدان.
دەڵێن عەبدولئیلا خۆی هاتبوو گوێی لەو مشتومڕە بێ کە لەنێوان فەهد و کەسایەتییەکی دیی نایناسم بەرپابوو، کابرا گوتبووی داوای بەزەیی بکە و ئەویش رازی نەببوو داوای بکا. خۆ ئەگەر داوایشی بکردبا هەر لە سێدارەی دەدا. عەبدولئیلا نموونەی کینە بوو بەرانبەر نەیارەکانی و، کە عەقید سەلاحەدین سەباغ لەبەردەم وەزارەتی بەرگری لەداردرا، پێچەوانەی نەریتی باو، تا سەعات نۆ بە هەڵواسراوییان هێشتەوە تا عەبدولئیلا بەوێدا تێپەڕێ و بە پەتەکەوە ببینێ.
کە ڕۆژی یەکەم، ١٤ی شوباتی ١٩٤٩، هاوڕێ فەهد و صارمیان بۆ سێدارە بردە گۆڕەپانی مووزەخانە لە بەری کەرخ بە دەنگی بەرز ماڵئاواییان لە هاوڕێیانیان کرد و ئەوانیش بە سروودی نێونەتەوەیی وەڵامیاندانەوە، کەچی سەربازەکان لە گیراوەکان بەربوون و لێیاندان. ڕۆژی دواترێ، ١٥ی شوبات، حازم و یەهودایان برد. حازم لە گۆڕەپانی بابولموعەزەم لەداردرا. ئەوانەی لەکاتی لەداردانەکەی هاوڕێ فەهد لەوێبوون گوتیان کە فەهد بەسەر سێدارە دەکەوت گوتی: "شیوعییەت لە سێدارە بەرزترە و لە مردن بەهێزترە"، صارمیش گوتی: "من بە شیوعیاتی ژیام و بە شیوعیاتی دەمرم و ئەگەر ژیانێکی دیکەشم بدرێتێ هەر لەپێناوی شیوعییەتدا دەمرم"، حازم گوتی: "جێی شانازییە لە گۆڕەپانێک لەدار بدرێم کە لەوێ پێشڕەویی جەماوەرم کردووە".
کە هاوڕێیانیان لە بەندیخانەی کووت بر دە ئەبوغرێب، هەندێ هاوڕێ پێشنیاریان کرد یاخی بن و نەهێڵن بیانبەن، بەڵام فەهد ئەوەی ڕەتکردەوە و گوتی: "دادگاییکردنی یەکەممان لە سەرووی ئەو کێشانە بوو کە ڕاپەڕینی لێ کەوتەوە و دادگاییکردنی دووەممان لەسەرووی ئەو کێشانە دەبێ کە دەبێتە هۆی بەرپابوونی شۆڕش".
پێشبینییەکەی هاوڕێ فەهد هاتەدی و شۆڕش ڕوویدا و ئەوجا شۆڕشی پێچەوانە و

ئستیعمارییەکانیشرۆڵی خۆیان لە نانەوەی دووبەرەکیی نێوانئەو هێزە سیاسییانە دیت کە شۆڕشیان پێگەیاند و پشتیوانییان کرد و، ئاگری شۆڕشیش بەردەوام هێزمی خۆی دەخوا.

دەستگیراوەکان هەر هەموویان مانیان لە خواردن گرت و داوایان دەکرد وەک دەستگیرکراوی سیاسی مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ و، هەمووئەو مافانەیان هەبێ کە لە سیستەمی بەندیی سیاسیدا هاتووە. مانگرتنەکە پازدە ڕۆژی خایاند، فەرماندەی گرتووخانەکە بەهەموو جۆرێک هەوڵیدا مانگرتنەکە بشکێنێ و من، گوایە لە هاندەرانی مانگرتنەکەم، یەک لەوانەبووم بردرایەوە زیندانە تاکەکەسییەکان، چونکە ڕێککەوتنی نێوان بەندییەکان بە هەردوو زمانی کوردی و ئەرمەنی بوو و ۆلەدارەکانی پاسەوانی مەلەکی تێنەدەگەیشتن. دوای "پازدە ڕۆژ"حەمدوون سەعیدی فەرماندەی گرتووخانەکە ڕایگەیاند حکوومەت بەدەم داوای ڕاگیراوەکانەوە هاتووە و، دەرماڵەی دەستیرکراوانی سیاسییان بۆ خەرج دەکرێ و کەسوکاریان دەتوانن کەلوپەلی ڕێپێدراوی وەک خواردن و جلوبەرگیان بۆ بێننە لیکۆڵینەوەکانی تاوان و ئەوانیش دەینێرنە گرتووخانە تا بدرێتە دەستیان، ڕێیشیان داینێ ڕۆژی سەعاتێک بێینە گۆڕەپانی گرتوخانەکە و خۆمان بدەینە بەر هەتاو. چونکە چوار مانگیش بوو لە زیندانی تاریکدابووین، کە ئێمەیان بردە دەرەوە بۆ بەر هەتاوەکە نەماندەتوانی خاومان بکەینەوە و، هەر بەڕاستییش خواردنی دەستبەسەری سیاسییان بۆ هێناین و میوە و چا و جگەرەش.

ئەوەی سەیربوو، ئەک لە عەریفەکانی ئاسایشی بەشەکەی ئێمە پیاوێکی بەتەمەن بوو و ناوی" ئەبو حمید"بوو، هەرجارێکی بۆ سەراوێیان ببردینایە ئەو پیاڵەیەک چای بۆ دەهێنام و دەپارایەوە لیی وەرگرم. زۆری ڕێز لێدەنام و تەنیا بە "چاوەکەم" و "ئاغام" و "تاجی سەرم" دەیدواندم. عەریفێکی دی لێپرسی: "ئەبو حەمید، تۆ زۆر شیرینکاری بۆ مامۆستا مەکەرڕەم دەکەی". وەڵامیداوە و گوتی: "ئێوە باپیری ناناسن، شێخ عەلیی باپیری، خوای لێ خۆشبێ، سواری دیواری دەبوو و دەچووە حەجێ، بەڵام مامۆستا ڕێی باپیرانی بەرداوە و، ئەوەش پاکبوونەوەی گوناهانە و، خوایاربێ دەردەچێ و بە سەلامەتی دەچێتەوەتەکیەی باپیری لە کەرکووک". من پێگەی شێخ عەلی باپیرم دەزانم، ئەو لە گەورەزانایانی ئایین بوو و لە شەریعەت و سۆفیگەری زۆر زانابوو.بەلام ئەوەش دەزانم کە چوو بۆ حەج، لێرەوە تا بەیرووت سواری ئۆتۆمۆبیل بوو و لەوێش بە کەشتی چووە جەددە و چووحەجی ماڵی خوای کرد. جا هاوڕێ نافیع لەسەر وەرگرتنی چایەکەی "ئەبوحەمید" سەرکۆنەی دەکردم.

## ڕووداوێکی سەیری ساڵح جەبر:

ڕووداوێکی زۆر ســـەیر و تۆقێنەر لە گرتووخانەکە ڕوویدا و دەبێ باســـبکرێ، چونکە بەڵگەیەکی دڕندایەتیی ڕژێم بوو ئەویش: ژنەکەی ســـاڵح جەبری کچی شـــێخ عەددای ئەلجەریانی بوو و کابرا موڵک و ماڵێکی زۆری لە لیوای حیللە هەبوو. دوای مردنی ئەو موڵک و ماڵە بۆ غەزبان و هادی و مەهدی و جەواد و فەزیلەی ژنی ساڵح جەبری مایەوە. بەڵام غەزبان ئەلجەریان بەدەسـەڵات بوو و ئەو سـەرۆکی عەشـیرەتەکەی بوو و، نەریتی ءەشـــەرەتانیش وەهایە کوڕی گەورە و شـێخی عەشـیرەت زەوی و موڵک بەڕێوەدەبا و سەروبەری دەکا و هەندێ بەروبووم دەداتە خوشک و برایەکانی گچکەترێی.

سـاڵح جەبر ویسـتی غەزبا ئەلجەریانی لەکۆڵ ببێتەوە و، بەناوی ژنەکەی دەسـت بەسـەر موڵک و ماڵ و زەویوزارەکەدا بگرێ، ئیدی دنەی هەردوو برایەکەی دا، هادی و مەهدی، تا غەزبانی بکوژن و بەڵێنی دابوونی لە حوکمی یاســـا بیانپارێزێ، ئەوانیش بەڕاســـتی غەزبانی برایان کوشـــت و، هێنایاننە گرتووخانەی ئەبوغرێب و خرانە دووزیندان لەو خیندانانەی ئێمەی تێدابووین. دوای ســـەعاتێک گوێمان لە هاوارهاواری ئەو دوو زیندانە بوو و فەرمـانـدەی گرتووخـانەکەش هێوری دەکردنەوە. یەکێکیـانی هێنـا و دەرگـای زیندانەکەی ئێمەی کردەوە و گوتی: "سەیرکە، ئەوە موکەڕەم تاڵەبانییە و پارێزەرە و یەک لە شێخەکانی تاڵەبانییە و، ئەوە چەند مانگە لێرەیە و ناشکریەت  و هاوار ناکا، دەی وەک ئەو پیاوبن" .

تاوانبارەکە بێدەنگ بوو و دڵنیابووســـاڵح جەبر هەر لەو زیندانەی دەردێنێ و بەردەبێ. هەر بەڕاســـتییش ڕۆژێکیان بردنیان، بەڵام بۆ بەردان نا، بەڵکو بۆ دادگا و لە دادگاییەکی خێرادا فەرمانی لەســـێدارەدانیان درا و بردرانە بەغدا و هەرخێرا لەســـێدارەیاندان و گۆڕەپانەکە بۆ ســـاڵح جەبر و ژنەکەی چۆڵ بوو تا دەســـت بەســـەر ئەو هەموو زەوییە فراوانەدا بگرن کە عەددای ئەلجەریان دەســـتی بەســـەردا گرتبوو، چونکە ئەو کوڕەی مابووی، جەواد ئەلجەریان، هێشـــتا منداڵ بوو و نەیدەتوانی بەڕووی ســـاڵح جەبردا بوەستێتەوە و، ئەوەش لە"سەردەمی خۆشگوزەرانی"دا ڕوویدا کە ئەیاد گەیلانی لە ئێزگەی "دەنگی عێراقی ئازاد"ی پراگ باسی "پیاوچاکانی سەردەمی خۆشگوزەرانی" قسەی لەسەر دەکا.

## دادگاییکردنی لقی کوردستان و لیژنەی ناوخۆی کەرکووک:

ڕۆژی پێش ڕۆژی دادگاییکردنمان، ئێمەیان لە ژوورێک کۆکردەوە، من و نافیع یونس و جەماڵ حەیدەری و یوسف حەننا و ئەحمەد غەفوور و سابیر قادر و تۆما شابا و مەجیدی شێخ جەلالی قەرەداغی.

ڕۆژی دادگاییەکەیش بە ئۆتۆمۆبیلێکی داخراو ئێمەیان بردە سەربازگەی وەشاش، کە ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی دانیشتنەکانی خۆی لەوێ گرێدەدا بۆ دادگاییکردنی سیاسییەکان.

عەقید عەبدوڵلا نەعسانی سەرۆکی ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی بوو و، بەوە ناسرابوو دوژمنی نیشتمانپەروەرانە بەگشتی و دوژمنی شیوعییەکانیشە بەتایبەتی. ئەو دڕندە و زمان پیس بوو، بە ئەرکی خۆی دەزانی نیشتمانپەروەران دەستەدەستە و پۆل پۆل بەرەو سێدارە و بەندیخانان بنێرێ. حوکمەکانیشی پێشترێ لە لێکۆڵینەوەکانی تاوانڕا بۆ دیاری دەکرا. جا لە ڕۆژی دادگا تۆمەتبارەکان، پێش دادگاییکردنیان، بەپێی ئەو حوکمەی بۆیان داندرابوو ڕیز دەکران. بۆ نموونە، ئەوانەی بەرایی حوکمی سێدارەیان درابوو، ئەوانەی دواترێ بەندیی تاهەتا و کاری قورس،ئەوانەی سێیەم پازدەساڵ بەندت و ئیتر ئاوا. یەک لە دادوەرە مەدەنییەکان"عەبدولباری" کە پتری سەر بۆ فەرمانەکانی ئاسایش دادەنەواند، بڕیارەکانی ئەنجوومەنی بەشێوەیەکی یاسایی دادەڕشت و، وەک ئەوەی دادگاییەکە زۆر بەڕێوجێ کرابێ.

کە لەڕۆژی دادگایی بانگی شایەدەکانیان کرد، هەوت بووین: مەجید ڕەئوف فوئاد بەهجەت و ڕەفیق چالاک، تا دژی ئێمە گەواهی بدەن و، پێشدەچوو لەکاتی لێکۆڵینەوەدا ڕووخابن و چووبنە بەرەی ئاسایش تا شایەدی لەسەر هاوڕێیەکانیان بدەن و بگرە لەگەڵ بەرپرسەکانی ئاسایش بچنە کوردستان تا لە گرتنیاندا هاریکاربن. هەر بۆ ڕازیکردنی بەرپرسەکانی ئاسایشیش فیشاڵیان پێوەدەنا و درۆیان دەخستە سەر گەواهدانەکانیان. بۆ نموونە، ڕەفیق چالاک لە ئەنجوومەنی عورفی شایەدیی ئەوەی دا کە بەریدی حیزبی لە سلێمانییەوە دەهێنا و لە کەرکووک رادەستی منی دەکرد، لەکاتێکدا من، لەبەردەم ئەنجوومەن نەبێ، دەنا پێشترێ ئەو کابرایەم نەدیتبوو.

کە کاتی بەرگریش هات، سەرۆکی ئەنجوومەن پرسیی: پارێزەرتان هەیە بەرگریتان لێ بکا؟ دەشمانزانی بوون و نەبوونی پارێزەر هیچ لە ئەنجامی حوکمەکان ناگۆڕێ، بەڵام بە نەخێر وەڵامیان دایەوە، کەچی من گوتم من پارێزەرم و بەرگری لەخۆم دەکەم. بەڵگە تاوانییەکانی بۆ تۆمەتبارکردنم درابووە ئەنجوومەن ئەوەبوو حەفتا بریکاریی یاساییان هێنابوو کە لەبەردەم ئەنجوومەن کە لەبەردەم ئەنجوومەنە عورفییەکان و دادگاکانی سزا

بەرگریم لە تۆمەتبارانی کێشەی سیاسی کردبوو. ئەنجوومەن وای دانابوو گوایە منلەلایەن حیزبی شـیوعییەوە راسـپێردراوم تا لەبەردەم دادگا بەرگری لە شـیوعییەکان بکەم، لەو کێشانەش بەرگریکردن لە هاوڕێ فەهدی سکرتێری حیزب و یاوەڵەکانی دیکەی لەبەردەم دادگای سزای بەغدا.
هەریەک لە نافیع یونس و جەماڵ حەیدەری و ئەحمەد غەفوور بەرگرییەکی سـیاسـییان سـەبارەت بە کێشـەی نیشـتمانی و ئەو جەماوەرە پێشـکەش کرد کە دژی پەیماننامەی پۆرتسـمۆث ڕاپەڕیبوون و، وایان دانا کە پەلکێشـکردنی نیشـتمان پەروەران بۆ بەردەمی ئەنجوومەنی سـەربازی و ئاوا بە توندی حوکمدانیان تۆڵەکردنەوەیە لەو ڕاپەڕینە، منیش بەرگریی خۆم پێشکەش کرد کە یاسایی و سیاسی بوو و گوتم:
بەڕێزان سەرۆک و ئەندامانی ئەنجوومەنی قەدرگران
دادگاییکردنی ئەوڕۆی ئێمە لەو دادگاییانە جودا نییە، کە لەوەتەی حوکمی عورفی لەهەموو عێراق ڕاگەیەندراوە، دژی کۆمەڵە نیشـتمان پەروەرەکان کراوە و دەکرێ. من کە لە لێکۆڵینەوەکانی تاوا بوویمە بەچاوی خۆم ئەشـکەنجەدانی تۆمەتبارانم دیوە تا بەزۆر دان بە ڕووداوگەلێکدا بنێن هیچ پەیوەندیی بەوانەوە نەبووە. سەبارەت بە شایەدەکانیش ئەوەم دیوە و بەبەرچـاو و لەبەر گوێی دادوەرەکـانی لێکۆڵینەوە وپێچەوانەی یـاسـا و ڕێوشـوێنەکان و ڕێوجێی دادگاییکردن ئەوە ڕوویداوە. لەو شـایەدانەی ئەوڕۆ گەواهیی درۆیان لە دژی ئێمە دا و گوتیان گوایە لە لیژنە حیزبییەکان لەگەڵ ئێمەدا بووینە، ئەری ئەوە پرسـیاری ئەوە دروسـتناکا ئەگەر ئەوان راسـتگۆبن بۆچی گەواهی لەسـەر هاوڕێیەکانیان دەدەن؟ ئەرێ ویژدانیان بەخەبەر هاتووە و پێیانوایە ئەو حکوومەتەی لە خۆپیشـاندانەکانداهاواریان دەکرد بڕووخێ و دەیانگوت دوژمنی گەلە، ئێسـتا بووەتە حکوومەتێکی نیشـتمانی و ئەوەی دژایەتییدەکا نیشـتمان پەروەر نییە و دەبێ بەندیخانە بپەسـترێ؟! ئەرێ ئەندامانی ئەنجوومەن نەیاندیت شـایەدەکان چاویان بەردابۆوە و تەماشـای چاوی ئێمەیان نەدەکرد و لە ناخی خۆیاندا بە بێدەنگی دەڵێن چ بکەین ناچارین درۆ هەڵبەسـتین و گەواهیتان لەسـەر بدەین. بۆیە، ئەو بەزۆر گەواهییدانە و خەڵکێکی هێشتا لە لێکۆڵینەوەکانی تاوان گیراون و بە پاسەوانیی ئەوان دەهێندرێن، گەواهیدانەکانیان یاسایی نییە و ناکرێ حوکمی یاسایی لەسەر بنیات بندرێ.
لەو بەڵگانەی دژی منتان هێنایەوە بەرگریکردنم بوو لە داوای سـیاسـیدا، بەڵی لەبەردەم ئەنجوومەنی حورفیی سەربازیی کەرکووک بەرگریم لە سیاسییەکان کردووە و، زۆربەی حوکمەکانی بە بێتاوانیی تۆمەتبارەکان دەرچووە دانی بەوەدا ناوە کارەکانیان کاری نیشـتمانی بووە و لەهەردوو ڕووی سـیاسـی و یاسـایی تۆزێ لەسـەر نییە. دەبێ من، کە

پاریزەرم و ئەو هەموو گاڵتەجاڕییەم لەپێشـــدا دەکرێ، چ بکەم. کە گەیشـــتمە ئەو جێیەنەعسانی بە نووسـەرەکەی گوت قسـەکانی لە تۆمارەکەدا مەنووسـە، ئیدی خۆی بە هاواڵەنییەوە خەریک کرد و دەیگوت قسە بکە و بە نووسەرەکەیشی دەگوت مەنووسە و منیش لەسـەر قسـان بەردەوام بووم: دەبێ، منێکی ڕۆژی دەرچوونم شـوێنـدم خواردووەگەڵ ڕاستی و دادپەروەریدابم و بەرگریی لێ بکەم، دەبێ لەکوێ بوەستم! وەک دڵسـۆزییەک بۆ ئەو شـوێندە، بەرگریم لە ڕاسـتی و دادپەروەری کردووە، ئەو ڕاسـتی و دادپەروەرییەی لە بن قوببە و زیندانەکانی لێکۆڵینەوەکانی تاوان بێ بەها کرابوون. ئەوە ڕاســتیی ئەو بریکارییانەن کە دراونەتە ئەنجوومەنە بەڕێزەکەتان، بۆیە، کە وەک هەر پاریزەرێکی ڕێز لە شـوێندەکەی دەگرێ کار بکەم، ئەوا هیچ تۆز و غوبارێکی بەسـەرەوە نییە، ئەوەش ئەرکێکە لە ئەرکە هەرە لەپێشـــەکانی پارێزەر، بۆیە داوای بێتاوانیی خۆم دەکەم.

کە تۆمەتبارەکان لە قسـەدانەکانیان بوونەوە، سـەرۆکی ئەنجوومەن بڕیاری حوکمەکەی خوێندەوە کە هەر پێشـتری ئامادەکرابوو و، ئەویش حوکمدانی ئەندامەکانی لیژنەی لقی کوردستان بوو و، ئەوانیش هەریەک لە نافیع یونس و جەماڵ حەیدەری و ئەحمەد غەفور بوون و حوکمەکەیان دەسـاڵ بەندی بە کاری گرانەوە بوو و، حەوت سـاڵیش بۆمن و یوسف حەننا و سابیر قادر و، دوو ساڵیس بۆ تۆما شابا. هەرچی مەجید جەلال قەرەداغی بوو ناوی نە لە حوکمدراوان بوو و نە لە بەردراوانیش، کە لە هۆڵەکە دەچووینەدەرێ پرسـیی من ناوم لە بڕیاری حوکمەکە نەهاتبوو و، نەعسانی بێ ئەوەی لە ناوی بپرسێ، گوتی: "بڕۆ تۆش دوو ساڵ".

## له به‌ندیخانه‌ی ناوه‌ندیی به‌غدا:

به‌ندیخانه‌ی به‌غدا" به‌شه سیاسییه‌که‌ی" وێستگه‌ی گواستنه‌وه‌ی به‌ندکراوه سیاسییه‌کان بوو بۆ به‌ندیخانه‌ی نوگره سه‌لمانی بیابانی سه‌ر سنووری سعودییه، یانیش بۆ به‌ندیخانه‌ی کووت و، ته‌نیا بۆ چاوه‌ڕوانیی کاتبوو تا خێزان و که‌سوکار سه‌ردانیان بکه‌ن و پێداویستیی وه‌ک جلوبه‌رگ و نوێن و پاره‌یان بۆ بهێنن.

هه‌رکه له ده‌رگای به‌ندیخانه ناوه‌ندیی به‌غدا چووینه ژووری، به‌ندیوانه‌کان به‌خۆ و به تۆزه‌وه چاوه‌ڕێیان ده‌کردین. جا چاوه‌ڕێی ناڕه‌زاییه‌کی ئێمه‌بوون تا تێر لێدانمان بکه‌ن، واته "که‌ره‌وان" که‌ره‌وان ده‌ربڕین ده‌ربڕینێکی هیندییه و به‌ندیوانه‌کان به دوو ڕیزی ته‌ریب ڕاده‌وه‌ستانو تۆبزی ئه‌ستوور به‌ده‌سته‌وه، جا به‌ندییه‌که‌یان به‌به‌ینی هه‌ردوو ڕیزدا ده‌برد و بێ به‌زه‌ییانه لێیان ده‌دا و که له‌وسه‌ری ده‌رده‌چوو نیوه‌مردوو بووبوو. سه‌ره‌تای کارێ هه‌رچی جلوبه‌رگ و که‌لوپه‌ل بوو له‌به‌ریانکردینه‌وه و لێیان ئه‌ستاندین و ته‌نیا جلی بنه‌وه‌مان له‌به‌ر ما، ئه‌وجا جلی پیس و زبری به‌ندیخانه‌یان داینێ، که شه‌رواڵ و کراسێکی بێ قۆپچه‌بوو و هیچیان به‌به‌ری به‌ندی ڕێک نه‌بوو. ئه‌وجا سه‌رتاش ده‌هات تا سه‌رمان سفر بکا و ئێستا پیاو ده‌بووه بنیاده‌مێکی دی.

هه‌ندێ به‌ندکراوی ئاساییمان دیت جلی به‌ندیخانه‌یان له‌به‌ربوو، به‌ڵام وه‌ک چاکه‌ت و پانتۆڵ هه‌ڵبڕرابوو و دروابوو وڕێک بوو و قژیان داهاتبوو و ڕیشیان تاشرابوو. که پرسیارمان کرد گوتیان ئه‌وانه فه‌رمانبه‌رن و پاره‌یه‌کی زۆریان دزیوه و حوکم دراون و به‌ند کراون!!!

جا لێره‌ش ئه‌رکی نووسین و هه‌ژمار به‌ڕێوه‌ده‌به‌ن و ڕێزێکی زۆران لێ ده‌گیرێ، هه‌ندێکیشیان ئه‌و شه‌قاوو و شه‌للاتییانه‌ن که که به‌ڕێوه‌به‌ریی به‌ندیخانه ده‌یانهێنێ تابه‌ندییه‌کان **ناچار** بکه‌ن مل بۆ سیسته‌می به‌ندیخانه بده‌ن که میراتیی ئه‌و یاسایانه‌بوون به‌ریتانییه‌کان له هیندستان جێبه‌جێیان ده‌کردن. جا به‌ڕێوه‌به‌ریی به‌ندیخانه په‌نای بۆ بردبوون تا وا له‌و به‌ندییه سیاسییانه بکه‌ن ملیان بۆ بده‌ن که ماوه‌ی به‌ندییه‌که‌یان که‌مه.

له‌و شه‌قاوانه‌ش مه‌حمود قه‌رداش و هه‌دوو کوڕی خه‌ببازه‌ی "جه‌بار و ستار"، که هه‌رسێکیان کوردبوون. به‌ندیخانه شه‌للاتییه‌کی دیکه‌شی تێدابوو، ئه‌ویش خه‌لیل ئه‌بولهۆب بوو که عه‌بدولکه‌ری کننه‌ی پارێزه‌ر بۆ کوشتنی ڕکابه‌ره‌که‌ی هه‌ڵبژاردنێی به‌کاریهێنابوو، به‌ڵام بۆ به‌رگری له به‌ندییه شیوعییه‌کان به‌ره‌وڕووی شه‌قاوه‌کانی دی ڕاوه‌ستا و، دوایه بووه سیاسییه‌کی به‌رگریی له کێشه نیشتمانییه‌کان ده‌کرد.

مه‌حمود قه‌رداش که له به‌ندیخانه ده‌رچوو بۆ تۆڵه‌کردنه‌وه کوشتیان. هه‌رچی جه‌بار و ستار کوردی بوون، حکوومه‌تی به‌عس، دوای ئه‌وه‌ی له ته‌قه‌لێکردنی گردبوونه‌وه‌یه‌کی

شـــیوعییانی گۆڕەپانی "ســـباع" ی ١٩٦٨ کە بۆ زیندوو ڕاگرتنی کۆبوونەوەی قوتابیانی ١٩٤٨ کردبوویان، بەکاریهێنان، دواتریش لە ١٩٦٩ هەر بەخۆی هەردووکی کوشتن. هەرچی خەلیل ئەبولهۆبیشــە، دادوەری گشــتیی ســەربازی لەســەردەمی عەبدولکەریم قاســم زۆر نامەردا فەرمانی غافلکوژیی دا.

پێش ئەوەی بچینە بەشــی ســیاســی، ئێمەیان بردە لای ئاســنگەر تا بە زنجیری ئســن کۆتوبەنـدمـان بکـا، قۆنـاغی یەکەم کۆتکردنی قـاچەکـان بوو بە شـــیشـــێکی ئـاســـنی "٣٠"ســـانتیمەتر دەبوو و کۆتاییەکەی دوو ئاڵقەبوو دەوری قاچەکانی دەدا و بە بزمارێکی ئاسـن دەبەسـترا وئەگەر ئاسـنگەر نەیشـکاندبایە نەدەکرایەوە و ڕۆیشـتنی بەئێش بوو و خەو و ئامیی لەبەر دەبڕیی.

بەو دیمەنەوە چووینە بەشـــی ســـیاســـیی بەندیخانە، بەڵام ئەوە بۆ هاوڕێیانی پێشـــتری لەوێبوون ئاســـایی بوو، هاوڕێیان بەخۆشـــحاڵییەوە پێشـــوازییان لێکردین و گەرماویان بۆ داخستین تا خۆمان بشـۆین و ژەمە خۆراکێکیان بۆ ئامادەکردین و ئەوجا ڕایەخ تا تۆزێ وچان بدەین.

ئەو بەندیخانەیە هەندێ کەســی تێدابوو کە بەردەوام لەوێ دەمانەوە، ئەو کەســانە خزم و ناســیاوی نزیکی پیاوانی دەســەڵاتان هەبوو و هەر لەســەر لیســتی گواســتنەوە دەمانەوە، بەڵام بێ ئەوەی بیـانگوازنەوە. دوای چەنـد ڕۆژێـک هـاوڕێیـان نـافیع یونس و جەمـاڵ حەیدەری و ئەحمەد غەفور و چەندانی دی گواسترانەوە بەندیخانە نوگرە سەلمانی بیابان، کە دووبارە دەرگای بۆ وەرگرتنی ئەو بەندییە سیاسییانە کردبووەوە کە حوکمی گرانیان هەبوو. ئەوانەی بەبەردەوامی مانەوە منو شـــەریف ئەلشـــێخی پارێزەر و عەبدولڕەحیم شـــەریف و ســـەفوەت ئەمین زەکی و عەبدولجەبار شـــەوکەت ســـڕی حوســـێن ئەحمەد ئەلڕەزی"ســـەلام عادل" و عەلی حوســـین بەگی جاف و عەلی فەتاح دزەیی و ئیبراهیم ئەحمەد و جەلیل هۆشـــیـار بووین و ئەو دووەی دواییـان لە حیزبی دیموکراســـیی کوردســتانی بوون لە لیژنەی هاوکاریی نیشــتمانی و لەگەڵ ســوبحی محەممەد قەبانچی و ژمـارەیەکی دیکەی بەنـدکراوەکـان. کە منیش لە شـــیوعییەکـانی دیکەی بەنـدیخـانەکە کۆنتربووم و لەســـەر پێشـــنیاری هاوڕێیان جەماڵ حەیدەری و نافیع یونس و ئەحمەد غەفور و ئەوانیدیشلە بەندیخانەکە بوومە بەرپرسی یەکەم و عەبدولجەبار سەوکەتیشمان کردە نوێنەر بۆ هەرکارێکی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی هەمان بێ.

چونکە حیزبیش لەدەرەوە لێدانی کوسندەی بەرکەوتبوو، ئیدی خۆمان لەوەی لادەدا لەگەڵ بەڕێوەبەریی بەندیخانە یەکانگیربین و، بارە کۆمەڵایەتی و خانەوادەییەکەمان لێنەدەگەڕا بەڕێوەبەریی بەندیخانە دەســـتدرێژیمان بکاتە ســـەر. ئەنجوومەنی عورفیی ســـەربازییس

بەردەام كۆمەڵە بەندیی سیاسیی دیكەی ڕەوانەی بەندیخانەكە دەكرد و، لەوێرا دەناردرانە نوگرە سەلمان و كووت.
بڕێكی باشی خواردنی لە قوتوونراوی هەمەجۆرمان لا كەڵەكە ببوو، كە لە كەسووكاریش نزیک بووین ئیدی ژەمەخۆراكیان بۆ دەهێناین و پێویســـتمان بەو خواردنە لە قوتوونراوە نەبوو. من، لەگەڵ هەموو كۆمەڵێكی ڕەوانە دەكران، بۆ بەندییەكانی نوگرە ســـەلمانم دەناردن.
گرنگترین كاری بێ ئاگاداریی بەندییەكان لە بەندیخانە كردم و، بۆم بووە ســـەرئێشـــە، ئەویش ئەوەبوو زانیمان چاپخانەیەک لە دەرەوە هەیە و هیی كەســـیكە و دەیەوێ لەكۆڵ خۆی بكاتەوە و ڕێكدەكەون بە ٣٨ دینار بیكڕن. ئەو پارەیەی بۆ هاوڕێیان دەهات لای من كۆدەبووەوە تا هەندێ پێداویســـتیی پێبكڕین.ئیدی ئەو برە پارەیەم بۆ كڕینی چاپخانەكە هەنارد و درایە ڕێكخراوی حیزبیی لە بەغدا خۆی ڕێكخســـتبووەوە و، توانیی ســـەرلەنوێ ڕۆژنامە و بەیاننامە بڵاوبكاتەوە. لە بەندیخانە پێویســـتمان بە برەپارەیەک بوو بۆ كڕینی هەندێ پێداویستی، بەڵام پارەكە لەبەردەستدا نەبوو، لەسایەی گومانی هەندێ هاوڕێ و متمانەی هەندێكی دیداوای ئەو پارەیەم لە شـــێخ عەتای برام كرد و ئەویش دایمێ و پێویستمان بە ڕادیۆیەک بوو تا گویمان لە دەنگوباس بێ، شێخ ئەویشی لەژێر مەنجەڵێكی گورەی پەردەپڵاو هێنا و توانیمان بێ پشـــكنین بیهێنینە ژوورەوە،"ســـەعدون مەحمود ڕامز"ی مەئمووری بەندیخانە دەستی لە هینانی هەندێ كەلوپەل شل دەكرد.

## مشتومڕێکی توند لەگەڵ ماجید مستەفای وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی:

بەڕێز ماجید مستەفا، وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتیبوو و بەڕێوەبەریی بەندیخانەکانیس سەر بەوێ بوو، کە پێشتر باسی ئەو پیاوەم کردووە، ڕۆژێکیان بە ئاواڵیی بەڕێوەبەری گشتیی بەندەخانەکان و ساڵح فەوزیی بەڕێوبەری بەندیخانەی ناوەندیی بەغدا و چەندانی دی سەردانی بەندیخانەیان کرد، کە نوێنەریشمان بۆ سەردانیی بەرپرسان عەبدولجەبار شەوکەت بوو، ئیدی لە بەندیخانە پێشوازیی لێکردن و داواکارییەکانی پەیوەست بە بارودۆخی خۆمانی لە بەندیخانە خستە بەردەمیان و پەیوەندیم پێیەوە کرد تا داوای لێ بکەم مادام سەردانیکەر وەزیری دەوڵەتە ئەوا دەبی کێشە سەرەکییەکانمانی بۆ باس بکا کە ئەو حوکمە گرانانەیە لە ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی بەسەرماندا سەپێنراوە، ئێمە بەندیی سیاسیین و دەبێ مافە یاساییەکانی بەندیی سیاسیمان هەبێ و نابێ وەک تاوانباری ئاسایی کۆتوبەند بکرێین. کە وەزیر دیتی قسە بۆ عەبدولجەبار شەوکەت دەکەم، داوای کرد قسە بۆ ئەو بکەم و ئەویش دەیناسیم و سڵاوم لێکرد و داواکارییە سەرەکییەکانم بۆ خستەڕوو، داوامکرد بەندیخانەی نوگرەسەلمان نەمێنێ و ئێمە بە بەندیی سیاسی دابنرێین و ئەو کۆتوبەندەمان بۆ لادەن و چاوێک بە حوکمە ناڕەوایانەدا بخشێننەوە کە ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی بەسەریدا سەپاندووین، کە گوتیشم : "وەزیری بەڕێز ئێمە بەندیی سیاسیین نەک تاوانبار"، بێ هۆ لە قسەکەم توورەبوو و گوتی: "ئەگەر تاوانبار نەبوونایە کۆتوبەندیان نەدەکردن".

هەر بەو بۆنەیەوە ئەوە دێنمەوە یاد کە ڕۆژنامەی قاعیدە لە ١٩٤٥ نووسینێکی بە ناونیشانی "گەلی کورد لەبەینی هانێ و مانێ"[37] نووسیبوو و ماجید مستەفای بە "سیخوڕی فێڵباز" وەسفکردبوو و، ماجیدیس وایدەزانی من وتارەکەم نووسیوە، لەکاتێکدا ئەودەمی **هیچ** پەیوەندییەکم بە حیزبی شیوعیی عێراقی و بە وتاری ناوبراوەوە نەبوو.

لەسەر مکوڕیی بەڕێز ماجید مستەفای لە نووسینگەکەی لە کۆمپانیای "ئوور" ی بازرگانی چوومە دیدەنیی، سەبارەت بەو بابەتە پێیگوتم: "من لە ١٩٣٨ شیوعی بووم" دەیویست بڵێ کاتێک من شیوعی بووم ئێوە هیچتان لە شیوعییەت نەدەزانی. کە ئەو گوزارە زبرەیشی لە بەندیخانە لەدەم هاتەدەرێ، لەبەرچاوی ئامادەبووان قسەکەی کۆمپانیای ئوورم

---

[37] _ پەندەکە دەڵێ: لەبەینی هانێ و مانێ، بووینە دەسکی ڕحانێ. مەبەست ئەوەیە لەنێوان دوودژدا بێکەلک دەکەوین و نووسەری وتارەکەش دەبێ هی ناوچەی هەولێری بووبی چونکە ئەو پەندە بەو بنزارەی گوترایە. "ل .ب".

بەبیرهێنایەوە کە گوتبووی من شیوعی بووم و لێم پرسی:"ئەرێ ئێستا لەوکاتی خۆی بە تاوانبار دادەنێی؟"، ئیدی خێرا لە بەندیخانە جووەدەرێ و هەڕیشە و گوڕەشەی دەکرد.
ڕۆژی دواتری، ســـاڵح فەوزیی بەڕێوەبەری بەندیخانە بەدوایدا ناردم و گوتی: "پزیشـــک دەڵێ تۆ نەخۆشـــــی و بەرگەی کۆتوبەند ناگری، جا پێشـــــنیاری ئەوەیە کۆتوبەندەکەت بشکێندرێ" گوتم:"من تەندروستی زۆر باشە و ئەگەر کۆتوبەندی هەموان نەسکێنن، هیچ پاســاوێک نییە تا بەتەنێ کۆتوبەندی من بشـکێنن"، دوای چەند ڕۆژێک بڕیارێک لە لیژنەی پزیشکی دەرچوو و کۆتوبەندی هەمووانیان شکاند.

## دادگاییکردنی عەبدولڕەحیم شەریفی سەرکردە لە حیزبی شەعب:

عەبدولڕەحیم شــەریف یەک لە ســـەرکردە ســـەرەکییەکانی حیزبی شـــەعب بوو و ئەو حیزبەش دوای مۆڵەتی حیزبە سیاسییەکان لە٢ی نیسانی ١٩٤٦ بە ئاشکرا کاری دەکرد و ســـەرۆکەکەی عەزیز شـــەریف بوو. کە حکوومەتیش ئەو ئازادییە دیموکراســـییانەی سەندەوە، پێشتری، لەژێر فشاری کارە جەماوەرییەکانی ناوخۆ و دۆرانی نازیزم لە دنیا، ناچارکرابوو دانیان پێدا بنێ، ئەوا حیزبی شـــەعبش شـــەرعییەتەکەی لێســـەندرایەوە و ناچاربوو بە نهێنی کاربکا. حیزبی ســـەعب لە ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ بەشـــدار بیوو و چەدین شەهیدی دابوو، ئیدی ڕوون و ئاشکرا دیاربوو ئەو حیزبەش بەشی خۆی لە ســـتەم و تۆقاندنی حکوومەت بەردەکەوێ و، عەبدولڕەحیم شـــەریفیش لە بەرایی ئەو کەسانە بوو کە حوکمێکی ستەمکارانەی بەسەردا درا.

عەبدولڕەحیم شـــەریف کەســـایەتییەکی نەرم وخاکەڕا و ڕووخۆش بوو و بگرە لە کاتە تەنگ و ناخۆشەکانیش هەر وابوو. هەندێ شیوعی لە کەمکردنەوەی ڕۆڵی حیزبی شەعب لە بزووتنەوەی نیشـــتمانیدا تێیاندەپەڕاند و هەندێ قســـەیان وەبەرگوێی عەبدولڕەحیمیدا دەداکە نیشانەی هەڵسەنگاندنی ڕۆڵی حیزبە نیشتمانییەکانی دیکە بوو و، بەتایبەتییس لەو ماوەیەی حەمید عوســـمان دەســـتی بەســـەر ســـەرکردایەتیی حیزبدا گرتبوو و یەک لە ســـەندیکاییەکانی، کە عەبدولحەســـەن عەبدولجەبار بوو، کردبووە لێپرســـراوی ناوچەی بەندیخانەی بەغدا و، یەکەم کاری ئەو کابرایە کردی دەرکردنی عەبدولڕەحیم شـــەریفی حیزبی شەعب و ئیبراهیم ئەحمەد و ڕەشید عەبدولقادری حیزبی دیموکراسیی کوردستان و جەلیل هۆشـیار و کامل قەزانچی و چەندانی دیکەی لە ڕێکخراوەکەی بەندیخانە دەرکرد کە ڕێکخراوێکی حیزبی نەبوو و شیوعییەکان بۆ ڕێکخستنی ژیانی بەندییەکان و پاراستنی مافەکانیان سەرکردایەتییان دەکرد.

عەبـدولڕەحیم بەنهێنی پەیوەنـدیی بە حیزبەکەیەوە دەکرد و، ڕۆژێکیـان چووە دیـدەنیی کەســـوکار و برادەرەکانی، پشـــکنینە ئاســـاییەکانی بۆ کرا، بەڵام نامەیەکی حیزبییان لەلا دیتەوە کە دەیویســـــت بۆ هەڤاڵەکانی بەغدا بنێرێ. بەڕێوەبەریی بەندیخانە نامەکەی بە عەبدولڕەحیمەوە هەناردە لێکۆڵینەوەکانی تاوان تا لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دا بکرێ. دوای لێکۆڵینەوەیەکی خێراش هەواڵەی دادگای ســـزای بەغدا کرا و ســـەرباری حوکمەکەی پێشترێی دووساڵی دیکەیشیان بۆ بڕییەوە.

عەبدولڕەحیم بە پێکەنینەوە هاتەوە، لێمان پرسی: چەند حوکمدرای؟ گوتی دادوەر دووساڵی بەندی دامێ، بەڵام حیلەیەکم لەگەڵ کرد و ماوەی بەندیەکەم لێ تێکدا. گوتمان چۆن؟ گوتی دادوەر پرسیاری تەمەنی کردم و گوتم ٤٠ ساڵم، لە ڕاستیدا ٤٢ ساڵم و لە بەرانبەر ئەو دووساڵە نوێیەی بەندیم دووساڵم لە تەمەنم کەمکردەوە. ئەو ئاوا بەگاڵتەجاڕی و نوکتەوە بەرەوڕووی حوکمەکانی بەندی دەبووەوە.
ماوەیەک لە ماوەکانی بەندیخانەی بەغداما ن، شەکر و چامان کەم ببوو ئەودەمی من لێپرسراوی ڕێکخراوی حیزبیی بەندیخانەبووم، شیوعییەکانم بە نهێنی کۆکردەوە وتیمگەیاندن دۆخەکە چۆنە وبۆم ڕوونکردنەوە کە خەڵکی ناحیزبی و هیی حیزبە نیشتمانییەکانی دیکەشمان لەگەڵدا دەژین، پێشنیارم بۆ کردن وەک جاران چا لێبنێن، بەڵام پێشکەشی ەوانەسی بکەن کە شیوعی نین و شیوعییەکانیش ئەوەیان بە سنگێکی فراوانەوە قبووڵ کرد. ئیدی سووسەم بۆبەرپرسی دابەسکردنی چای کرد، کە هاوڕێ محەممەد ئەمین حەیدەری بوو،تا چا بداتە ئەوانەی شیوعییش نین هەتا ئەو تەنگدەستییە تەواودەبێ و ئەویش وایکرد. عەبدولڕەحیم شەریف تێبینیی ئەوەی کردبوو ئەوەی چا دابەشدەکا دەیداتە هەندێک و هەندێک نا، هات و پرسیاری هۆیەکەی کرد و، منیش ڕاستییەکەم پێگوت. گوتی: بۆ بەچیم دادەنێن، ئەدی یەکێک نیمە لە ئێوە؟ ئەدی منیش قوربانی بەو ستانە نادەم کە ئێوە قوربانیی پێ دەدەن؟ هیوادارم بەو هاوڕێیەتا بڵێی وەک هاوڕێیەکی خۆتان مامەڵەم لەگەڵ بکا. ئیدی سوپاسی هەست و هاوکاری و هاوڕێیم کرد و لە ژیانی سەختی بەندیخانە بووینە هاوبەشی، لەکاتێکدا ئەوانیدی ئەو هەستەیان نەبوو، یانیش هەیانبوو بەڵام چاویان لێ دەنووقاند.

## حەمید عوسمان، لە نوگرەسەلمان، بزووتنەوەیەکی کودەتایی دەکا:

حەمید عوسمان بەندیی هەتاهەتای بۆ بڕابووەوە و لە بەندیخانەی نوگرە سەلمان بوو و، زۆربەی کادیرە سەرەکییەکانی حیزبیش هەر لەو بەندیخانەیەبوون. بەرپرسی یەکەمی ئەوێش هاوڕێ سالم عوبێد نوعمان بوو، پێش ئەوەی بشگیرێ ئەندامی لیژنەی مەرکەزی بوو، حەمید عوسمان بەندییەکانی لەدژی سەرکردایەتیی ڕێکخراوی حیزبیی ئەوێ دنەدا و بارودۆخە تەنگەکەی بەندییەکان و هەندێ کەمتەرخەمی و خەمساردیی کارەکانی لیژنەی ئەوێی قۆستەوە، ئەوەش بووە هۆی دروستبوونی دووبەرەکیی ڕێکخراوی حیزبیی ئەوێ و هەبوونی دوو ڕێکخستنی حیزبی. بەڵام حەمید عوسمان لە کارە دووبەرەکییەکانی بەردەوام بوو تا دەست بەسەر ڕیکخراوە حیزبییەکانی بەندیخانەکانی دیکەشدا بگرێ. ئیدی "عەبدولحەسەن عەبدولجەبار"ی کرێکاری سەندیکایی بە هەنجەتی چارەسەری پزیشکی هەناردە بەندیخانەی بەغدا تا بەرپرسیارییەکە لە من وەرگرێ، منیش بۆ ئەوەی لە دووبەرەکییەکی حیزبی وەک ئەوەی نوگرەسەلمان دووربین ملم بۆ دا، بەڵام هەڵسوکەوتەکانی کاریان لە بارودۆخی بەندییەکانی بەغدا کردبوو.
وەک باسم کرد، نوێنەری حیزبی دیکەش لەبەندیخانەی بەغدا هەبوون. هەموو ئەندامانی لیژنەی بەندکراویشی جیاکردەوە و لەوانیدیی دابڕین و، لەوەش پتر بەبێڕێزییەوە مامەڵەی لەگەڵ خەڵکەکەی دی دەکرد. شەوێکیان کە کۆببووینەوە و گۆرانی سیاسیمان دەگوت، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بەلاماندا تێپەڕی و عەبدولحەسەن ڕووی گۆرانیی لەوی کرد و گوتی: "هەلپەرستینە بەشتان مردنە". ناڕەزاییم بەرانبەری دەربڕی و گوتم: "هاوڕێ، ئەوانە نیشتمان پەروەرن و بە تۆمەتی هاوکاریی حیزبی شیوعیی ڕۆژانی ڕاپەڕینی لیژنەی هاوکاریی نیشتمانی بەندکراون و هەلپەرست نینە، دابڕینیان لە ئێمە هەڵەیەکی گەورەبوو و ئەگەر لە بەندیخانەدا نەتوانین هاوکاریی یەکدی بکەین ئەی لەکوێ بیکەین؟". بەڵام لەسەر هەڵوێستە هەڵەکەی سووربوو و پەنای بۆ هەڵوێستی هاوڕێ فەهد برد کە لە بەندیخانەی کووت بەرانبەر داود ئەلسائیغ نواندبووی، بەڵام ئێستا ئەو دوو هەڵوێستە زۆر لەیەکدی جودان. داود سائیغ تا دوا هەناسەی ژیانی بەناوی شیوعیبوونەوە کاری دووبەرکی و هەلپەرستیی دەکرد و دژی حیزبی شیوعی بوو، لەکاتێکدا ئەوانە نیشتمان پەروەرن و، ئێستا چەندیش لۆمەی خۆم دەکەم چونکە بەتوندی ڕووبەڕووی ئەو هەڵوێستە هەڵەیە نەوەستام و با بەهەر نرخێکیش بووایە، چوندیشم ئازار دەکێشا کە ئیبراهیم ئەحمەد و جەلیل وشیاری برادەرم بدیتبا دەبووایە ڕوو لەولای بکەم، لەبەر

هیچیش نا هەر لەبەر ئەوەی شـــیوعی نەبوون، لەکاتێکدا پێکەوە لەیەک ژووربووین و باســـی بابەتی هەمەجۆری شـــێوازی هاوکاریی نێوان هەردوو حیزبی شـــیوعی و دیموکراسیی کوردیمان دەکرد.

مامۆســـتا ئیبراهیم ئەحمەد چەندین نووســـراوی وەبیرهێنانەوەی دایە عەبدولحەســـەن عەبدولجەبار و گلەیی لە پەیوەنیی خراپهەڵوێستی هەڵەیان دەگرت، بەڵام عەبدولحەسـەن ئەوەی بە کاێکی دروســـتی بەرانبەر "هەلپەرســـتان" دادەنا و، عەبدولحەســـەن ئەندامێکی کرێکاریی کرێکارەکانی بەندەری بەسرا بوو و، لە مانگرتنەکانی کرێکاران بەشدار ببوو و ســـەندیکاییەکی باش بوو و بەندیی تاهەتای بۆ بڕابووەوە، بەڵام کەمترین زانیاریی مارکســـیزم-لینینیزمی نەبوو و وەک گوتم لاســـایی لیبڕاوییەکەی فەهدی دەکردەوە تا لەجێی نابەجێ و بە وشـــکی لەبەرانبەر هەلپەرســـتەکانی بزووتنەوەی شـــیوعی بەکاریان بهێنێ.

## فیکری ڕاسڕەو و چەپڕەوی سەرکردایەتیی بەهادین نوری:[38]

لە ئەنجامی ئەو خیانەتەی کمەڵێ شـــیوعی لە حیزبەکەیان و هاوڕێکانیان کرد، لەوانەش عەبدولوەهاب عەبدولڕەزاق و یەهوودا و ماڵک سیف و فوئاد بەهجەت و مەجید ڕەئوف و ڕەفیق چالاک و کەســـانی دیکەیش، ئیدی حیزبی شـــیوعی یەک لەدوای یەک لەســـەر سێدارەکانی بەغدا دەستی لێ وەشێندرا و سەدان سەرکردەی حیزب وئەندامانی بردرانە بەردەم دادگا ســـەربازییەکان و بە حوکمی کاری گرانەوە لەوێ هاتنەدەرێ و بەرەو بەندیخانەکان بردران.

ئەو ئەندامانەی ســـەرکردایەتیی لە گرتن دەرباز ببوون لەجیاتی ئەوەی پاشـــماوەی ئاڵقەکانی حیزب کۆکەنەوە و بەڕێکی بۆ پاراســـتنیان بکشـــێنەوە، هەندێ ئەندامی لەو بارودۆخیدا سەرکردایەتیی حیزبیان دەکرد، لەسەر ڕێچکەی سەرچڵیی دوور لە مارکسیزم بەردەوامبوون. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی لە جەماوەر داببڕێن و ســـەرلەنوێ لەســـەریەک دەست لە حیزب بوەشێندرێتەوە. لەو سەرکردانەش هاوڕێ بەهادین نوری بوو کە دواترێ بووە سەرکردە.

یەک لە بیرۆکە چەپڕەوەکانی هاوڕێ بەها بانگەشەکەی بوو بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی میللی لەجیاتیی بەرەی نیشـــتمانی. ئەوەش مانای وابوو هێڵێکی ڕاســـت و چەپ بەســـەر ڕۆڵی بۆرژوازیای نیشـــتمانیی عێراقیدا بهێنرێ، وەک ئەوەی لەو قۆناغەدا هەرچی بارگەی شۆڕشگێڕییە نەیمابێ، لەکاتێکدا بۆرژوازیا نەگەیشتبووە دەسەڵات و ببەرژەوەندییەکانی خۆی دەســـتەبەر نەکردبوو تا خۆی لە بزووتنەوەی نیشـــتمانی بتەکێنێ. چەمکی بەرەی میللییش ئیحای ئەوەی دەدا حیزبی شـــیوعی ســـەرکردایەتیی بەرە و بزووتنەوە بکا، لەکاتێکدا حیزبی شـــیوعی لە دۆخێکدا نەبوو بتوانێ بەرەیەکیلەو جۆرە بەرپا بکا و ســـەرکردایەتییشـــی بکا. ئەو بیرۆکـانەس تەنیـا بەوەی لێکـدەدرێتەوە کە بیروڕای هەڵپەرستانەی چەپڕەوین.

دووەم شـــتی لۆمەی هاوڕێ بەهادینی لەســـەر دەکرێ ئەوەیە کە ئەو باوەڕنامەکەی، دەربڕینی بیرۆکەیەک بوو ڕەخنەی لە هەڵوێســـتەکانی ســـاڵانی چلی ســـەدەی بیســـتەمی

---

[38] _ بەهادین نوری:لە ١٩٢٧ لە سـلێمانی لە خێزانێکی جووتیاری ئایینذۆسـتی گوزەران خۆش لەدایکبووە. ئامادەیی تەواوکردووە و، لە ١٩٤٤ چووەتە ڕیزی حیزبی شیوعی. لە ١٩٤٩- ١٩٥٣ سکرتێری لیژنەی مەرکەزیی حیزب بووە، لە نیســـانی ١٩٥٣ گیراوە و لە ١٩٥٥ ڕەگەزنامەی عێراقیی لێســـەندراوەتەوە. لە ١٩٥٨_ ١٩٦١ بە ئەندامی مەکتەبی ســیاســی هەڵبژێردراوە و، پاشـــانیش لە ١٩٦٤ هەتا نەوەدەکان ئەندامی لیژنەی مەرکەزی بووە . لە ١ی ١٢ی ٢٠٢٠ دوای ئەوەی دووچاری ڤایرۆســـی کۆرۆنا بوو کۆچی دوایی کرد. بۆ زیاتر: المصـــدر الســـابق، ص١٩؛ نقلا عن حنا بطاطو، المصدر السابق، ج٢، ص٣٢٢.

ســـكرتێری گشـــتیی حیزب دەگرت دەربـارەی مـافی كوردان لەوەی خۆیـان بڕیـاری چارەنووســـی خۆیان بدەن، گوایە ئەوە "هەلپەرســـتی"یە. بەڵام با بچینەوە ســـەر ئەوەی هاوڕێ فەهد لە ڕۆژنامەی قاعیدەی زمانحاڵی حیزبی شیوعی لە ١٩٤٥ نووسیویەتی، كاتی داوا لە كوردان دەكـا خەبـات بۆ دیموكراســـییەت بكەن چونكە "تەنیـا لە ســـایەی دیموكراسییەت كورد دەتوانن ئەوەی بە ئاشكرا دەربڕن داخوا دەیانەوێ جودا ببنەوە یان لەناو دەوڵەتی عێراق بمێننەوە". باشـــە ئەوە دانپێدانانێكی ڕاشـــكاوانەی هاوڕێ فەهد نییە بەوەی كورد مافی خۆیانە جودابینەوە و دەوڵەتێكی ســـەربەخۆ دامەزرێنن یان بڕیاری مانەوە لەناو عێراق بدەن و شـــێوەیەكی دیكەی دەســـەڵات هەڵبژێرن؟ باشـــە دەبێ مافی چارەی خۆ نووســـین لەوەی زیاتر چ بێ ئەگەر گەلی باســـكراو بتوانێ مافی جودابوونەوە هەڵبژێرێ، ئەرێ هەڵوێستی هاوڕێ بەها، بە ڕەتكردنەوەی هەڵوێستی ڕاشكاو و ڕەگاژۆی هاوڕێ فەهد ســـەبارەت بە مافی كوردان لە مافی چارەی خۆ نووســـین و تێیدا مافی جیابوونەوەش، بە هەڵوێستێكی ڕاستڕەو داناندرێ؟

## قەسابخانەیەک لە بەندیخانەی بەغدا:

دوای ئەوەی مانگرتن لە خواردن لە بەندیخانە سـیاسـییەکان درێژەی کێشـا، لەوانەش بەندیخانەی نوگرە سەلمان و کووت و بەغدا، کە داواکارییون داخستنی بەندیخانەی نوگرە سـەلمسـن و گواسـتنەوەی بەندییەکان بوو و بەپێی یاسـاش بەندییەکان مافی بەندیی سیاسییان بدرێتێ و چاویش بەو حوکمە ستەمکانەدا بخشێندرێتەوە کە لەسایەی حوکمە عورفییەکادا بەسـەریاندا سـەپاندبوون ، ئەوجا بەندییەکانیان لە هەردوو بەندیخانەی ەغدا و کووت کۆکردەوە.

بارودۆخی بەندیخانەکانی ئەو سـەردەمی بێبارییەکی سـاسـی و فیکری توندی بەخۆوە دیت، لە دۆخ و کەشـێکی سـیاسـیی ئاوادا خۆپیشـاندانەکان لە ڕاپەڕینی ١٩٥٢ لە بەغدا تەقینەوە و هەموو عێراقی گرتەوە، خەریکبوو دۆخەکە لەدەسـەلاتی حکوومەت دەربچێ، لە یەک لە خۆپیشـاندانە جەماوەرییەکانی هەسـتابوو و ڕووی لە باولموعەززەمی نزیک بەندیخانەی بەغدا کردبوو، دەینەڕاند و داوای بەردانی بەندییە سـیاسـییەکانی دەکرد، بەندییەکان بە هوتافی دژەحکوومەت وەلامیاندانەوە و داوایان دەکرد بەربدرێن، جا ئەو کارە وای لە حکوومەت کرد داوا لە نورەدین مەحمودی سـەرۆکی ئەرکانی سـوپا بکا وەزارەتێکک بەناوی سوپای عێراقی پێکبێنێ کە ئەوان ڕۆژان هاوسۆزی خۆپیشـاندەران بوو.

پێکهێنانی ئەو وەزارەتە گەلی نەخەڵەتاند، کە حکوومەتەکەی نورەدین مەحمود دەسـتی بە نرخ دادانی هەنـدێ جۆر ۆراک کرد، هـاووڵاتییەک بە گەپچـاڕییەوە برووسـکەیەکی هەناردبوو: "کە نرخی شـێلمتان دانا دڵمان ئاوی خواردەوە، بە ئومێدی خودا بەرەو پێش برۆن". ئەو کارەشـی وای لە حکوومەت کرد بیباتە پێش دادگا و بە تۆمەتی گاڵتەکردن بە بەرپرسان شەش مانگیان بەندی بۆ بڕییەوە.

بەندییەکان لەسـە ئەوەی مکوڕبوون چاوێک بەوحوکمانەدا بخشـێنرێتەوە کە بەسـەریاندا دراوە و، بەریان بدەن و مافی بەندیی سـیاسـییان بدرێتێ و بارودۆخیان لە بەندیخانە باشتر بکرێ.

دوای دوو مانگرتنی دوای یەکدیی لە بەندیخانەکان کران و هەریەکەیان نزیکەی مانگێکی خایاند و تێیدا نوعمان محەممەد سـاڵحی کادری شـیوعی مرد کە جەماوەری بەغدا بە خۆپیشـاندانێکی گەورەوە بەخاکیان سـپارد، حکوومەت ناچاربوو بەیانێک دەربکا و لە ئێسـتگەش بڵاوکرایەوە و گرنگترین شـتێکی لە بەیاننامەکەی حکوومەتدا هاتبوولیژنەیەکی بە سـەرۆکایەتیی مامۆسـتا حەبدولجەبار تەکەرلیی جێگری سـەرۆکی دادگای تەمیز لە گەورە دادوەران پێکهێنـا، تـا جـاوێـک بەو حوکمـانەدا بخشـێننەوە کە لە ئەنجوومەنە

عورفییەکان دەرچووبوون؛ تێیدا داواش لە بەندییان کرابووهەریەکەیان داوایەک پێشکەشی لیژنەکە بکا تا سەیری کێشەکەی بکرێتەوە و، دانیشی بە زۆربەی ئەو مافانەدا نابوو کە لە سیستەمی حوکمدراوەکا سیاسییەکاندا هاتبوو، هەر بەڕاستیش کۆتوبەندی ئاسنینی بەندییەکانیانلادا و ڕێیاندا کەسوکاریان هەفتەی دوو جار بێنە سەردانیان و ڕێ درا کتێبیشیان بۆ خوێندنەوە بۆ بێنن.
حکوومەت، لەژێر فشاری جەماوەر، ناچاربوو دەستبەرداری هەندێ شت بێ، کەچی چاوی لە هەلێک بوو تا ئەو دەسکەوتانە بسەنێتەوە و، بەندییە سیاسییەکان لە بەندیخانەیەک دوورخاتەوە کە بکەوێتە جەرگەی بەغدای ڕەنگە جەماوەر لە دۆخێکی تایبەتدا بەسەر بەندیخانەکەدا بدا و بەندییەکان ئازاد بکەن. لە سەرەتای ١٩٥٣ دەبگۆیەک لە بەندیخانە بڵاوبووەوە گوایە حکوومەت بەنیازە ئەو بەندییانەی لە بەندیخانەی بەغدان کۆمەڵ کۆمەڵ بگوازێتەوە بۆ بەندیخانەی باقووبە، تا بتوانێ ئەو دەستکەوتانە بسەنێتەوە و دیسان کۆتوبەندیان بکاتەوە و ناچاریان بکا جلی بەندیخانە لەبەر بکەن.
هەر بەڕاستییش، بەرەبەیانی ١٧ی حوزەیرانی ١٩٥٣، قۆمیسەری بەندیخانە هاتە بەر دەرگای بەندیخانە و لیستێکی بەدەستەوەبوو ناوی بیست بەندیی تێدابوو، بۆی خوێندینەوە و پێیگوتین گواستنەوەکە سبەینێ سەعات یەک جێبەجێ دەکرێ.
ئەودەمی من، لەگەڵ یوسف حەننا ئەلقەس و گریگۆر بدرۆسیان و حاجی بەشیری بەبنەچە سەنیگالی بوو و لە حیللە ژیابوو و کاسانی دیکەش، لەدەرەوەی ڕێکخراوی حیزبیی بەندیخانەبووین. ڕێکخراوی حیزبی هەندێ نووسراوی داواکاریی پێشکەش دەکرد زێدەڕۆییەکی زۆری تێدابوو، لەکتێکدا من پێموابوو ڕاپەڕین کۆتاییهاتووە و چەندین دەستەی نوێی تێکۆشەران بە خۆ و بە حوکمی گرانەوە ڕەوانەی بەندیخانان کراون و، نوگرە سەلمانی بیابانیش دیسان کراوەتەوە و چەندین دەستەی حوکمی گرانیان بەسەردا دراوە ڕەوانەی ئەوێ کراون. ئاخر چۆن فێری هێرش و بەسەردادانی پێگەکانی دوژمن بووبووین،دەبێ ئاواش فێربین چۆن بە ڕێکی بکشێینەوە تا دوژمن نەتوانێ بمانشکێنێ.
دووربەدوور ڕەخنەم لە هەڵسوکەوتی ڕێکخراوی حیزبی دەگرت و داڕشتنینووسراوی داوایەکانم بە هەڵە دادەناکە پێشکەش دەکران و پێموابوو نەوت بە ئاگردا دەکەن. کە ئێستاش بەڕێوەبەرێکی تازەیان بۆ بەندیخانە هێنابوو و ئەویش"عەبدولجەبار ئەیوب" بوو و بەوە ناسرابوو کێشە و بیانگان دروستدەکا تا ئازاری بەندییان بدا.
ڕۆژێکیان سەلیم چەلەبیی بەرپرسی یەکەمی لیژنەی حیزبی سەردانی کردم و داخوا لەو دۆخە تەنگەدا چۆن هەڵسوکەوت بکرێ، دوای ئەوەی بارودۆخی دای ڕاپەڕین و هێرشە دڕندانەکەی حکوومەتی بۆ باسکردم، پێشنیارم بۆ کرد بەهێمنی و هاوئاهەنگیی دەرەوەی

بەندیخانە بجوولێتەوە و، شێوازی ئەو نووسینانەی داواکاری بگۆڕن کە داوای جێبەجێکردنی یاساو سیستەمەکانیان دەکرد و دەریشی بخەن کە لاریمان لەوەی نیی بمانگوازنەوە بەندیخانەی باقووبە، بەو مەرجەی حکوومەت ئەو شتانەی خوارەوە دەستەبەر بکا:

١_ بەندییەکان لەهەر دەستدرێژییەک پارێزراوبن.

٢_ ئەو دەستکەوتانەی لە ١٩٥٢ بەدەستیان هێناوە هەر بمێنن.

٣_ هەموو پێکەوە بگوازرێنەوە نەک دەستەدەستە.

٤_ گواستنەوەیان تا دوای دیداری کەسوکاریان دوابخرێ تا ئەو پێداویستییانەیان بۆ بێنن کە لەوێ پێویستیان پێی دەبێ.

سەلیم چەلەبی بە پێشنرەکانم ڕازیبوو و، داوای لێکردم نووسینێکی داواکاری بە زمانێکی ماقوول بنووسم و منیش نووسیم. بەڵام ئەو پاشەکشەیە درەنگ کەوتبوو و، بەڕێوەبەری بەندیخانە پێش پێشکەشکردنی داواکارییەکان هات و ناوی بیست بەندیی خوێندەوە، کە من یەکێکیان بووم، تا خۆیان بۆ گاستنەوە ئامادە بکەن.

ڕێکخراوی حیزبیی بەندیخانە بڕیاریدا بەدەم ئەو فەرمانەوە نەچێ و، نووسینی داواکارییەکەی پێشککەس کرد و ئەو داواکارییانەی تێدابوو کە لەسەرەوە باسم کرد و، کەشێکی گەرموگوڕی بەرگری لە بەندیخانە تەشەنەی کرد ئەگەر حکوومەت هێز بەکاربێنێ. ڕۆژی دواترێ کە داوای گواستنەوەی بەندییەکانیان کرد، نەچوونە بن بار و داوای ئەو شتانەیان کرد لە نووسینەکەدا هاتبوو، بەڵام حکوومەت بەنیازبوو دەستکەوتەکانیان لێ بسێنێتەوە و دووریان بخاتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەوکارەی بە بەرپاکردنی قەسابخانەیەکیش بۆ بچێتەسەر.

سەعات یەکی دوای نیوەڕۆی ڕۆژی دواترێ عەدولجەبار ئەیوبی بەڕێوەبەری بەندیخانە، بەخۆ و بە کۆمەڵێ بەندیوان و پۆلیسەوە هاتن ڕاوەستان و بە کەلەپچە و چەکەوە داوایان لەو بەندییانە کرد، کە پێیانگوترابوو دەگوازرێنەوە، بێنە دەرەوە، کە من یەکێکیان بوم، کە ئەو مەرجانەی گواستنەوەشمان پێگوتەوە لە نووسینەکەدا نووسیبوومان، دەستی بە جنێو و هەڕیشان کرد. دوای نیو سەعات، واتە "١:٤٠" ، سەلمان بەیاتیی بریکاری موتەسەڕیفی بەغدا هات. لەدەرگای بەندیخانەوە خۆی و پۆستەکەی پێ ناساندین و بڕیارەکەی وەزیری ناوخۆی پێڕاگەیاندین، کە ئەودەمی حوسامەدین جومعەبوو، داوای لێکردین مل بۆ فەرمانەکە بدەین و یاخی نەبین و، ئەویش، لە سنووری لیوایەکەیدا دەستەبەری سەلامەتیی بەندییەکان دەکا، وەگەر نا ئەوا حکوومەت، بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی، ڕێوشوێنە یاساییەکان دەگرێتەبەر. کە بەندییەکانیش سووربوون دەبی بەپێی ئەو مەرجانە

بگوازرڕێنەوە کە لە نووسینەکەیان پێشکەشیان کردووە، گوتی: "کەواتە من بەرپرسیاری ئەوەی نیمە کە بەسەرتان دێ"، و لە بەندیخانە چووە دەرێ.
ئەوجا بریکاری موتەسەڕیفی هاتەوە و، دوای تۆزێکیش دیتمان ژمارەیەکی زۆری پۆلیس بەجەکەوە لەنێوان بەندیخانە و دیواری دەورەی کۆبوونەوە و هەریەکە و تۆبزێکی بەدەستەوە بوو و خوودەی پۆلاییان لەسەری نابوو.هەستیشمان کرد شەقامەکە لە مەیدانی بابولمەعەزەمڕا لەوجێی دەچووەوە سەر ئەعزەمیەی داخرابوو و هاتوچۆی پێدا نەدەکرا و لەهەروزەنای پۆلیسان بترازێ دەنگی دیی لێوە نەدەهات.
ئەوجا عەبدولجەبار فەهمیی بەڕێوەبەری پۆلیسی بەغدا هات وژمارەیەک پۆلیسی لەگەڵدابوو نەردیوانی داریان پێبوو لەگەڵ تفەنگی بۆمبی فرمێسک ڕێژ و چوونە سەربانی هۆڵەکانی بەندیخانە و لەێش هەمووشیانەوە بەڕێوەبەری پۆلیس.
هەوڵیان دا لە دەرگای بندیخانەوە بێنە ژووری، بەڵام بەندییەکان دایاننە بەر بەرد و گڕی نەوت و ئاوی گەرم و کشاندنیانەوەو، ئیبراهیم شەجەر لە بەرایی کۆەڵێک پۆلیس بوو و هانیدەدان لە دەرگاکەوە بچنە ژووری و دەیگوت:" ئەوانە جوونە و دەمانەوێ ڕەوانەی ئیسرائیلیان بکەین و ڕازی نین". دنەی دەدان تا لە دەرگا بێنە ژووری، کە لەبەردەم خۆڕاگریی بەندییەکانیش دەستەپاچەبوون، لوولە ئاوی ئۆتۆمۆبیلی ئاگرکوژێنەوەیان هێنا تا بەندییەکان لە دەرگاکە دوورخەنەوە و بە دوودەوان هەردوو سپپانی دەرگاکە برووخێنن. بەڵام ئاوەکەش سوودی نەبوو، ئیدی عەبدوجەبار فەهمیی بەڕێوەبەری پۆلیس فەرمانی بەکارهێنانی بۆمبی گازی فرمێسک ڕێژی دا و، دەیان بۆمبیان بەرەو گوڕەپانی بەندیخانە تەقاند، بەڵام بەندییەکان ڕێوشوێنی خۆپارێزییان گرتبووەبەر و، خاولییان بە تێکەڵەی ئاو و سرکە تەرکردبوو و دەست و دەموچاویان پێ سڕییەوە و بۆمبەکانیان دەگرتەوە و لەو پۆلیسانەیان دەگرتەوە کە لەنێوان هەردوو دیواری بەندیخانە کۆکرابوونەوە، ئیدی تا لە دووکەڵی گازەکە دەربازبن، ڕایانکرد.
بەڕێوەبەری بەندیخانە فەرمانیدا تەقە لە بەندییەکان بکەن، ئیدی لە دەرگا و لە سەربانێڕا و لە دەلاقەی هۆڵەکانەوە فیشەک بەسەرژوورەوەی هۆڵەکاندا باری. عەبدولجەبار ئەیوب کونێکی بچووکی لە ژووری نەهەستنی بەندیوانەکان کرد کە بەرانبەر ژووی جەمەعاتی ئالای کرێکاران بوو و لوولەی تفەنگی لەوێڕا هێنایە ژووری ومووسا سلێمانی ئەندازیار لەبەردەم دەرگای ژوورەکە وەستابوو و فیشەکێکی لە سەری دا و کوشتی ونافیع یونسی بریندار کرد و چەندی دیکەیشی بەو دەستڕێژەی بەردایەوە لەوانەش حەسەن ڕەحیم کە سەربازێکی خەڵکی چەمچەماڵ بوو و موسا سلێمانی ئەندازیاری خەڵکی هەولێر بوو و ئیسماعیل قرتەی بەغدایی و ئەحمەد حەسوونی مامۆستای خەڵکی موسەیەب و چەندی

دیکەش. دوای رووخاندنی دەرگای بەندیخانە، پۆلیسی نهێنیی ئیبراهیم حەسەن شەجەری ئەفسەر سەرکردەیان بوو بە ژووری وەربوون و ئەوی تووسی بهاتبان تەقەیان لێ دەکرد، شەڕەکە ئاوکووف نەبوو، ئیدی بڕیاری پاشەکشە درا.بەندییەکان، دوای ئەوەی سروودی نێونەتەوەییان گوت:

هەستن ئەی هۆزی بەس مەینەتان.... دیلانی برسیەتیی دنیا

کشانەوە نا ڕاڕەوەکانی بەندیخانە و ئاماژە درایە بەندییەکان بریندارەکان هەڵگرن و بکشێنەوە ناو هۆڵەکان، ئەحمەد حەسوونی مامستا لە گۆڕەپانەکە و لە نزیک دەرگاکە لە گۆمی خوێن و ئاودا گەوزیبوو، یەکەم ڕحژی دینەیی بەندییانم بیرکەوتەوە کە ژنەگەنجە جوانەکەی و کیژۆڵە ساوایە وەک پەپوولەکەی هاتبوون و دەستی لە ملی باوکی دەکرد و لنینەدەبووەوە، ئێستا باوکی تەرمێکی ساردوسوڕە و لەخوێندا مەلەدەکا، تەنانەی کەس ناتوانێ ڕایشیکێشیتەوە و لە زەبری پێلەقە و قۆنداغە تفەنگانیش دووریخاتەوە، ئاجی بەشیری سەنیکالیم بیرکەوتەوە، ئەو پیاوە باشەی دەوڵەمەندێکی حیلله لەحەجێڕا هێنابووی و هەستی چەوسانەوە و ڕووشکێنی وایلێکردبوو پەیوەندی بە شۆڕشگێڕانەوە بکا و ببووەتێکۆشەرێکی شۆڕشگێڕ، ئیدی گەورەکەی دەریدەکا، بەڵام ئەو ژنێکی عێراقیی ئەسمەر دەخوازێ و سێ کوڕی لێی دەبی، جا هەڵیدەگرتن و

بە برادەرەکانی نیشاندەدان و دەیگوت: دەبینن ڕەنگیان دەڵێی ڕەنگی چوکلێتە. ئەو، گوللە بەر سینەی کەوتبوو، ئەگەر کەللەسەری بە قۆنداغە تفەنگ و پۆستاڵی پۆلیسان وردوخاش نەکرابا، ڕەنگە چاکببوایەوە. هەرچی مووسا سلێمان بوو، ئەو لاوە ئەندازیارەی خوشکەکەی لەکاتی دیدارەکاندا بەخۆ و بە کیسەی پڕ جلوبەرگ و خواردنەوە بۆ براکەی پێشی هەمووان دەهاتە ناو بەندیخانە. خوشکە ئاواتی ئەوەبوو برای بەربێ ولە پرۆژەیەکی ئەندازیاری لە هەولێرێ کاربکا. مووسام دیت لەدەرگای ژوورەکە کەوتبوو و گوولەیەکی بەر ناوچەوانی کەوتبوو کەللەسەری وردکردبوو، ئەو فیسەکە ڕاوچییەکی شارەزا تەقاندبووی، ئەو ڕاوچییە عەبدولجەبار ئەیوبی بەڕێوەبەری بەندیخانە بوو. قەتم ئەو ئەو پیاوە بەتەمەنە لاوازە سەرسپییە لەبیرناچێ، ئەو ئەدیب و شاعیرەی هەموو مرۆڤایەتیی خۆشدەویست؛ محەممەد شەرارە، دیتم لە دەرگای ڕاڕەوێک ڕاوەستابوو و دارێکی بەدەستەوەبوو ئەگەر لەچۆلەکەیەکت بگرتبا لێی نەدەترسا، دەیگوت: "فاشیستینە، غایەنینە، پیاوکوژینە، واز لە لاوەکان بێنن و وەرن من بکوژن"، دارەکەم لەدەست دەرهێنا و بردمە ناو ڕاڕەوەکە. جا ئەو دڕندانە ئاگایان لە چییە، ئەاون ئەدیب و شاعیریان ناوێ، ئەوان مرۆکوژ و دڕندەیان دەوێ.

کشـاینەوە هۆڵەکان وناڵەی بریندارەکان جەرگی بنیادەمی دەبڕی و یەکەکانی فریاکەوتنی بەندییان خەریکبوون چارەســــەریان دەکردن تا لانیکەم خوێنبەربوونەکە ڕاگرن. گوێم لە عەبدولجەبار ئەیوب بوو فەرمانی بە بەندیوانەکان دەدا هاوڕێ"عەزیز ئەلشێخ" بکوژن، کە مامۆستای زانکۆبوو و ئەندا لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعیی عێراقی بوو.
لە دەرگــای هۆڵەکە نزیکبووم و دەرگــاکە داربوو و لە کونییــان داڕزابوو، ئەگەرچی بەندییەکانیش کشــابوونەوە نو هۆڵەکان، کەچی هێشــتا گوللەیان بەســـەردا دەباری و لە هەندێ هۆڵدا پەنجەرەی هەوای بنمیچ هەبوو و پۆلیس لەوێرا تفەنگیـان هێنا ژووری و چەند کەســی دیکەیان لە بەندییان کوشــت و بریندار کرد، گوێم لە چوار فیشــەک بوو لە دەرگاکە دران.
لە ڕاڕەوێک بووم کە زۆربەی بەرپرســــانی لیژنەی حیزبیی لێبوو و لەوانەش ســــەلیم چەلەبی و عەزیز ئەلشێخ، ئەو کاتەی ئیبراهیم حەسەن شەجەری ئەفسەر چوار فیشەکی بێ نیشانگرتن لە دەرگاکە دا، من لەپشتدەرگای ڕاڕەوەکە ڕاوەستابووم، ئەوجا دەرگاکەی بە پێلەقە شـــکـانـد و هـاتە نـاو ڕاڕەوەکە و دەمـانچەیەکی "برۆنینگی عەیـار ٧ملم"ی بەدەســتەوەبوو، هەر هێندەی هاتەژوورەوە فەرمانی پێکردم بەردەکەی دەســتم فڕێدەم ، گوتم ئێوە دەزانن ئێمە بێ چەکین و ئاوکووفی یەکدی نیین، دەمانچەکەت لەکیفەکەی بنێوە منیش بەردەکەم فڕێدەدەم، گوتی باشـــە ڕازیم، دەمانچەکەی لە کیفەکەی نایەوە و ئەوجا داوای لە بەرپرســی بەندیوانەکان کرد یەکیان لەگەڵی بچێ و تا پێیان بڵێ بەرگری مەکەن و ئاماژەیشــی دایە پۆلیســان تەقە ڕاگرن، بەرپرســەکان داوایان لە عەزیز ئەلشــێخ کرد ڕەگەڵی بکەوێ، بەڵام من گوێم لە دەنگی عەبدولجەبار ئەیوب بوو کە دەینەڕاند و جنێوی بە عەزیز ئەلشــێخ دەدا و بەتەمای کوشــتنی بوو، لێنەگەڕام لەگەڵ ئەفســەرەکە بچێتە دەرەوە و گوتم: تۆ لێرەبە دەنا دەتکوژن، من لەگەڵی دەچم. گوتی: تۆش دەکوژن. گوتم: گوێی مەدەرێ.
لەگەڵ ئەفســەرەکەی چوومە دەرێی ڕاڕەوەکەی چەند پۆلیسـێک بە جەکەوە هێرشـیان بۆ هێنام و ویســتیان تەقەم لێ بکەن، بەڵام ئەفســـەرەکە خســتمییە نێوان خۆی دیوارەکە و نەیهێشـت پۆلیسـەکان بمکوژن. چووینە ڕاڕەوەکەی دیکەی هێشـتا پۆلیسـەکان تەقەیان لە بەندییەکان دکرد، ئەفســـەرەکە فەرمانی بە پۆلیســـەکانی دا تەقە ڕاگرن. کە عەبدولجەبار فەهمیی بەڕێوەبەری پۆلیس گوتی بە پێلەقـان دەرتـان دێنین، لە وەڵامـدا گوتمـان ئێوە ئەوەنین بە پێلەقان دەرمانبێنن بەڵکو بە گوللە دەیکەن. ئەوەشـــتان ســـەلماند و چەند کەســتان کردە قوربانی. ئاخر شــەڕەکە بەرابەر نەبوو و بەردەوامیی قوربانیی دیکەی لێ دەکەوتەوە، ئێمە گەلێکمان هەیە تۆڵەی قوربانییەکانی دەکاتەوە. ئێمە دیلین و تکام وایە

ئەگەر ئەوان تەقەیان ڕاگرت ئێوەش بەرگری نەکەن، ئیدی بەندییەکان ڕازیبوون و، ئیدی ئاوا بەخۆ وبە بۆجامەیەکی بەخوێن و قوڕەوە لەگەڵ ئەفســـەرەکە چوومە دەرەوە و دابوومییە نێوان خۆی و دیوارەکەی تا لە هێرســـە دڕدانەکانی پۆلیســـان بمپارێزێ کە دەیـانگوت:" گەورەم لێگەڕێ بـا تەواوی بکەین" وجـا لوولەی تفەنگەکـانیـان دێنـا پێش و ئەفســـەرە لێیان نەدەگەڕا. چووینە هەموو ڕارەوەکان، ئەگەرچی من لە هەردوو دەســتەی حیزبیی "قاعیدە" و "ئاڵای کرێکاران" دووربووم، تکام لێکردن ئەو شـــەڕەی ڕاگرن و، بەردەوامیی قوربانیی پتری لێمان گەرەکە، ئێمە زۆر هاوڕێی ئازامان لەدەســتچووە، بەڵام شـــەرەف و بیروباوەڕمان لەدەســـت نەداوە، ئەو گوزارشـــتەم لە هەموو ڕارەوەکان دووبارەدەکردەوە و داوام لە ئەفســـەرەکانی پۆلیس دەکرد لێنەگەڕێن پۆلیســەکان تەقەمان لێ بکەن و، تەقەش لە هەموو لایەکی دەهات.
دەســـت بە چۆڵکردنی هۆڵەکان کرا و بەندییەکانیش، کە زۆربەیان برینداربوون بە نێوان دوو ڕیز پۆلیس و بەندیواناندا بردران کە تۆبز و تفەنگیان بەدەستەوەبوو و کە ئێمە وەک ڕیزێک دیلی خوێنیان لێ دەچۆڕا بەبەینیاندا دەڕۆیشـتین، بێ بەزەییانە لێیاندەداین. لە ڕێگا "ئیسماعیل ئەحمەد قرتە"ی بەندکراوم دیت لە دواساتەکانی ژیانیدابوو، ئاخر ئەوفیشەکێک لە ســـینگی دابوو و هەناوی هەلاهەلاکردبوو و لە پشـــتی چووبووە دەرێ، دەیگوت: "من دەمرم، سڵاو لە کەسوکارم بکەن". عەبدوللەتیف سـەعیی پارێزەری خوێنی لەبەر دەڕیی، لەتەنیشـت ئیسـماعیل ئەحمەدی بوو، لە بەنیوانەکا دەپاڕایەوە قومێک ئاو بدەنە ئەو بدەنە هاوڕێکەی کە گیانی دەدا، بەڵام تەنیا جوێنی پێ دەبڕا.
لە گۆڕەپانەکەی تەنیشـت بەندیخانە"گۆڕەپانی کارگەکان" ژمارەیەک نووســەر دانیشـتن تا ناوی بەندییە زیندووەکان تۆمار بکەن و ماجید مســتەفای وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی لە سەریان ڕاوەستابوو دەستێ جلی ڕەشی زۆر کەشخەی لەبەردابوو و، دەتگوت دەچێتە ئاهەنگ و لیوا قاسم شوکریی بەڕێوەبەری گشتیی بەندیخانەکانی بە لووتبەرزییەوە لەتەک ڕاوەســتابوو، لووتبەرزییەکەیشـی هیی ئەوەی بوو کە ئەو بەندییە نیشـتمان پەروەرە بێ چەکانەی بەزاندبوو کە تاکە چەکیان بیروباوەڕ بوو، عەبدولجەبار ئەیوبی بەڕێوەبەری پۆلیسی بەغداشیان لەگەڵ ڕاوەسـتابوو، کە مەستی سـەرکەوتن بوو، بەڵام با بزانین ئەو مەستییە تا چەند بڕ دەکا.
کە بەپێش پایەداریی ماجید مستەفای وەزیردا تێپەڕیم، کە باشـی دەناسـیم، پرسـیی چەند گوللەت بەرکەوتووە، وەڵامم نەدایەوە. عەبدولجەبار دەستی بەرزکردەوە و ویستی لێمبدا و گوتی پایەداریی وەزیر قســـەت لەگەڵ دەکا، بەڵام "ســـەید ســـاڵح نعێمی"ی مەئمووری

بەندیخانە، ئەو مرۆڤە باشـــە، دەســـتی گرت و گوتی گەورەم تکایە، بەخۆی بریندارە و نەخۆشە، ئیدی لێنەگەڕا لێم بدا.
هەمووان خوێنیان لێ دەچۆڕا، ژمارەیەکی کەمیشـیان ڕەوانەی نەخۆشـخانەی بەندیخانە کران، تەرمی شـــەهیدەکـانیـان بەبەرچـاومـانەوە برد دوا ســـەرنجی مـاڵئـاوایی و خۆشەویستیمان دانێ. هەر بەندییەک دەچووە لای نووسەرەکە ناو و ماوەی بەندییەکەی دەگوت و، بە فەرمانی وەزیر و بەڕێوەبەری گشـتیی بەندیخانەکان دەبوایە ڕاسـپێرییەک لەبەرانبەر ناوەکەی بنووسرێ تا لە بەندیخانەی باقووبو چۆنی مامەڵە لەگەڵ بکرێ.
کۆی بەندییەکان نزیکەی (١٥٠) کەس دەبوون و هەشتیان شەهیدبوون و (٩٣)یان بریندار بوون و تەنیا ئەوانەیان گواســتەوە نەخۆشـــخانە کە برینەکانیان ســـەخت بو. هەرچی ئەوانەش بوون یەک دوو گوللەیـان بەرکەوتبوو جێی کـارێی نەگرتبوو، لێگەڕان خوێنیـان لەبەر بڕوا. مەدحەت ئیبراهیم جومعەی وەزیری نـاوخۆ و عەبـدولجەبـار فەهمیی بەڕێوەبەری پۆلیسـی بەغدا و لیوا قاسـم شـوکریی بەڕێوەبەری گشـتیی بەندیخانەکان و عەقید سـاڵح مەهدی سـامەڕایی نوێنەری سـەرکردایەتیی سـەربازی وئەفسـەر ئیبراهیم حەسەنی فەرماندەی ئەو هێزەی بەسەر بەندیخانەی دادابوو و عەزرە وەردەی فەرمانداری فەوجی هێزی سـوارە و عەبدولجەبار فەهمیی بەڕێوەبەری بەندیخانە، ڕاوەسـتابوون تا سەیری قوربانییەکانیان بکەن، ئەوان سەرکەوتوو و ئێمە دیلی ئەوان بووین. عەبدولجەبار فەهمی نازناوی بەســـەردا دابەس دەکردین، صـــائین، پووچ، ترســـنۆک. بەڵام با ببینین دواترێ ئەوانە چۆن بە زەلیلی لە بەرانبەر دادگای گەل لە ١٩٥٨ بەســـەری شـــۆڕەوە ڕاوەســـتابوون و چۆن ســـواڵی بەزەییان لەو کەســـانە دەکرد کە پێشـــترێ تا مردنێ بە پێڵاوەوە بەسەر سەریان دەکەوتن و چۆن دەپارانەوە و داوای بەزەییان دەکرد.

## له به‌ندیخانه‌ی باقووبه:

دوای ڕۆژێکی خوێناوی، هه‌ر هه‌مان شه‌و ئه‌وانه‌ی مابووین به پاس ڕه‌وانه‌ی به‌ندیخانه‌ی باقووبه‌یان کردین و له‌ناو خوێن و قوراودا مه‌له‌مان ده‌کرد. ته‌نیا برێک په‌لاسـی دڕاومان له‌به‌ر مـابوو و ئۆتۆمۆبیلی چه‌کداری پۆلیس پـاسـه‌وانیی ده‌کردین، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی نـا هێرشـمان بکرێته سـه‌رێ به‌ڵکو بۆ ئه‌وه‌ی ڕانه‌که‌ین و له‌هیکرا بچینه‌وه باوه‌شـی گه‌لی خۆمان. شـه‌وێ گه‌یشـتینه به‌ندیخانه‌ی باقووبه و له به‌ندیخانه‌ی به‌غداش چوار به‌ندییان کۆتوبه‌ند کردبوو چونکه به هانده‌ری یاخیبوونه‌که‌یان دانابوون، ئه‌وانیش عه‌زیز ئه‌لشـێخ و کازم جه‌واد و حیکمه‌ت خه‌لیل و من بووین.

که گه‌یشـتینه باقووبه، "سـالح فه‌وزی"ی به‌ڕێوه‌به‌ری به‌ندیخانه‌ی باقووبه و ده‌سـته‌یه‌ک به‌ندیوان به‌خۆ و به تۆبزه‌وه له پێشوازیمان بوون، له خۆشبه‌ختییان جێیه‌کی ساغیان له به‌ده‌نمـان نه‌دۆزییه‌وه به‌رگه‌ی تۆبزان بگرێ، سـالح فه‌وزی له‌به‌ر شـوێنه‌واری قه‌سابخانه‌که‌ی دیتبووی تۆقیبوو.

عه‌بدولجه‌بار فه‌همی تا ئه‌وێ دوامان که‌وت تا پرسورایه‌ک بداته سالح فه‌وزی، "ئه‌وه‌ی به زنجیری ژماره سـی ببه‌سـتنه‌وه" که زنجیرێکی قورسـه و ئه‌وانه‌ی پێ ده‌به‌سـترێنه‌وه که فه‌رمـانی له‌داردانیـان بۆ ده‌رچووه، " ئه‌وه به زنجیری ژمـاره دوو و ئه‌وه‌یان به ژمـاره یه‌ک......". عه‌زیز ئه‌لشـێخ و مه‌که‌ڕه‌م تـاڵه‌بـانی بخه‌نه زینـدانه‌کـان چونکه ئه‌وان دنه‌ی خه‌ڵکه‌که ده‌ده‌ن؛ که سـالح فه‌وزی به‌و زنجیرانه‌وه دیتمی که ته‌نیا ئه‌وه‌ی فه‌رمانی له سـێداره‌دان یان به‌ندیی تاهه‌تای به کاری قورسـه‌وه هه‌بێ پێی ده‌به‌سـترێته‌وه، پرسـیاری ئه‌و کۆتوبه‌ندانه‌ی کرد که نه‌مده‌توانی هه‌ڵیـان بگرم. عه‌بدولجه‌بـار ئه‌یوب پێیگوت ئه‌وه فه‌رمـانی به‌ڕێز وه‌زیره، به‌ڵام ئه‌و فه‌رمـانی شـکـاندنی دا و تـا به زنجیرێکی نیزامی ببه‌سترێمه‌وه و گوتی: "نیزامیٔ به‌ندیخانه ڕێ به‌وه‌ی نادا.

به‌ندییه‌کانیان گواسـته‌وه و به‌سـه‌ر هه‌ردوو قه‌ڵای به‌ندیخانه‌که‌دا دابه‌شـیان کردن و ئێمه‌یشـیا له زیندانی تاکه‌که‌سـی دابڕی، به‌ڵام ئێمه ماندوو و هیلاک بووین، حه‌زمان ده‌کرد له‌وێمان دانێن تا تۆزێک بحه‌سـێینه‌وه. به جلی خوێناوی و پێی له کۆتوبه‌ندێدا له‌سـه‌ر قیره‌که‌ی خه‌وتین. جله‌کانمان دڕاو و به قوربوو و سـه‌رباری گه‌رمای هاوینێش له‌رزمان گرتبوو. تۆزێکیان نان و شـۆربا داینێ. نزیکه‌ی دوو هه‌فته لێنه‌گه‌ڕان په‌یوه‌ندی به به‌ندییه‌کـانی دیکه‌وه بکه‌ین، به‌ڵام گوێمـان به‌وه‌ی نه‌دا، ئی خۆ هه‌زاران ڕۆڵه‌ی ئه‌و ولاته هه‌یه زه‌وی ڕاده‌خا و ئاسـمانی به‌خۆیدا ده‌دا، ئه‌دی هه‌موو گه‌لی عێراق کۆتوبه‌ند نه‌کراوه؟! دۆخه‌که دوو هه‌فته هه‌ر ئاوا مایه‌وه تا توانییان به‌ندییه‌کان به‌یده‌سـت بکه‌ن و

نیزامی ئاسـایی بەندیخانەیان بەسـەردا بسـەپێنن و، ئەو نیزامەش لەو نیزامانە بوو کە سوپای بەریتانیای داگیرکەر لە هیندڕا هێنابوویە عێراق.
دوای دوو ڕۆژان بەندیوانێک هات و بەناو بانگی کردم، گوتم چونکە بە دنەدەریان داناوە دیـارە بۆ لێکۆڵینەوەم دەبەن. ڕۆژنـامەکـان نـاویـان لەگەڵ نـاوی کوژراوەکـان بڵاوکردبوومەوە، ئیدی مـامم داوای لە حەسـەن تـاڵەبانی کردبوو بچێتە بەندیخانە و بەچاوی خۆی بمبینێ تا دڵنیابێ سەلامەتم.
بەندیوانەکە بردمیە ژووری بەڕێوەبەری بەندیخانە، دیتم شـێخ حەسـەن تـاڵەبانیی موتەسـەڕیفی لەلایە، کە موتەسـەڕیف بەو حالە خراپەوەی دیتم هەسـتا و دەستی لە ملی کردم، بە خەمەوە گوتی: "باشـە ئەوانە نەیارن.... شـیوعین... حوکمدراون.... بەڵام بۆ بەو دڵڕەقییە؟ لە بەڕێوەبەرەکەی پرسـی داخوا بۆ خراومەتە بەندیی تاکەکەسـی، وەڵامیداوە "ئەوە بە فەرمانی ماجید مسـتەفای وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی کراوە" پێیگوت: "لەوێی دەربێنە، من پەیوەندی بە پایەداریی ماجید مسـتەفاوە دەکەم. ئیدی ڕەوانەی قەڵای کرد
ەو لەژووری حوکمدراوانی سێدارەی دانام، بەڵام بێ ئەوەی دەرگام لەسەر داخەن
دوای دە ڕۆژان لەو زیندانەیـان دەرهێنـاین گێڕاینیـانەوە قەڵا. لە بەنـدیخـانەی کوتیش قەسـابخـانەیەکی درندانەتر بەرپا کرابوو و، دە هـاوڕێ لەوێ شـەهید ببوون. ئەو قەسابخانەیە لەسەر دەستی تاهیر زوبەیدیی بەڕێوەبەری گشتیی بەندیخانەکان و جیهاد جافی بەڕێوەبەری بەنـدیخـانەی کووت کرابوو، کە تـاهیر زوبەیدی دواتر بەدەسـتی بەندییەک کوژرا. پاشان بەندییەکانیان ڕەوانەی بەندیخانەی باقووبە کرد ولەوانەش حەمید عوسـمان و زەکی خەیری و عەزیز ئەلحاج و مەهدی حەمید و عومەر عەلی ئەلشـێخ و حەمزە سـەلمان ئەلجوری وکەسـانیدی بوون. جا هەر دەسـتەیەک بگەیشـتبانایە جێ بەندیوانەکان بەخۆ و بە تۆبزەوە بۆیان ڕیز دەبوون، بەبێ خوێن و برین نەدەهاتنە ناو قەڵا. لە یەکێک لەو ڕێوڕەسمانەی پێشوازی، ساڵح فەوزیی بەڕێوەبەری بەندیخانە پرسیی بۆ لێیاندەدەن؟ عەریف ڕەحیم، کە زەبەلاحێکی سـمێڵ فش بوو، وەڵامیداوە: دەسـتکاریی شـتێکیان کردووە پەیوەندیی بەوانەوە نییە. کەواتە بنیادەم نابێ بپرسـێ بۆ دەسـتدرێژیی دەکرێتە سەرێ، چونکە ئەوە پەیوەندیی بەوییەوە نییە!
کە ڕێیاندانین چاومان بە کەسـوکارمان بکەوێ، دیتمان دیدارەکە لە هۆڵێک دەکری کە دوو بەربەسـتی تەلی تۆڕئاسـا لەنێوان بەندییەکان و کەسـوکاریاندا هەیە و بەندیوانەکان هـاتوچۆی تێدا دەکەن، زۆربەی بەنـدییەکـان ئەو جۆرە دیدەنییەیان ڕەتکردەوە. یەک لە شـتە خۆسـەکانی ئەودیدارە محەممەد گوبانچیی شـێخی گۆرانیی عێراقی هاتبووە دینەیی

کوره بەندکراوەکەی کە ناوی ســـوبحی بووکە دیتی ناتوانێ بە ئاســـانی قســـە لەگەڵ کوڕەکەی بکا، پێیگوت: "ئەگەر مەقامیشت بۆ بخوێنم هەر گوێت لێ نابێ؟"
نەســـرەت ئورفەلیی دادوەی لێکۆلینەوە هاتە بەندیخانە تا گوتەی هەندێ لە بەندییەکان سەبارەت قەســابخانەکەی بەندیخانەی بەغدا تۆمار بکا و، بەپێی ڕێوشـوێنی دادگاییەکانی سزابێ. حکوومەی، لە بەرانبەر گەورەیی قەسابخانەکەی بەندیخانەی بەغدا، بەیاننامەیەکی دەرکردبوو و گرنگترین شتی تێیدا هاتبوو بریتیبوو لە: "لە کاتێکدا حکوومەت هەوڵی دەدا بەندییەکـان بگوازێتەوە بەنـدیخـانەی بـاقووبە، بەنـدییەکـان یـاخیبوونیـان ڕاگەیـانـد و بەڕێوەبەریی بەندیخانەیان بەردباران کرد..... ئیدی هەندێ ڕووداوی جێی داخ ڕوویاندا و، لیژنەیەک بۆ لێکۆڵینەوە لەو ڕووداوانە پێکهێنراوە و بەرپرســـانی ڕووداوەکە دەبردرێنە بەردەم دادگای تایبەتمەند" . ئەوە ئەو کلێشەیەیە کە حکوومەتەکان دەیانویست تاوانەکانی خویانی پێ بشارنەوە، بەڵام حکوومەت، لەبەر قورسایی تاوانە ناشیرینەکانی و لە بەرانبەر توورەیی گشـتیی ناوخۆ و دەرەوە، ناچاربوو دەســت لەکار بکێشـێتەوە، بڕیاریشـی دا هەندێ کارمەندی پۆلیش هەواڵەی دادگا بکا وداوایان لە بەندییەکان کرد دەســتنیشـانیان بکەن و ئەو کارانەس دیاری بکەن کە هەر یەکەیان کردوویەتی. مەحاڵ بوو ئەو کەسانەی قەســـابخانەکەیان بەرپاکردبوو دیاری بکرێن و، بەندییەکان لەبەردەم دادگا دوپاتیان کردەوە بەرپرســـی قەســـابخانەکەوەزیری ناوخۆ و وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی و بەڕێوەبەری پۆلیســـی بەغدا بەخۆی و بەڕێوەبەریی بەندیخانەن. جا ئەگەر حکوومەت بەراسـتیەتی و دەیەوێ بەرپرسـانی قەسـابخانەکە سـزا بدا دەبێ ئەوانە بداتە دادگا. ئیدی ئکوومەت پێیوابوو بەو شانۆگەرییە ئەو بابەتەی کۆتایی پێ هێناوە.
کە لیستەکەش ژمارەیەکی زۆری بەرپرسی گەورە گرتبۆوە و نووسراوی دەستگیرکردنیان بۆ دەرچووبوو، دەبوایە وەزیری داد ڕەزامەندی لەسەرئەوەی بدا تاوانبارانی قەسابخانەکە بدرێنە دادگا، بەڵام وەزیر ئەو کارەی ڕەتکردەوە و ئیدی کێشەکە داخرا.

## هێرشی پێچەوانە بۆ وەرگرتنەوەی مافەکانی بەندییان:

ئێستا ئێمە لە ساڵی ١٩٥٤داینحکوومەتەکەی جەمیل مەدفەعی، لە ژێر قورسایی ئەو تاوانانەی بەرانبەر گەل کردبوونی و ئەو قەسابخانانەی، لە سایەی حوکمە عورفییەکان، دەرهەق بە زیندانییە سیاسییەکان بەرپای کردبوون، ناچاربوو دەست لە دەسەڵات بەردا. بەندییەکانیش بۆ ماوەیەک ناچار کران مل بۆ نیزامی بەندیخانان بدن و وەک بەندیی ناسیاسی حیساب بکرێن، ئەوەش بە دەستبەسەرداگرتنی کەلوپەلەکانیان و مافەکانیان و دیسان بە زنجیر کۆتوبەندیان کردنەوە. بەندیوانەکان بەندییەکانیان ناچاردەکرد لە هەژمارکردنی بەیانی و ئێوارە پێنج کەس پێنج کەس دانیشن، بەڵام خۆیان بە ژمارەی زۆر و بە تۆبزەوەدەهاتنە ژووری. زۆرجارانیش لەبەر چرووکترین هۆ بە تۆبزان بەردەبوونە گیانی بەندییەک و دەیانخستە زیندانی "وەرزشی"....

بە بۆچوونی ڕێکخراوی حیزبیی بەندیخانە، بۆ وەدەستهێنانەوەی هەندێ ماف، ئێستا کاتی ئەوەبوو هێرشێکی بەرانبەر بکرێ. دوای ئەوەی بەندییەکان لە بەندیخانەی باقووبە بە شێوەی ئاڵقەی گەورە کۆبوونەوە تا بۆنەیەکی تازیەباری بۆ یادی شەهیدبوونی هاوڕێکایان لە بەندیخانەی بەغدا و کووت بگێڕن، بە سروودی نێونەتەوەیی دەستمان پێکرد:

هەستن ئەی هۆزی بەش مەینەتان.......... دیلانی بریەتیی جیهان

ئەوجا هەندێک سروودی نیشتمانی بۆ نەمریی شەهیدان. بەندیوانەکان خێرا هاتن و دوای ئەوانیش پۆلیس، چەک بەدەستەوەسەرکەوتنە سەر بانی هۆڵەکان و هەڕەشەیان دەکرد و فەرمانیا دەکرد پەرتبین و واز لە خوێندنی سروودان بێنین، کەچی بەندییەکان گێیان بە هەڕەشەکانیان نەدا لە ئاهەنگەکەیان بەردەوامبوون.

ڕۆژی دواتریێ، ژمارەیەکی زۆری بەندیوانان بە پێشڕەویی "ڕەحیم"ی ڕەئیس عورەفا بە خۆ و بە تۆبزی دەستیانەوە هاتنە ناو بەندیخانە و فەرمانیان بە بە بەندییەکان کرد بۆ هەژماری ڕۆژانە ڕیزبن"مەستەڕە" ، کەسیان هەڵنەستانەوە، کە ڕەئیس عورەفا ڕەحیمیش ویستی لە بەندییەک بدا و ناچاری بکا هەڵسێتەوە، پێشتریێ بڕیار درابوو ژمارەیەک بەندی هێرسبکەنە سەر بەندیوانێک. ئیدی تۆبزەکانیان لیستاندن و بە لێدا تێیان بەربوون. ڕەئیس عورەفا ڕەحیم یەکەم کەس بوو ڕایکرد و خوێنی لەسەری دەچکا و بەسەر شواربەکانیدا دەهاتەخواریێ. بەڕێوەبەر و هاریکارەکانی خێرا هاتن و گوتیان: ئەوەچییە؟ ئەوەی لە بوندیخانەی بەغدا و کووت بەسەرتان هات بەستان نەبوو؟ یەک لە بەندییەکان وەڵامیدایەوە: دەستیان لە کارێک وەردا پەیوەندیی بەوانەوە نەبوو. ئەوە سەرەتای

بەدەســــتهێنانەوەی هەندێ لەو مافانە بوو کە دوای قەســـــابخانەی بەگدا و کووت لێیانسەندبووین.

لەو ڕۆژیرا بەندییەکان ڕازی نەبوون ئەو هەژماردنە بکەن کە شکۆی بنیادەمی دەسکاند و داواکاری لەدوای داواکارییان پێشــکەش کرد، ڕادیۆمان دەوێ.... ڕۆژنامەمان دەوێ...کتێبمان دەوێ...دیدەنییەکی بەرێوجێمان دەوێ. پاشـــان ژیانی بەکۆمەڵ و وەرزشمان ڕێکخست و ئاڵقەی گفتوگۆی سیاسیمان دەبەست و،ڕۆژێکیان داوای کوتکێکی ئاســـنیان کردبوو تا حەمامەکە جاککەنەوە، بەڵام ئەو زنجیرانەیان پێ شـــکاند کە پێی کۆتوبەند کرابووین و فرێماندایەوە بەرێوەبەری و ، دیسان بارودۆخەکان ئاساییبوونەوە و منیش ببوومە نوێنەری بەندییەکان و لەجیاتیی ئەوان دەجوومە بەرێوەبەری و بەنەرمی و بە مکوڕییەوە کێشەکانم لەگەڵ چارەسەر دەکردن.

## هەوڵی ڕاکردن لە بەندیخانەی باقووبە:

لەبەر ئەو لێدانە یەک لەدوای یەکانەی لە سـەرکردایەتی و کادیە کاراکانی بەر حیزب کەوتبوو، سەرکردایەتیی حیزب لەدەرەوەی بەندیخانە لاوازبوو. دووبەرەکییە بەربڵاوەکەی ناو بەندیخانەکانیش لە دەرەوەش ڕەنگدانەوەی لەسـەر حیزب هەبوو، نەخاسـمە دووبەرەکییەکەی ١٩٥٣، دوای ڕاکردنی جەماڵ حەیدەری لە بەندیخانەی بەغدا، کاتی بردبوویانە نەخۆشـخانەی مەلەکیی نزیک بەندیخانە، ڕێکخراوێکی لە حیزب جیابووەوە بەناوی "ئاڵای کرێکاران" "رایة الشـغیلة" دروسـتبوو وئیدی حیزب کە دووچاری هەندێ هەڵویسـتی چەپڕەوی تەریک ببوو، جەماعەتی "ئاڵای کرێکاران"ی ڕەتیانکردبووەوە دروشـمی ڕووخاندنی ڕژێمی پاشـایەتی هەڵگرن، بەوە تۆمەتبار دەکرد کە جەماعەتی "ئاڵای پاشایەتی"ن و ئەوانیش حیزبیان بەوە تۆماردەکرد کە چەپڕەوە و دروشمی "بەرەی میللی بەسـەرۆکایەتییحیزبی شـیوعی بۆ ڕووخابدنی ڕژێمی پاسـایەتی و دامەزراندنی حکوومەتێکی میللی بەسەرۆکایەتیی حیزبی شیوعی"ی هەڵگرتووە.

کە بارودۆخی بەندییە سیاسییەکانی بەندیخانەی باقووبە جێگیر بوو و دەسەڵاتیان بەسەر بەڕێوەبەریی ناوخۆی بەندیخانە بەدەسـتهێنایەوە و، حکوومەتیش بەڵێنی چاوپێدا خشـاندنەوەی ئەو حوکمانەی بەسـەریاندا درابوو نەیبردەسـەر، ئیدی بیریان لە لەوەی کردەوە کادیرە حیزبییەکانی سـەرکردایەتیی حوکمی گرانیان بەسـەردا درابوو ڕابکەن. چونکە حیزب لەدەرەوە زۆری پیویست پێیانبوو، نەخاسمە دوای دەستگیرکردنی هاوڕێ بەهادین نووری و بەندکردنی لە نوگرە سەلمان.

سـەرباری ژمارەی زۆری بەندییان وبیروباوەڕی جیاوازیش، توانییان بابەتی لێدانی توونێلێک لە یەک لەژوورەکانی کرابووە کۆگای ئازووخە، بشاردرێتەوە . توونێڵەکە سێ دیواری بڕیبوو کە قووڵایی هەریەکێکیان سێ مەتر بوو و بەبن ئەو سـەقامە گشـتییەیدا دەڕۆیی کە بەندیخانە و نەخۆشـخانەی جودادەکردەوە و لە باخچەی خەسـتەخانەکە دەچووەدەرێ و، ئەوەش بە هەماهەنگی لەگەڵ حیزب کرا لە دەرەوەی بەندیخانە.

بەڵام لە شـەوی خشـکەکردنی بەندییەکانی بڕیاربوو لە تونێڵەکەوە ڕابکەن، لەبەرهەندێ هۆی پەیوەسـت بە نهێنگیریی چوونەدەرەوەیان، وادەی دەرچوونەکەیان گۆڕا.ئەوەش وایکرد، پێش هاتنی ئەو ماشـێنەی حیزب بۆ ئامادەی کردبوو تا پێش ئەوەی بەڕێوەبەریی بەندیخانە پێ بزانێ بیانگوازیتەوە، بچنەدەرەوە و ناچاربوون دزابکەنە بێسـتانێکی نزیک جێیەکە. خاوەنی بێسـتانەکە وایزانیبوو چوونە و دەیانەوێ رابکەنە ئێران و هەندێ قاچاغچی دەیانبەنە ئێران و لەوێشـڕا بۆ "ئیسـرائیل". ئیدی هەواڵی دابووە دەسـەڵات و توانییان بیانگرن و دیسـان ڕەوانەی نوگرەسـەلمانیان بکەنەوە. خاوەن بێسـتانەکەس

پەژیوان ببووەوە و گوتبووی ئەگەر بیانگوتبا گیراوی شیوعین یارمەتیی دەدان تا بگەنەوە بەغدا.

ڕۆژی دواتریّ دەستەیەکی لێکۆڵینەوە هاتنە بەندیخانە و لەگەڵ بەرپرسانی بەڕیوەبردن و نوێنەری بەندییەکان دووان، کە من نوێنەریان بووم، دەســتەکە گەیشــتە ئەو بڕوایەی ئەو کارەی بەندییەکان کردوویانە کارێکی مەزنە و زۆریش وردە. هیچ مرۆڤێکی ئاســـایی ناتوانیّ ئەو جۆرە کارانە ئاشــکرا بکا، ئیدی لیژنەکە پێشــنیاری ئەوەی کرد بەڕێوەبەریی بەندیخانە سووچبار نییە، بەڵام هەژمار و پشکنینی بۆ شتەکانی بەندیخانە کرد و دەستی بەســەر هەموو ئەو ســتانەدا گرت کە دەکریّ هەڵکۆڵینیان پیّ بکریّ. ڕەنگە بیّ ســوودیش نەبیّ ئەگەر هێڵکارییەکی جێیەکە و توونێڵەکەی بۆ خوێنەران دانێم

هێڵکارییەکی بەندیخانەکە

## سەربردەی ڕاکردنی حەمید عوسمانی سکرتێری حیزب:

راکردنی دووەمی بەندیخانەکە راکردنی حەمید عوسمانی بەرپرسی یەکەمی حیزب بوو لە بەندیخانە و ئەوەیان زۆر وردتربوو، چونکە حەمید عوســـمان لای بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش ناسراوبوو، ئیدی هەموو ڕۆژێ و لە هەموو هەژمارێکی بەڕێوەبەریی بەندیخانە دەیکرد، داوایان دەکرد دڵنیابن کە لە بەندیخانەیە.

حەمید عوسمان هەموو کاتی خۆی لەو سووچە بەسەردەبرد کە کرابووە جێی ئازووخە و جانتای بەندییەکان. ســـووچەکە مێزێکی بچووکی لێبوو و چەند کتێبێک و گلۆپێکی خوێندنەوەس"تێبڵ لامپ". جا حەمید عوســـمان لەوێ دادەنیشـــت و لەوی پێشـــوازیی لە هاوڕیکانی دەکرد و کاروباری سیاسی و بابەتی دیکەیان شەن و کەو دەکرد.

دوای ئەوەی بەڕێوەبەریی بەندیخانە دڵنیابوو لەو ژوورەدایە و ئەودەمی دەســـتنیشـــانیان کرد وا لەگەڵ بەندییەکی دیکە بە کوردی قسان دەکەن، حەمید عوسمان توانیی لە دەرگای سەرەکی لەگەڵ سەردانیکەران، واتە کەسوکاری بەندییان، لە ١٩٥٤ بچێتە دەرەوە.

بەندیوانەکان،مانگێک پتر بوو حەمید عوسمانیان لەگەڵ بەندیان دەژمارد و دەستنیشانیان دەکرد. ناوەناوەس ڕاپۆرت لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاســـایشـــی بەغدایرا دەهاتە بەڕێوەبەریی بەندیخانەی گوایە حەمید عوســـمان لە دەرەوەی بەندیخانەیە و ســـەرکردایەتیی حیزبی شیوعیی عێراقی دەکا و، بەڕێوەبەرریی بەندیخانەس ئەو پڕوپاگەندانەی بەدرۆ دەخستەوە و، دووپاتیدەکردەوە لەکاتی ژماردنی بەندییان حەمید عوســـمان دتراوە لەگەڵ یەکی دیکە قسەی کردووە.

ڕاکردنی حەمید عوســـمان دەنگدانەوەیەکی گەورەی لەســـەر بزووتنەوەی نیشـــتمانی و چالاککردنەوەی نیشتمانی هەبوو و، حیزبی شـیوعی هەموو جارێک دوای لێدانەکان خۆی دەگرتەوە و وەک هێزێکی پێشی پێشەوەش دەچووە شەڕە نیشتمانییەکان.

حەمید عوســـمان بەیاننامەیەکی بە ناوی ئاشـــکرای خۆی بڵاوکردەوە و تێیدا داوای لە هەموو هێزە نیشـــتمانییەکان کردبوو لە بەرەیەکی نیشـــتمانیدا هاوکاریی یەکدی بکەن تا گەل تەیار بکرێ بۆ ڕووخاندنی ڕژێم و دامەزراندنی ڕژێمێکی نیشـــتمانیی دیموکراتیی ئامانجەکانی گەل دەستەبەر بکا.

ئیدی **هیچ** گومانێک نەما کە حەمید عوســـمان لەدەرەوەیە، بەڵام ئەوەی بەندیوانەکان هەموو رۆژێ بە حەمید عوســـمانی دادەنێن و دڵنیان لە بەندیخانەیە کییە و، چۆن ژمارەی بەندییەکانیش کەمینەکردووە، کارەکە ئەوڕۆژی ئاشـــکرابوو کە بەیاننامەکە بەناوی حەمید عوســـمان بڵاوکرایەوە. کە مەئموورى بەندیخانە و چەند بەندیوانیک هاتن و پرســـیاری حەمید عوســـمانیان کرد و گوتیان دەمانەوێ قســـەی لەگەڵ بکەین، بەندییەکان بردنیانە

ژوورەکەی و گوتیان فەرموون ئەوەش حەمید عوسمان، چیتان لێی دەوێ؟ کە لێنزیکبوونەوە دیتییان پەیکەرێکی حەمید عوسمانە و لە قور دروستکراوە و ماکیاژێ بۆ کراوە تا لە حەمید عوسمان بچێ، لەو جێیەش داندراوە کە هەردەم لێی دادەنیشت. بەندیوانەکان پەیکەرەکەیان برد و مەئمووری بەندیخانەش بەدوایانەوە و لەسەری خۆی دەدا و بردیانە ژووری بەڕێوەبردن. دەستەی لێکۆڵینەوەس دووپاتیان دەکردەوە مرۆڤی ئاسایی ناتوانێ ئەو شێوازە وردانە ئاشکرا بکا، ئیدی تەنیا سزای "ئاگادارکردنەوە"یان دایە مەئموور و بەندیوانەکانی سەرپەرشتیی ژماردنی بەندییەکانیان دەکرد و کە پلەبەرزکردنەوەی فەرمانبەر ساڵێک دوادەخا. دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز کاررایم بۆ مەئمووری بەندیخانە کرد تا ئەو سزایەی لەسەر لادەن چونکە بەوەی ناسرابوو فەرمانبەرێکە لە سنووری ئەرکەکانی لانادا و ڕقیشی لە بەندییە سیاسییەکان نییە.

## جارێکی دیش بەندیخانەی نوگرە سەلمان کرایەوە:

نوگرە سەلمان نزیک سنووری عێراق و سعوودییەیە و لە ناوچەیەکی دوورەدەستی بیابانە، ئەو بەندیخانەیە لە بنجڕا قەڵایەکی سەربازی بووە و ئەفسەرێکی بەریتانیی ناوی کلۆب پاشا"ئەبو حەنیک" بووە،بنیاتیناوە تا لەسەر سنوور بەر بە هێرشەکانی وەهابییان بگرێ. ئەو بەندیخانەیە دوو قەڵای دوونهۆمییە و نهۆمی زەویی دەرگای نییە و دەرگا لە نهۆمی دووەمە و دەبێ بە قاڵدرمەیەکی ئاسن بۆی بەسەرکەوی کە بەدەرگای قاسەی ئاسن دەچێ. پێش پەنجەرەکانیشی پەردەی پۆڵایان هەیە و گوللە نایانبڕێ. هەردوو قەڵایەکەش بە تووتێلێک دەگەنە یەکدی و لە ناوەڕاستی تووتێلەکە جێیەک بۆ دانانی ئاو و هەڵگرتنی ئازووخە هەیە تا ئەگەر گەمارۆدرا خۆی ڕاگرێ. لەسەردەمی مەلەکی ئەو بەندیخانەیە فراوان کرا و دە هۆڵی گەورەی تێدا بنیاتنرا کە هەریەکەیان جێی (١٥٠) بەندیی تیدا دەبووەوە و بۆ شیوعییەکانیا دروستکرد و خرایە سەر بەندیخانە کۆنەکە. بەندیوان و پۆلیسەکانی بیابان، کە وشترسواربوون، پاسەوانیی ئەو بەندیخانەیەی دەکەن. بەندییەکانیش لەمێرگی دوورەوە ئاویان بە تانکەر بۆ دێ و، ئەوانەی سەرپەرشتیاری جێیەکەشن ئازووخەی وشک دەدەنە بەندییەکان تا خۆیان بەکۆمەڵ خواردن بۆ خۆیان لێبنێن.

کە ڕووداوی اکردنی بەندییان زۆربوو و بەتایبەتییش کادیرانی شیوعی و چالاکیی سیاسی لە دەرەوە بووژایەوە، حکوومەت بەندییەکانی تەنگەتاو دەکرد و بێژووانە و بەڕێی فێڵبازی دەستی بەسەر مافە یاساییەکانیان دادەگرت، کادیرە پێشکەوتووەکانی حیزب گواسترانەوە بەندیخانەی نوگرە سەلمان تا بۆی بڕەخسێ بەسەر بەندیخانەکانی دیدا زاڵ بێ. بەڵام بەندییەکان ملیان نەدەدا و بەرگرییان دەکرد، ئیدی ویستی دەست بەسەر ڕادیۆیەکاندا بگری و موکەبەرە لە بەندیخانە دانێ، تا بەندییەکان تەنیا گوێیان لە بەرنامەکانی ڕادیۆی بەغدا بێ، بەڵام بەندیەکان ڕادیۆیەکانیان ڕادەستی بەڕێبەری نەکرد، ئەوجا ویستیان دوو شیوعیی لیژنەی حیزبیی بەندیخانەی باقووبە بگوازنەوە نوگرە سەلمان کە ئەوانیش حەننا ئەلیاس و توعمە مەرداس بوون. بەڵام بەندییەکان ڕادەستیان نەکردن. ئیدی نەجمەدین سائیبی موتەسەڕیف هات کە خەڵکی کەرکووک بوو و برادەری کاری پارێزەریم بوو و لەگەڵ سوڵتان ئەمینی بەڕێوەبەری پۆلیس کە زاوای بەهجەت عەتییەی بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوەکانی تاوان بوو و دەستەیەک پۆلیسی ناوخۆیشان لەگەڵ خۆ هێنابوو، بەچەکەوە چوونە سەر بانی بەندیخانە و هەڕەشەیان دەکرد ئەگەر بەندییەکان مل نەدەن قەسابخانەیەکی دی دروستدەکەن.

که منیش نوێنەری دیداری بەرپرســـانی بەندییەکان بووم، بۆ دیداری موتەســـەڕیف و بەڕێوەبەری پۆلیس و بەڕێوەبەری بەندیخانە جوومەدەرێ. دوور لە دووەکەی دی بەتەنیا لەگەڵ موتەســـەڕیف دوام و ئـامۆژگـاریم کرد خۆ لەکـارێکی وەک ئەوەی هەردوو بەندیخانەی بەگدا و کووت نەگلێنێ و، ئەو کارە دڕندانانەش، چ زوو و چ درەنگ، بێ سزا تێناپەڕن، بڕوای بە قسەکانم هات و پرسیاری کرد چ بکەم؟ گوتم بڕۆ لەگەڵ یان دانیشە و منیش تکای ئەوەی دەکەم گواستنەوەیان تا وادەی مانگانەی سەردا دوابخەن تا چییان دەوێ کەســـوکاریان بۆیان بێنن و دوایەش کارەکە لەبیرخۆت ببەوە و دواترێ داوای گواســتنەوەیان مەکەوە. پێشـــنیارەکەی قبووڵکردم و ئەو ســـێ مانگەی لەو بەندیخانەیە مامەوە ئەوانیان نەگواستەوە.

بەلام حکوومەت بەندیخانەیەکی دیی دروســـتکرد و کردییە بەش بەشـــی بچووک و هەر بەشـێکیشـی لەویدی دادەبڕی و بەڕێوەبەرێکی لە عەبدولجەبار ئەیوب دڕندەتری بۆ دانا، کە ئەویش عەلی زێنولعابدین بوو، ئیدی توندترین ئەشـــکەنجەی بەندییەکانی دەدا، بەڵام گەل ئەوەندەی مۆڵەت نەدایە و شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ روویدا.

## له بەندیخانە دەرچوونم و بەپۆلیس ڕەوانەکردنم بۆ بەدرە:

کە نزیکبوو حەوت سالّی بەندییەکەم تەواوکەم، لە ١٩٥٤ یاسایەک دەرچوو کە ڕەگەزنامەی عێراقیی لە حوکمدراوە شیوعییەکان وەردەگرتەوە و لە ولاتی وەدەردەنان. هەریەک لە یەکێتیی سۆڤیەت و بولگارستان و ئەلمانیای دیموکراسی ڕازیبوون پەنابەری بدەنە ئەوانەی ڕەگەزنامەیان لێ دەسەندریتەوە و میوانداریيان بکەن.

نەجم سائیبی موتەسەرفی کەرکووک، کە هاوڕێ و برادەرم بوو، هاتەلام تا لێم بپرسێ داخوا دوای ئەوەی لە بەندیخانە دەردەچم و ڕەگەزنامەم لێ دەستێننەوە، چ ولاتێک هەڵدەبژێرم بمنێرنێ. وەلامم ئەوەبوو کە: "من ڕەگەزنامەم لە حکوومەت وەرنەگرتووە، بەڵکو بەوەم وەرگرتووە کە باب و باپیرانم نیشتەجێی ئەو ولاتە بووینە. منیش بە ئارەزووی خۆم نیشتمانەکەم بەجێ ناهێڵم و ناچمە ولاتێکی دی و، هەر لە عێراق دەمێنمەوە" گوتی مانەوەم لە عێراق واتە دەبێ تا هەتا لە بەندیخانەبم، وەلاممداوە: "هەمووشتێک کۆتایی هەیە، دەبێ ئەو بارودۆخەس کۆتاییەکی هەبێ".

کە کاتی ئەوەی هات لە بەندیخانە بەربم، بەندییەکان بەو بۆنەیەوە ئاهەنگێکیان ساز کرد. گوتیشیان دەرچووبم لە بەندیخانە و چوونەوە ڕیزی بزووتنەوەی نیشتمانی دەسکەوتێکیێ گەورەی بزووتنەوە و حیزبی شیوعییە. ڕۆژی دەرجوونم ماڵئاواییم لە بەندییەکان کرد و ئەوجا ماڵئاواییم لە ساڵح فەوزیی بەڕێوەبەری بەندیخانە کرد و هانمدا بۆ چارەسەری هەر کێشەیەک با لە هاوکاریی بەندییان بەردەوام بێ و چارەسەری بکەن. شێخ عەتای برام و کەسێکی دیکەی کەرکووکی گەڕیکی بەر تەکیەی ناوی قادر حەمامچی بوو لەدەرەوە، لەگەڵ ژمارەیەک پۆلیسی هاتبوون تا بنکەی ڕاگواستنەکان لەگەڵمان بێن، چاوەڕێم بوون .

سەرکەوتینە ناو ئۆتۆمۆبیلەکە و بەرەو بنکەی پۆلیسی ڕاگواستنەکان بەڕێکەوتین. لەوێ پێیانگوتم دەبێ بچمە "بەدرە"ی سەر بە لیوای کووت تا سێ ساڵی نیشتەجێی زۆرەملێ لەژێر چاودێریی پۆلیس لەوێ بەسەرببەم، ئەوەش تەواوکردنی حەو حوکمەبوو کە ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی بەسەریدا سەپاندبووم.

ڕۆژی دیاریکراوی ڕاگواستنێ، بە گیراوی و کەلەپچەکراوی و بە پاسێکی دارین و چاودێریی دوو پۆلیسەوە، کە پاسەکە ژمارەیەک هاوولاتییشی تێدابوو، دوای نیوەڕۆیەکەی بەرەو کووت بەڕێکەوتین. ڕێیەکە قیرتاو نەکرابوو و پۆلیسی بەریتانیا "ومبی" ڕێیەکەی خۆشکردبوو و پەستابوویەوە. کەشەکە باران بوو و ڕێیەکە قوڕبوو و ڕووشمان لە کووت بوو و لەوێشەوە بەرەو بەدرە، کە لە شارۆچکەی "عەزیزییە"ش دوورکەوتینەوە پاسەکە خلیسکا و لەڕێیە خۆڵەکە دەرچوو ووەرگەڕا، بەلام تەنیا تۆزێک

پێستەمان رووشا، بەو باران و سەرمایە لە پاسەکە هاتینەدەرێ و سەرنشینەکان هانایان بۆ ئەمیری ئیمانداران، عەلیی کوڕی ئەبو تالیب دەبرد. لەودەمی ئۆتۆمۆبیلێکی جێبی ئەمریکی بەوێدا هات، شوفێرێکی چەکدار و کوڕێکی گەنجی تێدابوو گوتیان کوڕی محەممەد حەبیب ئەلمیری ڕەبیعەیە، پۆلیسەکە لێیپارایەوە و گوتی : "شیوعییەکی مەترسیدارم لەگەڵدایە و دەترسێم ڕابکا، تکایە هەتا کووت هەڵمانگرە"، کە گوێی لە شیوعییەکی مەترسیدار بوو گوتی: " من شیوعییەک هەڵگرم؟ هەی دەردی لێدا" ئیدی پێی لێنا و بەجێیهێشتین. بەڵام گوێمان لە دەنگی مەکینەیەکی دوور بوو، کە نزیک کەوتەوە دەرکەوت بلدۆزەری کۆمپانیای "ومبی"یە لە کووتڕا بەرەو عەزیزییەی دەچوو، هەموو هاواریان کرد "اللهم صلی علی محمد و ال محمد" ئەمیری ئیمانداران هات ڕزگارمان بکا، هەر بەڕاستییش بلدۆزەرەکە بە هاوکاری خەڵکەکە پاسەکەیان هێنایەوە سەرڕێیەکە و بەرەو کووت بەڕێکەوتین. شەوێ گەیستینە کووت و، لەوێ لەجێی هێشتنەوەی بەندییانهەردوو هاوڕێ'عەلی شێخ حمود و عەتا دەباس'ل دیت کە حکوومەت دواترێ لە ڕاپەڕینەکە شاری "الحی" لە ١٩٥٦ لەسێدارەیدان.

لەو هەڵوێستە سەیرانەی دواترێ روویاندا، ئەحمەد ساکح ئەلعەبدی فەرمانڕەوای سەربازی دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ ڕۆژێکیان پەیوەندیی پێوەکردم، کە ئەودەمی پشکنەری گشتیی چاکسازیی کشتوکاڵی بووم گوایە عەبدولکەریمی سەرۆکوەزیران پەیوەندیی پێوە کردووین و دەڵێ محەممەد ەلحەبیب کارەبای جنێتەرەکەیماڵەکەی لەسەرئەو کارگەی چاککردنەوەی ئامێران بڕیوە کە پێشترێ هیی خۆی بووە و بەپێی یاسا دەستی بەسەردا گیراوە، جا فەرمانڕەوای سەربازی داوای کردبوو لەگەڵ ئەفسەرێکی وەزارەتی بەرگری بچمە کووت و دەستکراوەی دەسەڵاتی فەرمانڕەوای سەربازییشی کردبووین تا کارەبا بدەینەوە کارگەکە.

کە جووینە ئەوێش، عەقید عەبدوللەتیف دەراجی موتەسەڕیف بوو و شێخ عەلی تالەبانیش قایمقامی قەزای ناوەند بوو. داوامان لە کوڕی ئەمیر کرد کارەبا بداتەوە کارگەکە، جا ئەو کەسەی ئەوێ شەوێی باسم کرد ڕازی نەبوو بمگەیەنێتە کووت، ئێستا داوایەکەی ڕەتکردەوە، منیش فەرمانم دایە بەڕێوەبەری پۆلیس دەستگیری بکەن و بە کەلەپچەکراوی بینێرنە بەغدا تا دادوەری سەربازیی گشتی بڕیار بدا چارەنوسی چ دەبێ، کە بە کەلەپچەکراوی لە پشتەوەی پیکابی پۆلیسان دانیشتبوو و چەند پۆلیسی لەگەڵ بوو، عەلی تاڵەبانی هاتەلام و تکای لێکردم بەگیراوی ڕەوانەی نەکەم وبەڵێن دەدا خۆی بێتە بەڕێوەبەرایەتییەکەم و ئێستاش کارەبایەکە بداتەوە. داوام کرد بیهێنن، پێمگوت: "جوانم لێ وردبەوە، ڕەنگە ڕۆژێک منت دیتبێ". گوتی : شوێند بەخوا بەبیرم نایە تۆم دیتبێ. گوتم:

"شـــەوەکەت بەبیردێ کە ڕازی نەبووی بە ئۆتۆمۆبیلەکەت بمگەیەنییە کوێت؟ من لەتۆ بەخشـــندەترم، ڕازیبووم بە ئۆتۆمۆبیلی حکوومەت بتبەنە بەغدا. گوتی: "هەر شــــتەی بە کاتی خۆی، تکایە لەســــەر کارێکی تێپەڕیوە لێپرســــینەوەم لەگەڵ مەکە". ئیدی ئاماژەم بۆ پۆلیس کرد کەلەپچەکەی بکەنەوە و بەریدەن و داوام لێکرد سبەینێ بێتە پشکنینی گشتیی چاکســــازیی کشــــتوکاڵیی بەغدا، هەر بەڕاســــتییس ڕۆژی دواتریێ هات، ڕێزم گرت و پەیوەندیم بە فەرمانڕەوای سـەربازیی گشـتی کرد و گوتم کێشـەکە کۆتاییهات و کارگەکە کارەبای درایەوە و بەڵێنیش دراوەجارێکی دیکە نەبڕدرێ، بە کوڕەکەی ئەمیریشــــم گوت: "ئێستا تۆ ئازادێ، دەچییەوە لای کەسوکارت یان دەبییە میوانی من" جا سوپاسی کردم و چووەوە لای کەسوکاری.

کە گەیشتمە بنکەی پۆلیسی کووت، خستمیانە ژوورێکی هەردوو هاوڕێ عەلی شێخ حمود و عەتا دەباسی لێبوو و، لەمێژبوو دەستگیر کاربوون و هیچ تۆمەتێکیان ئاراستە نەکرابوو و، ئەوانیش مانیان لە خواردن گرتبوو، وەک هاوکاری منیش مانم لەگەڵ گرتن و ڕۆژی دواتریێ سـەید تەقی تەباتەباییســەرۆکی شـارەوانیی عەمامەیەکی سـەوزی لەســەری بوو هات دانوســتانیان لەگەڵ بکا تا مانگرتنەکە بشــکێنن و بەڵێنی دا لە مەســەلەی بەردانیان بکۆڵێتەوە. لێرە منیش قســــەم کرد و گوتم من پارێزەرم، نابێ کەســــی گیراو لە چل و هەشت سەعات پتر بهێڵرێتەوە ئەگەر هیچ تۆمەتێکی ئاراستە نەکرێ، جا لەجیاتیی ئەوەی داوای کۆتاییهێنانی مانگرتنەکەیان لێ بکەی، وا باشــترە بە بەرپرســان بڵێی کێشــەکەیان کۆتـایی پێ بهێنن ، یـان تۆمەتێکیـان بۆ دانێن یـان بەریـان بـدەن. پێدەچوو بە لایەنە بەرپرسـەکانی گوتبێ پارێزەرێکی لەوێ دەستبەسـەرە ڕێنوێنییان دەکا و پێیاندەڵێ مافیان چییە و چ نییە. ئەگەرچی باران دەباری و ڕێی بەدرەی خۆشنەکرابوو و مەترسیی ئەوەی هەبوو ئۆتۆمۆبیـل لە ڕێیە پەکی بکەوێ، کەچی هەر نـاردمیـانە بەدرەی و ئێوارەکەی گەیشتمەجێ.

**سێزدە ڕۆژی دوورخراوەیی لە بەدرە:**

بەدرە شــــارۆچکەیەکی بچووکە و دەکەوێتە ســــەر "کلال"، لە تخووبی فەیلییان نزیکە و لەســـەر ســـنووری ئێران و چیایەکانی "پشــتکۆ"ی ســـەرکەشـــە کە شــکۆیەک دەداتە شـارۆچکەکە و زۆربەی خەڵکی شـارەکەش کوردن و، زۆربەشـیان لە عەشیرەتی "مەلەک شــــــایی"ن و فەیلین. نزیـک دۆڵەکەش بێســــتـانی دارخورمـا و مزرەمەنیی لێیە و. بەڕێوەبەرییەکانی حکوومەت تۆزێک لە شارۆچکەکەی دوورن و دۆڵێکیان لەبەینێیە.

چل و پێنج دورخراوە لە شـارۆچکەکەی هەبوون و زۆربەیان لە بینایەکی فراوان بوون و باخچە و یانەیەکی فەرمانبەران دەوریان دابوو. حکوومەت ئەو دوورخراوە سـیاسـییانەی

لەو بینایە نیشـــتەجێ کردبوو، بەڵام ئەوانەی خاوخێزانیان لەگەڵ خۆ هێنابوو لە هەندێ خانووی بەڕێوەبەریی ناوخۆیان دانابوون.
بۆ هەر دوورخراوەیەکیش پۆلیسێکیان دانابوو و بجووبایە کوێ وەک سێبەر لەگەڵی بوو و لەبەردەم یانەکەی بەرانبەر قایمقامییەت و بنکەی پۆلیس بوو، کۆدەبوونەوە. قایمقام داود ســـەلمان بەیاتی بوو کە پێشـــتر بریکاری موتەســـەڕیفی بەغدابوو، ئەو کاتەی قەســـابخانەکەی بەندیخانەی بەغداله ۱۹۵۳ ڕوویدا. ئەویش لەو قەزایە دوورە خۆی بە دوورخراوە دادەنا، مامۆستا کامل قەزانچییش لە دوورخراوەکان بوو و شتێکی خۆشـی ســـەبارەت بە مامۆســـتا کامل قەزانچی هەیە و ئەویش ئەوەیە لە ۱۹٥٤ خۆی بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران پاڵاوتبوو و خۆیشـــی نیشـــتەجێی زۆرەملێی بەدرەبوو، لەکاتی دیاریکراوی دانانی دەستەبەری"تامینات" بەبەرچاوی پۆلیسەوە سواری ئۆتۆمۆبیلێک دەبێ و بەغدا هاتم، دەشـڵی مافی دەسـتووریی خۆی بەکاردێنێ، جا پۆلیش لێگەڕابون سـواری ئۆتۆمۆبیلەکە ببێ، بەڵام لە خاڵی پشـکنینی دەوروبەری شـار، بە تۆمەتی ئەوەی دەیەوی لە نیشتەجێی زۆرەملێ ڕابکا، دەیگرن و بە کەلەپچەکراوی هێنایانە جێی ڕاگرتنێ"تەوقیف".
ئەفســەرێک لە شـارۆچکەکە هەبوو هاوسـۆزی بەندییە سـیاسـییەکان بوو و ناویم لەبیر نەماوە، کە شـــەوان بە ســـەرخۆشـــی لە نادی دەچووەوە جوێنی بە حکوومەتی دەدا.ئەو ئەفسەری تەجنیدی قەزایەکەی بوو.
لەوێبوونم ڕێکەوتی گرێـدانی پەیمـانی عێراقی - تورکیی کرد لە ۱۹٥٤وەک ڕێ خۆشـــکردنێک بۆ پەیمانی بەغدا، ئیدی نووســـراوێکی نارەزاییمان دژی ئەو ڕێککەوتنە ئیستیعمارییە پێشکەش کرد.
تەنیا ســـێزدە ڕۆژ لە بەدرە مامەوە، شـــێخ حەبیب تالەبانیی مامم لای ســـەعید قەزازی وەزیری ناوخۆ ناوبژیی بۆ کردبووم تا نیشـتەجێی زۆرەملێیەکەم بگوازنەوە شـارۆچکەی کفریی نزیک گوندی زەرداوی شێخ عەتای برام لەووی دەژیا. جا لەگەڵ یەکەم ئۆتۆمۆبیلی جێبی پۆلیس ڕەوانەی بنکەی پۆلیســـی ســـەرایان کردم تا لەوێرا ڕەوانەی کفریم بکەن، ڕازی نەبووم بە کەلەپچەکراوی بمبەنەوە کەرکووک و دوایەش بۆ کفری، جا بەڕێوەبەری پۆلیسـی گشـتیی ئەودەم وەجیە یونس بوو بەدوایدا ناردم تا لە ڕازی نەبوونم بپرسـێ و گوتی بۆ ئەوەی بە یاسایی ڕاگیراوە شەرم نییە. گوتم : من بۆیە نارازیم چونکە ڕاگرتنەکە نایاســاییە، ئەوەی لەســـەرمە لەجێی دانیشـتنەکەم ئامادەبم و ســـەردانی پۆلیس بکەم تا بارودۆخی خۆمیان پێبڵێم. ئەفســەرێک بە پلەی عەمید ڕوکن لە نزیکییەوە دانیشـتبوو، کە گوێی لە ناوی من بوو هەســـتایەوە و، گوتی : "دەزانی ئێمە ئامۆزاین؟" گوتم: "نازانم جەنابت کێی؟" گوتی: "من غازی داغســـتانیم، ئەرێ دەزانی پەیوەندیی برایەتیی نێوان

محەممەد پاشا داغستانیی خوالێخۆشبووی باوکم و شێخ محەممەد عەلی تاڵەبانیی باپیرت چۆن بوو؟ من منداڵبووم کە باوکم ئێمەی ئەسپاردەی باپیرت کرد و چووە شەڕی شوعێبە و لەوێ شەهید بوو. باپیرت ئەکی باوکایەتیی لەگەڵ ئێمە بەجێهێنا و، ماوەیەکی درێژ میوانداریی کردین و ئێمەس ئەو جاکەیەی قەت لەبیر ناکەین". ئەوجا پرسیاری مامەکانم و میمکەکانمی کردو ناوی هەمووانی دەزانی، ئەوجا ڕووی لە بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس کرد و، گوتی: "ئەگەر کەفالەتی من قبوڵ بکەم من دەبمە کەفیلی، ئەوە ئامۆزامە". بەڕێوەبەری گشتی رازیبوو بە ئۆتۆمۆبیلی عەتای برام بچمە کەرکووک و ئەوجا بۆ کفری. لە کەرکووک، حوسێن فەریدی بەڕێوەبەری پۆلیس هەناردییە دوام و ڕێیدام سەردانی خزمەکانی کەرکووکم بکەم و ئەوجا ڕوو لە کفری بکەم.

## نێشتەجێی زۆرەملێ و چاودێریی پۆلیس لە کفری:

دەبوایە سێ ساڵ لە نیشتەجێی زۆرەملێ بم لە کفری و لە ژێر چاودێریی پۆلیسدا. کفری پێشتری، کە ژمارەیەکی زۆری گەنج و ڕۆشنبیر و کەسایەتیی کۆمەڵایەتی تا ساڵی ١٩٤٥چوونە ڕیزەکانی حیزبی هیوا و، دواتریش لە ١٩٤٦ چوونە ڕیزەکانی حیزبی ڕزگاری، بنکەیەکی گرنگی بزووتنەوەی نەتەوەیی بوو. ئەگەر بمانەوێ لەو بوارەدا مافی هەموو کەسێک بدەین ئەوا شێخ جەماڵ تاڵەبانیی باوکم و محەممەد فەتاح بەگی جاف لە ١٩٢٩ ڕا کە لقێکی کۆمەڵەی "ئازادیی کوردستان"مان لە کفری کردەوە لەو ناوچەیە دەستی باڵایان لە بزواندنی هەستی نەتەوەیی هەبوو و، سەرباری ئەو دووەش سەعید ئەفەندیی موفتی و وەستا ساڵحی بەرگدروو و سەعید وەنداوی و کەسانی دیکەش ئەندامی کۆمەڵەکەبوون.
بەڵام بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد دوای تێکشکانی بزووتنەوەکەی شێخ مەحمود لە ١٩٢١ تووشی نوسوستی هات و دواشەڕی کردیشی شەڕی ئاوباریکیناحیەی "گل" بوو دواترێ خۆی رادەستی حکوومەت کرد تا دەساڵان لە نیشتەجێی زۆرەملی بێ لە باشوور، یەک لە هۆیەکانی کزبوونی بزووتنەوەی نەتەوەیی لە کفری مردنی محەممەد بەگی جاف بوو و زۆربەی ڕۆشنبیرانی کۆمەڵەش لە هەموو شارەکانی کوردستانڕوویا لەوەی بوو لەگەڵ حکوومەت ڕێککەون و پۆستی باڵایان لە دەوڵەتدا بدرێتێ، باوکم زۆری خەم لەو ئاڕاستەیە و لە کۆچی محەممەد بەگی جافی برادەری نزیکی دەخوارد.
ئەو نوشوستییە تا١٩٣٨، کە حیزبی هیوا لە کەرکووک دامەزرا، بەردەوام بوو، کۆمەڵێ ڕۆڵەی کفریش وەک قوتابی و مامۆستا لە کەرکووک بوون. دیارترین و چالاکترین کەسایەتیی حیزبی هیوای بیرۆکەکانی ئەو حیزبەی بردە کفری مامۆستا محەممەد قەرەداغی بوو. ئەو گەنجە نەرمونیان و سەنگینەی لە ڕازیکردنی ڕۆشنبیران و کاسبکاران ماندوو نەدەبوو تا بێنە ڕیزەکانی حیزب. لە مەودایەکی کورتدا ژمارەیەک کەسایەتیی شکۆمەند لەدەوری حیزب کۆبوونەوە لەوانە شێخ عەتا تاڵەبانی و شێخ محەممەد نەجیب وەهاب تالەبانی و کەریم بەگی سەرۆکی عەشیرەتی جاف و داود بەگ و مستەفا بەگی جاف و محەممەدەمین جاف و شێخ ئەحمەد شاکەلی و ئەحمەد بەگی بابان و حاجی قەرەداغی و حوسێنی برای و حاجی عەلیی حاجی محەممەد و مەلا عەزیز عەبدولڕەحمان و محەممەد عەلی ئاغای زەنگەنە و زۆری دیکەش. بەڵام کە لە ١٩٤٥ڕا کێشە لەناو ڕیزەکانی حیزب دروستبوو و، ماجید مستەفا وفوئاد عارفی برازای ڕۆڵێکی گەورەیان لە دروستکردنی ئەو قەیرانە و پارچە پارچەبوونی حیزبدا هەبوو، هەر لەبەر ئەوەشە فوئاد عارف دەترسێ ڕاستیی ڕۆڵی خۆی لە پارچەپارچەکردنی حیزبی هیوا باس بکا.

کەچی ڕێکخستنەکانی حیزبی هیوا لە کفری دوا ڕێکخستنی ئەو حیزبەبوو بەردەوام بووبێ، بەڵام کە حیزبێکی نەتەوەیی نوێی ڕێچکە پێشکەوتنخواز دروست بوو، ئەو ڕێکخراوانەی حیزبی هیوا خۆی هەڵوەشاندەوە و، ئەو حیزبەش حیزبی دیموکراتیی کوردی بوو بە سەرکردایەتیی مەلا مستەفای بارزانی. بەڵام ئەو حیزبەش، ئەودەمە تووشی نشوستی بوو کە بارزانییەکان کشانەوە کوردستانی ئێران و دواتریش، کە کۆماری مەهاباد رووخا و قازی محەممەد و هاواڵەکانی لەداردران، ئەوانیش چوونە یەکێتیی سۆڤیەت.
کە گواسترامەوە کفری، بزووتنەوەی نەتەوەیی روو لە کزی بوو و، حیزبی شیوعی ڕێکخستنی لەوی نەبوودەسەڵاتە حکوومییەکانیش هەڵمەتێکی راگەیاندنیا لە دژم بەرپا کردبوو، گوایە پۆلیس ناوی هەموو ئەو کەسانە دەنووسێ کە سەردانم دەکەن، بەڵام خەڵکە بەرێزەکەی کفریملەیان لەگەڵ ئەو هەرەشانە کرد و بۆ بەخێرهێنانم سەردانیان دەکردم دیاریی وەک پێداویستییەکانی ژیانیان بۆ دەهێنام و، شێخ عەتای براسم لە گوندی زەرداوبوو کە تەنیا ٢٣ کم لە کفری دوورە.
دوای ماوەیەکی کورتی جێگیربوونم لەوێ، حیزبی شیوعی لەرێی هاورێ عوبێد عەبدولرەحمانەوە پەیوەندییان پێوە کردم و ئەو پەیوەندیی لەگەڵ دروستکردم و ئەو بڵاوکراوە سیاسییانەی بۆ دەهێنام کە دەردەچووندەبوایە هەموورۆژێش لە بنکەی پۆلیس ئامادەبم تا تۆمارەکە واژوو بکەم و بیسەلمێنم لێرەم، پۆلیسیش کەسێکی بۆ هاواڵی و چاودێریی جوولانەوەکانم تەرخان کردبوو، بەڵام شارۆچکەکە بەرێوەبەرایەتیی ئاسایشی لێ نەبووو چاودێرییەکە هەر هاکەزایی بوو.
دەبوایە بۆ جوولاندنی چالاکیی سیاسی لە ناوچەکەدا بەجۆرێک پەیوەندی بە شیوعییە کۆنەکان بکەم کە حکوومەت هەست پێ نەکا من پەیوەندیم پێیەوە هەیە. یەکەم شیوعیی پەیوەندیم پێیەوە کرد عەلی شێخ محێدین بوو، ئەو هاورێیە قوتابیی قوتابخانەی پیشەسازیی سەربازی بوو و،لەو هەڵمەتە چرەی کرایە سەر شیوعییەکان سێ قوتابیی کورد حوکمدران، ئەوانیش عەلی شێخ محێدینی خەڵکی کفری و محەممەد ئەجمەد سۆفیی خەڵکی کەرکووک و حەسەن رەحیمی چەمچەماڵی بوون و، بەهاوکاریی عەلی شێخ محێدینیش یەکەم شانەی شیوعیمان لە ناوچەکە ڕێکخست.
پەیوەندیم لەگەڵ فەرمانبەران ئاسایی بووبگرە قایمقام و دادوەر و ئەفسەری پۆلیسیشبۆ پارێزەری سەریان لە نووسینگەکەم دەدا، بۆیە چیدی بۆ واژووی رۆژانە نەچوومە بنکەی پۆلیس تا تۆمارەکە واژوو بکەم، بەڵکو عەریفی بنکەکەتۆمارەکەی دێنا نووسینگەکەم تا واژووی بکەم..لە ماوەی لە کفری بوونم ئۆتۆمۆبیلێکی تایبەتم کڕی. دوای ئەوەی

پۆلیسەکەی بۆ چاودێریم داندرابوو دەڕۆیی، شەوەکەی دەچوومە گوندی زەرداو تا لەگەڵ حەتای برام بابەتە سـیاسـییەکان تاوتوێ بکەین و،پێش نیوەشـەوێشـدەگەڕامەوە، شارۆچکەکەس خاڵی پشکنینی لێ نەبوو.
ڕۆژێکیان شـێخ عەتا پێیگوتم حەمید عوسـمانی سـکرتێری لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شـیوعی لە زەرداوە و، بە تایبەت بۆ دیتنی من هـاتووە و لە کەرکووکێڕا بەیاوەریی هاوڕییەک بەپێ هاتووە. چوومە زەرداو و چاوم پێیکەوت هۆی هاتنیشـی بۆ ڕازیکردنی من بوو تا پشـتی بیرۆکە پاکتاوییەکەی بگرم تا لقی کوردیی حیزبی شـیوعی بچنە ناو ڕێکخسـتنەکانی حیزبی دێموکراتیی کوردسـتانی تا ئەوەی دواییان بکرێتە حیزبێکی شـۆڕشـگێڕی کوردی، ئەو بیرۆکەیەس بۆنی ئەوەی لێدەهات کە سـەرکدایەتیی حیزب دەستەپاچەیە و ناتوانێ حیزبی شیوعی بکاتە حیزبێکی جەماوەریی وەک پێشتری. بەڵام من تەواو دژی بیرۆکەکە بووم، گفتوگۆیەکی درێژمان کرد و جارجارەش توند دەبووین. من باوەڕم وابوو دەبێ حیزبی شیوعی لەرووی ئایدیۆلۆژیا و ڕێکخستنەوە سەربەخۆیی خۆی هەبێ و تا ئەوپەڕی رادەش هاوکاری لەگەڵ حیزبەکانی دیکە بکا و نەخزێتە ناو تەریکییە نەتەوەییەکان. ئەو بیرۆکەیە لای ڕێکخراوی سـلێمانیی حیزبی شـیوعی هەبوو، بەڵام زۆربەی ڕێکخسـتنەکان دژی بیرۆکەی ئاوێتەکردن بوون. لەو ماوەیەشـدا هاوڕییان کەمـاڵ فوئـاد و لەتیف نـانەوا و نەژاد ئەحمەد عەزیز چوونە نـاو حیزبی دیموکراتیی کوردستان، حەمید عوسمانیش گەڕایەوە و لە هەڵوێستی من رازی نەبوو.

## یاسای چاودێریکردنی قوتابیان لەلایەن بەڕیوەبردنەکانی قوتابخانان:

دوای ئەو خۆپیشاندانە جەماوەرییانەی لە هەردوو ساڵی ١٩٥٢ و ١٩٥٣ کران و قوتابییانی دواناوەندی و کۆلێژەکان ڕۆڵێکی دیاریان لە ڕێکخستن و هەڵگیرساندنیدا دیتحکوومەت یاسایەکی دەرکرد و بەڕیوەبردن و دەستەی وانەگوتنەوەی کردە پێکهاتەی سیخوری تا چاودێریی هەڵسوکەوتی قوتابیانی دژە حکوومەت بکەن. ئیدی ناچارکرابوون هەر جوولە و هەر چالاکییەکی قوتابیان دەیانکرد ئەوان بە دەسەڵاتە ئاسایشییەکانی ڕاگەیەنن.

من، دوای ئەوەی حەوت ساڵی حوکمدانەکەمم تەواوکرد، لەبەردەم ئەنجوومەنی عورفیی سەرازی و لە ١٩٤٩دا بە سێ ساڵی سزای پاشینە سزادرابووم، کە دەبوایە سێ ساڵ لەژێر چاودێریی پۆلیسدابم. دوای ئەوەی حوکمەکەمم تەواوکرد نیشتەجێی بەزۆرم لە شارۆچکەی بەدرەدا بەسەردا سەپێندرا و دوای چەندین داواکارییش جێیەکە کرایە شارۆچکەی کفری.

لەوی پەیوەندیم بە ڕێکخراوی حیزبییەوە کردەوە و، ئەو شێوحییانەشم کۆکردەوە کە وازیان لە کاری حیزبی هێنابوو، واپێدەچوو ڕێکخوارەکە چالاکتر بووبێ، چونکە دروشمی ئەوکاتیی حیزبیش ڕووخاندنی ڕژێمی پاشایەتی بوو و دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری. ئیدی ڕێکخراوەکە بڵاوکراوەیەکی ناوخۆی بڵاوکردەوە دروشمی دژە حوکمی پاسایەتیی کۆنەپەرستی دژاگەلی تێدابوو و، دانەیەکی بڵاوکراوەکەش بە دیواری دواناوەندیی کفریی کوراندا هەلواسرابوو.

مۆفەق شەفیق وەنداوی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بوو و لەخانەوادەیەکی ناسراوی شارۆچکەکە بوو. منیش، چونکە لەژێر چاودێرییەکی وردداِبووم، بەردەوام پۆلیسێکم لەگەڵ دابوو، گومان لەمن نەدەکرا، پۆلیس بەهاوکاریی بەڕێوەبەریی قوتابخانە و بەڕێوەبەرەکەی، لەگەڵ قوتابیان دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد. ئیدی گومان کەوتە سەر قوتابییەک، بەڕێوەبەر و برایەکەی کە لە قوتابخانەکە قوتابی بوو شایەدییان لەسەر قوتابییە بێگوناهەکە دا و، بە تۆمەتی سووکایەتیکردن بە خانەوادەی پاشایەتی و هاندانی گۆڕینی ڕژێمی فەرمانڕەواگیرا و دوای لێکۆڵینەوە درایە دادگای سزای کفری.

قاسم داود یەعقووبی دادوەری دادگای سزای کفری بوو، ئەو لە خانەوادەیەکی ناسراوی هەولێری بوو و هیچ کەیفی بە شیوعییەکان و نیشتمان پەروەرەکان نەدەهات. بەڵام من برادەرایەتییەکی تایبەتم لەگەڵیدا هەبوو، کە لەژێر چاودێریی پۆلیش و نیشتەجێی زۆرەملی بووم، بۆم نەبوو بەرگری لەو جۆرە داوایانە بکەم ، بەڵام مەزهەر فەهمی عەزاویی

پارێزەر لەجیاتیی لیژنەی بەرگری لە دادپەروەریی ســـەندیکای پارێزەرانی کارەکانی بۆ ئەوە تەرخان کردبوو تا لە دادگاکاندا بەرگری لە نیشـــتمان پەروەران بکا، خۆبەخشـــانە هاتبوو بەرگریی لێ بکا.
لە ڕۆژی دادگایی وەک بینەر ئامادەبووم مۆفەق شـــەفیقی بەڕێوەبەر و برایەکەی هاتن ودوای شـــوێنخواردن دژی قوتابییە تۆمەتبارەکە شـــایەدییان دا و گوتیان تۆمەتباریان دیتووە کە بڵاوکراوەکەی بە دیوارەوە هەڵواســـیوە. تۆمەتبارەکە بیگوناه بوو و ئاگای لە ڕووداوەکە نەبوودوای کۆتاییهاتنی دادگاییەکە و بەرگریی پارێزەر، دادوەر هۆڵەکەی بە گوێگران چۆڵکرد من نەبێ.
دادوەر قســـەکانی رو لەمن کرد و گوتی: **ئێمە** لە دادگاین و کە کارەکەس پەیوەندیی بە کاروباری بینا و بالەخانان هەبێ پســـپۆڕێکی وەک بەننا و ئەندازیار بانگ دەکرێن. لە بابەتە پزیشـــکییەکانیش بانگی پزیشـــکیک دەکەین تا پرســـوڕای پێ بکەین. جونکە تۆیش پسپۆڕی ئەو جۆرە کارانەی و، بابەتەکە پەیوەستی دواڕۆژی قوتابییەکەیە، ئەوا پێویست بە راوێژی ئێوە دەکا، بە شـــێوەیەکی تایبەت نەک فەرمی، داخوا پێتان وایە ئەو قوتابییە ئەو کارەی کردبێ؟ گوتم: کە لە بابەتی ئاوا پســـوڕا دەکەن دیارە کارێکی باش دەکەن، ئەگەر دەتانەوێ بە ویژدانێکی ئارامەوە حوکمێک بدەن، ئەوا من بۆتان دووپاتدەکەمەوە قوتابییەکە بێ گەناهە، دوور و نزیکیش ئاگای لە بابەتەکە نییە، گەواهیدانی بەڕێوەبەر و برایەکەیشـــی درۆیە و لە ترســـی تۆڵەی حکوومەت و ســـزادانیان بەپێی یاســـای دەرکراو کردوویانە. گوتی: سوپاس ئێستا بابەتەکە لەبەرچاوم ڕوونە.
دوای تەنیاییەکی کورت لەگەڵ نووســـەرەکەی، بانگی تۆمەتبارەکە وپارێزەرەکەی کرد و گوێگرانیش هـاتنەوە هۆڵی دادگا و، لەبەر نەبوونی بەڵگەی تەواو و پێویســـــت بڕیـاری بەردانی تۆمەتبارەکەی دەرکرد.

## گفتوگۆیەک لەگەڵ موتەسەڕیفی لیوای کەرکووک:

لەو ڕووداوانەی دەبێ باسیان بکرێ، لەو کاتەی لە کفری بووم یوسف زیای موتەسەڕیفی کەرکووک سەردانێکی بەسەرکردنەوەی کفریی کردوەک پێیشیان گوتم، پرسیاری بارودۆخی منی کردبوو و، پێیانگوتبوو پارێزەری دەکا و هیچ چالاکییەکی سیاسیی نییە. ئێوارەکەی هەندێ خەڵکی دیاری شارۆچکەکە و ئەندامانی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردن و شارەوانیی کۆ کردبووەوە، کە بەلایەنگری حکوومەت دادەندران، تا پرسیاری پێداویستییەکانی شارۆچکەکەیان لێ بکا، لەسەر یارەزووی موتەسەڕیفیش، منیش لە کۆبوونەوەکە بەشدار ببووم. سەرباری ئەوەی هیچ خزمەتگوزارییەک نەبوو و حکوومەت کاروبارەکانی قەزایەکەی بەتەواوی پشتگوی خستبوو، وەلامی هەمووان ئەوەبوو کە شارۆچکەکە لەسایەی حکوومەت و لە سایەیپاساوە پێویستی بە **هیچ** نییە، هەمیشەش کەوتووەتە بەر لوتفی حکوومەت و بەرپرسان. ئەوجا رووی قسانی لەمن کرد و گوتی: ماملۆستا تۆ چ دەڵێی؟پێموابوو وەک ئەوەیە بڵێ ئەدی بۆ ئێوە نەیارن و لە حکوومەت رازی نین؟ گوتم: موتەسەڕیفی پایەبەرز، من لە ۱۹۳۱ لەو شارۆچکەیە قوتابیی پۆلی یەکی سەرەتایی بووم و،تاکە قوتابخانەی ئەو قەزایەش بینایەکی کۆن بوو و یەکەم قایمقامی دوای داگیرکەری بەریتانی، کە شێخ محەممەدی شێخ ڕەزای تاڵەبانی بوو. بنیاتینابوو، جونکە ئەو پیاوێکی رۆشنبیری سەردەمی خۆی بو و کەیفی بە زانست و رۆشنبیری دەهات. بەڕێوەبەری قوتابخانەش لە سەردەمی ئێمەدا پەروەردەکاری پیاوچاک ڕەشید عاکف هورمزی بوو و، خەڵکی کەرکووک بوو. نەیدەوێرا لەبەر درزی میچ و دیوارەکانی لە ژووری بەڕێوەبردن دانیشێ نەکا بەسەریدا برووخێ. ئیدی بەشی هەرەزۆری دەوامەکەی لە گۆڕەپان و لەناو قوتابییان بەسەردەبرد. ئێستا چارەکە سەدەیەک و پتریش تیپەڕیوە و بۆ نیشتەجێی زۆرەملێ و چاودێریی پۆلیس هاتوومەتەوە ئێرە، دیتم بەڕێوەبەری قوتابخانە، مامۆستای بەڕێز "نەجم" لەوەی دەترسێ بینایەکەی بەسەردا برووخێ و ڕەشید عاکف هورمزیی پەروەردەکار و مامۆستایشی هەر دەترسا بەسەریدا برووخێ. قوتابخانەکە هەروەک جارانیەتی و حکوومەت دەستیکی چاککردنەوەیسی پێدا نەهێناوە تا لێنەگەڕێ بەسەر سەری قوتابی و مامۆستاکاندا برووخێ تیبینییشم کردووە حکوومەت لە مەودای ئەو چارەکە سەدەیەدا تەنیا جوار خانووی بچووکی بۆ فەرمانبەران بنیاتناوە، بەڵام لەو ماوەیەدا دەیان خانوو ڕووخاون و، حکوومەت ئەو شارۆچکەیە تەواو پشتگوێ دەخا.

موتەسەڕیف ئاوڕیکی لە قایمقام دایەوە و گوتی: "ها دەڵێی هیچی نییە؟" ئەوجا وەلامی منی دایەوە و گوتی: "دەزانی ئەو شارۆچکەیە لە ۱۹۲۰ لەدژی بەریتانییەکان ڕاپەڕی و

کاپیتان"سیلمەن"ی هاریکاری حاکمی سیاسیی کوشت، ئەوە شارێکی بێزراوە" پێیمگوت: "دڵیان بەوەندەی بەو سـارەیان کرد دانەکەوتووە؟ دوایەش دەڵێن بەریتانییەکان لەو وڵاتەی نەماون، ئەدی ئێستا کێ تۆڵەی کاپیتان "سلیمەن دەسێنێتەوە؟"
ئیدی کەشی کۆبوونەوەکە گۆڕا و وایلێهات ئامادەبووان پێشنیاری خۆیان بۆ پێشخستنی شارۆچکەکە خستەڕوو، هەر لە کردمەوەی ڕێگاوبان و بنیاتنانی خانوو بۆ فەرمانبەران تا قوتابخانە بۆ منداڵەکانیان...
یوسف زیای موتەسەڕیف بەڕەچەڵەک تورکمان بوو و لە عەشیرەتی بەیاتی تورکمان بوو کە نیشتەجێی ناوچەی نێوان "دوواخوورماتوو" و تخووبەکانی زنجیرە چیای حەمرینن و لە "ئیبخانە"، لە بەغدا ژیابوو و ببوە عارەب و لایەنگری بزووتنەوەکەی ڕەشـید عالی گەیلانی بووله مایسـی ١٩٤١، چەند سـاڵێک گیرا و ئەوجا خەریکی پارێزەری بوو و وردەوردە لە حکوومەت نزیکبووەوە و، کردیانە موتەسـەڕیفی لیوای کەرکووک. ئەو موتەسـەڕیفە بەوەی بەناوبانگ بوو کە بەرتیل خۆرە و سـەروسـامانی دەوڵەتیش گلدەداتەوە.
ڕۆژی دووەم موتەسـەڕیف لە دیوانی قایمقامییەت داوای کردم و دۆسـییەیەکی دامێ تا پێیدا بچمەوە و رای خۆمی لەسـەر بدەم. پێموابوو تایبەتی مەسـەلەیەکی مافناسـی یان بەرنامەیەکی پەرەپێدانی شارۆچکەکەیە. کە لە نووسینگەکەم سەیرم کرددیتم قۆنتەراتێکە بۆ بنیاتنانی قوتابخانەیەکی شەس پۆلی لە گوندی"کوڵەجۆ"ی نزیک جەلەولا"گولاڵە"، ئیدی جوومەوە لای تا بزانم پەیوەندیی من بەو دۆسـییەوە جییە، کە دۆسـییەکە پەیوەندیی بە قۆنتەراتەوە هەیە و منیش قۆنتەراتچی نیمە. گوتی: منیش ڕۆژێـک لە ڕۆژان وەک تۆ گیرابووم و ئێسـتا هارریکاریی تۆم گەرەکە. جا ڕازیبی و ئەگەر ئەو قۆنتەراتە وەرگری، قۆنتەراتچیی دیکە هەن و ئامادەن لە بەرانبەر ئەوەی ئەو قۆنتەراتەیان بدەیتی پارەیەکی باسـت بدەنێ و وەک قۆنتەراتچیی لاوەکی وەەیگرن. پێمگوت: داوای لێبووردن دەکەم و گوتم: منخەریکی پیشـەی خۆمم و پارێزەری پارەیەکی ئەوتۆم دەداتێ پێداویستیی ژیانی پێ دابین بکەم و نامەوی سەرقاڵی کاریک بم هیچ پەیوەندیی بە کارەکەمەوە نییە.

**دوو جووتیاری هەرە دڕی گوندەکەمان دەبنە شیوعی:**

دوو جووتیاری دڕ و شەرانگێزی عەشیرەتی زەنگەنە لە گوندەکەمان هەبوون، کە شریان بە خەڵکەکەی دی دەفرۆشـت، باوکم لێیان پەسـت دەبوو، یەکیان ناوی حەیدەر عەلی مەدحەت بوو و جووتیارەکان بە (              ) بانگیان دەکرد و هەمیشە لەگەڵ مامی ناتەبابوو جونکە کچەکەی خۆی نەدەدایە. هەر بۆئەوەی تۆڵە لە مامی بکاتەوە هەندێ سەروسامانی لێ دزی و شتە دزراوەکان دیترانەوە و ئەویش دانی بە کارەکەیدا نا و سێ

ســـاڵ حوکم درا، بەند کرا و، کە بەریشـــبوو دیتی کچە مامەکەی شـــووی بە خزمێکیان کردووە ناوی 'کاکەحەمە'یە. ئیدی لەســـەر ڕێی زەرداو-کفری بۆی دانیشـت و کوشـتی و ڕایکرد و بە چەکەوە لەگوندێکەوە دەجووە ئەویدی و دەترســـا خزمەکانی دەســـتی لێ بوەشێنن، تا پۆلیسیک گرتی و رادەستی حکوومەتی کرد.

حەیدەر هەواڵەی دادگای ســـزای گەورەی کەرکووک کرا و منیش پارێزەر بووم و دژی حەیـدەر بەرگریم لە خـانەوادەی کوژراوەکە دەکرد. ئیـدی بەنـدیی تـاهەتـای بۆ برایەوەهەناردرایە بەندیخانەی باقووبەی بەشێکی بۆ بەندییە شیوعییەکان تەرخان کرابوو و منیش پێشـترێ لەو بەندیخانەیە گیرابووم. بەڵام من حەوت سـاڵ بەندی لە بەندیخانە و سێ ساڵ چاودێریم لە کفری تەواوکرد.

حەیدەر بەنهێنی پەیوەندیی بە شـیوحییەکانەوە کرد و کەوتە بن کاریگەرییان و تێڕوانینی بۆ ژیان گۆڕا، لەو ماوەیەیدا خزمێکی "کاکەحەمە"ی لە تۆلەدا برایەکی حەیدەری کوستبوو کە پیاویکی بێ وەی بوو. بەڵام لە نەریتی عەشـــیرەتدا دەبێ تۆڵە لە هەر کەســـێکی تـاوانبـارەکە بکرێتەوە ئەگەر بێ گونـاهیش بێ، ئەو کەســـە، کە نـاوی "خوبیـار" بوو، بە ناوبژیوانیی من تا دوژمنداری و تۆڵەســـەندنەوە پتر پەرە نەســـێنێ، خۆی دایە دەســـت حکوومەت، بومە ناوبژیکەری هەردوولا تا ســـوڵحی عەشـــایەری بکەن. چونکە پێشـــبینیی ئەوەســـم دەکردحەیـدەر هەر لە یەکەم ڕۆژی بەربوونیـدا لە تۆڵەی برایەکەی خوبیـار دەکوژێ، ئیدی جوومە باقووبە بۆ دیدەنی حەیدەر تا کێشەکە چارەسەر ببێ.

سەید نەجم سـائیب موتەسەڕیفی باقووبەی بوو، ئەو خەڵکی کەرکوکە و لە خانەوادەی ســـەیدەکانی"ئال بو علک"ە، پێشـــترێش لە کەرکووک دادوەر"قازی" بووە و منیش پارێزەر، ئیدی پەیوەندییەکی برادەرایەتیمان دروســـتکردبوو. چوومە لای موتەســـەڕیف و داوای هـاریکـاریم لێکرد تـا ڕوو لە عەلی زێنولعـابدینی بەڕێوەبەری بەنـدیخـانە بنێ، کە بەوەی ناسرابوو دژی شیوعییەکانە و حەزدەکا لە بەندیخانە ئازاریان بدا. موتەسەڕیف پەیوەندیی پێوەکرد و داوای لێکرد ئەرکەکەم ئاسان بکا و پێیگوت: "وریابە نەتکاتە شیوعی".

چوومە بەندیخانەی باقووبە و داوای دیداری حەیدەری بەندکراوم کرد، بەڵام دیتم ئەو بنیادەمە توند و دڕەی جاران نییە. ئێستا ئەو مرۆڤێکی بی وەیە و لە هەموو ئەو کارانەس پەشـــیمانە پێشـــترێ کردوونی و ئازاری بە خۆی و خزمەکانیشـــی گەیاندووە. هەر خێراا بەدەم داوایەکەمەوە هات و ڕازیبوو ســـوڵح لەگەڵ خزمەکانی بکا، بەتایبەت "خوبیار"، گوتی: "هەموو کێشـــەکان من لێیان بەرپرسـیارم، تکات لێدەکەم داوا بکەی بمبەنەوە کفری تا خوبیار ببینم و داوای لێبووردنی لێ بکەم و داوای لێبووردن لە مندالەکانی "مایخان"ی براشـم بکەم. کە هێنایانەوە کفری ئەفســـەری پۆلیس دەترسـا حەیدەر و خوبیار بباتە لای

یەکدی چونکە دەیزانی حەیدەر چەند دڕ و توندە، بەڵام من هێورم کردەوەداوام لێکرد لە بەندیخانەی بنکەی پۆلیس دیداریان بۆ ڕێکبخا و، خوبیاریش لەوەی دەترسـا و، لەناو سەرسوڕماویی پۆلیس و گیراوەکاندا حەیدەر دەستی لە ملی خوبیار کرد و تکای لێکرد لەکارەکانی پێشـتریی ببوورێ و، داوای لێکرد لاپەڕەیەکی نوێی دوور لە گیانی تۆڵەی عەشایەری بکەنەوە. خوبیاریش درایە دادگایسزاای کفری و لەبەر ئەوەی هیچ شایەدێکیش نەبوو تاوانەکەی بەچاوی خۆی دیتبێ، دادگا بڕیاری بەردانی دا.
حەیدەر، کە لەبەندیخامە دەرچوو و هاتەوە کفری، لە بنیادەمێکی خراپەوە ببووە مرۆڤێکی زۆر نەرمونیان وتێکۆشەرێکی شیوعیی کە لەگەڵ شێخ عەتای برام، خوالێخۆشبێ،لە خەبات بەردەوام بوو.
کەسەکەی دووەمیان جووتیارێکی گوزەران خۆشـی گوندەکەمان بوو، بەڵام سەر بە گێچەل بوو و کاری ئەوەبوو گۆنگەڵان لە گوندی دروسـت بکا. پێشـتریش کابرایەکی عەشـیرەتی زەنگەنەی ناوی "شـەفیع ئاغا"بوودواترێ بووە سـەرکاری داودبەگی جافی خوالێخۆشبوو لەسەر ئەو زەوییانەی لە نێوان ئەو و شێخ عەبدولوەهاب تالەبانی کێشەیان لەسـەربوو. شـەفیع ئاغا بەدەسـتی شـێخ محەمەدی کوڕی شـێخ عەبدولوەهاب کوژرا و، زۆربەی جووتیارەکانی گوندەکەشـمان زەنگەنەبوون ، ئیدی ئەو جووتیارە دڕە "عەزیز ئیبراهیم سـوورونجی" دنەی عەشـیرەتی زەنگەنەی دەدا دژی ئەوانیدی و لای ئاغاکانی زەنگەنەی دەگرت و، باوکیشـم بەتەواوی لەو کێشـە و ململانێیانە بوونە هۆی کوشـتنی شـەفیع ئاغا دووربوو و سـەرکۆنەی ئەو کارانەشـی دەکرد. کە عەزیز زێدەڕۆیی لە فیتنەنانەوەی ناو گوندی کرد باوکم داوای لێکرد گوندەکەی بەجێبێڵی و بارکا. ئەویش چووە گوندی دوازدەئیمام، گوندەکەش لەبەر شـاردنەوەی دوازدە موسـلمانی لە شـەڕی هێزە ئێرانییەکانی بەرەو دەشـتی قەرەئۆغلانی نزیک کفری پاشـەکشـەیان کردبوو، کوژرابوون، ئیدی هەردوازدەیان لەسـەر گردێک شـاردراونەتەوە و ئەو گوندەش ناوی لێنراوە دوازدە ئیمام.
کە عەزیز ئیبراهیم ویسـتی زەوییە کێڵدراوەکان بۆوەرزی کشـتوکاڵی دادێ تۆ بکا وبەردەوام سـەر لە گوندی بداتەوە، باوکم لێنەگەڕا و گوتی هە موو خەرجییەکانی کێڵانی دەداتەوە. بەڵام ئەو پشـتی بە عەلی ئاغای زەنگەنە قایم بوو کە کوڕی حەسـەن ئاغای تابوور ئاغاسی بوو و، تابوور ئاغاسی فەرماندەی فەوجی هێزەکانی سوارەی حەمیدییەی بووە کەسولتان عەبدولحەمیدی دووەم لە کوردەکان دروستی کرد تا ڕێوبانەکان بپارێزن و هەر سـەرهەلدان و یاخیبوونێکی کوردیی نا ئیمپراتۆریای عوسـمانیش سـەرکوت بکەن. ئەوەش وەک "ڕاویژکاری فەوجی سـەرایای بەگریی نیشـتمانی" بوو" واتە فەوجی

جاشـــەکانی ســـەردەمی بەعس کە کە حکوومەتی بەغدا بۆ شـــەڕی شـــۆڕشـــی کوردی پێکیهێنابوون و دواتریش پێیاندەگوتن "جاش".

عەلی ئاغـا و دارودەســـتە چەکدارەکەی هەڕەســـەی ئەوەیـان دەکرد بە زەبری هێز زەوییەکانی عەزیز ئیبراهیمی دەهاژۆن. لە بەرانبەریشـــدا بـاوکم خزمە چەکدارەکانی کۆکردەوە و بەهێز دەستی بەسەر ئەو زەوییانەدا گرت، ئەودەمای من قوتابیی پۆلی یەکی ســـەرەتایی بووم کە عەزیز ئیبراهیمم دیت بەســـواری ئەســـپە ڕەشـــەکەیەوە هاتبوو ڕووداوەکە بە حکوومەت ڕاگەیەنێ. حـاجی عەلیی من لەگەڵ خـانەوادەکەی دەژیـام لێیپرســـی مەســـەلە چییە؟ لە وەڵامدا گوتی: "ئەوڕۆ خوێن دەگاتە چۆکان". منیش لەوەی دەترســـام شـــەڕی چەکداری لە گوندەکەمان ڕووبدا و ببێتە قســـابخانە. بەڵام کارەکە بە نـاوبژیی شـــێخ عەبدولوەهـاب تـاڵەبـانی کۆتـایی هـات و بـاوکم وەک گوتی قەرەبووی خورجییەکـانی کێڵانی عەزیز ئیبراهیمی کردەوە و ئەویش وازی لە زەوییەکە هێنـا و نەهاتەوە گوندی.

من ڕقم لەو کابرایەی هەڵگرتبوو کە دەیویســـت فیتنەی لەنێوان باوکم و عەلی حەســـەن ئاغای برادەری دروست بکا. ئەوڕووداوە لە ١٩٣١ بوو و، لە ١٩٥٦ نیشـتەجێی زۆرەملیم لە کفری بەســـەردا ســـەپا و ئۆتۆمۆبیلێکی بچکۆلەی جۆری "فیـات"ی ئیتـاڵیم کڕی و چاوبەستەم لە پۆلیسـان دەکرد و بەسـەو دەجوومە گوندەکانی دەوروبەر تا پەیوەندی بە جووتیارانەوە بکەم ولە شـــانەی جووتیاریی شـــۆڕشـــگێڕانەدا ڕێکیان بخەم، ئەوەی جێی ســـەرســـوڕمانیشـم بوو ئەزیز ئیبراهیم لە بەرایی ئەو کەسـانەبوو بەدەم بانگێشـتی منەوە هات و، هەڵسوکەوتی تەواو گۆڕابوو و، ئیستا مرۆڤێکی بێ وەی و خۆشەویست بوو وتا ڕۆژی مردنیشـــی هەر تێکۆشـــەرێکی شـــیوعی بوو. بیروباوەڕە لینینییەکان ئاوا پەرجوو دروستدەکەن.

## ڕووداوێک لەگەڵ قایمقامی کفری:

کە لە نیشتەجێی زۆرەملیی کفری بووم، هەوڵمدەدا کێشە لەگەڵ بەرپرسانی قەزایەکە دروست نەکەم، بەتایبەتیش کە بەرپرسە سەرەکییەکانی وەک سەید عومەر محەممەد ئاغای قایمقام و سەید قاسم یەعقووبیی دادوەر و فازڵ حەمیدی ئەفسەری پۆلیس هەموویان ناسیاوم بوون لە بەڕێوەبەرایەتی سەردانم دەکردن و لە یانەی فەرمانبەرانیش یەکدیمان دەدیت.

ڕۆژێکیان ڕووداوێکی ناخۆش لە گوندە چکۆلەکەی زەرداو ڕوویدا کە زۆربەی دانیشتووانەکەی لە عەشیرەتی "کیز"ی کوردن. ڕووداوەکەش ئەوەبوو دوو خێزان ببووە شەڕیان و بەدار لەسەری یەکێکیان دابوو و تووسی خوێنبەربوونی ناوەوە ببوو مرد و، سێ تاوانبارەکەس ڕایانکردبووە سەر سنووری ئێران.

قایمقام تکای لێکردم تاوانبارەکان بدەمە دادگا و ئەویش نووسراوەکان دەکێشێتەوە تا بپێیاسای داوای عەشایەریی عێراقی بەڕیوە بچێ و، منیش ئارەزووم لەوەی بوو تا کێشەی نێوان دوو خێزانەکە فراوان نەبێ و ڕەنگە تۆڵەی کوژراوەکە بکرێتەوە و کێشەکە گەورە ببێ.

عەشیرەتەکانی سەر سنووری عێراق و ئێران جمور و کاکەیی و باجەلان و شەرەفبەیانی و هیی دیکەبوون. منیش برادەرایەتیم لەگەڵ سەرۆکەکانیان هەبوو و نامەم بۆ ناردن و داوام لێکردن بەدوای تاوانبارەکاندا بگەڕێن و بیاانگرن و بیانێرنەوە کفری، یەکێکیان، کە هیدایەت خان بوو، لەناو سنووری ئێران گرتنی و بە برایەکەیدا ڕەوانەی کفریی کردنەوە، منیش لای خۆمەوە ڕادەستی قایمقامم کردن و داوام لێکرد بەپێی یاسا لێرسینەوەیان لەگەڵدا بکا و کارێک بکا بەپێی داوای عەشایەری سوڵح لەنێوان هەردوو خێزانەکە بکا. ئیدی قایمقام بەوە زۆر دڵخۆش بوو و فەرامانیدا نووسراوەکان بکێشرێنەوە تا لەڕووی بەڕێوەبەرییەوە کاریان تێدا بکا. منیش وەک چاودێر ئامادەی هەندێ دانیشتنی دادگاییەکە دەبووم. قایمقام هەموو جارێک بە تاوانبارەکانی دەگوت: "وانەزانن لەبەر لەبەر خاتری شێخ موکەڕەم یارمەتیتان دەدەم ، بە توندترین شێوە سزاتان دەدەم"، داوام لێکرد قاز لەو قسانە بێنێ، چونکە من داوام لێ نەکردبوو یارمەتیی تاوانبارەکان بدا و، لە ئەنجامیشدا هەریەکە و حەوتساڵ بەندییان بۆ بڕایەوە.

کە دادوەر بەو حوکمەی زانیبە قایمقامی گوت ئەو تاوانە تاوانی ئەنقەست نییە، بەکو دەسوەساندنێکە و بووەتە هۆی مردن. حوکمی ئیداریی ئەو جۆرە کێشانە لە دوو ساڵ و سێ ساڵ تێناپەڕێ. ئیدی وەڵامی قایمقام بەبەرچاوی ژمارەیەک بەرپرسەوە ئەوەبوو کە:

"من بۆیە لەگەڵیان توند بووم چونکە ســـەر بە موکەڕەم تالەبانین". کە گوێم لەو قســـەیە بووەوە زۆرم خەم پێ خوارد.
کە ئێوارەکەی لە نووسینگەی پارێزەری بووم زەنگی تەلەفۆن لێیدا، دیتم عومەر محەممەد ئاغای قایمقامە و دەڵێ: "من تاوانبارەکانم بە حەوت ســـاڵ ســزاداوە تۆ دەڵێی چ؟" منیش زۆر توورەبووم و گوتم: "خوا رووت ڕەشکا" و تەلەفۆنەکەم بەڕوویدا داخستەوە.
بەیانییەکەی بۆ هەندێ کاری پارێزەری چوومە لای ئەفسەری پۆلیس و، ئەدەم کەسێکی خەڵکی کەرکووک بوو و لە هاوڕێیانی خانەوادەکەمان بوو و ناوی مەدحەت بەکتۆ بوو. دوو کەســـی دیاری شـــارۆچکەکەی لەلابوو و ئەاونیش حاجی ڕەئوف و مەلا مەدحەت بوون. ئەفســـەرەکە زۆری ڕێز لێدەنام و دەیگوت: "تۆ بارودۆخی خۆت دەزانی ومنیش حەزناکەم کەس ئازارت بدا، تکات لێدەکەم برۆ لای قایمقام"، ژوورەکەی قایمقام لە ژووری ئەفســـەرەکە نزیک بوو. گوتم: "باســـە بۆ بچمە لای؟" بارودۆخی من چاودێریی پۆلیســـە، دەبێبچمە بنکەی پۆلیس و ڕۆژانە تۆماری لێرەبوونی خۆم واژوو بکەم، ئەگەر قایمقامیش بیەوێ لەجیاتی جارێک ڕۆژی دووجار دەچم".
لەو کاتیدا زەنگی تەلەفۆن لێیدا، ئەوەی ئەوسەری قایمقام بوو قسەی دەکرد، نازانم داوای چیی لێکرد، بەڵام وەڵامیداوە و گوتی وا لەلامە و جا دەخواتەوە و دوایە دێتە لاتان، گوتم: "بڵێ نایەت". ئەفســـەرەکە تکای لێکردم بە تەلەفۆن قســـەی لەگەڵ بکەم، کە گوێدانی تەلەفۆنەکەم بەگوێمەوە نا گوێم لێبوو قایمقام گوتی: "بەو ســـیفەتەی قایمقامم، پێت دەڵێم دەبی هەر ئێستا لە قایمقامییەت ئامادەبی"، گوتم : "هەی سەگی کوڕی سەگ بزانە تۆ کێی و بشزانە لەگەڵ کێ قسان دەکەی، ئەوەی تۆی کردووەتە قایمقام دیارە چ کەرێکە". ئیدی تەلەفۆنەکەم داخستەوە. ئەفسەرەکەی پۆلیس ڕەنگی لە ڕوودا نەما و زۆر شڵەژا، ئاخر لە بەڕێوەبەرایەتییەکەی و لە تەلەفۆنەکەی ئەویشـــەوە جوێن بە قایمقام درابوو. پێیمگوت: "مەترســـە، ئەگەر شـکاتی لێکردم یان هەر ڕێوشـوێنێکی دیی گرتەبەر، تۆ چیت لەمن گوێ لێبووە ئەوە بڵێ، چ دەکا با بیکا". لەودەمی فەڕاشـــی قایمقام دەرگای کردەوە و دوایە جووەوە لای قایمقام، دوای تۆزێک هاتەوە و داوای لە هەریەک لە حاجی ڕەئوف و مەلا مەدحەت کرد بچنە لای قایمقام، کە هاتنەوە گوتیان بەرووماندا هەڵشـاخا و گوتی: "ئێوەن نێوانی من و موکەڕەم تێکدەدەن" گوتیشیان ئاگایان لە مەسەلەکە نییە و سەریان سوڕما موکەڕەم لە تەلەفۆنی جنێو بە قایمقام دەدا.
دەمزانی قایمقام هیچم بەرانبەر ناکا، ئەو لە بەڕێوەبردنێ لاوازبوو و، ژنەکەی خوشـــکی هاوڕێیەکمان بوو، واتە شـەهیدی دکتۆر ڕوشـدی ئەحمەد، کە پاشـترێ هەواڵگریی عێراقی لە یەمەنی باشوور تیرۆریان کرد.

ئێوارەکەی، کە لە نووسینگەکەم بووم، قایمقام بەخۆ و بە فەڕاشەکەیەوە هاتن و هێشتا داخی ئەو هەڵسوکەوتانەیم لە دل بوو، جایەک و جگەرەیەکم دایە، ئەوجا لە نووسینگەکەم چوومە دەری و سواری ئۆتۆمۆبیلرکرم بووم تابچمەوە ماڵ و لەوی لە نووسینگەکەم بەجێی بێڵم، ڕەنگە ئەو هەڵسوکەوتە جوان نەبێ، بەڵام هەڵسوکەوتەکانی و داوکردنی لە پۆلیس تا بمبەنە بەردەمی نەدەکرا بێدەنگەی لێ بکرێ، دەبوایە لەجێی دارەکی دووی لێدەمەوە.

## حەمید عوسمان و هەوڵی پاکسازیی حیزبی شیوعیی عێراقی:

حەمید عوســـمان، دوای راکردنی لە بەندیخانە، نەیتوانی بەتەواو بەســـەر حیزبدا زاڵبێ ونەیتوانی حیزبیش بکاتە حیزبێکی جەماوەری، چونکە تێگەیشـتنەکانی سـنووردار بوون و چالاکییەکانی لە سنووری کوردستان تێنەدەپەڕی،لە کوردستانیس حیزبێکی دیموکراسی هەبوو، کە حیزبی دیمەکراسـیی کوردی بوو، کە مەلامسـتەفای بارزانی و هاواڵەکانی لە مهاباد دایانمەزراندبوو، لە کوردسـتانی عێراقیش دوو کەسـایەتیی دیار سـەرکردایەتییان دەکرد و ئەوانیش ئیبراهیم ئەحمەد و هەمزە عەبدوڵڵا بوون و، لەناوەندە کوردییەکان تەواو ناسرابوون.

حەمید حومان بۆ مەبەسـتی گەیشـتنە پلە و پایە دەیویسـت بچێتە پاڵ ئەو حیزبە، بەڵام چیی لە حیزبی شیوعی بکردایە کە تاکە حیزبی جەماوەریی چلەکانی ناوەندە کوردییەکان بوو؟ ئەری بۆ ئەو کەســـە ســـەرکردانەی بەجێبێڵێ کە کودەتایەکی ناڕەوای بەســـەردا کردبوون تا دەسـت بەسـەر حیزبدا بگرێ؟ لە کۆتاییدا بیری لە پاکتاوی حیزب کردەوە بە هەنجەتی ئەوەی نابێتە حیزبێکی جەماوەی و، دەبێ بخرێتە ناو حیزبی دیموکراسـیی. چونکە ئەو حیزبەش نە حیزبێکی لە ناو حیزب قبووڵ دەکرد و نە باڵباڵێنی ناو حیزب. پێدەچوو بەدەنگەوەهاتن گوێپێدانێکی لای ئەو ســـەرکردە و کادیرحیزبییە هەڵەرسـتە پاکســـازییانەی دەورەی نەدۆزیبێتەوە، جا بۆ ئەو بیرۆکانەی لێرەولەوێ لە پشـتیوانان دەگەڕا و، نازانم جۆنیش منی بەبیرهاتبووەوە لەکاتێکدا لەژێ چاودێریی پۆلیســـی کفریدابووم.

ئێوارەیەکیان شـــێخ عەتای برام هەواڵی دامێ کە حەمید عوســـمان لە گوندی زەرداو لە ماڵەکەیەتی و، دەیەوی من ببینێ. توانیمان لەو پۆلیســـە دەربازبین کە چاودێریی منی دەکرد و لەگەڵمدابوو. جا ســـواری ئۆتۆمۆبیلەکەم بووم و چوومە زەرداو. دیتم حەمید عوســـمان شـــیوعییەکی دیکەی لەگەڵدایە و خەڵکی بەرتەکیەی کەرکووکە و دەیناســـم.

ئەویش ئەحمەد کەشیش بوو و هەردووکیان بەپێ بە گوندەکای تاڵەبانیاندا هاتبوون.

حەمید عوسمان بەڕاسکاوی بیروڕایەکانی خۆی خستە بەردەمم و داوای کرد رای خۆمی لەوبارەوە بدەمێ، ئەودەمی بەنهێنی پەیوەنیم بە لیژنەی ناوخۆی کەرکووکەوە هەبوو. بەرپرســـەکەی ناوەناوە ســـەری لێدەدام تا نامەیەکی حیزبم بداتێ و هەندێ بڵاوکراوەی یزبییش. لە دانراوەکانی لینین و نووســـینەکانی هاوڕێ فەهد زۆرم لەبارەی بیرۆکە پاکتاوییەکان خوێندبووەوە، ئیدی ئاسان نەبوو حەمید عوسمان بیرۆکە پاکتاوییەکانی بە ئاســـانی بەســـەرمدا تێپەڕێن. دوای گفتوگۆیەکی زۆرو هەندێجار توندیش، پێمگوت ئەو بیرۆکانە مانای پاکتاوکردنی حیزبی شـــیوعییە و بە ئارەزووی حیزبە بۆرژوازی و

بۆرژوای بچووکە. ئەوجا بە ئۆتۆمۆبیلەکەم گەیاندمنە دوورپیانی کفری و کاریز و لەوێڕا بەپێ ڕۆیشتن و بە ناوچەکاندا بەرەو کەرکووک بوونەوە. خەڵکێکی زۆریش دەزنن حەمید عوســــمان ڕیزەکانی حیزبی بەجێهێشــــت تا ببێتە ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی دیموکراســیی کوردی، کە نەگەیشــتە ئامانجەکانیشــی دواتریش وازی لە کاری ســیاســی و حیزبی هێنا.

## چۆنم بە وادەی شۆڕشی ١٤ای تومموزی ١٩٥٨ زانی؟

کفری نیمچە تەریکی بارودۆخی سیاسیی بەغدا و چالاکیی سیاسیی حیزبەکان و ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز بوو. هەندێ هەواڵی سەیری عەقید عەبدولکەیم قاسم لە ئەحمەد ساڵحی ئەفسەری پۆلیس گوێ لێدەبوو کە خەڵکی سلێمانی بوو، گوایە دژی بەریتانییەکان و خانەوادەی پاسایی قسان دەکا و، وەهاش ناسرابوو کە نهێنیی قایمە و نزیکترین کەسیشی هیچیان دەربارەی چالاکییە نهێنییەکانی نەدەزانی.

بڕیاربوو دوو لیوا لە ناوچەی دەربەندیخان مانۆڕێک بکەن و مەلیک فەیسەڵی دووەم و ئەمیر عەبدولئیلای وەسی و نوری سەعیدی سەرۆکوەزیران و گەورە بەرپرسانی دیکەش ئامادەی بن، بەڵام ئەو مانۆرەی بە زەخیرەی ڕاستی دەکرا بە هەنجەتی نەخۆشکەوتنی مەلیک نەکرا.بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەبوو کە چینی دەسەڵاتدار هەستی دەکرد گەل زۆر دژیانە و چالاکیەکی سیاسی لەناو سوپاش هەیە و ئیدی خۆی دەپاراست. کە مانۆڕەکە هەڵوەشایەوە، هەندێ لەو یەکانەی بڕیاربوو لە مانۆڕەکەدا بەشداربن لەڕێی گەڕانەوەیان بە شارۆچکەی کفریدا تێپەڕین. ئێوارەیەکیان لە یانەی فەرمانبەران بووم و لەو ژوورەی قایمقام و دادوەر و ئەفسەری پۆلیس و پزیشی قەزای تێدا کۆدەبوونەوە. کۆمەڵێ ئەفسەر هاتنە ژوورەکە و لەوان عەقید عەبدولحەکەمی فەرماندەی فەوجیی کوردێکی خەڵکی ڕواندز و ئەفسەرێکی مولازمم ناسی کە لەکاتی قوتابییەتیی شیوعی بوو. رادیۆیەکە لەسەر ئێزگەی بەغدابوو و بە ڕست جنێوی بۆ سەرۆک جەماڵ عەبدولناسر دەنارد. ئەفسەرەکان بانگی بەڵێندەری یانەکەیان کرد و داوایان لێکردئێزگەی "ئیسرائیل" دابخا. بەڵێندەرەکە گوتی ئێزگەی بەغدایە، لەسەریان شێڕاند و گوتیان"ئیسرائیل"ە، ئەوجا تکایان لێکردم ئێزگەی "سەوتولعەرەب"ی قاهیرەیان بۆ بکەمەوە، منیش کردمەوە. یەکەم کەسی لە ژوورەکە چووەدەرێ ئەحمەد ساڵحی ئەفسەری پۆلیس بوو، ئەوجا عومەر محەمەد ئاغای قایمقام و پاشان قاسم یەعقووبیی دادوەر. ئیدی من ئەفسەرەکان مابنەوە. دەیانزانی من شیوعیم و نیشتەجێی زۆرەملێم بەسەردا سەپاوە. ئەوان داخی ئەوەیان بوو مانۆڕەکە نەکرابوو و بەرپرسەکان ئامادەنەببوون تا سەروبەرەکەیان لەگەڵدا یەکلاکەنەوە. ئەوجا ملی ڕێی کەرکووکیان گرت. دوای ماوەیەک شێخ عەتای برام پێیگوتم کەسێک لە بەغداوە هاتووە و دەیەوێ بۆ کارێکی گرنگ بمبینێ و ئێستا لە ماڵەکەیەتی لە گوندی زەرداو. دوای ئەوەی پۆلیسەکە چووەوە ماڵەکەی تا پشوێک بدا منیش جوومەوە ماڵەوە و سواری ئۆتۆمۆبیلەکەم بووم و رووم لە گوندی کرد. دیتم هاوڕێ جۆرج حەننا تەللو لەلایەن هاوڕێ سەلام عادلی سکرتێری حیزبی شیوعییەوە نێردراوە تا هەواڵی ئەوەم بداتێ بەو نزیکانە شۆڕشێکی نیشتمانی دەکرێ و نیزامی مەلەکی دەڕووخێنێ و کۆماری

رادەگەیەنێ. ڕوونیشــیکردەوە ڕەنگە وادەکە لەنێوان ۱۱ تا ۱٥ی تەمووز بێ، ئەو کاتەی لیوایەک دەجوولێ ئەفســـەرە ئازدیخوازەکانی پەیوەســـتی بزووتنەوەی نیشـــتمانی ســـەرکردایەتیی دەکەن و بەرەو ئوردن دەچێ. داوای لێکردین وریابین نەکا لایەنگرانی ڕژێم هەوڵدەن تۆڵەمان لێ بکەنەوە یان یاخیبوونێکی عەشایەری لە دژی شۆڕش بکرێ.
گەرامەوە کفری و دڵنیاسبووم هیچ یاخیبوونێک ڕوونادا، چونکە ئەو عەشیرەتەی دەتوانێ یاخیبێ عەشـیرەتی جافە و ئەوانیش پێیان ناکرێ چونکە ململانێ لەنێوان سـەرۆکەکان و خەڵکەکەی لەسـەر ئەو زەوییانە هەیە کە سـەرۆکەکان دەڵێن گوایە لەبەردەستی ئەوانە و لەناو ســـەنەدی تاپۆیەکەیانە، بەڵام تیرەکان بانگەشـــەی ئەوەی دەکەن ئەو زەوییانە دانەچێندراون و تەنیا بە داجاندنیشیان دەبنە موڵک و لە دێرزەمانیشەوە پاوانی عەشیرەت بووینە نەک ســـەرۆکەکان. ئیدی داوایەکیان لە دادگا تۆمارکرد و جیهاد وەنداوییان کردە بریکار تا بەرگری لە مافەکانیان بکا . کەواتە هیچ یاخیبوونیک دژی شۆڕش دروست نابێ.
لەو مەودایدا داوەتی ئاهەنگی شـووکردنی کچە میمکێکم بووم"نامق حەمەد دزەیی"نامق لە لایەنگرانی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو و ، ژنو ژنخوازییەکەش لەگەڵ خدر ئەحمەد پاسای مامی بوو و "ژن بە ژن" بوو. نامق کچی خدر ئاغای هێنابوو و کوڕی خدر ئاغاش کچی حەمەد ئاغای هێنابوو.
ئەوکاتەی لە حەوشـــەی ماڵەکە ڕاکشـــابووم و داوەتکراوەکانی ســـەرۆکەکانی دزەییان پۆکەریان دەکرد، خدر ئاغا هات و پرســـیاری منی کرد، داوای لێکردم لەگەڵ ی بچمە گوندەکەیان کە لەوێ ئاهەنگی ژنهێنانی کوڕەکەی دەگەڕا. خالید نەقشبەندیی موتەسەڕیفی لەمێژبوو یەکدیمان دەناسـی و عەونی یوسـفی کۆنە برادەرم داوایان کردبووم، بەڵام من داوای لێبووردنم کرد چونکە لەسەر داوەتی حەمەد ئاغای مێردی میمکمم و ڕاشنەهاتووم شەوان درەنگ بخەوم.
ئێوارە کـاتی شـــێوکردن، عەلیی کوڕی عەزیزئـاغـای دزایی گـالتەی لەگەڵ دەکردم و نەیگوت بەڕاستی پێت بڵێم من تۆم خۆشناوێ جونکە شیوعیی. بەیانیی ١٤ی تومموززی ۱۹٥۸ سـەعات شـەش بوو و نانی بەیانیمان دەخوارد، شـوفێرێک خۆی لە ژوورێ کوتا و ڕادیۆی کردەوە و خەریکبوو لە خۆشـییان دەفڕی و پێیگوتین شـۆڕش کراوە و مەلیک و جێنشـــین"ڕەنگە وەســـی بێ.ل .ب"کوژراون. منو نووری تاڵەبانیی ئامۆزام پێکەوەبووین و باسی دروستیی شۆڕش و ئەو هێزانەم بۆ کرد کە لەپشتیەوەن و مامۆستایەکی عارەبیس لەوێ بوو ئەو هەواڵەم پێگوت و زۆر دڵخۆش بوو. بەڵام کپییەک ڕووی ئاغاکانی دزەیی داگرت، هەریەکەیان چەندین چەکداری هەبوو پاســەوانیان لێ دەکرد، هەر هەندەی گوێیان لە هەواڵەکە بوو جەکەکانیان برد و دوور ڕاوەستان.

سـەرۆکەکان لە نیەتیان ترسـان، نەریتی سـەرۆکە دزەییەکانیش وابوو تفەنگیان بە دیاری دەدا زاوای و جەکەکـان لە گۆشــــەیەکی ژوورەکە کۆکرابوونەوە. داوایـان لە زاوا کرد چەکەکانیان بداتی تا بەرگری تا خۆیانی پێ لە پاســەوانەکانیان بپارێزن. تکایان لێ کردم داوا لەو پاسەوانانە بکەم دەستدرێژییان نەکەنە سەرێ. ئامۆژگاریی چەکدارەکانم کرد کە شـــۆڕش لە بەرژەوەندیی ئەوانە و دژی دەرەبەگانە و، با یاســـا نەبەزێنن. بەڵام دەبێ وریابن وئەگەر یەکێک ویســتی یاخی ببێ بەرگری لە شـــۆڕش بکەن. بەپەلە گەڕامەوە کەرکووک، ماوەیەکی کورت بوو لە گەڕانان ئازادبووم، چونکە ماوەی نیشـــتەجێبوونی بەزۆرم کۆتایی پێ هێنابوو. کە عەقید شێخ خالید نەقشبەندی کرایە ئەندامی ئەنجوومەنی دەسەڵاتداریی پێکهاتبوو لە هەریەک لە فەریق محەممەد نەجیب ڕوبەیعی و شێخ محەممەد مەهدی کوببە، خالید نەقشـــبەندی لەگەڵ ئەفســـەرە ئازادیخوازەکان نەبوو، بەڵام لە هەڵوێســتی ئاوادا، پەیوەندیی تاکەکەسـیی نێوان ئەفسـەران ڕۆڵی خۆی دەگێڕێ و، خالید نەقشـــبەندی بوچوونێکی ڕوونی دەربارەی شـــۆڕش نەبوو، بۆیە کەگوێی لە بڕیاری دامەزراندنی بوو دوودڵ بوو لەوەی پەیوەندی بە پێگەکەوە بکا یان نا، ئیدی چووە لای لیوا عەبدولوەهاب شاکری قائید فیرقە لە کەرکووک تا راوێژی پێ بکا دەبێ چ بکا. وەڵامی عەبدولوەهاب شاکر ئەوەبوو: "خۆت لەو کارەوە مەگلێنە، چەند سەرسەرییەکن، وەسی و مەلیکیان کوشتووە، بەڵام نوری پاشا دەربازبووە وکارەکا دەگێڕێتەوە سەر باری خۆیان".
ئیدی ئامۆژگاریی ئەوەی کرد بچێتەوە ســــەر کارەکەی خۆی، موتەســــەڕیفیی هەولێر، نەقشــبەندی گەڕایەوە هەولێر و کە عەونی یوســف بەوەی زانیهانیدا خۆی بگەیەنێتە ئەو پۆســتە نوێیەی جونکە ناوی لە ئێزگەکان خوێندراوەتەوە، جا ئەگەر شـۆڕش ســەرکەوت ئەو جێگری ســـەرۆککۆمارە و ئەگەر شـــکســـتیشـــی خوار هیچ شـــتێک دادی نادا. ئیدی نەقشبەندی، بێ ئەوەی بەلای عەبدولوەهاب شـاکردا تێپەڕێ، چووە بەغدا، هەرچی ئەوەی دیکەیان بوو خانەنشـــین کرا و دواتریش کرایە موتەســــەڕیفی لیوای حیللە.کە گەڕامەوە کەرکووک هیچ شـــتێکم دەربارەی شـــۆڕش نەدیت لە لافیتەیەکی بەخێرهێنانی قەڕالیچە "فازیلە"ی دەستگیرانی مەلیک فەیسـەل نەبێ کە فڕێدرابووە سـەر زەوی. هەر هەمان ڕۆژ چوومەوە کفری.

## گەڕانەوە کەرکووک:

پێش شۆڕشی ١٤ی تەمموز ماوەی چاودێریی پۆلیسم تەواوکردبوو. بەڵام بە خەمڵاندنی من حکوومەت ڕێی نەدەدا لە کەرکووک دانیشم، ئیدی تا شۆڕش جەسپا لە کفری مامەوە. هەرکە گەڕامەوە کفریش لیژنەی بەرگریکردن لە شۆڕشم دامەزراند و هەموو لایەنگرانی شۆڕشی دەگرتەوە و یەک لە ئەندامەکانیشی عەلی حەمدیی ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. عەلی حەمدی بەڕێوەبەری تاپۆی کفری بووبەڵام پێش شۆڕس هیچ چالاکییەکی سیاسیی دیاری نەبوو، بەڵام پەیوەندیی بە حیزبی ناوبراوەوە هەبوو.
دوای ماوەیەک حیزب داوای لێکردم بەیەکجاری بچمەوە کەرکووک، ئیدی خانوویکم بە کرێ گرت و کەسوکارەکەم بردەوە کەرکووک. جەماوەرێکی زۆری کورد و تورکمان تا سەرتخووبی قەزایەکە بۆ ماڵئاواییم هاتن و خۆشەویستیی خۆیان بۆ دەربڕیم و هیوایان دەخواست هەر لەناویان بمێنمەوە. لە کەرکووک درامە پاڵ لیژنەی ناوخۆی لیوا و بەرپرسی لیژنەکەش هاوڕێیان نافیع یونس و عەزیز محەممەد بوون. نووسینگەیەکم بەناوی پارێزەری هەبوو و نوری تاڵەبانیی پارێزەر هاوبەشم بوو، بەڵام لەڕاستیدا نووسینگەیەکی ئاشکرای حیزب بوو و، خەڵکێکی زۆر سەردانیان دەکردم و، هاوڕێ عەزیزمحەممەدیش بۆ دیداری حیزبییەکان زۆر دەهاتە نووسینگەکە. کتێبخانەیەک بەناوی "کتێبخانەی لاوان" کرایەوە وهاوڕێ"جەبار زوهێری" بەڕێوەی دەبرد، کە سابیقە مەندایی بوو، پاشان عەبدولڕەزاق عەبدولواحید بووە بەرپرسی کتێبخانەکە و کتێبی مارکسیی تدابوو و وەک بنکەیەکی لاوان و قوتابیان بوو.
لە کۆبوونەوەیەکی گشتیی، بێ ئەوەی مامەشێخ جەمیلم بزانێ، لە تەکیەی تاڵەبانی کرا، چەند لیژنەیەک بۆ بەرگریکردن لە کۆمار پێکهێنران. یەکەمجاربوو ڕێکخراوێک لە موسڵمان و مەسیحی و کورد و تورکمان و ئاشووری و کلدان پێکبهێنرێ. بەڵام چالاکیەکانمان بەدڵی لایەنە "کۆنەپەرست"ەکان نەبوو وهێشتا کونسوڵخانەی بەریتانی وئەمریکی و تورکی هەر لە کەرکووکێ مابوون و ، کۆمپانیای نەوتیش چالاکییەکی گەرموگوڕی دژی شۆڕش هەبوو و سەرپەرشتیی هەندێ کەسی"کۆنەپەرس"ی دژە شۆڕشی دەکرد. بۆ نموونە، عەبدولڕەزاق عەبدولغەفووری بەڕێوەبەری پۆلیس، کە ئەفسەری ئاسایشی کەرکووک بوو ڕۆڵێکی گەورەی لە دژایەتیی بزووتنەوەی نیشتمانیدا هەبوو و دوای شۆڕشیش گیرا، کۆمپانیای نەوت هەر بە ڕواڵەت ئۆتۆمۆبیلە تایبەتییەکەیان بە کرێ گرتبوو و کرێیەکی جاکیان دەدایە خێزانەکەی و، گەلێ کاری دیکەی لەو جۆرەس کران.

## گەڕانەوە کەرکووک:

پێش شۆڕشی ١٤ی تەمموز ماوەی چاودێریی پۆلیسم تەواوکردبوو. بەڵام بە خەملاندنی من حکوومەت ڕێی نەدەدا لە کەرکووک دانیشم، ئیدی تا شۆڕش جەسپا لە کفری مامەوە. هەرکە گەڕامەوە کفریش لیژنەی بەرگریکردن لە شۆڕشم دامەزراند و هەموو لایەنگرانی شۆڕشی دەگرتەوە و یەک لە ئەندامەکانیشی عەلی حەمدیی ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. عەلی حەمدی بەڕێوەبەری تاپۆی کفری بووبەڵام پێش شۆڕس هیچ چالاکییەکی سیاسیی دیاری نەبوو، بەڵام پەیوەندیی بە حیزبی ناوبراوەوە هەبوو.

دوای ماوەیەک حیزب داوای لێکردم بەیەکجاری بچمەوە کەرکووک، ئیدی خانووێکم بە کرێ گرت و کەسوکارەکەم بردەوە کەرکووک. جەماوەرێکی زۆری کورد و تورکمان تا سەرتخووبی قەزایەکە بۆماڵئاواییم هاتن و خۆشەویستیی خۆیان بۆ دەربڕیم و هیوایان دەخواست هەر لەناویان بمێنمەوە. لە کەرکووک درامە پاڵ لیژنەی ناوخۆی لیوا و بەرپرسی لیژنەکەش هاوڕێیان نافیع یونس و عەزیز محەممەد بوون. نووسینگەیەکم بەناوی پارێزەری هەبوو و نوری تاڵەبانیی پارێزەر هاوبەشم بوو، بەڵام لەڕاستیدا نووسینگەیەکی ئاشکرای حیزب بوو و، خەڵکێکی زۆر سەردانیان دەکردم و، هاوڕێ عەزیزمحەممەدیش بۆ دیداری حیزبییەکان زۆر دەهاتە نووسینگەکە. کتێبخانەیەک بەناوی "کتێبخانەی لاوان" کرایەوە وهاوڕێ "جەبار زوهێری" بەڕێوەی دەبرد، کە سابیئە مەندایی بوو، پاشان عەبدولڕەزاق عەبدولواحید بووە بەرپرسی کتێبخانەکە و کتێبی مارکسیی تێدابوو و وەک بنکەیەکی لاوان و قوتابیان بوو.

لە کوبوونەوەیەکی گشتیی، بێ ئەوەی مامەشێخ جەمیلم بزانێ، لە تەکیەی تاڵەبانی کرا، چەند لیژنەیەک بۆ بەرگریکردن لە کۆمار پێکهێنران. یەکەمجاربوو ڕێکخراوێک لە موسڵمان و مەسیحی و کورد و تورکمان و ئاثووری و کلدان پێکبهێنرێ. بەڵام چالاکیەکانمان بەدڵی لایەنە "کۆنەپەرست"ەکان نەبوو وهێشتا کونسوڵخانەی بەریتانی وئەمریکی و تورکی هەر لە کەرکووکێ مابوون و ، کۆمپانیای نەوتیش چالاکییەکی گەرموگوڕی دژی شۆڕش هەبوو و سەرپەرشتیی هەندێ کەسی"کۆنەپەرس"ی دژە شۆڕشی دەکرد. بۆ نموونە، عەبدولڕەزاق عەبدولغەفووری بەڕێوەبەری پۆلیس، کە نەفسەری ئاسایشی کەرکووک بوو ڕۆڵێکی گەورەی لە دژایەتیی بزووتنەوەی نیشتمانیدا هەبوو و دوای شۆڕشیش گیرا، کۆمپانیای نەوت هەر بە ڕواڵەت ئۆتۆمۆبیلە تایبەتییەکەیان بە کرێ گرتبوو و کرێیەکی جاکیان دەدایە خێزانەکەی و، گەلێ کاری دیکەی لەو جۆرەس کران.

ڕۆژێکیان دەستەیەک کەسایەتیی ئاثووریی ئەفسەری سوای لیڤیی بەریتانی بوون و مووچەی خانەنشینییان لە باڵیۆزخانەی بەریتانی وەردەگرت، هاتنەلام و داوایان لیکردم بەدواداچوونیان بۆ بکەم تا خزمەتەکانیان لە سوپای عێراقیش هەر بە خزمەت دابندرێ.
ئەوەی سەیریش بوو، هەموو خانەنشینە ئاثوورییەکانی سوپای لیڤی، بەپێی مۆڵەتێکی لە دەسەڵاتە بەریتانییەکان دەرچووبوو و ڕێی دەدان چەکیان هەبێ، چەکەکانیان بە سەد فیشەکەوە هەر لەلابوو "بەڵام بەو مەرجەی تەنیا لە مەسەلە نیشتمانییەکاندا بەکاربهێنرێ".
جا منیش پێمگوتن خزمەتەکانی سوپای بریتانییان بە خزمەتی سوپای عێراق دادەندرێ.

## پێشوازی لە گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانی:

لەگەڵ شـــاندێکی کەســـایەتییە کوردەکانی کەرکووک ئامادەی پێشـــوازیی بەڕێز مەلا مســـتەفای بارزانی بووم بەبۆنەی گەرانەوەی لە یەکێتیی ســـۆڤیەت. ئەو کاتەی جووینە "هۆتێل دجلە"ی بارانی لەوی دابەزیبوو، چاومان بە هەردوو ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی پارتی دیموکرات کوردســـتان، عومەر دەبابە و جەوهەر عەزیز دزەیی، کەوت. داوامان لێکردن دیداریکمان لەگەڵ بەڕێز بارزانی بۆ ڕێکبخەن، بەڵام ئەوان بە هەنجەتی ئەوەی کات نییە داوای لێبووردنیان کرد.

موقەدەم میرحاج ڕووداوەکەی گەیاندبووە بارزانی و ئەویش داوای لێکردبوو پەیوەندیم پێوە بکا و هەر یەکســـەر داوەتی دیداری بارزانیمان بکا، لە دیداری شـــاندەکەش لەگەڵ بەڕێز بارزانی ، کە لە من و مارف بەرزنجی و نوری تاڵەبانی و مەجید کاکە و حاجی مەحمود پێکهاتبوو، ســـەبارەت بەوەی لەگەڵ هەردوو ئەندامەکەی لیژنەی مەرکەزیی حیزبەکە، ڕوویدابوو داوای لێبووردنی لە شاندەکە کرد و گوتی:ئەوانە ئەو هەڵسوکەوتانە بەناوی من و بێ ئیزنی من دەکەن و من پەیوەندیم پێیانەوە نییە. وەفدەکەش داوای لێبووردنەکەی بارزانیی قبووڵ کرد.

دوای قبووڵکردنی لێبووردنەکەی پێمگوت: " بەڕێزتان چ لەســـەرکردەیی پارتی دیموکراتی کوردستان بن و چ سەربەخۆ بن، لای هەمووان ڕێزتان هەیە و، ئێستا لە کوردستان دوو حیزبی ســـیاســـی هەن پێشـــڕەویی جەماوەری کوردی دەکەن و، لە مەســـەلە ئێســـتاییە پێویستەکانیشدا لەگەڵ یەک کۆکن. هەندێ جیاوازیی فیکری و سیاسییان لە نێواندا هەیە و، بەڕێزتان دەتوانن لە نزیککردنەوەی بۆچوونی نێوانیاندا و، لەپێناو بەرژەوەندیی گەلی کورد، ڕۆڵتـــان هەبێ". بـــارزانی بە تووڕەییەوە گوتی: "حیزبی شـــیوعییس دۆدەکا". وەلامداوە: " بەڕێز بارزانی، دەتوانن لەسەر هەڵەیەکی ئەم هەڵوێست یان ئەو هەڵوێست ڕەخنەیەکی برایانە لە حیزبی شیوعی بگرن، بەڵام دروســـت نییە سیفەتی درۆزنی بدەیە پاڵ حیزبێکی تێکۆشاوە و گەورەترین قوربانیی لەپێناوی گەل داوە". بارزانی گوتی: "ئەگەر عەبدولکەریم ئامۆژگاریی من قبووڵ بکا، پەنجا ســـەرکردەی حیزبە عێراقییەکان لەسیدارە دەدا، ئەودەمی دەەتوانێحوکمی وڵات بکا". وەلامدایەوە: "ئەگەر ئەو ماوەیە لە"قەرەتەپە بوویتایە لەوەی پتر فێردەبو کە لە یەکێتیی ســـۆڤیەت فێری بووی". هەســـتام تا دیدارەکە بەجێبێڵم، بەڵام بارزانی هێوری کردمەوە و دۆستانە دانیشاندمەوە.

**گفتوگۆیەک لەگەڵ نازم تەبەقچەلی قائید فیرقەی دوو:**

عەمید نازم تەبەقچەلی کرابووە قائید فیرقەی دوو، هەر لەگەڵ دەســـتبەکاربوونیشـــی هەڵوێســـتی بەرانبەر حیزبی شیوعیی عێراقی و پارتی دیموکراتی کوردستان نەرێنی بوو.

بەڵام ەفســەری رەکنی دووەمی فیرقەکە،ســەبیح عەلی غالبی موقەدەم ڕوکنی ســەر بە ڕێکخراوی ئەفســەرانی ئازادیخوازبوو، ئەو هەڵوێســتی بەرانبەرمان باش بوو و، ئەو ئەفســەرانەی لایەنگری شـۆڕشـیشـبوون لە کەرکووک ژمارەیان کەم بوو وهەریەک لە "ســەبیح عەلی غالبی موقەدەم ڕوکن و ســەباح ســائیبی ڕائید و زیاب عەلکاویی نەقیب بوون".
تا تەبەقچەلی هات، ســەبیح ســەرپەرستیی فیرقەی کرد و تا زەکی خەتیبی بەڕێوەبەری نوێیش هات سەباح غالب سەرپەرشتیی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی کرد و ، بۆ چارەسەری ئەو کێشــانەی دروســتیش دەبوون زۆرم ســەر لە ســەبیح عەلی غالب دەدا و، دەزگا و دایەرەی بەڕێوەبردن و پۆلیس هێشــتا هەر ئەوەی جاران بوون و لیوا بەشــیر حەدیدی ملکەچی کۆمپانیاکانی نەوت و بەرتیل خۆر هێشتا موتەسەڕیف بوو و، موقەدەم هیدایەت ئەرسەلان و عەمید جەماڵ کەماڵ فەرماندەی ئینزیبات بوون و، ئەو ڕاییکەرانەی کارەکان هیچیان لایەنگری شۆڕش نەبوون و کارەکان بە هەڕەشەی موقەدەم سەبیح عەلی غالب بەڕیوەدەچوون.
کە نازم تەبەقچەلی پەیوەندیی بە ســەرکردایەتیی فیرقەی دوو کرد، هەڵێســتی بەرانبەر حکوومەتی دامەزراو نەرێنی بوو و کاروبارەکانی وا ڕێکدەخســت پێدەچوو لە داهاتوودا بەنیازی بەرپاکردنی بزووتنەوەیەکی کودەتایی بێ. ســەبیح عەلی غالبی گواســتەوە و کردییە پاشــکۆی ســەربازی لە ئەنقەرە و نەقیب عەزیز ئەحمەد شــەهاب هاتە جێی کە دواتریش پاش شکستی کودەتایەکەی عەبولوەهاب شەواف لەموڵ پێکەوە لەسێدارەدران.
نازم تەبەقچەلی لە بەرایی کارەکانیدا هەندێ ڕێوشوێنی دژی پارتی دیموکراتی کودستان گرتەبەر. فەرمانیدا هەرکەسێ پارە بۆ ئەو حیزبە کۆبکاتەوە بیگرن. ئیدی عومەر مستەفای پارێزەری بەرپرســی ئەو حیزبە، کە پێیاندەگوت عومەر دەبابە، هاتە ســەردانم تا داوا لە تەبەقچەلی بکەم بەریان بدا. چوومە بنکەی فیرقە و داوام لە موقەدەم ســەبیح عەلی غالب کرد بە قائید بڵێ دەمەوێ بیبینم و، هەر یەکسەر چوومەلای و بابەتەکەم خستە بەردەمی.
لە چەکمەجەی نووســینگەکەی بیتاقەیەکی دەرهێنا کە نەخشــەی کوردســتانی لەســەر چاپکرابوو و، ئەو بیتاقەیەبوو کە ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان بەخشــەکانایێ بۆ حیزب پێ کۆدەکردەوە. قـائید گوتی: ئەرێ ئێســتـا کـاتی ئەوەیە ئەو نەخشــەیە بڵاوبکرێتەوە؟ گوتم: نا ئێســتا کاتێکی گونجاو نییە، بەڵام دەرســم داخوا ئەو هەڵمەتەی تۆس بۆ گرتنیان کـاتێکی گونجاوە؟ تەمـاشــایەکی بیتاقەکەی کرد و گوتی ســەیرکە کەرکووکیشــیان خســتووەتە ســەر کوردســتان، گوتم: ئەدی کەرکووک چییە؟ شــارێکی

پاکســـتانە؟ گوتی: چیتان دەوێ؟ دەتانەوێ کەرکووکیش ببەن؟ گوتم: ئێســـتا ئێمە لە سەروبەندیدابەشکردنی ولاتین یان یەکخستنی؟.

هەر لە هـاتنە کەرکووکیشـــیرا، تەبەقچەلی خۆی لە تورکمـانەکـان نزیکـدەکردەوە، لە خۆشـــەویســـتیی ئەوان نەبوو بەڵکو بۆ ئەوەی بوو ســـوناســـی کوردی لە ناوچەکە ڕەشــکاتەوە، ئیدی تورکمانە کۆنەپەرســتەکان دەســتیان بە جوولە کرد و لەژێر پەردەی ئایینیش کۆبوونەوەی فراوانیان دەکرد. واتە خوێندنەوەی مەولوودی بێ ئەوەی کاتی بێ و، ئەوەندە مەولوودەی لە یەک مانگدا کرا لە هەموو ســـاڵەکانی پێش شـــۆڕش نەکرابوو و،تەبەقچەلیش لە هەموو ئەو کۆبوونەوانە ئـامـادەدەبوو کە خەڵکـانێـک دەیـانکرد هیچ پەیوەندییاان بە دینداریەوە نەبوو.

## یەکەم دیدارم لەگەڵ عەبدولکەریمی سەرکردەی شۆڕش:

سـەبیح عەلی غالب داوای لە من و لە هاوڕێ فاتیح داود جەباری کرد بۆ دیداری پێشـەوا عەبدولکەریم قاسـمی سـەرۆکوەزیران بچینە بەغدا. بە تەلەفۆن پەیوەندیی بە عەقید ڕەفعەت ئەلحاج سـرِیی بەڕێوەبەری هەواڵگریی سـەربازی کرد تا دیدارەکە ڕێکبخا و، هەردووکمـان چووینە بەغدا و چووینە وەزارەتی بەرگری، کە بەڕێوەبەری هەواڵگری و پێشەوا عەبدولکەریم قاسم لەوێبوون. زۆری نەخایاند و قاسم داوای کردین و پێشتریش فاتیح مەلا داودی دەناسـی، کە ئەویش پێشـترێ ئەفسـەر بوو. لە فاتیحی پرسـی ئەگەر داوای سـتێکی لێ بکا ئامادەیە بیکا؟بەڵام فاتیح گوتی ئەو تەنیا بۆ پیرۆزبایی هاتووە. عەبدولکەریم گوتی سـەرۆکی شـارەوانیتان، کە شـێخ فازڵ فەیزوڵڵا بوو، دەرکراوە و، موتەسـەڕیفیش کراوەتە پشـکنەری بەڕێوەبەری. کەچی فاتیح داخی خۆی بۆ دەرکردنی فازڵ تاڵەبانی دەربڕی و گوتی سەرباری فیکرە ڕاستڕەوەکانیشی ئەو فەرمانبەرێکی پاک بوو. هەرچی موتەسـەڕیفە، کابرایەکی بەرتیل خۆر بوو، ئیدی جۆن کەسـێکی پاک دەردەکرێ و بەرتیـل خۆرەکەش دەهێڵدرێتەوە؟! عەبـدولکەریم گوتی: ئەو کـارانە لای عەبدولسەلام عارفە.

ئەوەی جێی سـەرسـوڕمانم بوو، فاتیح، بێ ئەوەی حیزب ڕێی ئەوەی دابینێ، هاوکاریی ڕێکخراوە شـیوعییەکانی خسـتە پێش عەبدولکەریم قاسـم. ئاخر کەناڵی دیکەی پەیوەندیی حیزب و قاسم هەبوون، بەڵامقاسم گوێی بە کارەکە نەدا.

کە لای قاسم هاتینەدەرێ، چووینە لای بەڕێوەبەری هەواڵگری، تادیدارێکمان لەگەڵ عەقید عەبدولسـەلامی جێگری سـەرۆکوەزیرانیش بۆ ڕێکبخا. پرسـیی لەو دیدارەمان لەگەڵ پێشـەوا عەبدولکەریم قاسـم و عەبدولسـەلام عارف هەسـتمان چۆن بووە. گوتمان هەرچی ئەوەی دووەمە"واتە دیداری عەبدولسەلام" پوولێکی نەهێنا و پێویستیش نەبوو!

کە گەڕاینەوە کەرکووک، سـوبحی عەلی غـالـب پێیڕاگەیـانـدین گواسـتراوەتەوە بۆ "ملحق"هاوبەشـتی سـەربازیی ئەنقەرە ونەقیب عەزیز ئەحمەد شـەهاب جێی دەگرێتەوە کە ئەفسـەرێکی خەڵکی لیوای موسڵە . یەکەم شتی کە عەزیز ئەحمەد شـەهاب پێشنیاری بۆ کردم ئەوەبوو کە تەبەقچەلی حەزدەدا پۆسـتی سـەرۆکی شـارەوانی وەرگرم، بەڵام من لەبەر هۆی خانەوادەیی داوای لێبووردنم کرد چونکە نامەوێ جێی خزمەکەم بگرمەوە کە لەو پۆستە دەرکراوە.

کە دەنگۆی ئەوەی بڵاوبووەوە گوایە تەبەقچەلی لەو پیلانە کوداتـاییە تێوەگلاوە کە کە ڕەشید عالی گەیلانی ویستبووی بیکا و، ئەفسەرە ڕاستڕەوەکان لە دەوری کۆببوونەوە تا حوکمەکەی قاسـم بڕووخێنن. بەڵام قاسـم کەتیبەیەکی تانکی بەفەرمادەیی نەقیب فازڵ

بەیاتیی ئەفســەری شــیوعی ڕەوانەی کەرکووک کرد تا ڕاســتەوخۆ پەیوەندیی بە منەوە هەبێ. لە ڕۆژی ڕاگەیاندنی گرتنی ڕەشــید عالی گەیلانی، فازڵ بەیاتی تانکەکانی لە ناوچە ستراتیژییەکانی ساردا بڵاوکردەوە. ئەوەش تەبەقجەلیی شڵەاند، بەڵام من، دەرحاڵ داوای دیداری تەبەقچەلیم کرد و، لە یانەی ئەفســەران دیتمی، گوتم برووســکە بۆ لایەنگریی ڕێوشــوێنەکانی گرتنی ڕەشــید عالی بکە پڕوپاگەندەکان لەخۆت دوورخەیەوە، ســەرباری ئەوەی ڕازیبوو و برووســکەکەیشــی هەنارد، بەڵام هێشــتا گومانی لێ دەکرا و هیچ کارێکیشی بەرانبەر نەکرا.

حکوومەت بەڕێز عەبدولجەلیل حەدیســیی کردە موتەســەڕیفی کەرکووک تا جێی بەشــیر حەداد بگرێتەوە. عەبدولجەلیل پێشــترێش بە پــاکی نــاســرابوو و بە هەڵوێســتە چاونەترســییەکانیشــی بەرانبەر دەرەبەگەکانی ئال تاسـینی قەزای "حەی". ئەو لە کەسە نیشـتمان پەروەرەکانی نزیکی حیزبی"وەتەنیی دیموکراسـی" بوو. لە نووسـینگەکەی خۆی بەخێرهاتنم کرد و ئەویش بەخێریهێنام و داوای کرد بۆ پرسورا سەری لێ نەبڕم.

## مەلا مستەفا و سەردانی کەرکووک و بارگرژیی نەتەوەیی:

مەلا مستەفای بارزانیی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان گەڕانێکی بە شارەکانی باکووردا کرد، لەوانەش شاری کەرکووک.[39] لەدەرازەی ڕێگای هەولێر کەرکووک جەماوەرە کوردەکە پێشوازییەکی گەرمیان لێکرد و ئەوەش ڕقی تورکمانەکانی هەڵساند و بەتایبەتییش ڕاسپەرەوەکانیان. تا کوردەکان زۆری دیدار لەگەڵ نەکەن نازم تەبەقچەلی بڕیاریدا لە یانەی ئەفسەران لەکەرکووک میوانداریی بکا، هەرچی خۆیشییەتی، سەفەری موسڵی کرد تا پێشوازیی لێ نەکا و ئەفسەری ڕوکنی یەکەمی فیرقە جێی گرتەوە.

بۆ ڕێزلێنانی بارزانی، قیادەی فیرقە ئێوارە خوانێکیان ئامادەکرد و ئەفسەر و ژمارەیەک سەرکردەکانی فیرقەیان بانگێشت کردبوو و، منیش یەک لە بانگێشتکراوەکان بووم. مەلا مستەفا ویستی سەردانی مەلا عومەر گومبەتیی زانای ئایین بکا لە ماڵەکەی خۆیدا، گوتیان ماڵەکەی لە کۆڵانێکی تەسکە و ئۆتۆمۆبیلی ناچێتێ و، ئەوان دەنێر و داوەتی دەکەن تا لە یانە سەردانی بارزانی بکا. بارزانی گوتی ئەو پیاوە ئیمانداره ڕێزی لای من هەیە چونکە کە لە ١٩٤٥ داوایان لە پیاوانی ئایین کرد بەیانێک دژی بارزانییان دەرکەن و بە کافریان دانێن، ئەو پیاوە ڕازی نەبوو و گوتی: "چۆن حوکمی کافربوونی خەڵکێک بدەم کە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هەیە و هەموو فەرزەکانیش جێبەجێ دەکەن؟".

دوای شێوکردن، کوردێکی زۆر لەبەردەم یانەکە کۆبوونەوە و ئەوەش بەرپرسەکانی بێزارکرد. داوایان لە مەلا مستەفا کرد وتارێکی کورتیان بۆ بدا و سوپاسی ئەو هەستە جوانەیان بکا بەرانبەر بەو هەیانە و داوایان لێ بکا پەرتەی لێ بکەن و، ئەویش وایکرد.

ڕۆژی دواترێ کە مەلا مستەفا بە فڕۆکە چووەوە بەغدا، خەڵکێکی زۆری کورد بۆ ماڵئاوایی لە فڕۆکەخانە بوون و، کە بەو شەقامەی دەچووەوە فڕۆکەخانە تێپەڕیمدیتە خەڵکێکی تورکمان کۆبوونەتەوە و بەرچیغیان لە دوو پیکابیان دەبردە ناو قاوەخانەی "یەڵدز" و لەبن کورسی و قەنەفایان دادەنان، ئیدی زانیم کە بەرێکەرەکان دێنەوە پێکدادانێک دروست دەبێ.

لە فڕۆکەخانەی داوام لە زەکی خەتیبی بەڕێوەبەری پۆلیس کرد یەکسەر بچێتەوە شاری و دەوری قاوەخانەکەی بدا و ڕێی ماڵاواییکەران بگۆڕێ و بە شەقامێکی دیکەیاندا ببا تا نەگەنە یەکدی. ئەوەش کارێکی دروست بوو. ئیدی بەڕێوەبەری پۆلیس ڕۆیشت

---

[39]_ بارزانی بڕیاریدا لە ٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨ لەڕێی گەڕانەوەی بۆ بەغدا، دوای ئەوەی سەردانی ناوچەی بارزانی کردبوو، سەرێک لە کەرکووکیش بدا و سەردانەکەیشی دوو ڕۆژی خایاند. للمزید، نوری عبدالحميد العاني و علاء جاسم محمد الحربي، تاريخ الوزارات العراقية ١٩٥٨- ١٩٦٨، بيت الحكمة ٢٠٠٤، ص٢٨٦.

ڕێوشـــوێنی تەواوی نەگرتبێتە بەر هەر بە بڵاوکردنەوەی چەند پۆلیســـیک لە ناوچەکەدا دەســتبەردار بووبێ کە زۆربەیان تورکمان بوون. کە ماڵاواییکەران گەڕانەوە پێکدادانەکان ڕوویاندا و تورکمانەکان بە بەرچیغەوە هێرشـــیان کرد و لافیتەکانی بەخێرهێنانی مەلا مستەفا بارزانییان دڕاند.
لە فرۆکەخانەش فەرماندەی ئینزیباتی سـەربازی تووسـی نۆرەی دڵ بوو و گواسـترایەوە نەخۆشـــخـانە و لەوێ مرد، بەڵام تورکمـانەکـان پێیـانوابوو چونکە بەرگەی دیمەنی ماڵئاواییەکە و کۆبوونەوەی کوردانی بۆ مەلا مستەفا بارزانی نەگرتووە بۆیە مردووە.
ڕۆژی دواترێ خۆپیشـــاندانێکی تورکمانان ڕووی لە ســـەرای حکوومەت کرد و، هوتافی وروروژێنەری دژی کوردیان لێدەدا و دەیانگوت " کەرکووک تورکمانییە" نووســـینگەکەی منیش بەرانبەر سەرای و سەرکردایەتیی فیرقەی بوو، هەندێ گەنج هەندێ هوتافیان دژی منیش لێـدا، گەنجێکی تورکمــان بەپێش نووســـینگەکەمــدا تێپەڕی و چەقۆیەکی لە نووســـینگەکەم گرت، ڕامگرت و پێمگوت ئەو کارە خزمەتی تورکمانان ناکا و کوردەکان دژی ئەوان نین و، نەمهێشت ئەوانەی نووسینگەکەم دەستی بدەنێ.
کوردەکانی بە خۆپیشاندان بەرەو ئیمام قاسم هاتن و ئەوانیش دەیانویست بەرەو سەرای و بنکەی فیرقەی بێن، بەڵام من و هـاوڕێ مـارف بەرزنجی وعومەر مســـتەفا "دەبابە"، تکامان لێکردن پەرتەی لێ بکەن و، دۆخەکە ئاڵۆزتر نەکەن وئەوانیش ملیان بۆ تکایەکەمان دا و پەرتەیان کرد.
ڕۆژی دواتری، تەبەقچەلی بانگی کردم و پرسیی داخوا هیچ دەستدرێژییەک کراوەتە سەر نووســـینگەکەم، منیش نکۆڵیم لێ کرد، بەڵام ئەو زانیی لە لیوایەکە چ ڕوودەدا و، یەکەم کاری کردی داخستنی بنکەی ڕۆشنبیریی ئەمریکی و تورکی بوو و هەردوو کونسوڵخانەی تورکی و بەریتانیی داخســـت و ئەوانەی ڕەگەزنامەی تورکییان هەبوو هێنانیە دەری و، لەوانەش نیزامەدین نەفتچی، ئەگەرچی لەهەموانکەمتری سۆز بۆ تورکیا هەبوو و، جوانی دەست لەسـەر دەردەکەی دانا، ئەو دامەزراوانە پەیوەندییان بە قووڵکردنەوەی کێشـەکانی نێوان کورد و تورکمان هەبوو و کێشەیان لەبەردەم شۆڕشیش دروست دەکرد.
ڕۆژی دواترێ، ئێوارەکەی، تەبەقچەلی ژمــارەیەک پیـاومــاقووڵی کورد و تورکمــانی شــارەکەی بانگی کۆبوونەوەیەک کردلە بنکەی فیرقەدا و، پێشــبینیم کرد داوای هاوکاریی هێورکردنەوەی دۆخی نێوان هەردوولا بکا، ئیدیی ڕەسـنووسـی بەیاننامەیەکی هاوبەشـم ئامادەکرد[40]، بانگێشـــتی کورد و تورکمانید دەکرد بۆ هاوکاری و برایەتی، تا ئەو هەڵە

---

[40] _ نـازم تەبەقچەلیی قـائیـد فیرقەی دوو'لیژنەی هـاوکـاریی نیشـــتمـانی'ی کۆکردەوە کە پێکهـاتبوو لە توێژە سـیاسـییەکان و ژمارەیەک پیاوماقوولی تورکمان و هەریەک لە موکەڕەم تاڵەبانی و حوسـین بەرزنجیی پارێزەر و

نەدەنە دەست دوژمنان و سەقامگیری لە شارەکە دابین بکەن. کە دامە دەست تەبەقچەلی پێی باشـــبوو و بۆ ئامادەبوانی خوێندەوە و داوای لیکردن واژووی لەســـەر بکەن تاچاپ بکرێ و لە کەرکووک و ئەو سارانە بڵاوبکرێتەوە کە کورد و تورکمانی تێدایە و، واشکرا. ئۆتۆمۆبیلەکانی ئینزیباتی ســـەربازی بەیاننامە هاوبەشـــەکەیان لە بازاڕەکانی شـــاری بڵاوکردەوە و فڕۆکە ســـەربازییەکانیش فڕێیاندایە ســـەر شـــارۆچکەکانی دیکە و ، بەوەش دۆخەکە هێور بووەوە. تەبەقچەلی لە بیرەوەرییەکانیدا، کە پڕی بوختانە بۆ من، دەڵێ من ڕەشنووسی بەیاننامەکەم نووسی، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ڕەشنووسەکە بەخەتی من نووســـراوە و، هەر بە خەیاڵی تەبەقچەلیشـدا نەهاتووە بەیاننامەیەکی هاوبەشـی نێوان کورد و تورکمانەکان دەربکرێ، بەڵکو تەنیا دەیویســـت ئامۆژگارییان بکا و دۆخەکەهێمن بکاتەوە.

---

عەبدولقادر بەرزنجیی عەقیدی خانەنشین و عومەر مستەفای پارێزەر و محەممەد حاجی عیزەتی پارێزەر و تەحسین ڕەئفەتی پارێزەر و عەتا خەیروڵلای ڕەئیس ئەوەلی خانەنشـین و مەجید حەســەنی دەرمانســاز، گرنگترین شـتی لە بەیاننامەکەدا هاتبوو: "ئەی خەڵکی کەرکووک، بە عارەب و کورد و تورکمان و ئاثوری و ئەرمەنەوە، ئیسـتیعمارەکان و بەکرێگیراوەکانیان لە خائین و کۆنەپەرســتان، ژەهری دووبەرەکی و دوژمندارییان لەنێوان نەتەوەکانی نیشـتمانە خۆشـەویسـتەکەمان دەرشـت ، بەتایبەتیش لە ناوچە هەسـتەوەرەکانی وەک شـاری کەرکووکی لە چەندین نەتەوە پێکدی. ئامانجیان دابڕینی ئەو پەیوەندییە برایەتییەی نێوان نەتەوە و کەمینەکانە کە لە دیرزەمانەوە بە برایەتی و هاوکاری پێکەوە ژیاون. چەندی وریاییســمان لاواز بێ دوژمن ئەوەندە باشـتر دەتوانێ دەسـتمان لێ بوەشـێنێ و فیتنەمان لە بەینێ دروستکا. بەڵام شۆڕشی ١٤ی تەمموز، بەسەرکردایەتیی عەبدولکەریم قاسمی پاڵەوان، کە هەموو گەلی ێراق پشتیوانیەتی، بووەتە گورزێکی کەمەرشکێنی ئیستیعمار و پیلانەکانیان......للمزید: نوری عبدالحمید العانی و علاء جاسم الحربی، تاریخ الوزارات العراقیة،ص٣٦٨.

## حیزبی شیوعی چۆنی دەڕوانییە دۆخی کەرکووک؟:

دوای چاپکردنی بەیاننامەکە و دابەشکردنی، کە بەشێوەیەکی کاتی دۆخەکەی هێورکردەوە، بەڵام کەســـە کۆنەپەرســـتە کورد و تورکمانەکان، لەبەر ئەوەی شـــۆڕش گورزی لە بەرژەوەندییەکانیان وەشـــاندبوو، لە چالاکییە تێکدەرەکانیان بەردەوام بوون. ســـەرەتا تەبەقچەلی داوای لێکردم پۆســـتی ســـەرۆکی شـــارەوانیی کەرکووک وەرگرم، جا لەبەر هەندێ هۆی خانەوادەیی داوای لێبووردنم کرد، بەڵام نازم تەبەقچەلی رووی لە ئیسلامییە تورکمانەکان کرد، نورەدین واعیز، کە کوردێکی بە تورکمان بوو بوو، کردییە ســـەرۆکی شـــارەوانیی کەرکووک، لەکاتێکدا ئێمە داوامان دەکرد مارف بەرزنجی یان نوری شـــێخ جەمیل تاڵەبانی دامەزرێنێ تا یەکێکیان ببنە ســـەرۆکی شـــارەوانیی کەرکووک. کە نازم تەبەقچەلی بەلای رێی پیلانی داشـــکاندەوە تا کودەتایەکی ســـەربازی دژی عەبدولکەریم قاسم بکەن، لە خەڵکە دیموکراسی و لایەنگرەکەی شۆڕش و سەرکردایەتیی عەبدولکەریم قاسم دوورکەوتەوە و خەریکبوو دژایەتیی دەکردن و لە خەڵکە نەیارەکە نزیک دەبووەوە و تورکمانەکانیش زەوییەکی بەپیتی ئەو کارە بوون.

حیزبی شیوعی لەبەینی دوو ئاگران بوو، زێدەڕۆیە نەتەوەپەرستەکانی تورکمانەکانیان بە ژمارە و هێز زۆر لەســـەرەوەی ڕاســـتی دەخەملاند و هەوڵیان دەدا وا ببەنە مێشـــکی خەڵکەکەوە کە زۆربەی ئەو شـــارە کوردییانەی کەمە نەتەوەیەکی تورکمانیان تێدایە، بە شوناس شاری تورکمانین و لەو شارانەش شارۆچکەکانی کەرکووک، تازە و خوورماتوو و داقووق قدووز و کفری و قەرەتەپە و خانەقین ق مەندەلی، لەکاتێکدا ئامارە فەرمییەکانی زێدەڕۆییان لە ڕێژەی تورکمانان کردووە و هەندێکی بە بنەچەش کوردن بە تورکمانیان داناون، دەرکەوت لە کەرکووک، کە ئەو شارەیە گەورەترین کۆبوونەوەی تورکمانی تێدایە، ڕێژەیـــان "٢:١"ە، واتە دوو کورد و تورکمـــانێـــک، بە زۆرترین خەمڵانـــدنیش، ژمـــارەی تورکمانان لە ئێستا لە کوردستان لە ٦٠٠ هەزار تێناپەڕێ و، زۆربەیشـیان لەو ناوچانەن کە لەبن دەستی حکوومەتدان و خەریکە دەکرێنە عارەب.

هەرچی لایەکەی دیکەیە، ئەو نەتەوە پەرســـتە کوردانەن کە دوژمنایەتیی نێوان خۆیان و تورکمانەکانیان لە سەردەمی عوسمانلیرا بەمیرات بۆ ماوەتەوە و، دواتریش لە مافی چارەی خۆ نووســـینی ویلایەتی موســـڵی ناوی لێندرا دانانی ســـنووری نێوان عێراق و تورکیا، دوژمنایەتییەکە توندتربوو، وەک ئەوەی نێوان عێراق و تورکیا بۆشـــاییەک بێ و گەلێکی لێ نەبێ ناوی گەلی کورد بێ و وەک گەلانی دیکەی دنیا چاوی لە ئازادی و ســـەربەخۆیی بێ. ئەگەرچی بەرنامەی پارتی دیموکراتی کوردســـتان ئاماژەی ڕوونی ســـەبارەت بە مافەکانی کەمینەی تورکمان تێدایە، کەچی ئەوان ئاسۆ تەنگیی نەتەوەپەرستیی تورکمانیان

به دوژمنداری وەلامدەداوە، نەک بەو ئاراستەیەدا بچن لەگەلیان ڕێککەون. حیزبی شیوعییش لەناوچەکە لەسەر بنەمای لقی کوردستان دامەزرابوو و،ڕێکخستنی تایبەتی تورکمانانی نەبوو، بەودواییانە نەبێ لە دووز و قەرەتەپە پەیدابوو و هاوڕێ تورکمانەکانیش پێویستیان بە تاقیکردنەوەی چۆنیەتی مامەلەکردن لەگەل بابەتی وا ورد هەبوو و، لەبەر ئەو ڕێچکە راسترەوییەی بزووتنەوەی نەتەوەیی تورکمانیش. بزووتنەوەکەیان بە بزووتنەوەیەکی کۆنەپەرستی دژە شۆڕش لە قەلەم دەدرا، لەکاتێکدا بەچاوپۆشی لە سەرکردایەتییەکەی و ئەو دروشمانەی بەرزی دەکردەوە، جەوهەری ئەو بزووتنەوەیە دیموکراسییە و ئامانجی دەستەبەرکردنی مافە نەتەوەییەکانی کەمینەی تورکمانە. سووربوونی تورکیاش لەسەر ئەوە ویلایەتی موسل مافی ئەوە قورەکەی خەستتر کرد. گوتیشی گوایە ئەنجوومەنی نیشتمانیی گەورە بە پەیماننامەی لۆزان ڕازی نەبووە کە بەپێی ئەو پەیماننامەیە حکوومەتی تورکیا، پێچەوانەی بەندەکانی تایبەت بە کوردانی پەیماننامەی سیڤەر لە بەرانبەی ئەوەی کوردستانی باکووری خراوەتە سەر. دەسبەرداری ویلایەتی موسل بووە.
ئەو کێشەیە ورد و ئالۆز بوو، پێویستی بە هاوێرکردنی مافە رەوایەکانی کەمینەی تورکمانی و لە ئەستۆ گرتنی ڕەوایی ئەو مافە هەبوو، تا لە چاوتەنگییە فراوانخوازییەکانی بۆرژوای ڕاستڕەوی تورکیای جیاکاتەوە کە لەسەر حیسابی مافە نەتەوەییەکانی کوردان دەهاتە دی و لەو خەلکە ڕاسڕەوانەشی جوداکاتەوە کە ئاواتیان ئەوەیە ئەو ناوچەیە بە تورکیاوە گرێدەن.
پێویستە ئەوەش بلێم ئەو هاوڕێ تورکمانانەی بەو دواییە "دوای شۆڕش" هاتنە ناو حیزب شارەزاییان کەمبوو و مرۆڤ وروووژێنەر بوونزۆرشیان کاری هەرزەکارانە کرد، ئەوەش وایکرد جەماوەری تورکمانیان لێ دوورکەوێتەوە نەک ڕایانکێشن، شارۆچکەی قەرەتەپەی لێدەرچێ کە هاوڕێی تورکمانیی بەرپرس"عەلی یاغش" لەێبوو و، چونکە مرۆڤێکی ڕەوشت بەرز بیر قووڵ بوو متمانەی خەلکەکەی بەدەستهێنا و، توانی بەرژەوەندیی جەماوەی تورکمان لەگەل مافەڕەواکانیان لێک گرێدا و ئەو ڕێکخستنانە هەمیشە توندوپوند بوون وجێگیربوون. بەلام هاوڕێ" عەلی یاغش" بالاترین شتی کردە قوربانیی بیروباوەڕە شیوعییەکەی و گەلە تورکمانەکەی کە ژیانی بوو، دەسەلاتە بەعسییەکان لە هەشتاکا هەر لەبەر ئەوەی شیوعی بوو و لەبەر هیچی دی نا، لەسێدارەیان دا.
کەسێکی دیکەی تورکمانی کەرکووک، "موسلیح جەلالی"بوو، ئەو بە بنەچە کورد بوو و خانەوادەکەی لە کەرکووک لەسەردەمی عوسمانلییان ببووە تورکمان. ئەو، بەرانبەر تورکمانان کەسێک بوو دەماری جاڕس بوو و، هەر خێراس بایدایەوە و وازی لە حیزبی

شـــيوعی هێنا و بووه بەعســـی و، لەو دەســـتەیەی لێکۆڵینەوەیە کاری دەکرد کە کورد و شـــیوعییەکانی دادگایی دەکرد و دوای دادگاییەکی هاکەزایی فەرمانی لەشـــێدارەدانی بۆ دەردەکردن.
مرۆڤ دەتوانێ دەســـتنیشـــانی بکا داخوا کێ حیزبە نەتەوەییە تورکمانییەکان ســـەر بە چ حیزبێکی تورکیی ناو تورکیان. لەو ماوەیەی عێراق لەناو پەیمانی بەغدا بوو، عەدنان مەندەریســـی ســـەرۆکوەزیرانی تورکیا ســـەردانی کەرکووکی کرد، بەلام بەهوتافی جیاجیا پێشـــوازیی لێ کرا، ئەوانەی ســـــەر بە حیزبی دیموکراتی بوون، کە عەدنـان یەک لە جەمســـەرەکانی بوو، هوتافیان بە گیانی ئەو لێدەدا و ئەوانەی ســـــەر بە حیزبی گەلی کۆماری بوون هوتافیان لەدژی لێدەدا.
موتەســـەریف داوای کرد لەگەل کەســـە دیارەکانی تورکمانی کەرکووک کۆبێتەوە، کە لەگەڵیان کۆبووەوە بۆی ڕوونکردنەوە لەکاتی گەڕانی بەشـــارەکەدا چ ڕوویداوە و ، جا عەدنان مەندەریس پێیگوتن: "ئەگەر خۆتان بە هاوولاتیی تورکیا دادەنێن و ســـەر بە حیزبەکانی ئەوێن، ئەدی بۆ لەو هەڵبژادنانەی ئەوێ بەشـــدار نابن، ئەگەر خۆشـــتان بە هاوولاتیی عێراق دەزانن چیتان لە ئێمە داوە لە تورکیا، جا چ گەلی تورکیا قبوولم بکایان ڕتمکاتەوە"
قسەکانی مەندەرێس ئەو خلیسک و لێژاییەی ئاشکراکرد کە نەتەوەپەرستە تورکمانەکان تێیکەوتوون و چ زیانێکیشـــیان لە مەســـەلە نەتەوەییەکەیان داوە. ئەوان بەشـــدارییان لەو خەباتە دیموکراتییە نەکردووە کە بۆ عێراقێکی دیموکراتیی ســـــەربەخۆ دەکرێ و تێیدا هەموو نەتەوە و کەمە نەتەوەکان مافە نەتەوەیی و دیموکراتییەکانیان پارێزراوە. ئیدی نەتەوەپەرســـتە تورکمانەکان دەبێ چاوێک بە بەو هەلویســـتە هەلانەیاندا بخشـــێننەوە کە زیان بە کێشە ڕەوایەکەی گەلەکەیان دەگەیەنێ. تورکمان لە کوردستانی باسوور کەمینەن و ڕێژەیان بۆ کورد نزیکەی "١-٨"ە. لە هەموو عورف و دەســـتورەکانی دونیاش ناکرێ کەمینە بڕیاری چارەنووســـی زۆرینە بدا، بۆیە کێشـــەکەیان تەنیا بەوەی چارەســـەر دەبێ لەگەڵ هێزە دیموکراتییەکانی عێراق هاوخەبات بن و، بەتایبەتیش کورد، تا ســـیســـتەمێکی دیموکراتی دامەزرێ و دان بە هەموو مافە نەتەوەییەکانی نەتەوەکان و کەمینەکان دابنێ، تورکمانیش کەمینەیەکی خاوەن کێشێکی تایبەتن لە کوردستان.

**چوونە بەغدا:**

دوای شـــۆڕش، عەبدولجەلیل حەدیســـی موتەســـەریفی کەرکووک بوو، ئەو لە بەڕێوەبەرە پاک و لێوەشـــاوەکان بوو، زۆرجاران لە دیوانی موتەســـەریفی و لەدەرەوەش یەکدیمان دەدیت. ڕۆژێکیان پێیگوتم، مامۆســـتا ئیبراهیم کوببەی وەزیری ئابووری داوای کردووە

بچمە بەغدا ببینم. ئیبراهیم کوببە یەک لەوانەبوو لە حیزبی شیوعی نزیکبوون و. ئەگەرچی حیزبی شیوعی بانگێشت نەکرابوو تا لەو حکوومەتە هەمەلایەنەی بە سەرکردایەتیی پێشەوا عەبدولکەریم قاسم پێکهێنرابوو بەشداربێ، بەڵام قاسم ئیبراهیم کوببەی بە شیوعی دادەنا، لەڕێی ئەویشەوە حیزبی شیوعی نوێنەری لە حکوومەت هەیە. ئیبراهیم کوببە سەر بە خانەوادەیەکی شیعەیە و کۆڵەگەکەیان شێخ محەممەد مەهدی کوببەیە، سەرۆکی "حیزبی ئیستیقلال" و ئەندامی ئەنجوومەنی حوکمە دوای شۆڕش. ئیبراهیم کوببە کۆلێژی مافی تەواوکرد و ئەوجا بۆ خوێندنی باڵای ئابووری چووە پاریس بخوێنێ. بەڵام لەبەر هۆی خێزانی خوێندنی تەواو نەکرد و گەڕایەوە عێراق. حکوومەت لە سەردەمی مەلەکی گرتی و خستییە بەندیخانەی جەلەولای بۆ گرتنی ڕۆشنبیران و بیریارانی دژەحکوومەتی ئامادەکردبوو. دوای شۆڕش وەزارەتی ئابووریی وەرگرت و جێی ڕێزیسەرکردەکانی شۆڕش بوو.

چوومە بەغدا و لە وەزارەتی ئابووری چاوم بە مامۆستا ئیبراهیم کوببە کەوت، ئەو هاوڕێحافز توکمەچیی کردبووە بەڕێوەبەری گشتیی ئابووری، جا ئیبراهیم کوببە داوای لێکردم ببمە جێگری بەڕێوەبەری گشتیی "انحصار"[41] وەرگرتنی تووتن و، پێیشی گوتم بەڕێوەبەری گشتی دەگوازرێتەوە ئەرکێکی دی ومن وەک بەڕێوەبەری گشتی جێی دەگرمەوە. پێمگوت ئەو بەڕێوەبەرایەتیی هەرکاتێک پێویستی بە پرسوڕا بوو من ئامادەم هاریکاریان بم، بەڵام هیچ وازم لە دامەزران نییە، بەتایبەتیش کە من ئەندامی لیژنەی لقی کوردستانی حیزبی شیوعیم و، بێ ڕەزامەندیی حیزبیشواز لە کارەکەی ئەوێم ناهێنم. گوتی ئەو ڕەزامەندیی حیزبی وەرگرتووە، کە زانیشم سەرکردایەتیی حیزبی شیوعی بەوەی رازی بووە، منیش بە دامەزران ڕازیبووم، ئیدی لە بەڕێوەبەراتیی ناوبراو دامەزرام، بەلام بەزۆری لە بەڕێوەبەرایرتیی گشتی دەوامم دەکرد و لەگەڵ بەڕێز باقر ئەلحەسەنی و لەسەر داوای خۆیشی. دەیشیزانی من جێی دەگرمەوە و ئەو دەبێتە باڵیۆز لە وەزارەتی دەرەوە. جا هێندەی نەبرد و بوومە بەڕێوەبەری گشتیی وەرگرتنی تووتن.

---

[41] _ بەڕیوەبەرایەتیی"ئینحیساری تووتن" وەرگرتنی تووتن:بەڕیوەبەرایەتییەک بوو لە وەزارەتەکەی سالح جەبر لە ١٩٤٧ دامەزرابوو و، ئەرکی چاککردنی چاندنی تووتن و هێنانی تووی چاککراو و بە کارهێنانی شێوازی نوێیهەلگرتنی و دامەزراندنی کۆگای سەردەمییانە بوو و هێنانی پسپۆڕانیش تا سەرپەرشتیی چاندنی بکەن لە ناوچەکانی باکووری عێراق. ئەو بەڕێوەبەرایەتییەش بەسای یاسای ئینحیساری تووتنی ژمارە"٢٥"ی سالی١٩٣٩ دامەزرا. للمزید:عبدالکریم الازریتاریخ فی ذکریات العراق ١٩٣٠-١٩٥٨. مرکز الابجدیة، بیروت، ١٩٨٢،ج١ خ١٢٨؛ احمد حمید محسن، التجارة الخارجیة فی محاضر مناقشة مجلس النواب العراقی ١٩٣٩-١٩٥٨. رسالة ماجستیر غیر منشورة، کلیة التربیة ، الجامعة العراقیة.٢٠٢١، ص١٥٢.

هەندێ گۆڕانکاریم لە بەڕوەبەرایەتیی ناوبراو کرد، هەندێ لە گەندەڵەکانم دەرکرد و هەندێکم خانەنشین کردن و هەندێکم گواستنەوە تا دزی و گزی و بەرتیل بنەبڕ بکەم کە لەو بەڕێوەبەرایەتییانە بەربڵاوبوون. هەندێ گۆڕانکارییشم لە کاری بەڕێوەبەرایەتییەکە کرد، بەتایبەت پەیوەندیی بە جووتیارانەوە دوای ئەوەی ڕۆڵی دەرەبەگەکان لە گوندەکان بەرتەسک ببووەوە.

لە بواری حیزبییشدا، وەک ئەندامی لیژنەی پەیوەندییە نیشتمانییەکان دەستم بە کار کرد و ئەو لیژنەیە زۆری کەسایەتیی کۆمەڵایەتیی ئاشکرای حیزب تێدابوو وەک دکتۆر حافز توکمەچی و دکتۆر محەممەد سەلمان حەسەن و مامۆستا عەبدولڕەزاق زووبێر و مامۆستا نەعیم بەدەوی. هاوڕێ محەممەد حوسێن ئەبولعیسیش سرۆکایەتیی لیژنەکەی دەکرد، ئەو لیژنەیەش کەرەستەی پەیوەندیکردن بوو بە بە حیزب و ڕێکخراو و کەسایەتییە نیشتمانییەکانی ناو حیزبی شیوعیی عێراقی.

هەر چوار مانگم لە بەڕێوەبەرایەتیی وەرگرتنی تووتن پێچوو و ئیدی مامستا ئیبراهیم کوببە داوای کردم تا بگوازمەوە بۆ پشکنەری گشتی لە وەزارەتی چاکسازیی کشتوکاڵ، کە تازە داندرابوو و مامۆستا ئیبراهیم کوببەش کرابووە وەزیری. وەزارەتەکە لە سەرەتای دامەزراندنی بوو و، هاوڕێ عەبدولڕەزاق زوبێر بەڕێوەبەری گشتی و ئەندامی لیژنەی باڵای ئەنجوومەنی کشتوکاڵی بوو کە عەبدولکەریم قاسمی سەرۆکوەزیران سەرۆکی بوو و، بەڕێز هەدیب ئالحاج حمودی وەزیری کشتوکاڵ سەروکاری لیژنەکەی دەکرد و، ئەو لە خانەوادەیەکی موڵکداری لیوای دیوانییە بوو و لە کەسە دیارەکانی حیزبی"وەتەنیی دیموکراتی" بوو و، ئەندامێکی دەستکراوەی ئەنجوومەنی باڵای کستوکال بوو.

## شایەدێکی بەردەم دادگای گەل:

"دادگای گەل"[42]، دادگای سەربازیی تایبەت، بۆ دادگاییکردنی لایەنگرانی سەردەمی مەلەکی دامەزرا. لە یەکشەممەی ١٥ی ئاداری ١٩٥٩، سەعات ٨:٣٠ی ئێواریێ پێیانڕاگەیاندم تا گەواهیی خۆم بەرانبەر تاوانباران عەبدولجەبار فەهمیی بەڕێوەبەری پۆلیسی بەغدا و، عەبدولجەبار ئەیوبی بەڕێوەبەری بەندیخانەی سیاسی وئیبراهیم حەسەنی"ئیبراهیم شەجەر" فەرماندەی هێزی پۆلیسی نایاب وداود سەلمان بەیاتیی قایمقامی ناوەندی بەغدا و بریکاری موتەسەڕیف و عەززە وەردەی فەرماندەی هێزی پۆلیسی گەڕۆک بدەم. عەززە وەردە دەفتەرێکی بەدەستەوە بووویێنەی زەعیم عەبدولکەریم قاسمی لەسەربوو و بەرانبەر عەقید فازڵ عەباس مەهداویی سەرۆکی دادگای ڕاگرتبوو، کە بانگی بەندییەکانی پێشتریێ کردبوو تا لەسەر تاوانبارەکان ببنە شایەد، بە تایبەتیش قەسابخانەکەی بەندیخانەی بەغدا.

لێرە وردەکارییەکانی گەواهیدان و ئامادەبوونی بەردەم دادگام دەگێڕمەوە. کە دادگاییەکە بەڕێوەدەچوو من لە کەرکووک بووم. جارێکیان کە لە پرسەی ژنێکی خزممان بووم لە ماڵی ئامۆزایەکم و"عەبدوڵلا سەعید"ی بەڕێوەبەری پێشتریێ پۆلیسی لیوای موسڵ لە نزیکمەوە دانیشتبوو، "ئیبراهیم حەسەن"ی بەرگی بەڕێوەبەری پۆلیسی لەبەربوو بەخۆ و بە دووپۆلیسی چەکدارەوە هاتەژووریێ، لە شوێنێکی هۆڵەکە دانیشت، بەڵام چاوی بە لایەکدا دەگێڕا، عەبدوڵلا سەعیدی لە نزیکمەوە دانیشتبوو و تۆقیبوو لە گرتنێ دەترسا، گوتی ئەوە بۆ من هاتووە، گوتم: نا بۆمن هاتووە. سەری سوڕما، بەڵام کە کە ئیبراهیم

---

[42] _ دادگای سەربازیی باڵا بۆ ئەو مەبەستە دامەزرا و، بەناوی"دادگای گەل" ناسرابوو و بۆ دادگاییکردنی کەسایەتییەکانی سەردەمی مەلەکی داندرابوو، ئەرکی دیکەیشی پێ سپێردرابوو بۆ دادگاییکردنی ئەوانەی پیلان لە شۆڕش دەگێڕن. لیژنەیەک بۆ دانانی بەڕێوەچوونی دادگایەکە داندرا و منیش وەک وەزیری داد سەرۆکی ئەو لیژنەیە بووم و، دوای دانانی ڕێوشوێنەکانی ئەو دادگایەمەرسوومی کۆماریی ژمارە ١٨ی ٢٠ی تەممووزی ١٩٥٨ی بۆ دەرچووو، دادگایەکە دەستی بە بەدواداچونی ئەو کێشانە کرد کە دەیدرایە و لەوانەس سزادانی ئەوانەی پیلان لە سەلامەتیی نیشتمان دەگێڕن و گەندەڵی لە سیستەمی فەرامڕەواییدا دەکەن. مەرسوومەکە لە ١٥ی ئابی ١٩٥٨ هەموارکرایەوە و لەسەر ڕاسپاردەی ئەو پێشنیارەی ئەنجوومەنی وەزیران لە ٢٠ی تەممووزی ١٩٥٨ کردی دەستەیەک بۆ دادگا دامەزرێندران و، وەک خوارەوەبوون:

١_ عەقید فازل عەباس مەهداوی ،سەرۆکی دادگای سەربازی. ٢_ موقەدەم عەبدولهادی ئەلڕاوی- ئەندام-. ٣_ موقەدەم فەتاح شاڵی . ئەندام. ٤_موقەدەم شاکر مەحمود ئەلسەلام. ئەندام. ٥_ ڕەئی ئەوەل ئیبراهیم عەباس لامی . ئەندام. ٦_ ڕەئیس کامل حوسێن شەماع. ئەندامی یەدەگ و، دەستەی داواکاری گشتیش پێکهاتبوون لە ١_ عەقید روکن ماجد محەمەدەمین. ٢- سەیدغازی عەبدولهادیی دادوەر. ٣_ جێگری داواکاری گشتی بەڕێز عەبدولمەجید سەلام. للمزيد. وزارة الدفاع، القيادة العامة للقوات المسلحة، محاكمات المحكمة العسكرية الخاصة(محكمة الشعب)، ٢٢ جزءا، ج١، خ١٤-١٥.

حەسەن بێ ئەوەی ،وەک داب وایە، فاتیحە دووبارەکاتەوە چووەدەرێ. ناسیاوێکم هات و گوتی: بەڕێوەبەری پۆلیسـی موسـڵ لەدەرەوە تۆ گەرەکە، چوومەدەرێ و دیتم ئیبراهیم حەسـەن قایشـی پانتۆڵەکەی گرتم و گوتی: دەخیلی تۆ و خودام، لە دادگای گەل داوایان کردووم، تۆ لە بەندیخانەی بەغدابووی و دەزانی من هیچ کارێکی تاوانم نەکردووە، خاوەن ماڵ و منداڵم تکایە شـایەدیمبۆ بدە. گوتم: ئەدی حاجی بەشـیریش ماڵ و منداڵی نەبوو؟، دوایەش من داوام نەکردووە دادگا گوێ لە گەواهیدانی من بگرێ، ئەگەر دادگا داوام بکا و شوێندم بدا ئەوا ڕاستی دەڵێم. گوتی: تۆ دەزانی کە هاتمە ناو بەندیخانە چەکم پێ نەبوو. گوتم: بەڵکو چەکداربووی و دەتوانم ناو و جۆری چەکەکەسـت بڵێم و بە دەمانچەکەشت چوار فیشـەکت بەو ڕاڕەوەیەوە نا کە من لەپشت دەرگاکەی وەستابووم دوایە پێلەقەیەکت لە دەرگاکە دا و هاتییە ژوورێ.

دەرکەوت ئەو بدوو پۆلیسەی لەگەڵیبوون، لەژێر فەرمانی ئەودا نەبوون، بەڵکو پاسەوانی بوون و دەبوایە بە بەندکراوی ڕەوانەی بکەن، کە لەوێ دادگاییکردن لە دادگای سەربازیی تایبەت"دادگای گەل" چاوەڕێی دەکرد، جا دوای چەند ڕۆژێک پێیانگوتم لە دادگا ئامادەبم.

هۆڵێکی ترسـی دەنواند، سـەکۆی قازییەکانی گەل و لەلای ڕاسـتیشـداواکاری گشـتیی سـەربازی و لەلای چەپیش شیشـەبەندی ئەو تاوانبارانەی تێ ئاخنرابوو کە پێشتر ناوم هێنان، بەلام پرسیم ئەدی تاوانبارە گەورەکان کوان؟ کوا حوسـامەدین جومعەی فەرمانی کوشـتنی بەندییەکانی دا، کوا ماجد مسـتەفای بەندییەکانی ڕەوانەی بەندیخانەی باقووبە کرد کە نزیکەی حەفتایان برینداریش بوون و فیشـەکیان بەرکەوتبوو و لێنەگەڕا بیانبەنە خەستەخانەش؟ ئەدی عەبدولجەبار فەهمی کوا؟ ئەوەی فەرمانیدا لەسـەربانی بەندیخانەڕا بەندییەکان بکوژن، ئەدی جەمیل جەمیل مەدفەعیی تاوانباری هەرە گەورە کوا، کە فەرمانیدا ئەو بەندییانە بە پەرجوو لە مردن دەرباز ببوون بدرێنە ئەنجوومەنی عورفیی سـەربازی، تا لەجیاتیی سـزادانی تاوانبارە ڕاستەقینەکان، باری شـانیان بە چەندسـاڵێکی دیکەی زیادە قورس بکەن.

سـەیرێکی رووی تاوانبارەکانم کرد کە سـەریان شـۆڕکردبووەوە. ئەوان لەبەرەم مێژوودا لە چنگی دڕندان بترازێ هیچی دی نەبوون کە لە بەرپاکردنی ناشـیرینترین تاوان هۆیان نەدەدایەوە، ئەو چنگانەی جەسـتەی ئەو تێکۆشـەرە شـۆڕشـگێرانەیان هەلاهەلا دەکرد کە گەل و ئەوانیشیان خۆشدەویست، باشە بۆ ئەوانە نەکوژراوم؟

سـەرۆکی ددگا پرسیاری ناو و تەمەن و جێی دانیشتنی لێکردم و دوایەش شوێندی دام. ئەو پرسیی ئەو تاوانبارانەی ناو شیشـەبەند دەناسـی و، هەریەکەیان لە قەسـابخانەکەی بەغدا چیی گوت؟

ئاورپیکم لە شــیشــەبەندەکە دایەوە،لەبەر ترس ولەبەر ئەوتاوانانەی بەرانبەر نیشــتمان پەروەران کردبوویان، ڕەنگوڕواژایان ئەوەندە گۆڕابوو خەریکبوو نەیانناســمەوە. هەوڵمدا رابردوو بە هەموو ناخۆشییەکانیەوە لەبیر بکەم، بەڵام حاجی بەشیرم بەبیرهاتەوە، کە لە یەک لە دیدەنییەکان، یاریی لەگەل منداڵە ئەسمەرە جوانەکەی ناو باوەشی ژنەکەی دەکرد. ئەحمەد حەســـنم بەبیرهاتەوە، هەرکە دەرگای بەندیخانە دەکرایەوە تا کەســـوکار بێنە دیداری بەندییان، ئەو باوەشـــی بۆ کچۆلەکەی دەکردەوە کە دەتگوت پەپولەیە. موســـا ســـلێمانم بەبیرهـاتەوە ، خوســـکەکەی یەکەم کەس بوو خێرا لە دەرگـای بەنـدیخـانە دەهاتەژووری و جلوبەرگ و خواردنی بۆ برایەکەی دەهێنا. پیرێژنەکەی دایکی ئیسـماعیل فەرتەم بەبیرهـاتەوە کە لەبەر قورســـایی خواردنی"کوشـــر"ی بۆ کوڕەکەی دەهێـنا کووڕدەبووەوە. هەموویان لەبیرکەم ئەو دوا وشـانە لەبیرناکەم کە ئیسـماعیل بەزەحمەت دەیتوانی بیانکا و خوێن لە سینگ و پشتی دەهاتەخوارێ و دەیگوت من دەمرم، سڵاو لە دایکم بکەن. ئەو دایکە تەنیایەی کاری دەکرد و پارەی کدەکردەوە تا کورە بەندکراوەکەی بژی. ئیدی نەمتوانی بەسەر هەموو ئەوانەدا بازبدەم.

_ بەڵێ بەڕێزی ســـەرۆکی دادگاهەموو تاوانبارەکان دەناســـم ئەوەی لێ دەرچێ کە دەفتەرەکەی بەدەســـتەوەیە و وینەی پێشـــەوای لەســـەرە، ئەوم نەدیتییە.ئەوانیدییان، بەڕێوەبەری پۆلیســی بەغدام دیت کە بە نەردیوانە دارەکەدا هەڵگەڕا و جووە ســەر بانی هۆڵەکە، ئەویش بوو ســـەرەتا فەرمانیدا بۆمبی فرمێس ڕێژ لە بەندییان بگرن و دواترێ فەرمانیدا تەقەیان لێ بکەن و یانکوژن، هەرچی عەبدولجەبار ئەیوبە ئەوا لای بەندییەکان ناســـراوە، ئەگەر حکوومەت بیویســـتبا کێشـــە بۆ بەندییان بۆ دروســـتکا و دواتریش قەســـابخانەیان بۆ دانێ، ئەوا ئەوەی دەناردکە جلی بنیادەمانی لەبەرە. هەرچی ئیبراهیم شـــەجەرە، ئەوبوو هانی کۆمپانیای دەدا بەندییەکان بکوژن و دەیگوت: ئەوانە جوونە و دەمـانەوێ بیـانـنێرینە ئیســـرائیل، بەلام ئەوان یـاخیبوونیـان ڕاگەیـاندووە، ئیدی پۆلیس هۆسەیان لێدەدا"جوولەکە گوتمان خۆ بدە دەست"، ئەو دەمانچەیەکی جۆری برۆنینگی ٧ ملم ی بەدەســـتەوەبوو و هەر ئەویس بوو دوای قەســـابخـانەکە لەنـاو ڕارەوەکـان و ژوورەکان لەگەلم دەگەرا. هەرچی ئەوکابرایەشـــە،داود ســـەلمان بەیاتی، تەنیا کە بڕیاری ئەوەیان پێگوتین دەمانگوازنەوە بەنیخانەی باقووبە ئەوم دیت و، دەیگوت: ئەگەر شتێکتان بەســـەرهات من بەرپرســـیار نیم، بەدڵنیاییشـــەوە دەیزانی حکوومەت نیەتی کوشـــتنی بەندییانی هەیە.

ئەوجا سەرۆک لێیپرسیم: ڕاستە جووتان لەگەڵدا بووە؟

_ پێموابی دووان بوون.

_ هەموو بەندییەکان چەند کەس دەبوون؟

_ نزیکەی "١٥٠" کەس.

_ دووان جووبوون و، ئەوانیدیس هەموو بوونە جوو؟

ئەوجا ســـەرۆکی دادگا دایو دووقســـان و بانگی شـــایەدەکانی دیکەش کرا و دوای چەند ڕۆژێک گوێمان لێبوو لاشەی هەردوو تاوانبار عەبدولجەبار فەهمی و عەبدولجەبار ئەیوب بە پەتی سیدارەدا شۆڕبوونەتەوە و لە هەمان بەندیخانەی قەسابخانەکەیان تێدا بەرپا کرد و، ئەوانیدیش بە مەودای جودا بەندکرابوون و، دەیانگوت: ئێمە فەرمان پێکراو بووین ئێمە فەرمانمان جێبەجێ دەکرد، ئێمە تەنیا ئامێر بووین.

## جێبەجێ نەکردنی بڕیارێکی عەبدولکەریم قاسم:

ئەوەی زانرابوو فەرمانەکانی عەبدولکەریم قاسمی ڕەتکردنەوەی نییە، بەلام شتێکم بەسەرهات کە نیشانەی ئەوەیە ئەو قسەیە ڕاست نییە و ڕوداوەکەش ئاوابوو:
بەڕێوەبەری گشتیی ئنحیساری توتن بووم، بۆ بەسەرکردنەوەی بەڕێوەبەرییەکان چوومە سلێمانی. کە لەوی بووم بەڕێوەبەری پۆلیسی لیوا بە شلەژاوی پەیوەندیی پێوەکردم و گوتی پێشەوا عەبدولکەریم قاسم داوای کردووی و دەبێ بچییەوە بەغدا.
لە ڕێی گەڕانەوەم بە کەرکووکدا چووم و دیتم بەڕێوەبەری پۆلیس چاوەڕێمە و، هەمان قسەی بۆ دووبارەکردمەوە و منیش نەمدەزانی بۆ داوای دیتنی کردووم. کە گەیشتمەوە بەغدا پەیوەندین بە ئیبراهیم کوببەی وەزیری ئابوورییەوە کردتا بزانم سەرۆکوەزیران بۆ داوای کردووم و، ئەویش نەیدەزانی و پەیوەندیی بە موقەدەم عەبدولغەنیی سەرۆکی یاوەرانەوە کرد و ئەویش داوای کرد بچمە وەزارەتی بەرگری بۆ دیتنی.
تۆزێک دەگەڕێمەوە دواوە، کابرایەک هاتە بەڕێوەبەری و بڕیارێکی لیژنەی بالای بازرگانیی پێبوو کە سەرۆکوەزیران بەخۆی سەرۆکی لیژنەکە بوو و، داوایسەکرد دە تۆن توتن بنێردرێتە دەرەوە بۆ ئیماراتی کەنداوی حارەبی و، عەبدولکەریم بۆ برادەرە کۆنەکانی ەفاداربوو و، ئەو کابرایەش دووکانێکی چکۆلەی لە "عەگد النصاری" هەبوو. هەمەجۆر جگەرەی دەفرۆشت لەوانەش ئەو جگەرانەی خاوەن دووکانەکن دروستیا دەکرد، وەک بافرە و توتنی دەپێچرایەوە و جگەرەی قەمیشی دادەگیر. جا عەبدولکەریم کاتی کە ئەفسەرێکی بچووک بووە لەلای دانیشتووە.
کە ئەو بڕیارەی هێنا جێبەجێم نەکرد، چونکە لەبەر کەمیی توتنی کارگەکانی بەغدایە یەک دەوام کاریان دەکرد و، توتم لە کۆگاکانی ئینحساری توتنی کەمبوو و، من داوام لە لیژنەی بالا کردبوو ڕەزامەندیمان بدەنێ هەندێ توتن لەدەرەوە بهێنین تا ئەو کەمییەی پێ بگرین و کارگەکان بەگەڕ بخەین، ماقووڵ نبوو ڕێ بە کەسێک بدەم دە تۆن توتن ڕەوانەی دەرێ بکا لەکاتێکدا کارگەکانمان لەبەر کەمیی توتنی نیمچە وەستاو بوون.
ئەو کابرایە پێیگوتم سەر بە پێشەوایە. گوتم هەموومان سەر بە پێشەواین، بەلام ئەو بڕیارە هەڵەیە و جێبەجێی ناکەم، کابرا زویر بوو و بە توورەیی لە بەڕێوەبەرایەتی چووە دەرێ.
کە چوومە وەزارەتی بەرگری، یاوەرەکە بردمییە هۆڵی پێشوازی، دوای تۆزێک عەبدولکەریم هات و بەخێری هێنام و پرسیاری کاروباری بەڕێوەبەرایەتییەکەی لێکردم. منیش پێمگوت داوام کردووە هەندێ توتن لەدەرەوە بێنم، چونکە حکوومەت هێنانی

جگەرەی بیانیی قەدەغە کردووە، ئەوەش وایکردووە جگەرە لە بازاڕ کەمبێ. گوتی:ئێمە بە داوایەکەت ڕازیینبەڵامبیرۆکەیەکم هەیە، دەبێ ئێمە بازاڕەکانمان لە کەنداو بپارێزین و تووتنی عێراقییش لەوێ بە هەڕمێنە.
تێگەیشتم مەبەستی ئەو کابرایەیە بڕیارەکەی بۆ دابوو، گوتم: پێشەوای مەزن، لەبەر کەم تووتنی کارگەکان نیمچە وەستاون، ئێمەش لە مانگی مەحەڕەمین، ئەوانەی پرسەی مردنی ئیمام حوسێن بەڕێوەدەبەن سەردانیان کردووم تا هەندێ تووتنیان بدەمێ، بەلام بەس توانیم برە توتنێکی کەمیان بدەمێ.
بەلام ئەو لەسەر بڕیارەکە سووربوو چونکە لیژنی باڵای ڕێکخستنی بازرگانی دەریکردبوو، بەڵام وەڵامی من ئەوەبوو: پێشەوای بەڕێز ڕێم بدەن دەست لەو بەڕێوەبەرایەتییەی بکێشمەوە، خەڵکێکی زۆر هەن ئامادەن فەرمانتان جێبەجێکەن ئەگەرچی دژی بەرژەوەندیی ئێوە و دەوڵەتیش بێ.
تۆزێک بیریکردەوە، ئەوجا گوتی: نا.... بەپێی بەرژەوەندیی دەوڵەت و بەرژەوەنیی بەڕێوەبەرایەتییەکەت کار بکە، وای دانێ ئەو بڕیارە هەر نەبووە . منیش لەسەر ئەو برە تووتنەی دەتەوێ بیهێنی ڕازیم، خوا بتپارێزێ مادام لەسەر بەرژەوەندیی دەوڵەت و سەلامەتیی ڕێوشوێنەکانی بەڕێوەبەرایەتییەکەت مکوڕی، ئەوجا بە ڕوویێکی خۆش بەگەرمی بەڕێیکردم.

## پشکنەریم لە وەزاەتی چاکسازیی کشتوکاڵ و کۆسپەکانی سەر رێی یاسا:

ســــەرباری ئەو دژبەرییەی لەنێوان گەل و ئیســــتیعمار لە عێراق هەبووە، بەلاّم ئامرازی دەســــتی ئیســــتیعمار نیزامی مەلەکی بوو و، ئەو نیزامەش پشــــتی بە بۆرژوای گەورە و فەرمانبەرە گەورەکان و گەورە ســــەرکردەکانی ســــوپای ناو شــــارەکان و ، دەرەبەگ و خاوەن زەویووزاری گوندەکان دەبەســــتا. ئیدی هەر شــــۆڕشــــیکی بکرابایە دەبوایە شــــۆڕشــــێکی دیموکراتی بووایە و دژی بۆرژوا و دەرەبەگی بەکرێگیراو بووایە.رێکخســـتنەکانی ئەفســـەرانی ئازادیخوازی شـــۆڕشـــی ١٤ی تەمموزیان تەقاندەوە لەژێر کاریگەریی پرۆگرامی حیزبە نیشــــتمانییەکاندا بوون، کە بەجۆرێک لە جۆرەکان بەرنامەی پاکتاوکردن و گۆڕینی پەیوەندییە دەرەبەگییەکانی گوندیان هەبووە، یانیش سنووردانان بۆ مولکداری بەو جۆرەی سـەرۆک جەماڵ عەبدولناسـر لە میسـر جێبەجێی کرد.

ڕووبەری زەوییە کشـتوکاڵییەکانی عێراق بە "٤٠" ملیۆن دۆنم دەخەملێنران کە "١١" ملیۆن دێمیی پشتی بە بارانێ دەبەستی و "١٢،٥" ملیۆن دۆنمی بەراو و ئەوەی دیکەیان تەنیا بە هەبوونی ئامرازەکانی ئاودا دادەچێندرێن.

مولکداریی کشـــتوکاڵییش ئاوا دابەش ببوو: "٨٦٪"ی ئەوانەی لە بواری کشـــتوکاڵ کاریان دەکرد خاوەن زەوییە بچووکەکان بوون و مولکدارییەکەیان لە ٤ بۆ ١٠٠ دۆنم زەوی بوو وتەنیا "١٠،٥٪"ی زەوی هیی ئەوانبوو و نزیکەی ١٢٪ی خاوەن زەوییەکانیشـــــمامناوەند بوون و "٢١،٥"ی زەوی هیـی ئەوان بـوو، لە کـاتێـکـدا ٢٪ی گەورە دەرەبەگـان و ئوروستوکراتەکانی شار"٨٦٪"ی زەوییەکان هیی ئەوان بوو.

ئەو کێشـــەیەس وایدەکرد ملیۆن و نیوێک جووتیار لە گوندەکان هیچ زەوییەکیان نەبێ کە "٨٩٪" ی ئەوانەن لە بواری کشــــتوکاڵدا کاردەکەن، ئەوانەی بە نیوەیی یان بە کرێ لە زەویی دەرەبەگ و خـاوەن زەوییـان کـاریـان دەکرد. نزیکەی ملیۆنێکی دیکەش کـاریـان وەرزییە و، بەردەوام لە گەڕانن بەدوای پاروە نانێکدا.

گۆڕانێکی وردەوردەی بەرەو سـەرمایەداریی کشـتوکاڵی هەبوو و ئەویش بە بەکارهێنانی کەرەسـتە و ئامیری کشـتوکاڵی و زەوی دەرهێنان لە جنگی جووتیاران. ئەوەی پێشـتری وێنەیەکی بـارودۆخەکەمـان دەداتێ، بەلاّم ڕەنگدانەوەی ڕاســـتییەکی تـاڵە و ئەویش دەوڵەمەندیی بێ سـنووری چنگە خەڵکێک و هەژارییەکی لەڕادەبەدەری ملیۆنان جووتیار،

دەســـتەی یەکەمیـان ئەو دەرەبەگـانە بوون کە لە لادێ بە کۆڵەگەی نیزامی مەلەکی دادەندرێن و زۆربەی ئەندامەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران لەوانن.
ســـەرباری ئەوەی هاوڕاییەکی گشـــی لەنێوان حیزبە نیشـــتمانییەکان هەیە و بە پێویتی دەزانن هەر شـۆڕشـێکی نیشـتمانی دەبێ چاکسـازییەکی کشـتوکاڵییشـی لەگەل بێ، بەلام لەڕووی ناوەرۆک و قووڵیی ئەو چاکســازییە کشـتوکاڵییەی دەبێ بکرێ بەرنامەی حیزبە نیشتمانییەکاندا جیاوازییان هەیە و، بەرنامەکانیشیان بەو جۆرەی خوارەوە بوو:
١ـ حیزبی شـیوعیی عێراقی: دەبێ ئەو تالانییەی دەرەبەگ و موڵکدارە گەورەکان بەرانبەر زەویی جووتیاران دەیکەن ڕاگیرێ و دەســـت بەســـەر زەویوزاری دەرەبەگ و خاوەن زەوییە گەورەکاندا بگیرێ و بێ قەرەبوو بەسەر جووتیاراندا دابەس بکرێ.
٢ـ حیزبی "وەتەنیی دیتوکراتی": دەبێ چاو بە موڵکداریی کشتوکاڵیدا بخشێندرێتەوە وئەو زەوییان مفت هیی میرین بە موڵکایەتیی بچووک بەســـەر جووتیاراندا دابەش بکرێ و موڵکدارییە گەورەکانیش لە سنوورێکی ماقووڵ دیاری بکرێن.
٣ـ حیزبی"ئیستیقلال": دەبێ زەوی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە دابەش بکرێ و، کێشەکەس بەوەی چـارەســـەر بکرێئەو زەوییـانەی زینـدوو دەکرێنەوەبی بەرانبەر و تەنیـا بـدرێتە جووتیارە ڕاســتەقینەکان، جۆرەکانی خاوەندارێتیی زەویش یەکبخرێ.٤ـ حیزبی"شـەعب": کێشـــەی زەوی و زیندووکردنەوەی زەوی، بە پرۆژەی ئاودێری و دابەشــکردنی زەوییە ئەمیرییەکان بەسەر جووتیاراندا چارەسەر، بکرێ.
٥ـ حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکی: موڵکداریی کشتوکاڵی و زەویوزار دیاری بکرێ.
٦ـ پارتی دیموکراتی کوردســـتان: دیاریکردنی موڵکداریی کشـــتوکاڵی و دابەشـــکردنی دەرەبەگییە گەورەکان بەسەر جووتیاراندا.
ئەوەی تێبینی دەکرێ تەنیا حیزبی شـــیوعی لە بەرنامەیدا بووە دەســـت بەســـەر زەویی دەرەبەگەکاندا بگرێ و بێ بەرانبەر بەسەر جووتیارانیدا دابەش بکا.
حکوومەت پێش شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ هەوڵیدا هەندێ یاسا دەربکا تا ململانێی چینایەتی لە گوندا تۆزێک ســووک بکا. لەوانەش بەشـکردنی بەرهەم لە نێوان جووتیار و خـاوەن موڵـک و، حکوومەت لە جیـاتی ئەوەی یـاســـایەک بۆ ئەوکـارە دەرکـاپەنـای بۆ مەرســـووێک برد چونکە زۆربەی نوێنەران پەرلەمان لەدەرەبەگ و موڵکدارەکانبوون و، ڕازی نەدەبوون ئەو جۆرە یاســـایانە کە پەرلەمان تێپەڕێ. ئیدی هیچ جارەیەک نەبوو لەوەی زیاتر کە هاوگونجانییەک لەنێوان بەرنامەی حیزبەکانی لایەنگری شـــۆڕش بکرێ.
ئیدی یاسای چاکسازیی کشتوکاڵ دوای شۆڕش دەرچوو کە بڕی هەرەزۆری موڵکداریی کشـــتوکـاڵیی دیـاری کردبوو و بۆ زەویی بەراو"١٠٠٠" دۆنم و بۆ زەویی دێمەکـاریش

"٢٠٠٠" دۆنم بوو و ئەوەی لەوەندەش پتربوو لە بەرانبە قەرەبوویەک دەستی بەسەردا گیرا و بە موڵکی بچووک دابەشی سەر جووتیاران کرا، ئامانجیش لە قەرەبووەکە ئەوەبوو سەرمایەیەکی گەورەیان لەلا دروستبێ و ببنە بۆرژوای گوند یان بازگانی شاربەڵام لەسەر حیسابی دادۆشینی وزەی دارایی جووتیارانی بیست ساڵی دادێ چونکە پارەیەک لەجیاتیی زەوی درایە خاوەن زەوییەکان، بەڵام چ بکرێ؟ ئاخر شۆڕش بە سەرکردایەتیی بۆرژوا کرابوو و، شێوەی کودەتایەکی سەربازیی وەرگرتبوو کە حەتمەن سەرکردە سەربازییەکانی شۆڕشیان تەقاندەوە و سیستەمە نیمچە دەرەبەگییەکەیان ڕووخاند و سیستەمی کۆمارییان دامەزراند کە تۆزێ ئازادییە دیموکراتییەکانی تێدابوو، ئاڕاستەیان دەکرد. بەڵام دیکتاتۆریی سەربازی بووە دیکتاتۆریی تاکەکەسی و دواترێ بە بە چەندین کودەتای سەربازیدا تێپەڕی.

لەسایەی ئەو شتانەی پێشترێ، لە گۆڕانی بونیادی ئابووریی گوند لەسایەی یاسای چاکسازیی کشتوکاڵی وەک پشکنەری گشتی لە وەزارەتی چاکسازیی کشتوکاڵی خەریکی کاری خۆم بووم بۆ چاودێریی دروست جێبەجێکردنیاسا و پێشێل نەکردنی و چارەسەری ئەو کێشانەی دێنە پێش جێبەجێکردنی. عەبدولکەریم قاسمی سەرۆکوەزیرانیش زۆرجاران بۆچارەسەری کێشە عەشایەرییەکان، یان ئەو کێشانەی لەنێوان جووتیار و خاوەن موڵکەکان ڕوویاندەدا، بەتەنیا پەنای بۆ دەهێنام یانیش لەناو لیژنەی تایبەتی لەوەزارەتی چاکسازی کشتوکاڵی و وەزارەتی ناوخۆ و وەزارەتی بەرگری پێکدەهێنران. لەو کێشانەی لە بەرژەوەندیی جووتیاران لە چارەسەرکردنیاندا بەشدار بووم، ئەو کێشە چەکدارییەی لەنێوان "ئال زبێرەج" و "ئەلبو محەممەد"ی لیوای عیمارە و ئەو کێشانەیلەناو میرەکانی ناوچەی غەڕاف ڕوویاندا و، ئەو ڕووداوانەی لەنێوان جووتیارەکان و بەڕێوەبەرییە حکوومییە ڕاسترەوەکانی لیوای دیوانییە و، کێشەانی جووتیارانی "ئەلبو متێوت وجحێش و تورکمانی تەلەعفەر و عەشیرەتی گەرگەڕیی کوردی لەگەڵ شێخەکانی شمەر".

لەو کێشەیەی لەنێوان هەردوو عەشیرەتی ئال زیرەج و ئەلبو محەممەد روویدا کێشەکەم بەپێی ئەو دروشمەمان چارەسەر کرد کە دەڵێ: "جووتیار برای جووتیارە، دوژمنیان دەرەبەگ و ئیستیعمارە" ، جا ئەو سەرۆک عەشیرەتانەی لە پشت کێشەکان بوون بۆ موسل دوورخرانەوە و سوڵح لەنێوان جووتیارەکانی هەردوو عەشیرەت کرا. کێشەی نێوان سەرۆکەکانی عەشیرەتی دزایی و جووتیارەکانیان بەوەی چارەسەر کرا کە داوایەکانی دەرەبەگەکانی دژی یاسابوون ڕەتکرانەوە و لایەنگیریی جووتیارەکان کە یاسایان لەگەڵدابوو.

لەو کاروبارانەی دەبێ باسیان بکرێ ئەوەیە کە هەندێ دەزگای چاکسازیی کشتوکاڵی و بەتایبەت لە لیوایەکانی ناوەڕاست و باشوور، زێدەڕۆییەکی چەپڕەوی زیانی بە بەرژەوەندیی هاوکاریی نیشتمانی دەگەیان باڵی بەسەر کارەکانیاندا کێشابوو. بۆ نموونە، گەرانێکی پشکنینم لە لیوایەکانی باشوور کرد، دەزگاکانی چاکسازیی کشتوکاڵی و کومەڵەی جووتیاران بە دروشمی چەپڕەوییەوە پێشوازییان لێکردم کە چەکوچ داسیان لەسەر کێشرابووچونکە من سیوحی بووم.بەلام ئەو دروشمانە ئەو دەزگایانەیان لە دەزگا حکوومییەکانی دی دادەبڕی و لە جێبەجێکردنی یاسادا بێ یارمەتیی دەزگا حکوومییە بورێوەبەرییەکان دەمایەوە. کە گەیستمە ئەوێ و ئەو دروشمانەم دیت کارمەندانی وەزارەتی چاکسازیی کشتوکاڵیم کۆکردەوە و باسی ئەو قۆناغەم بۆ کردن کە شۆڕشی پێدا دەڕوا و گوتم ئەوە قۆناغی شۆڕشی نیشتمانیی دیموکراتییە و دژی ئیستیعمار و دەرەبەگە، ئەوە شۆڕشێکی سۆسیالیستی نییە و بە سەرکردایەتیی حیزبی شیوعی نییە، بۆیە وا پێویست دەکا دروشمی ئەوتۆ بەرزکەنەوە لەگەڵ ئەو قۆناغەی بگونجێ، واتە دژی ئیستیعماری کە پێویستی بە یەکێتیی هێزە نیشتمانییەکانە و، دژی دەرەبەگە کە پێویستی بە یەکگرتنی هەمان ئەو هێزانە هەیە و بەپێی یاسای باو. ئەوەش کۆڵکەی هاوبەشی نێوان بەرنامەی هەموو حیزبە نیشتمانییەکانە لە قۆناغی ئێستادا، وەگەر نا دەبێتە هۆی دووبەرەکیی دوژمنان چ بەکرێگیراوان و چ دەرەبەگان، دەیقۆزنەوە و دەبێتە هۆی نوشوستیی چاکسازیی کشتوکاڵی، ئیدی بەدەم رایەکانمەوە هاتن و وازیان لەو دروشمە چەپڕەوییانە هێنا کە زیانی بۆ حیزبی شیوعی و بزووتنەوەی نیشتمانیش هەبوو. زۆرجاران دەرەبەگەکان دەگەتشتنە ئەو بروایەی کاتی کوومەت ڕامدەسپێری چارەسەری کێشەکانیان بکەم ودەسەلاتی حاکمی سەربازیم دەداتێ، نیشانەی ئەوەیە بەدەم سکاڵاکانیانەوە نایەت. جا یەک لە سەرۆکەکانی عەسیرەتی دزەیی کە مەعروفاگای پیرداودی بوو، ئەوەی ئەوکاتە دەربڕی کە داوایەکەیانم ڕەتکردەوە شیوعییەکانی گوندەکانیانم نەگرت تا چارەسەری کێشەکانی ئەو گوندانە بکەم وپێمگوتن: چەند کەسێکی ئاغەکان بگرم ئاسانترە لەوەی چەند سەد جووتیارێک بگرم. مەعروفاگا گوتی:هەرکە حکوومەت تۆی هەناردە ئێرە، ئێمە هەر لە بەراییرا زانیمان گوێ لە سکاڵای ئێمە ڕاناگرێ. کە سەرۆکوەزیران ڕایسپاردم گوێ لە سکالایەکانیان ڕاگم و هیچیشیان یاسایی نەبوون، هەندێ سەرۆک عەشیرەتی جافانیش لە هەڵەبجە هەمان قسەی مەعروفاگای دزەییان کردەوە. ئەوان دەیانویسیت ئەو زەوییانەی بۆیان داندراوە بیاندەمێ و جووتیارەکانیش ناچاربکەم بە پشکداری کاریان تێدا بکەن، بەشی یەکەمی داوایەکە یاسایی بوو و ڕازیبووم، بەلام بەسی دووەمیانناياسایی بوو و ڕەتمکردەوە.

## هەڵوێستی دەرەبەگان بەرانبەر یاسای چاکسازیی کشتوکاڵی:

دەرەبەگە حارەب و کوردەکان خۆیان دەدا پەنای محەممەد نەجیب ڕوبەیعیی سـەرۆکی ئەنجوومەنی دەسـەڵاتداری و، دیوەخانی لەوان جمەی دەهات، جونکە پێیان وابوو نەیاری چاکسـازیی کشـتوکاڵییە. ڕوبەیعی خۆی لە پەنا دینداری نابوو لەکاتێکدا ئەو دیندار نەبوو. کە نەیارانی حکوومەتەکەی عەبدولکەریم قاسـمیش لە حیزبە نەتەوەییە عارەبەکان و کوردییەکان دەرکەوتن، دەرەبەگە دژە شـۆڕشـەکان لە دەوری حیزبی "ئیسـتیقلال" کۆبوونەوە کە شـێخ محەممەد مەهدی کوببەی سـەرۆکی حیزبەکە تازە دەسـتی لە ئەندامێتیی ئەنجوومەنی دەسـەڵات کێشابووەوە. محەممەد سـدیق شـەنشـەلیش دەستی لە وەزارەتی"ئیرشاد" کێشایەوە، باڵی ڕاسترەوی حیزبی بەعس کە فوئاد ریکابیی ئەمینداری گشـتییدەسـتی لە وەزارەتی پلام دانان کێشـابووەوە، ببووە حیزبێکی نەیار. پارتی دیموکراتی کوردستان کە پێشـەوایەکەی مەلا مستەفای بارزانی بوو، کاتی بووە حیزبیکی نەیار و یاخیبوونی دژی حکوومەتەکەی قاسـم ڕاگەیاند، زۆربەی دەرەبەگە کوردەکان لە دەوری کۆبوونەوە. هەرچی دەرەبەگەکانی نەیاری مەلامستەفا بوون دایانە پاڵ حکوومەت تا دژی سـۆڕشـی کوردییە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ هەڵگیرسـابوو، بەناوی "فورسـانی سـەلاحەدین" سـەرکردایەتیی چەکدارەکانیان بکەن و، بەوەس دەسـەڵاتی خۆیان بەسـەر عەشیرەت و زەوییەکانیاندا سەپاندەوە.

لەو ماوەیەیدا، دەرەبەگەکان سـەرۆکە چالاکەکانی کۆمەڵەی جووتیارانیان تیرۆر کرد، کە ئەوانیش جەماڵ جەلال تاڵەبانیی سەرۆکی یەکێتیی کۆمەڵەی جووتیارانی لیوای کەرکووک و عەبدولڕەحمان خدری سـەرۆکی کۆمەڵەی جووتیارانی سـلێمانی و، عەلی مەولودی سەرۆکی کۆمەڵەی جووتیارانی لیوای هەولێر بوون، بێ ئەوەی حیزبی شیوعی لەسەریان بێتە دەنگ و، من پێموایە بێدەنگیی حیزبی شـیوعی و بێ وەڵامیی بەرانبەر تیرۆرکردنی کادیرە جووتیارییەکانی هەڵە بوو. ئەو دەرەبەگانەی تیرۆرکردنەکانیان ڕێکخسـت لەلایەن حیزبی شـیوعییەوە هیچ سـزایەکیان نەدرا، لەکاتێکدا حکوومەت ئەو کارەی هەر بەلاوە گرنگ نەبوو.

## هەڵگەرانەوەی حکوومەت لە جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی و چالاکیی کۆمەڵەکانی جووتیاران:

حکوومەت دەستی بە تەنگ پێ هەڵچنین و دژایەتیی کۆمەڵەی جووتیارانی شۆڕشگێڕ کرد کە حیزبی شیوعی پێشڕەویی دەکردن. داوای لەو کۆمەڵانە کرد داواکاری پێشکەشی وەزارەتی ناوخۆ بکەن تا مۆڵەتی فەرمییان بدرێتێ، بەلام بەهەنجەتی بێ مانا مۆڵەتی نەدانێ، لەونەش، ئەو پوولەی لە داوایەکە دەدرێ دەبێ ڕێک لێیبدرێ، ئەوجا سووسەی بۆمۆڵکدارە مامناوەندە لایەنگرەکانی حکوومەت و حیزبی "وەتەنیی تەقەدومی" کرد کە محەممەد حەدید سەرۆکی بوو و تازە لە حیزبی"وەتەنیی دیموکراتی" جودا ببووەوە. ئیدی مۆڵەتی دایە ئەو کۆمەڵانە و "عیراک ئەلزوکوم"ی لەجیاتیی"کازم فەرهوود یاسری"ی ئەندامی حیزبی شیوعیی عێراقی، وەک سەرۆکی کۆمەڵەکانی جووتیاران سەپاند.
ئەوجا دەزگا ئاسایشییەکان، بەفەرمانی دادوەی سەربازیی گشتی، لەسەر بنەمای ئەو تۆمەتانەی مەللاکەکان بۆیان دروستدەکردن، دەستیان بە گرتنی کادیرە جووتیارییرکان کرد. ئیدی ئیبراهیم کوببەی وەزیری چاکسازیی کشتوکاڵی لەسەر ئەو هەڵسکەوتانە دەستی لە وەزارەت کێشایەوە و، ئەحمەد محەممەد یەیای وەزیری ناوخۆ بەبریکای هاتە جێیەکەی.
ئامانجی هەڵبژاردنی ئەحمەد محەممەد یەحیاس ئەوەبوو، بڕیک هاوکاری لەنێوان هەردوودەزگای ناوخۆ و چاکسازیی کشتوکاڵیدا دروست بکرێ. عەبدولکەریم قاسم کۆنگرایەکێ هاوبەشی بەسەرۆکایەتیی خۆی بۆ موتەسەڕیفەکان و بەڕێوەبەرە گشتییەکان و بەڕێوەبەرەکانی چاکسازیی کشتوکالی بەستا تا کێشەی نێوان ئەو دوو دەزگایە چارەسەر بکرێ و، ئیدی ئەو کۆندڕە گەورەیەی نێوان موتەسەڕیفەکانی بۆ چاکسازیی کستوکاڵی گەرموگوڕ نەبوون و بەڕێوەبەرەکانی چاکسازیی بۆی گەرموگوڕ بوون ئاشکرابوو.
دەزگا قەزاییەکان بەلای پیاوانی بەڕێوەبەریدا کێلیان دەکردەوە و دژی چاکسازیی کشتوکاڵی بوون. لێرە رووداوێکی بەدەنگەوە نەهاتنی دەزگا بەڕێوەبەرییەکان و قەزاییەکان بۆ چاکسازیی کشتوکاڵی دەخەمەڕوو. سکرتێری یەکێتیی گشتیی کۆمەڵەکانی جووتیارانی لە پیاوانی حکوومەت بوو و ناوی بەڕێز حەمید بوو، لای عەبدولکەریمی سەرۆکوەزیران سکالای لەوەی کردبوو دەزگا بەڕێوەبەرییەکان کردبوو دژایەتیی کۆمەڵەکانی جوتیاران دەکەن، ئەگەرچی ئەو کۆمەڵانە حکوومیین و سەر بە حیزبی شیوعی نینە. عەبدولکەریم قاسم دەستەیەکی لێکۆڵینەوەی لە من و لە ئەفسەرێکی

وەزارەتی بەرگری پێهێنا تا لە بابەتەکە بکۆڵینەوە. هەرهێندەی گەیشــتینە لیوای دیوانیە و کەبە ئۆتۆمۆبیلەکەم ژمارەی چاکسازیی کشتوکاڵیی پێوەبوو، بەلای ئۆتۆمۆبیلی دادوەری لێکۆڵینەوەی لیوادا تێپەڕیین، دیتم شــۆفێرەکەم کەلەپچەی لەدەســتی کراوە و بەفەرمانی دادوەر و بە هەنجەتی ئەوەی کــاتێ بەلایــدا تێپەڕیوین "هۆڕنی بەکــارنەهێنــاوە بۆ تــا ئاگاداربێ، خرابووە بەندیخانە . کە جووینە ناحیەیەکیش تا لێکۆڵینەوە لەگەڵ بەڕێوەبەری نــاحیە بکەین و بەڕێز حەمیدیشــــمــان لەگەڵدابوو، بەڕێوەبەری نــاحیە هەندێ کوێخــای دەرەبەگانی هاندابوو تا سکالایەک دژی سکرتێری یەکێتیی گشتیی کۆمەڵەکانی جووتیاران بەرز بکەنەوە کە بەڕێز حەمید خۆی لایەنگری ســــەرۆکوەزیران بوو، ئیدی ئەفســــەری پۆلیس بەڕێز حەمیــدی کەلەپچەکرد تــا بە کۆتەوە بینێرێتە بنکەی پۆلیس و بگیرێ. موتەســــەڕیفی لیوای ئەکرەم ئەحمەد بوو، ســــەرباری ئەوەی بنیادەمێکی باس بوو و لە رووی سیاسی و داراییەوە پاک بوو، بەلام هیچی بەدەست نەبوو ووەک دەڵێن "بەنی دوو هەنبانەی بوو" و وەک والییە عوســمانلییەکان لە دیوانی موتەســەڕیفییەی دانیشــتبوو و ســەید ئەحمەدی کۆنەپەرســتی جێگری ئیشــوکارەکانی بەڕێوەبردنێی بەدەســتەوەبوو و ئەویش بوەی ناســرابوو دژە شــۆڕســەو هاوکاری نەیارو دەرەبەگانە، کە لەڕێی زەعیم ئەحمەد محەننەد یەحیایەوە هەواڵەکەم دایە عەبدولکەریمی سەرۆکوەزیران و پێمراگەیانس ج ڕوویداوە،نە هیچی گوت و نە هیچی کرد. ئیدی بەوجۆرەی دەزگا بەڕێوەبەرییەکان و ئاسایشییەکانی چەندین لیوای لە حکوومەتی مەرکەزی دابڕان.

نموونەیەکی دیکەی دژایەتیی دەزگا ئاسایشییەکان بەرانبەر حیزبی شیوعی، ڕووداوێکە و دەیگێڕمەوە لە نێوان من و مەجید خەلیلی بەڕێوەبەری ئاســایش ڕوویدا؛ ڕۆژێکیان لەگەڵ یوســف ئەلمیعماری بریکاری وەزیری بووم، عەقیدێک بە جلی ســەربازییەوە هاتەژووری. بریکاری وەزیری زۆری گرنگی پێدا و ئەوەش ســەرنجی منی ڕاکێشــا، نەمدەزانی ئەوە بەڕێوەبەری ئاســایشــی گشــتییە و، ئەودەمی عەبدولکەریم قاســم فەرمانێکی لێبووردنی بەرانبەر تاوانە ســیاســییەکان دەرکردبوو و کێشــە ورووژێنراوەکانیان داخســتبوو تا لاپەڕەیەکی نوێی هاوکاری بکرێتەوە. بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی دەستی بە قسان کرد و قسەکانیشی دژی حیزبی شیوعی بوون. ئەگەرچی بریکار منی بەوی ناساند بەلام ئەوی بەمن نەناســــاند. پێمگوت زەعیم عەبدولکەریم قاســــم فەرمانی داوە لاپەڕەیەکی نوێی پەیوەندییە نیشــــتمانییەکــان بکرێتەوە، بەلام خەڵکــانێکی وەک مەجید جەلیل دەیــانەوێ جارێکیدی ئەو لاپەڕەیە ڕەشــکەن، خۆی نەگرت و هەســتایەوە و گوتی من مەجید جەلیلم. گوتم لای من گرنگ نییە مەجید جەلیل بێ، چونکە من باسی ڕاستی دەکەم. ئەوجا دەستی بە هێرسکردنەسەر عەزیز ئەلحاج کرد، کە ئەودەمی ئەندامی حیزبی شحوعیی عێراق بوو

و، منیش بەتوندی وەڵامم دایەوە و بریکار تا کەشەکە هێورکاتەوە هاتە نێوانمان و، بریکار ئەوەی لەنێوان من و بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی گوزەرابوو بە ئەحمەد محەممەد یەحیای وەزیری ناوخۆی راگەیاندبوو و، ئەویش لێیپرسیم: زانیومە لەگەل عەقید محەممەد جەلیلی گفتوگۆیەکی زۆشتان کردووە. گوتم: پێتوایە عەقید جەلیل شایانی گفتوگۆیەکی لەوەی خۆشتربێ کە کراوە؟ وەزیر دەخەنییەوە و مانای وابوو لە گفتەگۆیەکەی وڕازیبوو. ئەحمەد محەممەد یەحیا دژی شیوعییەکان نەبوو، لەو سالانەی قاسم لە شیوعییەکانی بادابووە زۆرجاران دەزگا ئاسایشییەکان و ئەحمەد سالح عەبدیی دادوەری سەربازیی گشتی راپۆرتیان لەسەر فەرمانبەرانی چاکسازیی کشتوکاڵی دەدا و دەیانگوت شیۆعین، ئەحمەد محەممەد بەدوایدا دەناردم و دەیگوت: راپۆرتمان سەبارەت بە فلان فەرمانبەر پێگەیشتووە، تکا دەکەم بڵێ با بیگوازنەوە و لەبەر چاوانی دوورخەوە.

## شیوعییەکان لای شێخ ئەحمەد بارزانی سکاڵا لە مەلا مستەفا دەکەن:

دوای ئەوەی مەلامستەفا لە دوورەوڵاتیی یەکێتیی سۆڤیەت هاتەوە، بردرایە خانویکی هیی هێلی سەمەندەفەربوو لە ساڵحییەو، شێخ ئەحمەدی براگەورەشی میوانی بوو. بارزانی زۆری ڕەخنە لە شیوعییەکان دەگرت، ئیدی حیزب داوای لە من و جەماڵ حەیدەری کرد بچینە سەردانی شێخ ئەحمەد و بەناوی حیزبی شیوعییش بەخێرهاتنی بکەین.
بۆ سلاوی شێخ ئەحمەدی جووینە ماڵەکە و زۆری پەخێرهێنانین، بەڵام مەلامستەفا لە دانیشتنەکەی نەبوو. ئیدی پێمانگوت چ لە نێوان ئێمە و مەلا مستەفادا دەگوزەرێ، شێخ ئەحمەد زۆر توورەبوو و گوتی: "بانگی"مستۆ"[43]ی بکەن، مەبەستی مستەفابوو، مەلا مستەفا هات و جەمەدانییەکی سووری بە دەستووری بارزانییان لەسەری نابوو، بەڕێزەوە لە بەرانبەر شێخ ئەحمەدی ڕاوەستا و گوتی: "بەر ئەمری جەنابتم. شێخ ئەحمەد گوتی: "مستەفا تۆ نابیتە پیاو"، مەلا مستەفا سەیرێکی کردین و زانیی ئێمە لای شێخ ئەحمەد سکاڵامان لێ کردووە، جا گوتی: بۆ کاکە؟ شێخ ئەحمەد گوتی: لەو بارودۆخە تەنگەی لە ١٩٤٦ بەسەرمان هات، ئەگەر تۆ برتەنیا بهاتیتایە ماڵەکەم نەمدەتوانی یەک ڕۆژ بتحەوێنمەوە ، ڕووسەکان، چەندین ساڵ ئێوە و هاوڕیکانتانیان حەواندەوە، کەچی دژیان دەدوێی. مەلا مستەفا گوتی: کاکە من دژی ڕووسان قسەم نەکردییە. شێخ ئەحمەد گوتی: جا جیاوازیی چییە ئەگەر دژی رووسە عێراقییەکان قسان بکەی، ئەدی ئەوانەش هەر برای ئەوانی وێندەر نینە؟
مەلا مستەفا، ئاماژەیەکی بۆ شێخ سادق بابۆی کرد بمانباتە ژووورە تایبەتەکەی و، شێخ سادق لەگەڵ شیوعییان هاوسۆز بوو، چووینە ژوورەکەی مەلا مستەفای، دوای کەمێک ئەویس بە پێکەنینەوە هات و گوتی: زانیم ئێوە لای شێخ ئەحمەدی سکالاتان لێ کردووم، ئەوجا دەستمان بە قسەی دۆستانە کرد. مەلا مستەفا دەیگوت: ێوە دەتانەوی چۆنتان گەرەکە ئاوا بجوولێمەوە، بەلام من لێرە سەر بۆ کەس دانانەوێنم. گوتم برای گەورەم بارزانی، ئێمە هەمیشە دەمانەوێ سەربەرز بی، پێیشت وا نەبێ حیزبی شیوعی بیەوی سەر بۆ ئەو یان یەکێکی دی دانەوێنی، ئەو دەخوازێ تۆ برادەرێکی شکۆمەند و بەڕێز بی و سەر بۆ خەلکی وەک ڕەشید عارف دانەنوینی کە لە هەمو جێیان دەڵێ مەلا مستەفا بەو

[43] _ ئەو جۆرە ناوهێنانە لەناو کوردان و بەتایبەت بادینان زۆر باوە و ناوەکان بچووک دەکرێنەوە و بۆ خۆشەویستییە و بگرە زۆرجاران ناوە ڕاستەقینەکان نانووسرین و ناوە بچووککراوەکە لە شوناس دەنووسرێ، جا عەلی دەبێتە عەلۆ و جەلال دەبێتە جەلۆ و سلێمان دەبێتە سلۆ و تاد...... جنێودانیش ، بەتایبەت باوک و مان و براگەورە، لەناو کورداندا زۆر بابووە و شانازییشی پێوەکراوە کە بچووک چەندە گوێڕایەڵی گەورەیە. "ل . ب"

یارمەتییانە دەژی کە ئەو دەتداتێ. بارزانی گوتی: باشـــە کاروباری ئەو دیوەخانە چۆن بەڕێوە ببەم کە ڕۆژی ســـەدان کەســـی دێتێ؟ لێرە گوتم: ڕێز و پێگەی بارزانیی برا بە خۆی بە خەباتی دوورودرێژیەتی لەپێناو گەلی کورد نەک بەو دیوەخانەی ڕەشـــید عارف و کەسانی وەک ڕەشید عارف خەرجیی بۆ دابین بکەن.
سەرۆک عشیرەتە کوردەکانی نەیاری ئێوەن، دیوەخانی زۆر لەو دیوەخانەیان گورەتریش هەبوو، بەلام ڕێزی گەلەکەیان بەدەست نەهێنا، خەڵک لەبەر هەڵویستە نیشتمانییەکانتان و قوربانیدانەکانتان ڕێزتان دەگرن. بارزانی گوتی: تۆ دەزانی لە مەجلیســـان قســـان بکەی و، دلنیابن من برادەرێکی دڵسـۆزی ئێوەم، ئەگەر رەخنەیەکیشـم لە هەڵوێسـتتان گرتبێ لەبەر دڵسـۆزی و برایەتی بووە. گوتم: مەلا مســـتەفا، من بەرانبەر کەســـانی وەک تۆ بەڕێزەوە قسـان دەکەم، ڕەنگە لە دیوەخانی دی خراپ بدوێم. ئیدی کەشـی پەیوەندییەکانی نێوانمان گۆڕا، ئیدی دەستمان بە قسەی دۆستانە کرد و ئەوجا سوپاسی هەستی برایانەی ئەومان کرد و بەڵێنماندایە کە شیوعییەکان هەردەم جرادەری دڵسۆزی دەبن و دوایە ڕۆیشتین.

## عەبدولکەریم داوام لێدەکا ببمە موتەسەڕیفی لیوای کەرکووک:

ئەنجوومەنی وەزیران، بەڕێز فواد عارفی وەزیری دەوڵەتی ڕاسپاردبوو گەشتێک بە کوردستانی عێراقدا بکا و بزانێ کێشەکانی جییە و پێشنیاری چارەسەری کێشەکان بخاتەڕوو. سەفەرەکەی بەهاوڕێی دوو ئەفسەری کورد کرد، یەکیان محەممەد عەلی شەریف بوو، لە چوونە کەرکووکیدا هەستی بە مەترسیی دۆخەکە کردبوو، هەستی بەوەی کردبوو هەستەوەرییەک لەنێوان کوردو تورکمانان ولە نێوان حیزبی شیوعی و توێژەکانی دیکەدا هەیە و کۆمپانیاکانی نەوتیش لەدژی شۆڕس بەگەرمی پاڵپشتی کۆنەپەرستان دەکەن، هەندێ هەڵسوکەوتی هەرزەکارانەی شیوعییەکانیش لەئارادایە.

فوئاد عارفیش نەتەوەییەکی کوردی ڕاستڕەو بوو و دڵی بە چالاکییەکانی حیزبی شیوعی خۆش نەدەبوو و، پەوەندیی بە کەسایەتییە ڕاستڕەوە کورد و تورکمانەکانی کەرکووکەوە هەبوو. ئیدی زۆری گوێ لەوان گرت و گوێی لە شیوعییەکان ڕانەگرت. کە هاتەوە بەغداش بە عەبدولکەریمی سەرۆکوەزیرانی ڕاگەیاند دۆخەکە چەند مەترسیدارە و. پێشنیاری ئەوەیشی بۆ کرد وەک موتەسەڕیف بمنێرێتە کەرکووک تا چارەسەری کێشەکان بکەم و بارەکە هێور بکەمەوە.

دۆخی کەرکووک بەو جۆرەبوو: ژمارەی کوردەکان دووهێندەی ژمارەی تورکمانەکان بوو، بەلام لە زۆربەی بەڕێوەبەرایەتییەکان تورکمان بالادەست بوون و، کۆمپانیاکانی نەوتیش پەیوەندییەکی پتەویان لەگەل کۆنەپەرستە کورد و تورکمانەکان هەبوو و، تورکیا و بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاس چالاکییەکی گەرمیان هەبوو. ئاخر ئەوان کونسوڵخانە و بنکەی سیخوڕییان بەناوی "بنکەی ڕۆشنبیری" هەبوو و، خەڵکە ڕاستڕەوەکە جەماوەری تورکمانیان لەژێر پەردەی ئایین کۆدەکردەوە، " بێ بۆنە و بە بۆنە، مەولوودیان دەخوێندەوە" تا لە نازم تەبوقچەلیی قائید فیرقە نزیکببنەوە، جونکە هەستیان کردبوو دژی عەبدولکەریم قاسمیە و، دواتریش لە کە لە بزووتنەوەی شەوافی تێوەگلا لە پێگەکەی لادرا و گیرا و دواترێ لەداردرا.

داود جەنابی، کە شیوعی بوو ڕەوانەی کەرکووک کرا و کرایە قائیدی فیرقەی دوو. ئیدی دەستی لە هەموو گەورە و گچکەیەکی وەردەداعەبدولجەلیل حەدیسیش موتەسەڕیف بوو و، ئەو لەڕووی سیاسی و دارایی و هەلسوکەوتەوە لە بەڕێوەبەرییە پاکەکان بوو، بەلام هاوڕێ شیوعییەکان و لەوانەش جەنابیی قائید فیرقە، مامەڵەیەکی شایانی ئەویان لەگەل نەکرد و بگرە دواترێ بە گیراوی ڕەوانەی بەغدایان کرد و بەڕێوەبەری اسایشیش ڕەزا گولانی بوو و کوردێکی سلێمانی بوو، بە هەق و ناهەق خەڵکی بەند دەکرد، ئیدی بووە هۆی دەستگیرکردنی گەلێک و دوورخستنەوەی زۆرکەسیس بۆ باشووری عێراق.

کە عەبدولکەریمی سـەرۆکوەیران بدویدا ناردم، نەمدەزانی بۆ داوای کردووە بمبینێ، چونکە فوئاد عارف پێی نەگوتبووم پێشنیاری جێی بۆ کردووە. جومە هۆڵی پێشوازی و ئەوجا عەبدولکەریم قاسـمیش هات و بەخێریهێنام و وەک هەرجارێکیش جاوەڕێبووم بزانم چ دەڵێ، گوتی: خۆت ئامادەکە، دەچییە کەرکوک، پێموابوو، وەک چۆن پێشـتری ڕەوانەی مووسڵی کردبووم تا کێشە عەشایەرییەکان چارەسەر بکەم، ئێستاش بۆ کارێکی تایبەتم دەنێرێ، گوتم من لەژێر فەرمانتاندام، خێرە؟ شتێک بووە؟ گوتی: بە موتەسـەڕیفی دەچییە ئەوێ. بابەتەکە تۆزێک سەیربوو، بەڵام ئاگام لەوەی نەبوو چ ڕوویداوە. گوتم: من بەرفەرمانتانم، بەڵام هۆی چوونەکەم چییە؟ گوتی: کێشـەیەکی زۆر لەوێ هەیە، تۆ خەڵکی شارەکەی و خەڵکەکەی ئەوێ دەناسی و دەشتناسن، دەتوانن کێشەکان چارەسەر بکەن. جیوای کەرکووک لیوایەکی هەستەوەرە، عەرەب و کورد و تورکمون و ئاثووری و سوننە و شیعەی تێدایە، تۆ ماوەیکی زۆر لەوێ ژیاوی و بەوەش ناسـراوی کێشـەکان بە هێمنی و لەسـەرەخۆیی چارەسـەر دەکەی، خەبەرم هەیە تۆ گونجاترین کەسـی بۆ ئەو جێیە. پێمگوت: من لاریم نییە، بەڵام دووشـتم لە جەنـابتـان دەوێ؛ لەوێ گرتن و دوورخسـتنەوەیەکی هەرەمەکی کراوە، تا خەڵکەکە هەسـت بکەن من شـێوازێکی نوێی بەڕێوەبردنم هێناوە و، تـا هـاوکـاریم بکەن، تکام وایە لێگەڕێی گیراو و دوورخراوەکـان لەگەل خۆم ببەمەوە و، لەوێ بەریان بدەم و ئامحژگارییان بکەم پێویسـتە هاوکاربن و یاساکان نەبەزێنن و کاری پێچەوانەی سیاسـەتی حکوومەتی شـۆڕش نەکەن. گوتی: خوا دەست بە باڵەتەوە بگرێ، ئەو داوایەت قبووڵە. گوتم: داوای دووەمم ئەوەیە دەسەڵاتەکانمان سـنووریان هەبێ و، گەورەییتان دەزانێ داود جەنابیی قائید فیرقە برادەرمە و، پێموانییە کێشـەمان بکەوێتە بەینێ، بەڵام وەک دەزانن بەپێی یاسـای دەسـەڵاتی جێبەجێکردن و بەڕێوبردنی لیوایەکان، قائید فیرقە سـەر بە موتەسـەڕیفە، چونکە موتەسـەڕیف نوێنەری دەسـەڵاتی باڵای دەوڵەتە لەوێ نەک قائید فیرقە، لەو حاڵەتەشـدا دەزگاکانی ئاسـایش و پۆلیس لەبن دەسـتی موتەسـەڕیفی دەبن نەک کەسـیکی دیکە، ئیدی پێویستە بەپێی یاسـا دەسەڵاتەکانی هەرکەسێک دیاری بکرێ، تا من سنووری دەسەڵاتەکانی خۆم نەبەزێنم و ڕێش بە کەس نەدەم سـنووری دەسـەڵاتەکانی خۆی ببەزێنێ. گوتی: کەواتە برۆ و، تەلەفۆنێکی تایبەتیشت هەیە، من هاوکاری داواکارییەکانت دەبم. گوتم: بەڕێزی زەعیم، من پیاوی یاسام و دەشزانم جێی متمانەی بەڕێزتان دەبم، بەڵام دەمەوێ دەسەڵاتەکانی من و دەسەڵاتەکانی خەلکی دی بە نووسین دیاری بکرێ، تا خەڵکەکەی دیکەش بزانن دەسەڵاتی موتەسـەڕیف تا کوێ بڕ دەکا. گوتی: لەو حاڵەتەدا دەبێ دەسـەڵاتی موتەسـەڕیفەکانی دیکەش دیاری بکەم. گوتم : جا ئەوەیە کە دروسـتە. گوتی: بەڵام من پشـت بە هەموویان

نابەستم. گوتم: باشە چۆن کاروباری دەوڵەت و گەل دەدەیە کەسێکی هیی ئەوەی نییە پشتی پێ ببەستی؟! ئیدی لەسەر داوایەکەم هەر سووربووم، هەستایەوە و گوتی: ئەورۆ و بەیانی بیری لێ بکەوە، ئەگەر ڕازیبووی وەرەوە لام تا فەرمانی دامەزراندنت دەرکەم بچییە سەر کارە نوێیەکەت.
ڕۆژی دواتریێ فوئاد عارف لە ماڵەوە هاتە لام و، بۆی ڕوونکردمەوە سەرۆک وەزیران داوای لێکردووە رازیم بکا و بێ مەرجیش، منیش بیرۆکەی خۆمم بۆ رونکردەوە و هەر لەسەر مەرجەکەم سووربووم، ئیدی داوای دیداریم نەکردەوە و چاوەڕێی ڕزامەندیی بووم.
داود جەنابیی قائید فیرقە هەموو کاروبارەکانی لیوای بەدەستەوە بوو، هەر ئەویش فەرمانی دەستگیرکردنی عەبدولجەلیل حەدیسیی موتەسەڕیفی بە شێوەیەکی نایاسایی ونارەوا دەرکردبوو و ڕەوانەی بەغدای کردبوو، ڕەنگە موتەسەڕیف دەسەڵاتە یاساییەکانی خۆی جێبەجێ کردبێکە لەگەڵ ویست و ئارەزووی زەعیم داود جەنابی یەکانگیر بووبی، ئیدی لەسەر ڕێی خۆی لایدابێ. منیش تەواو پێموابوو لەبەر هەمان هۆ لەگەڵ هاوڕێ و برادەری خۆم زەعیمی قائید فیرقە یەکانگیر دەبین، ئاخر ئەو، دەزگای ئاسایس و پۆلیسی، کە سەر بە موتەسەڕیفن، بەخۆیەوە بەستابووەوە و فەرمانەکانی ئەویان جێبەجێ دەکرد نەک هیی موتەسەڕیف. بەڵام زۆر زێدەڕۆیی کرابووە سەر مافی هاوولاتییان کە دەکرا بەجۆرێکی دی مامەلەیان لەگەڵ بکرێ. گەرمبوون و کەم شارەزایی لە بەڕێوەبردن و هەڵپەی هاوڕێیانی حیزبی شیوعی بە پشت بەستن بەو دەسەلاتە بێ سنوورانەی داود جەنابیی قائید فیرقە بوونە هۆی ئەو کارەی لەکەرکووک و لە یەکەم ساڵیادی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ ڕوویاندا.

## ڕووداوە ئازاربەخشەکانی ١٩٥٩ی کەرکووک:

کوردو تورکمان لە عێراق بەگشتی و لە شاری کەرکووک بەتایبەتی پەیوەندیی ڕۆحی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی کۆنیان پێکەوە هەیە.
تەنیا بیرۆکە نەتەوەییە جوداخوازییەکانی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم توانیی ڕوونیی ئەو پەیوەندییانە شلوێ بکا، ئەویش کاتێ، بزووتنەوەی نەتەوەیی تورکیی لە کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقیی تورکی و تەرەقیی کوردی بەرجەستە بوون و، هەرکە ئیتیحادییەکانیش گەیشتنە دەسەڵات دەستیان بە چەوساندنەوەی نەتەوە غەیرە تورکەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانلی کرد.
هەڵوێستی دووەمی پەیوەندییەکانی نێوان کورد و تورکمانی لێڵ کرد ئەو کاتەبوو کە بەریتانییەکان لە ١٩١٤ عێراقیان داگیرکرد و چەندوچوونی نێوان دەوڵەتە ئیستیعمارییەکانی شەڕی یەکەمی جیهانییان بردبووەوە و کاتێکی کە زۆربەی سیاسییە کوردەکان بەلای ئەوەیدابوون تورک نەگەڕێتەوە و کوردستانی باسوور˚ویلایەتی موسڵ˚ی کە بەریتانییەکان پلانی ئەوەیان بۆ دەکێشا بیخەنە سەر دەوڵەتی عێراق، کەچی کوردەکانداوایان دەکرد دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆی لێ دامەزرێ و دەسەڵاتی هەردوو نەتەوەی تورک و عارەبیان ڕەتدەکردەوە، لە کاتێکدا تورکمانەکان بەلای ئەوەیدا بوون ویلایەتی موسڵ بخرێتە سەر تورکیا بێ ئەوەی ئاماژە بە هیچ مافێکی ئەو کوردانە بکەن کە هەشتا لە سەدی دانیشتووانی ویلایەتەکە بوون.
هەڵوێستی سێیەمی پتر و پتری هەستەوەری لەنێوان کورد و تورکمان دروستکرد، بەستنی پەیمانی سەعداباد بوولە ١٩٣٧لە هەندێ بەندیدا هاتووە دەبێ ئەو وڵاتانەی لەو پەیمانەدان، هەر جووڵانەوەیەکی دژی هەر یەکێکیان سەرکوتکەن و، ئەوەش یەکەم پەیمانی دژە دەوڵەتی سۆڤیەتی لاو بوو. ئەو لەناو تورکمانان پێشوازییەکی زۆری لێکرا و، بە پشتگرتنیحکوومەتی عێراقییش.ئەوەش وایکرد کوردەکان لێیان دوورکەونەوە. ئەو کێشانەی نێوان کورد و تورکمانان بەپلەی یەکەم دەکەوتە نێوان توێژە ڕۆشنبیرەکەی هەردوولایان، لەکاتێکدا پەیوەندییە بازرگانییەکان، بەتایبەت لەنێوان بازگانە بچووکەکان لەژێر کاریگەریی ئەو کێشە نەتەوەییانەدا نەبوون.
چوارەم هەڵوێستی ەریکبوو لە ئاسۆ وەدەردەکەوت، لە نیوەی دووەمی ساڵانی سییەکانی سەدەی بیستەم بوو، ئەوکاتەی حیزبی هیوا دامەزرا، ئەگەرچی بەرنامەیەکی نەتەوەیی بەرانبەر نەتەوەکانی دیکە نەبوو. سەبارەت بە پەیوەندییە دیموکراتییەکانی نەتەوەکانی کوردستان هەڵوێستێکی نەرێنیی هەبوو. حیزب، عارەب و تورکمانی بە دوژمنی خۆی دەزانی، نەک حکوومەتی عێاقی و حکوومەتی تورکیی. هەڵوێستی تورکمانەکانیش،

ســـــەبارەت بەو مافە نەتەوەییانەی حیزبی هیوا بۆ کوردانی داوا دەکرد، نەرێنی و بگرە دوژمنکارانەش بوو.
لە سالەکانی دوادوایی حوکمی مەلەکی لەو سەردەمەی عێراق لە ١٩٥٥ چووە ناو پەیمانی بەغدا، کە تورکیایشـــــی تێدابوو، تورکیا چالاکییەکی فراوانی لەناو تورکمانەکان هەبوو و. حکوومەتی عێراق ڕێگەی پێدا بنکەیەکی ڕۆشـنبیری و کونسـولخانە لە کەرکووک بکاتەوە و ئەرکی ئەوەبوو لاوەکان لە رووی فیکرییەوە وەها ئامادەبکا تا پەیوەسـتی تورکیابن و خۆریشــــیان خوێندنیان لەوێ تەواودەکرد و دوایە دەهاتنەوە عێراق بە فیکر نەتەوەیی شۆڤێنی ڕەباس کرابوون، بەتایبەت دژی کورد.
هەڵوێستی پێنجەمی کێشە توندەکەی پتر کرد، ئەو کاتە دەرکەوت کە مەلا مستەفا بارزانی سەردانی کەرکووکی کرد و پێشوازییەکی گەرمی لێکرا و لە میوانداریی **حکوومەتیش** بوو، پاشانیش ئەو ماڵئاواییە گەرمەی بۆی کرا.
لەکاتێکدا هەڵوێستی شەشەم کە لە هەمووانیش بەهێزتربوو ئەوەبوو کە کۆنەپەرستی، جا لەهەر نەتەوەیەک بێ، دژایەتیی چالاکیی دیموکراتی و چەپڕەوی و کوردیی دەکرد، چونکە چالاکیی کوردییش شێوازێکی دیموکراتی و پێشکەوتنخوازیی هەبوو.
جا ئەو هەلانەیشی بخەسەر کە حیزبی شیوحی و پارتی دیموکراتی کوردستان کردیان و، پێموایە ئەوان نەیـانتوانی بگەنە جەمـاوەری تورکمـانی، کە زۆربەیـان لە رەنجـدەران و کاســـبکاران و ڕۆشـــــنبیران بوون و، پێیانوابوو ئەوان زۆرینەی گەلن لەوێ. کە داود جەنابیی سـەرکردەی سـەربازیی شـیوعییش کرایە قائید فیرقەی دووی کەرکووک و جێی تەبەقچەلیی گرتەوە، تەبەقجەلیی هەوڵی دەدا تورکمانەکان لەدژی کوردەکان هاندا، بارەکە گۆڕا، نەخاســـمە کە هەندێ لە هاوڕێ تورکمانەکانی حیزبی شـــیوعیی عێراقی لەجیاتیی ئەوەی وەک تورکمـانێـک کـار بکەن ئەاون لە غەیرە تورکمـانەکـان تونـدتر بوون و ئەو کارەش وایکرد تورکمانەکان پتریان ڕق لە حیزب بێ.
هەڵوێســتی حەوتەم چالاکیی کۆمپانیا نەوتییە ئیسـتیعمارییەکان بوو، کە ڕۆڵێکی گەورەی لەو کارەدا هەبوو. ئەو کۆمپانیایانەهەرچی کۆنەۆەرســـــتی کورد و تورکمان و عارەب هەبوون لوهامێزیان کردن و، دوای ئەوەی پاش شـــــۆڕشـــــی ١٤ی تەمموز پۆســـــتی بەرژەوەندییەکانیان لەدەسچووبوو ئەو کۆمپانیایانە مووجەیەکی باشیان بۆ بڕیبوونەوە.
بەڵێ چالاکییەکی کۆنەپەرســتانە لە لیوایەکە هەبوو، بەڵام شــێوزی چارەســـەکردنیشـــی دروســـــت نەبوو بووە هۆی ئەوەی کورد و تورکمان لێکتر ببێزرێن و ئەو توێژانەس لێک دوورکەونەوە کە دەکرا بە شــــێوازێکی دیکە مامەڵەیەن لەگەڵ بکرێ، پێویســــتبوو درک بەوەی بکرێ ککەرکووک لە ویلایوتەکانی دیکە جودا نییە، ئەویش پارچەیەکە لە دەوڵەتی

عێراقی بۆرژوای نیشتمانی فەرمانڕەوایی دەکا و توێژە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی گەل پشتیوانیی لێدەکەن، کارێکی هەڵەبوو کەوەک هەرێمێکی حیزبی شیوعی مامەڵەی لەگەڵ بکرێ. لەیەکێک لە گەڕانە فەرمییەکانم  و کاتێ بە کەرکوکدا تێپەڕیمئەو بابەتانەم دەستنیشان کرد و پێشبینیی ئەوەم کرد دۆخەکە لەنێوان کورد و تورکماندا بتەقێتەوە، جا راپۆرتێک دەربارەی ئەوە بۆ سەرکردایەتیی حیزبی شیوعی لە بەغدا نووسی ، داوام لێ کردن چارەسەری دۆخەکە بکەن و هەندێ لەو هاوڕێیانەی هەڵسوکەوتی هەرزەکاارانەیان هەیە بیانکێشنەوە و هاوڕێی تێگەیسووتر بنێرن تا ئەو تەقینەوە چاوەڕوانکراوە ڕوونەدا.
لەسەرداوای حیزبی شیوعی و ئیبراهیم کوببەی وەزیری ئابووریی نزیک لە شیوعییەکان جوومە بەغدا تا پۆستی بەڕێوەبەری گشتیی ئینحیساری تووتن وەرگرم و، دواتریش پشکنەری گستیی وەزارەتی چاکسازیی کشتوکاڵی، ئیدی پەیوەندیم بەو ڕووداوانەوە بڕا کەلەکەرکووک روویاندا، هەر چەند  مانگێک لە کەرکووک مامەوە تا ئەو ڕووداوانە ببینم کە باسم کردن، ناشزانم ئەگەر لە کەرکووک بمابامایەوە داخوا دەمتوانی ڕێ لەو ڕووداوانە بگرم کە دواترێ روویاندا یان نا؟ ئاخر ئەو هاوڕێیانەی لەوێبوون ئەگەر لەمن لێهاتووتر نەبووبن لەمن کەمتر نەبوون، بەڵام زۆربەی بەرپرسە حیزبییەکان یان لە شارەکەی غەوارەبوون وخەڵکەکەیان نەدەناسی ونەیاندەزانی چۆن چارەسەری کێشەکانیان بکەن، یانیش خەلکی ناوچەکەبوون بەلام پێویستیان بە شارەزایی و بیرکردنەوە  هەبوو تا چارەسەرێک بۆ کێشەی تورکمان کوردستان دانێن.
راستییەکەی هەردوو حیزب، پیوعی و دیموکراتی کوردستان گوزارەی "بەخشینی مافەکانی کەمە نەتەوەکانی وەک تورکمان و ئاثووری و ....تاد" یان لە بەرنامەی خۆیان دانابوو، بەلام ئەو دروشمەیان نەکردە کارێکی دیار و، نەشیانتووانی خۆگریی جەماوەری تورکمان لەو دروسمە لێکدەنەوە و، ئەوان هەموو چالاکییەکی تورکمانییان بە چالاکییەکی کۆنەپەرستی دژە دیموکراتی لەقەڵەم دەدا و، لەبیریان جووبوو کە تەنیا داواکردنی مافە نەتەوەییەکانی تورکمان لە جەوهەردا بە چالاکییەکی دیموکراتی دادەندرێ.
بە دڵنیاییەوە چالاکیی کەسە سەرکردەییەکانی تورکمان لەناو جەماوەری تورکمانیدا قەتیس دەبوو، کەواتە ج شتێک ڕێ لەوەی دەگرێ لەڕێی ئەو کەسانەرا بگەیە ئەو جەماوەرە، جا هەر بیروڕا و هەڵوێستێکیان هەبێ، ئەوەش بە هاماهەنگی لەگەل ئەو کەسانەدا دەکرا. من ئێستا خۆم تا رادەیەک بە هەڵە دەزانم کاتێ مەرجم بۆ بوونە موتەسەریفیی کەرکووک دانا و، لە جونکە لە تێپەڕاندنی دەسەڵاتەکانی هاوڕێ عەمید داودجەنابی و لەپاخستنی تواناکانی کارکردنم دەترسام. بەڵام ئەگەر قبووڵم بکردایە و لەبەر پلە حیزبییەکەم لەوێ، کە ئەندامی لقی کوردستان بووم و بەرپرسی پەیوەندییەکانی

ناوخۆیشـــیوعییەکـان، لەوانەش داود جەنـابی، لەبەر پێگەی خـانەوادەکمـان لەنـاو تورکمـانەکـانی کە زۆربەیـان موریـدیتەکیەی تـاڵەبـانیی کەرکووک بوون وپەیوەنـدییە تایبەتییە باشەکانم لەگەڵ کەسە دیارەکانی تورکمان، پێموابێ هاریکارم دەبوون تا ئاشتی بخەمە نێوان کورد و تورکمانەکانی کەرکووک.

ئەگەر هەموو ئەوشتانەی لەسەرەوە سەبارەت بە سیمای کوردی و دیموکراتیی لیوایەکە باسکران کۆکەینەوە، لەگەڵ کورتبینیی هەردوو حیزبی شیوعی و دیموکراتی کوردستان لە یەکەم ســاڵیادی شــۆڕشــی ١٤ی تومموز لە ١٩٥٩ و، ئارەزوویان لە بەڕێوەبردنی ڕێپێوانێکی سـەربەخۆ بۆدەرخسـتنی سـیمای تورکمانی نەک کوردی لە لیوایەکەدا. بەڵام دەسـەڵاتەکان ڕێیان نەدانێ و ئەوەش ڕقی تورکمانەکانی هەڵساند و دەستدرێژییان کردە ســەر ئەو ڕێپێوانەی ئاسـتییانەیەی حیزبی شـــیوعی و پارتی دیموکراتی کوردســـتان ڕێکیانخســتبوو و بەکارەســاتێکی راســتەقینە کۆتاییهات کە مارف بەرزنجی و حوسـین بەرزنجی و عەبدولجەبار محەممەد پیرۆزخان و کەســـانی دیی تیدا بوونە قوربانی، کە لە کەســـە دیارە پێشـــکەوتنخواز و نەتەوەییەکان بوون کە ئەوشـــارە هێناونییەتە دنیا، کارەسـاتەکەش کێشـە و دوژمنداریی نەتەوەیی نێوان ئەو دوو نەتەوەیەی قووڵتر کردەوە کە لە دێرزەمانەوە بە ئاشتی و بێ کێشە پێکەوە ژیاون.

زۆربەی کـارە تـاوانکـارییەکـان کـاتێک ڕوویـاندا کە ئەو دوو حیزبە دەڵاتیـان بەســـەر دۆخەکەدا نەمـا و نەیـانتووانی بیوەســـتێنن. ئەوەی خراپتریش بوو ئەوەبوو کە ئەو تاوانانەیان شـەرمەزاار نەکرد کە کرابوون و، هەموو بەرپرسـیارییەکەیان خسـتە ئەسـتۆی ئەسـتۆی تورکمانەکان و لەترسـی سـزای دەسـەڵاتەکانی بەغداش ڕەخنەیان لە هەڵویسـتە هەڵەکانیان نەگرت.

کۆنەپەرســتی وچالاکییە ئیســتیعمارییەکان لەئارادابوون تا هەموو بەرپرســیارییەکانیان بخەنە ئەوستۆ. ئاخر بەرپرسان، بەتایبەت هاوڕێ شیوعییەکانی باوەڕیان بە نێونەتەوەیی و هـاوکـاریی نەتەوەکـان هەبوو، بۆ پڕکردنەوەی ئەو خەرەنـدە گەورەیەی، لەئەنجـامی هەوڵی تورکمانان کە لەزۆر بۆنەدا دەیانویســت کەرکووک بە شـوناسـێکی تورکمانییەوە دەرخەن، کەوتبووە نێوان کوردو تورکمانان دەبوایە ڕێگایەکی دی بگرن.

کۆنەپەرســتان ئەو ڕووداوەیان دژی کورد و دیموکراتیەت قۆســتەوە و ئەو کارانەیان بە هەردوو حیزبی شیوعی و دیموکراتی کوردستانەوە بەستەوە و، حکوومەتی بەغدایان لێ هەڵگەڕاندنەوە ، ئەو کارەســـاتەش، دوای کودەتای ٨ی ســـوباتی ١٩٦٣، بە کوژرانی ژمارەیەک تورکمان و دواتریش بە لەداردانیچەندین کەســایەتیی دیاری کورد و شـیوعی کۆتاییهات

## ڕاسپاردنم بۆ وەزارەتی شارەوانی:

سـێیەم ددار و گرنترین دیداری لەگەڵ زەعیم عەبدولکەریم قاسـم لە کۆتاییەکانی ١٩٥٩ بوو، کە کاتێفوئاد ریکابی و محەممەد سدیق شیدشەل، لەژێر کاریگەریی سەرۆک جەماڵ عەبدولناسـر، پۆسـتە وەزارییەکانی خۆیان بەجێهێشـت و چوونە بەرەی نەیاران، ویسـتی ڕێکخسـتنەوەیەک بۆ ئەنجوومەنی وەزیران بکا و ژمارەیەک لە دیموکراتییەکان بخاتە ناو وەزارەت ، نەخاسمە کە شیوعییەکان لە ١ی ئایاری ١٩٥٩ "بژی کەریم حیزبی شیوعی لە ددەسەڵات داوایەکی گرنگە".

نازانم داخوا عەبدولکەریم قاسم دەیزانی شیوعیم یان نا، بەڵام جاسم عەزاویی سکرتێری ڕۆژێکیان داوای کردم تا بچمە دیتنی سـەرۆکوەزیران، هەمووانیش پێیان دەگوت "زەعیم" . کە جوومە وەزارەتی بەرگریدیتم بەڕێز عەبدوللەتیف شـەواف لای جاسـم عەزاوییە و ئەویش نەیدەزانی بۆ داواکراوە.عەبدوللەتیف پێشـەمن چووە هۆڵی پێشـوازی تا زەعیم ببینێ، دوای ماوەیەک گەڕایەوە ، پرسـیم دیدارەکە بۆ چی بوو؟ گوتی ڕایسـپاردم وەزارەتی بازرگانی وەرگرم و قبووڵم کرد.

کەواتە مەسەلەکە ئەوەیە بمانخاتە ناو وەزارەت،دوای ماوەیەک زەعیم داوای کردم، دوای بەخێرهێنان پرسـیاری ئەوەی لێکردم داخوا پێش شـۆڕش چ کارێکم دەکرد و لەکوێبووم. بۆم ڕوونکردەوە کە من پارێزەرم و پێش شـۆڕشـیش لە بەندیخانە و دوورخراوەیی بوویمە. گتی شـۆڕش هەمووتانی لە بەندیخانە و دوورخراوەیی ڕزگار کرد. گوتم : زەعیمی بەڕێز شۆڕش هەموو گەلی عێراقی لە مەینەتی دەرباز کرد، بەڵام من خۆم حەوت ساڵم بەندی کێشا سێ ساڵیش دوورخراوەیی، ئەوجا شۆڕش ڕوویدا. گوتی: لەبەرچی بەند کرابووی؟ گوتم بە تۆمەتی شـیوعیبوون. گوتی: ئەوەی چوو چوو، دەمەوێ پۆسـتی وەزیری شارەوانی وەرگری، ئەوجا گوتی: ئەگەر کێشەیەک لەنێوان من و حیزبی شیوعی رووبدا و، حیزب داوات لێبکا دەست لەکار بکێشییەوە، لەگەڵ من دەمێنییەوە یان دەست لەکار دەکێشـییەوە و دەڕۆی؟ گوتم ؛ پێموایە ئەو گریمانەیە لەئارادا نییە، چونکە تا ئێوە لەگەڵ گەلدابن حیزبی شـیوعی لەگەڵتاندایە، ئەرێ ئەگەری ئەوە هەیە ڕۆژێک لە گەل دوورکەونەوە؟ دوایەش من ئەندامێکی کۆنی حیزبی شـیوعیم، ئەگەر بۆ کورسـییەکی وەزارەت پشت لە حیزب بکەم، باسە بەڕێزتان پێتان وانییە ئەگەر کەسێکی دی پۆستێکی دیکەم نیشان بدا پشت لە ئێوەش دەکەم؟

گەتی: ئەو قسـەیەت جێی ڕەزایە، بەڵام لە هەموو حاڵێکدا دەمەوێ لەگەڵمدابن. گوتم : لە هەموو حاڵێکی کە گەلت لەگەڵدابێ ئێمە لەگەڵتداین و، منیش تاکێکی ئەو گەلەمتکام وایە ڕاسپاردنم بۆ ئەو بەرپرسیارییە بەو مەرجانەوە نەبەستییەوە، چونکە من نزیکەی چارەکە

ســـەدەیەکە وابەســـتەی حیزبێکم کە لەڕیزەکانیدا خەباتم کردووە و بەرگەی ئازار و ماندووبوونێکی زۆرم گرتووە و لەوکارەی کردووشـــمە پەشـــیمان نیم و لە دواڕۆژیش پەشیمان نابم.
گوتی: ڕەنگە نیشـتمان پەروەرەکان لەسـەر یەک ڕێ هاوڕانەبن وهەریەک بەپێی بۆچونی خۆی جودابن، م دەمەوێ هاوڕێ و وەزیرەکانم لەوانە هەڵبژێرم کە هەمیشـە دەسـتبارم لەگەڵ دەگرنگوتم: زەعیمی بەڕێز من باوەڕم بەوەی هەیە ئەو ڕێیەی حیزبی شـیوعی بۆ خزمەتی گەل گرتوویەتییە بەر ڕێیەکی بێ کێشـــە و تـاقیکراوە و ڕوونە، بۆ گریمـانەی جوازی دانێین کە ئێمە جیاواز نیین و، ڕەنگە لە داهاتووش جیاواز نەبین، ئەگەر جیاوازیش بووین داخوا بۆ بەڕێزتـان گرانە وەزیرێکی دی هەڵبژێرێ؟ گوتی: ڕاسـتە هەڵبژاردنی جێگرەوەیەک کـارێکی قورس نییە، بەڵام هەڵبژاردنی وەزیرێکی قـاڵبووی تەواو کوڵاو و پوختەبوو کارێکی ئاسـان نییە. ئەوجا گوتی: بەهەرحاڵ، باس بیر لە بابەتەکە بکەوە و. دیسان یەکتر دەبینینەوە.
ڕستەی کۆتایی ئاماژەی کۆتاییهاتنی دیدارەکەبوو و بە سوپاسەوە ماڵاواییم لێکرد.
پێموابی من پاڵێوراوی حیزبی شـیوعی نەبووم بۆ ئەو پۆسـتە و، گفتوگۆیەک لەنێوان ئەو و فوئـاد عـارفی وەزیری دەوڵەت دەربـارەی هەبوونی حەســـەن تـالەبـانی لە وەزارەتدا کرابوو، کە وەزیری کـارەبـاری کۆمەڵایەتی بوو و، فوئـاد عـارف بوونی ئەوی لەنـاو وەزیرەکان بە نەشــاز دادەنا، ئیدی پرســیاری کەسـێکی دیی لێ کردبوو و ئەویش ناوی منی هێنابوو و، عەبدولکەریم قاسمیش ڕازی ببوو.
پێدەچوو ئەو قسانەمی بە ڕەتکردنەوە دانابێ، ئەگەر بەڕاشکاویش وای نەگوتبێ، جارێکی دی بەڕێز فوئـاد عـارفی هەنـاردەوە، کەدەیزانی ئێمە برادەری کۆنین، تـا ڕازیم بکـا مەرجەکەی قبووڵ بکەم و ئەگەر کێشەیەک کەوتە نێوان ئەو و حیزبی شیوعی دروستبوو واز لە حیزبی شـیوعی بێنم، بەڵام من باوەڕم بەوە نەهێنا و، کە هاوڕێ نەزیهە دلێمییش بووە وەزیری شـــارەوانی و چووە ناو وەزارەت جێگرەوەی من نەبوو، چونکە بڕیاربوو پێکەوە لە وەزارەت بین، من لە وەزارەتی شـــارەوانی و ئەویش بۆ ئەوەی ژن بێنە ناو وەزارەت بکرێتە وەزیری دەوڵەت، یان وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتیی بدرێتێ و ئەویش لە هەبوونی دووتاڵەبانییان لەوەزارەت دوودڵ بوو، جونکە شـێخ حەسـە تاڵەبانی وەزیری گەیاندن بوو. بەڵام پێیانگوتبوو ئەدی عەبدوڵڵا قەســـاب و عەبدولعەزیز قەســـابی کوڕی لەسـەردەمی مەلەکی لە یەک وەزارەت وەزیر نەبوون؟ باشـە چ ڕێ لەوەی دەگرێ شـێخ حەسەن و موکەڕەم لە یەک وەزارەت بن.

من لەسـەرهەڵوێسـتی خۆم سـووربووم، ئیدی بابەتەکە هەروا بە هەواوە مایەوە تانەزیهە دلێمیی کردە وەزیری شارەوانی، پێموایە ئەو هەڵبژاردنەش لەسەر بنچینەی حکوومەتێکی هەمەلایەنیی حیزبی نەبوو و لەسـەر بنەمای تایبەتمەندییش نەبوو، چونکە نەزیهە دلێمی پزیشـک بوو، عەبدولکەریم بەس ویسـتی بۆ بابەتی پروپاگەندەیی کادرێکی ژن بخاتە ناو وەزارەتەکەی و نەزیهەش سەرۆکی کۆمەڵەی ژنانی عێراق بوو و ئیدی کردییە وەزیر.

## لەبەر یادداشتی ئاشتیی کوردستان درامە لێکۆڵینەوە :

شـــۆڕشـــی ١٤ی تەمموز بە یەکڕیزیی هەموو نەتەوە کانی گەلی عێراق لە خەباتی دووروودرێژی دژی حوکمی مەلەکیی کۆنەپەرستی دوژمنی گەل هەڵگیرسا، لە کوردستان لە ١٩٤٣ شـــۆڕش لە ناوچەی بارزان هەڵگیرســـا، لە ١٩٤٥ بەیارمەتیی حیزبی هیوا بەشـێوەیەک فراوانتر هەڵگیرسـایەوە و، دوای سـەرکوتکردنی شـۆڕشـیش حکوومەت ڕێوشـوێنێکی توندی بەرانبەر کوردان گرتەبەر و هەزاران خانەوادەی بارزانیی بەندکردن و گواستنیەوە و، چەند سـەد کەسێکیان بەسەرکردایەتیی مستەفا بارانی ناچاربوون پەنا بۆ یەکێتیی سـۆڤیەت ببەن و چوار ئەفسـەی چوبوونە پاڵ شـۆڕش لەداردران وئەوانیش بریتیبوون لە هەریەک عیزەت عەبدولعەزیزی ڕائید ڕوکن و مسـتەفا خۆشـناوی نەقیب و خەیروڵلا عەبدولکەریمی نەقیب و مولازم محەممەد مەحمود و سـەدان شـیوعییش خرانە بەندیخانە کە ژمارەیەکی زۆریان کوردبوون و ئەفســـەرە کوردەکانیش ڕاســـتەوخۆ بەشداریی شۆڕشیان کرد.

ڕووداوەکانی شـــۆڕشـــی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ی مێردەزمەی حوکمی مەلەکیی ڕاماڵی و کۆماری ڕاگەیاند و کوردەکانی لە بەندیخانەکان بەردا و دوورخراوەکانی بردەوە زێدی خۆیان، ئەوا هەموو کێشـــە نەتەوەییەکانی دیکەی داپۆشـــی، لە ١٩٥٩ یەکەم دەســـتەی قوتـابیـانی کورد بۆ خوێنـدنی مێژوو و ئەدەبی کوردیڕەوانەی پەیمـانگـا و زانکۆکـانی ڕۆژهەلاتنـاســـیی دەرەوە کران تـا دوای وەرگرتنی تـایبەتمەنـدی ببنە یەکەم تووی دامەزراندنی بەشی خوێندنی کوردی لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا.

حکوومەتەکەی قاســـم هەرخێرا پاشـــەکشـــەی لەو هەنگاوە پێشـــکەوتنخوازانەی کرد کە لەمانگەکانی بەرایی شـۆڕش هەڵیهێنابوون. ئیدی کێشـەینەتەوەیی کورد دووبارە کەوتەوە ســـەر ئاوێجا لەلایەک هێزە کۆنەپەرســـتەکانی ناوخۆی دژی شـــۆڕش بوون و کاریان بۆ ئەوەی دەکرد بیخەنە دەریایەکی کێشـــەوە، ئەو بابەتەیان قۆســـتەوە و، لە لایەکی دیکەش ئەو هێزەبێگانانەی دژی کۆمارە لاوەکەبوون پێیانوابوو ئەگەر حکوومەت لەشەڕی کوردان بئاڵێ هەلێکە بۆ لاوازکردنی و دوایەش لەناوبردنی.

عەبدولکەریم قاسم یاسای ژمارە "٨٠"ی ساڵی ٩٦٠ی دەرکرد، کە بەپێی ئەو یاسایە هەموو ئەو زەوییانەی وەبەرناهێنرێن لە کۆمپانیا نەوتییە ئیســـتیعمارییەکان وەرگیرێتەوە. چوونە ناو شـــەڕێکی ئاوا لەدژی کۆمپانیا مۆنۆپۆلەکانی نەوت پێویســـتی بە کۆکردنەوەی هەموو وزەیەکی گەل هەبوو تـــا لەو ململانێیەیـدا لەدەوری حکوومەت کۆببنەوە، کەچی حکوومەتەکەی قاســـمبەو ڕێوشـــوێنە نادیموکراتییانەی پیادەی دەکردن وردەوردەخۆی لە

گەل دووردەخستەوە، هێ لە حیزبی'وەتەنیی تەقەدومی' هیچ حیزبێکی دیکەی بۆ پاڵپشتی ـە دەورە نەما.
هەر هێندەی ســـاڵی ١٩٦١ هاتەبەرێ، ئیدی کۆمپانیاکانی نەوت لە بارودۆخێکدابوون ـەیانوانی ڕاستەوخۆ هەڕەسە لە عەبدولکەریم بکەن کە ئەگەر لەسەر داوایەانی بەردەوام بێ دەسەڵاتەکەی لەناو دەبەن.
گۆڤاری ئیکۆنۆمیستی بەریتانی وتارێکی ورووژێنەری نووسیبوو و، ناونیشانەکەی دەڵێ: 'خەمی یەکەمی دەسەڵاتدری عێراق پاراستنی خۆیەتی'. لەو وتارەدا هاتووە: 'شەڕی قاسم بۆ مانەوە، وەک خۆی دەڵێ، بە زنجیرەیەک ڕووداو دەســتیان پێ کردووە کە ناکرێ لێی پاسـگەز ببیەوە. دۆخی کوێت و کوردســتان و نەوت ڕەنە کاری بەردڵێ قاســم بن، بەلام کێشەکانی دەبێتە پاشماوەیەکی بۆ هەرکەسێکی دوای خۆی دەبێتە میرات'.
قاسم لە شـەڕی کوردستانەوە گلا و، بۆ بەردەوامیی شـەڕیش دەسبەرداری کەسایەتییە پێشـــکەوتنخوازەکانی ســـەرکردایەتی و یەکەکانی ســـوپا بوو و هانای بۆ ئەفســـەرە کونەپەرستە زێدەڕۆیەکان برد.
هەندەی پێنەچوو قاسمی تێمابوو نەیدەزانی چ بکا زانیی نوێنەری کۆمپانیای نەوتی عێراق ئاناژەی بۆ چ دەرەنجامێک دەکرد، هەر بەڕاســتییش قاســم دەســتی بە شـــەڕی مانەوە کردبوو، لە کوردســتان لە ١١ی تشــرینی یەکەمی ١٩٦١ شـــەڕێکی توند لە کوردســـتان هەلگیرسا.
حیزبی شـــیوعی ئەو هەڵمەتە ســـەرکوتکەرەی ڕەتکردەوە، کە حکوومەتەکەی قاســم لە بەیاننامەیەکی لە ١٤ی تشــرینی یەکەمی ١٩٦١ دەریکردبوو، کردییە ســـەر کوردەکان و، ـاوای کرد ئەو هەڵمەتە ســـەربازییە ڕابگیرێ و بەدەم داوای کوردەکانەوە بێن کە مافی چـارەی خۆنووســـینیـان دەویســـــت' هەرچی حکوومەتە عێراقییەکـانن بە هەموو جۆرەکانیانەوە، چ لە ســـەردەمی گۆڕبەگۆڕی پاســـایەتی و ج لە ســـەردەمی کۆماری، بەجۆیکی دیکە چارەســەری کێشــەی کوردیان کرد،یان بەتەواوی پشــتگوێیان خســت و یانیش سەرکوتکردنی هەر تێکۆشانێکی نەتەوەیی کورد لەپێناو سادەترین مافە سەرەتاییە ڕەوایەکـانیـان لەنـاو یەکگرتوویی عێراق دەســـپێشـــخەرییـان لێ کردبێ، جـا ســـەرکوتکردنەکانیش بە ئاگر و ئاســـن و ســـێدارە و بەندیخانە و دوورخســـتنەوە و بێلانەکردن بوون و، هەوڵیشیان دا نەتەوەی کورد بە ئاگری تۆپان بتوێننەوە'.
لەســـەر ئەو بەیاننامەیە، هەڵمەتێکی فراوانی واژوو کۆکردنەوە لەســـەر یادداســـتێک کرا و پێشـکەشـی حکوومەتەکەی قاسـم کرا و داوای دەکرد یکســەر شـەڕ ڕاگیرێ و ئاشـتی لە

کوردستان دابین بکرێ[44] وژمارەی واژووەکانی ڕۆژانی بەرایی گەیشتنە بیست هەزار واژووی کەسایەتییە کۆمەڵایەتییە ناسراوەکان و کەسایەتییە ڕۆشنبیر و سەندیکاییەکان واژوویان کردبوو. ئەودەمی پشکنەری گشتیی وەزارەتی چاکسازیی کشتوکاڵی بووم و. لەتەک مامۆستا ئەحمەد جەلالەدینی دەستەی چاکسازیی کشتوکاڵی وعەبدولڕەزاق زوبێری ئەندامی دەستەی ڕاوێژی دەستەی باڵای چاکسازیی کشتوکاڵی و فایەق هۆشیاری بەڕێوەبەر دەستبەسەرداگرتن لە وەزارەتی چاکسازیی کشتوکاڵی واژووم کرد. عەبدولکەریم فەرمانی دا هەواڵەی دەستەیەکی لێکۆڵینەوەی تایبەتمن بکەن کە وابەستەی دادوەری سیاسیی گشتی بوو و، فەرمانیشی دابوو ماڵەکانمان بگەڕێن ئی بەڵکو شتێکی وەهای تێدا بدۆزیتەوە بەڵگەی ئەوەی بێئێمە دەسپێشخەریی هەڵمەتی ڕاگرتنی شەڕمان کردبێ.

بانگی وەزارەتی بەرگری کراین تا لێکۆڵینەوەمان لەگەڵ بکرێ. چووینە بەردەم دەستەی لێکۆڵینەوەی لە سێ کەسایەتیی سەربازی پێکهاتبوون:

_ناوت: موکەڕەم جەماڵ تاڵەبانی.

_تەمەنت: ٤٧ ساڵ.

_ کارت: پشکنەری گشتیی وەزارەتی چاکسازیی کشتوکاڵی.

_ واژووت لەسەر بەیاننامەی ئاستی بۆ کوردستان کردووە؟ : بەڵێ واژووم کردووە.

_ بۆ واژووت لەسەر ئەو بەیاننامەیە کردووە لەکاتێکدا پێچەوانەی ئەرکە فەرمانبەرییەکانتە وەک فەرمانبەرێکی گەورەی دەوڵەت؟

_ ئامانجی بەیەیاننامەکە دنەدانی یاخیبوون نییە، بەڵکو کەمەرگرتنێکی حکوومەتە تا شەڕ لە کوردستان ڕاگرێ و کوشتاری برایان کۆتایی پێ بهێنێ و ئاشتی باڵکێش بێ و کێشەکە بە ئاشتییانە چارەسەر بکرێ. بەردەوامیی شەڕ لە بەرژەوەندیی حکوومەت نییە و لە دوژمنانی وڵات بترازێ کەسیدی سوودی لێ نابینێ. ئێمە خەریکین دەچینە شەڕێکی

---

[44] _ پەرەسەندنی قەیرانی باکووری عێراق لە نێوان حکوومەت و هێزە کوردییەکان و سووربوونی هەردوولا لەسەر یەکلاکردنەوەی هەڵوێستەکاناین بە زەبری جەک و بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەکی چارەسەری قەیرانەکە لە ئاسۆدا دیاربێ و لە گەرمەی تۆمەتبارکردنی یەکدی، سەرباری ئەوەش شیوعییەکان چەند دەسپێشخەرییەکی چارەسەری قەیرانەکەیان خستەڕوو بێ ئەوەی لای هیچ لایەکیان بگرن. ئەوجارەیان شیوعییەکان دروسمێکی لە هیی جاران جودایان بەرزکردەوە، ئەویش دروشمی "ئاشتی بۆ کوردستان" بوو. شیوعییەکان ئەو دروشمەیان لە ئەنجامی هەڵاوسانی دۆخی کوردستان خستەڕێ، ئەوان لە سەری نیسانێراهەڵمەتێکی سیاسییان بۆ کۆتاییهێنانی کارە سەربازییەکانی بەرانبەر کورد دەکران هێنابووە کایە، ئەویش لەڕێی ئەو هەڵمەتەی ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەی نووسینی دروشمی سەردیواران و ڕێکخستنی هەڵمەتیڕاگەیاندنی سەر شەقام و ناو پاسە حکوومییەکان" گرتبۆوە. للمزید: سیف عدنان القیسی. الحزب الشیوعی و القضیة الکردیةفی العراق، دراسة فی أرشیف الوثائق السریة و العلنیة للحزب (١٩٣٥-١٩٧٥)، دار سطور، بیروت، ٢٠٢١، ص١٤١-١٤٠.

ـیکەوە کە گرنگییەکەی هیچی لە گرنگیی شۆڕشی ١٤ی تەمموز کەمتر نییە، پێویستی بە یەکگرتنی هەوڵەکانە و یەکخستنی هێزەکانی گەلیش تا لەو شەڕەنیشتمانییە گەورەیەدا پشتیوانیی حکوومەت بکەن، ئەویش شەڕی مۆنۆپۆلەکانی نەوتە.
واژووکردن لەسەر ئەو بەیاننامەیە بەپێی یاسا پێچەوانەی ئەرکە فەرمانبەرییەکانم نییە و قەتیش لاسەنگیان ناکا. تاکە کۆتێکی لەو یاشایەدا هاتبێ تەنیا دەربارەی چالاکیی حیزبییە، یاسا ئەوەی لە هێڵی سەربازی و هێڵی دەرەوە و قازییەکان قەدەغەکردووە و، بەیاننامەکەس چالاکییەکی حیزبی نییە، ئەگەر بە گریمانە وایدانێین حیزبییشە ئەوا من لە هیچ کام لەو کۆمەڵانە نیم کە یاسایەکە ناویان دێنێ، بۆیە، واژووکردن لەسەر هەر بەیاننامەیەکی سیاسی مافێکە لە مافەکانم و بەیاساش قەدەغە نییە.
پاشی لێکۆڵینەوەمان لەگەڵ تەواوبوو، سەرۆکی دەستەکە داوای لێکردین بەڵێنی کەفالەتی ١٠٠ دینار بدەین کە دەبێ، هەرکاتێکی داوامان لێکرا، لەبەرانبەر دەستەکە یان دادگا ئامادەبین. ئیدی واژوومان کرد.
عەبدولکەریم قاسم لە هەڵمەتە سەرکوتکەرەکەی دژی کوردانی هەر بەردەوام بوو، بەلام ئێمە دەزانین ئەو میراتەی گۆڤاری ئیکۆنۆمیستی بەریتانی لە وتارەکەیدا ئاماژەی پێ کردبوو، چون پاکوپیس کرا. ئاخر کوێت ناویکی دیکەی نەوت بوو و، چەند ڕۆژێک دوای کوتایی قاسم وەک ئەندام لە دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکان وەرگیرا،خوێن ڕژانیش لە عێراق بێ پسانەوە هەر بەردەوام بوو و خوێن تێکەڵی خوێنی دەبوەوە.

## حیزبی شیوعی وشیاریی ڕوودانی کودەتا دەدا:

حیزبی شـــیوعیی عێراقی دەیزانی، بۆ لەناوبردنی حکوومەتەکەی عەبدولکەریم قاســـم، چ لەبەری نادیاریدا ڕوودەدا و، دەشـــیزانی ســـەرکەوتنی کودەتایەکە بەســـەر کەڵەکەیەک تەرمی شـــیوعییەکان و دیموکراتییەکاندا دەڕوا. ئەگەرچی بەیاننامەیەکی لە کانوونی دووەمی ١٩٦٣ دەرکرد، تێیدا حکوومەتی لە ئامادکاریی کودەتایەکی سەربازیی راستڕەوی ڕەنگە ئێستا نا ئێستا رووبدا، ئاگادارکردەوە. تێیدا ئەو بزاوتە گومانبەرانەی دەستنیشان کردبوو کە لە هەندێ یەکەی سوپا لە بەغدا و حەبانییە دەکران. بەڵام عەبدولکەریم قاسم لە بەبەرداچوونی دەســەڵاتی شــیوعییەکان پتر دەترســا نەک لەکودەتایەکی دەســەڵات و ژیانیشی کۆتایی پێ بهێنێ.

حیزب هەڕەشــەی ئەوەی کرد کە بەربە و بزووتنەوەیە دەگرێ و وردوخاشــیشــێ دەکا و لەوەش پشت بە هێزە تایبەتەکانی ناو سوپای دەبەستێ. بەتایبەتیش هەدوو جەکی زرێ و ئاسمانی و، ئەو ئەو پشتیوانییە جەماوەرییەی لە زۆربەی شـارەکانی عێراقدا هەیەتی و بەتـایبەتییش بەغـدا. حیزب پێیوابوو بە تەنیـا و بێ هەمـاهەنگی لەگەڵ حیزبەکـانی دی. ناتوانێ بەرانبەر کودەتاچییەکان بوەســتێ، بەتایبەتیش هێزەکانی ناو ســوپای پشــتیوانیی عەبدولکەریم قاسم ســەرۆکوەزیرانیان دەکرد، ەلام ئەوەی بەســەردا تێپەڕیبوو کە دەمێکە ڕاست و چەپ ئەو هێزانە بۆخۆیان رادەکێشن و عەبدولکەریم قاسمیش بە پاراستنی ئەو هاوسەنگییە شلۆقە درێژە بە دەسەڵاتەکانی دەدا.

باڵی ڕاستڕەو، ئەو کاتەی ترسەکانی قاسمی قۆستەوە و لەپشتیشییەوە ترسی بۆرژوای لایەنگیری، لە چەندانە بوونی دەسەڵاتی شیوعییەکان لەناوجەماوەری کرێکا ر و جووتیار و ســەربازان و، ئیدی هەموو ڕۆژێ جێ پێیەکی نوێی بۆخۆی دەکردەوە. ئیدی پەلکێشــی ئەوەیان کردگەورە ئەفسەرە شیوعی و پێشکەوتنخوازەکان لە شوێنە سەرکردایەتییەکانی ســـوپا دوورخاتەوە، وەک عەمیدی ڕوکن داود جەنابیی قائیدی فیرقەی دوو و، عەمیدی ڕوکن هاشم عەبدولجەباری فەرماندەی لیوایبیست و، عەقید سەلمان حیسانی فەرماندەی لیوای زرێپۆش و دەیانی دیکەش. تا ئەفسەرە نەتەوەپەرست و ڕاسڕەو و کۆنەپەرست و دژە دەســـەڵاتی ئەو و دژە شـــیوعی و دیموکراتی جێیان بگرنەوە. ئیبراهیم فەیســـەڵ ئەنســـاری کرایە ســـەرۆکیئەرکانی فیرقەی دوو، تا دوای کودەتا بکرێتە قائیدی فیرقە و دواتریش بکرێتە سەرۆکی ئەرکانی گشتی و، ساڵح مەهدی عەماشیش کرایە یاریدەدەری عەمید ڕوکنی فرۆکەوان جەلال ئەوقاتیی قائیدی هێزی ئاسمانی. تەها شەکەرچییش کرایە یـاریـدەدەری لیوای نۆزدە و عەبـدولڕەحمـان عـامریش کرایە فەرمـانـدەی لیوای بنکەی حەبانییە و قاســیش پێویســتی بەو کۆنەپەرســت و شـــۆڤێنییانە هەبوو تا لە هەڵمەتە

سەربازییەکەی دژی شۆڕشی کوردیی لە ئەیلوولی ١٩٦١ هەڵگیرسابوو،سەرکردایەتیی
یەکەکانی سوپای بۆ بکەن.
دوای ئەوەی حیزبی شیوعی، بەو خۆپیشاندانانەی بۆ ڕاگرتنی هەڵمەتە سەربازییەکەی
دژی شۆڕشی کوردان کرابوو و مانگرتنی کرێکاری بۆ باسترکردنی بارودۆخی کار و
گوزەران کران و پاشەکشەی حکوومەت لە زۆربەی ئەو ڕێوشوێنە شۆڕشگێڕییانەی دژی
دەرەبەگ گیرابوونە بەر و، جێبەجێکردنی یاسای چاکسازیی کشتوکاڵی لە بەرژەوەندیی
جووتیارە دەوڵەمەندەکان و بۆرژوای گوندان، ئیدی مەحاڵبوو حیزب بتوانێ هەماهەنگی
لەگەڵ قاسمدا بکا و، بۆرژوای لایەنگری حوکمی قاسم زۆر بێ شەرمانە ددان
جیرکردنەوەیان ئەوکاتی دەرکەوت کە لە کوردستان مانگرتنی کرێکاران و
خۆپیشاندانەئاستییەکانیا بەر فیشەک دا و، بەهەنجەتی بێ چەندین کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی
جووتیارانیان هەڵوەشاندەوە و، هەڵمەتێکیان دژی شیوعییەکان بەرپاکرد.
حکوومەتەکەی قاسم، بەو ڕێوشوێنە نادیموکراتییانەی، وردەوردە خۆی لە گەڵ دابڕی و
هی لە حیزبی"تەقەدومی وەتەنی" بەسەرۆکایەتیی محەممەد هیچ حیزبێکی دیکەی لەپشت
نەما تا لەو جەنگەی دەبوایە دژی کۆمپانیاکانی نەوت بیکا پشتیوانیبن.
هەر هێدەی ساڵی ١٩٦١یش هاتەبەرێ، کۆمپانیاکانی نەوت لەدۆخێکدابوون دەیانتوای
ڕاستەوخۆ هەڕەشەی ئەوەی لە عەبدولکەریم قاسمی بکەن کە ئەگەر لەسەر
داواکارییەکانی بەردەوام بێ ئەوا دەسەڵاتەکەی دەڕووخێنن و لەوەشدا هیوایان بەو
دەسەڵاتەبوو کە جێی دەگرێتەوە.
ئێرەدا پیاو پرسیارێکی ڕەوای بە مێشکیدا دێ، باشە حیزبی شیوعی چاوەڕوانیی چیی
لە قاسم هەبوو، ئەرێ قاسم هیچ دەسەڵاتێکی لەناو جەماوەردا مابوو، ئەدی حیزب
چاوەڕێی چیی دەکرد؟
کە قاسم شەڕی دژی هێزە دیموکراتییەکان و شیوعییەکان وکوردان ڕاگەیاند، ئەرێ وا
باشتر نەبوو دەسەڵاتی قاسمی بڕووخاندبا و حکوومەتێکی دیموکراتیی نیشتمانیی بهێنابا
سەر کار؟ ئەدی دروستتر نەبوو دەستی خۆی بەپێش بخستبا و دژی ئەو کودەتایەی
خەریکبوو ڕووبدا، بجوولابا؟ ڕەنگە ئەودەمای خەڵکێک هەبوونایە بەرگرییان لە
سەرکردایەتیی بکردایە و بیگوتبا: ڕاپەڕینی دژە قاسم هێشتا کاتی نەهاتبوو، بەڵام
جەماوەرهەر لە یەکی ئایاری ١٩٥٩ڕا داوای دەکرد حیزبی شیوعی بێتە سەر دەسەڵات،
بەڵام سەرکردایەتیی حیزب سواڵی هێنانە سەرکاری یەک وەزیری دەکرد بێتە ناو
وەزارەتەکەی قاسم تا ڕوویدەرەوەی حکوومەت ئارایشت بکا و ئەو وەزارەتەش بە
فەرمی ڕانەگەیاندرابا.

قاسمی، به بەیەکدادانی ڕاست و چەپ و ڕاگرتنی هاوسەنگیی نیوانیان درێژەی بە تەمەنی حکوومەتەکەی خۆی دەدا، کە دەستی بە چەککردنی شیوعییەکان کرد و چەکەکەی دایە دەست ڕاستڕەوا تا کوردان لەناو ببەن، ئەو هاوسەنگییە لاسەنگ بوو و، سەرکردایەتیی حیزبیش دووڵ بوو و بگرە کلکایەتیی ئەو ئەو جەماوەرە بەرفراوانەی کرێکاران و جووتیاران و ڕۆشنبیران و کاسبکارانەشی نەکرد و، بەڵکو بووە هۆی پەکخستنی ئەو بزاوتە خۆکاوییەیشی کە لە گردبوونەوەکەی یەکی ئایاری ١٩٥٩ داوای دەکرد حیزبی شیوعی بێتە سەر دەسەڵات.

## کودەتای هەشتی شوباتی ١٩٦٣ و بەرگریی حیزبی شیوعی:

ئەو کودەتایەی حیزبی شیوعی پێشبینیی کردبوو، کە یەکە سەربازییەکانی حیزب لە بەیانەکەی مانگێک پێش کودەتا دەستنیشانی کردبوون، جولان، لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ روویدا.

هەر لە یەکەم ساتیش کودەتاچییەکان دوژمنایەتیی خۆیان بۆ شیوعییەت و حیزبی شحوعی ئاشکراکرد و ڕایانگەیاند ئەوان لە شیوعییەت بترازێ دژایەتیی کەسیدی ناکەن، واتە دژایەتیی ئیستیعمار ناکەن. ئەوان هەر لە ساتە بەراییەکانی بەرەنەیانیی ڕۆژی کودەتادا عەمید ڕوکن جەلال ئەوقاتیی سەرکردەی هێزە ئاسمانییەکانیان کوشت، کە شیوعی بوو ودەستیشیان بە گرتنی سەرکردە و ئەفسەرە شیوعییەکان کرد، بگرە ئەوانەشی کە قاسم لە سوپای دوورخستبوونەوە، جا چ ئەوانەی ئازایانە بەرەنگاری کودەتا بوونەوە و ئەوانەشی کە نەگەیشتنە یەکەکانیان و ئەوانەشی ترسنۆکانە لە ماڵەکەی خۆیاندا مانەوە.

ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەوەیە زۆربەی ئەفسەرە شیوعییەکان لە ڕۆژی کودەتاکەی ڕێکەوتی هەینیی مانگی ڕەمەزانی کردبوو، مۆڵەتیان درابوێ و، سەرباری ئەوەی ڕۆژی پشووش بووئەفسەرانی لایەنگری کودەتا لە سەربازگەکاندا ئێشکگربوون و پێشوەختە هەموو ستێکیان ڕێکخستبوو، بەلام ئەو کارە لەو کاتە تەنگەی حیزب دەستنیشانی ئەوەی کردبوو بەوزووانە کودەتایەکی ڕاسترەوانە بەرپادەبێ، بەڵگەی بێسەروبەری و ناوریایی ولاوازیی سەرکردایەتی نییە؟

حیزبی شیوعی پشتی بەو دەسەلاتە خۆشبوو کە لەناو ئەفسەران و پلەداران سوپادا هەیبوون، ئەو پشتی بە جێبەجێکردنی پلانی"کتوپڕی" دەبەستا کە ئەگەر هەوڵی کودەتا بدرێ. بەڵام ئەو پلانە، لەبەر دوو هۆ، جێبەجێ نەکرا؛ یەکەمیان نائامادەیی ئەو سەرکردە سەربازییانەی دەبووایە یەکسەر بجوولێن و، ئەو کەمە خەڵکەی بەرووی کودەتاسدا وەستانەوە هەوڵەکانیان پەکخرا، ئیدی گیران و هەندێکیشیان کوژران، وەک ئەوەی لەگەڵ جەلال ئەوقاتیی سەرکردەی هێزە ئاسمانیەکان ڕوویدا.هۆی دووەمیان ئەوەبوو حیزب سووسەی دابووە ڕێکخراوەکانی وێنەی قاسم بەرزکەنەوە و بەرگریی لێ بکەن، بەلام عەبدولکەریم قاسم خۆی لە شەڕی سەرکوتکردنی کوردانەوە گلاندبوو، بۆیە بەرزکردنەوەی دروشمی بەرگریکردن لە دەسەلاتەکەی وەک ئەوەبوو لەگەڵ حکوومەتێکدابی کە ئەو گەلی کوردەی سەرکوت دەکرد داوای مەفە نەتەوەییە ڕەوایەکانی خۆی دەکرد، جا هەڵوێستی سەرکردایەتیی کورد هەرچییەک بێ. وەکچۆن دەسەلاتی

قاسم لەو جەماوەرەی تەریک ببوو کە بەدەست دەزگا ئاسایشییەکانییەوە تووشی چەوسانەوە و سەرکوتکردن ببوو.
حیزبی شیوعی پشتی بەو هێزانەی ناو سوپا دەبەستا کە تایبەتی خۆیبوون تا هێزە چەکدارەان بکاتە دوو بەس و پەرچەکردارێک بۆ پەکخستنی هەر هەوڵێکی کودەتایی بکا، وەک ئەوەی لە ۱۹٥۹ ڕوویدا. بەلام ئێمە لە ۱۹٦۳ بووین و بارودۆخ و تەازووی هێزەکانی ناوخۆ گۆرابوون و حیزبی شیوعییس هەوڵی نەدا هێزە دیموکراتییەکان لە دژی هێزە نەتەوەییە ڕاسترەوەکان و کۆنەپەرستەکان حوکمی قاسمیان رووخاند بکاتە یەک پارچە.
ئەگەرچی جەماوەر لە هەندێ گەڕەکی بەغدا هەستابوونەوە و بەرانگژی کودەتاچییەکان ببوونەوە، بەلام ئیدی لە گۆڕەپانەکەدا بەتەنیا مایەوە، کەی عەبدولکەیم قاسم تا دوا هەناسەشی هەر دژی شیوعییەکان بوو و، سەرکردایەتیی حیزبی شیوعییش بەرەبەیانی کودەتا شڵەژا و لەجیاتیی ئەوەی لەگەڵ ئەو جەماوەرە دەرکەوی کە ئامادەی بەرگری بوون، کەچی لەجاوان ونوون نەوەکا بکەونە دەسی کودەاچییەکان و بەلام هەر کەوتنە دەستیشیان.
بەرەبەیانی ڕۆژی کودەتا حیزبی شیوعی بەیاننامەیەکی دەرکرد و داوای لە گەل کرد بەر بە کودەتاچییەکان بگرن و لێنەگەڕێ وەبەری بێنن، وەک لەویدا هاتووە کودەتاچییەکان دەستەیەکی پێکدی نائاسنان و سەرباری حیزبی بەعسی ئیستیراکی چەند دەستەیەکی گەورە سەربازانی تیدایە کە سەر بە نەتەوەییەکانن و هەندێ ئەفسەری ڕاسترەو وکۆنەپەرستی گومانلێکراویشیان تێدایە کە دامزراوەکانی ئیمپریالیزم دەیانجوولێنێ.
بەرەبەیانیی ڕۆژی کودەتایەکە خزمەکانم ئامۆژگارییان کردم ماڵەکەم بەجێبێڵم و بچمە لای خزمەکانم، بەلام هەر بەدوای ڕووداوەکاندا دەچووم .
هێشتا کودەتاچییەکان نەیانتوانبوو دەست بەسەر سەربازگەکانی بەغداد بگرن و، ئەو لیوایەی لە حەبانییەیرا جوولابوو هێشتا نەگەیشتبووەجێ. لەگەڵ ژنەکەم لەماڵ چووینەدەرێ و چووینە ماڵی دکتۆر حیکمەت ڕەئوفی خەزووم و داوام لە دکتۆر حیکمەت کرد بمگەیەنێتە هەر کۆبوونەوەیەکی جەماوەریی بەرەنگاری کودەتا بووبێتەوە. ئەگەرچی من ڕۆڵێکی دیاریکراوم لە پلانە" کتوپڕ"ەکەدا نەبوو، کەچی چوومە شەقامی شێخ عومەر کە کرێکاران لەوی کۆببوونەوە، دیتم کرێکارەکان شیشە و بەرچیغیان بەدەستەوەبوو و ئامادەی هەر کارێک بوون سەرکردایەتییان ئاراستەیان بکا، بەلام کوا سەرکردایەتی؟ ئەوجا کوان سەرکردەکان؟.
هەربەڕاستییش کەسم لە سەرکردەکان نەدیت، لەجیاتیی ئەوەێ دەست بەسەر کەتیبەی تانکەکانی فەزیلییەدا بگرن، کەچی ئەو کەتیبەیە بێ جوولە مانەوە تا کودەتاچییەکان

ـیوارەکەی دەستیان بەسەردا گرت و جوولاندیان تا دەستی پی بەسەر وەزارەتی ـەرگریدا بگرن کە لە ئاسمانێرا بۆردومان دەکرا.
هەرچی حەبدولکەریم قاسم و هاوالّەکانی بوون لله وەزارەتی بەرگری مابوونەوە، دوایە، ـەیەر گوری بۆمبابارانی تۆپ و ساروخی سەریان، چوونە هۆلّی ئەمینداریی پایتەختی ـەوێ نزیک بوو و، حەبدولکەریم قاسم ، یونس تائییرۆژنەمەنووسی هەنارد، کە ـەگەلیدابوو تا پەیوەندی بە کودەتاچییەکانەوە بکا و بلێ ئەگەر ژیانی پارێزراوبێ و رێی ـەحن لە عێراق بچێتە دەرێ، ئامادەیە خۆ بەدەستەوە بدا، بەلام ئەوان مکوڕبوون دەبێ بێ ـەرج خۆ بەدەستەوە بدەن.
کە جەماوەر لەبەر دەرگای وەزارەت کۆبوونەوە و داوای چەکیان دەکرد تا بەر بە کودەتاچییەکان بگرن، عەبدولکەریم گوتی چەکیان نادەمێ چونکە نایەوێ ئەوەی لە کەرکووک و موسڵ روویدا دووبارەببێتەوە، بەلام عەبدولکەریم قاسم ئاگای لەوەی نەبوو کودەتاچییەکان هەموو شتێکیا رێکخستبوو. ئەوان، پێش کودەتا بە پەلپ و بیانووی جوداجودا، ئەو تۆپە دژە ئاسمانییانەیا کێشابووەوە کە لە وەزارەتی بەرگری بوون و، ـرێکی زۆری چەکیشیان بردبوو، ئیدی موقەدەم سەعید مەتەری شیوعیی فەرماندەی هێزی بەرگریکار لە وەزارەتی بەرگری هاتە بەرانبەر خەلکەکە و پێیگوتن جەکی پێویست ـە وەزارەتی بەرگری نییە و سەدان سەرباز و پلەدار چەک نییە تا چەکداریان بکا، ـاوایشی لە جەماوەری کۆبووەوە کرد لەجێیەکی دی جەک پەیاکەن.

## سەربردەی گرتنی قاسم، وەک سەعدون غێدان بۆی گێڕامەوە:

دوای دانوســـتانی نێوان قاســـم و کودەتاچییەکانی ڕۆژێکی تەواوی برد و،دوای ئەوەی کودەتاچییەکان ڕەتیانکردەوە هیچ دەستەبەرییەکی بدەنێ، لە ٩ی شوباتی ١٩٦٣ بێ قەیدو شەرت خۆی بەدەستەوە دا.

لێرە گێڕانەکەی ســـەعدوون غێدان[45] دەگوازمەوە، کە دواتریش حەبدولکەریم قاســـم و هاواڵەکانی، دوای گیرانیان چیان بەســـەرهات. ســـەعدون غێدان گوتی: کە حەبدولکەریم قاســـم و عەقید فازڵ عەباس مەهداوی "ســـەرۆکی دادگای گەل" و عەقید تەها ئەلشـــێخ ئەحمەدی بەڕێوەبەری هەواڵگریی ســـەربازییان هێنان، من لەگەڵ عەبدولســـەلام عارف و هاوڕێکانی لە بینای ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بووم و هەموویان کەلەپچەکرابوون و لەبەردەمی عەمید عەبدولغەنی راویی سەرۆکی دادگای تایبەت لەسەر کورسییان دانان.

حەبدولســـەلام ووی دەمی لە عەبدولکەریم قاســـم کرد و گوتی: عەبدولکەریم دیتت چۆن شـــۆڕشـــمان لەســـەر کردی؟ عەبدولکەریم وەڵامیداوە: من شـــۆڕشـــم دژی ئیســـتیعمار و دەســـەڵاتی مەلەکیی بەکرێگیراو کرد، بەڵام تۆ شـــۆڕشـــت دژی دەســـەڵاتی نیشـــتمانیی دژە ئیستیعمار کرد. عەبدولسەلام گوتی: تۆ شۆڕشت بۆ بەرژەوەندیی خۆت کرد. عەبدولکەریم پێیگوت: کام بەرژەوەندیی خۆم، جا ســـێ دیناری دووســـەد و پەنجا فلســـی لە گیرفانی دەرهێنا و بە دەموچاوی عەبدولســـەلامی دادا و گوتی: ئەوە هەموو ســـامانەکەمە و هەر ئەوەندەســـم لە مووچەکەم ماوە. لێرە کودەتاچییوکان بەربوونە گیانی گیراوەکان و بەتایبەتیش عەقید مەهداوی و پەنجەیان لە دەمی نابوو تا دەمی هەڵزڕێنن و ئەوەی بەڕوویدا دەنەڕاندن"تاوانباری فاشستینە بەکرێگیراوانی ئیستیعمار"، ئەوانیش زۆریان لێدا و عەبدولغەنی ڕاوی فەرمانی لەداردانی بۆ دەرکردن.

کە ویســـتیان چاوی عەبدولکەریم قاســـم و هاوالەکانی ببەســـتنەوە تا گوللەبارانیان بکەن. عەبدولکەریم بەرووياندا هەڵشاخا و گوتی: "ئەوە شوورەییە، سەرباز لە گوللە ناترسێ و ئەوە بێڕێزییە بۆ ســـوپای عێراق، بۆ کە لەفەلەســـتین دەجەنگاین **چاو**مان دەبەســـتەوە؟". ئەوجا کودەتاچییەکان، عەبدولغەنی راویی سەرۆکی دادگا هاکەزاییەکەشیان لەگەڵ، دایاننە

[45] _ ســـەعدون غێدان: لە ١٩٣٠ لە بەغدا لەدایکبووە، لە ١٩٥٣ کۆلێژی ســـەربازیی تەواوکردووە، لە کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بەشداربووە، لە کودەتای ١٧ی تەمووزی ١٩٦٨ بەشداربووە، لە ١٩٦٨-١٩٧٠ سەرکردەی اسەوانی کۆماری بووە، ئەوجا وەزیری ناوخۆ و گەیاندن، سەرباری ئەندامیەتیی لە ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش و، لە یەکەم حکوومەتی سەدام حوسێن لە ١٩٧٩ پێکیهێنا بووە جێگری سەرۆکوەزیران. لە ١٩٨٥کۆچی داویی کرد. للمزید: حسن لطيف الزبيدي، المصدر السابق، ص٤٧٩.

بەر دەســـترێژ و کوشـــتنیان و تەرمەکانیان لە تەلەفزیۆن پیشـــاندان و ڕۆژی دواتریش وێنەکانیان لە ڕۆژنامەکان بڵاوکردەوە.
ئێســـــتا، دەکرێ درک بەوەی بکەین ئەو میراتەی گۆڤاری "ئیکۆنۆمیســـــت"ی بەریتانی لە وتارەکەی پێشتریێ ئاماژەمان پێ کرد، چۆن یەکلاکرایەوە. نوێنەرێکی پۆلیس، کە قاسم و هاوالەکانی تیرباران کران گوتی: "خوێنێکی زۆر لە عێراق ڕژا، بەڵام سوپاس بۆ خوا، یەک دڵۆپ پیترۆل نەڕژا".

## پەیوەندیی کودەتاچییەکان و هەواڵگریی ئەمریکا:

گێڕانەوەکانی باسی پەیوەندیی کودەتای سەرکردە بەعسییەکان بە هەواڵگریی ئەمریکاوە دەکەن، جیاوازن. بەڵام ئاماژە و بەڵگە هەن دەیسەلمێنن سەرەداوێکی ڕۆڵی هەواڵگریی ئەمریکای تێدایە.

لێرەدا، ئەو ڕووداوانەی سەبارەت بە پەیوەندیی بەعس بە هەواڵگرییەوە یادگەم تۆماری کردووە، ڕایدەگوێزمە ئێرە. لە بینای سەرکردایەتیی قوتری و ڕێک لە ١٩٦٩ و بە ئامادەیی هەریەک لە حەماد شیهابی وەزیری بەرگری و عەبدولخالق سامەرایی و عەبدوڵڵا سەلوم سامەرایی و عامر عەبدوڵڵا و من، کە پرسیار لە عەماد شیهاب کرا داخوا من دەناسی؟! گوتی: "من زۆرم گوێ لە باسی مامۆستا موکەڕەم بووە بەڵام پێشتر ناسیاویمان نەبووە" گوتم: "هیوادارم قسەی خراپت دەربارەی من گوێ لێ نەبووبێ". گوتی: ""نا قسەی باشم دەربارەت گوی لێبووە، گوتیان نیشتمانپەروەرێکی تێکۆشەری کۆنە و، قسەی خراپیشم گوی لێبووە، گوتیان تۆ مەلا مستەفات خۆشدەوێ و ڕێزی لێ دەگری". گوتم: "تۆ بڵێی ڕێزگرتنی مەلا مستەفا سیفەتێکی خراپ بێ؟!" گوتی: "ڕووداوێکت بۆ دەگێڕمەوە کەمن ئاگام لێیەتی، ڕیژێکیان پێش- شۆڕشی ٨ی شوباتی ١٩٦٣- من و عەمید عەبدولجەباری قائید فیرقەی پێنجلە ١٩٦١ مۆڵەتمان وەرگرتبوو و لە بەیرووت بووین، باڵیۆزخانەی ئەمریکا مکوڕبوو دیداری لەگەڵ بکەن، بەڵام ئەو داوای لێبووردنی دەکرد چونکە سەربازە و سیاسی نییە و، ئەو لە مۆلەتە و بۆ وچان هاتووە، بەلام من داوام لێکرد بیانبینێ تا بزانین چییان لە زەینێدایە. لە دیداری باڵیۆزی ئەمریکا، چونکە خزمی عەبدولکەریم قاسمە و مێردی خوشکیەتی، باڵیۆز ڕایسپارد بە عەبدولکەریم بڵێ یاسایەک بۆ گێڕانەوەی ئەو زەوییانە دەرنەکا کە بەرهەمهێنانیان تێدا ناکرێ و لە چوارچێوەی ئیمتیازی کۆمپانیا نەوتییەکانن و، با کۆمپانیای نەوتی نیشتمانیش دانەمەزرێنێ، ویلایەتە یەکگرتووەکا ئامادەیە داواکارییەکانی جێبەجێکا. بەڵام ئەگەر ئەو دوو یاسایە دەرکا، ئەوا دەسەڵاتی ئەمریکا بەهەموو شیوەیەک هەوڵی ڕووخاندنی دەدا. کە عەبدولجەبار گەرایەوە بەگدا ئەو قسانەی لە باڵیۆزخانەی ئەمریکا کرابوون هەمووی بە عەبدولکەریم قاسم ڕاگەیاند.

بەلام عەبدولکەریم ئەنجوومەنی دەسەڵات و ئەنجوومەنی وەزیرانی کۆکردەوە و یاسای ژمارە ٨٠ی ساڵی ١٩٦١ی دەرکرد و، یاای کۆمپانیای نیستمانیی بۆ وەبەرهێنانی نەوت دەرکرد" گوتم : "جا چ ڕوویدا؟" گوتی: "دەستیان بە جوولاندنی مەلا مستەفای لە دژی قاسمی". گوتم: "ئەدی بارزانی توانیی حوکم قاسمی برووخێنی؟". گوتی : "نا، بەڵام ئەوە بەڵگەی بەکرێگیراویی بارزانییە". گوتم: "کە بارزانی نەیتوانی عەبدولکەریم قاسمی برووخێنی، بەعسی و قەومییەکانیان بەگژ وەنا". لێرە، عەبدولخالق سامەڕایی رووی دەمی

ـە حەماد شیهاب کرد و گوتی: "برای من تۆ دەڵێی من سەربازم وهیچ لە سیاسەت نازانم، بۆ دەچییە بابەتێکی ئاوا ئاڵۆز واز لە کەللەی سەرمان بێنە".
گێڕانەوەکانی پەیوەندیی هەواڵگریی ئەمریکی بە بەعسەوە لێرە، بەوەندە گێڕانەوەیەی حەماد شیهابی کۆتایی نەهات گوایە ئاگاداریان کردووەتەوە، بەڵکو ئەوجارەیان داوایان لە وەزیرەکانی قاسم کرد دەست لە کار بکێشنەوە تا حکوومەتەکەی لاواز بکەن و، ئەوەش حەسەن تاڵەبانیی وەزیری گەیاندنی حکوومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم بۆی دووپاتکردمەوە. باسی ئەوەی کرد کە فوئاد عارفی وەزیری دەوڵەت مۆڵەتی وەرگرتووە و لە بەیرووت بووە، باڵیۆزخانەی ئەمەریکی پەیوەندییان پێوە کردووەداوایان لێ کردین لە حکوومەتی عەبدولکەریم قاسمی بکشێینەوە چونکە هەندەی نەمایە. کە گەڕاینەوە فوئاد عارف دەستکێشانەوەی خۆی پێشکەش کرد، بەلام من لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمی مامەوە تا لە ٨ی شەباتی ١٩٦٣ حوکمەکەی ڕووخا.
قسەکەی عەلی ساڵح سەعیدی سکرتێری حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکییش، کە گوتی: "بە شەمەندەفەرێکی ئەمریکی هاتینە سەر دەسەلات"، ئەو قسانەی پێشترێم دەسەلمێنێ.
ئەو هەموو بەڵگانە ئاماژەی ئەوەینە هەواڵگیی ناوەندیی ئەمریکی ڕۆڵێکی گەورەی لە ڕووخاندنی عەبدولکەریم قاسمدا هەبووە و، بارودۆخەکەش بۆ ئەوە گونجاوبوو، لە سوپادا دەستەی دژە قاسم هەبوون و، هەڵوێستی عەبدولکەریم قاسمیش بەرانبەر شیوعییەکان خراپ بوو کە هەتا کۆتاییش هەر لەگەڵیدا مانەوە. دابڕانی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان، کە بەعسی و قەومییەکان پەیوەندییان پێوەکرد تا لە کرداری لەناوبردنی قاسمدا بەشدار بێ.
نەیارەکانی عەبدولکەریم قاسمی لێرە یەکیان گرتەوە، بەعسییەکان هەنگاوی بەراییان نا و پەیوەندییان بە مەلا مستەفاوە کرد، بە ڕاگواستنی قسەی فوئاد عارفی وەزیری، وەک لەسەرەوە باسمکرد پێش کودەتا دەستی لەکار کێشایەوە، داوای لێکرابوو پەیوەندی بە کەسایەتییەکی سەرکردایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستان بکا، ئیدی دیدارێک لە نێوان سەوکەت ئاکرەیی و عەلی ساڵح سەعدی کرا، تا تاوتوێی ڕێگاکانی ڕووخاندنی حوکمی عەبدولکەریم قاسم بکەن و، فوئاد عارفیش پێشترێ ئاگای لەوەی بوو کە سەرۆکایەتیی ئەمەریکا گلۆپی سەوزی ئەو کارەی داگیرساندووە.
لە دیداری دووەمدا، ساڵح یوسفیی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان ئامادەببوو، کە بەشاراوەیی لە بەغدا بوو و، لیوا تاهیر یەحیاش ئامادەی دیدارەکە ببوو. دوای شەن و کەو و پەیوەندی بە بارزانییەوە لەسەر ئەوەی ڕێککەوتن بۆ

لەناوبردنی عەبدولکەریم قاسم و هێنانی حکوومەتێکی دیکەی کەسێکی مەدەنیسەرۆکایەتیی بکا ڕێککەوتن و ئەو کەسەش حیکمەت سلێمانی سەرۆکوەزیرانی پێشتریێ بوو و لەڕێی ماجید مستەفای برادەرییەوە "کە خاڵی فوئاد عارف بوو" قسەیان لەگەڵ کرد و ئەویش ڕازیبوو ببێتە سەرۆکی حکوومەت.
لە بەرەبەیانی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ کە بەعس حوکمی عەبدولکەریم قاسمی ڕووخاند، هەریەک لە فوئاد عارف و ساڵح یوسفی بروسکەی پشتیوانیی کودەتایان لێدا، بەلام بە پێچەوانەی ڕێککەوتنەکە عەبدولسەلام عارف لەجێی حیکمەت سلێمانی بووە سەرۆکی کۆمار و، هەنجەتیشیان ئەوەبوو سەربازەکان
کودەتایان کردووە ئیدی بۆ کەسێکی غەیری وان ببێتە سەرۆکی حکوومەت.

## لەبەر چنگی کودەتاچییان:

کە زانیم کودەتا سەرکەوتووە و توانیویانە بەسەر بەرگریی هەریەک لە کازمییە و باب ئەلشێخی زاڵبن، خێزانەکەمم هەنارد تاخانوێکمان بۆ بەکرێ بگرێ بۆ ئەوەی هەتا لەبەغدا دەردەچین و دەچینەوە کوردستان تێیدا بمێنینەوە، کە ئەندامانی حیزبی شیوعی لە گوندێکی نزیک کفری کۆببوونەوە و ەوتبوونە نێوان دوو ئاگران، ئاگری حکوومەتی کودەتاچییەکانی ڕایگەیاندبوو لە شیوعییان بترازێ دوژمنی کەسی دی نییە و ئاگری پارتی دیموکراتی کوردستانی پشتیوانی کودەتاچییەکان بوو و، بەلام مەلا مستەفاا بارزانی بەدەم داوای کودەتاچییەکانەوە نەچوو و ڕادەستی نەکردن. و پاراستنی.

ژنەکەم خانوێکی لە شەقامی فەلەستین بەکرێ گرت کە نزیکی شەقامی قەناتی سوپا بوو. جا لێفەیەک و سەرینێک و هەندێ خواردنمان لە ماڵی خوشکەکەم برد و لەژێر باڵی تاریکیدا چووینە ئەو خانووەی هیچی تێدا نەبوو لەو لێفە و سەرینە بترازێ، لە مانگی شوباتی سارديشدا بووین، جا دراوسێیەکمان ئێمەی بەو حالەوە دیت و لەترسی ئەوەی نەکا زمانمان لێ بدا چووین سەردانمان کردن و بەخێریان هێناین و چایان بۆ داناین و دوایە چووینەوە ماڵەکە، بەیانییەکەی ژنەکەم چوو هەندێ خواردن پەیداکا و سەردانی ماڵەکەی وەزیرییەمان بکا و ئیدی کەسیک بە جێیەکی زانین.

پێدەچێ ئەوانەی گەڕەک بە موختاریان گوتبێ خێزانێک لەو ماڵەیدا خۆیان شاردووەتەوە و ئیدی بە هاوالگریی سوپایان گوتبێ، ئیدی خەریکبوون چاودێریی ماڵەکەیان دەکرد، ئیی ژنەکەمیان ناسیبوو کە خوشکی موقەدەم سەعدوڵلا راوییە، کە لە موسڵ لەکاتی جوولانەوەکەی شەواف کوژرا و بەوەی ناسرابوو لایەنگری عەبدولناسری بوو. عەدنان راوی لە هەوالگری بوو و یەک لەەفسەرە خانەنشینەکانی بەشداری کودەتا بوو و گەڕێندرابۆوە خزمەت. ئەو دەیناسیم، هەستی کردبوو خۆ ئامادەدەکەن بەسەر ماڵەکەم دادەن یان بمگرن یان بمکوژن. داوای لە محێی بەڕێوەبەری هەوالگری کردبوو کارەکە بۆ ئەو جێبێڵن نەوەکا "حەرەس قەومی" بمکوژن، ئیدی ئەویس داواکەی قبول کردبوو، بەتەنیا لەماڵ بووم و خەریکی ساختەکردنی سوناسەکەم بووم تا ناوەکەم بگۆڕم و لەهەوڵی ئەوەی بووم لە بەغدا دەرچم. ئیدی ناوی خۆم کردبووە سابیر ئەحمەد ڕاوی. گوێم لە تەقەی دەرگابوو، پێموابوو ژنەکەمە، کە کردمەوە دیتم عەدنان راوییە و بەجلی سەربازییەوە و هاتە ناو ماڵەکە و ئۆتۆمۆبیلەکەی لەبەر دەرگا ڕاگرتبوو. پێیگوتم دەسەلات بە جێیەکەی زانیوم و ئەویش بەڵێنی داوە، بەو مەرجەی ژیانم پارێزراوبێ،ڕادەستم بکا و، ئەوانیش دەستیان داوەتە بەرێ. ئیدی هیچ چارەیەکم نەبوو و لەگەڵی چوومە وەزارەتی بەرگری و چووینە ژوورەکەی ڕائید محێی بەڕێوەبەری

هەواڵگری. بەخێری هێنام و گوتی: "ئێمە دەزانین تۆ خراپەت بۆ کەس نەبووە، خوا یاربێ خراپەســت لەگەڵ ناکەن، هوجا داوای لە ئەفســەرێک کرد لەگەل کۆمەڵێ ســەرباز بمبەنە بەندیخانەی ناوەندیی سەربازگەی رەشید و ڕایسپارد بە ڕائید حازمسەباغی فەرماندەی گرتووخانە بڵێ ئاگای لێم بێ هەتا بڕیاری چارەنووسم دەدرێ.

## له گرتووخانەی سەربازگەی ڕەشید:

هەرکە گەیستینە سەربازگەی رەشید و ئەفسەرە مولازمەکەی لەگەلمان هاتبوو رادەستی حازم سەباغی بەڕێوەبەری بەندیخانەی کردین تا تا راسپاردەکەی بەڕێوەبەری هەوالگریی سـەربازیی پێبلێ، وەلامی ئەوەبوو: "بۆ چاوەڕوان لەوانیدی نەبووە؟!"، ئەوجا فەرمانیدا بمپشکنن و شتومەکەکانم لێ وەرگرن و ڕەوانەی ژووری وەزیرانم بکەن.
کە چوومە ژوورەوە، هەریەک لە وەزیران ئەحمەد محەممەد یەحیا و محەممەد حەدید ومحێ عەبدولحەمید و تەلعەت شـەیبانی و ئیدیش هاتنە پێشـوازیم و، عادل جەلالی وەزیری کشتوکالیشیان لەگەلدا بوو و لە سووچێکی ژوورەکە ڕاکشابوو. عادل جەلال کە کرایە وەزیر گوتی: "بۆیە وەزارەتی چاکسـازیی کشـتوکالییان داومەتێ تا هەریەک لە موکەڕەم تالەبانی و فایەق هۆشیاری بگرم" ئاوڕێکم لێ دایەوە و پرسیم: "ئەوە کێیە، ئەبو سـەفوانە؟باسـە منو فایەق هۆشـیارت جۆن کەلەپچە دەکرد؟ ". گوتی: "ئێسـتا کاتی ئەو قسـەیەیە؟ ئێسـتا هەموومان کەلەپچەکراوین". گوتم: "هۆی کەلەپچەکردنی هەمووسـمان هەلوێستی کەسانی وەک تۆیە".
وەزیرەکان ترسیان لەوەی نەبوو لێپرسینەوەیان لەسەر کارەکانی وەزارەت لەگەل بکرێ، چونکە ئەوان لە پـاکیی خۆیـان دلنیـابوون، بەلام دەیـانزانی ئەوانە لەبەرئەوەی لەگەل عەبدولکەریم قاسمی هاوکار بووینە لێیان لەشەڕن.
لە ژوورەکەی تەنیشت ژمارەیەک وەزیری دیکەی لیبوو و دووانیان کوردبوون و ئەوانیش حسـەن ڕەفعەتی وەزیری بنیاتنان و نیشـتەجێبوون بوو لەگەل شـێخ حەسـەن تالەبانیی وەزیری گەیاندن و، عەمید روکن ئەحمەد سـالح عەبدیی دادوەری سـەربازیی سـەردەمی قاسمیشیان لەگەلدابوو. مامەلەی کودەتاچییەکان لەگەل پیاوانی حکوومەتەکەی قاسم زۆر خراپ نەبوو، بەلام ئەوان بە پەیامنێرەکانی ڕۆژنامە میسـری و خۆرئاواییەکانیان نیشـان دەدان.
ڕۆژێکیان، لیوا تاهیر یەحیای سـەرۆکی ئەرکانی سـوپا هاتە گرتووخانەکە و داوای کرد محەممەد حەدیدی وەزیری دایی سەردەمی قاسم بێننەلای و دەمانچەکەی هەلکێشابوو و داوای لە محەممەد حەدید دەکردسـەروسـامان و پارەکانی ئاشـکرا بکا، بەلام محەممەد حەدید شـوێندی بۆ دەخواردن کە هیچ پارەیەکی نییە و، هەرچیی هەیەتی سـامانی نەگواسـتراوەن، تاهیر یەحیاس جنێوی پیسـی دەدا کە تەنێ هیی ئەوەی بوون دز و ڕێگر ئەو جوینانە بدەن.

حافز عەلوانی یاوەری عەبدولکەریم قاسمیش لە ژوورەکە لەگەڵمان بوو. ڕۆژێکیان ئەفسەرێک بانگی کرد، کە چووە بەر پەنجەرەکە، ڕیزە فیشەکێکی کلاشینکۆفی پێوەنا. سەری برینداربوو بەڵام جێی کارێی نەگرت و وەزیرەکان فریاگوزارییان بۆ کرد.
زۆر لە ژووری وەزیرەکان نەمامەوە، ئەفسەرێک بانگی کردم و گوتی بەخۆ و بە کەلوپەلەوە بێمە دەرێ، کە هاتمەدەرێ خستمیە ژوورێکی سێ بە سێ مەتری هەشت گیراوی پتر تێدابوو، لەبەر بێ جێیی بێ کەلوپەل جوومە ژوورەوە، گیراوەکان بە نۆبەت چەند سەعات بەپێوە رادەوەستان و جێ نەبوو لێی دانیشن. لە سووچێکی بۆم داندرابوو دانیشتم و پێموابوو ئەگەر چەند سەعاتێک ئاوا بمێنمەوە پشتم دەشکێ بەڵام ٢٣ ڕۆژ لەوی مامەوە و پشتم نەشکا.
لەو ژوورەی، داود جەنابیی عەقید ڕوکن و موقەدەم خزەیر دوریی "ئەندامی دادگای گەل" وعەقید مەجید جەلیلی بەڕێوەبەری ئاسایش و عەقید سەلمان حیسانی فەرماندەی لیوای زرێپۆش و موقەدەم ڕوکن غەزبان ئەلسەعد و کاسب ئەلسەعدی برای و کەماڵ حومەر نەزمیی قازی وداود خەماس ئەلشێخی قازیی لێبوو. ژوورەکە دوو ئەفسەری دیکەیشی لێبوویەکیانم ناسی، سەلاح محەممەد جەمیل بووئەفسەرێکی دیکەش لەگەل بر ئەندازیارەکەی بوو و، ٢٢ سەربازیش کە لە سەربازگەی خان بەنی سەعدی باقووبوی بەرەنگاری کودەتاچییەکان ببوونەوە، بەڵام کە دوای سەرکەوتنی کودەتایەکە دەیانەوێ ڕاکەنە کوردستان، کودەتاچییەکان توانیبوویان دەستگیریان بکەن و کۆتوبەندی ئاسنیان لە دەست و پێیان بوو، بەندییەکانی ئەو بەشە دەیانزانی لەداردەدرێن بەلام خۆگرییەکەیان جێی سەرسوڕمان بوو.
بەرەبەیانی ڕۆژی دواترێ ژمارەیەک گیراویان برد، لەوانەش عەمید ڕوکن داود جەنابیی قائید فیرقەی دوو و مەجید جەلیلی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی و عەقید سەلمان حیسانی فەرماندەی لیوای زرێپۆش وموقەدەم حوسێن خزر ئەلدوریی ئەندامی دادگای گەل وموڵازمێکی کوردی لە بەڕێوەبەرایەتیی ئینزیباتی وەزارەتی بەرگری بوو و ناوی ئەکرەم سەید ئەمین بوو و لەگەڵ هەندێکی دیکەی هەموویان بردران تا بێ دادگاییکردن لەسێدارەیان بدەن. دوای ماوەیەک عەقید سەلمان حیسان و دوای ئەویش موڵازم ئەکرەم سەید ئەمین هێنرانەوە گرتووخانە. سەلمان پێیگوتین هەمووانیان لەسەر خوانێکی درێژ دانایان و کاغەز و قەڵەمیان داینێ تادوا وەسیەتمان بنووسین، کەسیان نەیانتوانیبوو وەسیەت بنووسن حوسێن خزر ئەلدووری نەبێ و، ئەوەی لەگیرفانی مابوو هێنایەدەرێ کە "٨٣"دینار بوولەسەر وەسیەتنامەکەی دانا تا ئەگەر ویستییان بیدەنە خانەوادەکەی. دادگاییکردنەکەیشیان پێلاقە و بۆکسی سەروگوێلاک بوو عەلی سالح ئەلسەعدی

ــكرتيرى حيزبى بەعس هات و مەجيد جەليلى بەرێوەبەرى ئاسـايشـى لە عاردى كوتا و
گێكى بەدەستەوە بوو و چەند ددانێكى دەرهێنا و ئەويش لەبەر ئازار هاوارى دەكرد.
ـەو سـەروبەنديدا ليواى فڕۆكەوان حەردان عەبدولغەفار تكريتيى وەزيرى بەرگرى هات و
چلوێكى بەوانەدا گێڕا كە فەرمانى لەسـيدارەدانيان درابوو، ئيدى سـەلمان حيسـانى
كونەبرادەريناسـيبۆوە و لێنەگەڕابوو رەوانەى گورەپان بكێ تا گوللەبارانى بكەن و بە
ـۆتۆمۆبيلەكەى خۆى هێنابوويەوە گرتووخانە، ئەوجا مولازم ئەكرەم سـەيد ئەمينيشـيهەر
هێنـابووەوەگرتووخـانە چونكە لاوێكى بچووك بووە، هەرچى ئەوانيـدى بوون بە
كەلەپچەكراوى بردبوونيانە گورەپانى تيرباران و هەموويا بەرگوللەدابوون.
ـە دەستەى دووەم، دە ئەفسـەريان كەلەپچەكرد، لەوان موقەدەم عەدنان خەيال و مولازم
ـەلاح ئەحمەدم ناسى و پێيانگوتبوون سەعات سێى بەيانى دەيانبەنە گورەپانى تيرباران
كرنن. گيراوەكان كەلەپچەكانيان بە ئامێرى ڕيش تاشـين لەدەسـتيان كردەوە و، مولازم
ـەلاح لە نوكتە و جەفەنگى خۆى نەدەكەوت، "ڕۆب"ەكەى لەبەركردبوو دەيگوت دەترسـم
ـەرەبەيان لەسەر ستوونى سێدارە سەرمام ببێ، بەڵام سپێدەكەى نەهاتن بيانبەن و سێ
ـۆژان بەو حـالەوە مـانەوە، ئەوجـا مولازم تەهـاى ئەفسـەرى گرتووخـانەكە هـات و
كەلەپچەكانى كردنەوە و پێيگوتن: ئەوەى فەرمانى لەداردانى دابوون عارف عەبدولڕەزاقى
ـيواى فڕۆكەوانى بوو، بەڵامشـەوێ بە تۆمەتى خۆئامادەكردن بۆ كودەتايەكى دى گيرابوو
و. ئەوجا چاويان لە لەداردانيان پۆشيبوو.
ـە كەرەتى سـێيەم سـەلاح محەمەد جەميل و هاوڕێكانيان بردن، لە دادگاييەكى هاكەزايى
فەرمانى لەداردانيان دابوون، ئيدى هێنرانەوە گرتووخانەكە و جاوەڕێى سـاتى
ـەداردانێ بوون. يەكيان تێدابوو ئەندازيارێكى گەنج بوو و برايمولازمەكەى ديكە بوو، برا
ئەفسەرەكەى داواى لێ كردبوو بيگەيەنێتە سەبازگەى خان بەنى سەعدى باقووبەى، نە لە
ـزيك و نە لەدوور پەيوەنديى بەو رووداوانەوە نەبوو، لەوێ گيردەبێ و ئيدى هەموويان
بەرگوللەدران.
شـەوێكيان پێيانگوتين ئێمەش ئامادەبين، پاسـى خەلك گواسـتنەوەيان هێنا و دەسـتيان لە
پستەوە بەستاينەوە و چەند زرێپۆشێك و ژمارەيەكى زۆر ئەفسـەر و سـەربازمان لەگەل
هات.حازم ئەلسـەباغى فەرماندەى گرتووخانەكە پێيگوتن: لە بەغدايان دوورخەنەوە ئەوجا
گوللەبـارانيـان بكەن. بەلام سـەربـازەكان هـاوسـۆزمـان بوون، پێيـانگوتين دەمـانبەنە
بەنديخانەى باقووبە. هەر بەڕاسـتيش ئێمەيان بردە بەنديخانەى باقووبە و لە هۆڵێكى
گەورە و سـارديان كردين و ئێمەش ئەوى نوين بێ پێمان نەبوو و، لەبەر داهێزرانيش
ـەسەر زەوييە ساردەكە ڕاكشاين تابنووين هۆڵەكە پڕ كۆكە بكەينعەقيد ڕافد حامد بابانى

پزیشی نەشتەرگەریمان لەگەل بوو و داوای لێدەکردین بێین و بچین تا تووشی هەوکردنی سییەکان بین.

لە بەندیخانەی باقووبەی عەبدولئەمیر عگێلیی داواکاری گشـــتیمان لەگەڵدابوو، تۆقیبوو و نەیدەتوانی بخەوێ، دەیدیت لە ســـەعات نۆی ئێوارێرا دەنووســـتم و بەرەبەیان لەخەو رادەبووم، ڕۆژێک لە نهێنیی بێ پەوایی پرسیم بەرانبەر بەوەی چاوەڕێم دەکا، گوتم ئەدی پەروایی ئێوە چیی لە واقیعەکە گۆڕیوە.

## تۆمەتی تەقاندنەوەی فرۆکەیەکی جەنی لەسەردەمی قاسمدا:

ـەگەڵ ژمارەیەک لەوانەی فەرمانی سـێدارەیان درابوو و دوایە کرابووە بەندیی تاهەتا، ـەدوایاندا هەناردین تا بمانبەنە بەغدا و،گیراوەکان و بەڕێوەبەرانی بەندیخانەش سـەریان ـەوەی سوڕمابوو بۆ لەگەڵ ئەوانەم دەنێرن، چونکە ئەوانە لە کەرکووک لەدار دەدرێن و، هەمووان پێیانوابوو لەگەڵ ئەوانەدا لەدار دەدرێم. ئێمەیان بردە بەندیخانەی سـەربازیی سـەربازخانەی ڕەشـید. بردمیانە ژووری حازم سـەباغی بەڕێوەبەری بەندیخانە، نەخۆشـبووم و بەتوندی دەکۆکیم. پێیگوتم: تۆ هانی خەڵکت داوە تا لە سـەردەمی عەبدولکەریم قاسـم فرۆکەیەکی"ئیلیوشـین" بتەقێننەوە و سـزاکەیشـی لەداردانە. بەاشـە چپەیوەندییەک لەنێوان هاوکاریی عەبدولکەریم قاسـم و تەقاندنەوەی ئەو فڕۆکەیە هەیە؟ ْنێرە، مولازمێکی زانیم ناوی حوسـام جەماسـە و خەڵکی مووسـڵە زللەیەکی لێدام و چاویلکەکەی شـکاندم، بەڵام حازم سـەباغ نەیهێشـت پترم لێبرا و گوتی: نەخۆشـە ببەنە ژووری ژمارە ١٧، ئەوێ بەژووری کات بەسـەربرد دادەندرا. دیتم عەبدولجەلیل پەرتۆی سـەرۆکی دیوانی ئەنجوومەنی وەزیران و سـێ برا لە کوڕەکانی ڕافـاییل بەتتیی ڕۆژنامەنووس و ژمارەیەک ئەفسەر لەوێن.

ڕۆژێکیان داوایان لێکردم جلەکانم لەبەرکەم و منیش وامکرد، بردمیانە ژووری فەرمانەی گرتووخانەکە و، چوار پۆلیسـم لەگەڵدابوو. حازم پرسـیی بۆ کوێی دەبەن؟ یەکیان گوتی: بۆ کۆشک "قەسر". لەدڵی خۆمدا گوتم "قەسری نیهائییە" و، ئەوەش کۆتاییمە، ئاخر دەیان سـەرکردەی حیزبی شـیوعی لەوێ لەژێر ئەشـکەنجە کوژران، لەوانەش سـەلام عادلی سکرتێری حیزب و محەممەد حوسێن ئەبولعیس ونافیع یونس و عەبدولڕەحیم شەریف و جۆرج حەننا تەللۆ و......تاد.

بەڵام بردمیانە کۆشـکی کۆماری، کە بردمیانە هۆڵی لێکۆڵینەوە، دیتم ژمارەیەکی زۆری لێکۆڵەرانی لێیە و خۆی لە ١٣ ئەفسـەری هێزی ئاسـمانی و ئەفسـەری پۆلیس و ئاسـایش دەدا. پرسـیاری ئەوەیان لێکردم داخوا چۆن لەگەڵ کەسـانی دی فڕۆکەی ئیلیوشـنمان تەقاندەوە؟ گوتم ئەو پرسـیارە بۆ من لەهیکڕایە ، من پشـکنەری گشـتیی وەزارەتی چاکسـازیی کشـتوکاڵ بووم و ئێسـتاش هەر هەوم، پەیوەندیم بەو کارەوە چییە؟گوتیان دانپێدانانی هەریەک لە مولازم عادل ئاکرەیی و کەریم ئەسـەدیی بۆ بخوێننەوە. ئەوان بەوەیان تۆمەتبار کردبووم گوایە هانمداون ئەو فڕۆکەیە بتەقێننەوە و ئەوەشـیان لەگەڵ پلەدارەکانی هێزی ئاسمانی کردووە. قسەکانم بە دێڕ و نیوێک تەواوکرد کە من نە ئاگام لەو مەسـەلەیەیە و نە پەیوەندیم پێیەوە هەیە. لێرەدا عەقید ڕوکنێک هاتەژوورەوە، گوترا فەرمانەدەی لیوای ٢٥ی کۆشـکی کۆمارییە و ناوی حەمید سـەعیدە. قسـەکانی منیان پێ

نیشـــاندا، ڕووی قســـانی لەمن کرد: مامۆســـتا موکەڕەم ، ئێمە ڕێزت دەگرین و لای ئێمە بەسەنگی، دان بە ڕاستییەکەدا بنێ، ئەوانەی پێشەتووش نکوڵییان لێکرد، بەڵام کە دارمان بەگەڕ خستڕاستییەکەیان گوت، جا وامەکە لەو ڕێزگرتنە دەرچین و بە هەمان شێواز دانی پێدا بنێی. گوتم: ئەوانەی دارتان لێ بەگەڕ خســـتن بەناهەق دانیان پێداناوە و، بەوەش ڕاســـتییەکـان لەبەین چوون، ئیـدی منیش وەک ئەو هەموو خەڵکە بێتـاوانەی بەنـاهەق ئازاردراون.

ڕووی لە لێکۆڵەرەکان کرد و گوتی: بیبەنەوە گرتووخانە، کاتێکی دی بدوایدا دەنێرینەوە. ئیدی بردمیانەوە گرتووخانەی سەربازگەی ڕەشید.

## ڕاپەڕینەکەی سەربازگەی ڕەشید"بزاوتی حەسەن سریع"[46]:

ئەو سەربازانەی پاسەوانیی بەندیخانەیان دەکرد، کە بەشێکی کەتیبەی زرێپۆش بوون و مونزیر مستەفا دلێمی سەرکردەیان بوو، بەزەییان بە بەندییەکاندا دەهاتەوە و ڕقیان لە کارە خوێنڕێژییەکانی کودەتاچییەکان دەبووەوە و، بە تایبەتیش "حەرەس قەومی". ڕۆژێکیان یەکێکیان لە زمانی دەرچوو و گوتی بەوزووانە ئازادتان دەکەین، دوای چەند ڕۆژێک یەک لە پلەدارەکان گوتی ئەوان بە گوللە قفڵەکان دەشکێنن و بەندییەکان ئازاد دەکەن، تا هەر ئەفسەرێک ئەرکی خۆی لە کۆتاییپێهێنانی ئەو دەسەڵاتەدا ببینێ، بەڵام دوای چەند ڕۆژێک ئەو کەتیبەیە گواسترایەوە خانەقین.

بەرەبەیانی ٣ی تەممووزی ١٩٦٣ بەدەنگی تەقەی لێرەولەوێ بەئاگاهاتین، ئەو حاڵەتانەش ئاسایی بوون، جا یان دەستەیەک لە نیشتمان پەروەران لەداردەدەن، یان دەسڕێژی

---

[46] _ ڕەنگە هەولەکەی حەسەن سریع ڕواڵەتێکی سەرچلیی تاکەسیی شانەیەکی حیزبی شیوعیی ژمارە دیاریکراوی هەبێ. بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەوەی دەردەبڕێ کە بەو هەموو شێوازی سەرکوتکردنەی لەگەڵ شیوعییەکان کرا، هێشتاش کۆتایی پێ نەهێنان و، ڕەنگە ئەوەش بۆ ئەو شێوازی ڕێکخستنە نهێنییە بگەڕێتەوە، کە سەرکردەی شیوعی ناوی لێ دەنێ"سەرەداوی"واتە هەر سانەیەک شانەکانی دی ناناسێ لەڕێی بەرپرسەکەیەوە نەبێ، جا هاشم حەمدانی یەک لە بەشداربووانی بزاوتەکە بوونئاماژە بەوەی دەکا لەبەر ئەو داڕووخانەی تووشی ڕیزەکانمان ببوو بەترسەوە بەشدارییان کرد. ئەو هەوڵەی کودەتا، وەک ئەو کودەتایانەی پێشتری لە عێراق هەوڵیان بۆ درابوو، لەنێوان ئەفسەران و کەسایەتییە مەزنەکان نەکرا. پەیوەندییەکان لەڕێی محەممەد حەبیب"ابی سەلام"ەوە کران کە یەک بەرپرسانی ئەو سانە حیزبییانەبوو پاشماوەی شیوعییەکالنی لە بەرگدرووی حافز لەفتەی ناوچەی قوسابخانەی نزیک گۆڕستانی غازالی و دووکانی دیکە کۆکردەوە. ئەو کابرایە ، بە پشتگیریی هەندی ئەفسەری شیوعی، نەخاسمە ئەوانەی لە هێزی ئاسمانی بوون، گرەوی لەسەر جێبەجێکردنی پلانی کودەتا کرد. لەلایەکی دیکەشەوە، کە ئەوەیان گرنگەکەیە،دەستیان بە گەران کرد بەدوای ئەو سەرکردانەی حیزبدا کە نەگیرابوون تا شان بدەنە بەر بەرپرسیارییە سەرکردایەتییەکەیان، ئیدی دووکانەکەی حافز لەفتە بووە بنکەی ڕێکخستنەوەی حیزبی و کودەتایی. تەنێ بیرکردنەوەی محەممەد حەبیب"ابی سەلام" لە گەران بەدوای هێزێکی سەربازیدا نیشانەی باوەڕێکی قووڵە بەوەی سوپا دەتوانێ ڕژێمی سیاسی بگۆڕێ نەک گەل، کە ئەوەش قەناعەتی ئەوانە بوو کودەتای ٨ی شوباتیان کرد. لەبەر ئەوە محەممەد حەبیب ناسینی نائیب عەریف حەسەن سریعی لەڕێی چەند خانەنشینێکی سەربازییەوە بەڕێگای گەیستنە ئامانج دانا. ئەو پیاوەش بە بەرپرسی سەرەداوێکی حیزبیی سەربازیی دادەندرێ کە نەکەوتبووە دەست لێکۆڵینەوەکانی دەسەلات ." ئەو ڕێکخستنە سەربازییە داوای لە حیزبی شیوعیی عیراقی کرد پشتی بگرێ و پاڵپشتیی بکا تا ڕژێمی دەسەلات بگۆڕێ.بەڵام سەرکردایەتیی حیزبی سیوعیئەوکارەیان بە جۆرەسنوور بەزاندنێکی بنەمایەکان دانا و گوایە پێچەوانەی پابەستیی حیزبییە". بەڵام ڕێکخستنە سەربازییەکە لەکاری خۆی بەردەوام بوو و پتر لە دووهەزار سەربازی ئامادەکرد، بەڵام کێشە ئەوەبوو نەیدەزانی چۆن ڕێکیان بخا و نەیدەتوانی ئاراستەیان بکا. ئەوە هێ لە نەبوونی ڕێوشوێنەکانی ڕێکخستن و سەنترالی. بۆیە سەیر نییە کە دەسەڵات دوو سەربازی ئەو ڕێکخراوە بگرێ، کە ئەوەش وایکرد سەرکردایەتیی ڕێکخراوەکە لە ئاشکرابوونی بترسێ و پەلەی لە تەقاندنەوەی هەڵویستەکە کرد وکرایە ڕۆژی ٣ی تەممووزی ١٩٦٣. للمزید:سیف عدنان ارحیم، الحزب الشیوعی فی عهد البکر ١٩٦٨- ١٩٧٩، دارالحکمة، لندن، ٢٠١٤، ص١١١-١١٥.

گوللەیە و بۆترســــاندنی خەڵکە، بەڵام دەنگەکـان خەریکبوون لە بەنـدیخـانەکە نزیـک دەبوونەوە. وەگرە گێمان لە هەڕەشـــەی ئەوەی بوو کە بەندیخانەکەی دەشـــکێنن. لەناو ئەو گوولله‌بارانەیدا خۆمان بۆ چوونەدەری ئامادەکرد و، حازم سـەباغ و هاریکارەکانیمان دیتن لەژێر دەســـترێژی گوللەدا لە ژوورەکانی بەڕێوەبەریی نزیک دەرگا ئاســـنینەکەی دەرەوە دووردەکەوتنەوە تا لەناو جۆگەکانی باخچەکە دریژبن و خۆیان بپارێزن. پێدەچوو گواســـتنەوەی کەتیبە زرێپۆشـــەکە پلانەکەی زۆر تیکدابێ، ئاخر بەندیخانەکە "٥٠٠" کەس پتری لە ئەفســـەر و پلەداران و تایبەتمەندا تێدابوو و، ڕاپەڕیوەکان ئامانجیان ئەوەبوو بەریان بدەن تا بەتەواوی دەست بەسەر سـەربازگەی ڕەشیددا بگرن و لەوێشڕا دەست بەســـە بەغدادا بگرن. وەک دواتریٚ گێڕایانەوە،ڕێکخراوێکی شـــیوعیی 'ســـەلام ئەحمەد' سـەرکردەی بوو پەیوەندیی بە ژمارەیەکی زۆری "زوبات سـەفە شـیەعییەکان"ەوە هەبوود کە هێشتا ئاشـکرا نەببوون و لە سـەربازگەی ڕەشـید سـەربازبوون و، ئامادەیی خۆیان دەربڕیبوو ســـەربازگەی ڕەشـــید و بەندیخانە بگرن، جا ئەگەر پلانەکە ســـەرکەوت و ئەفسـەرەکانیان ئازاد کرد کە ژمارەیەکی زۆی فڕۆکەوان و ئەفسـەری زرێیان تیدایە، ئەوا دەتوانن بەغدای پایتەخت داگیر بکەن و حکوومەتی کودەتا لەناو ببەن، نەخاســـمە کە لە ســـەربازگەکەدا بنکەیەکیئاســـمانیی گرنگ هەبو و ژمارەیەک فڕۆکەی جەنگیی لێبوو.ئەو دەســـتەیە بە کردارێکی لێزانانە و بێ شـــەڕ دەســـتیان بســـەر بنکە ئاســـمانییەکەی وســـەربازگەی تانکەکان و بەشـــێکی فراوانی ســـەربازگەکەدا گرت، بەڵام لەجیاتی ئەوەی ڕوو لە گرتووخانەکەی بکەن کەهەشـت سـەد پلەداری"ضـباط صـف" شـیوعیی تێدابوو و بەهاسـانییش دەسـتی بەسـەردا دەگیرا و بەندییەکان ئازاد دەکران، کە زۆربەیان شـوفێری ئۆتۆمۆبیل و پلەداری ۆپخانەی بوون، ڕوویا لە بەندیخانەی ئەفســـوران کردن چونکە سەرکردەی ئەفسەریان نەبوو. پەیوەندییان بە ئەفسەرەکانی بەندیخانەوە نەبوو تا پلانێک و لەناوەوەڕا دەســـتبەســـەر بەندیخانەکە داگرن، کە ئەوەش گران نەبوو.ئەوان دەســـتیان بەسەر دەروازەی سەربازگەی ڕەشیددا گرت و لەوێ زۆریان سەرکردەی سوپا و وەزیر و بەرپرس دەستگیر کرد، کەڕایانکردبوو بینە ناو سەربازگەکە. بەڵام عەبدولسوام عارف بە خۆ و بە کەتیبەی تانکەوە لە ســـەربازگەی وەشـــاشـــەوە هات و دەســـتی بەســـەر دەرگایســـەربازگەکەدا گرت و لەویشـــەوە دەرگای گرتووخانەکە، ئیدی توانی ژمارەیەکی زۆری ڕاپەڕیوەکان بگرێ و لەوانەش "ڕەئیس عورەفا حەســـەن ســریع"ی ســـەرکردەیان، ئیدی ئەو هەوڵە جەربەزەیەی ئەو پلەدارە ئازایانە شـکستی هێنا، دیتم کەلەپچەکرابوون و پاسەوان بە بەرچیغ و قونداغە تفەنگان لێیان دەدان و خوێنیان لەبەر دەڕۆیی، ئیدی دوای لێکۆڵینەوەیەکی خێرا هەموویان گوللەباران کردن، بەڵام سەلام ئەحمەد دەربازبوو.

## شەمەندەفەری مەرگ[47] بەرەو بەندیخانەی نوگرە سەلمان:

کودەتاچییەکان، لەسەرووی هەمووشیانەوە عەبدولسولام عارف، لە تۆڵەی ئەو ڕاپەڕینە سەرنەگرتووەی سەرباز و پلەدارەکان و بۆ ئەوەی لەسەربازگەی ڕەشید رووبدا دووبارە نەبێتەوە، بڕیاری لەداردان "٣٠٠" ئەفسەری بەرزیان دا لەو ئەفسەرانەی لە گرتووخانەی سەربازگەی ڕەشید بوون.

دەڵێن لیوا ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆکی وەزیران بوو، بەتوندی ئەوەی ڕەتکردەوە و توانی عەبدولسەلام عارفی بەوەی رازیکا گیراوەکان لە سەربازگەی ڕەشیدی بۆ نوگرە سەلمانی بیابانی دووربخرێنەوە ، تا ئەو پاشماوە شیوعییانەی لێرەولەوێ ماون هیچ هیوایەکیان نەمێنێ. ڕۆژی دووەم بە بەندییەکانیان ڕاگەیاند خۆیان بۆ سەفەرێ ئامادەکەن، تەنیا وەزیرەکان و بەڕێوەبەرە گشتییەکان و مامۆستایانی زانکۆ نەبێ، جا ئێوارەکەی بردنیانە وێستگەی شەمەندەفەری بەسرا تا بە واگۆنە ئاسنینەکانی کەلوپەلانی هیچ هەواگۆڕییەکیان تێدا نەبوو بیانگوازنەوە شاری سەماوەی و لەوێسەوە بە پاس بیانبەنە بەندیخانەی نوگرە سەلمان.

سەرۆک عەبدولسەلام عارف و تاهیر یەحیای سەرۆکی ئەرکانی سوپا فەرمانیان ئەوەبوو ئاوڕ لە هانا و هاواری بەندییەکان نەدرێتەوە ودەرگا نەکرێتەوە و فریاکەوتنی سەرەتاییان بۆ نەکرێ، ئیدی سەفەر لەکاتی شەوێ باشتربوو بەڵام واگۆنە ئاسنەکان لەگەڵ بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای بەیانی بوونە دۆزەخێکی بەرگەیان نەدەگیرا، واگۆنە بەتالەکانی هیچ کونێکی هەواگۆڕکێیان نەبوو گەرمداهاتن و، لەبەر ئەوەی بە ئارەقەکردن خوێ لە لەشی زۆربەی بەندییەکان دابەزی و، هاوار و ناڕەزاییەکانیان هەتا گەیشتنە شاری سەماوەی دادی نەدا و، کە دەرگاکانیان کردەوە ئیدی بەندییەکانیان بەڕاکێشان هێنا دەرێ، ڕافد ئەدیب بابانی پزیشکی عەقید لەناو گیراوەکان بوو، جەماوەرێکی زۆری خەڵکی سەماوە لە وێستگەی سەمەندەفەر کۆببوونەوە تا هاریکاریی گیراوەکان بکەن.

---

[47] _ ئارەزیی کوشتنی شیوعییەکان لای سەرکردەکانی کودەتای ٨ی شوبات هێشتا بەهێزە و  و دوای بزاوتەکەی حەسەن سریع لە هەموو کاتێک چالاکترە و، ڕژێم دەستی بە گواستنەوەی بەندییە سەربازەکان کردووە و لە بەندیخانەی سەربازگەی ڕەشید کە ژمارەیان خۆی لە ٤٥٠ ئەفسەر دەدا و هەندێکیان لایەنگری عەبدولکەریم قاسم بووینە و هەندێکیان شیوعی، سەرۆک عەبدولسەلام عارف و ئەحمەد حەسەن بەکریسەرۆکوەزیران بەوەیان تۆمەتبار دەکردن گوایە دەستیان لەگەڵ ەسەنسریع و هاوڕێیەکانی هەبووە، ئیدی، وەک هانی فەکیکی ئاماژەی پێدەکا، لەسەر لەداردانیان مکوڕبوون، ئەوەیا خەیاڵی ئەوەی مێشکی داگرتبوون ئەگەر ئەوانە بەزیندوویی بمێننەوە خەلکی دی هاندەدا پیلانان بگێڕن، ئیدی بە شەمەندەفەر ڕەوانەی نوگرە سەلمان کران و ئەو شەمەندەفەرە بە "شەمەندەفەری مەرگ" ناسرا. للمزید:هانی الفکیکی، اوكار الهزیمة(تجربتی فی حزب البعث العراقی" مؤسسە المنارة، ١٩٩٢،ص٢٧٩.

دکتۆر داوای لێکردن ئاو و خوێی چێشــت بێنن تا فریای ئەوانە بکەون بووراونەتەوە، جە بە هاریکاریی خەڵکەکە توانیی ڕزگاریان بکا و ژمارەیەکیشــیان بۆ چارەســـەر ڕەوانەی خەستەخانە کران.
من لەگەڵ وەزیر و بەڕێوەبەرەگشتییەکانی گیرابوون لە گرتووخانەی سەربازگەی ڕەشید ماینەو. ڕۆژێکیان حازم ســەباغی فەرماندەی گرتووخانەکە دیتمی، پرســیبووی بۆ لەگەڵ بەندییەکانی دی ڕەوانەی نوگرە سەلمان نەکراوم، گوتبوویان چونکە بەڕێوەبەری گشتییە. گوتبووی دەبێ ڕەوانەی نوگرە سەلمان بکرێ.
لە گرتووخانەی ســـەربازگەی ڕەشـــید ماینەوە و ، ڕووداوێکی خۆش هەیە دەمەوێ بیگێڕمەوە:
ئەحمەد محەممەد یەحیای وەزیری ناوخۆدســـتە کاغەزێکی یاریی پۆکەری هەبوو و . وەزیرەکانی قاســم فلّیان پێ دەگرتەوە، ڕۆژێکیان بەیانییەکەی دەســتە کاغەزەکەم لەژێر ســـەرینەکەی ئەحمەد محەممەد یەحیای دەرهێنا، ئیدی خەریکبوو وەک ئەوان فالم دەگرتەوە و، ئەوانیدی خەوتبوون. ئەنجامی فالەکە باشـــبوو، ئیدی ئەحمەد محەممەد لە خەوەکەی هاواری کرد: کاک موکەڕەم ئەورۆ بەردەبێ!وەزیرەکان لەخەو هەســـتان و پرسیاری سەرچاوەی هەواڵەکەیان دەکرد، گوتی: فاڵەکە وای گوت.
ســـەعات دەی ئەو ڕۆژە، ئەفســـەرێکی بەڕێوەبەریی گرتووخانە هات و گوتی: موکەڕەم تاڵەبانی و، حەســـەن تاڵەبانی، جلەکاانتان لەبەرکەن ئێوە بەردەدرێن. عەمید ئەحمەد محەممەد یەحیا و عەمید محێ عەبدولحەمید هەرایان کرد تا جانتا و نوێنەکەم بۆ ئامادەبکەن، بەلام لەجێی خۆم نەجوولام و گوتم:تۆ بڵێی ئەوانە بەرمدەن؟! هێشـــتا نەجوولامەوە، ئەفســـەرەکە دیســـان هاتەوە و گوتی: ببوورن تەنیا موکەڕەم تاڵەبانی بەردەدرێ، من هێشـــتا ڕەقببوم. دوای تۆزیک هاتەوە و گوتی ببوورە بەردان نییە . موکەڕەم تالەبانی ڕەوانەی نوگرە ســـەلمان دەکرێ، ئەودەمی هەســـتام شـــتومەکەکانم کۆکەمەوە و گوتم: ئەوە ڕاستە، ئاخر ماقوول نییە ئەوانە بەرمدەن!گواسترامەوە پۆلیسی "تەسفیرات" ورۆژی دواترێ بەشەمەندەفەر بردرامە سەماوەی و لەوێرا بۆ بەندیخانەی نوگرە سەلمان.
لە بەندیخانەی نوگرە سەلمان، حەرەس قەومییە بەعسییەکان سەرپەرشتیی بەندیخانەیان دەکرد و ڕەشاشیان لەسەر بانەکانی بەندیخانە دانابوو و دەرگایان لەسەر بەندییەکان دادەخست و، ژمارەی بەندییەکانیش لە ١٧٠٠ کەس پتربوو و، ژمارەیەکی زۆری ئەفسەر و پلەداریان تێدابوو. کابرایەکی فەلەستینی لەگەڵ حەرەس قەومییەکان بوو و لە هەمووان دڕتربوو، داوای لە بەندییەکان دەکرد هەرکەس لەسەر نوێنی خۆی دانیشێ و کەس لەگەڵ

نەوەی تەنیشتیشی قسان نەکا و بە دیالێکتە فەلەستینییەکەی دەیگوت: "کە دەرزی هەڵدەم نەبێ گوێن لە زرینگەکەی بێ"[48] ئیدی بەندییە ســـــەربازەکان پیلانیان لێ دانا، کە ئەو قســـــەیەی دووبارەکردەوە دایانە بە نەعلان و دەیانگوت"تەنیا گوێت لە نەعلان دەبێ"ئیدی کە لەدەســـتیان بەربوو و چووەدەرێ بە ڕەشـــاشـــەکەی دەســـترێژێکی لێ کردن، بە لام ڕێکەوت وابوو بە کەس نەکەوت.

[48] _ بە بنەزمانە فەلەستینییەکەی ئاوایە: "من القي الابري لازم اسمع لها رني"

## هەڵوێستی مەلا مستەفا بەرانبەر شیوعییان:

هەر لە ڕۆژی یەکەمڕا سەرکردەکانی کودەتا دەیانگوت لە شیوعییان بترازێ ئەوان دوژمنی کەسی دی نین، بە دەربڕینێکی ڕاشکاوانە ش دەیانگوت ئەوان دژی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی نین، بەڵکو نوێنەری ئەوانیان وەک پەیامنێری ڕۆژنامان دێنان تا بەچاوی خۆیان ببینن چییان بە دوژمنانی ئیستیعمار و کۆنەپەرستان کردووە و یاسای ژمارە "٨٠"ی ساڵی ١٩٦٠ یان لەسەر ڕەفکەی دانا تا داوا لە کۆمپانیاکانی نەوت بکەن بەئازادی کاری زۆریان بکەن و بەرهەم زیاد بکەن.هەندێ سەرکردە و کادیری حیزب لە کوستن و گرتن دەرباز ببوون و، توانیبوویان بگەنە کوردستان تا بچنە ڕیزی سەرکردایەتیی لقی کوردستان و، جارێکی دیکەش خەریکبوو پەیوەندیی نێوان حکوومەت و سەرکردایەتیی بزووتنەوەی کوردی تێکدەچوو و، شیوعییەکان لەوێ لەبەینی دوو ئاگردا بوون، لەلایەک ڕاوەدوونانی حکوومەت و لەلایەکی دی ڕاوەدوونانی پارتی دیموکراتی کوردستان، باڵی "ئیبراهیم ئەحمەد- جەلال تاڵەبانی". ئەگەرچی ئیبراهیم ئەحمەد لە گوندی قەسرێی کوردستان، کە بارەگای بارزانی لە ١٩٧٤ لەوێ بوو، پێیگوتم :"لەوەی دڵنیام ئەوەی دوژمنایەتیی شیوعییان بکا سەرەداوێکی پەیوەندیی لەگەڵ ئیستیعمار هەیە"، بەڵام دەبێ هەمووجارێک لە بەڵگەی نوێ و لە سەرەداوی نوێی ئەو پەیوەندییە بگەڕێین و، شیوعییەکان لەو ماوەیەی شل و پەیتیی پەیوەندیی نێوان حکوومەت و سەرکردایەتیی کوردی زۆریان کێشە بۆ دروستبوو.

کە حکوومەت داوای کرد ئەو شیوعییانەی لە کوردستانن بدرێنەوە دەستی، هەڵوێستی مەلا مستەفای زۆر شکۆمەندانە بوو، ئاخر ئەو متمانەی بە هاوکاریی حکوومەت لاوازبوودووچاری کێشەی باڵباڵێنی ناوخۆی پارتی دیموکراتی کوردستانیش ببوو و بەتایبەت لەگەل باڵی ئیبراهیم ئەحمەد- جەلال تاڵەبانیی دواترێ لە ١٩٦٤ جودابوونەوە.

بارزانی دەیویست هەموو نەیارانی حکوومەت لەژێر سەرکردایەتیی خۆی کۆکاتەوە و، بە پاراستنی شیوعییەکانیش جاوی لەوەی بووپەیوەندییەکانی لەگەڵ دامەزراوەی سۆسیالیست و بزووتنەوەی پێشکەوتنخوازی جیهانی باشتر بکا.

ڕاستییەکەی، بارزانی نەیدەویشت وەک حیزبێکی سیاسیی خاوەن قەوارە هاوکاری لەگەڵ شیوعییەکان بکا، بەڵکو دەیویست وەک پەنابەر بیانپارێزێ وبە " پەنابەر" ناوی دەبردن، بێ مۆڵەتی خۆیشی قەدەغەبوو چەک هەڵگرن.

بارزانی، ئەوەندەی باوەڕی بە پشتگرتن و پشتیوانیی دەرەوە هەبوو ئەوەندەی باوەر بە توانای گەل نەبوو خۆی مافی خۆی بستێنێ و، کەمیشی باوەڕ بەتوانای حیزبەکان هەبوو گەل بۆ تێکۆشان کۆکەوە و،ئەو دەیویست حیزب و ڕێکخراوەکان هاریکاری دەسەڵات و

ســـەرکردایەتییەکەی بن، هەر حیزبە و ناوێکی ناشـــیرینی لێنابوون، بە حیزبی شـــیوعیی دەگوت "حیزبی حوسێن ئەلرەزی"، مەبەستی سەلام عادل بوو.
کە شـــەڕ لە نێوان بەعس و بزووتنەوەی وردی هەڵگیرسـایەوە، ســاڵح مەهدی عەماشـی وەزیری بەرگری ئیحای ئەوەی دەدا کە لە مەودای پازدەڕۆژان بزووتنەوەی چەکداریی کوردی کۆتایی پێدێنی و کوردســـتان داگیر دەکا. بەوجۆرە، حکوومەت لە کوردســـتان سیاسەتی "زەویی ئاگرراوی" گرتەبەر، ئیدی دەستی بە سووتاندنی گوند و کێڵگەکان کرد و لە هەموو جێیەک خەلکی دەکوشت.
ئەو کارە بەربەریســـتییانە؛ کوشـــتوبڕی شـــیوعییەکان و دیموکراتییەکان و گەلی کورد، ڕەنگدانەوەی ئەو قەیرانە قووڵەبوو کە کودەتاچییەکانی تێدا دەژیان. شـــیوعییەکان وەک دەســتەی ســەربەخۆی خۆبەخش هاتنە ناو ڕیزەکانی شـۆڕسـی چەکداریی کوردسـتان و، پێویســـتیـان بە چەک و جبەخـانە و ئـازووخە هەبوو و، بزووتنەوەی کوردییش بـایی پێویستی نەدەدانی و بە وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکردن.
حیزبی شـــیوعی لە کوردســـتان هەر تەنیا ڕیزەکانی ڕێکنەخســـتەوە وبەس،دەســـتی بە فراوانکردنی ڕێکخســـتنەکانی پایتەخت و شـــارەکانی دیکەی عێراقش کردبوو. دیســـان پەیوەندیی بە توێژەکانی گەلەوە کردبوو لە کرێکاران و جووتیاران و قوتابیان و توێژی دیکەش. دەنگوباســـی بەرگریی شـــیوعییەکان و هێزەکانی پشـــتیوانی وورەی خەڵکەکەی بەرزدەکردەوە.
بلاوکراوە و ڕۆژنامە نهێنییەکانی حیزبی شـیوعی دەگەیستە زۆربەی شـار و سـارۆچکە وگونـدەکـانی عێراق و، هەزاران کەس گوێیـان لە رادیۆی حیزبی شـــیوعیی دەرەوە ڕادەگرتکە بە ئێزگەی "دەنگی گەلی عێراقی" ناســـرابوو، کە رووی تاوانە دیکتاتۆرییەکانی هەڵدەماڵی و ، هەواڵی ســـەرکوەتنەکانی شـــۆڕشـــی کوردی و هێزەکانی پشـــتیوانیی بلاودەکردەوە.

## کودەتای ١٨ایتشرینی دووەمی ١٩٦٣:

کودەتای سەرکردە بەعسییەکان هەر نۆ مانگی خایاند، ئەومانگانەس لەلایەک ئەو ململانێیانەیان بەخۆوە دیت کە کەوتبووە نێوان سەرکردەکانی بەعس و هێزە قەومییەکان و سەرباریش دووبارە هەڵگیرسانەوەی شەڕی کوردستان دوای ئەوەی بەعسییەکان ئەو بەڵێنانەیان شکاند کە بە بزووتنەوەی کوردییان دابوو.
لە ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣ عەبدولسەلام عارف و هاوڕێکانی کودەتایەکی سەربازییان بەسەر بەعسییەکاندا کرد کە لەبەر کێشەی نێوانیان داوایان لە مێشیل عەفلەق کردبوو بێ دەسەاتی عێراق وەرگرێ.
حەرەس قەومییەکانی بەندیخانەی نوگرە سەلمان، دوای ئەوەی دەنگوباسی کودەتایەکەی عارف و ئەو زنجیرە دەستگیرکردنانەیان گەیشتێ کە بەسەر ژمارەیەکی زۆری سەرکردەکانیان ڕاگەیشتبوو و، بڕیاریان دابووزۆرترین ژمارەی بەندییە شیوعییەکان، چ مەدەنی و چ سەربازی، بکوژن کە سەرکردەی حەرەس قەومییەکانی بەندیخانەی نوگرە سەلمانیش سەلیم زیێبەق بوو و بەنیازبوون دواترێ ڕاکەنە سووریا.
بەڕێوەبەری بەندیخانەکە عەبدولڕەحمان جاسم بوو، ئەو ئەفسەرێکی خانەنشین و مرۆڤێکی جاک بوو و هاوسۆزی گیراوە سەربازییەان بوو. لەگەڵ بەڕێوەبەری پۆلیسی بادییە ڕێککەوتن تا ڕێ لە جێبەجێکردنی ئەو قەسابخانەیە بگرن و، وەک جێبەجێکردنی فەرمانێکی حکوومەتی نوێش، کە ئەحمەد حەسەن بەکرد وەک سەرۆکوەزیر تییدا مابووەوە، ئیدی هەندێ بەندیوانیان هەنارد ئەو ئۆتۆمۆبیلانە بەتاڵکەن کە ئامادەکرابوون تا دوای قەسابخانەکە بەهۆیانەوە بەرەو سووریا ڕاکەن. ئیدی بەڕێوەبەری بەندیخانە خەریکبوو بە وریایی بە فێڵ مامەڵەی لەگەڵ دەکردن، دواترێ پەلاماریدان و چەکی کردن و جلەسەربازییەکانی لەبەرکردنەوە و گرتنی و بە پۆلییس ڕەوانەی بەغدای کردنەوە. ئیدی بەندییەکان ئاوا لە قەسابخانەیەک دەربازبوون بەعسییەکان بەتەمابوون بەرپای بکەن.

## لێکۆڵینەوە لەسەر تێکدانی سیستەمی دەسەڵات:

هەر چەند مانگێک لەوی مامەوە، برووسکەیەک هات داوای دەکرد ڕەوانەی بەغدام بکەنەوە تا لەسەر ئەرکە فەرمانبەرییەکانم لێکۆڵینەوەم لەگەڵ بکرێ بە تۆمەتی تێکدانی سیستەمی دەسەلات. وەزارەتی چاکسازیی کشتوکاڵی پێش لێکۆڵینەوەکە بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەسەر کار دەریانکردبووم.

مامۆستا عەبدولڕەزاق زوبێری بەڕێوەبەری چاکسازیی کشتوکاڵییسم لەگەڵدابوو، شەوێک لە بنکەی پۆلیسی بادییەماینەوە، بە ئۆتۆمۆبیلێکی پۆلیس ئێمەیان بردە سەماوە، لەوێش بۆ بەغدا. کە گەیشتینە گۆڕەپانی ئەمینی شەقامی ڕەشید" ئێستا گۆڕەپانی ڕەسافییە"، سەرباری ئەوەی پڕی سەرباز و پۆلیس بوو، یەک لە گیراوەکان خۆی لە ئۆتۆمۆبیلەکە فڕێدا و ڕایکرد، ئەو پەڕیسووتوان بوو. سەربازەکان دەیان فیشەکیان پێوەنا، بەڵام توانیی بۆی دەرچێ و لە کۆڵانە تەسکەکاندا خۆی بشارێتەوە. لەبەر ئەوە ئێمەیان بردە بنکەی پۆلیسی سەرای، ژووری ڕاگرتنەکە پڕی گیراو بوو و پلەی گەرماس بەرز بوو، بۆیە عەبدولڕەزاق زوبێر بووڕایەوە، ئیدی ناڕەزاییمان پێشەسی پۆلیس کرد و، هەر ئەو شەوی ئێمەیان گواستەوە جێی ڕاگیرانی گستی بەسی سیاسییەکان، هەندێ وەزیری پێشترێ و هەندێ بەڕێوەبەری گشتی ولەوانەش نەقیبێکی دەرمانساز و دکتۆر مەهدی مورتەزا. لە ووریکدا مامەوە مامۆستا ئیبراهیم کوببە و دکتۆر حافز تەکمەچی و عەبدولڕەزاق زوبێر و یونس تائیی ڕۆژنامەنووسی لێبوو.

چونکە دەبوایە ژوورێک بۆپێشوازیی ئەو ئەفسەرانە ئامادەبکرێ کە دوای ئەوەی بە حوکمی گران حوکمدرابوون ڕەوانەی نوگرە سەلمان دەکران، ئیدی ئەوانەی ژووری ئێمە دابەشی سەر ژوورەکانی دی کران. هەردوو بەڕێزان ئەحمەد محەممەد یەحییا و محێدین عەبدولحەمید کەلوپەلەکانیان گواستەوە ژوورەکەی خۆیانو، مامۆستا محەممەد حەدیدیش لەوی بوو

بەشی سیاسی پیس و پۆخڵبوو و ئاودەستەکانی گیرابوون و جێیەکە پڕی ئاغزە جگەرەبوو. دوای ئەوەی مۆڵەتم لە بەندییەکان وەرگرت، یەکەم کاری کردم کاری بە کۆمەڵی پاککردنەوەی بەشەکە بوو و دەبووایە دوو کەسیس بە نۆبەت بەرپرسیاری پاکیی بەشەکە بن، حەوشەکەیان بشووشتایە و فێنککەوەکانیان پڕ ئاو بکردایە و لینەگەڕابان ئاغزە جگەرە فڕێدرێتە سەر زەوی و قوتووی بەتاڵیان بە دیوارەوە بکردایە بۆ ئاغزە جگەرە. من و دەرمانسازەکەی ئەویس هەر شیوعی بوو گیزەرە نەوتییەکەی ئاو گەرمکردنمان چاککردەوە و ئیدی بە ئاوی گەرم خۆیان دەشووشت.

فازڵ بەیاتیی بەڕێوەبەری نیشتەجێکردن لەکاتی جاکردنەوەی حەمامەکە و ڕێکخستنەوەی بەشەکە دیتمانی، ڕاوەستا و گوتی: ئەو بەعسییە گەمژانە بۆ پەنا بۆ ئەسکەنجە دەبەن تا وابکەن خەڵک دانپێدابنێ شـــیوعییە، هەر بـاچـاودێری بکەن و بزانن کێ بەخوایش خۆدەبەخشێ و خزمەتی خەڵک دەکا ئیدی ئەوە بێ ەسکەنجە و دانپێدانان شیوعییە.
دەســەڵاتەکانی کودەتا نەیانوانی هیچ بەڵگەیەکی گەندەڵی و ســەرپێچیی یاسـا بدۆزنەوە تا بەرپرســـەکانی حکوومەتەکەی عەبدولکەریم قاســـمی پێ تۆمەتبار بکەن . کە دەســـتەی لێکۆلینەوەی تـایبەتی ئەنجوومەنی وەزیرانی لێکۆڵینەوەیـان لەگەڵ دەکردم، داوایـان لە وەزارەتی چاکســازیی کشــتوکاڵی کردبوو تا ئەو ســەرپێچییە دارایی و بوەڕێوەبەرییانە ئاشــکراکەن لە کاتی کارکردنم لەوێ کردوومە، وەڵام هاتەوە: ئێمە هیچ ســـەرپێچییەکی دارایی وبەڕێوەبەریی ئەومان نەدۆزییەوە. لەگەڵ ئەوەشـــدا ســـەعدون حەمادیی وەزیر چەندین ساڵ لەخزمەت دەرکرێم.
ڕۆژێکیان بۆ لێکۆڵینەوە داوایان کردم، دەســـتەی لێکۆلینەوەکە لە عەقید عەلی کەســار و هەردوو دادوەر فەیســـەڵ ئەوســـی و وەحید حافز پێکهاتبوون کە هاوڕێی کۆلیژی مافم بوون و، لە هەندێ کاری لێکۆڵینەوەش ، ئەوکاتەی پشکنەری گشتیی وەزارەتی چاکسازیی کشتوکالی بووم، لەگەڵمدا بەشدار ببوون. لێکۆلینەوەکە سەبارەت بە "تیکدانی سیستەمی دەسەڵات" بوو، ئیدی تۆمەتەکە بە وەڵامەکەی وەزارەتی چاکسـازیی کستوکاڵی سـەرەوە سرایەوە، مەسـەلەکەی دیکەیان ئەوەبوو کە سـەر بە بزاوتی لایەنگرانی ئاسـتی بوویمە و کتێبی"هاوپەیمانیی نێوان کرێکاران و جووتیاران"ی لینینم پێ گیراوە. نکۆڵیم لەوەی نەکرد ســـەربە بزاوتی لایەنگرانی ئاشـــتیمە چونکە بزاوتێکی مرۆڤایەتییە و کار بۆ پاراســـتنی بەســـەرییەت دەکا لە بەلایەکانی شـــەڕی ئەتۆمی، ڕەتمکردەوە کتێبەکەم هەبووبێ، جونکە ئەوان لەناو دیکتی هەوای نووســینگەکەی وەزارەتم دۆزیبوویانەوە و، ئەودەمی ئەو کتێبە قەدەغە نەبووە، باشـــە بۆ لەوێی بشـــارمەوە! کەواتە ئەوە دوای کودەتا شـــاردراوەتەوە ئەوکاتەی حکوومەتی نوێ ەو چاجۆرە چاپکراوانەی بە بەڵگەی تاوان داناوە. منیش لە بەیانییەکەی ٨ی ســـوباتی ١٩٦٣ ڕا لە نووســـینگەکەی خۆم دەوامم نەکردووە، بەپێی بەڵگەنامەی بوون ونەبوونی کەلوپەلی ژوورەکەم، کودەتایەکە لە زســـتانێ بووە و ئەو چاپکراوانەش لە هاوینێ و لەکاتی ئیشپیکردنی فێنککەرەوە دۆزراونەتەوە، ئیدی هەژماری کەلوپەل یان پشـــکنین دوای شـــەش مانگ پتر دوای کودەتا کراوە و خەڵکی دیکەش ژوورەکەیان بەکارهێناوە، بۆیە هەبوونی هیچ بەڵگەیەک ناکەوێتە سەرشانی من.
بەڵام دەســتەی لێکۆلینەوە بە تۆمەتی "تیکدانی سـیسـتەمی دەسـەڵات" و سـەر بە بزاوتی لایەنگرانی ئاشتی و خاوەنداریی چاپکراوی قەدەغە، هەواڵەی دادگای شۆڕشیان کردم. جا

دەستەی لێکۆڵینەوە لێیان پرسیم داخوا لە دەستەیەکی دی، سەبارەت بە حیزبی بوونم، لێکۆلینەوەیان لەگەڵ کردووم، ئیدی بە بەڵێ وەلاممدایەوە و لەوبارەوە لێکۆلینەوەیان لەگەڵ نەکردم

لەگەڵ کۆتاییهاتنی لێکۆڵینەوە سەرۆکی دەستەکە لێی پرسیم داخوا حەزملێیە لە بەغدا بمێنمەوە، چونکە لێکۆلەنەوە تەواوبووە و ئەگەر وابنووسێ ئەوا دەمبەنەوە بەندیخانەی نوگرە سەلمان ئیدی داوامکرد لەبەغدام بهێڵنەوە، ئەویس نووسیی لێکۆڵینەوە هێشتا تەواو نەبووە و، داوای کرد لێرەم بهێڵنەوە بۆ تەواوکردنی لێکۆڵینەوە و، گەرامەوە بەشی سیاسیی بەندیخانەی بەغدا.

لەو ماوەیەی لە بەندیخانەی بەغدا بووم دەستەیەکی دیکەی لێکۆڵینەوە ی سەرکردایەتیی هێزی ئاسمانی دیسان بۆ لیکۆڵینەوەی تۆمەتی تەقاندنەوەی فرۆکە جەنگییەکانی سەردەمی قاسم هاتن و منیش وەلامم نەخێر بوو. دەستەکە دیتییان وەلامەکەی پێشترێم کورتە و منیش واژووم نەکردووە و دەستەکەش باوەریان بە پووچیی تۆمەتەکە هێنابوو.

## ڕووداوێکی سەیری بەندیخانەی بەغدا:

ڕۆژێکیا مەئموری بەندیخانە هاتەلام و گوتیدکتۆر عەبدولکەریم هانیی وەزیری کار و کاروباری کۆمەڵایەتی سەردانی بەندیخانە دەکا. ئیدی دەبێ لە ژوورەکان بێنەدەرێ و بۆ پێشوازیکردنی لە حەوشەکەی ڕیزبن. گوتم: بۆ ئێمە قوتابیی باخچەی ساوایانین تا بۆ پێشوازیی وەزیری ڕیزبین؟ بەشی زۆری بەندییەکان وەزیری پێشوون وسەنگی خۆیان لەناو کۆمەڵگەدا هەیە، ئیدی چۆن بەو جۆرەی پێشوازیی وەزیری بکەن؟ تووڕەبوو دەرگاکەی بەتوندی داخست،، دوای تۆزێک محەمەد حەسەن تائیی بەڕێوەبەری بەندیخانە. کە مرۆڤێکی هێمن و ژیربوو، بەدوویدا هەناردم و پرسیاری ئەوەی کرد چی لەنێوان من و مەئمووری بەندیخانە ڕوویداوە، سکاڵی لە دژەمن کردبوو. جا هەڵوێستەکەی کابرام بۆ روونکردەوە، بەدوای مەئمورکەیدا نارد و پێگوت: "کوڕەکەم، ئەوانە تا دوێنێ وەزیر بووینە، تەمەننامان دەکرد ڕازیبن بمانبینن، ئەوەش مەسەلەیەکی سیاسییە و ڕەنگە سبەینێ ئەوان پێکبێنەوە و هەندێکیان بچنەوە وەزارەت، من پێموانییە وەزیری بەڕێز داو لە محەممەد حەدید یان ئەحمەد محەممەد یەحیا یان محێدین عەبدولحەمید بکا، بەو شێوەیەی داوات لە موکەڕەم تاڵەبانی کردووە، بچنە پێشوازیی، جا ئەگەر وەزیری بەڕێز ئارەزوو بکا سەردانی ئەو بەشە بکا با بەخۆی هەڵبیژێری چۆنی دەکا، ئەگەر منیش لەجێی ئەو بوومایە سەردانی ئەوانەم دەکرد و سڵاوم لێ دەکردن. ڕاستییش، وەزیر هاتە بەشەکە و بەژوورەکاندا گەڕا، بەڵام بێ سەلام و کەلام.

## لەبەردەم دادگای شۆڕش:

دادگای شـۆڕش دادگایەکی نائاسـاییە و حکوومەتە سـەربازییەکان و شـۆڕشـگێڕییەکان پێکیدەهێنن تا دوژمنانی شــۆڕش یان کودەتای پێ دادگایی بکەن، واتە ئەوانەی لایەنگری دەسـەڵاتی پێشـتری بووینە. ئەو دادگایەس پێکهێنرابوو لە عەمید عەبدولڕەحمان تکریتیی سـەرۆکی دادگا و عەقید خالد شـێخلی و عەقید ئەحمەد مەحموود نعێمی و، داواکاری گشتییش ڕاغب فەخریی مافناس بوو.

ئەوەی خۆشبوو ئەوەبوو کە هەریەک لە حەمید ناسری بەڕێوەبەری گشتیی بەروبوومی خورما و مامۆستا نەعیم بەدەویی بەڕێوەبەری گشتیی بازرگانیجوونە بەردەم ئەو دادگایە و، ئەعیم بەدەوییان ، هەر لەبەر ئەوەی جنێوی بە شـۆڕشـی کوردی و مەلامسـتەفای بارزانی نەدابوو بە دەسـاڵ کاری قورس بەندکردبوو، لەبیرمە، دوای ڕێککەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ بەندێکی تێدابوو ئەوانەی لەسـەر کێشـەی کورد حوکمدرابوون ماوەی بەندییەکەیان بۆ بە خزمەت دادەندرا، ئیدی مەسـەلەکەی نەعیم بەدەویم خسـتە بەردەمی سـامی عەبدوڕەحمانی وەزیری کاروباری باکوور تا بەغەمی بکا و لەبەرانبەر ئەو هەڵوێستە سکۆمەندانەیەی بەرانبەر شۆڕی کورد ڕێزی لێ بگیرێ، بەڵام ئە ڕەتیکردەوە و ئەنجەتیشی ئەوەبوو عارەبە و بڕیاروکو نایگرێتەوە.

لە گرتووخانەکە، عەقید سەلمان حیسانمان لەگەڵدابوو، هەرچەندجاری کەسێکیان ببردبایە دادگای شۆڕش یان ەنجوومەنی عورفیی سەربازی، دەنکە حەبێک ڤالیۆمی هێورکەرەوەی دەدایە، دەیگوت؛ پیاوی خراپن، ڕەنگە هەندێ قسـە بکەن و تووشـی هەڵچوونت بکەن و خۆت لەبیربچێ، ئەو دەنکە هێورکەرەوەیە بخۆ.

ئەو ڕۆژەی بۆ دادگاییکردن داوایان کردم،وەک خووی خۆی بەخۆ و بە دەنکە ڤالیۆمەوە هاتەلام، بەڵام من داوا سـێدەنکم لێکرد، سـەری سـوڕما چونکە سـێ دەنک زۆرە و نابێ بخورێ، گوتم من هەڵناچم و دەمارم ناگیرێ و پێویسـتم بە هێورکەرەوە نییە، بەڵام ئەو سێ دەنکە دەدەمە ئەندامانی دادگا تا هێور ببنەوە وبەرگەی قسەکانم بگرن.

لە ڕۆژی دادگای ڕێکەوتی سـێشـەممەی ١٤ی کانونی دووەمی ١٩٦٤، دادگاییکردنەکە بەسـەرۆکایەتیی عەمید عەبدولڕەحمان تکریتی و خالد شـێخلی و عەقید حوسـێن عەبدولجەبار لە سەعات دە دەستپێکرد و داواکاری گشتییش ڕاگب فەخری بوو.

_ سەرۆکی دادگا پرسیی: ناوت؟ گوتم موکەڕەم جەماڵ تاڵەبانی

_ تەمەنت: ٤٠ ساڵ.

_کارت: پشکنەری گشتی لە وەزارەتی چاکسازیی کومەڵایەتی.

_ لە کوێ دادەنیشی؟: بەغدا- وەزیرییە.

ئەوجا ڕاغب فەخریی داکاری گشــتی هەسـتایەوە، ئیدی خوێندنەوەیەکی دوورودرێژی خوێندەوە کە لە ڕاپۆرتی دژیەکی لە دژی من کۆکردبووەوە،کە لە دۆســییە چەندین ساڵەکەی بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتیمدا هەبوو. پوختەکەی ئەوەبوو:
تاوانبار یەک لە دامەزرێنەرانی پارتی دیموکراتی کوردســتانە و، یەک لە شــیوعیی هەرە دەمارگیرەکانی باوەڕی شـیوعییەتە و، لە ١٩٤٩حەوت سـاڵبەندیی بە کاری قورسـەوە بۆ براوەتەوە و ئەوجا سـێسـاڵیشـی لە دوورخراوەیی بەسـەربردووە. دوای شـۆڕشـی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لایەنگیری عەبدولکەریم قاســم بووە، وەزارەتی بازرگانی یاســای ئینحیســاری تووتنی هەمووارکردووەتەوە تا بتوانن بە بەڕێوەبەری گشــتیی ئینحیســاری تووتنی دامەزرێنن، چونکە پلە وەزیفییەکەی هیی ئەوەی نەبووە. لەســەردەمی ئەو بەڕێوەبەرایەتییەکە بە شـیوعییان سـیخناخ بووە کە هەموویان تاوانبار دایمەزراندوون و ئەو فەرمانبەرە قەومییە دڵســۆزەکانی خاکی نیشــتمانی دەچەوســاندەوە، وەکچۆن بێ ئەوەی ڕەچاوی هەستی عێراقییە قەومییەکان بکا تووتنی لە وڵاتە شیوعییەکان هاوردووە ئەو لە لایەنگرانی بزاوتی قەدەغەکراوی ئاشــتیی جیهانییە و بڵاوکراوەی شــیوعیی لەلا گیراوە و ، دەسەڵاتەکەی قاسمیش لەسەر شانی خەڵکانی وەک ئەو بنیاتنرابوو و یەک لەو کەسانەیە کە سیسـتەمی دەسـەڵاتیان تێکداوە. بۆیە، داوا لە دادگای ڕاوەسـتاوتان دەکەم لەبەر نکۆڵیکردنی لە خاکی نیشـتمان و تێکدانی سـیسـتەمی دەسـەڵات، توندترین سزای بدەن.
دوای تەواوبوونی خوێندنەوەکەی داواکاری گشتی، سەرۆکی دادگا لێیپرسیم:
_تۆ تاوانباری؟ گوتم نەخێر.
_ ئەدی ســەبارەت بەو تۆمەتانەی بەرەوڕووت کراونەتەوە چ دەڵێی؟ لە بەرگرییەکەم وەڵامیان دەدەمەوە بەڵام چەند تێبینییەکم هەیە و دەیانخەمە بەرچاوی دادگای بەڕێزتان.
پارێزەرت هەیە: نەخێر.
دەتەوێ پارێزەرێک بگری؟؟ وەڵاممدایەوە من مافناسـم و چەند ین سـاڵ کاری پارێزەریم کردووە و دەتوانم بەرگری لە خۆم بکەم، کە داواکـاریش مکوڕبوو پـارێزەرێـک بگرم پێمگوت: تۆ مەبەستت لەو سووربوونەت چییە، هەردەتەوێ لە ڕاهی خوای سوودێکت پێ پـارێزەرێـک هەبێ؟ من، لەخوا بەزیـاد بێ، بەدەســتی بەتـاڵ و گیرفـانی بەتـاڵەوە لە فەرمانبەری هاتوومەدەرێ، پارەم نییە بیدەمە پارێزەر.
_ سەرۆک : تێبینییەکانت چ بوون؟
_ بەڕێز ســەرۆکی دادگا، داواکاری گشــتی دەڵێ من لە هەرە هاریکارەکانی عەبدولکەریم قاسم بوویمە و دەسەڵاتەکەی ئەو لەسەر شانی هیی وەک من بنیاتنرابوو. پەیوەندیی من

کاتی دەســـتبەکاربوونەکەی ئاگاداری دەکاتەوە، ئیدی ئەویش فەرمانێکی کارگێڕیی پێ دەردەکا، مادام کاتی دەســـتبەکاربوونی پێش ســـەعات دوازدەیە، فەرمانی کارگێڕییەکەی ئاوا دەبێ "پێش نیوەڕۆ دەستبەکار بووە" نەک "پاش نیوەڕۆ"ئیدی فەرمانەکە بەپێی یاسای خزمەت دەرچوو ودکتۆرئەنوەر عەلیی بەڕێوەبەری ناوچەکەش واژووی لەســـــەر کرد. ڕاســـتیی کارەکە ئەوەبوو. بەڵام بۆیە ئەو بابەتە لەدادگا ورووژێندرابوو چونکە مونزیر دواتر بە کوشتنی کەسێک تاوانبار کرابوو گوایە لەسەر ململانێی سیاسی لە کازمیە ئەو کەســـەی کوشـــتووە و فەرمانی لەســـێدارەدانی بۆ دەرچووبوو و چونکە وکدەتایەکیش ڕوویدابوو و بەڕێوەبەری گشتییس درابووە دادگای شۆڕش، ئیدی هەلپەرستان ئە وەیان بە هەل زانیبوو تا گەواهیم لە دژی بدەن.

دادگا بانگی ئەنوەرعەلیی بەڕێوەبەری ئینحیســـــاری تووتنی بەغدای وەک شـــایەد کرد. دکتۆرعەلی بەبنەچە عارەب بوو و بە باوکیان دەگوت"عەلی موســـڵاوی" بۆ بازرگانی هاتبوونە کەرکووک ولەوێ کیژە تورکمانێکی هێنابوو و چونکە خانەوادەکەس لە گەڕکێکی تورمانان بوون ئیدی ببوونە تورکمان. کە بەڕێوەبەرایەتیی ناوچەی بەغدام بەجێهێشـت تا بەڕێوەبەرایەتیی گشـتی وەرگرم، پێم باشـبوو لەو پۆســـتە دامەزرێ، چونکە بڕوانامەی دکتۆرای لە بواری ئابووریی کشتوکاڵی لە زانکۆی ئەستەمبۆڵ وەرگرتبوو.

دکتۆر ئەنوەر گەواهیی لە دژی دام و گوتی: ئەو تەنیا شـــیوعییەکانی دادەمەزراند و، کە لێم پرسی ئەدی تۆ کێ دایمەزراندی و ئەرێ تۆ شیوعیی؟

ســەرۆکی دادگا پرسـیی: ئەو تمەتبارە تۆی دامەزراند؟ گوتی: ئەو هەر سـایسـتەیی خۆمی داومەتێ. ســەرۆکی دادگا بەروویدا هەڵشـاخا:برۆ دەەوە ئەوە پاداسـتی چاکەیەتی؟ئەوجا بانگی سەلمان متەوەلیی سەرۆکیتێبینەران کرا، ئەویش باسی کێشەی مونزیر ئەبولعیسی کرد. ئەوجا سەرۆکی دادگا لێیپرسی: تۆۆ حەجیماڵی خوات کردووە، بە ویژدانەوە پێمان بڵێ هەڵسوکەوتی تۆمەتبار لە فەرمانبەریدا چۆن بووە؟ گوتی بەخوا، بەو ماڵەی حەجم بۆ کردووە بەدرێژایی ئەو ماوەیەی لەو بەڕێوەبەرایەتییە بوویمە بەڕێوەبەرێ وەک ئەو پاک و دادپەروەرم نەدیوە. سەرۆکی دادگا گوتی ئێمە باوەر بەو گەواهییە دەکەین.

ئەوجا بانگی عەبدولکەریم مســـتەفای شـــایەد کرا. ئەو هەرباســـی دامەزراندن و دەستبەکاربوونی مونزیر ئەبولعیسی دەکرد و، گوتی تۆمەتبار تەنیا پشتی بە شیوعییەکان دەبەســـتا، ئیدی ڕســـتێک ناوی هێنان زۆربەیان شـــیەعی نەبووندوای چەند وجوونی شایەدەکان دادگا چارەکە سعاتێکی وچان ڕاگەیاند و، دوایە کە دادگا دانیشتەوە، سەرۆکی دادگا دووپاتیکردەوە دادگا ســـوورە دادپەروەری دەســـتەبەر بکا و، مافی بەرگریی دایە تۆمەتبار و دەبێ گەواهییەکانیش بژار بکرێن و ئەوانەی لە پاڵنەری کەســـییەوە یان

هەڵبەستانەوە هاتوون وەلابنرێن. هەرچیی لە دادگایس گوترا هەمووی لەبەرچاو ناگرێ، بەڵکو مکورە هەموو ئەو ستانە لەبەر ڕۆشنایی ڕاستی و یاسا و دادپەروەری بژار بکا.
ئەوجا داوای لێکردم بەرگریی خۆم پێشکەش بکەم، بەڵام داوای کاتم کرد و گوتم تا سێشەممەمەی دادیم بدەنێ تا بەرگرییەکەم بنووسمەوە و بەڵگە بەرگرییەکانمی تێدا بنووسمەوە کۆکەمەوە. سەرۆکی دادگا گوتی کێشەکەی تۆ لەوەی سادەترە کە تەخمینی دەکەی، بۆ ئێستا بەرگرییەکەت پێشکەش ناکەی و کێشەکە کۆتایی بێ؟ بەڵام هەر سووربووم مۆڵەتم بدرێتێ و ئەویش ڕازیبوو.
داوام کرد تاوادەی دادگا بە کەفالەت بەربدرێم، دوای شەن و کەوکردن دادگا بڕیاریدا بە کەفالەتی کەسێکی دستەبەریی هەزار دینار بکا بەربدرێم بەو مەرجەی لەبەغدا نەچمەدەرێ، بەلام ڕەشید موسڵحی دادوەری گشتیی سەربازی لەسەر دۆسییەکەی نووسیبووم "بەڕەزامەندیی ئێمە نەبێ بەرنەدرێ"، ئیدی دادگا بڕیارەکەی بۆ دادوەری گشتیی سەربازی هەنارد تا بە بەردانم ڕازیبێ، بەلام شایەدێکی دیتبووی گوتی ڕەشید موسڵح دەینەراند و گوڕەشەی دەکرد و جنێوی بە دادگا دەدا چونکە ڕازیبووە بەربدرێم، ئەو ڕازی نەبوو، دوایە زانیم دادگا لە بێتاوانیم دڵنیابوو و، دەیویست لەسەر ئەوەی ئەندامی بزاوتی لایەنگرانی ئاشتیم شەش مانگم بۆ ببڕێتەوە و،، کە ئەو ماوەیەشم بە ڕاگیراوی بەسەربردبوو ئەوا یەکسەر ئازادیان دەکردم. بەڵام ئێستا دادوەری گشتیی سەربازی هاتووەتە ناو کارەکە و فشار دەخاتە سەر دادگا تا بەهەر جۆریک بێ حوکمم بدا.
پێموابوو دانیشتنی دادێ هەر بۆ گوێ لە بەرگری گرتنی من و دەرکردنی حوکمەکە دەبێ، بەڵام سەرم سوڕما دادگا داوای شایەدی دیکەی کردبوو و، یەکەم شایەدیش عەلی واسیتیی هەلپەرست بوو، ئەو لەسەردەمی باقر حوسێنیی بەڕێوەبەری پێشترێ ئاڵای شیوعیی بەرزدەکردەوە و لەپێشەوەی ڕێپێوانەکان سەمای دەکرد، ئیدی کردبوویە ئەفسەرئاسایشی بەڕێوەبەرایەتی، ئەرکی ئەفسەر ئاسایشیش دەستەبەرکردنی موڵکی دەوڵەت و ئاسایشی کارمەندانی بەڕێوەبەرایەتییە، بەڵام عەلی واسیتی خۆی کردبووە دەسەلاتێکی ئاسایشیی سەر فەرمانبەران. کە من بەڕێوەبەریی فەرمانگەکەم وەرگرت، لەسەر سکاڵای فەرمانبەران لەو ئەرکەم دوورخستەوە و بردمەوە سەر کارەکەی پێشترێ. ساڵح سەبریم کردە ئەفسەر ئاسایش کە مرۆڤێکی سەنگین بوو و هەمووش خۆشیان دەویست، ڕێنمایی ئەوەشم دایە جۆن مامەڵە لەگەڵ فەرمانبەران و سەردانیکەران دەکا و ئیدی جێی ڕەزامەندیی هەمووان بوو.

عەلی واسیتی بە گێرانەوەی دامەزراندنی مونزیر ئەبولعیس دەستی بە گەواهیدانەکەی کرد و گوتی، تۆمەتبار مونزیری وەک خەلاتی کوشتنی هاوولاتی عەبدولئەمیر تەویل دامەزراند، گوتیشی تۆمەتبار پێشتریش حوکمدراوە و لە شیوعییەکان بترازی کەسی دیکەی دانەدەمەزراند و، منی لە ئەرکی ئەفسەر ئاسایشی دوورخستەوە چونکە شیوعی نەبووم، لێرە سەرۆکی دادگا، کە پەیامنێرانی ڕۆژنامان و گوێگرێکی زۆریش لە دادگابوون- گوتی موکەڕەم شیوعییە، بەلام شیوعییەکی ئاقلە، پێیوابووە ئەگەر عەلی واسیتی ئەرکی ئەفسەر ئاسایشی بەدەستەوەبێ ناوبانگی شیوعییەکان خرا دەکا، بۆیە بۆ ڕازیکردنی خەلکەکە شیوعییەکی دیکەی ئاقلی لەجێ دانا و دلی خەلکەکەی ڕاکێشا. ئەوجا سەرۆکی دادگا داوای لێکردم بەرگرییەکەم **پێشکەش** بکەم و منیش بەرفریم لەخۆم کرد.

## بەرگرییەکەم لەبەبەردەم دادگای شۆڕش:

بەڕێز سەرۆکی دادگا و ئەندامە بەڕێزەکان:
من لەو بەرگرییەمدا ئاماژە بۆ هەندێ بابەت دەکەم کە لە لێکۆڵینەوە و لە دانیشتنەکانی ئەو دادگایەدا لەدژی من ورووژێنراون و، لەو ڕاپۆرتانەشدا کە بەڕێوەبەرییەکانی ئاسایش بەزکراونەتەوە.

هەر لەبەر ئەوەی دژی پەیماننامەی پۆتسمۆث بووم و لە دژی دەسەلاتی مەلەکیی کۆنەپەرستی دژەگەل لەگەڵ گەلدابووم، ساڵی ١٩٤٨ گیرام و لە ئەنجوومەنی عورفیی سەرازی حەوت ساڵ حوکمدرام و سێ ساڵیش لەژێر چاودێری و نیشتەجێی زۆرەملیدابووم. دوای تەواوبوونی بەندییەکەم بۆ "بەدرە" دوورخرامەوە و دوایەش بۆ کفری تا ماوەی ژێر چاودێرییەکەم لەوێ بەسەرببەم، هەتا لە ١٤ی تومموزی ١٩٥٨ گەل و سوپا دژی دەسەلاتی مەلەکی ڕاپەڕین و منیش گەڕامەوە کەرکوکی جێی لەدایکبوونم و خەریکی پارێزەری بووم.

ئاماژەتان بۆ ڕاپۆرتێک کرد، کە ئەودەمەی لە کەرکووک خەریکی پارێزەری بووم، میوانداریی هەردوو پارێزەر شەریف ئەلشێخ و کامل قەزانچیم کردووە. بەڵێ میوانداریم کردوون چونکە ئەوان هاوپیشەم بوون وهاتبوونە کەرکووک تا لەبەردەم دادگای سزا لەبەرگری کردن لە کرێکارەکانی کۆمپانیای نەوت دا بەشداریم لەگەڵ بکەن کە لە ١٩٤٦ مانیان گرتبوو و پێیشم وا نییە ئاسایش بۆ بەرگریکردنم لە داوایەکی ئاوادا نووسراوی سوپاسگوزاریم بۆ بنێرێ.

هەرچی بابەتی دامەزراندنی عەلی مەحمود فەرەج و عەلی واسیتییە، ئەوا دامەزراندنیان پێش وەرگرتنی پۆستی بەڕێوەبەریی گشتییە، بەڵکو پێش دامەزرانیشمە و، مافی ئەوەسم نییە پرسیاری ڕچکە و مەیلی سیاسیی فەرمانبەران بکەم، بگرە هەڵسەنگاندنیشیان لەسەر بنەمای شیاوی و مەرجی یاساییە و دامەزراندنی فەرمانبەرەکانی بەڕێوەبەرایەتییەکەم یاسایی و دروست بووە.

هەرچی بابەتی مونزیر ئەبولعیسە کە ئێستا ئەو هەمووهەرایەی لەسەر دروستکراوە، ئەو نووسراوەکانی دامەزرانی بە پلەی نووسەر"کاتب" وبە مووچەی مانگانەی ١٣ دینار پێشکەش کرد. مەرجە یاساییەکانی، لەوانەش حوکم نەدرابێ، لەودا هەبوون، کە داشمەزرا هیچ تۆمەتێکی لەسەر نەبوو. کە ئاسایشیش ویستیان بەشێوەیەکی نایاسایی بیگرن، نارەزاییەکم سەبارەت بەوە **پێشکەش**کرد کە ئاسایش ڕێوشوێنە یاساییەکانیان لە گرتنی فەرمانبەرێکی بەڕێوەبەرییەک پێشێل کردووە نەک لەسەر ئەوەی بە کوشتنی کەسێک تۆمەتبار کراوە، چونکە دەبوایە نووسراوێک بدرێتە سەرۆکی بەڕێوەبەرییەکە و تێیدا

داوای جێبەجێکردنی بڕیارێکی دادگایی بۆ گرتنی جێبەجێ بکرێ، تەنیا لەکاتی ڕەزامەندییس بڕیارەکەی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، ئەگەر سەرۆکی فەرمانگەکەش ڕەتیکردەوە، ئەوا ئەوکاتە دەگیرێ کە لە فەرمانگەکەی چووە دەرەوە.
بەڕێز داواکاری گشتی ئاماژەی بەوەدا کە من لە نزیکەکانی عەبدولکەریم قاسم بوویمە. بەڵێ ئەو پێشنیاری موتەسەڕیفیی لیوای کەرکووکی بۆ کردم و منیش مەرجی ئەوەم هەبوو کە دەبێ هەموو گیراوەکان و دوورخراوەکان بەربدا تا ئەو ئەرکە قبووڵ بکەم. بەڕێز وەزیری دەرەوەس داوای کرد لە چیکۆسلۆڤاکیا ببمە باڵیۆزی عێراق، ڕەنگە ئەوەش بەئاگاداری یان ئاماژەی عەبدولکەرم قاسم بووبێ، بەلام من لەبەر هۆی تایبەت قبوولم نەکرد و، وەزارەتی ساەوانییەکانیشی خستە بەردەمم، بەڵام من مەرجەکانیم قبووڵ نەکرد و ڕەتمکردەوە.
هەرچی لیژنەکانی پاراستنی کۆمارە، ئەو لیژنانە یەکسەر دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ لە هەموو دامودەزگاکانی دەوڵەت دامەزران. من لە ١-١-١٩٥٩ دامەزرام و ئەو لیژنانە هەبوون و ئەرکی ئەو لیژنانەش پاراستنی ئەو دامەزراوە حکوومییانە بوو کە هیچ گۆڕانکارییەکیان بەرانبەر هیچ دژەبزاوتێک تێدا نەکرابوو.
هەرچی دامەزراندنی دکتۆ عەلییە ئەو دادگا بەڕێزە دەزانێ ئەو چەندە دژی شیوعییەکان بووە و کەسێکی ئەوەندە سپڵەیە،سەرباری ئەوەی من لە پۆستێکم دامەزراندبووکە دوای پۆستی بەڕێوەبەری گشتی گرنگترین پۆستە ونیسانەی ئەوەیە لەبەی مەیلی سیاسییان جیاوازی لەیوان خەڵکەکە ناکەم، کەچی گەواهییەکی دژی من هەڵبەستا.
بەڕێز داواکاری گشتی باسی ئەوەی کرد کە من داوام لە داواکاری گشتیی دادگای گەل کردووە سزای لەداردان بەسەر عەمید ڕوکن نازم تەبەقچەلی و هاواڵەکانیدا بسەپێنی. پرسیار ئەوەیە تۆبڵێی داواکاری گشتی ئەرکەکانی خۆی نەزانێ! دوایەش دادها بڕیاری حوکم دەردەکا نەک داواکاری گشتی و ئەوجاس با بڵێ ئەو قسە بێ بنەمایەی لەکوێ هێناوە؟ ئاخر گەواهیدا بەیەک لە هەستەکان دیاریدەکرێن، وەک ئەوەی بڵێ دیتم یان گوێم لێبوو، یان بەڵگەیەکی نووسراوم دیتەوە یان شتێکی لەو بابەتە. تەبەقچەلی، خوای لێ خۆشبێ، برادەرم بوو، من یەکەم کەس بووم لە کەرکووک سەردانم کرد و ڕامگەیاند لەگەڵ شۆڕشدام و، یەکەم کەسیس بووم هارکاریم کرد تا بارودۆخی ئەوێ سەقامگیر بێ. داوایشی لێکردم ببمە سەرۆکی شارەوانیی کەرکووک و بە بە بێلایەنی و پاکیی منیدا هەڵدا، لەبەر هۆی خانەوادەییش ڕەتمکردەوە.
هەچی کۆمەڵەی هاوڕێیەتیی عێراقی- بولگارستانییە، ئەوا ئەو ڕێکخراوانە لە میسر و سووریا و جەزائیر و هیندستانیش هەیە، لە وەزارەتی ناوخۆش مۆڵەتی دراوەتێ و، بە

چاوپۆشـــیش له هەڵوێســـتی حکوومەتەکانیان، له هەوڵی ئەوەیدایە پەیوەندیی هاوڕییەتی لەگەڵ گەلان دروست بکا.
ســـەبارەت مەســـەلەی ئەندامیم له بزاوتی ئاشـــتی، بزووتنەوەیەکی جیهانییه و ئامانجی ئەوەیه مەترسیی شەڕی ئەتۆمی له دنیا دوورخاتەوه و ئاشتی نێون گەلاندا بەرکەماڵ بێ. ئالێرەدا ســـەرۆکی دادگا قســـەکەی بڕیم و گوتی: ڕێکخراوەکه بی مۆڵەته، گوتم: من موســـڵمانم ســـوننەم ئەوانەس مۆڵەتیان له وەزارەتی ناوخۆ نییه "هەموو ئەوانەی له مۆڵەکەبوون پێکەنین"
ســـەرۆکی بەڕێز هەر ئەوەندە بەســـە ئامارێک بخەمە ڕوو تا بزاندرێ مەترســـییەکانی شـــەڕێکی نوێ چەند زۆرن، نیکیتا خرۆشـــۆڤی ســـەرۆکی دەوڵەتی ســـۆڤیەتی لەبەردەم ئەنجوومەنی ســـۆڤیەتی باڵادا گوتی، کۆگەکراوی چەکە ئەتۆمییەکانی ئەو دەوڵەتانەی چەکی ئەتۆمییان هەیه بای ئەوەیه بڵێین هەر تاکەکەسێکی سەرزەوی هەشتا تەن باروتی پێدادرێ. ئەوەش مانای وایه ئەو دەوڵەتانه هەشتا تەن باروتیان بۆ هەریەک لەوانەی ناو ئەوهۆڵەدان ئامادەکردووه تا له شـەڕێکدا بەکاری بهێنن که نه سیر و نه پیوازێکی ئێمەی تێدا نییه. باشـه مافی هەر مرۆڤێک نییه بیر له دوارۆژی مرۆڤایەتی و ژیانی کەسـوکار و منداڵەکانی بکاتەوه؟ ئەندامبوونی ئەو ڕێکخراوه تاوان نییه، بەڵکو به پێچەوانەوه ئەرکی مرۆیی هەموو کەسێکه.
هەرچی واژووی سەر ئەرزوحاڵی سووککردنی سزای لەداردانه، ئەوەیان پلەنرێکی مرۆیی و نیشتمانیی هەبووه و هەر بۆ کەسێکیش داوا نەکراوه، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی بووه، من له ململانێ سیاسییەکاندا ڕقم لەو سزایەیه.
سەبارەت به ئەندامیی پارتی دیموکراتیی کوردستانیش، ڕوونمکردەوه که ڕۆژێل له ڕۆژان ئەندامی ئەەو حیزبه نەبوویمه و، بەڕێز داواکاری گشـتییش نەیتوانی بیسـەلمێنێ سـەر به هیچ حیزبێـک بووبم و، من جوداخوازیش نەبوویمه و خەڵـک دەزانن چەنـده مکوڕی یەکگرتوویی نیشـتمانی بوویمه. بۆیه، ئەو کارانەی داواکاری گشـتی باسـیکردن به تاوان دانادرێ، ئیدی داواکارم بڕیاری بێتاوانیم دەربکەن و سوپاس.
دوای چارەسەعاتێک شەن و کەو، دادگا دیسان دانیشتەوه پێچەوانەی ڕێوشوێنی دادگایی، که دەبێ بەرگریی تۆمەتبار دوا شـتی دادگابێ و ئەوجا دادگا بۆ هەڵسـەنگاندنی بەڵگەکان و لێوردبوونەوەی بەرگریی تۆمەتبـار تەنیـا دەبن و دواترێ بڕیـاری بێتـاوانی یـان تۆمەتباریی دەدەن، کەچی دیســان دەســتیان به لێپرســینەوه کردەوه لەگەڵم. پێیشـموایه دادگا هیچیان بۆ پاســاوی تاوانبارکردنم نەدۆزییەوه و، پێشــتریش ئەوەیان نەدەویســت،

بەڵام ئێستا کەوتبووە ژێر فشاری دادوەری گشتیی سەربازی، ئیدی بەدوای شتێکدا دەگەران منی پێ تاوانبار بکەن و، گفتوگۆیەکانیش بەوجۆرەبوون:
_سەرۆک: تۆ شیوعیی؟ گوتم: نەخێر.
_چوویتە ڕیزی لایەنگرانی ئاشتی؟ بەڵێ لە ١٩٦١.
_ ئامانجەکانی چییە؟ وەک گوتم، دوورخستنەوەی مەترسیی هەڵگیرسانی شەڕێکی جیهانیی ئەتۆمییە و چارەسەرکردنی کشە نێودەوڵەتییەکانیش بە شێوەیەکی ئاشتیانە.
_ ئیبراهیم ئەحمەدی پارێزەر لە کۆمەڵەی لایەنگرانی ئاستییە، ئێستا لەکوێیە؟
_ وەڵاممدایەوە ئەو سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستانە، شتێکی ئاساییە لەگەل بزووتنەوەی کوردی بێ.
ئەوجا سەبارەت بە کۆمەڵێ کەسایەتیی نیشتمانی و دیموکراتی و شیوعی دەستی بە پرسیاران کرد. منیش نکوڵیم لە ناسینی زۆربەی ناوەکان کرد.
_ بخاوتی لایەنگرانی ئاشتی برایەتی و هاوڕایی بزاوتی شیوحیی کردووە؟ بەڵێ هەردوو بزاوتەکە، تەنیا لە خەباتی چەپارەکردنی مەترسییەکانی شەڕ و پاراستنی ئاستیی دنیا، هاوڕاهی یەکدیبوون. هەرچی بزاوتی ئاستییە، وەک گوتم، حیزبێکی سیاسی نییە، هەر لەو ناوانەشرا، کە ئێوە باستان کردن، دەردەکەوێ ئەندامەکانی لە بیروڕای سیاسی و توێژی جودای کۆمەڵایەتییشن.
_ ئەو دووە لێکدی جودان؟
_ بەڵێ جوداییەکی زۆریش، حیزبە شیوعییەکان حیزبی سیاسین و کار بۆ بەرپاکردنی سۆشیالیزم دەکەن، هەرچی بزاوتی ئاشتییە بزاوتێکە بەرفراوانییەکی ناوازەی هەیە و دەکرێپیاوێکی ئایین و عەلمانییەک و شیوعییەک و پارێزکارێکی کۆنەپەرستیش کۆکاتەوە و، کرێکار و سەرمایەداریش پێکەوە کۆکاتەوە، واتە هەموو ئەو کەسانەی باوەریان بەوەی هەیە کە دەبێ مەترسییەکانی شەڕی ئێتۆمی دووربخرێتەوە و ئاشتی پارێزراو بێ.
_ بۆ لایەنگرانی ئاشتی چوونە مووسڵ و، کێ قەسابخانەکەی موسڵی بەرپاکرد؟
_ گوتم ئامانجی لایەنگرانی ئاشتی ئەوە نەبووە کاری توندوتیژی بکەن و، ناسزانم کێ هۆی قەسابخانەکە بووە، بەلام توندوتیژییەکان لە دژبەرانی لایەنگرانی ئاشتیرا دەستی پێکرد.
_ لایەنگرانی ئاشتی لە عێراق لایەنگری وێرانی و مەرگن، تۆش دوای ئەو قەسابخانەیەی مێژوو نەوە دوای نەوە باسی دەکا، بوویە ئەندامی لایەنگرانی ئاشتی. دوایەش تۆ کە بەڕێوەبەری گشتیی چۆن ڕێگە بە کۆبوونەوەیەکی شیوعی دەدەی لە بەڕێوەبەرایەتییەکەت

بکرێ و عەلی مەحموود فەرەج لەو کۆبوونەوەیەدا داوا بکا حیزبی شیوعی لە دەسەڵات ببێتە هاوبەش ؟
ـ پێیم گوت: بەڕێزی دادوەر، تۆ مەسڵمانی و پێموابێ لەسەر مەزەبی حەنەفیی. ئەری، هەر بۆ نموونە، ئیسلام و مەزەبی حەنەفی، یان خودی خۆت بەرپرسیاری کارێکی کە حەنەفییەکی موسڵمان لە ئەعزەمییە بیکا؟ من نازانم پێچ و پەنای ئەو مەسەلەیە جۆنە و، لایەنگرانی بزاوتی ئاشتیش بزاوتێکی جیهانیی فراوانە و ملیۆنان لایەنگری هەیە و لەوانەش پیاوانی ئایین و زانا و ئەدیب.
هەرچی ئەو کۆبوونەوەیەیە گوایە لە بەڕێوەبەرایەتییەکەم کراوە، ئەگەر ڕاست بێ، شایەدەکان گوتیان لە ئێوارە و دوای دەوام کراوە و منیش ئامادەنەبوویمە و، ئەو ڕووداوە چەند ین ساڵ پێش هاتنە سەر دەسەڵاتی ئێوە بووە، کەواتە یاساو دەسەڵاتەکانی ئەودەمی لێی بەرپرسیارن و دەبوا ئەوان ڕێوشوێنیان بەرانبەر بگرتایەبەر، نەک ئێوە، کێشەکەس پەیوەندیی بەمنەوە نییە و ئەو دادگایەش تایەتمەندیی ئەوەی نیە لێیبکۆڵێتەوە.
ـ ئەدی کە مونزیر ئەبولعیس دەستگیر کرا بۆ نوسراوت بۆ وەزارەتی بازرگانی هەنارد؟
ـ گوتم ئەرکی سەرۆکی بەڕێوەبەرییە وەزارەتەکەی لەو جۆرە کارانە ئاگادار بکاتەوە، وەک پێشێلکردنی شکۆی بەڕێوەبەرییەکەم و بەخاندنی شێوازە یاساییەکانیش، ناڕەزاییم لە شێوازی بردنەکەی دەربڕی. من یاساییم و سنووری دەسەڵاتەکانی خۆم دەزانم و، ئەرکی منە داوابکەم ڕێوشوێنە یاسایەیەکان بگیرێنە بەر و ناڕەزایی بەرانبەر ڕێوشوێنە نایاساییەکان دەربڕم. پێشتریش ژمارەیەک فەرمانبەری قەومیبە فەرمانی دادوەری گشتیی سەرازی گیران، سەرەتا کارەکەیان خستە بەردەممتا ڕزامەندیی بە ڕێوجێی لەسەر بدەم، جونکە ڕاگرتن'گرتن'ی فەرمانبەرێک ڕەنگە کاروبارە فەرمییەکان بشڵەژێنێ و داخوا جیی دەوڵەتیشی لە ئەستۆدایە. ئیدی کارەکان بەوپێیە دەکرێن، لەسەر فەرمانەکەم نووسی جێبەجێ بکرێ و ئەوەش شتێکی بەڕێوجێیە. دوای لێکۆڵینەوەش بەریاندان و نووسراوی بەردانەکانیشیان بەڕێوجێ پێشکەشکرد، نووسیم ڕێیان بدرێ دەستبەکاربنەوە و کارەکان بەڕێکی کرانەوە، واتە خەرجکردنی مووچە ڕاگیراوەکانیان ئەو کارەش یاساییە.
ـ کڕینی تووتنە بولگارییەکە چییە؟
ـ کە کرامە بەڕێوەبەری گشتیی بەڕێوەبردنی ئینحیساری تووتن، توون لەکۆگاکان کەمبوو و، حکوومەتیش هاوردەی جگەرەی بیانیی قەدەغە کردبوویدی جگەرە لە بازاڕەکان کەمبوو و کارگەکان بە نیوەی توانای خۆیان کاریان دەکرد، پێشنیارم بۆ وەزارەتی بازرگانی کرد ڕازیبێ هەندێ تووتنی خۆرهەڵاتیی هاوشێوەی تووتنی عێراقی هاوردە بکەین، دوای ڕەزامەندییش بە پێی ڕێوجێی پێویست کەمکردنەوەمان ڕاگەیاند.

توركیا و یۆنان و بولگارستان هاتنەپێش و نرخ و نموونەی توتنی خۆیان پێشکەشکرد، نرخرکانی بولگاریا کەمترین نرخ بوو و نموونەی تووتنەکەیسـیان مەرجی پێویستی تێدابووو، بەڕێوەبەرایەتییش لەو مامەڵەیەدا "١٥٠" هەزار دیناری پتر پێبڕا و پارەکەی دایە قیسـتی یەکەمی دامەزراندنی ئەو کارگەی جگەرەیەی لە سـلێمانی بنیاتی نا. ئیدی سەرپێچیی ئەو کارە لە چ دایە و کێ بەو مامەڵەیە ڕازی نەبوو؟

_ مامۆستـا موکوڕەم تۆ کەسـێکی ئاقڵی، خووی گەلی عێراق نازانی؟ چۆن تووتن لە وڵاتێکی شیوعی هاوردە دەکەی؟

_ بەڕێز سـەرۆکی دادگا، من هەتا دڵنیا نەبووم مەترسـیی بۆ سـەر گەلی عێ نییە رازینەبووم ئەو تووتنە هاوردە بکرێ. من بازرگان و پیاوێکی کاری ناسـراوی وەک عەبدوڵلا لوتفییم هەبوو، کە سـەرمایەدارێکی گەورەی خاوەن کارگەی جگەرەیە. کە نموونەی تووتنەکانیان دامێ جگەرەیەکم دایە عەبدوڵلا لوتفی و تا داوا تا ئاغزەکەی کێشای، ئیدی عەبدوڵلا لوتفی، ئەو بازرگانە سەرمایەدارە نەبووە شیوعی، ئیدی دڵنیابووم ئەو تووتنە شـیوعییە هیچ مەترسـییەکی لەسـەر گەلی عێراق نییە "هەرچی لە هۆڵەکەی بوون پێکەنین".

_ بۆ بوویە ئەندامی کۆمەڵەی هاوڕێیەتیی عێراقی- بولگاری؟

_ تا لای دادگای بەڕێزڕوون بێ، تا واس لێکنەدرێتەوە لەخۆشـیی بولگارسـتانە لەبەر مامەڵەی تووتنەکە. من زۆر دوای دەسـبەردان لە ئینحیسـاری تووتن وگواسـتنەوەم بۆ وەزارەتی چاکسـازیی کشـتوکاڵی و بوومە پشـکنەری گشـتی ئەوسـا بوومە ئەندامی ئەو کۆمەڵە و مامۆسـتا محمەد حەدید سـەرۆکایەتیی دەکرد، ئەویش زۆر لەوەی دوورە ببێتە شـیوعی. زۆر کۆمەڵەی هاوڕێیەتییش لە زۆر وڵاتان هەیە و، دوور لەوەی سـیسـتەمی کۆمەڵایەتییان چییە و ئەو کۆمەڵانە پەیوەندییـان بە حکوومەتی ئەو وڵاتـانە نییە و کۆمەڵەکان ئامانجیان فراوانکردنی پەیوەندییە لەگەڵ گەلان و ئەوەش لە بەرژەوەندیی عێراقە.

_ پلەی زانسـتیت چی بوو تا وەزارەت یاسـایەکەی هەمواربکاتەوە تا بتوانێ وەک بەڕوەبەری گشتی لەو فەرمانگەیەت دامەزرێنێ و مووچەشت بای ئەوەی نەبووە؟

_ سـەرۆکی دادگای بەڕێز، ئەگەر سـەیرێکی ئەو بەڕێزانە بکەن کە پێش من بەڕێوەبەری گشتیی ئەو فەرمانگەیەبوون دەبینن، بۆ نموونە سەید باقر حەسەنی

کەمە خەڵکێکی دیکەش، ئەوان دووپلەیان سـەرا دانێ تاببنە بەڕێوەبەری گشـتی، ئەوەش بەپێی یاسـای ئینحیسـاری تووتن لە دەسـەڵاتی وەزیردابوو، جا منیش وەک ئەوانەی ئێشـەخۆم، وەزیر دەیتوانی پلەیەک یـان دوو پلەم بـداتێ تـا بێ ئەوەی پەنـا بۆ

هەمواركردنەوەی یـاســـــا ببردرێ، بکرێمە بەڕێوەبەری گشـــتی، بەڵام وەزیر هەربە ڕەقەکاری بۆ ئەوەی مووچەیەکی لە شـــایســـتەیی خۆم پترم نەداتێ، نەک بەپێی یاســـای ئینحیسـاری تووتن، بەڵکو بەپێی یاسـای خزمەتی مەدەنیی لە فەرماننگەکانی دی کاری پێ دەکرا، هنای بۆ هەمواری یاســا بردتا بە بەڕێوەبەری گشـــتی و بە مووچەی حەفتا دیناو دایمەزراندم لەجیاتیی ئەوەی دوو پلەم بداتێ و وەک ئەوانیدی بە مووچەی "١٣٠" دینار دامەزرێم. دوایەش من لە دوو بواردا خزمەتم کردووە، لە وەزارەتی بازرگانی و وەزارەتی چاکسازیی کشتوکاڵییش، جا ئەەر دادگای بەڕێز سەیری نمرەکانی دەرچوونی کلێژی مافم بکا، دەبینێ لە هەردوو وانەی یاســـــای بازرگانی و یاســـــای زەویوزارنمرەی تەواوم بەدەستهێناوە، واتە"١٠٠"نمرە، ئەوە لێزانیی من بوو، دوایەش بۆ سەبارەت بە لێهاتوویی و پاکیی من پرسیار لە شایەدەکان ناکەن؟ لەکاتێکدا هەرایەکتان لەسەر دامەزراندنی مونزیر ئەبولعیس بەرپپاکردووە و لەسەر دەستبەکاربوونی لە فەرمانەکەی"پێش نیوەڕۆ یان پاس نیوەڕۆ"، کە جیاوازیی مووچەکەی تەنیا "٤٠٠" فلســـە، باشـــە بۆ پرســـیاری باری ماددیی پێش دامەزران و پاس دامەزرانیشـــم، ئەواجا بۆ پرســـیاری هەڵســـوکەوتی فەرمانبەری و ڕەوشتی تایبەتیم ناکەن؟

_ دادوەر وەڵامیداوە:کەس تانە لە هەڵســـوکەوت و ڕەوشـــت و پاکیت ناکا، فەرمانگەکەت وەڵامی دادگای داوەتەوە کە هیچ ســـەرپێچییەکی دارایی و بەڕێوەبردنت نییە، ئێمە هەموو ئەو شتانە لەبەرچاو دەگرین، ئێستا ڕات بەرانبەر عەبدولکەریم قاسم چییە؟

_ پێمگوت: هەڵســـــەنگاندنی هەر کەســـێک لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکانی دەگرێتەوە . من ئێستا لە هەڵوێستێکدام پێویستە بەرگری لەخۆم بکەم نەک لە عەبدولکەریم قاسـم، ئێستا من لە باریکدا نیم تا  لایەنە چاکەکانی هەڵسـەنگێنم، بەڵام دەڵێم ڕێچکەی ئەو دواییانەی لە دەســـەڵاتدا ڕێچکەیەکی دیکتاتۆرییانەی دوور لە دیموکراســـی بوو، ئەوەش بۆ ئەوەبوو تا لە دەسەڵات بەردەوام بێ و بگرە لە مامەڵەی هێزە چەپ و ڕاستڕەوەکانیشدا ئەوی بەوی دادەدا و ئەوی بەویدی دادەدا، ئەوەی ســـەیربوو ئەوەبوو هەمووان بەدەنگییەوە دەهاتن و ئیدی دەبێ هەمووس بەرپرسیارییەکەی هەڵگرن.

_ڕات بەرانبەر حیزبی شـیوعی چییە؟ ئەو حیزبەی قەسـابخانەی دانا و کوشـتاری کرد و خەڵکیان بە شـــەقامەکاندا ڕاکێشـــا؟ ئالێرەدا داواکاری گشـــتی هاتە ناو قســـان تا هەندێ تۆمەتی دی بۆ حیزبی شیوعی زیادکا.

_ ســــەرۆکی بەڕێز، فیلێکیان هێنابوو تا چەند کوێرێک بزانن چۆنە، یەکیان جووەپێش و دەســـتی لەکلکی دا وتی فیل وەک پەت وایە. ئەوەی دووەمیان دەســـتی لە گوێچکەی دا، گوتی: فیل بە خوانچەی دەچی.ئەوەی ســـێیەمیان دەســـتی لە قاچی دا ، گوتی:فیل وەک

کۆڵەگەی ماڵە. جوارەمیان دەستی لە ورگی دا، گوتی: فیل وەک مەنجەڵە. بەلام کەسیان نەیانتوانی بەدروستی بزانن فیل چییە، چونکە هەموویان کوێربوون.
ئەگەرچی ئامادەبووان تێگەیشتن مەبەستم چییە، کە چی سەرۆک، بێ ئەوەی تیبگا من بە راشکاوی گوتم ئێوە هەمووتان کوێرن و نازانن ڕاستیی حیزبی شیوعی چییە، کەچی ئەویش لەگەل ئامادەبووان پێکەنی.
ئەوجا دادگا بڕیاریدا روانینە کێشەکە نیو سەعات دوابخا ت بڕیاری خۆی بدا، لە دووبارە گوی لە شایەدەکان گرتنەوە و پرسیار لێ کردنەوەم، پێدەجوو دادگا ڕێچکەی خۆی گۆڕیبێ و ملی بۆ فشارەکانی ڕەشید موسڵحی دادوەری گشتیی سەربازی دابێ.
**بڕیاری تاوانبارکردن:**
تۆمەتبار، موکەڕەم جەماڵ تاڵەبانی، بەڕێوەبەری گشتیی پێشتریی ئینحیساری تووتن و پشکنەری گشتی لە وەزارەتی چاکسازیی کۆمەلایەتی، بەپێی یاسای تێکدانی سیستەم هێنرایە بەردەم ئەم دادگایە، دوای گوێگرتن لە ناوەرۆکی تۆمەتبارکردنەکە و گەواهیی شایەدەکان و ئەو زانیارییانەی لەناو دۆسییەی داوایەکەدان و راپۆرتی وەزارەتیچاکسازیی کشتوکاڵیدەربارەی هەڵسوکەوتی فەرمانبەریی، پاسان گوێگرتنی دادگا لە بەرگریی تۆمەتبار، بەقووڵی گفتوگۆی لەگەڵ کرد. دوای پرسوڕادادگا لەرووی ویژدانەو گەیشتە ئەو بڕوایەی لە کارکردندا پاکە و لەرووی سیاسییەوە بێلایەنە و بەیەکسانی مامەڵەی کەگەڵ فەرمانبەران کردووە بێ ئەوەی جیاوازی لە مەیلی سیاسییان بکا، بۆیە دادگا بڕیدا لەسەر ئەو تۆمەتەی دەربارەی خراکردنی سیستەمی بەڕێوەبەری دراوەتە پاڵی ئازادی بکا دادگا لە ماددەکانی دیکەی تۆمەتبارکردن وردبووەوە، گەیشتە ئەو بڕوایەی چاپەمەنی و بلاوکراوەی قەدەغەی لابووە و ئیدی بەو پێیە بڕیاریدا توانباری بکا، تۆمەتبار لەبەردەم دادگاشدا دانی بەوەیدا نا کە سەر بە بزاوتی لایەنگرانی ئاشتیی قەدەغەکراوە، ئیدی بڕیاریدا بەپێی ئەوە تۆمەتباری بکا.

## بڕیاری حوکم:

له ڕێکەوتی ١٩٦٤/١/٢٢ دادگای شــۆڕش به ســەرۆکایەتیی زەعیم"عەمید" عەبدولڕەحمان تکریتی و ئەندامێتیی هەریەک له زەعیم "عەمید"خالد ڕەشــید شــێخلی و عەقید ئەحمەد مەحمود نعێمی و ڕێدراون بەناوی گەل دادوەری بکەن، پێکهات و ئەو بڕیارەی خوارەوەی دا:

١_ حوکمدانی تاوانبار موکەڕەم جەماڵ تاڵەبانی بەکاری قورس بۆ ماوەی ســێ ســاڵ بەپێی مادەی "١٥-١٤-٤"ی مەرســووم بەو مەرجەی ماوەی دەســتگیرییەکەی بۆ هەژمار بکرێ.

٢_ حوکمدانیشی به بەندیی توند بۆ ماوەی شەش مانگ بەپێی ماددەی"٤٣- ٣٢"ی یاسای کۆمەڵەکان، ئەو حوکمانه دوای یەک بەســەریدا جێبەجێ دەکرێن دای تەواوبوونی ماوەی حوکمدانی یەکەمی.

ئەوجا دادگا بڕەیەکی دیکەی بۆ بڕیارەکه زیادکرد که بخرێمه بەندیخانەی بەغدا، دوای ماوەیەک داوایەکم پێشکەشی دادگای سزای گەورەی ناوچەی بەغدا کرد چونکه دادگای شــۆڕش ســیفەتی ئەو تاوانەی دیاری نەکردبوو من لەســەری حوکمدرابووم، ئەویش بڕیاریدا به تاوانی سیاسیی دابنێ.

## جارێکی دیکەش لە بەندیخانەی ناوەندیی بەغدا:

گەڕێندرامەوە بەڕێوەبەریی بەشی سیاسیی بەندیخانە، مەئموورەکە بەپێی بڕیاری دادگا هەناردمییە بەنیخانەی ناوەندی، کەچی ثامر حەمدانی بەڕێوەبەری بەندیخانە، بە هەنجەتی ئەوەی جێیەکی تایبەتی سیاسییانیان نییە، وەری نەگرتم، ئەگەرچی ئەحمەد محەممەد یەحیای وەزیری ناوخۆ و ئیبراهیم کوببەی وەزیری چاکسازیی کشتوکاڵی لەوێبوون. دوای پرسوڕای نێوان هەردوو بەشەکە، بڕیاردرا بەشێوەیەکی کاتی بخرێمە بەندیخانەیەکی ئاسایی لە ژوورێکی تایبەت بە شیوعییەکان هەتا وەک وەزیرەکانی سەرەوە جیەکم بۆ ئامادەدەکرێ، دوای ماوەیەک ژوورێکی فەرمانگەکە لە تەنیشت ژووری هەردوو وەزیرە حوکمدراوەکە چۆڵ بوو و، کەسوکارەکەم قەرەوێڵەیەک و پێداویستی دیکەیان بۆ هێنام و گواسترامەوە ئەوێندەرێ.

ئیبراهیم کوببە وەزیری ئابووری بوو، لەبەر ئەو ڕێوشوێنە سەرکوتکەرییانەی ئەحمەد ساڵح عەبدیی دادوەریگشتیی سەربازی لە دژی هەندێ کارمەندی چاکسازیی کشتوکاڵی دەیگرتەبەر، دەستی لەار کێشابووەوە، ەگەرچی زۆریشمان ئامۆژگاری کرد لەو بابەتانەدا ئەوەندە بنبڕ نەبێ و ئەو ململانێیە سیاسییانەی نێوان تەرەفەکانی ڕژێم شتێکی ئاساییە، بەڵام ئەو لەسەر دەستلەکارکێسانەوەکەی هەر سوور بوو و لێی قبووڵ کرا. کە ئێستاش درابووە دادگای شۆڕش بە تێکدانی سیستەمی دەسەڵات و هاوکاریکردنی عەبدولکەریم قاسم تۆمەتبار کرابوو، لە ڕاستیشدا ئەو جۆرە تۆمەتبارکردناە کەرەستەیەک بوو بۆ پاساوی هەڵگەڕانەوە لە شۆڕش. دادگای شۆڕش ئیبراهیم کوببەی بە دەساڵ بەندی و کاری گران سزادابوو و، حوکمدانەکەیشی بە سیاسی داندرابوو ئیدی خرایە بەندیخانەی بەغدا.هەرچی ئەحمەد محەممەد یەحیای وەزیری ناوخۆ بوو، هەمان تۆمەتی ئاڕاستە کرا، هادی ڕەشید چاوشلییش کە کوردی هەولێرێ بوو، بەوەی تاوانبار کرابوو گوایە موفەوەزێکی پۆلیسی گەڕاندبۆوە سەرکار کە لەسەردەمی مەلەکی بەتۆمەتی شیوعیبوون لەکار دەرکرابوو و، ڕەگەزنامەی عێراقییەکیشی دابووە کابرای کە لەبەر شیوعی بوونێ لێیستێندرابووەوە. کە ئەحمەد محەممەد یەحیایان هێنا گەواهیی لەسەر بدا، هەڵوێستێکی جوامێرانەی نواند، ئەستۆپاکیی دایە بریکارەکەی و هەموو بەرپرسیارییەکەی خستە سەر خۆی چونکە ئەو وەزیر بووە و ئەو بەرپرسیاری سیاسەتی وەزارەت بووە و بریکاری وەزیریش فەرمانبەرێکە وەک هەموو فەرمانبەرەکانی دیکە، ئیدی دادگا بریکارەکەی بێتاون کرد و وەزیریشی بە پێنج ساڵ بەندیی کاری قورس سزادا.

ئیبراهیم کوببە و محەممەد یەحیا دوو بەندیی سیاسی بوون لە ژووورێکدا، لەبەر هۆیەکی نازانم چ بوو بەینیان نەبوو، من ئۆباڵەکەی لەبەردوو هۆ دەخەمە ئەستۆی ئیبراهیم

کوببەی؛ یەک ئەو مرۆڤێکی زانـا و پێشـــکەوتنخواز، دەبووایە لەبەر ئەو هەڵوێســـتە جوامێرانەیەی و سەنگینی رەوشتی، دەبووایە محەممەد یەحیای لەهامێز بگرتایە. ئیبراهیم کوببە، نەک هەر بەرانبەر ئەحمەد محەممەد یەحیـای، بەڵکو کە وەزیربوو، بەرانبەر هاورییەکانی وەزارەتیشی هەر توند و توورەبوو و لێبووردنی نەبوو.
گواسـترامەوە ژوورێکی تەنیشـتیان، من و ئەحمەد محەممەد یەحیا لە باخچەی بەندیخانە پێکەوە دادەنیشـتین، بەڵوم ئیبروهیم کوببە نەدەهاتە لامان، ئیدی من دەسـتێک لە پاش و دەستێکم لەپێش، یان دەبووایە لەو هەڵوێستە شەرماوەرەی نێوانیان بوومایە، کە ئەو پێش بەندیخانە وەزیر و برادەرم بوو، یانیش داوا بکەم بمگوازنەوە بەندیخانەی نوگرە سەلمانی بیابان، کە سەدان شیوعی و دیموکراتیی سەرباز و مەدەنی لەوێ بەند کرابوون.
رۆژێک، کامل چادرچی بۆ ســــەردانی ئیبراهیم کوببەی هاتە بەندیخانە و،کە زانیی لە ژوورەکەی تەنیشــتیمە ســەریدا تا ســڵاوێک بکا، ئیدی پێمگوت لەبەر ئەو هۆیەی رەنگە داوای گواســـتنەوەی خۆم بکەم. گوتی هەوڵدە پێکیانبینییەوە، گوتم وەک دەزانی ئەوەیان دژوارە.
دوای ماوەیەک، سەرباری هەدانەدانی ئەحمەد محەممەد یەحیای، چونکە بەتەنیا دەمایەوە، داوایەکی نووســـراوم دایە بەرێوەبەری گشـــتیی بەنـدیخـانەکـان، جونکە ئێمە لەژێر ســەرپەرســتیی دادوەری گشــتیی ســـەربازی بووین. رۆژێک، ثامر حەمدانی بەرێوەبەری بەندیخانە داوای کردم و بریاری دادوەری گشـــتیی ســـەربازیی پێراگەیاندم کە ئەگەر نەفرەت لە شـــیوعییەت بکەمبە دەرکردنی مەرســـوومێک بەرمدەدا، منیش رەتم کردەوە، گوتی ئەگەر بە تۆمەتی شـــیەعییەتی بەند نەکرابی، ئیدی بۆ چەندین ســاڵ لە بەندیخانەی سەلمان بەسەردەبەی لەبەر ستێکی پێی تۆمەتبار نەکراوی، بەڵام من بەنووسین نووسیم نەفرەت لە شــیوعییەت ناکەم، ئیدی گواســترامەوە نوگرە ســەلمان، لەوەیشــیان ویســتم کەســوکارەکەم لە هاتووچۆی بەندیخانە بحەســێنەوە ، کە خۆیان هیچیان نەبوو و شــێخ عەتای براشــم، کە پێشــترێ چاوی لێیان بوو، پەیوەندیی بە هێزی پشــتیوانیی شــیوعییان کردبوو لە کوردســتان، هۆی دوەمیشــیان ئەوەبوو دەمویســت لەگەڵ هاورێیەکانم بم، جا لەهەر کوێ بن.

## دیسان له بەندیخانەی نوگرە سەلمان:

كە گەیشتمە بەندیخانەی نوگرە سەلمان، عەبدولڕەحمان جاسم بەڕوەبەری بەندیخانەكە بوو كە وەک پێشتریش باسم کرد، ئەفسەرێکی خانەنشین بوو و، ئێستا خەڵکێکی سەر بە ئاسایش و هەواڵگریی سەربازی چاودێریی بەندیخانەیان دەکرد و، هەر ئەوانیش كە بەندییەکان دەگەیشتنە جێ کەلوپەلەکانیان دەپشکنین. ئەگەرچی نارەزاییم دەربڕی گوتم من سیاسیم و مافی ئەوەم هەیە ڕادیۆم هەبێ ڕۆژنامەم بدرێتێ، ڕادیۆیەکەیان لێستاندم، گوتیان ئەو بەندیخانەیە هیی غەیرە سیاسییانە و ئەو کەسەی لە بەندیخانەیەکی دی سیاسییە، كە دەگوازرێتەوە ئەو بەندیخانەیە مافەکانی بەندیی سیاسیی لەکیس دەچێ.

جووم ژوورەوەی بەندیخانە و بەندییەکان پێشوازییان لێکردم، لەوانەش مامۆستا نەعیم بەدەوی وعەبدولڕەزاق زوبێر و ڕافد ئەدیب و دکتۆر قوتەیبە شێخ نووریو دکتۆر عەبدولسەلام باڵەتە و ژمارەیەکی زۆری ئەو ئەفسەرانەی لە بەندیخانەی سەربازگەی ڕەشیدم دیتبوون و ژمارەیە بەندیی خەڵکی کفریش.

بەندییەکان سێ کۆمەڵە بوون. کۆمەڵەی شیوعییەکان و برادەرەکانیان،چ سەربازی و چ مەدەنی. کۆمەڵەی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی"پارتی دیموکراتی کوردستان"دەستەیەکی ئایینیی کوردانی لەوی دەستبەسەرکرابوون و، پەیوەندیی ئەو سێ دەستەیەش دۆستانەبوو.

ئەوەی سەیربوو، سەرۆکی کۆمەڵە ئایینییەکە ناوی "سۆفیان"ی بوو و پێنج فەرزە بانگی دەدا و نوێژیان بە جەماعەت دەکرد، ڕۆکێکی هاوینێ بانگی بەیانیی لەنزیک دەستەی پارتی دیموکراتی کوردستان دا و لەخەوێی هەستاندن. ئیدی ئەوانیش خۆیان لێ توورەکرد و گوتیان خەوی بەیانیانت لەکیسداین. پێیگوتن: ئێوە بە شیوعییەکان دەڵێن بێ دین و ئەوە ساڵێکە لەنزیکیان بانگ دەدەین، نە لێمان تووڕەبووینە و نە ناڕەزاییان دەربڕیوە.

دانی ئێواران، بەندییەکان لە گۆڕەپانی بەندیخانەکە تۆپانێیان دەکرد. سووسەم ببۆ هەندێ بەندی کرد دوو ژووران بۆ وانە پێگوتنەوەی قوتابیان دروستکەن تا ئەرکەکانیان بخوێنن و ئەگەر بەریاندان بۆ تاقیکردنەوە ئامادەبن. شێخی سۆفییانیش هات و تکای کرد بەڵکو ژوورێک بۆ ئەوانیش دروستکەی تا بە ئازادی نوێژی تێدا بکەن، چونکە ئەوانەی تۆپانێ دەکەن نوێژیان لێ تێکدەدەن، ئیدی ژوورێکی نوێژیش بۆ ئەوان دروستکرا.

ڕێوشوێنی بەندیخانە لەگەڵ لەوەی جاران جودابوو، جاران، ئەوانەی دەهاتنە ناو ئەو ڕێکخراوە بەندییەی شیوعییەکان بەڕێوەیان دەبرد، ژیانێکی سۆشیالیستی دەژیان، ئەوان هەر چ خواردن و پارەیەکیان بۆ بهاتبا، تەنیا شتە تایبەتەکان نەبێ، ئەوا ڕادەستی

ڕێکخراوەکەیان دەکرد و لە ژیانی بەکۆمەڵی بەندییەکان بەشــــدار دەبوون و، بەوەش، ئەگەر کەســـوکاریان دواکەون یان لەبەر هەر هۆیەک پێیان نەکری بێنەلایان، لە بەلای تەنگانەی ژیان دووردەبوون و بەو ژیانەش ڕازیبوون.
بەلام ئێستا ژمارەی بەندییەکان زۆرە، زۆرتر لەوەی پێشتری باسم کرد، ئێستا لە "١٥٠٠" بەندی تێدەپەڕێ وله لە خوو و دەروون بیروڕای جودا، ئیدی پێویســـتی بە جۆرە ڕێکخســـتنێکی لەبارتر هەیە تـا هەمووان پێی ڕازیبن. ئیدی ڕێکخراوەکە ئـازەخەی بەندیخانەی وەردەگرت و خواردنێکی تا ڕادەیەک باشـی دەدایە بەندییەکان، چا فرشـتنی بەندیخانەشـــی بەڕێوە دەبرد و لە قازانجەکەی جلوبەرگ و پێداویســـتە تایبەتکانی وەک گوێزانی ڕیش تاشـین و پارەی چا کڕینی دەدایە ژمارەیەکی زۆری ئەو ســەرباز و پلەدار و کرێکار و جووتیارانەی ســـەرچاوەی داهاتیان نەمابوو، ڕێیشـــی بەهەندێ گوزەران خۆشـــان دەدا هەندێ کەلوپەلی تـایبەتی وەک خواردنی لە قوتوونراو و پـارە هەڵگرن، لەهەموو خوانێکیشدا هەندێ لە هەژاەکان دەبوونە هاوبەشی هەندێ لە خۆشگوزەرانەکان تا لە هەندێ خواردن لەگەڵیان بەشدار بن کە کەسوکاریان بۆیان دەهێنان. هەر بۆ نموونە، ڕێکخراوەکە بەیانیان نان و شـۆربای دەدایە بەندییەکان و گوزەران خۆشـەکانیش لە یەک خواندا "پێنج کەس" هەندێ پەنیر و خواردنی قوتوویان دادەنا.
ئێوارەیەکیان دەمەقاەیەک لەنێوان بەرپرســی هۆڵێک و ئەســـەرێکی گیراو دروســـتبووکە داوای دەکرد هەموو ئێواران برنج و مەرەگەی بـدرێتێ. ئەوە، بۆ بەنـدیخـانەیەکی دوورەدەسـتی وەک نوگرە سـەلمان، داوایەکی لەدەسـت نەهاتووە و، جونکە جنێویسـی بە ڕێکخراو و بەرپرسەکە دابوو، کابرا لێیدابوو. ئەوەش بووە جێی دڵخۆشیی ئەفسەرەکان و ئامۆژگاریی ئەفســەرەکەیان کردبووبارودۆخی بەندیخانەکەی لەبەرچاوبێ و داوایەک نەکا کە لەدەســـت کەس نایەت جێبەجێی بکا. جا لە دۆخی ئاوادا بنیادەم دەشـــڵەژێ؛ ئەوەیان ماڵەکەی بێ بەخێوکەر بەجێهێشتووە و، ئەوێهێ ژنەکەی دەستی لێ بەرداوە و چووەتەوە ماڵە باوانی. جا لەو کارانەی زۆر ئەستەم بوون ئەوەبوو مەزەەر نوابی شاعیر و تێکۆشەر پێش بەندکردنی کچێکی نیشـــان کردبوو، بەلام حوکمی هەمیشـــەیی بەســـەردا درابوو، نامەیەکی لە دەزگیرانەکەیەوە بۆ هاتبوو دەیگوت کەسـوکارەکەی ڕازی نین بیسـت ســاڵ چاوەڕێ بکا تا ئەو لە بەندیخانە دەردەچێ. ئیدی ئەو ناچارەنیشـانەکە هەڵوەشـێنێتەوە و خۆی لەو کۆت و بەندە ڕزگار بکا. جا موزەفەر زۆری خەم خوارد، بەلام ئێمە ورەمان دەنایە بەر و دەمانگوت ئەو گەنجە و ئەو باودۆخەش هەر ئاوا نابێ و درێژە ناکێشـــێ و ئەویش لە بەندیخانە دەردەچێ و زەماوەند لەگەڵ کچێک دەکا بەهای قوربانیدانی بۆ گەل بزانێ. یان یەکێکی دیکەیداوایەکی لە دادگای شـــەرعی تۆمارکردووە و داوای تەلاق دەکا

چونکە مێردەکەی بۆماوەیەکی زۆر حوکمدراوە و کەسـی نییە بەخێوی بکا و خەرجیی دابین بکا، ئیدی گەرەکیەتی لە کۆتوبەندی هاوسـەرییەکەی دەربازبێ و مێرد بە پیاوێکی وا بکا بەخێوی بکا. بەڵام کچ و ژنە وشـیارەکان نموونەی ئەو کەسـانەبوون کە بە روویەکی خۆش و ئارامگرتنەوە بەرگەی ئاسـتەنگەکانی ژیانیان دەگرت و مێردەکانیان هاندەدائارام بگرن و دەیانگوت ئامادەن کاربکەن و منداڵەکانیان بەخێو بکەن.
ڕۆژێکیـان نـامەیەکم لە ژنەکەمەوە بۆ هـات و دەیگوت هەردوو منـداڵە جمکەکەمـان مردوون"کچێک و کوڕێک" کە هێشـتا سـاوابوون. ئیدی ئەو هەواڵەم لە هاوڕییەکانم شـاردەوە و ئازارەکەم لە ناخی خۆم هێشـتەوە. هاوڕێ ئەحمەد غەفوور بەوەی زانی و ئیدی دڵی دەدامەوە وبە ئارامی و بەرگەگرتنی ئازاری منیدا هەڵدەدا.
من کادیرانی حیزبم فێری ڕۆشنبیریی سیاسی دەکردو، بزاوتێکی دووبەرەکی لەدەرەوەی بەندیخانە پەیداببوو و یەک لە ئەفسەرە شیووعییەکان بەرپای کردبوو و ئەو بزاوتە دزەی کردە ناو بەندیخانەش و، دەیگوت ڕۆڵی ئایدیۆلۆژیا و هەڵگرانی کتێبە مارکسـییەکان کۆتاییهاتووە و، ئەوانەی بواری سەربازی بە بەرپاکردنی کودەتایەک دەتوانن بارودۆخەکە بگۆڕن. ئەفسـەرەکان، لەسـەر ئەو قەساخانانەی دژی شـیوعییەکان و هاوکارانی حیزبیان کردبوو، هەڕەشـەی تۆڵەسـەندنەوەیان لە بەعسـییەکان دەکرد . منیش پێمدەگوتن : دەبێ وەرچەرخانێک لە ڕێوانی سـیاسـەتی حیزبە عێراقییەکان بکرێ و دەبێ ئاشـتبوونەوەیەک لەنێوان ڕەوتی سـۆشـیالیسـتی و دیموکراتی و ڕەوتی قەومیی ولاتدا بکرێ. باشـە ئەگەر ئێمە بە نۆبەت دەسەڵاتمان لەیەکدی ئەستاند و قەسابخانەی وەک ئەوەمان بۆ یەکدی دانا کە لە١٩٥٩ و ١٩٦٣ روویاندا، ئەرێ چارەنووسـی ولات چ دەبی و، کەینێ کاتی ئەوەمان دەبێ شتێکی بەسوود پێشکێشی ئەو گەلە بکەین.
من باوەڕم بەوەی هەبوو دەبێ ئەو ململانێیە خوێناوییانە ڕاگیرێن و، ڕێیەک بۆ هاوکاریو هاوپەیمانیی نێوان هێزە نیشـتمانی و قەومییە جیاوازەکان بدۆزرێتەوە. ئەوەی سـەیریشـە ئەوەیە ئەو دەستەیەی باوەڕیان بە کودەتای سـەربازی و کوشـتنی بەعسـییەکان هەبوو، یەکەم دەستەبوون خزمەتگوزارییەکانیان خستە بەردەستی ئەو بەعسییانەی دەسەڵاتیان لە عەبدولڕەحمان عارف وەرگرت و، حیزبی شیوعییان بە خائین دادەنا و، سەدام حوسێن خۆی وەڵامدانەوە و گوتی: ئێمە پێوەینە هاوکاری و هاوپەیمانی لەگەڵ حیزبی شـیوعی بکەین، باشە ئەگەر پێمانوابێ ئەوان خائینن ئیدی چۆنیان هاوپەیمانی لەگەڵ بکەین؟!
لەو هاوڕێیانەی لە بەندیخانەی سـەلمان بوون عادل سـەلیم و ئەحمەد غەفور و سـامی ئەحمەد و عەزیز سباهی و عەبدولوەهاب تاهیر بوون.

دوای ئەوەی لە بەندیخانە دەرچووم گوێم لە جیابوونەوەی هەریەک لە عەبدولوەهاب تاهیر و سامی ئەحمەد بوو، چونکە حیزب دەیەوێ دانوستان لەگەڵ حیزبی بەعس بکا و بەرەی نیشتمانی لە وڵات دامەزرێنێ، ئەوانە لایەنگریی دەستەی عەزیز ئەلحاج بوون"دەستەی تێکۆشانی چەکداری" و یەکەمین خۆ بەدەستەوەدەری دەسەڵاتی نوی بوون و هەڵپەی ئەوەیان بوو وەک دوو ئەندامی حیزبی بەعس وەریانگرن یانیش ڕێیان بدەنێ خزمەتیان بکەن.

بەعسییەکان لە لەناونردنی شیوعییەکان بەردەوام بوون و هەریەک لە حەمەدەڵلا نەجاڕ و سەلاح ئەحمەدیان ڕەوانەی نوگرەسەلمان کرد تا لە سێدارە بدرێن و ئەو دووەش بە کێشەی موسڵی سەردەمی بزاوتی شەواف تاوانبار کرابوون. حەمەدەڵلا هەوڵیدا لە بەندیخانەی سەماوە ڕابکا، بەلام نەیتوانی و لە مووسڵ لە سێدارە درا، هەرچی سەلاح ئەحمەدە، توانی لە بەندیخانەی سەلمان ڕابکا، بەلام پێش ئەوەی بگاتە سەماوە لەڕێگا لە تینوان مرد.

لە بەندیخانە، عەقید عەبدولڕەحمان قازیشمان لەگەڵدابوو، ئەگەرچی ئەو لە نزیکەکانی بارزانییس بوو، کەچی لەگەڵ شیوعییەکان دەژیا نەک پارتییەکان، باشترینن پزیسکەکانیش هەر لە بەندیخانەبوون، لەوانەش عەقید ڕافد ئەدیبی باسم کرد و ئەو لە بنەماڵەی بابنی کوردی بوو.

ڕۆژێکیان برووسکەیەک لە ڕەشید موسڵحی دادوەری گشتیی سەربازییەوە گەیشتە بەندیخانە و داوای لە هەریەک لە موکەڕەم تاڵەبانی و دکتۆر ڕافد ئەدیب و دکتۆر قوتەیە شێخ نووری ودکتۆر عەبدولسەلام باڵەتە و دکتۆر عەبدولسەمەد نوعمان کردبوو با نەفرەت لە بنەمایەکی شیوعییەت بکەن تا بەربدرێن، ئەو برووسکەیەس نیشانەی گەمژەیی دادوەری سەربازی بوو، هەمووان ڕەتیانکردەوە نەفرەت لە شیوعییەت بکەن، دکتۆر عەبدولسەلام باڵەتە گوتی من نە بە شیوعی بوون و نە بە پارتیبوون تاوانبار نەکراوم من تەنیا لەبەر ئەوەی گیراوم جونکە برای عەقید جەلال باڵەتەیمە، جا ئەگەر نەفرەت بکەم دەبێ بڵێم من برای جەلال باڵەتەی برام نیمە، ئەو برای لە دایک و باوکمە، چۆن برایەتی بە نەفرەت بکەم؟

## وەزیری ناوخۆ لەبەندیخانە بەرمەدەدا:

دووساڵ بەسەر گرتن و بەندکردنمدا تێپەڕیبوو، برووسکەیەکی بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشـــتی گەیشـــتە بەندیخانەی نوگرەســـەلمان، ناوەرۆکەکەی ئەوەبوو موکەڕەم جەماڵ تاڵەبانیی بۆ بنێرن، نەمدەزانی بۆ داوایان کردبووم و بە تەخمینی خۆم ســـەبارەت بە بوونە شـــیوعیی بەرپرســـیارییەکانم لەو حیزبەدا لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا دەکەن، چونکە لەبەردەم دەســـتەی لێکۆڵینەوەی تایبەتی ئەنجوومەنی وەزیران تەنیا لەســـەر تێکدانی سیستەمی بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردبووم:
ئێوارەکەی بردرامە بنکەی پۆلیسـی بادییە لە سـەلمان، تا بەرەخسـێ و بەرەبەیانی ڕۆژی پاشترێ سەفەر بکەین چونکە بە ئۆتۆمۆبیلێکی شڕی پۆلیس سەفەرەکە دەسەعات پتری دەویسـت، هەرکە گەیەندرامە پۆلیسـی تەسـفیراتیش گواسـترامەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ئاسایش، لەوێ لە ژوورێیان کردم. لەوێ کۆمەڵێ ئەندامی سوپا و خەڵکی مەدەنیم دیت بە هەوڵی کودەتایەک، بە ســەرکردایەتیی موقەدەم ڕوکن ســەلیم فەخری، تۆمەتبار کرابوون. دەزگا ئاســایشــییەکان ســەلیم فەخرییان لەڕێی ئەفســەرێکی ســیوعییەوە دانەخۆرەی بەغدا کردبوو کە ئەودەم کاری بۆ ئاســایش دەکرد. ســەلیم فەخری لە کوردســتان لەگەڵ شــیوعییەکان کاری دەکرد و دانەخۆرەی بەگدا کرابوو تا پەیوەندی بە ژمارەیەک ئەندامانی ســـوپا بکا تا خۆیان بۆ ئەو کودەتایە ئامادەبکەن گوایە بەتەمان بیکەن. ئیدی خۆی و ژمارەیەک داروودەستەکەی دەستگیر دەکرێن و، لە هۆڵێکی بەرانبەر هۆڵی بەعسییەکانیش هەندێ بەعسیی تێدابوو، مورتەزا سەعید عەبدولباقییان لەناودابوو کە بەبنەجەتورکمانی عشیرەتی بەیات بوو، باوکی لە پلەدارەکانی پۆلیسی پاراستنی نەوت بوو، گواسترایەوە حەدیسە و لەوێ خێزانەکەیان بوونە عارەب و، مورتەزا بووە وەزیری دەرەوە و دوایەش وەزیری ئابووری و، ئەوجا باڵیۆزی عێراق لە مۆسکۆ، دواترێ حوکمی بەندکردنی درا و لە بەندیخانەدا مرد.
یەکی دیکەیان نەعیم حەداد بوو کە دواترێ بووە ئەندامی ســەرکردایەتیی قوتریی حیزبی بەعس و وەزیری لاوان و ســکرتێری بەرەی نیشــتمانی و قەومیی پێشــکەوتنخواز. ئەو دوولایەنەش نێوانیان نەبوو، تەنیا کەسێک نەبێ کە ناوی سەلاح شبیب بوو و سەری لە ژوورەکەمان دەدا تا یاریی پۆکەر لەگەڵ هاوالەکانی سەلیم فەخری بکا و، نەعیم حەدادیش هەڕەشەی لێ دەکرد و جنێوی پێدەدا چونکە پەیوەندیی بە شیوعییەکانەوە دەکرد.
شـیوعییەکانیان بەشـەو دەناردەلێکۆڵینەوە و دوای چەند سـەعاتێک بەخوێن لێ چۆڕانەوە دەیانهێنانەوە، چونکە دانپێدانان ئەشـــکەنجەیان دەدان، شـــەوێکیان ئەحمەد مەحمود

حەللاقی شـــیوعییـان برد، کە کوردێکی ســـلێمـانی بوو،لە جێی گرتنەکە بە نیوەمری هێنایانەوەبرینەکانیمان شووشت و هیچمان نەبوو برینەکانی پێ پاککەینەوە.
بەعســـییەکـانیشـــیـان دەبردە لێکۆڵینەوە، بەڵام ئەوانیـان بەجۆرێکی دی ئەشـــکەنجە دەدا،درندەیەک ئەو کارەی دەکرد ناوی "عومەر" بوو و بێ ڕەوســـت بوو و دەســـتدرێژیی سێکسیی دەکردەسەریان. لە ١٩٦٨ پرسیاری عومەرم لە نەعیم حەداد کرد، گوتی هەر لە یەکەم ڕۆژی شـۆڕشـی ١٧ی تەمموز کوشـتمان. منیش لەو کەشـە تۆقێنەرەدا چاوەڕێی چارەنووســـی خۆمم دەکرد و جاوەڕێم دەکرد بزانم لەســـەر چ مەســـەلەیەکلێکۆڵینەوەم لەگەل دەکەن.
ڕۆژێکیان بانگکرام تا خۆم بۆ دیدارری ڕەشـید موحسـینی بەڕێوەبەری ئاسـایشـی گشـتی ئامادەکەم، بە جلی خەوەوە چوومە دیتنی، جونکە لە بەندیخـانە جلی مەدەنیمـان نەبوو، پرســـیاری ئەوەی لێکردم داخوا دەســـتەجلێکم هەیە تا بۆ دیداری وەزیری ناوخۆ لەبەری بکەم؟
ڕۆژی دواترێ دەســـتێ جلیان لە ماڵەوە لە بەغدا بۆ هێنام و، بردمیانە دیداری وەزیر و منیش نەمدەزانی وەزیر کێیە. ئیحســـان تاڵەبانیی برامم لای بەڕێوەبەری نووســـینگەکەی دیـت. کە چووینە ژوورەوە دیتم عەقید ڕوکنســـوبحی عەبدولحەمیدە، ئەوکـاتەی لە کەرکووک مولازم بوو ئەوم دەناســـی. ســـەرباری ئەوەی مەترســـیی بۆ ئەویس هەبوو، چونکە من وەک ســـیوعی ناســـرابووم، کەچی یەکدیمان دەدیت. ســـوبحی هەســـتایەوە و دەســـتی لەملی کردم و داوای لێبووردنی لیکردم لەو شـــتانەی لەو دوو ســـاڵەدا بەســـەم هـاتبوون و گوتی:ئێوە هەڵەتـان کرد و ئێمەیش، لەو وڵاتەیدا کەس نییە هەڵەی نەکردبێ، پێویســـتە ئەوەی چووە لەبیری بکەین، خەبەرم زانی لە بەندیخانەی ســـەلمانی. بەخۆمم گوت دەکرێ من وەزیری ناوخۆبم و مامۆســـتا موکەڕەم لە بەندیخانەی ســـەلمان گیرابێ؟
ئەوجا گوێدانی تەلفۆنەکەی هەڵگرت و پەیوەندیی بە تاهیر یەحیای سەرۆکوەزیران کرد و پێیگوت: مـامۆســـتـا موکەڕەم لای منە، بەلام نەمتونیوە نووســـراوەکـانی دەرکردنی لێخۆشـــبوونی بۆ بنووســـم، چونکە من دەمەوێ پێشـــی جێژنێ دەربچێ، هیوادارم نووسراوێک لای خۆتانەوە بۆ سەرۆکایەتیی کۆمار بنێرن تا مەرسوومەکە دەرکەن.
ســـوپاســـی ئەو ئاوڕدانەوە جوانەیم کردو پێمگوت: حەوت کەســـی خەڵکی کفری لە بەندیخـانەی نوگرە ســـەلمـانن وبە حوکمی جیـاواز حەکمدراون، من کە لەکفری بووم واملێکردن ببنە شـیوعی، ئەوەش ڕەوسـتی باس نییە من لە بەندیخانە بێمەدەری و ئەون لە بەندیخانە بەجێ بهێڵم، گوتی ناوەکانیانم بدەرێ تا بیانهێنم و لەگەڵ تۆ بەریان بدەم. ناوەکانم دایە و داوای لە سکرتێرەکەی کرد برووسکەیەک بۆ بەندیخانەی سەلمان بنێرێ

و داوا بکا بیاننێرنە ئاسایشی گشتی، دوای دوورۆژیش گەیشتنە ئاسایشی گشتی و ئەوجا نێردراینە هۆڵێکی فراوانی ڕاگیرانی گشـــتی هەتا مەرســـوومێک بە بەردانی هەموومان دەردەچێ.
ئەوەی ســەیرە، وەک ســوبحی عەبدولحەمید دواتری پێیگوتم، گۆڤارێکی میســری بەردانی منی ئاوا وێناکردبوو: کاتێ ســـوبحی عەبدولحەمید وەزیری ناوخۆ بووە و ســـەرێک لە بەڕێوەبەرییەکانی ســـەر بە وەزارەتەکەی دەدا، ســـەردانی بەندیخانەی نوگرە ســـەلمانی بیابان دەکا کە تایبەتی بەندییە شـــیوعییەکانە. لەوێ چاوی بە موکەڕەم تاڵەبانیی کۆنە برادەری دەکەوێ و، لەناو سەرسوڕمانی بەندی و بەندیوانان، وەزیر و بەندی دەست لە ملی یەکدی دەکەن و وەزیر، کە برادەرە کۆنەکەی لە کۆتوبەندانددا دەبینێ، فرمێســـکان بەردەداتەوە. ئیدی بە فڕۆکە هێلیکۆتەرە تایبەتەکەی دەیباتەوە بەغدا و بە ســـەلامەتی دەینێرێتەوە ناو کەسوکاری.
کە لە بەندیخانە هاتمەدەرێ، ئیحســانی برام و شـێخ غالب شـێخ ســالّح باداوەی پیاوچاکی خزمم و بەڕێز ڕەشاد موفتیئەو مرۆڤە باشەی پێشتری نەمدیتبوو، چاوەڕێیان دەکردم و. بە ئۆتۆمۆبیلەکەی ئەمەی گەیاندەوە ماڵەکەمان لە وەزیرییە و، باری داراییمان زۆر خراپ بوو، من و ئیحسانی برام لە وەزیفە دەرکرابووین و ماوەی پێویستی خانەنشینبوونیشمان تەواو نەکردبوو و، شـــێخ عەتای برامی لەو هەڵوێســـتانەدا فریامان دەکەوت، گوندی زەرداوی بەجێهێشتبوو و ڕەگەڵ هێزی پشتیوانیی شیوعییان کەوتبوو وببوە سەرکردەیان تا لەدەســـت حکوومەت دەربازبی و نەگیرێ و ئەویش ژنە منداڵەکانی بێ دەرامەت لە کەرکووک بەجێهێشتبوو.
لە بەغدا، **ئێمە** و خێزانی ئیحســـان لە خانوێکی کرێی گەڕەکی وەزیرییە کۆبووینەوە و بەحاڵ دەمانتوانی کرێی خانووەکە بدەین. خاوەنی خانووەکە خانمی ژنی عەمید ڕەســـمی قامچیی خوالێخۆشـبوو بوو و مرۆڤێکی باشـبوو و دەیزانی بارودۆخمان چەند زەحمەتە. نەکا لەڕوو دابمێنین، هەتا ئێمە نەمانگوتبا ئەو بۆ کرێی خانوو نەدەهات. من برایەکەم نووســـینگەیەکی پارێزەریمان کردەوە، چونکە تازەکاریش بووین لە بەغدا، هەر ئەوەتە و دەمانتوانی کرێیەکەی بدەین، بەڵام بورهان جەلالی خاڵمان دەســـتی بە فرۆشـــتنی پارچەزەویی چۆلی کردبوو و دایکیشمان بەشی تێدابوو و بۆ کرێدا و کاروباری گوزەران تۆزێک فریامان دەکەوت و پارەیەکیشـــی بە قەرز داینێ و دایکم، کاتێ گوتیان خانووەکە دەفرۆشـــرێ، توانیی بە "٤٢٠٠"ینار بیکڕێ، کە بە خاوەن خانووەکەیســـمان گوت تەنیا بە قیست دەتوانین پارەکەی بدەینێ، ڕازیبوو دەوەی بە دوو مانگ"٥٠٠" دیناری بدەینێ، وەک پێشتریش ئەگەر قیستەکان دوابکەوتنایە ئەو داوای نەدەکرد.

## سەرۆک عارف و کۆبوونەوەی نهێنی ماڵی فوئاد عارف:

ئەو دانوستانانەی لەنێوان حکوومەت و بزووتنەوەی کوردی کران هیچ ئەنجامێکیان نەبوو. حکوومەت پێویستی بەوەی بوو دانوستان لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی بکا و ئەو شەڕە ڕاگرێ، تا دەستی بۆ دانوستانی کۆمپانیا نەوتییە بیانییەکان بەتاڵ بێ سەبارەت بە داواکارییەکانی عێراق لەو کۆمپانیایانە و، کۆمپانیایەکانیش ڕکەیان لەسەر هەڵوێستی خۆیان دەکرد بەرانبەر حکوومەتی خۆی وا نیشاندەدا خۆ لە سەرۆک جەمال عەبدولناسری نزیک دەکاتەوە و ئیدی وەک چاولێکەریی میسر، هەندێ بانکی ئەهلی و کارگەی خۆماڵی کرد، گوایە ڕێ پێشکەوتنی سۆشیازیزمی دەگرێتەبەر.

کە جارێکی دی شەر لە کوردستان هەڵگیرسایەوە، ئەو کوردانەی لە بەغدا بوون پرس و ڕای ئەوەیان کرد کارێک بکەن کورد بگاتە داواکارییەکانی، ئیدی بانگێشت بۆ کۆبوونەوەیەک کرا لە ماڵەکەی بەڕێز فوئادعارف و نزیکەی "٦٠" کەسایەتیی سەربازیی خانەنشین و مەدەنیی خاوەن بیروڕای جیاواز ئامادەی بوونلەوانەش شیوعی و دیموکراتی و ڕاستڕەو و بگرە بەکرێگیراوانی خۆرئاواش. لە دەسپێکی کۆبوونەوەکەدا، فوئاد عارف جنێوی بەو کەسە دا ئەوەی لەو کۆبوونەوەیە دەگوترێ بیباتە دەرێ، ئەوجا دەست بە گفتوگۆ کرا، ڕایەکان لەسەر ئەوەی کۆک بوون نووسراوێکی ە کەس بە ناوی هەمووان واژوویان کردبێ بدرێتە حکووموت و تێیدا داوای ڕاگرتنی شەڕی کوردستان بکەن و داواش بکەن حکوومەت بەدەم داوا ڕەواکانی کوردەوە بێ. ڕۆژی دووەم، پێش ئامادەکردنی نووسراوەکە، سەرۆک عەبدولسەلام عارف داوای بەڕێز فوئاد عارفی کردبوو تا لە کۆشکی کۆماری ببینێ. لە دیدارەکە لێیپرسیبووئەوانەی لە دوێنی لە ماڵەکەی کۆبوونەوە کێبوون؟ فوئاد عارفیش لە وەڵامدا گوتبووی ئەو دیوەخانێکی هەیە دەیان کەس، تەنیا بۆ گفتوگۆ و قاوەخوادنەوە سەری لێدەدەن. ەبدولسەلام بانگی سکرتێرەکەی دەکا تا نەوارەکانی"شریت" بۆ بێنێ کە گفتوگۆیەکانی کۆبوونەوەکە بوو و، گوتی: ئەبو فەرهاد تۆ کەسێکی باشی و نیەتت پاکە و وادەزانی هەمووکەس وەک تۆیە، شەوێ دینێ پێش ئەوەی ئەوانەی لای تۆ کۆببوونەوە بچنەوە ماڵەکانیان دکتۆر قەرەنی دۆغرەمەچی ئەو شریتەی هێنایە هەواڵگریی گشتی و، بورهانی حامید بەگی جافیش شریتێکی دیکەی هێنایە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتی. ئەوجا فەرمانی گرتنی ئەفسەرە خانەنشینە کوردەکانی دەرکرد، لەوانەش فوئاد عارف، جا ڕەوانەی ناحیەی "عەین تەمر"ی کەربەلای کردن.

ئەوەی سەیربوو ئەوەبوو، کە لە ئاسایشی گشتی بانگی ڕەشید جەودەتی عەمیدی خانەنشینیان کردبوو لێیان پرسیبوو داخوا پارەی بۆ بزووتنەوەی کوردی هەناردووە،

وەلامەکەی "بەڵێ" بوو، کە گوتیان بۆ؟ گوتبووی من پیاوێکی پیری پەککەوتەم و ناتوانم بجەنگم بۆیە هاریکاریی دارایيم کردوون. جا لەگەڵ ئەوانیدی گیرا. زەید ئەحمەد عوسمانی بەوەی ناســـرابوو پەیوەندیی لەگەڵ هەواڵگریی ناوەندیی ئەمەریکا هەیە، لەناو گیراوەکان بوو و، ئەوانە تا مردنی عەبدولســـەلام عارفی لە رووداوەکەی هێلیکۆپتەری لە نیســـانی ١٩٦٥ کە بۆ ســـەردانی پـارێزگـاکـانی بـاســـوور چووبوو، هەر لەوێ مـانەوە. جـا عەبدولڕەحمانی برای جێی گرتەوە، کە بەوەی ناســـرابوو وەک عەبدولســـەلامی برای دڕ نییە و، عێراقییەکانیش بەگاڵتەوە بەو بژاردەیەیان دەگوت"لەجێی ونبووەکە".

## بزووتنەوەی کوردی و شەڕی شیوعییەکان لە چیای هندرێن:

عەبدولڕەحمان عارف ویستی گەرێکی دیکەی دانوستان لەگە کۆمپانیا نەوتییەکان دەستپێکا و، بۆ ڕاگرتنی شەڕی کوردستانیش پێویستی بەوەی هەبوو پەرلەمانێک بێنێتە کایە ڕەزامەندی لەسەر ئەو ڕێککەوتنە نوێیانە دەربڕێ کە لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوت واژوویان دەکا و، بۆ ئەو کارەش دکتۆر عەبدولڕەحمان بەزازی مامۆستای زانکۆی هەڵبژارد.

عەبدولڕەحمان بەزاز لەو ڕۆشنبیرانە بوو کە لە خۆرئاوایان خوێندبوو و پەیوەندییەکی ڕۆحیی پێیەوە هەبوو، یەکەم کاری کردیشی هەوڵی ڕاگرتنی شەڕی کوردستان بوو، ئیدی بەدوای زەید ئەحمەد عوسمانیدا نارد کە لە گرتووخانەی "عەین تەمر" گیرابوو و هەناردی تا پەیوەندی بە مەلا مستەفا بارزانییەوە بکا. مەلا مستەفا ئێستا داواکارییەکانی لەسەر حکوومەت سووکترکردبوو و بە پیادەکاردنی بەڕێوەبەرییەکی لامەرکەزیی عێراق ڕازیبوو بە کوردستانیشەوە لەگەڵ جێبەجێکردنی هەندێ داواکاریی سادە و بەڕێوەبەریی لامەرکەزی هیچ پەیوەندییەکی بە مافە نەتەوەییەکانەوە نەبوو، بەڵکو ڕێوشوێنێکی بەڕێوەبەرییە و زۆر وڵاتی کە هیچ کێشەیەکی نەتەوەییشیان نییە بەکاری دەهێنن. حکوومەت پەیوەندییەکانیلەگەڵ باڵی جەلالتاڵەبانی بەکارهێنا تا فشار بخاتە سەر بارزانی، تا بەوەی دەیخاتە بەردەستی ڕایبێ. دەزگا ڕاگەیاندنەکانی حکوومەت ڕایانگەیاند دکتۆر عەبدولڕەحمان بەزازی سەرۆکوەزیران دیدارێکی لەگەڵ جەلال تاڵەبانی کردووە نەک باڵی بارزانی، ئیدی جەعفەر عەبدولکەریم بەرزنجیی ئامر هێز ناوچەکەی خۆی بەجێدێڵێ و بە هێزەکەیەوە ڕوو لەو ناوچانە دەکا کە لەژێر دەسەڵاتی حکوومەتن، تا پەیوەندی بە باڵەکەی جەلال- ئیبراهیمەوە بکا. دواترێ کە بۆی دەردەکەوێ ڕێککەوتنەکە لەگەڵ بارزانییە، ئیدی دەگەڕێتەوە جێی کارکردنی خۆی.لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٥ عەبدولڕەحمان بەزازی سەرۆکوەزیران بەرنامەی حکوومەتی سەبارەت بە چارەسەری کێشەی کورد ڕایگەیاند کە لە جێبەجێکردنی بەڕێوەبەرییەکی لامەرکەزی تێنەدەپەڕی لەگەڵ هەندێ قەرەبووی دەدرایە کوردان و بارودۆخی کوردستانیش ئاسایی دەکرایەوە. بارزانی، هەرزوو ڕەزامەندیی خۆی سەبارەت بە بەیاننامەکەی حکوومەت ڕاگەیاند کە دکتۆر عەبدولڕەحمان بەزازی سەرۆکوەزیران خوێندبوویەوە. لە ڕێچکەی ڕووداوەکانیشڕا دەردەکەوێ بارزانی لەبەر دوو هۆ بە بەیاننامەکە ڕازی بووە، یەکەمیان ئەوەیە نەهێڵێ ئەو هەڵە دەست باڵەکەی ئیبراهیم- جەلال بکەوێ تا لەگەڵ حکوومەت ڕڕێککەون و ئەو بەیاننامەیە جێبەجێکەن کە ئەودەم هەڵویستی ئەو لاواز دەبێ،دووەمیسیان ئەوەبوو کە بوارێک بۆ لێکتێگەیشتن لەنێوان حکوومەت و کۆمپانیایەکانی نەوت برەخسێ.

رۆژێک پێش ڕاگەیاندنی بەیاننامەکەی ٢٩ی حوزەیران بە تاکسییەک لە کەرکووک هاتمەوە. دوو ئەفسەر بە جلوبەرگی مەدەنی لە ئۆتۆمۆبیلەکەدا بوون، یەکیان لە پیشەی پرسیم، گوتم کاسبم، لرە کێشمەکێشێکی نێوانیان کە ئەرێ کۆی "بەعیر" بیعران"ە یان "ئەباعیر"ە ، چونکە کۆی "کبیر" "کبران" نییە و"اکابر"ە. گوێم لیبوو یەکیان بە ئینگلیزی بەویدیی گوت: "وریابە ئەو کابرایە ڕۆشنبیە و وەک خۆی دەڵێ وا نەەیە و کاسب نییە". منیش لە ئینگلیزی تێدەگەمئیدی بە ئینگلیزییە لاوازەکەین قسەیان دەکرد و تیگەیشتم کە ئەوان دوای بەیاننامەکەی ٢٩ی حزێران بۆ بەشداریی هەوڵێکی کودەتایی دەچنە بەغدا، هەر هێندەی گەیستمە بەغدا هەواڵم دایە حیزبی سیوعی تا وریابن، چونکە لەگەل ڕاگەیاندنی ڕێککەوتن لەگەڵ بارزانی هەوڵێکی کودەتای ئەفسەرە قەومییەکان دەدرێ. هەر بەڕاستییش ڕۆژی دووەم عارف عەبدولڕەزاق بە خۆ و بە کۆمەڵێ لە ئەفسەرە قەومییەکان و بە "٥٠" تانکەوە هەلیانکوتایە سەر کۆسکی کۆماری، بەلام هیچ پاڵپشتییەکیان نە لە سەربازانەوە و نە لە جەماوەرەوە دەست نەکەوت، چونکە ئەوان دەیانویست بەهەر جۆرێک بێ شەڕ لە کوردستان ڕاوەستێ. ئیدی عەمید سەعید سلێبیی فەرماندەی ناوچەی بەغدا بەروویاندا وەستا و توانی هەوڵەکەیان شکست پێبێنێ و بیانگرێ.

عەبدولڕەحمان بەزاز نەیتوانی ئەو ئامانجانەی بۆیان هاتبوو بەدەستیان بێنێ، ئاخر ئەو، سەرباری لایەنگریی ئەو کوردانەی پەیوەستی خۆرئاواشبوون، وەک بابەعەلیی شێخ مەحمود و زەید ئەحمەد عوسمان و فوئاد عارف و عەلی حەیدەر سلێمان، نەیتوانی چارەسەری کێشەی کورد بکا، چونکە ئەفسەرە قەومییەکان و ئەفسەرە ڕاستڕەوەکان ڕازینەبوون کێشەی کورد لەسەر دەستی کەسێکی وەکعەبدولڕیحمان بەزاز چارەسەر بکرێ، بەزازیش، لەو کەشە گرژەدا، لە پیادەکردنی هەڵبژاردنێکی ئەنجوومەنی نیشتمانیی ڕەزامەندیی بەڕێوچێ لەسەر ئەو ڕێککەوتنە نەوتییانە بدا کە گوایە بەنیازە لەگەل کۆمپانیاکانی نەوتی بکا، دەستەپاچەبوو. ئیدی ئەوە بووە هۆی رووخانی حکوومەتەکەی و تاهیر یەحیا وەزارەتی پێکهێنا، کە بەوەی ناسرابوو هاوسۆزی میسرە، ئیدی بارزانی خۆی لێ گرت و مامەڵەی لەگەل نەکرد، هەڕەشەی لە هەموو ئەو کوردانەش کرد کە لە وەزارەتەکەیدا بەشداریی لەگەل دەکەن، بەلام لەگەل هەموو ئەوانەشدا هەریەک لە عەمید ئەحمەد کەماڵ و عەقید فەتاح شالی بەشدارییان کرد و هەریەک لە ئەکرەم حامید جاف و ئیحسان شێرزاد لەژێر فشاری کەسایەتییە کوردییەکانی بەغدا نەجوونە ژێر بار و ڕازی نەبوون بەشداری لە حکوومەتەکەی بکەن.

ئەگەرچی بارزانی وازی لە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردســـتان هێنابوو و بەوەی رازی بوو کورد بەشدارییەکی راستەقینە لە حکوومەتی ناوەندەی بکەن، بەڵام داوای دیارییکردنی سنووری کوردســـتانی بارزانی دڵەڕاوکێی ئەفســـەرە شـــۆڤێنییەکانی وروژاند، لە ئێوارەی ٢٩ی ئازاری ١٩٦٥ هادی خماســـی بەڕێوەبەری هەواڵگریی ســـەربازی کۆڕێکی لە بەغدا پێشکەش کرد و، تێیدا بە توندی هێرسی کردە سەر بارزانی و گوتی: "ئەوەی مەلا مستەفا گەرەکیەتی مانای وایە دەیەوی بەششێک لە عێراق دابڕێ و ئەو بەشە سنوور و قەوارەی هەبێ".

ئەوجا حکوومەتی عێراق دەســـتی بە هەڵمەتێکی ڕاگەیاندن کرد کە نەجمەدین واعیزی موفتیی خاکی عێراق تێیدا بەشداربوو و بەدوویدا دەستەی زانایان فەتوایەکیان دا و "وەک جێبەجێکردنی حوکمی ئیسلام" خوێنی کوردانیان حەڵاڵ کرد.

کە حکوومەت دەستی بە شـەڕ کردەوە یەکەکانی پشتیوانی لە کوردستان لەناو یەکەکانی "پێشـمەرگە"دا دەرکەوتن چەنکە ئەوان پتر پەیوەسـتی گەل بوون و پتریشـیان بەرگری لە مـافەکـانی ڕەنجـدەرانی کورد دەکرد. وەک ڕێکتری و ئـازاترین یەکەی "پێشـــمەرگە"ش دەرکەوتن، لە شـــەڕی "هندرێن"شـیوعییەکان وەک جەنگاوەری بەهێز دەرکەوتن و لیوای چواری سوپای عێراقیان شکاند، کە سەعید حەممۆی عەمید ڕوکن سەرکردایەتیی دەکرد و دیارترین ســەرکردەی بەهێزترین لیوا بوو. لە شـەڕێکی لە مایسی ١٩٦٦ ڕوویدا، شـەڕ لەگەل لیوایەک روویدا کە موقەدەم ئیبراهیم کەوســـەر ســـەرکردەی لیوایەکەبوو و تێیدا شـیوعییەکان دەسـتیان بەسـەر بەشـی هەرەزۆری چەکەکاندا گرت و لەوێ شـیوعییەکان وەک هێزێکی چەکداری دەســـتوەشـێن دەرکەوتن. لە شـــەڕێکی دیکەی ناوچەی قەرەداغ پەلێکی شـیوعییەکان دەسـتیان بەسـەر ئەو قەڵایەدا گرتەوە کە یەکەکی هەڵگەڕاوەی سـەر بە جەماعەتی "ئیبراهیم- جەلال" کە بە "باناق" ناسـرابوو و دوای شـەڕێکی گەرم دەسـتیان بەسەر ناوەندی ناحیەکەدا گرت.

دوای شـــەڕی هندرێن، ســـەنگی ســیوعییەکان لای بارزانی و ســـەرکردایەتیی شـۆڕشـی کوردی گۆڕا، کە شـیوعییەکان لە شـەڕێکی بەرەیی برووسـکە ئاسا تێیدا سـەرکەوتن، لە کاتێکدا یەکەکانی سەر بە بارزانیلە شەڕی "زۆزک" شەڕەکەیان دۆراندبوو، ئیدی بارزانمی بە وریاییەکی پترەوە مـامەڵەی لەگەلشـــیوعییەکان دەکرد و دوای ئەوە هەوڵیدا هێزی جەنگاوەری پشـتیوانی شـیوعییەکان سـنووردار بکا و دەسـەڵاتی حیزب لەناو جەماوەری کوردی کەمکاتەوە.

## ئیحسانی برام تۆمەتبار کرا و سەرۆک عارف هاتە ناو کارەکە:

عەقید بەدرەدین عەلی، لەسەردەمی سەرۆک عەبدولسەلام عارف کرابووە موتەسەڕیفی لیوای هەولێر. جا زۆری خراپە لەگەڵ خەلک کرد و بە تۆمەتی پەیوەندی بە بزووتنەوەی چەکداریی کوردەوە، بووە هۆی لەداردانی زۆر کەس، کە خانە نشـــینیش کرا لە بەغدا بەدەستی چەند کەسێکی نەناسراو غافلکوژ کرا، بەلام بۆ برایەکەم بەو کارە تۆمەتبار کرا؟ ڕۆژێکیان لای ئێوارەکەی، لە نزیک مالّی فوئاد عارف"ئەبە فەرهاد" چاوەڕێی پاسـی هاتوچۆ بووم، فوئاد لەژێر جاودێریی بەڕێوەبەرایرتیی ئاسـایشـدا بوو. ئەبو فەرهاد منی دیت و فەرمووی لێکردم تۆزیک لای دانیشم. لە هەمان کاتیشدا، سەعات سەشی ئێوارە وادەم لەگەڵ هەریەک لە عامر عەبدوڵلا و مەهدی حافز هەبوو. ئیدیگەڕامەوە ماڵەوە و لە دەرگا تووشـیان بووم و،ئۆتۆمۆبیلێک هات کە حەسـەن جەواد گومەر دەیهاژوا.پێدەچوو هەردو جاودێرەکەی مالّی فوئاد عارفلەکاتی جوونە ماڵەکەیدا چاودێرییان کردبم، دوایە زانیم راپۆرتێکیان بۆ بەڕێوەبەرایەتییەکانی ئاسـایش بەرزکردووەتەوە تێیدا هاتووە: کەسێکی بالابەرزی سەرسپیلە ماڵەکەی فقئاد عارف بوو و چووە مالّی ئیحسان تالەبانی " ئێمە لە خانوێکدا دەژیاین و ماڵەکەس بە ناوی ئەوەوە دەناسـرا"، جا لەویٚ گەیشـتە چەند کەسـێک کە باوەڕ وایە ئەوان بەدرەدین عەلیی خوالێخۆشـبوویان غافلکوژ کردبیٚ، هەولماندا بیانگرین، بەلام ئەوان ئۆتۆمۆبیلەکەی لە کوشـتنی بەدرەدین بەکار هێنرابوو بەجێیانهێشت و ڕایان کرد.

پۆلس و ئاسـایش هاتن و ئیحسـانی برام و سـەلاحی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسـیان گرت، کە مڕێکەوت هاتبوو سـەردانمان بکا، ئیدی بە تۆمەتی بەشـداریی غافلکوژیی بەدرەدین عەلی گیران. چوومە بەڕێوەبەریی ئاسـایش لە وەزیرییە و گوتم من موکەڕەم تالەبانیم، کابرای بالا بەرزی سـەر سـپیی لە ماڵەکەی فوئاد عارف هاتەدەرەوە و، منیش هەر لەو ماڵە نیشتەجێم کە ئیحسـانی برامی تێدا دەژی و ئەو دووکەسـەی لەوێشم دیتن عامر عەبدوڵلا و مەهدی حافز بوون کە بەهیچ جۆرێک پەیوەندییان بە تاوانی کوشـتنی بەدرەدین عەلییەوە نییە.[49]وەلامیان ئەوەبوو: مامۆ، ناوت لەو مەسـەلەیەدا نەهاتووە، بۆ خۆتی تێهەڵدەقورتێنی؟

---

[49] _ بەدرەدین عەلی: لە نیسـانی ١٩٦٢ کرایە موتەسـەڕیف..لە ١٩٦٤ گوسـترایەوە و کرایەمەتەسـەڕیفی لیوای عیمارە، ئەوجا خانەنشین کرا و گەڕایەوە بەغدا و لە کۆتاییەکانی مانگی ڕەمەزانیناوەڕاستی شەستەکان بەدەستی چەند نەناسـراوێک لە گەڕەکی ئەفسـەران"زەیوونە" لە ماڵەکەی خۆیدا کوژرا. کە هەوالی کوژرانەکەیشـی گەیسـتە شـاری هەولێرخۆشـی دلی خەلکەکەی داگرت چونکە لەو مەودایەی ئەو موتەسـەڕیف بوو" ماوەیەکی تاریک" و ناخۆش ژیان.

ئیحســـان نزیکەی بیســـت ڕۆژان دەســـتبەســـەر کرا، تا جەن تاڵەبانییەکی خزممان کە پەیوەندییان لەگەل ســـەرۆک عەبدولڕەحمان عارف هەبوو، هاتن و داوایان لێکرد فەرمان بدا بەریدەن چونکە هیچ پەیوەندیی بەو مەسـەلەیەوە نییە. ئیدی فەرمانیدا لەگەڵ سـەلاحی برادەری بەربدرێن.

## حیزبی سشوعی وەک هێزێکی سەرکردە دێتەوە گۆڕەپانەکە:

ڕۆرانی ســــەربازیی بەرانبەر زایۆنیی دوژمن لە ۱۹٦۷ لاوازیی حکوومەتەکانی بۆرژوای بچووکی ئاشکراکرد و نیشـانیشـی دا چەندە دابراون و دەستەپاچەی ئامادەکردنی گەلانی عەرەبیشـــن بۆ بەرەوڕووبوونەوەی دوژمنان. جەماوەری عارەبیش لەوەی تێگەیش کە دەســـبەســــەرداگرتنی ئازادییەکانی و ڕێ لێگرتنی لە ڕیکخخســـتنی ڕیزەکانی خۆی و ئامادەکردنی گەلی عارەبی بەرانبەر دوژمنان هۆی سەرەکیی ئەو شکستەی بووینە. ئیدی زۆر بە مکوڕی دەسـتی بەداوای ئازادیی دیموکراتیی پتر کرد و داوای کرد مافی خۆی لە ڕێکخستنی حیزبی و کۆمەڵایەتی و سەندیکادا بدرێتێ.

لە عێراق، حکوومەتی عەبـدولڕەحمـان عـارف- تـاهیر یەحیـا لە دومنـداریی حیزبە نیشـــتمانییەکان بەردەوام بوو و، لەســـەر هەمان ڕێچکەی عەبدولناســری ڕۆیی و، وەک جێگرەوەی حیـانی حیزبیی گـل داوای دەکرد، ڕێکخراوێکی لاوازی دامەزرانـد بەناوی"یەکێتیی ســیســیالیســتی". تێکەڵ گەلیی "شــعبیة" ئەو ڕێکخراوەش لە هەیوان و بێلایەکانی کۆشکی کۆمارییان تێنەپەراند و ئیدی بەلاوازی لەدایکبوو تا بەخێرایی بمرێ.

ئەو ڕێوشوێنە سۆشیالیستییانەی حکوومەت تەنانەت حیزبی شیوعییشی خەڵەتاند، لەژێر کاریگەریی خەڵکە ڕاستڕەوەکەی ناو ســەرکردایەتی و نائامادەیی ســەرکردەکانی دیکە لە پایتەخت حیزب بەیاننامەیەکی دەرکرد و هەر بەوەبدەش دەســـتبەردار نەبوو پشـــتی ڕێوشـــوێنەکانی حکوومەت بگرێ،ئیدی حکوومەت دوای دۆڕانەکەی شـــەڕی حوزەیرانی ۱۹٦۷، فەرمانی بەردانی ژمارەیەک گیراوی سیاسیی دەرکرد.

ســــەرکردەکانی حیزبی لە کوردســــتان بوون بەیاننامەکەیان ڕەتکردەوە و، هەر خێراش بەیاننامەکەیان کێشایەوە و لێپرسینەوەیشیان لەگەڵ ئەوانەدا کرد کە لەپشت دەرکردنییەوە بوون و دیسان دروشـمی رووخاندنی حکوومەتیان بەرزکردەوە، وەکچۆن حیزب دیسـان بەرەوڕووی ڕێکخراوە حکوومییەکە بووەوە"یەکێتیی سۆشیالیستی".

لەسـایەی ئەو بارودۆخەداحیزبی سـیاسـیی بێ مۆڵەت وەک هێزیکی جەماوەریی نەدەکرا بەهەند هەلنەگیرین و، هـاتبووەوە تا ڕۆڵی خۆی لە ژیانی ســـیاســـیی ولاتدا بگێڕێ. بەعسییەکان و، بگرە سـیوعییە ڕووخاوەکانی ژێر ئەشـکەنجەش پێیانوابووشـیوعییەکان، دوای ئەو گورزەی لە کودەتای ۸ی شـوباتی ۱۹٦۳ بەریانکەوت، تا دەسـاڵی دیکەش وەک حیزبێکی سـیاسـی نایەنەوە سـەرەخۆ. بەلام هەندێک ئاماژە دەریانخسـت کە حیزب دوو ساڵ دوای ئەو گورزە هاتەوە گۆڕەپان.

دوو ڕووداوی گرنگ رایانگەیاند حیزبی شـــیوعی، وەک هێزێکی ســــەنگی خۆی هەیە، گەڕاوەتەوە مەیدانی کاری جەماوەری. یەکەمیان؛ هەڵبژاردنەکانی ڕێکخراو و ســــەندیکا

حکوومییەکان و، دووەمیان ئەو خۆپیشاندانە جەماوەرییەی بەبۆنەی ساڵوەگەڕی هێرشی زایۆنیی سالی ١٩٦٧ حیزبی شیوحی سەرکردایەتیی کرد.

سەبارەت بە هەڵبژاردنەکانی ڕێکخراو و سەندیکایەکان، شیوعییەکان (٧٠ – ١٠٠٪)ی دەستە سەرۆکایەتییەکانی قوتابیانیان لە زانکۆکاندا بردەوە، ئەوەش وای لە حکوومەتی عەبدولڕەحمان کرد ئەنجامەکان هەڵوەشێنێتەوە، وەکچۆن لیستی یەکگرتنی پارێزەرانی[50]، شیوعییەکان چالاکانە بەشدارییان تێداکرد، لە سەندیکای پارێزەران بە سەرۆکایەتیی مامۆستا عەبدولوەهاب مەحمود، ئەوانیدیی ڕاماڵی ولە هەبژاردنەکان بەسەرلیستی سەرۆکایەتیی کۆمار، کە فایەق سامەرایی سەرۆکایەتیی دەکرد و لیستی "کۆنەپەرستان-بەعسییەکان" بەسەرۆکایەتیی موحسین دووری دا سەرکەوت، ئیدی حکوومەت ناچاربو دان بە ئەنجامەکاندا بنێ.

حیزب ڕایسپاردم سەرکردایەتیی هەلمەتی ئەو هەڵبژاردنە بکەم و، ژمارەیەک پارێزەری شیوعییس هاوکارم بوون و، ئەودەم لە وەزیفە دەرکرابووم و کاری پارێزەریم دەکرد. حیزبیش دەیویست هێزە نیشتمانی و دیموکراتی و قەومییەکان بکاتە بارستاییەکی دەوری لیستێکی عەبدولوەهاب مەحموودی کەسایەتیی سیاسی و کۆمەلایەتیی ناسراو سەرۆکایەتیی دەکرد.

لە ئەنجامی ئەو پەیوەندییە چڕانەی لەگەل هێزە دیمەکراتی و قەومییەکان کرا گەیشتینە دروستکردنی لیستێکی حیزبی سیوعی و کۆمەڵێک دیموکراتیی سەربەخۆ بە سەرۆکسیەتیی عەبدولوەهاب مەحمود بوو تییدا بەشداربوون و بزووتنەوەی سۆشیالیستی عارەبی و، حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیستیراکی"باڵی هەواداری سوریا"کە دیارترین کەسایەتییەکانی فوئاد ریکابیی ئەمینداری گشتیی پێشتریی حیزبی بەعس لە عێراق و ئەسعەد فرەیح بوون و عەبدولوەهاب مەحمود سەرۆکایەتیی لیستەکەی دەکرد و

---

[50] _ لە هەڵبژاردنی پارێزەران پێنج لیست بەشدارییان کردبوو، ئەوانیش:

آ_ لیستی یەکگرتن، عەبدولوەهاب مەحمود سەرۆکایەتیی دەکرد و یەکگرتنێک بوو لە شیوعییەکان ە بەعسییەکانی لایەنگری سوریا و بزووتنەوەی ئیستیراکیعەرەبی و، ٤١٣ دەنگی بردەوە.

ب_ لیستی پیشەگەری: عەندولموحسین دووری سەرۆکایەتیی دەکرد و ٢٦١ دەنگی هێنا.

ج_ لیستی قەومیی پێشکەوتنخوازی زەکی جەمیل حافز سەرۆکایەتیی دەکرد وپشتیوانیی قەومییەکان و بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکیی بەدەستهێنا و١٧٦ دەنگی هێنا.

د_ لیستی یەکگرتووی پیشەیی کە مەهدی شەمسی سەرۆکی بوو و یەک دەنگی بەدەستهێنا.

ە_ لیستی نەقیبی پارێزەران فائیق سامەراییپاسماوەی حیزبی ئیستیقلال و حیزبی وەتەنیی دیموکراتی و دەستەی عەبدولڕەحمان بەزاز لە پشتی بوون و٢٢٥ دەنگی بەدەستهێنا.لمزید: جعفر عباس حمیدی و اخرون، تاریخ الوزارات العتاقیة فی العهد الجمهری، ج١، خ٣٢٢-٣٢٣.

سەرباری نوێنەرانی ئەو حیزبانەی ناویان هێنرا، هەر یەک لە ناجی یوسف و جیهاد وەنداوی و توفیق ئالوسی و مەهدی حەسەنیی تیدابوو.
لەو هەڵبژاردنەی پێشتری کرابوو قەومییە ڕاستڕەوەکان بە هاوکاریی بەعسییەکان دەستە جەتەیان دوستکردبوو تا لێنەگەڕێن پارێزەرە دیموکراتییەکان بگەنە بنکەکانی هەڵبژاردن و، دەستدرێژییان دەکردنە سەر. من نووسینگەی مامۆستا ناجی یوسفی پارێزەرم کردە بنکەی بەڕێوەبردنی هەڵمەتەکە و لەوەشدا کۆمەڵێک پارێزەری شیوعی هاوکارییان دەکردم. جا چەند تیمێکم لە پارێزەرە لاوەکان دروستکرد تا پاسەوانیی پارێزەرەکان بکەن ولە دژی دەستدرێژیی لیستەکانی دیکە پارێزگارییان لێ بکەن، بەڵام بێ ئەوەی ڕێ لە هیچ کەسێکی لایەنگرانی لیستەکانی دی بگرن و مافی دەنگدانیان پارێزراو بێ. هۆیەکانی گواستنەوەیشمان بۆ پارێزەرە بەتەمەنەکان و بۆ ئەوانەش دابین کرد کە هیچ شتێکیان نەبوو پێی بگەنە بنکەی دەنگدان.
هەڵبژاردنەکان بە ئازادییەکی تەواوەوە کران و هیچ ڕووداوێک بەڕێوەچوونەکەی شڵوێ نەکرد و، لیستی یەکگرتن و دوولیستەکەی دی زۆربەی دەنگەکانی پارێزەرانیان ماشییەوە کە من لە کاری پارێزەریدا تازەکاربووم و ماوەی یاسایی ئەو پیشەیەم تەواو نەکردبوو تا بۆم بڕەخسێ ببمە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری سەندیکا، بۆیە خالید ئەحمەد تەهای پرێزەر ، کە مرۆڤێکی سەنگینی ناو پارێزەران بوو، دەستنیشان کرا تا لە سەندیکا ببێتە نوێنەری حیزبی شیوعی.
هەرچی کارە جەماوەرەییەکەی دیکەبوو، ئەو هەستانە جەماوەرییەبوو کە حیزبی سیوعی بەبۆنەی تێپەڕینی ساڵێک بەسەر هێرشی حوزەیرانی ١٩٦٧ی زایۆنیدا پێشەوایی کرد. ڕاستییەکەی حیزبی شیوعی ڕووی لەوەی کرد سوود لە شەرعییەتی یاسایی وەرگرێ تا پەیوەندییەکانی بە جەماوەری کرێکار و جووتیار و ڕۆشنبیرانەوە فراوان بکا، ئیدی خزییە ناو سەندیکا حکوومییەکان و چالاکییە سەندیکاییەکان و ئەو هاوکارییەی نێوان حیزبەکانی لەو چالاکییانە کەوتەوە، ڕێی کاری هاوبەشی نێوان حیزبەکانی خۆشکرد، ئیدی یەکەم کاری جەماوەریی سیاسیی هاوبەش تێپەڕینی ساڵێک بوو بەسەر هێرشی دوژمکارانە و جەماوەر بە فراوانی و گەرموگوڕی بەدەم کارەکەوە هاتن و شەقامی ڕەشید پڕبوو و نوێنەرانی حیزبەکان لە بەراییەکەی دەڕۆیشتن"حیزبی سیوعی، بزووتنەوەی سۆشیالیستیی عەرەبی، حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتراکی-باڵی سوریا، دیموکراتە سەربەخۆیەکان" دروشمەکانی بەرزیش کرابوونە وە ڕیسواکردنی ئیستیعمار و زایۆنیزم و حکوومەتە عارەبییە کۆنەپەرستەکان بوون و ڕێپێوانەکەش بەئاشتییانە و سەرکەوتووانە کۆتاییهات.

دوو ڕۆژ پاشترێ، حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکی ڕێکخستنی عێراق، هەر بۆ هەمان بۆنە ڕێپێوانێکیان کرد، بەلام دلنیابوو هاوسەنگییەک لە هێزە جەماوەرییەکاندا هەیە و، پەرەسەندنێکیش لەبەرژەوەندیی یەکگرتنی دیموکراتیدا لە ئارادایە. ئێستا بەعس دوو ڕێی لەپێشدایە، یەکەمیان، ئەگەر بیانەوێ دەست بەسەر دەسەلاتدا بگرن، دەیێ بەرەوڕووی شیوعییەکان ببنەوە، یانیش دەبێهاوکارییان لەگەلدا بکەن.

## دیدارێکی نهێنی لەگەڵ ئەحمەد حەسەن بەکرد:

حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکی- ڕێکخراوی عێراق، هەلوێستی بەرانبەر هەر کارێکی جەماوەری یان چالاکییەکی سیاسی یان سەندیکایی نەرێنی بوو ئەگەر بە دەستپێشخەریی حیزبی شیوعیی عێراقی بووایە. بگرە لەوەش واوەتر، پشتیوانیی ئەو کوتلەکارییانەی دەکرد دژی کوتلەی دیموکراتی بوون کە حیزبی شیوعی پێشەوایی دەکردن، بەلام دواترێ درکی بەوەی کرد حیزبی شیوعی بە هاوپەیمانیی لەگەلهێزە دیموکراتییە قەومییەکان، گەراوەتەوە گۆڕەپان و بووەتە هێزێکی سیاسیی گەورە و پشتیوانیی جەماوەری هەیە و هێزە پێشکەوتنخواز و نێونەتەوەییەکانیش پشتی دەگرن.
یەک لە ئاماژە ڕوونەکانی ئەوەی حیزبی بەعس، بەهاوکاریی کۆمەلێ ئەفسەری ڕاسترەوی ناو سوپا و دەرەوەی سوپا، خۆی بۆ کودەتایەکی دژی حکوومەتی عەبدولڕەحمان عارف ئامادەدەکا، ئەو نووسراوەی بەعس بوو کە دەربارەی بارودۆخی خراپی ولات دایانە سەرۆک عەبدولڕەحمان عارف و، لە واژووکردنەکەیدا ژمارەیەک ئەفسەر بەشدارییان کردبوو کە بەوەی ناسرابوون دژی دیموکراتی و شیوعییەکانن و، لەوانەش عەمیدی خانەنشین ڕەشید موسلیحی دادوەری گشتیی سەربازیی دوای کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣.
بەعسییەکان، لە هەلبژاردنەکانی کران و لە هەستانە جەماوەرییەی لە ٦ی حوزەیرانی ١٩٦٧ کرا هەستیان بە هێزی شیوعییەکان کرد. لەوەی دەترسا، ئەگەر خۆ لە کاری ڕووخاندنی حکوومەتی عارف بدا، بەرەو ڕووی بەرگریی شیوعییەکان ببێتەوە، لە کاتێکدا بەعس نەیتوانیبوو هیچ هێزێکی سیاسی بەلای خۆیدا ڕاکێشێ تا کاتێ دەسەلات وەردەگرێ پشتیوانیی بکا و، لوەش دەترسا ئەوەی لە ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣ ڕوویدابوو دووبارە ببێتەوە. ئیدی لەگەل ئەفسەرە گومانلێکراوەکانی ناو ڕیزی کودەتا بوونە هاوپەیمان وەک عەبدولڕەزاق نایف و ئیبراهیم عەبدولڕەحمان داود.
لێرەدا خالێک هەیە و دەبێ لەسەری بوەستین، ئەویش ئەوەیە کە دەزگاکانی ئیمپریالیزم خێرا لە بابەتەکانیان کۆلیەوە، ئاخر حیزبی شیوعی دووبارە لە گۆڕەپانی سیاسی، وەک

هێزێکی سەرکردەی حیزب و ڕێکخراوە جەماوەرییەکان لە دەوری کۆبووبوونەوە. دەرکەوتەوە و، هێزێکی چەکداریشی لە کوردستان هەبوو و، بەردەوامیش یارمەتیی شۆڕشی کوردیی دابوو. جا نەیاری ونارەزایی لە پایتەخت و شارەکانی دیکەی عێراقدا بەرفراوان ببوو و، جەماوەر خەباتێکی ئەوتۆی دەکرد ڕەنگە ببێتە شێرێکی سیاسیی ڕووخاندنی حکوومەت و هێنانی حکوومەتێکی هاوپەیمانیی دژی ئیمپریالیزم. هەر بەڕاستییش، ئەگەر تێکۆشانی جەمارەر پەرەی بسەندبا وحکوومەتیش بە زەبری چەک بەرگریی بکردبا، حیزب خۆی بۆ ئەوە ئامادەدەکرد.
حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکی، دوای ئەوەی خۆی بەشداریی ئەو خۆپیشاندانە دوورگرت کە هێزە نیشتمانییەکان لە شەشی حوزێران کردیان، بەبۆنەی هێرشی ٥ی حوزەیران ڕێپێوانیکی لە ٨ی حوزێران سازکرد کەسایەتییەکانی سەرکردایەتییشیان لەبەراییدا دەڕۆیشتن وەک ئەحمەد حەسەن بەکری ژازگری قوتری و، خەڵکەکە لێکدییان دەپرسی: ئەریێ ئەوە جێگرەوەی چاوەڕوانکراوە؟.
هەر بەڕاستییش، ئەو دوو خۆپیشاندانە تاقیکردنەوەیەک بوون بۆ ئەوەی بزاندرێ داخوا جەماوەر چەندە ئامادەی کارە سیاسییەکان و شەڕە نیشتمانییەکانی دادێیە و، وەکچۆن هەردووکیشیان بۆ نواندنی هێزبوون و وەڵامێکی حکوومەتیش بوون کە دەیگوت"یەکێتیی سۆشیالیستی"تاکە نوێنەری گەلە.
کەوایە دوو حیزبی سەرەکی لە گۆڕەپانەکەدا هەن، حیزبی سیوعیی هێزە دیموکراتی و قەومییە پێشکەوتنخوازەکانی لەدەورە کۆبووبوونەوە و، حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکیی ئەفسەرە گەورەکانی سوپای ناو کۆشکی کۆماری و دەرەوەی کۆشکی لە دەورە کۆبووبوونەوە تا لە بزاوتێکی کودەتایی سووک و ساناد ا حکوومەت بڕووخێنن.
بەڵام بەعس لەوەی دڵنیابوو هاوسەنگییەک لە هێزی جەماوەریدا هەیە و، ڕەنگە لە بەرژەوەندیی هاوپەیمانیی دیموکراتی پەرەبگرێ. ئیدی بەعس دوو ڕێی لەپێش بوو؛ ئەگەر بیانەوێ دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرن، یان دەبێ رووبەڕووی شیوعییەکان ببنەوە، یانیش دەبێ هاوکارییان لەگەڵدا بکەن.
لە ناوەڕاستیحوزێران، واتە دوای ئەو دوو خۆپیشاندانەی لەسەرەوە باسکران، تۆفیق ئالوسیی پارێزەر پەیوەندیی پێوەکردم، ئەو کەسایەتییەکی دیموکراتی و برادەری شیوعییەکانە، گوتی کەسایەتییەکی سەرکردەیی گەورەی حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکی دەیەوێ لەگەڵم دانیشێ و ئەو کەسەش دکتۆر عیزەت مستەفایە و، پێی باشە دیدارەکە لە خەستەخانەی "ڕازی" بێ کە هیی خۆیەتیهاوڕێیانی سەرکردایەتیی حیزبی شیوعیم ئاگادارکردەوە، ئەوانیش بە دیدارەکە رازیبون. حیزبی سیوعی ئاگای لەوەی

هەبوو حیزبی بەعس پلانێکی بەدەستەوەیە تا هاریکاریی گەورە ئەفسەرانی سوپا دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرێ.
ڕۆژی دواتریێ، تۆفیق ئالوســـی بۆ نەخۆشــخانەی 'ڕازی'یی، لە عەتیفییەی بوو، ڕەگەڵم کەوت. دکتۆر عیزەت مســـتەفا چاوەڕێی دەکردین. ئیدی تۆفیق ئالوســـیی پارێزەری بەرێکرد. عیزەت پێیگوتم کە ئەحمەد حەســـەن بەکر ویســـتویەتی بمبینێ، من و بەکر پێشــترێ یەکدیمان نەدەناســی و دکتۆر عیزەت لە ڕێگا پێیگوتم بەکر دەیەوێ بمبینێ، بۆ نەهێشـــتنی هیچ گومـانێکیش کۆتێکی پزیشــکی و گویدانێکی پشــکنینی دامێ و، بە ئۆتۆمۆبیلەکەی بردمی، بۆ خەڵەتاندنی پیاوانی ئاســـایشـــی چاودێریی ماڵەکەیان دەکرد، بەکر خۆی کردبووە نەخۆش، چووینە ماڵەکەی.
بەکر، لە ژووری میوانان بەخێرهاتنی کردین، ئەوجا دوو بەدوو دانیستین. بەکر گوتی: من وەک نوێنەری حیزبی سـیوعی داوای دیتنی تۆم کردووە. باسـی پەیوەندییەکانی پێشـترێی نێوان حیزبی بەعسـی عەرەبیی ئیشـتیراکی و حیزبی شـیوعیی عێراقیی کرد و، گوتی: ئەو ماوانەی ڕۆیشـــتن جیاوازییان هەبوو، ئیدی هاوکاری یەکدی بووین و بەتوندی دژایەتیی یەکدیشـــمان کرد و، هەندێ ڕووداوی ناخۆش و جێی داخیشـــمان کەوتە بەینێ، ئەو ماوەیەی هاوکاریی یەکدیمان کرد ســەرکەوتن و دەســتکەوتی بۆ بزووتنەوەی نیشـتمانی هەبوو و هەر چی ئەو ماوەیەی شــەڕەملەمان بوو شـکسـتی بزووتنەوەی نیشـتمانی و ئازاری جەماوەری پێوەبوو. گوتیشـی حکوومەتەکەی عەبدولکەریم قاسـم ئەو کێشـانەی قوستەوە و نێڵەی دان تا سوودیان لێ وەرگرێ، ئیدی ئیستیعمار و زایۆنیزم و حکوومەتە دیکتاتۆرەکان ســوودیان لەو کێشــانە وەرگرت. جا ئێمە ئێوەمان لەدەســتچوو و ئێوەس ئێمەتان لەدەســـت چوو، گەلیس لە ڕبردوودا هەردووکمانی لەدســـتچوو. ئەوجا باســـی بارودۆخی ناوچەکەی لە دوای شـــکســـتی حوزێرانی ١٩٦٧ی کرد و گوتی: دەبێ گەل، هەرچۆنی بۆی هەڵکەوێ گورزی بەهێز لە بەرژەوەندییەکانی ئیســـتیعمار و حکوومەتە خائینەکان بدا و ئەو شـکســتە بکاتە دەســتپێکی ســەرکەوتن، ئەوجا هاتە ســەر باســی حکوومەتەکەی عەبدولڕەحمان عارف و گوتی: بە ئاشـــکرا خیانەت لە گەل دەکا، لاوازە، بەڵام ڕووخاندنی پێویســـتی بە پاڵێکی بەهێز هەیە و، ئەوەش گران نییە، بەڵام دەبێ بیر لەو شـــتانە بکەینەوە کە دوای ڕووخانی ڕوودەدەن، نابێ ململانێ لەگەڵ یەکدی بکەین و دەبێ وەک پێشـــترێ نەکەین، بەڵکو دەبێ هاوکاربین. ئەوجا گوتی: من نەیاریی حیزبی شــیوعی وەک 'دلۆپی کووپە'ی دادەنێمبەردەوام لێدەدا تا بەرانبەرەکەی لاواز دەکا ئەگەر بەردیش بێ، ڕەنگە خۆیشــی نەتوانێ ئەو کارەی بقۆزێتەوە، یێدت خەڵکی دی دەیقۆزنەوە و خۆ هەڵدەدەنە ســـەر دەســـەڵات. دوایە داوای کرد لاپەڕەیەکی نوێی پەیوەندی لە نێوان

هەردوو حیزب بکرێتەوە و هاوکارییان لەسەر بنەما نیشتمانی و قەومییە ڕەگازۆیەکان لە نێواندا بێ کە بەرجەســـتەی بەرژەوەندییەکانی گەلی ڕەنجدەر بکا و، گوتی: با کار بۆ چاکســازیی کارکان بکەین، ڕێیەکی درێژ و ئەســتەمی تێکۆشــانی هاوبەشــمان لەپێشــە و زۆریشمان تاقیکردنەوەی پێشتریێ بەدەستەوەیە. تکای لێکردم ئەو ئارەزووە راستگۆیەی بۆســـەرکردایەتیی حیزبی شـــیوعی بگوازمەوە هیوایشــــی هەبوو وەلامێکی نەرێنیی بە خێراترین کات بگاتەوە دەستی و، لە پێناوی ئەوەی ولات لەو بارە خراپە دەربازکەین هەر یەکسەر دەست بە هاوکاریی یەکدی بکەین و دەستکەوتی زیاتر و زیاتر پێشکەشی گەل بکەین. داوایکرد شـــیوعییەکان لەگۆڕینی دەســـەلات لەگەڵیان هاوکار و هاوبەشـــبن و پێشـنیاریشـی کرد سێشـیوعی لە حکوومەتی دوای ئەو حکوومەتەی ئێسـتا بەشـداربن و ئەوسێیەش هەریەک لە موکەڕەم تاڵەبانی و دکتۆر محەممەد سـەلمان حەسـەن و دکتۆر حافز توکمەچی بن.

پێمگوت: بەڕێز باوکی هەیســـەم، من بەو دیدارە خۆشـــحاڵ، بێ ســـوودیش نابێ ئەگەر ســـەبارەت بە داهاتووی ولات بیروڕا بگۆڕینەوە. بەلام بە ڕاشـــکاوییەوە دەڵێم هێشـــتا کارەســاتەکانی ١٩٦٣ لە زەینی خەڵکدا ماوە و هێشــتا ســەدان شــیوعی لە بەندیخانە بیابانییەکەی نوگرە سەلمانن و، هەزاران کەس لە خۆیان و لایەنگران و برادەرانیان لە کار و فەرمانەکانیان دەرکراون و شـــەڕێ پاروونانەکەیان لەگەل دەکرێ. جا ئەگەر ڕێی بۆ خۆش نەکەین و شـــوێنەوارە دەروونییەکانی ئەو چورتم و بەلایانە چارەســـەر نەکەین نـاتوانین هیچ جۆرە هـاوکـارییەک ڕابگەیەنین و هـاوڕێیـان و جەمـاوەری لایەنگر و خانەوادەی و خزم و کەســـی لێقەوماوان هیچ ئامادەباشـــییەکیان بۆ قبووڵکردنی ئەو هاوکارییە لەهیکڕایە نییە. بەلام ئێمە هۆز عەشیرەتێک نین لەپشتی کیشوەرانەوەبین، ئێمە حیزبێکی سیاسیین و بەرژەوەندیی گەل و ولات لەسەرەوەی هەموو ستێک دادەنێین. ئێمە پێمانوابوو لە ١٩٦٣ کودەتا دژی شـۆڕشـی ١٤ی تەممووزە، ئیدی دەتمان لە هیچ شـتێکی دژی ئێوە نەگێڕایەوە، ئەگەر ئێســـتـاش بگەینە هەمـان خەملاندن، دوودڵ نـابین لەوەی بەتوندی بەرەوڕووی هەوڵی دەســـەلات وەرگرتنتان بوەســـتین وگوێش بەو قوربانییانە نـادەین کە ڕەنگە لەوەی پێشـــتریش زیـاتربێ، ئەوەش بۆ بەرگری لە بیروبـاوەڕمـان و بەرگری لە مـاف و بەرژەوەنـدییەکـانی گەل. بەلام ئەگەر خەملانـدنەکـانمـان بەجۆریکی دیکەبوون ئەوا هەموو هەوڵێک دەدەین ئەوی پێشـــتێ ڕوویداوە بیبوێرین. بەلام بواردنی ئەو ڕووداوانە و ئەفرانـدنی کەشـــێکی دەروونی لای هــاوڕێیــانمــان و ڕەنگە لای هاوڕێیانیشـــتان و پەیداکردنی کەشـــێکی گونجاوی هاوکاریی نێوانمان لە داهاتوودا رەنگە پێش و پاش وەرگرتنی دەسەلات بکەویتە سەر ئێوە. دەبێ بەگیانێکی نوێوە مامەلە لەگەل

جەماوەری گەل بکرێ وشوێنەوارە ئازاربەخشەی کارەکانی پێشتریتان چارەسەر بکەن و دەرەنجامەکانیشـــی بە تەواوی بســـڕنەوە. تەنیا ئەودەمی ڕەنگە کەشـــێکی گونجاوی ئەو جۆرە هـــاوکـــارییەی نێوان ئەو دوو حیزبە و ئەو دوو جەمـــاوەرە دروســـــتبێ، وەک فەرمووشـــتان هاوکاریی نێوانمان نوێ نییە و پێشـــتری لە بەرەی یەکێتیی نیشـــتمانیدا لە ســـاڵی١٩٥٧ هاوکاریی یەکدیمان کردووە و کارەکانیشـــی بە ســـەرکەوتنی شـــۆڕشـــی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ بەری دا.

ئەحمەد حەسەن بەکری سوپاسی ئەوەی کردم کە کاوبارەکانمبەدروستی خەملاندووە و بەرژەوەندیی گەل و نیشـــتمانم لە ســـەرووی بەرژەوەندی و حیســـابێکی دیکە داناوە و، گوتی: ئەگەر ئێمە هەردوو حیزب، هەر لە ســـــەرەتـاوە، نیەتێکی ڕاســـــتگۆی ئەفراندنی کەشێکی هاوکاریی نێوان خۆمان هەبێ، ئەوا دەستەبەر کردنی ئەو کەشە ئەوەندە ئەستەم نییە. بەڵام شـــۆڕش؛ هەر شـــۆڕشـــێک، دەبێ پێش و پاش هەڵگیرســـــانی بەدوای هاوپەیمانەکانیدا بگەڕێ ، بۆیە ئێستا دەتوانین هاوپەیمانەکانمان دەستنیشـان بکەین و با ناویان لێبنێی هاوپەیمانە ئاســـاییەکان و نەڵێین هاوپەیمانی گریمانەکراو، هەرچی ئێمەین، ئەوا لە ئێســـــتاوە ئامادەی هاوکاریین و، ئەو جۆرە هاوکارییەس ســـــەرەتایەکی باش و یەکلاکەرەوەی ئەفراندنی کەشی لێکنزیکبوونەوەیەکی سیاسیی تەواوی نێوانمانە.

پێمگوت: ئێمە ڕێکخستنەکانمان لە دەسەڵات دەشارینەوە تا دەستی پیاوانی ئاسـایشـیان نەگاتێ، بەڵام هەرگیز سیاسەتەکانمان لە گەل ناشارینەوە و دوو سیاسەتیشمان نییە یەک نهێنی و یەک ئاشـــکرا. ئێوە دەزانن حکوومەتی تاهیر یەحیا ڕقی گەل لە بەرانبەر خۆیدا کەمکاتەوە، ئیدی سەدان بەندی سیاسیی بەردا و، لە ناویشیاندا شیوعییەکان، بەڵام ئەوە ســـیاســـەتی ئێمەی بەرابنەری نەگۆڕیدروشـــممان هەر رووخاندنی حکوومەتەکەی تاهیر یەحیایە، پێچەوانەی ئێوە، کە بەیانیان لە کۆشـــــکی کۆماری لەگەل عەبدولڕەحمان عارف کۆدەبنەوە و ئێوارانیش لەگەڵ نەیارەکانی کۆدەبنەوە تا پلانی ڕووخاندنی دابنێن. گوتتان ئێوە بەدوای هاوپەیماندا دەگەڕێن بۆ ئەو شۆڕشەتان کە خەریکە بەرپای دەکەن، ئێمەتان وەک هاوپەیمانی ئاسـایی دەسـتنیشـان کردووە، بەلام ئێمە گوێمان لەوەی دەبێ کە دیدار لەگەڵ ئەم و ئەو دەکەن، بۆیە دەمانەوێ نزانین هاوپەیمانەکانی دیکە کێن و، ئەوانە کێن بۆ ڕووخاندنی حکوومەت کارتان لەگەڵ دەکەن؟

گوتی: بێ متمانەیی نا، بەڵکو پاراستن و مەلەی ئاسـایشـیئەومان بەسـەرا دەسـەپێنێ ئەو کارانە ئاشکرا نەکەین.

گوتم: بەڕێز ئەبو هەیســـــەم، ئێمە یاریی پۆکەرتان لەگەل ناکەین تا بڵێین ئەوە کاغەزە شـاراوەکەیە، ئاخر کاغەزێکی خراپ تووسـی زیانمان دەکا و رەنگە مایەپووچیشـمان بکا،

وەک دەڵێن ئێوە بەتەمای ڕووداوی مەترسیدار و گرنگن و کاریگەرییەکی بنەڕەتیی لەسەر ڕژێمی حوکم و سیاسەتی وڵات دەبێ. داوادەکەن وەک هاوپەیمانی سەرەکی و ئاسایی هاوکارتان بین. بە تەخمینی من ئێوە هاوپەیمانێکی لە ئێمە بەهێزترو ڕاستگۆترتان دەست ناکەوێ، ئەوەندەی منیش بزانم لەناو حیزب و هێزە سیاسییەکان هێشتا هیچ کەس ڕاینەگەیاندووە هاوکاریتان بکا و، ڕەنە عەمر و زەیدێکتان هاوکار هەبێ، بەلام بە دڵنیاییەوە لەو کەسایەتییە سیاسییانە نین کە ڕابردوویەکی نیشتمانی و باڵا و پاکیان هەبێ، ڕەنگە هاوڕێی ڕێگا بن. لەوانەشە هاوڕێی خراپ بن و ببنە ئامرازێک بۆ ڕاگرتنی شیرش و تێکدانی، پەندەکەش دەڵێ "هاوڕێ پێشی ڕێ"ئەو جۆرە شۆڕشانەش مەوایان لە ولاتی خۆمان کۆتایی نایەت، بەتایبەت ئەگەر ئێمە و ئێوە هاوپەیمانیمان ڕاگەیاند، بەڵکو ئەو سنوورە دەبڕێ و دەبێتە ڕووداوێکی مەزنی ناوچەکە و، زەنگی مەترسی بۆ هەموو هێزە نەیارەکان لێدەدا، ئەوەش وادەکا ناچاربین هەموو هێزە جیددییەکان و گشتگیرەکانی گەل بۆهەموو ئەگەرێک تەیار و ئامادەکەین و، هەر لە ساتی تتەقینەوەیدا پشتگیریی جیهانیی بۆ دەستەبەر بکەین. بەدڵنیاییشەوە، ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستان ڕێی ئەو جۆرە شۆڕشانە گوڵرێژ ناکەن، بەڵکو هەر لەیەکەم ساتیدا بەربینگی دەگرن، جا چەندی ڕیزەکانی شۆڕش پتەو و پاک بن ئەوەندە بە دامەزراوی بەڕێی خۆیدا دەڕوا، جا ئەگەر ئێوەس لە هەڵوێستێکی وەک ئەوەی وەک ئێمە بوونایە ، ئەوا لەبەر هەندێ کاروباری لای خۆتان ڕوونە، پشتگیرییەکی ڕەهاتان نەدەدا.

ئەوجا لێمپرسی هەڵوێستتان بەرانبەر شۆڕشی کورد چییە؟ گوتی ئێمە لەگەڵ بارزانی پێکهاتووین. گوتم: گوتم کەواتە ئێوە بەو زووانە حلوومەت هەر دەرووخێنن، ئێمەی کە پێشەکی پشتیوانیی ڕەهای خۆمان نادەینە ئەو کارەتان، وەک پێیشم وایە بەیاننامەی لەسەر دەرناکەین. ئێمە لەژێر ڕۆشنایی ڕێوشوێنەکانی ئێوەلە چارەسەرکردنی شوێنەوارە خراپەکانی کودەتای شوباتی ١٩٦٣ هەڵوێێستی ورد و دروستی خۆمان دیاری دەکەین.

داوای ناونیشانی نووسینگە و ماڵ و ئەو ژمارەی تەلەفۆنەی لێ کردم کە دەکرێ پەیوەندیی پێوە بکرێ. بەگاڵتەوە گوتمخۆتان ماندوو مەکەن، چونکە ئەوکاتەی بەیانی ژمارە"١" بڵاودەکەنەوە نە لە ماڵەوە و نە لە نووسینگە نامدۆزنەوە. گوتی: بەڵکو تۆ دەبینی کە هاوڕێ و براین و هەر لەیەکەم ساتەوە بەشداریمان دەکەی. بە گاڵتەوە گوتم: تکاتان لێدەکەم شۆڕش لە گەرمای تەممووزێ مەکەن، لە ئاهەنگەکانی شۆڕش هەتاو دەمانبا، تا پایزێی دوابخەن. گوتی: کاری باش دەبێ پەلەی لێ بکرێ، حکوومەت داهێزراوە، هەر یەک پاڵی دەوێ و ئیدی کارەکان دەگۆڕێن.

ئەوجا داوای لە دکتۆر عیزات مستەفا کر بمگەیەنێتە نووسینگەکەم و ناونیشانەکەیشی بزانێ و، داوای ناونیشانی دکتۆر محەممەد سەلمان حەسەن و دکتۆرحافز تۆکمەچییشی لێ کرد.
ئەوەی لە دیداری ئەحمەد حەسەن بەکرگوترابوو، خستمە بەردەمی سەرکردایەتیی حیزبی شیوعی و، پێی ڕازیبوون و، ئیدی هەندێ ڕێوشوێنی خۆپارێزی بۆ ئەوشتانەی لەهیکرا ڕوودەدەن گیرایەبەر.

## کودەتای ١٩٦٨ و دیداری بەکر لە کۆشکی کۆماری:

لە مەودای مـانگێکی دوای دیـدارەکەم لەگەڵ بەکر و تـا تـا ڕاگیـانـدنی ڕووخـانـدنی حکوومەتەکەی عەبدولڕەحمان عارف و تا بەعســـیش دســـەڵاتی وڵاتی وەرگرت، حیزبی شیوعیی عێراقی بە وریاییەکی زۆرەوە هەستی لە گۆڕانکارییانە ڕاگرتبوو کە ڕوویاندەدا و، لە بانگێشـــتی هاوکاریی جیددیی نێوان دوو حیزبەش زۆری متمانە بە بەڵێنەکانی بەعس نەبوو.

لەڕۆژی کودەتـای ڕێکەوتی ١٧ی تەمموز، کە لە ئێزگەی کودەتـاچییەکـان دەســـتیـان بەسەردا گرتبوو گوێمان لە بەیاننامەکان بوو، لەگەڵ هەندێ لە خزمان لە ماڵەکەی خۆمان لە وەزیرییە دانیشـــتبووین ، ئەوان خەمێک رووی داگرتبوون، ئاخر هێشـــتا ئەو ڕووداوە خوێناوییانەیان لە یادەوەریدا مابوو کە لە ١٩٦٣ ڕوویانـدا. داوایـان لێکردم مـاڵەکەم بەجێبێڵم و تـا کارەکـان ڕوون دەبنەوە لەجێیەکی دی خۆم بشـــارمەوە. بەڵام گوێم لە بەیاننامەکان ڕاگرت و لەجێی خۆم نەبزووتم. سەیریان بەو هەڵوێستەم هات و پرسییان: "شـطێک لەسـەر کودەتا و کودەتاچییەکان دەزانی؟؟ گوتم: بەڵێ، ئێسـتا هیچ مەترسـییەکم لەسەر نییە.

لام روون بو ئەحمەد حەسـەن بەکرد سـەرۆکایەتیی حکوومەت وەردەگرێ، بەڵام لەهیکرا دیتم وەزارەت بە ســـەرۆکـایەتیی عەبـدولڕەزاق نـایف پێکـدێ، ئەو، لە حکوومەتەکەی عەبدولڕەحمان عارف، بەڕێوەبەری هەواڵگریی سـەربازی بوو، بەوەس ناسـراوە لایەنگری خۆرئاوایە و بەتایبەتییش بەریتانیا.

دوو ڕۆژ دوای کودەتا، دکتۆر عیزەت مســـتەفای ببووە وەزیری تەندروســـتی پەیوەندیی پێوەکردم. داوای لێکردم ، بۆ دیداری ســـەرۆک ئەحمەد حەســـەن بەکر، پێکەوە بچینە کۆشـکی کۆماری، جوومە وەزارەتی تەندروسـتی و دوایەش ڕوومان لە کۆشـکی کۆماری کرد، پاســـەوانەکـان نەیـانهێشـــت لە دەرگـا بچینە ژووری، ئەوان هێشـــتـا وەزیری تەندروستییان نەدەناسی، ئیدی دکتۆر عیزەت خۆی ناساند و لێگەڕان بچینە ژووری و بۆ نووســـیمگەی بەکری ســـەرۆککۆمـار. بەکرد بە جلوبەرگی ســـەربـازییەوەبوو و کلاشـــینکۆفێکیشـــی لە تەنیشـــت بوو، لە لایەکەی دیکەیشـــی لەنێوان هەردوو یەلەفۆندا دەمانچەیەکی "٩" ملم"ی جۆری براونینگی دانابوو و، خۆشـــی و نیگەرانیی هەردووک بە ڕووانەوە دیاربوو. بەکر هەســـتایەوە و بەگەرمی دەســـتی لە ملی کردم و گوتی: من لێرە دادەنیش، هیواداربووم بەعسییەک لەلای ڕاستمەوە دانیشێ و شیوعییەکیش لەلای چەپم، دەبێ بڵێین ئەوەی چوو چوو، دەبێ ســەیری داهاتوو بکەین. گوتم: ســەرۆکی بەڕێز، لێرە ســـەرۆک قســـەکەی پێ بڕیم و گوتی: من هاوڕێتان بووم، یان دەبی بەو ناوە بانگم بکەی

یان بە ئەبو هەیســەم. گوتم: هاوڕێ ئەبو هەیســەم، **ئێمە** دەزانین ڕابردوو نایەتەوە، بەلام لەبیرکردنی رابردوو تەنیا بە چارەســەرکردنی شــوێنەوارەکانی ئێســتا دەبێ، ئەودەمی بە دڵنیـاییەوە و بە ئـارامییەوە لە داهـاتوو دەڕوانین. گوتی: دەبینن، خوایـاربێ، هەموو ئەو شتانە چارەسەر دەکەین، بەکر بە مکوڕییەوە پەلەی لە هاوکاریی هەردوو حیزب دەکرد.

دوای گفتوگۆیەکی درێژی نێوانمـان ڕووم لەو بینـایەی کرد کە کرابووە بنکەی ســەرکردایەتییقوتریی حیزبی بەعس و لە بزیک دەرگای دەرەوەی کۆشـکی کۆماری بوو، هەردو ئەندامی ســـەرکردایەتیی قوتی حیزبی بەعس، بەرێز عەبدولخالق ســـامەڕایی و عەبدوڵلا ســەلووم ســامەڕایی لەوێبوون. بە عەبدولخالقم گوت:ئەرێ ئێوە داواتان دەکرد داواتان دەکرد لەگەڵ عەبدولڕەزاق نایف و ئیبراهیم عەبدولڕەحمان داود لەگەڵتان بێینە سـەر دەسـەڵات؟ گوتی: ئەوانە هاوڕێی ڕێگان، ناچاربووین لەگەڵ خۆمان بەشـدارییان پێ بکەین، بەڵام کردارێکی راســـتکردنەوەی کارەکان بەو زووانە دەکرێ و دووردەخرێنەوە. گوتم: باشـــە ئەدی ئەگەر ئەوان کارێکی کارڕاتکردنەوەیەکیان کرد، ئەوســـا چی؟ گوتی: چەندرۆژێکە و لادەدرێن. بەڵام من بە وریاییەوە قسەم لەگەڵ دەکردن.

ڕوون و ئاشـــکرا دیاربوو دەســـەڵات بە لادانی نایف- داود تووســـی گەلێ ئاســـتەنگی ئیمپریالیزم دەبێ.

## بۆ نایف - داود لە دەسەڵات دورخرانەوە؟

بوونی خەڵکانێکی وەک عەبدولڕەزاق نایفی بەڕێوەبەری هەواڵگریی حکوومەتەکەی عەبدولڕەحمان عارف و عەبدولەحمان داود و دکتۆر ناسر حانی لەڕیزی کودەتاچییەکان، هەزار یەک نیشانەی پرسیاری سەبارەت بە ناوەرۆک و ئاراستەی کودەتا دروست دەکرد. بەتایبەتیش کە عەبدولڕەزاق نایف پۆستی سەرۆکوەزیرانی وەرگرت و عەبدولڕەحمان داودیش پۆستی وەزیری بەرگری، کە ئەو دوو پۆستەش دووپۆستی هەرەگرنگی حکوومەتە کودەتاییەکانن. پاساوی فەرمیی سەرکردایەتیی حیزبی بەعس ئەوەبوو گوایە عەبدولڕەحمان داود پێش کودەتا نهێنییەکەی بۆ نایفی هاوڕێی باسکردبوو، ئیدی نایف داوای پۆستی سەرۆکوەزیرانی کردبوو، جا بەعس کەوتبووە بەینی دوو بژاردان، یان بە داوایەکەی رازیبی و یانیش پیلانەکەی ئاشکرا ببی و، ئەوجا شکستی شۆڕش و ئەو کارەساتانەی بەدووایدا دێن. بەڵام پرسیارێکی دی سەبارەت ە عەبدولڕەحمان داود هەیە، ئەدی بەخۆیشی جێی گومان نەبوو؟ باشە بۆ دکتۆر ناسر حانیی نزیکخستەوە و دوایەش بەو جۆرە غافڵکوژ کرا؟

لە ڕۆژانی بەرایی کودەتا و لەبەردەم پرسیارگەلێکی ئێمە، سەرکردایەتیی بەعس پێیدەگوتین بەوزووانە " بزاوتێکی راستکردنەوە" دەکا تا لە دەسەڵاتیان دووربخاتەوە و، هەر بەڕاستییش ئەوکارە لە ٣٠ی تەمموزی ١٩٦٨دا کرا، واتە سێزدە ڕۆژ دوای کودەتا، وەک منیش بزانم، تەها یاسین ڕەمەزان لەوان ڕۆژاندا سەرقاڵی خەڵک گواستنەوەی نا ووەزارەتی بەرگری بوو و، ئەفسەرە بەعسییەکان یان لایەنگرانی بەعسیی لە جێیە هەستیارەکان دادەنا، نەوەکا نایف بە هاریکاریی دەستەیەک لە ئەفسەرە ڕاستڕەوەکانی برادەری دەستپێشخەری بکا و "بزاوتێکی راستکردنەوە بکا و بەعسییەکان لە دەسەڵات لادا و خۆی بە تەنیا بمێنێتەوە.

حکوومەت، سەبارەت بەو " بزاوتەی ڕاستکردنەوە"ی عەبدولڕەزاق نایف و داودی هاوڕێی پێ لە پۆستەکانیان لابرد، چیی گوت؟ کە داوای ئەو دوەی تێدابوو بۆ لادانی پاسای ژمارە"٨٠".

ئەگەرچی حکوومەت پاساوی بۆ دوورخستنەوەیان هێنایەوە، بەڵام خەڵکێکی زۆر باوەڕیان بە ناوەرۆکی بەیاننامەکەی حکوومەت نەکرد و، پێیانوابوو کردارەکە کردارێکی بەعسیانەی رووتی غایەنیکردنی بەعسییانەیە لە هاوڕێیان، بەڵام بەیاننامەکە ڕووناکی دەخاتەسەر ڕاستییەکی شاراوەی ئەو ململانێیەی لەنێوان کۆمەڵە مۆنۆپۆلییەکی نەوتیی بەریتانی و مۆنۆپۆلیی فەرەنسیدا هەبوو و کە ئیمتیازی بەتەنێی بەدوای نەوتدا گەرانی لە

هۆڕاوەکانی باشـــووری خۆرهەلاتی عێراقی لە حکوومەتەکەی عەبدولڕەحمان عارف بەدەســـتهێنابوو. ئەودەمای حکوومەت ڕێککەوتنێکی لەگەل فەرەنســـا واژووکردبوو و ئیمتیازی بەدوای نەوتدا گەرانی لە مەکامن "هۆڕاوەکانی حەویزە" و کۆمەڵە دوورگەکانی "مەجنوون"ی دابووە کۆمپانیای "ئیراب"ی فەرەنسی، جا کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی چاوی لەوەی بوو هەموو ئیمتیازەکان هەر بۆ ئەو بێ، بە نیگەرانییەوە هەستی لە پەرەسەندنەکانی پەیوەندیی نێوان حکوومەتی عێراقی و فەرەنســـا ڕاگرتبوو، نەخاســـمە دوای ســـەردانی سەرۆک عەبدولڕەحمان عارف بۆ پاریس و ئەو دەنگۆیانەی گوایە لەوێ دیاری و بەرتیلی وەرگرتووە، جا کۆمپانیای نەوت لەوەی دەترســـا، لە جێیە بەرهەم نەهێنراوەکانی حکوومەت بەپێی یاســـای ژمارە "٨٠"ی ســـالّی ١٩٦١ وەریگرتبوونەوە، کۆمپانیا فەرەنسییەکان جێی بگرنەوە.
ئەگەرچی حکوومەتی کودەتای سالّی ١٩٦٣ ئەو یاسایەی لەسەر ڕەفکەی دانابوو، کەچی ئەوە کاتی بوو، وەک عەبدولکەریم قاســـمیش بەرانبەر هەڕەشـــەکانیکۆمپانیاکانی نەوت گوتی: "ئێوە پێتانوایە باروودۆخەکان لە عێراقدا دەگۆڕێن، منیشـــدەمەوێ بۆتان نووپاتکەمەوە ئەو زنجیرەیە کۆتایی نایەت". جا حکوومەت، بە هاندان و دنەدانی پۆلیســـی"ئیراب"ی فەرەناســـی جاوی لەوەی بوو بەشـــی شـــێری لە میراتییەکانی قاسم بەرکەوێ، ئەو یاسایەی زیندوو کردەوە.
نوکەست دەست نەدەکەوت لەسەر ئەوەی هاورا نەبن کە سێینەی عەبدولڕەزاق نایف و عەبدولڕەحمان داود و دکتۆر ناسر حانی پەیوەندییەکی پتەویان بە خۆرئاواوە هەبوو و، نەخاسمە بەریتانیا. جا سەیر نەبوو نایف داوای جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنەی بکا کە لەسەر بنەمای ئەو بەڵێنەی بەشداریی لەە کودەتایەکە کردبوو و ئەویش هەلوەساندنەوەی یاسای ژمارە"٨٠" بوو،بەلام " ئەو زنجیرەیە کۆتایی نایەت"، ئەگەر دوێنێ قاسمی کوشت، ڕەنگە ئەورۆ نایف – حانی بکوژێ و سبەینێش دەسەلاتی بەکر رادا و، هەر ئەوەندەشمان بەسە بەبیرمان بێتەوە ســـەرۆکی کۆمپانیای ئەنگلۆ – فەرەنســـی، لە کاتی خۆمالّیکردنی نەوتی ئێرانی لە ســـەردەمی دکتۆر موســـەدەق گوتی:"هەوتبوونێکی ناخۆشـــە پیاو بەیانییەکەی لەخەو هەستێ و ببینێ بەشی هەرەزۆری نەوتەکەی لەدەستداوە". کۆمپانیا نەوتییەکان لە هێدمەکەیان واگاهاتن و لەناو ئەفسەرانی سوپای عێراقی بەدواینموونەیەکی وەک ژەنەراڵ زاهیدیدا دەگەران تا لەکاتی پێویست سەڕەکە لە بەرژەوەندیی ئەواندا یەکلا بکاتەوە، بەلام با ببینین شەڕەکە لە بەرژەوەندیی کێ یەکلاکرایەوە.
نایف- داود، پێویســـتیان بە کاتێکی تەواوبوو تا خەڵکی لایەنگری خۆیان لە ناو ســـوپادا لەدەوری خۆیان کۆکەنەوە و "بزاوتێکی ڕاســـتکردنەوە" دژی بەعس بکەن. لە ماجەرای

کارەکانیشـــرا دەردەکەوێ، بەعس، وەک عەندولخالق ســامەڕایی ئەندامی ســەرکردایەتیی قەومی گوتی، ئەودەمای واژووی ڕێککەوتنی هاوبەشـــیی دەســـەڵاتی لەگەڵ نایف واژوو دەکرد، پلانی ئەوەیشـی دادەنا هەر لەگەڵ گەیشـتنە دەسـەڵات، بەهەر نرخێک بێ، خۆی و هاواڵەکانی لەناو ببا.

ئەگەر دکتۆرموســـەدەق هەڵویســـتی خراپ بوو و، ئەودەمەی خۆی بۆ شـــەڕی مۆنۆپۆلە نەوتییەکـان هەڵکردبوو، لە هـاوکـاریکردنی لەگەڵ هێزە نیســـتمـانییەکـانی دیکەی وەک حیزبی"تودە"دا هەڵەی کرد و ژەنەراڵە کۆنەپەرســـتەکانی نموونەی "زاهیدی"ی لە ســـوپا هێشتەوە، ئەوا حیزبی بەعس سوودی لەو هەڵەیەی دکتۆر موسەدەق هەڵەی قاسمیش وەرگرت و، پێش و پاس کودەتا داوای هاوکاریی لە حیزبی ســیوعی کرد و بیریشـــی لە لەکۆڵکردنەوەی ئەو خەڵکە کۆنەپەرســـتە ســـەرچڵیکەرانەی ناو ســـوپا، تا لەوەی دڵنیابێ. کاتێ دەچێتە شـــــەڕی خوماڵیکردن لە دژی مۆنۆپۆلەکانی نەوت لە عێراق، کودەتایەکەی زاهیدی لێرەش دووبارە نابێتەوە.

دەتوانین بڵێین: شـەڕی نەوت بە للەدەسـەڵات لادانی نایف دەسـتی پێ کرد، بەڵام هێشـتا مەسەلەی دیکە لەسەر ڕێی بەعس هەبوون بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی شەڕ و یەکلاکردنەوەی لە بەرژەوەندیی عێراق، کێشـەی کورد و مەسـەلەی بەرەی نیسـتمانی لەو گرنگترین پێداویستییە پێویستانەبوون تا بەیەکڕیزییەکی پتەو بچنە ئەو شەڕەوە.

ئەوجا بەعس ناســـر حانیی وەزیری دەرەوەی لە ١٠ی تســـرینی دووەمی ١٩٦٨ غافڵکوژ کرد، لە ماڵەکەیدا پەیوەندییان پێیەوە کرد کە سەرۆک ئەحمەد حەسەن بەکرداوای کردووە ببینێ و ئۆتۆمۆبیلێک دێ تا لەماڵەوەڕا بیباتە ئەو دیدارە. هەر بەڕاستییش ئەو ئۆتۆمۆبیلە هات و بردیی، بەڵام پەیوەندیی لەگەڵدا نەما، ڕۆژی دواترێ تەرمەکەی لە "قەناتی جەیش" لە خۆرهەلاتی بەغدا دۆزرایەوە.

ســـەربردەی غـافڵکوژکردنەکەشـــی ئـامـانجی ئەوەبوو گومـانی ئەوەی برەوێتەوە کە کودەتایەکە، لەڕێی ئەو کەسانەوە، پەیوەندیی بە وڵاتە ئیستیعمارییەکانەوە هەیە.

## حیزبی سیوعی سەبارەت بە کودەتا چیی گوت:

لە ناوەراستی تشرینی یەکەمی ١٩٦٨، لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعیی عێراقیکۆبوونەوەیەکی کرد و بەیاننامەیەکی دەرکرد و تێیدا رای خۆی بەرانبەر کودەتا و دیارترین بابەتە هەرە پێویستەکانی دۆخی سیاسی دەربڕیبوو و حکوومەتی کودەتایشی[51] وەک خوارەوە هەڵسەنگاندبوو:

ئەو خەڵکەی سوپای ئەندامی حیزبی بەعسن یان لەسەر حیزبی بەعس حیسابن و لەگەڵیدا بەشداری دەسەڵاتەکەینە، کۆمەڵێ خەلکن لە بیروڕا جودا و بنەمایەکی سیاسیی یەکگرتوویش کۆیان ناکاتەوە، ئەگەر پێکهاتەی دەسەڵاتی ئێستا بخەینە لاوە و چاو لەو راستییەش بپۆشین کە بەعس لە دەسەڵاتی دەوڵەت چ پێگەیەکی هەیە، ئەوا دەبێ بێتە بن باری رەخنە و لێپرسینەوەی بەردەم گەل و هێزە نیشتمانییەکان. شێوەی دەسەڵات و ئاراستە گشتییەکەی و چارەسەرییەکانی بۆ کێشەکان، هەمووی لە چوارچێوە و

---

[51] _ گرنگترین ئەو شتانەی لە بەیاننامەکەی حیزبی شیوعی هاتبوو، لەسەر بارودۆخی ناوخۆ و شیکردنەوەی سروشتی کودەتایەکە چڕببووەوە و، دووپاتیکردبووەوە دەبێ ڕێچکەی دەسەڵاتی نوێ بگۆڕدرێ و بەدوای ئەو کودەتایانەشدا چووبووەوە کە لە عێراق ڕوویاندابوو و وەهای وەسف کردبوون کە: "دەسەڵات هەر سروشتەچینایەتییە بنەڕەتییەکە و سیاسەتە دژە گەل ە دژە یموکراتییەکەی خۆت پاستووە" وەهایشی دانابووچارەسەری سوێنەوارە خراپەکانیئەو ڕژێمانە لەوەیدایە"شێوازەکانی حوکمی دیکتاتۆری و سیاسەتی ستەمکارانە و هەموو پاشەرۆ و یاسا و دامەزراوە تۆقێنەرەکانی لەناو ببا" بانگەشەی ئەوەیشی کردبوو کە سەرکردە نوییەکان دەبی ڕێچکەیەکی نوێیان هەبێ و " پشت بە پێکهێنانی حکوومەتێکی فرەلایەنیی نیشتمانیی دیموکراتی ببەستێ کە نوێنەری ئیرادەی هێزەهێزە هاوپەیمانەکانی ناو بەرەی نیستمانی بێ، چونکە هەر ئەو بەرەیە ئێستا هێزی توانادارى دەستەبەرکردنی ئامانجە زۆر پێویستەکانە کە گەل داوایان دەکا"و، تا شوێنەوارەکانی رابردوویشوەک باس دەکرێن بە هەموو خراپییەکانیانەوە نەگەڕێنەوە . بەیانەکە باسی ماهیەتی کودەتایەکەی کردبوو لەگەڵ ئەو بارودۆخەی تێیدا دروستببوو وکە هیچ هاوگونجانییەکی فیکری و باوەڕی لەناو ڕریزەکانیدا نەبوو و، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ململانێی باڵەکانیکودەتا و دەستبەسەرداگرتنی بەعس. بەیاننامەکە ڕەخنەی لە بەبەعس کردنی دەوڵەت گرتبوو و دامەراندنی "سوپایەکی بیروباوەڕی"، واتە سوپایەکی بەعسی ودەست بەسەرداگرتنی سەرکردایەتیی ڕێکخراوە جەماوەرییەکان و سەندیکاکنی کرێکاران، کە لە ئامانجە هەرە بەراییەکانی بەعس بوون. بەیاننامەکە پێیوابوو ئەو دەسەڵاتەی ڕژێمی دەسەڵات پێشنیاری دەکا"لە ڕاستیدا دەسەڵاتێکی نادیموکراتییە و لە جەوهەریشداخوکمێکە بە دەستبەسەرداگرتن و زاڵبوون بەرپایە". ئەو ڕەخنەیەس دەگەڕێتەوە بۆ دیاریکردنی ئەو شێوازی دەسەڵاتەی لە داڕشتنی دەستووری کاتیدا هاتووە و هیچ بوارێک بۆ گومان ناهێڵێتەوە و ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش بە بالاترین دەسەڵاتی دەوڵەت دادەنێ ، کە دەستەبەری دانانی سەرۆککۆمار و دانانی سەرۆکوەزیران و وەزیرەکان و رازیبوون بە دەستلەکارکێشانەوەیان و بڕیاری یاسا و نیزامەکانی بەدەستە. ئەوەش وای لە"ح. ش . ع" کرد ڕەخنە لە بنکەی ئەو ڕرژێمەی دەسەڵات بگرێ کە "هەتا ئێشتاس هەر نوێنەری دەسەڵاتی دیکتاتۆرییەتێکی سەربازیی دژە دیموکراتییە و، دەریشی خست ڕژێمی دەسەڵاتدار ئامادە نییە، بێ دانپێدانانی پێشەوایی سیاسیی ئەو، ئازادییەکانی چالاکیی حیزبیی هێزەکانی دی دەست کراوە بکا.

"فەلسەفەی" بەعس و بیرۆکەکانی دەخولێتەوە، نەخاسمە لەو شتانەی پەیوەستی شێوازەکانی دەسەڵاتداری و هەلوێستی بەرانبەر دیموکراتین.
دیموکراتی و کێشەی کورد دوو خاڵی سەرەکیی کێشەی نێوان حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی بوون، ئەوەش دوو کۆسپی گەورەی بەردەمی نزیکبوونەوەیان بوون، جا حیزبی شیوعی لەو بارەوە دەڵێ: ڕێگای بێ کێشەی بەرەوڕووبوونەوەی مەترسییەکان و بەرگریکردن لەو دەستکەوتانەی بەدەستهاتوون یا پارێزگاریی ئەو دەسەڵاتەی هەیە ڕێی ئامادەکاریی سیاسی و چالاکیی سیاسیی بەرفراوانە. واتە ڕێک ڕێگای هاوکاری و بەرەی نیشتمانییکە بە بەرهەڵداکردنی ئازادییە دیموکراتییەکان و چارەسەری کێشەی کورددا دەڕوا.
ئەو باەتانەی دەخرانە روو و ئەو چارەسەرانەی حیزبی بەعس دەیخستنە روو، بەرەوڕووی ئەو هەڵوێستانە دەبوونەوە کە حیزبی شیوعی بەرانبەر بەو کێشانە هەیبوون. حیزبی شیوعی پێیوایەە کلیلی چارەسەری کێشەی کوردی ڕاگرتنی شەڕ و دەبێ یەکسەریش، لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد دەست بە دانوستان بکرێ تا بگەنە چارەسەرێکی ئاشتییانە و دیموکراتییانە. چارەسەری ئەو کێشەیەش، سەرباری ئەوەی بۆ حیزبی شیوعی مەسەلەی باوەڕە، ڕێ بۆ دەوڵەت خۆشدەکا لەبن ئەو بارگرانییە داراییە بێتەدەرێکە ئەو هەڵمەتە سەربازییەی سەر کوردستان دەیخاتە سەر شانی و دەکرێ ئەو برە پارەیەی دەگەڕێتەوە بدرێتەوە قەرزەکانی دەرەوە و سووە کەلەکەبووەکانی و ئەو خەرجییانەشی پێ زیاد بکرێ کە بۆ خزمەتگوزاریی گشتی و پەرەپێدانی ئابووری تەرخانکراون، ئەوەش وادەکا یەکەی چەکدارە چەلاوخۆرەکان هەڵوەشێنەوە و دەسەلاتی دەرەبەگان برووخێ و چاکسازیی کشتوکاڵی قووڵبێتەوە.
حکوومەت چارەسەرییەکانی بەوجۆرەی خوارەوە دادەنا: خۆ شلکردن بۆ هەندێ داوای ناوچەیی بۆ ئێران تا هەندێ یارمەتیی بارزانی ببڕ و، خۆ تەرخانکردن بۆ ڕامالینی شۆڕشی کوردی بەشێوەی پێشترێ و، داوا لە یەکێتیی سۆڤیەت بکرێ خشتەی قەرزەکانی سەر عێراق دانێتەوە و قیستە شایستەکانی دانەوە دوابخا. هەندێ پرۆژەی زیندووی ناو پلانی پەرەپێدان یان لادرێن و یانیش دوابخرێن و هەندێ پرۆژەی خێرا و لێنەکوڵراوە لەجێیان دابندرێ و لەڕێی کاری هەرەوەزییەوە جێبەجێ بکرێن، جا حکوومەت داوای لە حیزبی شیوعی دەکرد لەو کارانەدا بەشدار بێ و لە ڕیزی هێزە کوردییەکان بکشێتەوە و دەستە چەکدارەکانی"هێزی پشتیوانی" لە کوردستان بکێشێتەوە و هەڵیوەشێنێتەوە. وەکچۆن داوای دەکرد نێوانگیریی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت بۆ بکا تا خشتە بۆ قەرزەکانی سەر عێراق دانێتەوە و حیزبی شیوعییس ئەوەی ڕەتدەکردەوە و،

پێیوابوو کلیلی چارەسەر ئەوەیە شەڕی کوردستان یەکسەر راگیرێ و لەسەر بنەمای دانانان بە مافی ڕەوا و دادپەروەرانەی گەلی کورد، گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتیی بزووتنەوەی کورد بکرێ و، بەدەم داواکاریی ئۆتۆنۆمییەوە بچن و بە دڵسۆزییەوە روو لە دامەزراندنی بەرەیەکی نیشتمانی دیموکراتی بکەن و حکوومەتێکی هەمەلایەن پێکبێنن کە هەموو حیزب و هێزە نیشتمانییەکان تێیدا بەشداربن.

## بەعسی سوریا لە لایەنگران دەگەڕێ تا بەعسی عێراق بڕووخێنێ:

پێش ١٧ی تەممووزی ١٩٦٨ پارێزەریم دەکرد، ئەگەرچی بڕیارێکیش لە سەرۆکایەتی کۆمار دەرچووبوو و بڕیاری دەرکردنی پێشترێ ساڵی ١٩٦٣ هەڵوەشابووەوە و. دەمتوانی بچمەوە سەر کارەکەم"پشکنەری گشتی"لە وەزارەتی چاکسازیی کشتوکاڵی. بەڵام ڕازی نەبووم بچمەوە سەر فەرمانەکەم تا هەموودەرکراوەکان نەچنەوە سەر کار و پیشەکانیان.

کۆنگرەی پارێزەران لە ئەیلوولی ١٩٦٨ لە دیمەشق بەسترا و، داوەتنامەیەکم لە سەرکردایەتیی قەومیی حیزبی بەعسی سوریاوە پێگەیی تا وەک میوان ئامادەی کۆنگرەکە ببم و، منیش داوەتەکەم قبووڵ کرد. ڕۆژێک پێش سەفەرکردنم چاوم بە بەکری سەرۆککۆمار کەوت تا مۆڵەتی سەفەری لێ وەرگرم و مەسەلەی بەندییە لەسەرکار دەرکراوەکانیشی وەبیربێنمەوە. حکوومەت، بێ ئەوەی لێبووردنی گشتی دەربکا، دەستە دەستە بەندییەکانی بەردەدا و، بگرە لەو ماوەی بەندییەی مابووسیان لێی دەبوورین، ئیدی بابەتی بەندی و دەرکراوەکانی کردبووە ماددەیەکی چەندوچوونی هاوکاری کردن.

ئەگەرچی هەردوو ڕژێمەکە دژی یەکدیش بوون، سەرۆک لاریی لە سەفەرەکەم نەبوو. بەڵام داوای لێکردم دەربارەی بارودۆخی عێراقی دوای شۆڕش ڕاستییەکان بڵێم. گوتم: هەر بەڕاستی قسە لەسەر ڕاستییەکان دەکەم ودەڵێم؛تا ئێستا سەدان شیوع و دیمەکرات لە بەندیخانەکانن و بە هەزارانی لەبەر هۆی سیاسی لەسەر کار و فەرمانەکانیان دەرکراون، نەگەڕاونەتەوە.گوتی: تۆ لە دیمەشق دەبی و گوێت لیدەبێ یەک بەندییس لە بەندیخانەکان نەماوە و هەموو هاوڕێکانیشت گەڕاونەتەوە سەر کارەکانیان. گوتم: ئەودەمی دەهۆڵێک دەخەمە بن هەنگڵم و بەدرێژی و پانیی دیمەسقدا دەگەڕێم.

پسووڵەی سەفەرم لە هێڵی ئاسمانییسوریاوە بەدەست گەیستبوو تا دووەم ڕۆژی سەفەری پارێزەرە عێراقییەکان سەفەر بکەم. بڕیارمدا فڕۆکەکەم بگۆڕم و شەوێ لەگەڵ پارێزەرە عێراقییەکان سەفەر بکەم و سەعات یەکی دوای نیوەشەوێ گەیستینە فڕۆکەخانەی دیمەشق و، کە پەساپۆرتەکەم دایە ئەفسەری پەساپۆرتلە فڕۆکەخانە، جووە ژوورێک و دۆسییەیەکی لەگەڵ خۆی هینا و گوتی: بمبوورە قەدەغەیە تۆ بێیە ناو سوریا. گوتم من سەرکردایەتیی قەومیی حیزبی بەعس داوەتی کردووم، چونکە چەند سەعاتێکیش پێشوەخت هاتووم، نەهاتوونەتە پێشوازیم . کاغەزێکی بۆ نووسیم، داوای لیکردم لە مەودای سێ ڕۆژان لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گستی ئامادەبم و داوای ناونیشانی دیمەسقیشی لیکردم، لە پارێزەرەکانیشم زانی هۆتێلەکان پڕ میوانی کۆنگرەن، ئیدی بڕیارم دا بچمە بلوودان و لە هۆتێلێکی گەشتیاری دابەزم.

بەیانیی ڕۆژی دواتریَ دوو ئەندامی ســـــەرکردایەتیی قەومی هاتن و داوای لێبووردنیان لەوەی لە فرۆکەخانە بەســـــەرمهات کرد و گوتیان هەر لەو هۆتێلە جێمان بۆ گرتووی وَ ئۆتۆمۆبیلێکیشیان خستە بەردەستم و گوتیان لە گەرانەکانمدا هاوڕێم دەبن.
کە لە دیمەشـــق بووم زانیم هەموو بەندییەکان بەردراون و بەندیخانەی نوگرە ســـەلمانی بیابانیش نەماوە و هەموو دەرکراوەکانیش بانگکراون لە یەکی تشـــــرینی یەکەمی ١٩٦٨را بچنەوە ســـەر کار و فەرمانەکانیان. هەرچی ئەوانەی بواری ســـەربازی بوون لە فەرمانی مەدەنی دامەزران.

## چەند دیدارێک لە دیمەشق:

بە ئامادەیی ژمارەیەکی زۆری پارێزەرانی عارەبی ولە چەندین ولاتی عارەبی، ئامادەی کۆنگرەی پارێزەرانی عارەب بووم، دیارترین کەسایەتییە سیاسییەکان شەفیق ئەرشیداتی نەقیبی پارێزەرانی عارەب و عەبدولوەهاب مەحمودی نەقیبی پارێزەرانی عێراق بوون.

ئورەدین ئەتاسیی سەرۆککۆماری سوریا لە کردنەوەی کۆنگرەکەدا ئامادبوو، وتەیەکی بەخێرهینانی بۆ میوانان **پێشکەش** کردئەوجا نەقیبەکانی پارێزەرانی ولاتە عارەبییەکان بە نۆبەتوتەی خۆیان **پێشکەش** کرد ، لەوانەش نەقیبی پارێزەرانی حەلەبی هێرشێکی توندی کردەسەر دەسەلاتی سوریا و بە دیکتاتۆریەت تۆمەتباری کرد، پێدەچوو لە ئیخوان موسلمین بێ. ئەگەرچی کرابوومە بریاردەری لیژنەی سیاسی، بەلام لەبەر چڕیی ئەو پرۆگرامەی بۆم داندرابوو تا سەردانی ڕێکخراوە کۆمەلایەتی و سەندیکا و کارگە و کێلگایان بکەم و دیداری بەرپرسانیش، نەمتوانی ئامادەی هەموو دانیستنەکان بم، بەلام بەشداریی دارشتنی بریاری تایبەتی پەیوەستی کاروبارە سیاسییەکانی بەیاننامەی کۆتاییم کرد.

دیدارەکانم لەگەل ئەلرەفیق ئەلمەجلی ی ئەندامی سەرکردایەتیی قەومی لە بینایەی سەرکردایەتیی قەومیدا چەندبارە بووەوە و، بەزۆرییس بەسەو بوو، سەیرەکە، یەم گەمژەییەکە، لەوەیدابوو وەهای قسە بۆ دەکردم وەک ئەوەی بەرپرسی یەک لە نووسینگە قەومییەکانی بەغدایان بم. باسی ئەوەی دەکرد چەند ە پێویستە هێزەقەومییەکان یەکبگرن و پلانێک بۆ رووخاندنی دەسەلاتی بەعسی عێراق دابندرێ. جا منیش گویم بۆ دەگرت و بە هەلدانەوەی لاپەرەکانی گۆڤارێکیش خۆم لە بەشی هەرەزۆری قسەکانی گێل دەکرد.

لە کۆتاییدا گوتم: هاورێ، ئێمە حیزبێکی کۆنی عێراقینسیاسەتی سەبەخۆی خۆمان هەیە و بەرژەوەندی ولات و گەلەکەمان لەسەرووی هەموو بەرژەوەندی و گرنگییەک دادەنێین و ناکرێ درێژکراوەی زنجیرەی یان ئارەزووەکانی هیچ حیزبێکی دیکەی ناوەوە ودەرەوەی عێراق بین. لەبەر رۆسنایی باوەرە نیستمانی و نێونەتەوەییەکانمان لە ناوەوە و دەرەوەی ولات هاوکاریی خەلکانی دی دەکەین.

ئێوارەیەکیان پێیگوتم بەرێز نورەدین ئەتاسیی سەرۆککۆمار سەعات هەستلە کۆشکی کۆماری پێشوازیم لێ دەکا، ئیدی لاوادەی بریاردراو چووینە کۆشک، دیتمان ئەتاسی چاوەڕێمانە. پێشوازیی لێ کردین و بەخێری هێنام و وسوپاسی کردم کە لەو بارودۆخەی عێراقدا بەدەم داوەتەکەوە هاتووم و، پرسیاری هاورێیان عەزیز محەممەد و زەکی خەیریی لێکردم و گوتی: هاورێ موکەرەم، هەموو سنوورەکانی ولاتەکەمان بۆ تۆ کراوەیە و، لە هەرکاتێکدا سەردانمان بکە تۆ میوانێکی ئازیزی ئێمەی.

به گاڵتەوە گوتم: هاوڕێی سەرۆک، من وەک هاوڕێ عەزیز محەممەد و زەکی خەیری نیم بەپیادەیی و بە دزییەوە لە سنوور بێمە ژوورەوە، من پەساپۆرتێکی یاسایم پێیە و بێ ڕێگریی حکوومەتیش هاتووم.
کرانەوەی سوور ج سوودیکی هەیە کە من ئاسمانی سوریام بەروودا داخرابێ، جا ئەو کاغەزەم دەرهێنا کە داوای لێ دەکردم سەردانی ئاسایشی گستی بکەم، نیشانیدا چەندی ئەو کارە پێ ناخۆش بووە و، گوتی:ئەوە پاشماوەی پەیمانی بەغدایە. گوتم:گەلی عێراق لەمێژە ئەو پەیماننامەیەی لەناو بیگا ونجڕونجڕ کردووە، ئێوە کەی ئاسەوارە خراپەکانی ئەوپەیمانە لەسەر ولاتەکەتان لادەبەن؟گوتی: هەرگیز دووبارە نابێتەوە.
ئەو سەردانەیان سەردانی شیریکاری بوو، سەرۆک ئەتاسی پێیگوتم، دوای ئەوەی پرۆگرامی سەردانەکەم کۆتایی پێدێ و ئاشنای ئامالەکانی شۆڕس لە سوریا دەبم، جارێکی دی دیدارێکی درێژمان دەبێ.
سەردانی ژمارەیەکی زۆری ڕێکخراوی کۆمەلایەتی وسەندیکام کرد و، لەو سەردانانە ژمارەیەک هەڤاڵ پارێزەر لەگەلم بەشداربوون، ئەو ڕێکخراوانە حیزبی بەعس، وەک عێراق، دەستی بەسەردا گرتوون و قەدەغەیە حیزبەکانی دیکە و هێزە نیشتمانیەکان تێیدا بەشداربن. لە یەکێتیی ئافرەتان، بە هێرسێکی ستەمکارانە بۆ سەر هاوبەندیی ژنانی عێراقی و هاو بەندیی ژنانی سوری، بەرەو ڕوومان بوونەوە، کە هەردووکیان حیزبی شیوعیی عێراقی و حیزبی شیوعیی سووری ڕێکیخستوون. لە دوژمنایەتیی یەکێتیی ژنانی سوریا بەرانبەر هاوبەندیی ژنانی سوریا تێدەگەین، بەلام هۆی دوژمنایەتیيان بۆ هاوبەندیی ژنانی عێراق لەسەر چییە؟ ئەو هۆیەی ژنە بەرپرسەکانی یەکێتیی ژنانی سوری لەسەر هاوبەندیی ژنانی سوری هێنایانەوە ئەوەبوو هاوبەندی کە هاوبەندی بەشداریی یەکێتییان نەکردووە لەو داوایەی لە یەکێتیی سۆڤیەتیان کردووە تا لەگەل سوریا بەشداریی شەڕی ١٩٦٧ بکا و گوتوویەتی بەرگریکردن لە سوریا ئەرکی گەلی سوریا و سوپای سوریایە و، یەکێتیی سۆڤیەت پشتیوانیی سیاسی و سەربازیی خۆی پێشکەش دەکا تا بەر بە دوژمنداری بگیرێ. جا یەکێتییەکان بە مکوڕییەوە پرسیاری ئەوەی دەکەن، ئەدی ئەوە خیانەت نییە؟
بە سەرۆکییەکێتیی ژنانم گوت: ئەگەر یادگەم خیانەتم لێ نەکا، من لە قورئا خوێندوومەتەوە بەنی ئیسرائیل نەک عارەب، بە موسایان گوتووە"تۆ و خوایەکەت بڕۆن بجەنگن، ئێمە ئەوەتا لێرە دانیستووین". خوشکێ تۆ داوای بەرگری و قوربانیدان بۆ بەرگری لە خاکی سوریا بە خیانەت دادەنێی؟ لە کاتێکدا داوا لە یەکێتیی سۆڤیەت دەکەی قوربانی بە مەسەلەی ئاشتیی جیهانی بکا، کە ئەوە کێشەی من و کێشەی تۆ و کێشەی

هەموو گەلانی دنیایە و، کە هەموو مرۆڤایەتی بخەیە بەر مەترسـیی شـەڕێکی ئەتۆمیی ترسناک وبێی لەجیاتیی سوریاییان شەر بکەی، ئەریَ ئەوە نیشتمانپەروەریی بەڕاستییە؟ هاوبەندیی ژنانی عێراقی و سـوری دوو بەشـی شـۆڕشـگێڕی ژنانی ئەو دوو ولاتەن. لە ڕێوانی مێژووی تیکۆشـانی دوورودرێژی پڕ ئازاریشـیاندا دڵسـۆزیی خۆیان بۆ کێشـەی گەل و نیشـتمانیان سـەلماندووە. جا دەبێ بە شـێوەیەکی بابەتییانە و دادپەروەرانە هەڵسەنگاندنیان بۆ بکریَ وکار بۆ ئەوە بکریَ پردێکی هاوکارییان لەگەڵ دروست بکریَ.

## ڕێپێوانێکی "جەیشی شەعبی" لە دیمەشق:

لە کۆتایی دانیشتنەکانی کۆنگرەی پارێزەرانی عارەب، ڕێپێوانێکی " جەیشی شەعبی" کرا و دە هەزار خۆبەخش بەشـــداریيان تێدا کرد. ئەوان تفەنگ و ڕەشـــاش و تۆپی مۆرتەریان پێبوو و داوا لە پـارێزەرانیس کرا بەشـــــداریی ڕێپێوانەکە بکەن، کەچی، پـارێزەرە دیموکراتییەکانی عێراقی و جەزائیریی لێ دەرچێ، کەسیدی بەشداریی نەکرد. لەپێشـەوە، لەگەل یوسـف زەعینی سـەرۆکوەزیران و دکتۆر ئیبراهیم ماخۆسـی وەزیری دەرەوە و محەممەد ڕەباح تەویلی وەزیری ناوخۆ و محەممەد ڕەباحی سەرکردەی "جەیشی شەعبی" و کەسانی دی، ڕۆیشتین .

تێبینیی ئەوەم کرد جەماوەری دیمەشق بەخراپی سەیری ئەو"جەیشی شەعبی"یە دەکەن و نەمزانی بۆ، نێردراوی تەلەفزیۆنی سوری داوای لە پارێزەرانی بەشداربووی ڕێپێوانەکەیان کردبوو، گرتەیوکی ڕای خۆیـان بەرانبەر "جەیشــــی شـــــعبی" تۆمـار بکەن و، ئەوەی سـەیربوو ئەوەبوو کە هەموو بەرپرسـەکان هێرشـیان دەکردە سـەر سـوپای سـوریا و، دەیانگوت گوایە بەبێ شـەڕ بەرزاییەکانی جۆلانی ڕادەسـتی قەوارەی زایۆنی کردووە، جا لەجیاتیی ئەوەی لە هۆیەکانی شـکسـتەکە بکۆڵنەوە و چارەسـەری خەوشـەکان بکەن، دروشـــمی "شـــەڕی ڕزگاریخوازی میللی"یان هێنابووە گۆڕێ، لەجیاتیی ئەوەی تواناکانی گەل و بەگەڕبخەن و ڕێی بۆ خۆشـــکەن تا بتوانێ بەشـــدارییەکی کاریگەری هەبێ لە بەرگریی وڵات ســـوپـا و توانـا بەرگرییەکـانی بەهێز بکەن و، یەکێتیی گەل و هێزە نیشـتمانییەکانی دسـتەبەر بکەن ئەو دروشـــمەی "چەپ"ی نوێی هەندێ ولاتی ئەمریکای لاتین بانگەشـەیان بۆ دەکرد و، ڕوونیش دیار بوو "جەیشی شـەعبی" بەو توانا سنووردار و چەکە سـادانەیەوە نەیدەتوانی لە شـــێری داهاتووی قەوارەی زایۆنیدا جێی سـوپا بگرێتەوە، ئەو کارەش ترسـی خسـتبووە دڵی سـوپای سـوریا و ئەویش لای خۆیەوە، دواترێ لە کۆنگرەی حیزبدا ڕەوایی بەزانـد و ئەو بـاڵەی لە حیزب و دەوڵەتدا لادا تـا دواترێ تا بەسەرۆکایەتیی حافز ئەسەد سەرکردایەتی وەرگرێ.

کە سـەرکردە سـورییەکان ڕای منیان سـەبارەت بە "جەیشـــی شـەعبی" پرسـی، هیچ بژاردەیەکم لەبەردەویدا نەبوو، یان دەبووایە بەو سوپایە و بە ئەرکی سەرشانیدا هەڵبدەم و، کە ئەو بیرۆکەیەش باوی ناو سـەرکردە سوریەکان بوو یان دەبوایە ڕاستییەکان بڵێم و، ڕەنگە بەزاندنی سـنووری میوانی بێ. ئیدی ڕاسـتی گوتنی بنەما مارکسـی- لینینییەکان فێریان کردبووین و ئاشـکراکردنی کەموکووڕییوکان و ڕەخنە لە هەڵەکانیش لەئارادابوو. من ئەوەی دووەمم هەڵبژارد و، گوتم: پەیوەسـتیم وەک میوان بەسـەرمدا دەسـەپێنێ

سنووری میوانی نەبەزێنم و لە کەموکووڕییەکان بێدەنگبم، بەڵام دڵسۆزیم بۆ کێشەی خەباتی گەل لەدژی ئیمپریالیزم و زایۆنیزمی هاوپەیمانی ئەوەم بەسەردا دەسەپێنێ ئەو کێماسییانەی پێموایە هەن بخەمە بەردەمی برایان تە لە ڕیوانی شۆڕشگێڕییاندا ئەو کەموکووڕییانە چارەسەر بکەن و کون و کەلەبەرەکانی ناو ڕیزەکانی بزووتنەوەی ئازادیخوازی نیستمانیی سووریا بگرن.

سوپایەکانی دنیا، زۆربەی پێکهاتەکەی ڕۆڵەکانی کرێکا و جووتیار و ڕەنجدەرانی دیکەن، بەڵام "جەیسی شەعبی"دووستی لەوەی دی جودایە، یەکەمیان پەیوەندیی بە گەلەوەیە و گەل لەباوەشی دەگرێ و، گەل سەرچاوەی هێزی ئەو سوپایەیە، دووەمیانسەرهەلدانی سەرکردایەتیی ئەو سوپایە لەناو پێشەنگە شۆڕشگێڕەکانی گەل و، دڵسۆزیی بۆ بەرژەوەندییەکانی و ئامادەیی بۆ قوربانیدان تا گەل و دەستکەوتەکانی بپارێزێ. من گومانم لە دڵسۆزیی سەرکردایەتی نییە، بەڵام ئەوەی ئەوڕۆ سەرنجی ڕاکێشام ئەوەبوو کەسم نەدیت لە دیمەشق چەپڵە بۆ ئەو سوپایە لێبدا، ئیدی دەبێ ناوبڕێکی جیاکەرەوە لەنێوان ئەو سوپایە و گەلدا هەبێ، دوایەش ئەو دوولە قوولەی نێوان سوپای نیزامی و ئەو ئەو سوپا میللییە چییە؟ پێویست وایە سوپای سوریا، کە هەر ئاواسە، سوپایەکی میللی ببێ و لەگەڵ گەل لە کرلێکدابێپاسەوانی گەل و دەستکەوتەکانی بێ و ئەو خۆبەخشانەی "جەیشی شەعبی" لە شەڕی نیشتمانیی دادێدا پشتبەند و هێزی هاریکاری بن کە سوپا شەڕێک دەدۆڕێنی مانای وانییە دڵسۆزی کێشەی گەل نییە گەل بکرێ، .

دەبێ هەڵسەنگاندنێکی دروست و لێکۆڵینەوەیەکی بابەتییانە بۆ دۆڕاندنی شەڕی جۆلان بکرێ، تا چارەسەری کەموکووڕییەکانی سوپا و هۆییەکانی لاوازییەکەی بکرێ. من پێموایە یەک لە هۆیەکانی سکستی حوزێران بەشێوەیەکی گشتی ئەوەیە کە حکوومەتە عارەبییە پێشکەوتنخوازەکان نەیانتوانی گەل ئامادە بکەن و بەشێکی زۆری لایەنە نیشتمان پەروەرەکانیان دوورخستەوە و لێنەگەڕان شکۆی بەرگریی خاکی نیشتمانیان پێ ببڕێ و، بەر بە دوژمنکاریی ئیمپریالیزم و زایۆنی بگرن و، شەڕیان خستبووە تەسکترین چوارچێوە . ئێوارەکەی سوورییەکان لە تەلەفزیۆنیان دیتم کە ڕاشکاوانە ڕەخنەم لە هەڵوێستەکانی حکوومەتی سووریا دەگرت.

## دیدارێکی گەرم لەگەڵ سەرۆکی سوریا:

جارێکی دییس بانگێشتی کۆشکی کۆماری کرام و لەگەڵ 'المجلي'ی ئەندامی سەرکردایەتیی قەومی چووینە کۆشـکی کۆماری دیتم سـەرۆک نورەدین ئەتاسـی و یوسـف زەعینی سەرۆکوەزیران چاوەڕێمان دەکەن. سەرۆک بەخێری هێنام و بەسەرۆکوەزیرانی ناساندم و داوای لێکردم ماوەی پتر لە سوریا بمێنمەوە تا شارەکانی دیکەی سوریا ببینم و، گوتی: هیوامان وایە پترمان گوێ لە ڕەخنە بنیاتنەرەکانت بێ، دەمانەوێ سـارەکانی دیکەش ببینی تـابزانی حیزب و حکوومەت چەنـدیـان لایەنگیری هەیە کۆمەڵگەی دیمەسـق کۆمەڵگەیەکی بۆرژواییە و لەبەر ڕێوشوێنەکانی شۆڕشیش توێژێکی فراوانی زەرەرمەند بووە، ئیسی سەیر نییە نەرێنییەک لە دیمەشقدا ببینی.

گوتم: هاوڕێی هۆک، دەبێ شـۆڕش، هەر شـۆڕشـێکی میللی، دەربڕی بەرژەوەندیی توێژە فراوانەکـانی گەل بێ نەک زیـان بە بەرژەوەنـدیی توێژە فراوانەکـانی بگەیەنن. ئەو شـۆڕشـانەی بەرەو سـەرەوەی چەپڕەوی بەلاڕێدا دەچن، ئەوانەن کە پێش پێگەیشـتنیان پەلە لە کارەکـان دەکەن و بێ پاسـاو زیـان بە بەرژەوەنـدیی توێژێکی فراوانی گەل دەگەیەنن، کە دەبوایە ئەو توێژانە لەو قۆناغەدا هاوپەیمانی شۆڕش بن و لەتەکیدا بن نەک لە دژی بن. بەڵام ئەگەر شـۆڕش بەلای ڕاسـتدا لاڕێ بگرێ، ئەوا بەرگری لە یوێژێکی بەرتەسکی موڵکدار و سەرمایەداران دەکا و بەرژەوەندیی توێژێکی فراوانی گەل پشتگوێ دەخا و زیانی لێ دەدا. هەردوو لاڕێبوونەکەش لەیەک خاڵدا یەکدەگرنەوە، ئەویش زیان گەیاندنە بەرژەوەندیی توێژێکی فراوانی گەلە. ئێمە ئاوا لە مەسەلەی شۆڕش تێگەیشتووین و ، لینین ئاوای فێرکردووین. کە شۆڕش دەستی بە چاکسازیی کشتوکاڵی کرد، زیانی بە چنگێک موڵکدار و دەرەبەگان گەیاند تا داوای ملیۆنان جووتیار دەسـتەبەر بکا و، کە کۆمپانیـای پێنجینەشـی خۆمـاڵی کرد، ئەو گورزی لە بەرژەوەنـدیی پێنج خـانەوادەی دەوڵەمەنـد دا و لە بەرژەوەنـدیی دەیـان هەزار کرێکـار و کـارمەنـد بوو کە ئەو پێنج خانەوادەیە دەیانچەوسـاندنەوە . دەبوایە شـۆڕش دەسـەڵاتێکی هەرەفراوانی لە دیمەشـقی پـایتەختـدا هەبووایە، کە سـەرمـایە و پرۆژەی گەورە لێرە چڕبوونەتەوە و خـانەوادە دەرەبەگ و ئەرەستوکراتەکان لێرە دەژین.

ئەوجا باسـی ڕۆڵی بەرەی نیشـتمانیم کرد، ئەو کاتەی حیزبەکان و هێزە نیشـتمانییە پێشکەوتنخوازەکانە ئامادەکردنی بەرفراوانی جەماوەرهاوکاریی یەکدی دەکەن تا بەرگری لە نیشـتمان و شۆڕش بکەن باسـی گرنگیی هاوپەیمانیی نێوان هەردوو حیزبی سـەرەکیی سـوریام کرد، واتە حیزبی بەعس و حیزبی شیوعیی سـووری. هەوڵیدا ڕەخنە لە حیزبی

شـيوعی بگرێ، بەڵام من گوتم: ئەگەر گوێ لە حیزبی شـیوعی بگرین، ئەوا زۆری ڕەخنە لە کار و کردەوەکانی حکوومەتەکەتان هەیە.
گوتی: ئەوان ڕۆژنـامەکەیـان بە نهێنی دەردەکەن و ئێمە هیچیـان بەرانبەر نـاکەین گوتم: بەلام بۆ بە نهێنی؟ بۆ چاپخانەیەکی باشـیان بۆ دابین ناکەن تا ڕۆژنامەکەیان بەە ئاشـکرا دەرکەن؟تـا ئەوانیش لای خۆیـانەوە جەمـاوەری هـاوســـۆزی خۆیـان بۆ خەبـاتی دژی پیلانەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنی و کۆنەپەرستان ئامادە و تەیار بکەن
ئەوجا باسی هەڵوێستی ئەوانم بەرانبەر کێشەی کورد لە عێراق کرد و، باسی ئەوەم کرد هەر هەوڵێکی ئاسـتی و دیموکراتیی چارەسـەری کێشـەکە بو "دامەزراندنی ئیسـرائیلێکی دیی ناو دڵی نیشـــتمانی عارەبی" دادەنێن. گوتم: کورد وەک عارەبان، گەلێکی کۆنن، لە دێرزەمـانەوە لەســـەر خـاکی خۆیـان دەژین نەک خـاکی خەڵکی دی، ئەوان دووجـاری چەوسـاندنەوە و سـتەم و جیاوازی هاتوون وئیدی شـۆڕس دەکەن و داوای مافی ڕەواو دادپەروەریی زەوتکراوی خۆیـان دەکەن، نەک نیشـــتمـانێکیـان لە خـاکی خەلکی دی بۆ دروســـت بکرێ. ئاوان داوای یەکســـانی و ئۆتۆنۆمیی ناو چوارچێوەی کۆماری عێراق دەکەن و داننانیش بەو مافە گەڕاندنەوەی مافە زەوتکراوەکانە. ئێوەش، وەک دەوڵەتێکی ئازادیخواز و وەک حیزبێکی پێشـــکەوتنخواز دەبێ لەگەڵ ئەو مافەدا بن نەک لە دژی.
دوایەش کوردەکانی ســـوریا لە ســـەردەمی داگیرکاریی فەرەنســـاش پتر دووچاری چەوساندنەوە و ڕاگواستن دەبن و، ئەو کارە ستەمکارانەشتان ناو لێدەنێن "دروستکردنی پشـــتوێنەی عارەبیی نێوان خۆتان و تورکیا"، باشـــە بۆ ئەو پشـــتێنەیە هەر لە کوردەکان نەبێ؟ ئەو جۆرە کارنە ناوبانگی سوریا لە عێراق و لە دنیاش خراپ دەکا.
یەسف زعینی سەرۆکوەزیران نکۆڵیی لە هەر چەوساندنەوە و ڕاگواستنێکی کوردان کرد، گوتیشـــی گوایە تورکوکان هەمیشـــە پێدزەی دەکەن و ئەوانیش تەنیا ڕێیان لە پێدزە نایاســـاییە گرتووە. گوتم: چەندین ســـەدەیە کوردەکانی تورکیا دووچاری خراپترین چەوساندنەوە و کوشتار و ڕاگواستن بوونەتەوە، چەند ڕۆژێک پێشتر سەرۆک ئەتاسی فەرمووی: ســـنوورەکان بۆ ئێوە کراوەیە، ئەدی بۆ ســـنوور بۆ ڕاکردوانی دەســـتی چەوسانەوەی فاشیزمی تورکیش کراوە نەبێ"!.
نورەدین ئەتاسی دانی بە ڕوودانی هەندێ لەو شتانەدا نا کە من باسم کردن و بەەرانبەر کوردان کرابوون و گوتی: ئێمە زانیاریی تەواومان لەســـەر کێشـــەی کورد نییە، خۆزگە بەڵگە و زانیاریی فراوانتان دەداینێ، تا لێیانبکۆڵینەوە و بیانخەینە ناو ئەدەبیاتی حیزبمان و بیـانخەینە نـاو ئەو بـابەتـانەی لە کۆنگرەی قووتریی حیزبمـان دەخوێنە ڕوو، زۆریش دڵخۆش دەبین ئەگەر داوەتمان قبووڵ بکەن و لە کۆنگرەی حیزبمان ئامادەبن کە بڕیارە

ئەمساڵ بگیرێ. جا لەوێ ڕایەکانت لەسەر مینبەری کۆنگرە بخەڕوو گوتم: بەسوپاسەوە، بەڵام پێشنیار دەکەم میوانداریی شاندێکی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بکەن تا ئامادەی دانیشتنەکانتان بین و گوێتان لێ بگرن و گوێیان لێ بگرن، ئیدی وادەی ئەوەی دا.

سەرۆک ئەتاسی چووە سەر ناوەرۆکی ئەو بابەتەی من بۆی بانگێشتی سوریا کرابووم و، ئەویش هاوکاریی نێوان حیزبی شیوعیی عێراقی و حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکی- باڵی سوریا و، کوتلە سیاسییەکانیدیکە بوو تا بە پشتیوانیی سوریا دژی حیزبی بەعسی عێراق راوەستن و دەسەڵاتەکەی برووخێنن. دەمزانی ئەو هەموو گرنگیدانە بە سەردانی سوریام و خۆ کڕکردن لە ڕەخنەکانم بۆ سوودوەرگرتن بوو لە تواناکانی حیزبی سیوعیی لەگەڵ بزووتنەوەی کوردی و لە دژی حکوومەتی هەردوو عارفی برا چەکی هەڵگرتبوو و لە هەموو لایەکی عێراقیش، وەک بەهێزترین حیزبی سیاسی، هاتبووەوە گۆڕەپانی کاری جەماوەری. جا دەیانویست لە رووخاندنی حوکمی بەعسی عێراق سوودی لێ وەرگرن. باسی ئەو دیدارانەم نەکرد کە پێش و پاش شۆڕش لەگەل سەرکردەکانی حیزب و دەوڵەت لەعێراق کردبوومن، بەڵام ئەو ئاگای لەوەی هەبوو لەگەڵ سەرۆک بەکر پەیوەندییەکی باشمان هەیە.

گوتم : هاوڕێی سەرۆک،لە کاروانی تێکۆشانمان لەعێراق هەندێ کات لەگەل حیزبی بەعس نەیاربووین و هەندێجارانیش یاربووین. خوێنێکی زۆر لە نەیارییەکەمان ڕژا، دەستەی دیکە ئەوەیان قۆستەوە و دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرت تا هەردوولامان وەک یەک سەرکوت بکەن. جا ئەو کاتەی لە گۆڕەپانی خەبات یەکدیمان نەدیتبا ئەوا لە ژوورەکانی زیندان یەکدیما دەدیت. هاوکاری و هاوپەیمانیشمان سەرکەوتن و دەستکەوتی گەورەی بۆ گەل لێکەوتەوە، جا ئێستا هەموو ئەوانەمان بەباشی بۆ ڕوونبووەتەوە. ئێمە نامانەوێ ئەو کارەساتانەی پێشترێ دووبارە بکەینەوە ئەتاسی قسەکەی بڕیم و گوتی: ئەوان ئەگەر جێ پێی خۆیان توندکرد، وەک یەک لەئێوە و هاوڕێیانی ئێمەش بادەدەنەوە، ئێمە ئامادەی هەموو یارمەتییەکین بۆ ڕووخاندنیان، ئێستاش ئەوە کارێکی گران نییە. پێمگوت: ئەدی ئەگەر ئێوە دوای رووخاندنی ئەوان جێ پێی خۆتان توند کرد، چۆنمان مامەڵە لەگەل دەکەن، ئەدی هەر وەک مامەلەی ئێستاتان نابێ لەگەڵ هاوڕێ شیوعییەکانی ئێستای سوریامان؟

ئەوجا پێمگوت: هاوڕێ، خەریکە هەندێ قەناعەت لە عێراق دروستدەبن پێیانوایە دەبێ تەباییەکی نیشتمانی جێی دژایەتییەکی نابابەتی بگرێتەوە. ئێمە بە هەموو توانامانەوە کار بۆ ئەوە دەکەین و، نامانەوێ دەست لە هاوڕێکانتان بەردەین و لەگەڵ نەیارەکانتان ببینە

دۆســت. بەڵکو دەمانەوێ بە شــێوەیەکی گشــتی چارەســەری هەموو نەیارییەکانی نێوام هێزە نیشتمانییەکانی ولات بکەین.ئەو کارەش بە گۆڕانی بەردەوامی ڕێچکەی دەسەلات و حیزبی بەعس لە عێراق پیادەدەکرێ. ولات زۆری ئاســتەنگ و کێشــە لەبەردەمدایە و چارەســەرکردنیان پێویســتیی بە ئاویزانیی هەوڵی هەموو لایەنە نیشــتمانییەکانە و، چارەسەریشیان سوودی بۆ هەمووان هەیە.
حکوومەتی ئێستا، ئەگەر لەسەر ڕێچکەی هەڵەی حکوومەتەکانی پێشتری بڕوا، یان لەسەر ڕێچکەی ١٩٦٣ی خۆی بڕوا و، ڕێی خۆپەرستی و تاکڕەویی دەســەلات بگرێتەبەر، ئەوا خۆی لە دەرایەک کێشــە نوقوم دەکا و لێ هاتنەدەرێی ئەســتەم دەبێ و، رووخاندنیشــی دەبێتە شتێکی حەتمی و لەوەسدا هەر خۆی سەرکۆنەدەکرێ.
ڕاستییەکەی، خۆم لە گەلێ داوای پشتڕێ دەکرد و بە هەندێ گوزارشت وەلامیم دەدایەوە پەیوەندیی بە قســەکانی ئەوەوە نەبوو، جونکە لەگەل ســیاســەت و هەلوێســتی حیزبی شــیوعی بەرانبەر دەســەلاتی نوێ ڕێکنەدەهاتنەوە. چونکە ئێمەس بەخۆمان نەخســەی سیاسەتی حیزبمان دەکێشین و ناشمانەوێ بەپێی ئارەزووی خەلکی دی بەڕێدا بڕۆین.
سەربارێ ئەوەی حیزب ئەودەمای لە بەرەی ئۆپۆزسیۆن بوو، بەلام دروسمی رووخاندنی دەسەلاتی هەڵنەگرتبوو. حیزبی سیوعی سروستی دەسەلاتی ئەودەمیی هەڵسەنگاندبوو و گوتی: حکوومەتی ئێســـتا، هێشـــتا نموونەی دەســـەلاتێکی دیکتاتۆریی ســـەربازیی دژە دیموکراتییە، ئیدی بەو جۆرە هەر حیزبێک بەشدارییحکوومەت بکا لە پاشکۆیەکی سیاسیی حیبی بەعس پتر نابێ و، ئەو پێشوەختە دانی بە پێشەوایی حیزبی بەعسدا ناوە. لە سایەی ئەو دەســـتوورە نوییەیش، هەر لێکحاڵیبوونیک لەگەل حیزبی بەعســـی دەســـەلاتدارلە بەرەیەکی یەکگرتوودا مانای بەیعەتدانە بە پێشەوایی سیاسیی ئەو حیزبە، جا ئەو بەرەیە مانای بەشــداریی ححکوومەت بێ یان بێ ئەو بەشــدارییەش بێ. بەلام ئەوە مانای وانییە کە تاکە ئەڵتەرناتیڤی ئێســـتایی نێوانبڕیی تەواوی حکوومەت بێ، یان گەرانەوە ســـەر دروسمی ڕاشکاوی رووخانی دەسەلات بێ، وەک داوایەکی هەنووکەیی کاتی ئێستا.
لەوەیدا دەردەکەوێ کە هەلوێستم بەرانبەرداوایسەرۆکی سووریا تەوا لەگەڵ سیاســەتی حیزبی ســـیوعی ڕێکدەهـاتەوە. حیزبیش دووپـاتیکردەوە کە دەبێ وریـای دیـاردەی بەشوومزانیی بەعسی دەسەلاتدار بێ.
وەلامم بۆ ســەرۆکی سوریا لەهیکرا نەبوو، جەنکە هاوڕێکانی پێیانگوتبوو حیزبەکەمان لە عێراق چ پێگەیەکی سیاسیی هەیە و، چۆنیش حیزبی بەعسی عێراق دلی ڕادەگرێ و داوای هاوکاریی لێ دەکا. بەلام جارەنووســی هاوڕێکانی عێراقی ســـەرقالی کردبوو، بۆیە تکای لێکردم دەستبەرداری هاوڕێیەکانی نەبین. گوتم: هاوڕێی ئازیز، من پێموابوو دەبێ لەوەیدا

ڕاستگۆبم کە بەروونی باسی سیاسەتی حیزب بکەم بەرانبەرئەو دۆخە نوییەی عێراق، زۆربەی حیزبە سیاسییەکان لە ئەگەری ڕێککەوتنمان لەگەڵ دەسەلاتی ئێستا دەترسن و، ڕەنگە وابزانن ڕێککەوتنێکی ئاوەها لەسەر حیسابی ئەوان دەبێ.
هەرچی حیزبی شیوعییە بیرۆکەی بێنەوبەردەی لەسەر حیسابی حیزب و توێژە نیشتمانییەکانی دیکە نییە کە بەڕاستی دەیانەوی هاوکاریی لەگەڵدا بکەن. جا ئەگەر بانگەشەی هاوکاریی کرد ئەوا بانگەسە لەسەر بنەمای بەرەیەکی نیستمانی دەکا کە هەموو حیزب و هێزە نیشتمانییەکان تییدا بەشداربن و، خۆزگە لەو ڕێیەشدا هەماهەنگییەکیان لە نێواندا دەبوو نەکا حیزبی بەعسی دەسەلاتدار، بۆ لاوازکردنی پێگەی حیزبەکانی دی، بەتەنیا بانگێشتی هاوکاریی بکا. ئەوە پێویستی بە هەماهەنگیی نێوانمانە، جا ئەگەرسیاسەتەکانیان لەگەڵ ئێمە ڕێکنەخەن و بەڕێی سیاسەتێکی دیکەدا ڕۆیشتن، ئەودەم ئەوان ئێمە بەجێدێڵن.
تکای لێ کردم تا داوەتی ئامادەبوونی کۆنگرەی حیزبەکەیان قبووڵ بکەم و، ماوەیەکی درێژتر بمێنمەوە تا گفتوگۆی پتر بکەین، بەڵێنی ئەوەم دایە و ڕوخسەتی سەفەرم خواست.

## بەکر بەدوای چارەسەری کێشەی کورددا دەگەڕێ:

لەو ستە سەیرانەی لەبیرمە ئەو دیدارەبوو، دوای غافڵکوژکردنی ناسر حانیی وەزیری دەرەوەی پێشتری، لەنێوان من و سەرکردەکانی بەعس لە کۆشکی کۆماری کرا.
فەریق سەعدون غێدان فەرماندەی ئۆردووی سەربازیی بەغدابوو و، سکرتێری لیژنەی کاروباری باکووربوو کە حیزبی بەعس دایمەزراندبوو و، بنکەکەیشی لە کۆشکی کۆماری بوو. لە ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٦٨ تەلەفۆنی بۆ کردم و لەسەر داوای بەڕێز سەرۆکی کۆمار داوای لێکردم بچمە کۆشکی کۆماری. ئەودەمی عامر عەبدوڵلا و مەهدی حافز لە ماڵەوە میوانم بوون و، نەشماندەزانی ئەو داواکردنە لەبەر چییە. پێیانگوتم: بمێنینەوە تابزانین بۆ بانگیان کردووی؟ گوتم: تا سەعات دە چاوەڕێ بکەن، ئەگەر نەهاتمەوە لەڕێی قەناتی جەیش بەدوامدا بگەڕێن لەوجێی حانی بە کوژراوی دۆزرایەوە.
ئۆتۆمۆبیلە فۆلکس واگۆنە تایبەتەکەم بەڕێکەوتم، لێگەڕان بچمە ناو کۆشکی کۆماری، چوومە نووسینگەی فەریق سەعدون غێدان، عەونی یوسفی پارێزەر و حوسێن سافیی پارێزەرم لەوێ دیت. پێدەچوو ئەو دووە لە لیژنەی کاروباری باکوور بووبن. دۆسییەیەکیان لەبەردەمی بوو تایبەتی لێبووردنی پلەدارە سەربازییەکانی شۆڕشی کوردی بوو و، مووچکردن و دانەخۆرەکردنێکی ئەوتۆی تێدابوو وایان لێ بکا شۆڕش بەجێبێڵن و لاواز بێ.
لە سەعدونم پرسی داخوا سەرۆک کۆمار بۆ داوای دیتنی منی کردووە، گوتی: پێشنیاری کردووی ببیە ئەندامی لیژنەی کاروبارەکانی باکوور. گوتم: من رازی نیم. گوتی:سەرۆک ئێوەی پێشنیارکردووە. گوتم: بەڵام من لەگەڵ ئەو لیژنەیە ڕێکناکەوم و رازی نیم.
لەو کاتیدا سەرۆک بەکرد و سەدام حوسین و ساڵح مەهدی عەماش و حەردان تکریتی و هەندێکی دی هاتنە ژووری سوعدون غێدانی. لە کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتی بووندوای بەخێرهێنانم سەرۆک بەکر لەتەنیستم دانیشت. سەعدون غێدان پێیگوت کە رازی نیمە ببمە ئەندامی لیژنەی باڵای کاروبارەکانی باکوور. بەکر گوتی: بۆ؟ گوتم: سەرۆکی بەڕێز، لە چارەسەری کێشەی کورددا، ئاراستە و بۆچوونی ئێمە لەگەل بۆجوون و ئاراستەی ئێوە جودایە، بوونیسم لە لیژنەیەکی ئاوادا وادەکا ببمە کەسێکی ڕێ لە ڕێوشوێنەکانی بگرێ، کەواتە بوونم چ سوودێکی هەیە؟
پێدەچووسەرکردایەتی لەو ئاستەنگە دارایيانەی کۆڵیبێتەوە کە سایەی بەردەوامیی شەڕی کوردستان توشی حکوومەت ببوو. سەرۆک بەکرد گوتی: بارزانی دەیەوێ جیابێتەوە. گوتم من سەرم لەوەی سوڕماوە بارزانی بۆ جیابوونەوە لەخۆی دەتەکێنێ، ئەرێ جیابوونەوە شەرمەزاری و تاوانە؟ مافێکی ڕەوای گەلانە.ئەدی عارەب لە دەوڵەتی

عاسمانلی جودانەبوونەوە لەدژیشی هاوکاریی بەریتانیایان کرد؟ ئەگەر گەلێک هەستیکرد بوونە نەتەوەیی و ڕۆشنبیری و ئابوورییەکەی تووشی مەترسی دەبێ. ئەوە گێلییە ئەگەر پەنا بۆ لە فەلاکەت دەرباکردن نەبا و جیانەبێتەوە. ئاخر دوایە ونجڕونجڕ دەبێ و وێران دەبی و خوێنی لەبەر دەڕوا، ئەوجا پێیدەڵێن بەرانبەر ئەو یەکێتییە سـوومە کرنۆش ببا! کێ هۆی دابڕانە، کوردەکـان یـان حکوومەتە حـارەبییە یەک لە دوای یەکەکـان؟ ئەگەر ئازادمان بکەن، پێتان دەڵێین "خوا خێرتان بنووسێ و خواتان لەگەل و، جیادەبینەوە"
سەرۆک تووڕەبوو و گوتی: دەتانەوێ جیاببنەوە " یەخەمان بەردەن وجیابنەوە". بە هێمنی گوتم: ئێمە یەخەی ئێوەمـان گرتووە یـان ئێوە؟ ئێوە یەخەمـان بەردەن و جیـادەبینەوە"، ئێمەشئیسراحەت دەکەین و ئێوەش. لێرەدا هەمووان پێکەنین و، سەرۆک ئاوازەی قسانی گۆڕی و گوتی: واژووت لەسـەر پەڕەیەی سپی بۆ دەکەم و بۆ بارزانیی ببە، با پڕیکاتەوە و من ڕازیم. گوتم: مانای وایە ئێوە بە هیچ شـتێک ڕازی نین، داوایەکانی بارزانی دیارن، داویەتییە حکوومەتە یەک لەدوای یەکەکان، داوای ئەو لە چوارچێوەی ئۆتۆنۆمیدایە، جا ئەگەر بەوەی ڕازیبن گفتوگۆ لەسـەر ئەو بنچینەیەی دەسـتپێدەکا و، منیش ئامادەم بچمە لای بارزانی و هانیدەم لەسەر ئەو بنەمایە لەگەڵ حکوومەتەکەتان دەست بە گفتوگۆ بکا.
سـەرۆک گوتی: دەتوانی پرۆژەیەکی ئۆتۆنۆمیمان بۆ گەلاڵە بکەی تا لێیبکۆڵینەوە؟ گوتم: بەڵێ.
جا لە مەودای دوو ڕۆژان نووسـراوێکم ئەنجوومەنی سـەرکردایەتیی شـۆڕش و تێیدا بیرۆکەی ئۆتۆنۆمی و نـاوەرۆکی و پەیوەندیی نێوان نـاوچەی ئۆتۆنۆمی و حکوومەتی ناوەندم ڕوونکردبووەوە و، بۆ سـەرۆکم برد. ڕۆژی دواترێ بانگی کۆشـکی کۆماریی کردم و داوای لێکرم پرۆژە یاسـای ئۆتۆنۆمی بخەمەڕوو تا لێکۆڵینەوەی لەسـەر بکرێ و منیش وامکرد و دواترێ بووە بنەمایەک بۆ گفتوگۆی نێوان حکوومەت و سـەرکردایەتیی کورد.

## حیزبی شیوعی پیلانی "ڕاوی" ئاشکرا دەکا:

ئێوارەی ١٦ی کانوونی دووەمی ١٩٧٠، یەک لە هاوڕێیانی مەکتەبی سیاسی داوای لێکردم نامەیەکی گرنگ و بەپەلە یەکسەر بۆ ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆکی کۆمار ببەم. نامەکەش کراوەبوو وهەواڵی ئەوەی تێدابو پیلانێکی کۆنەپەرستانە لەسەر روودانە تا حکوومەت بڕووخێنێ و تۆڵە لە بەعسییەکان و شیوعییەکان بکاتەوە، سەعاتیسفری جێبەجێکردنیشی ڕۆژی ١٧ی کانوونی دووەمی ١٩٧٠یە و، چەرخەی بزوێنەری پیلانەکەش ئەحمەد عەبدوڵلی ڕائیدی خانەنشینە.

چوومە سەرکردایەتیی قوتریی حیزبی بەعس، دیتم هەریەک لە عەبدولخالق سامەرایی و عەبدوڵلا سەلوم لەوێندەرێنە. داوام لیکردن پەیوەندی بە کۆشکی کۆمارییەوە بکەن و بە سەرۆک بڵێن هەر ئێستا دەبێ ببینم.کە پەیوەندییان بە کۆشکی کۆمارییەوە کرد، گوترا سەرۆک لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشە و، چەند دەمەترێک لە بنکەی سەرکردایەتیی قوتری دوورە. ئیدی داوام کرد یەکسەر سەرۆک ببینم و لەبەر بابەتێکی مەترسیداریش. بردمیانە حوورێکی کۆشک تا داواکارییەکەم بە سەرۆک دەگەیەنن.

سەرۆک بەکر بە سەرسامییەوە هاتە ژوورەکە، ئیدی نامەکەم دایە و خوێندییەوە بەڵام هیچ نیشانەیەکی نیگەرانیم بەروویەوە نەدیت. گوتم: هاوڕێ ئەبو هەیسەم خۆتان توندکەنەوە، سەری سوڕما، گوتی: چی؟ شتێکی مەترسیدار لەئارادایە؟ دڵنیابووم نامەکەی بەوردی نەخوێندەوە، بەڵکو چاوەڕێ بوو من هەواڵە دروستەکەی لەدەستی بنێم. گوتم: ئەدی نامەکەت نەخوێندەوە؟. دیسان خوێندییەوە، ئەوجا ڕەنگوڕواژای گوڕا. گوتم: سبەینێ سەعاتی سفرە. سوپاسی کردم و سوپاسی حیزبی سیوعیی کرد بۆ ئەو دڵسۆزییەی بەرانبەر گەل و نیستمان و، گوتی: مادام ئێمە ئەو دووحیزبە هاوکاریی یەکدی دەکەین، کەس ناتوانێ دەست لە شۆڕش بوەشێنێ.

لە پیلانەکەی عەبدولوەهاب شەوافیرا کە دژی حکوومەتەکەی عەبدولکەریم قاسیکردبووی، نۆ کەس ە بەندیخانەی موسڵ بوون فەرمانی لەسێدارەدانیان درابوو، بەهەلم زانی تا داوای لێبووردنیان بۆ بکەم. گوتم ئەوانەی فەرمانی لەسێدارەدانیان دراوە تاکەی لەژێر بەزەیی چەقۆی قەسابیدابن؟ گوتی لە خوای بترازێ کەسی دی ناتوانێ ڕۆحیان بکێشێ.

گوتم:من دەزانم ئێوە لە سێدارەیان نادەن، بەڵام دەبنە قوربانیی پیلانێکی ئاوەها. گوتی: دڵنیابە، بە زووانە دەگەڕێنەوە ناو خاووخێزانیان. گوتم: سوپاستان دەکەم، بەڵام تکام وایە لە موسڵیان بگوازنەوە و لێبووردنێکی گشتییان بۆ دەربکەن. گوتی: سبەی

دەگوازرێنەوە و دوای ڕامالّینی ئەوپیلانەش لێبووردنیان بۆ دەردەچێ. جا دوای چەند ڕۆژێک لێبووردنیان بۆ دەرچوو و بەردران.
من گومانم لەوەی نییە کە هەوالگریی عێراقی، دوای ئەوەی هەوالّی پیلانەکەی گەیشتێ، کەسانی خۆی گەیاندە ناو پیلانگێڕان. ئەو دەمای گۆڤاری ئەنواری بەیرووتی، دوای پیلانەکە، دۆسییەیەکی تایبەتی سەبارەت بە وردەکاریی پیلانەکە و ئەو بەلّگانە بلاوکردەوە کە کەوتبوونە دەست دەستەی لێکۆلّینەوە. من پێموایە زۆربەی بەلّگەکان هەر لە شەوی دەستپێکردنی پیلانەکە دەستی بەسەردا گیرابوو.

## پیلانەکەی ڕاوی وەک سەدام گێڕایەوە:

سـەدامی ئەودەمی جێگری سـەرۆکی ئەنجوومەنی سـەرکردایەتیی شـۆڕش بوو، دەڵێ: ئامانجی سەرەکیی پیلانەکە ئەوەبوو عێراق ببەنەوە کاتی پێششۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨، ئەوجارەیان ڕوخسـاری نوێی بەکرێگیراوی نوێ خرابوونە سـەر ئەو پیلانە کۆنەپەرسـتییە، لەوانەش عەبدولغەنی ڕاوی وکۆمەڵێ ئەفسـەری دوا ١٧ی تەممووزی ١٩٦٨ خانەنشـین کرابوون و ئەوجارەیان شـێلگیرانەتر هەوڵی هەندێ ولاتی بێگانە وەگەڕخرابوون و، دڕندانەتر و توندوتیژتریش پشتیوانیی پیلانەکەیان دەکرد، توانای نوی خرابووە بەردەستی پیلانگێڕان. حکوومەتی ئێرانیش وەک بنکەیەکی هەواڵەکردن و بەرەی پێشـەوە بەکارهێنرابوو تا بە جیددیەتێکی پترەوە مامەلە لەگەل ڕێچکەکانی کارەکە بکەن.
ئەو کارەش هەر بۆ دەسـتەبەرکردنی مەبەسـتەکانی ئیمپریالیزم و ئیسـتیعمار بوو کە چەندین سـاڵ بوو لە بەدیهێنانیان دەسـتەپاچەبوو، ئیدی ئەو دەسـتەپاچەییە وای لە ئیمپریالیزم و ئیستیعمار کردبوودڕندانەر و دەستکراوەتر پشتی پیلانگێڕان بگرێ، چونکە درکی بەوەی کردبوو عێراق و بنکە شـۆڕشـگێڕییەکەی ئەو مەترسـییەن کە هەڕیسـی لە بەرژەوەندییە سیاسی و ئابووری و مۆنۆپۆلەکان و پرۆژەکانی ئیستیعمار دەگرێ.
دەزگای جێبەجێکاری پیلانەکەهاوپەیمانیی ئەنگلۆ- ئەمریکی و ئەو کۆنەپەرسـتانە بون کە ویژدانی خۆیـان فرۆشـتبووە بێگـانە و، ئەوەش هەر بۆ یەک ئـامـانج بوو و ئەویس ڕووخاندنی ڕژێمی دەسەلاتی شۆڕشگێڕی عێراق بوو.
ئەوجا سەدام حوسێن دەڵێ: بەپێی ئەو بۆچوونە، دەبێ پیلانگێڕان بە دڵنیاییەوە شکستی هەموو هەوڵێکی چارەسـەرکردنی ئاشـتییانەی کێشـەی کوردیان خسـتبێتە حیسـاباتی خۆیانەوە، تا عێراق بەدرێژایی چەندین ساڵ هەر لە پارچەپارچەبوونێکی ناوخۆی ناوچەی باکووردا بێ.
کەسـە سـەرەکییەکانی پیلانەکە هەریەک لە عەبدولغەنی راوی و سـەلمان داودی عەقیدی خانەنشین و عەبدولسەلام دەرگەزلی و عەمیدی روکن محەممەد ڕەشید موحسن جەنابی و عەقیدی روکنی خانەنشـین سـالح مەهدی سـامەرایی و عەمیدی خانەنشـین محەممەد فەرەج جاسـم وعەقید جابر حەسـەن حەداد و و عەبدولغەنی شندالەی ئەندازیار و دکتۆر نیزامەدین عارف و عەقید کەماڵ وڕاوی و ڕائید ئەحمەد عەبدوڵلا بوون.
هەر لەسـەر هەمان ڕێچکەشـدا، حیزبی شـیوعیی عێراقی ئەو هەوڵەی بردەوە سـەر دەسـتپێکردنی دانوسـتانی نێوان حکوومەت و سـەرکردە کوردەکان و'ترسـی دەزگا خۆرئاواییەکان نەکا دانوسـتانەکان بگاتە کۆتاییهاتنی ململانێی چەکداری لە کوردسـتان.
ئیدی هێزەکانی سوپای عێراقی دەگوازرێنەوە تا بەرەی خۆرهەلاتی دژی ئیسرائیل بەهێز

بکەن" . حیزبی شـــیوعییش ڕێوشـــوێنەکانی حکوومەتی بەوەی پتەوکرد کە "پیلانەکەی بۆ جەماوەرڕایگەیاند و ئاشـــکرایشـــی کرد کە پەیوەندیی بە ئیســـتیعمار و زایۆنیزم و کۆنەپەرستانی ئێرانەوە هەیە" و حیزبی شیوعی لەسەر ئەوەی راوەستا کە پێویستە بەرە دروســـتبکرێ و ، چارەســـەرێک بۆ کێشـــەی کورد بدۆزریتەوە و لێبووردنێکی گســـتی رابگەیەندرێ و، هەموو ئەفسەرەکانیش بگەڕێندرێنەوە خزمەتی سوپا.[52]

[52] ـ م ا ع، ملفات الحزب الشيوعى العراقي، رقم الملف ١٤٣٣، منشورات وبيانات، لاحزب الشيوعي العراقي،ناضلى يا جماهير شعبنا من اجل قطع دابر التامر الرجعي الاستعماري، منشور بخط اليد، بغداد، ٢ كانون الثاني ١٩٧٠.

## یەڤگینی بریماکۆڤی نێردراوی سیڤیەتی و بەیاننامەی ۱۱ی ئازاری ۱۹۷۰:

کە دانوستانی نێوان حکوومەتی بەعس و سەرکردایەتیی بزووتنەوەی کوردی دەگەڕا، من پشکنەری گشتی بووم لە وەزارەتی چاکسازیی کشتوکاڵی و، ڕاوێژکاری وەزیریش بووم. ڕۆژێکیان یەڤگینی بریماکۆڤ هاتەلام"دواتریش بووە وەزیری دەرەوەی ڕووســــیا" لەگەڵ تەرجومانێک هاتبوو کە ژنی دکتۆر سەلاح خالس بوو ناوی دکتۆر سوعاد محەممەد خزر بوو. بریماکۆڤ پێیگوتم دانوســــتانیی نێوان حکوومەت و شــــاندی کوردی گەیســــتووەتە قۆناغێکی ســــەخت و، شــــاندی کوردی ئێســــتا خۆیان دەپێچنەوە بچنەوە کوردســــتان، جا پرســــیاری ئەوەی لێکردم داخوا دەتوانم شــــاندی کوردی ڕازیکەم بمێننەوە یان هەندێکیان بمێننەوە تا دانوســــتانەکان بەردەوام بن؟ چونکە ئەگەر دانوســــتانەکان بپچڕێن ئەســــتە جارێکی دی هەردوولا کۆبکرێنەوە.
بریماکۆڤ، لە بەغدا، وەک پەیامنێری ئاژانســی نۆڤۆســتیی دەنگوباســی ســۆڤیەتی بەدوای ڕێوانی دانوســــتانەکانی نێوان حکوومەت و کوردەکاندا دەچوو. بەڵام لە ڕاســــتیدا ســــەرکردایەتیی ســــۆڤیەتی ڕایســــپاردبوو بەدواداچوون بۆ کێشــــەی کورد بکا، چونکە سۆڤیەتییەکان لایەنگری ئەوەی بوون کێشەکە بەئاشتی چارەسەر بکرێ.
ڕاستیەکەی، جوومە ناوجەی "کۆشکی سپی"ی شاندە کوردییەکە لەوی دابەزیبون، دیتم هەر بەڕاستی جانتایان دەپێچنەوە تا بگەڕێنەوە و، سەرۆکی شاندەکەش ئیدریسی کوڕی مەلا مســــتەفا بارزانی بوو. لەڕێی هەندێ گفتوگۆی بابەتییانە بارزانی ڕازیکەم ژمارەیەک ئەندامی شــــاندەکە بۆ دانوســــتانی هەندێ بابەتی لەســــەری هاوڕا نەبوون بمێننەوە و ئەوانیدی بۆ پرســوورای بەڕێز مســتەفا بارزانی بچنەوە کوردســتان. بریماکۆڤ زۆری دڵ بەو ئەنجامەی خۆشبوو و، دانوستانەکانیس هەر بەڕاستی بەردەوام بوون و ئەندامەکانی دیکە شــاندەکەش لەگەڵێشــیان هەردوو کوڕی بارزانی، ئیدریس و مەســعود، هاتنەوە و هەردوولا توانییــان بگەنە ڕێککەوتنی ۱۱ی ئــازاری ۱۹۷۰ و، بەو ڕێککەوتنەش پــارتی دیموکراتی کوردســــتان بە پێنج وەزیر لە حکوومەتدا بەشــــدار بوو و ئەوانیش بەڕێزان سامی عەبدولڕەحمان و نوری ساوەیس و نافیز جەلال و ساڵح یوسفی و موحسین دزایی بوون، هەرچی پەیوەندیی نێوان بەعس و حیزبی ســــیوعی بوو خاڵی جیاوازیان لەســــە کۆمەڵێ بابەت لەنێواندا بوو، لەوانەش هەڵوێســــتی ســــیاســــی و چارەســــەری کێشــــەی فەلەستین و، مەسەلەی بەرەی نیشتمانی و ئازادییە دیموکراتییەکان.

**سیاسەتی بەعس دوای بەیاننامەی ۱۱ی ئازاری ۱۹۷۰:**

کە ڕێککەوتنی نێوان بەعس و بزووتنەوەی کوردی تەواوبوو، بەعس لە ڕۆژنامەی"الثورة"ی زمانحاڵی خۆی ڕایگەیاند، حیزبی بەعس پابەندی ئەوەی نییە بەرە لەگەڵ حیزبی سیوعی دروست بکا و، ئیدی باس هەر باسی هەردوو حیزبی هاوپەیمان بوو؛ بەعس و پارتی دیموکراتی کوردستان.

بەڵام بەعس خۆی بۆ ئەوە ئامادەدەکرد لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوت دەست بە دانوستان بکا و هەمان ئەو داواکارییانەیشی هەبێ کە عەبدولکەریم قاسم داوای کردن و دوای ئەویش عەبدولسەلام عارف و پاشانیش عەبدولڕەحمانی برای. کۆمپانیاکانی نەوت لە هەوڵی ئەوەیدابوون ئەو ئاستەنگە داراییانە بقۆزنەوە و وەبەرییێنن کە تووشی حکوومەت ببوو، هەتا ناچاری بکا لەبەرانبەر زیادکردنێکی سنووورداری بەرهەمی وایدەکرد حکوومەت سەروسامانێکی پتری دەستکەوێ تا ئەو دۆخە داراییە قورسەی ئێستای تێپەڕێنێ، وا لە حکوومەت بکا دەستبەرداری داوایەکانی ببێ.

ئەو هەڵانەی عەبدولکەریم قاسم کردی و پێش ئەویش دکتۆر موسەدەق لەئیران کردی، ئەودەمەی لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوت کەوتنە ملە، هوکاریی هێزە شۆڕشگێڕەکانی ولاتیان نەکرد"حیزبی شیوعیی عێراقی و ، حیزبی تودەی ئێران"ژەنەراڵە کۆنەپەرستەکانی هەردوو وڵاتیان هێشتەوە، ئیدی خۆیشیان بە کودەتایەکی لە دژیان کرا و بە پاڵپشتی و ڕەزامەندیی کۆمپانیانەوتییەکان، کۆتاییان هات. هەرچی حکوومەتی بەعسی عێراقە، کە دڵنیابوو دانوستانەکان لەگەل کۆمپانیایەکانی نەوت گەیشتووەتە ڕێیەکی ئەوسەری دەرناچێ و خۆماڵیکردنی کۆمپانیاکانی نەوت تاکە بژاردەی بەردەمیەتی، ئەو جا لە هاوپەیمانیی پارتی دیموکراتیی کوردستان دەترسا و، هەڵوێستی بارزانیی لە ململانێی کۆمپانیاکانی نەوت بۆ روون نەبوو. حیزبی سیوعی، سەرباری ئەوەی هێزیکی گەورەی جەماوەری بوو، دوژمنی جێگیری ئیستیعمار و مۆنۆپۆلەکانی نەوتیش بوو، جا دەبوایە بەعس سوودی لە هەڵەکانی قاسم و موسەدەق وەربگرتایە و ئەفسەرە کۆنەپەرستەکانیان لە سوپا و حکوومەت دووربخستایەوە. ئیدی بە دوورخستنەوەی نایفی سەرۆکوەزیران و ئیبراهیم عەبدولڕەحمان داودی وەزیری بەرگری دەستیپێکرد و، هاوپەیمانیی لەگەڵ هێزە پێشکەوتنخوازەکان کرد کە خۆی لە حیزبی شیوعیی عێراقیدا دەنواند، ئەگەرچی هێشتاش بەئامانجی قەوارەبەندکردنی و لاوازکردنی هێشتا شیوعییەکانی دەچەوساندەوە، کەچی داوای هاوپەیمانیی سێ لایەنەی نێوان حیزبی بەعس و پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعیی عێراقیی کرد و ڕاستییەکەیشی، دانوستانی پێکهێنانی ئەو بەرەیە سەرەتا لەنێوان ئەو سێ حیزبە و سەرباریش چەند سەربەخۆیەکی وەک عەزیز شەریف و عەبدوللەتیف شەواف و هیشام شاوی بەڕێوەچوو.

حیزبی بەعس فسـاری دەخسـتە سـەر سـەرکردایەتیی بزووتنەوەی کوردی تا هەموو پەیوەندییەکی لەگەڵ حکوومەتی سـای ئێران ببڕێ، لەکاتێکدا سـەرکردایەتیی ناوبراو پێیوابوو حیزبی بەعس دەیەوێ لە هەموو لایەنێکی پشـتیوانی دایبماڵێ و دایبڕێ و ئەوجا دەستی لێ بوەشێنێ. لە دانیشتنێکی جوارقۆڵیی تێیدا ئامادەبووم، عەبدولخالیق سامەڕایی نوێنەری بەعس پێشـنیاری بۆ پارتی دیموکراتی کوردسـتان کرد هەموو پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکوومەتی شـا بپچڕێنێ. کلێشـەیەکی بنەبڕیشـی لەو بارەیەوە خسـتەڕوو، بەلام نوێنەری پارتی دیموکرات ئەو کلێشـەیەی ڕەتکردەوە، ئەوجا حیزبی شـیوعی کلێشـەیەکی هەموارکراوی خسـتەڕوو کە پارتی دیموکراتی کوردسـتان ئەوکاتە پەیوەندییەکانی بە ئێرانەوە بپچڕێنێ کە بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ جێبەجێکرا، نوێنەری حیزبی بەعس بەو کلێشیە رازیبوو، بەلام نوێنەری بارزانیی سامی عەبدولڕەحمان بوو، لە کۆبوونەوەکە رایگەیاند ئەگەر حیزبی بەعس لەسـەر ئەو ڕێچکەیەی ئێسـتای بەردەوام بێ، ئەوا سـەرکردایەتیی کورد پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکوومەتی ئێران دەمێنێ، جا ئەو هەڵوێسـتە بنەبڕە وایکرد دانوسـتانەکانی پێکهێنانی بەرەی نیسـتمانی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان بپچڕێ.

## بەڕێوەبەری ئاسایش هەوڵی کودەتا دەدا:

سەرۆک بەکر لە سەردانی پۆلۆنیا و بولگارستان بوو، بە وەزیرەکان ڕاگەیەندرا لە ساتی گەڕانەوەی لە فڕۆکەخانە ئامادەبن بۆ پێشوازیی لە ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٧٣. دوای جاوەڕوانییەکی درێژپێیانگوتین سەرۆک سەعات و نیوێک دوادەکەوێ، جا ئەوەی ئارەزوو دەکا بچێتەوە ماڵ دەتوانێ بچێ، بەلام ژمارەیەک وەزیر و ئەندامانی سەرکردایەتیی قوتریی حیزبی بەعس، لەبەر دووریی ماڵەکانیان لە فڕۆکەخانە مانەوە.
من و عامر عەبدوڵلا و عیزەت مستەفا و عەبدولخالق سامەڕایی و محەممەد فازڵ لە ئەلقەیەک دانیستبووین، هەریەک لە عامر عەبدوڵلا و عیزەت مستەفا دەربارەی خەلکی "عانە" قسەیان دەکرد، بەلام هەریەک لە عەبدولخالق سامەڕایی و محەممەد فازڵ گرژییەکیان بە ڕووانەوە دیاربوو، دوای ماوەیەک چوونەدەرەوە و لە گۆڕەپانی فڕۆکەخانە پیاسەیان دەکرد و قسەیان دەکرد، ئێمە، ئەودەمی هەستمان بە هیچ نەکرد. بەلام دوایە دۆخەکەمان هێنایەوە بەرچاو.
پێش وادەی دیاریکراو کۆمەڵە گەنجێکی زۆر هاتنە فڕۆکەخانە و پاس هێنابوونی و کراس و شەرواڵیان لەبەردابوو دەمانچەکانیان لەبن شەرواڵەکانیان شاردبووەوە. لە گۆڕەپان و سەربانەکان بڵاوبوونەوە و ئەوانەی پاسەوانیی فڕۆکەخانەیان دەکرد بردرانە دەرەوە.
دوای ماوەیەک سەدام حوسێنی جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش پەیدابوو و ، بێ ئەوەی بە هۆڵی پێشوازیدا تێپەڕێ و سڵاو لە وەزیرەکان بکا، چووە هۆڵی تایبەت. ئامادەنەبوونی حەماد سیهابی وەزیری بەرگری و سەعدون غێدانی وەزیری ناوخۆ لەکاتی لەعێراق نەبوونی سەرۆک، لەبەر هۆکاری ئاسایشی، شتێکی ئاسایی بوو.
هۆی دواکەوتنی سەرۆک بەکرد ئەوەبوو فڕۆکەکەی لە فڕۆکەخانەی "ڤارنا"ی بولگاریا نیشتبووەوە و، چیکۆڤی سەرۆکی بولگاریاس بەوەی دەزانی، ئیدی هاتبووە "ڤارنا" و، تا فڕۆکەکەی پڕ بەنزین دەکرێ، بۆ خوانی نیوەڕۆ میوانداریی سەرۆک بەکری کردبوو.
کە سەرۆک بەکر گەیستەجێ بەپێی پرۆتۆکۆلی باو پێشوازییەکی فەرمیی لێکرا و، لای پلیکانەی فڕۆکەکە سەدام حوسین پێشوازیی لێکرد، ئەوجا هات و تەوقەی لەگەل ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی سۆڕش و وەزیرەکان و ئەندامانی سەرکردایەتیی قوتریی حیزبی بەعس کرد بی ئەوەی هیچ شتێک ڕووبدا و، کەژاوە فەرمییەکەیش بە ئاسایی ڕۆیی و ئۆتۆمۆبیلەکەی سەرۆک و سەدام حوسینیشی لەگەلدابوو. ئۆتۆمۆبیلێک لە پێش ئۆتۆمۆبیلەکەی سەرۆک دەرکەوت دواترێ دەرچوو چوار مووشەکی لە گلۆپەکانی دواوی هەلگرتبوو تا ئەگەر غافلکوژیی سەرۆک و جێگرەکەی سەرکەوتوو نەبوو، لە چوارڕیانی شەمەندەفەری بەغدا-بەسرا بە ئۆتۆمۆبیلەکەی سەرۆکیدا بتەقێنێتەوە. بەلام ئۆتۆمۆبیلەکە

پێش ئەوەی بگاتە ئەو چوارڕیانە، ئۆتۆمۆبیلەکەی سەرۆکی جێگرەکەیسی لەگەڵدابوولایدا و چووە کۆڵانێکی خۆڵی دەچووەوە سەر کۆسکی کۆماری و کەژاوەکەی پێشوازی بەردەوام بوو و لە نزیک گۆڕەپانی مووزەخانە بڵاوەی کرد.
کە بۆ پیرۆزبایی دەربازبوون لەو هەوڵەی غافڵکوژی چووینە دیداری، سەدام حوسێن گوتی: من لە هەڵوێستی ئاوا وەک خۆپارێزییەک لەگەڵ سەرۆک سوارنابم، بەلام سووربونی سەرۆک وایکردسەرکەومە ناو ئۆتۆمۆبیلەکە، وەک خۆپارێزیی هەر نکاوییەکیش بە شوفێرەکەم گوت پێچ بکاتەوە و بچێتە ئەو کۆڵانەی دەچووەوە سەر کۆشکی کۆماری.
پلانەکە ئەوەبووە کە پێش گەیشتنەجێی سەرۆک کەسایەتییە گرنگەکان بگیرێن. هەریەک لە حەماد شیهابی وەزیری بەرگری و سەعدون غێدانی وەزیری ناوخۆ و مزهر ئیبراهیم ئەلحەسەنی سکرتێری سەرۆک، بە هەنجەتی پیشاندانی هەندێ دامەزراوەی خێزانیی لە ناوچەی فەزیلییە بۆ بەرگریی فەلەستینی ئامادەکرابوون، پەلکێش کرابوون و لەوێ لە حەسارگەیەکی نهێنیی ژێر زەوی دەستگیر دەکرێن.
سەری ڕێکخەر و جێبەجێکاری پیلانەکە نازم گزاری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوو. بڕیار وابوو عەبدولخالق سامەرایی ببێتە سەرۆککۆمار و، نازم گزار لە تەلەفزیۆنەوە چاودێریی جێبەجێکردنی پلانەکەی دەکرد، کە ڕێوڕەسمی پێشوازییەکەی بلاو دەکردەوە، کە بە شکستی پلانەکەی زانی بارمتەکانی لەگەڵ خۆی برد و برووسکەیەکی ئاڕاستەی سەرۆک بەکر کرد کۆمەڵێک داواکاریی تێدابوو؛ لەوانەش دەستپێکردنەوەی شەڕ دژی سەرکردایەتیی کورد. لەگەڵ گەیشتنی برووسکەکە و ئاشکرابوونی پلانی پیلانەکە، چەند یەکەیەکی هێزی تایبەتی بە هەلیکۆپتەر بردران دوای ئەو ئۆتۆمۆبیلانە کەوتن کە نازم گزاردارودەستەکەی تێدابوو و بارمتەکانیشیانلەگەڵ خۆ بردبوو و بەرەو سنووری ئێران دەچوون کە لە ئۆردووگایەکدا نزیکەی "١٧٠٠" کەسی ڕاهێنراوی کورد و عارەبی تێدابوو و بۆ ئەوە ڕاهێنرابوون تا کاری تێکدەرانە لە ئێران بکەن.بەلام پێش ئەوەی بگەنە ئەو سەربازگەیەهێزە تایبەتەکانی لە کۆپتەرەکان دابەزیبوون گەیشتنە سەریان. فەریق سەعدون غێدان، کە لە نەخۆشخانە جوومە سەردانی، پێیگوتم: من و فەریق حەماد سیهاب چاومان بەسترابووەوەلە کوسنی پشتەوەی ئەو ئۆتۆمۆبیلە بووین نازم گزاری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیی تێدابوو، ئەو لە کورسیی پێشەوە دانیشتبوو، کە گوێمان لە دەنگی سەربازانی یەکە تایبەتییەکان بوو لە کۆپتەرەکان دەهاتنەخوارێ، بە حەماد شیهابم گوت"برادەران گەیستن"، جا نازم گزار ئاوڕێکی لێداینەوە و گوتی: "پێش ئەوەی بمکوژن، دەتانکوژم" ئیدی بە دەمانجەکەی چەند فیسەکێکی پێوەناین و بریندارbووین. بە حەماد

شیهابم گوت : "خۆت بکه مردوو نەکا فیشەکی دیمان پێوەنێ"، بەڵام هەستمکرد حەماد لە ئاوزینگان بوو و سەری بەسەر سانمدا لاربووەوە. هەرکە هێزە تایبەتەکان و کۆپتەرەکان گەیشتن نازم گزار هاتەخوارەوە و ویستی رابکا، بەڵام سەربازەکانی گەیشتنێ و لە عاردییان دا. لێرە گویم لیبوو دەیگوت: "من بەتەنیا ئەو کارەم کردووە و عەبدولخالق پەیوەندیی پێوە نییە" و، جا ئەوانیدیش گیران و بارمتەکان ئازاد کران، مزهر ئیبراهیم ئەلحەسەنی سکرتێر و زاوای سەرۆککۆماریشمان لەگەڵدابوو و، برینداره‌کانیان گواستەوە نەخۆشخانەی و گیراوەکانیشیان بردە بەندیخانەیەکی تایبەت.

لەسەرئەوە دادگایەکی تایبەت بە سەرۆکایەتیی عیزەت ئیبراهیم دووری بۆ دادگاییکردنی نازم گزار و داروده‌ستەکەی دامەزرا، عەبدولخالق سامەڕایی و محەممەد فازڵیشیان لەناودابوو، فەرمانی لەسێدارەدانیان درا، بەڵام عەبدولخالق، بە تکایەکی میشێل حەفلەقی دامەزرێنەری حیزبی بەعس کردبووی، لە مردن ڕزگاری بوو و سزای لەسێدارەدانەکەی کرایە بەندیی هەتاهەتایی و، خرایە بەندیخانەی هەواڵگریی گشتی و، عەبدولخالق گوتبووی گوایە هیچ ئاگای لەو پیلانە نییە و تەنیا محەممەد فازڵ لە فرۆکەخانە سووسەیەکی بۆ کردبوو، عەبدولخالق لەسەر زۆر بابەتان لەگەڵ سەرکردایەتیی بەکر و سەدامی ڕێک نەبوو، لەوانەش مەسەلەی یەکێتی لەگەڵ سوریا.

لەناو پێکهاتەی وەزاری ناوی من و عامر عەبدوڵڵاش لەگەڵدابوو، بەڵام لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ ئێمە نەکرد، چونکە پیلانگێڕەکان دووپاتیانکردەوە ئێمە ئاگامان لەو کارە نییە و ئەوان ناوی ئێمەیان لەو پێکهاتەیە دانابوو گوایە لەگەڵ سەرکەوتنی پیلانەکەدا پێکیاندەهێنا.

پێش چەند ڕۆژێک هەریەک لە فایەق هۆشیار و جەماڵ بابان سەردانیان کردبووم و گوتیان نەجیب بابانی پارێزەر، کە لە نووسینگەی نوری ساوەیسی وەزیری بەکارخستن و نیشتەجیکردن دەچێتە دەرێ، ئاسایشی گشتی دەستبەسەری دەکەن، جا بۆ بەردانی داوای نێوانگیریی منیان کرد. پەیوەندیم بە نازم گزاری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتییەوە باس نەبوو. بە تەلەفۆن پەیوەندیم بە مزهر ئیبراهیم ئەلحەسەنی سکرتێری سەرۆککۆمارەوە کرد وداوام لێکرد ستیک بۆ بەردانی نەجیب بابان بکا، جا مزهر کە پاش شکستی پیلانەکە دیتم، پێیگوتم، بۆ جێبەجێکردنی داوایەکەتانبە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ نازم گزار کرد وادەیەک بۆ دیدەنی دانێ، جونکە بەرپرسی حیزبیم بوو و، وەک ڕێزێک لەو پەیوەندییە، نەمویست وەک فەرمانێک داوای لێ بکەم، بەڵکو تەنیا تکایەک بێ. نازم گزار گوتی سبەینێ سەعات دە لە نزیک نەخۆشخانەی سەلام یەکدی دەبینین و کەسیس لەگەڵ خۆت مەهینە چونکە بە ئۆتۆمۆبیلەکەی خۆم دەچینە ناوجەی فەزیلییە تا هەندێ دامەزراوەی نهێنی ببینین کە لەوێ لە ژێر زەوی بۆ بۆ بەرگریی فەلەستینیمان

دروســـــتكردووه. له وادەی دیــاریکراو به ئۆتۆمۆبیلەکەی خۆم چووم و یــاوەرەکەمم لەگەڵدابوو و لەنزیک نەخۆشـــخانەی ســـەلام بووین. نازم گزار هات و داوای لێکردم ئۆتۆمۆبیلەکەم بنێرمەوە و له ئۆتۆمۆبیلەکەی ئەوا ســـەرکەوم. ئەوجا رووماں له فەزیلییە کرد، لەوێ لەناو بینایەکی ئاســـایی کە بە پلیکانەکاندا چووینەخوارێ بۆ ئەو دەزگایەی گوایه دروستکراوە، دووکەس هێرشیان کردە سەرم و له زەوییاندام و دەست و چاویان بەســـتامەوە ومنیش هاوارم دەکرد و جنێوم دەدا، له ژووریکەوە گوێم لە دەنگی حەماد شـیهاب بوو دەیگوت: "تۆیسـیان هێنا؟" خسـتمیانە ژوورێکی بچووک و دەرگایان لەسـەر داخســـتم. ئەوجا ئەوەی رووی‌دا ڕوویدا و دوای ئاشـــکرابوونی پیلانەکه ئەوانییان وەک بارمتە برد و مزهر ئیبراهیم لە ئۆتۆمۆبیلێکی دیکەدا بوو و هیچ ئازارێکی پێ نەگەیشتبوو.

**ڕەتکردنەوەی جەژنانەی سەرۆک بەکر:**

دوای ئەوەی حیزبی سیوعی له ١٩٧٢ بە دوو وەزیر بەشداریی حکوومەتی بەعسی کرد، بژاردەکه کەوتە ســـەر هەریەک له عامرعەبدوڵلای وەزیری دەوڵەت و "من"ی وەزیری ئاودێری.

ســەرۆک بەکر پەیوەندیی دۆستانەی لەگەڵ مندا هەبوو، ئەو ڕێز و خۆشـەویستیی بۆ من هەبوو، ســەرباری ئەو پەیوەندییە سـیاسـییە باسـەی لە نێوانماندا هەبوو، ئەو باسـی ئەو چاکەیەی مامەکانمی دەکرد کە لە سـەردەمی عوسـمانلییان بەرانبەر مامەکانی کردبوویان، ئەوکاتەی ڕایانکردبوو و پەنایان بۆ هێنابوون، دەیگوت نزیکەی ساڵێک لەسایەی مامەکانم مابوونەوە، بەلام هەندێ ڕووداوی ناخۆش لەنێوانمان ڕوویاندا و دوایە دۆســـتایەتی گەڕایەوە نێوانمان.

ســەرۆک ڕاهاتبوو بەبۆنەی جەژنە ئیسـلامییەکان هەزار دیناری پێشـکەشـی وەزیرەکان دەکرد تا تا ببێتە پاڵپشـــتی مووچەکەیان بۆ خەرجییەکانی جەژن. لە یەکەم جەژنی دوای وەرگرتنی پۆســـتی وەزیریئاودێری لە ١٩٧٢، زەرفێکی هەنارد و هەزار دیناری تێدابوو، بەڵام من پارەکەم بە نووسراوێکی فەرمیی وەزارەتەوە بۆ ناردەوە و تێمدا نووسی:

بەڕێز سەرۆککۆماری قەدرگران

سـلاوێکی بێ گەرد..بە سـوپاسـەوە دیارییکەتانم وەرگرت کە بڕی هەزار دینار بوو، بەڵام دەمەوێ بۆ بەڕێزتانی ڕوونکەمەوە من مووچە لە دەوڵەت وەردەگرم و ئەو مووچەیەش بۆ خەرجیی خۆم و خەرجیی خانەوادەکەم بەسـە، دەوڵەت جخمەتگوزارییە ئاسـاییەکانی بۆ دابینکردووم. خەڵکێکی زۆری تەنگدەســت هەن تەمەننـای هـاریکـاریی دەســتی بەخشـــندەییتـانن تـا لەو بۆنەیەدا بیـانگـاتێ، ئیدی ســـوپـاس و ڕێزم بۆ ئێوە لەگەڵ گەڕاندنەوەی پارەکە.

گومانی تێدا نییە کە زارگۆی نامەکە دۆستانە نییە، بەڵام هەستمکرد ئەو کارە ناکرێ بێدەنگەی لێ بکرێ و قبووڵ بکرێ.
دوای چەند رۆژێک کە لە نووسینگەکەی لە کۆشکی کۆماری دیتم، لێیپرسیم بۆ پارەکەم گەڕاندووەتەوە؟ گوتم: سەرۆکی بەڕێز لە نووسراوەکە هۆیەکەم باسکردبوو، من پێویستم پێی نییە و وەرگرتنیشی بە مافی خۆم نازانم. گوتی: برادەرەکانت گلەیی لە کەمیی مووچەکانیان دەکەن. گوتم:ڕاستییەکەی ئەو مووچەیە ساڵی ١٩٣٧دیاریکراوە، جا ئەگەر وەزیریک بیەوی وەک وەزیری ئەوسا بژی، ئەوا کەمە، بەڵام من وەک هەر مرۆڤێکی ئاسایی دەژیم، خەرجیی زیادەم نییە، نە داوەت و نە شەوچەرە، ئیدی بەشم دەکا، ئەگەر هەستدەکەن مووچەی وەزیرەکان کەمە بۆیان زیادکەن، بۆ لە سواڵکردنمان رادێنن؟ بە توندی گوتی: بۆ ئەوە سواڵە؟من وەک باوکتانم. قسەکەیم بڕی و گوتم: من ئەو بڕە پارەیە بە دەرۆزە دادەنێم ئەگەر لە باوکیشمەوە هاتبێ، تکایە لەگەل من دووبارەی مەکەنەوە. گوتی باشە چۆنت دەوێ با وابێ. جا سەرۆک کە لەو بۆنانە هەزار دینارەکەی بۆ وەزیرەکان دەنارد هەندێ دیاریی رەمزیی بۆ من دەنارد، وەک بۆینباخ و بۆن و پۆستکارتی پیرۆزبایی.... لەگەڵ سلاوی ئەحمەد حەسەن بەکر، سەرۆککۆمار.

## بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخوازی ۱۹۷۳:

هەڵوێستەکانی حیزبی شیوعی لە بەرزنەکردنەوەی دروشمی رووخاندنی دەسەڵاتی بەعس و هەست راگرتن لە بارودۆخی ساڵی ۱۹٦۸، پشتی بە شیکارییەکی دروستی بارودۆخە نوێیەکەوە هەبوو لەگەڵ نیساندانی ئامادەیی حیزبی بەعس بۆ دەستەبەرکردنی کۆمەڵێ داواکاریی جەماوەر؛ لەوانەش هاوکاریکردن لەگەڵ حیزبی سیوعی و، گرتنەبەری سیاسەتێکی دژە ئیمپریالیزم. سیاسەتی حیزبیش لەو ماوەیەدا بە ئاشکرا دیاربوو کە پێکبەستنێکی دیالەکتیکیی نێوان هەردوو دروشمی"تێکۆشان" و "هاوکاری" بوو لەسەر بنەمای نەیاری و ڕەخنە لە هەموو نەرێنی و هەڵەیەکی بەرنامەی بەعس و حکوومەتەکەی. جەختی لەوەی کردەوە دژایەتیی شیوعییەت ناکا و حیزبە نیستمانییەکان ناجەوسێنێتەوە و مافی مرۆڤ پێشێل ناکا و دووری ڕواڵەتە سۆڤێتییەکان و دەمارگیریی نەتەوەیی و تایەفییە و پشتیوانی لە هەموو هەنگاوێک دەکا لە بەرژەوەندیی گەلدا بێ.

ئەو هەنگاوانەی حیزبی بەعس لەو ماوەیەدا گرتنیەبەر پاساو و خۆشکردنی سیاسەتی حیزبی شیوعی بوون. هاتە ناو مەترێزی دژە ئیمپریالیزم و بە گریدانی پەیمانی هاوڕێیەتی و هاریکاری لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت و دانپێدانانی بە کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی و هاریکاریی بزووتنەوەکانی ئازادیخوازی و ئاستیی دنیا و ڕێوشوێنی چاکسازیی کۆمەڵایەتیی لە بەرژەوەندیکریکاران و جووتیاران بوو، دەرگای هاوکاریی لەگەڵ وڵاە سۆشیالیستەکان کردەوە و، هەموو ئەو شتانەش دەرگای هاوکاریی نێوان ئەو دووحیزبەیان خستە سەرپشت.

سەرباری جیاوازیی تێڕوانینیان سەبارەت بە کۆمەڵێ بابەت، کەچی لەڕێی گفتوگۆی درێژخایەن و سەختەوە گەیشتنە کلێشەی هاوبەشی ئەو بابەتانەی لەسەری جیاوازبوون، بڕیاری خۆماڵیکردنی کۆمپانیاکانی نەوت و چوونە مەیدانی ئاشکرای ئیمپریالیزم و کارتلە نەوتیەکانیان کاری بۆ نزیککردنەوەی ئەو دوو حیزبە و واژووکردنی پەیمانی کاری نیشتمانی کرد و بەرەی نێوانیان لە ۱۷ی تەممووزی ۱۹۷۳ لەدایکبوو، بەتایبەت کە گەورەترین کۆسپی بەردەمی ئەو هاوکارییە بە دەرکردنی بەیاننامەی ۱۱ی ئازاری ۱۹۷۰و بەشدارکردنی پارتی دیموکراتی کوردستان بە پێنج وەزیران لە حکوومەت.

سیاسەتی حیزبی شیوعی بێ کۆسپ و تەگەرە نەبوو، دوو کێشەی گرنگ بەرانبەر دۆخەی هەبوو هەڵوێستی حیزبیان لاوازکردبوو، یەکەمیان بارودۆخی ناوخۆی حیزبی شیوعی و دووەمیان هەلوێستی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد.

حیزبی شیوعی کێشەی ڕەوتی چەپڕە و ڕاسترەوی هەبوو لەگەڵ ئەو کوتلەکارییانەی حیزبیان کردە چەند بەش. ڕەوتی چەپڕەو کوتلە هەلپەرستەکەی عەزیز ئەلحاج بوو کە

بانگەشـــەی بۆ ئەوە دەکرد نابێ هیچ چەند وچوونێک لەگەڵ حکوومەتی بەعس بکرێ و دەبێ، وەک شێوازی هەرەباشی خەباتی سیاسی، پابەندی تێکۆشانی چەکداری بین. ئەو تێڕوانینەی هەمەپەیوەندییەکی لەگەڵ مارکسـیزم – لینینیزم دەپچڕاند، کە هەمیشـە نکۆڵی لەوەی دەکاپاڵ بە شـۆڕشـەوە بندرێ،چونکە شـۆڕشـەکان، بارتەقای پێگەیشـتنی توندیی دژبەرییە چینایەتییەکان،ئەوانیش پەرەدەگرن و گەشە دەکەن.
ئێمە لە فەلسەفە و باوەڕی سیاسیمانەوە فێربووین کە هەر بزووتنەوەیەکی میللی چەندین شـێوەی بێ ژمار وەردەگرێ و هەمیشـە شـێوەی نوێ بۆخۆی دروسـتدەکا و شـێوە کۆنەکـان ڕەتـدەکـاتەوە و گۆڕانکـاری یـانیش پێکهـاتەی نوێ لە یوە کۆن و نوێیەکـان دروسـتدەکا. ئەرکی ئێمەس ئەوەیە چالاکانە بەشـداریی دارشـتنی شـێوازانەی خەبات و کەرەستەکانی بکەین.
کوتلەکەی عەزیز ئەلحاج، هەر لە یەکەم پێکدادانیان بەعس، زۆر ڕووزەردانە هاڕەیان کرد و، عەزیز ئەلحاجیش خۆی لەســـەر تەلەفزیۆن دەرکەوت تا ڕایگەیەنێ تۆبەی کردووە و داوایەش بووە بەعسی.
ئەو ڕەوتەی بەهادین نورییش مژدەی هاتنی دەدا، دیوی دووەمی هەمان پارەبوو. هاوڕێ بەهـادین، لە ڕێی مـاجەرای کـاروبـارەکانەوە لە لایەنە نەرێنییەکان بترازێ هیچی دیکەی پێشـــان نەدەدا. ئەو نەرێنییانەش، لە ســـەســـتەمی دەســـەڵاتی حیزبە بۆرژوازییەکان و بەتایبەت بۆرژوای بچووک، ڕەگاژۆ ببوون. جا لیســـتێکی درێژی ئەولایەنە نەرێنییانەی هەڵگرتبوو و هەر هەموو ئەو دەســـتەوتانەی وەلادەنا کە لەمەودای ســـاڵانی "١٩٦٨-١٩٧٣"وەدەست هاتبوون و بە جیا لە کاریگەری و تێکۆشانی حیزبی شیوعییش بەدەست نەهـاتبوون. ئەو هەمووجۆرە هـاوکـارییەکی لەگەڵ حیزبی بەعس ڕەتـدەکردەوە، هـاوڕێ زەکی خەیریش تاڕادەیەک لەسەر هەمان بیرورِا بوو.
هەر لەســـای ئەو ڕێوانەیدا، هاوڕێ بەهادین نوری لەبیرەوەییەکانیدا هەڵوێســـتی من سەبارەت بە وەڵامدانەوەی بەعس، کە لە هەردوو ڕۆژنامەی هەردوو حیزبدا بڵاوکراوەتەوە و گوتوومە ئەوە شتێکی ئاسایی و پێویستە، بە "خۆدزینەوە" لەقەڵەم دەدا.[53]

---

[53] _ گرنگترین ئەو شـــتانەی، لەوبـارەیەوە، لە بیرەوەرییەکـانی بەهـادین نوریـدا هـاتوون "لە حوزێرانی ١٩٧٨ کۆبوونەوەیەکی نائاسـایی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی سیوعیی عێراقی، بێ ئامادەبوونی سـترتێریش کرا .-مەبەسـتی عەزیز محەممەدی ســـکرتێری حیزبی شـــیوعییە- گفتوگۆیەکان توند و دۆخەکە گرژ بوو. ئێمە، دەســـتەیەک لە بەشدارانی کۆبوونەوەکە، داوامان کرد خێرا سەروبەری پێویست و خێرا بکرێ تا جالاکییەکانی ڕێکخستنی حیزبی و ڕاگەیانن بەردەوام بن. ئەوەس بە ئامادەکردنی چەند ماڵێک بۆشـــاردنەوەی کادیر و دەزگای جاپخانەی نهێنی. داواسـمان کرد وەلامی هەڵمەتە ڕاگەیاندنییەکەی بەعس بدرێتەوە. جا دەنگی بەرانبەر بەرزبووەوە کە پێیوابوو بابەتە ســـەرەکییەکە تەنیا کارکردنە بۆ پاراســـتنی هاوپەیمانیی بەرەیی و، هەردوو ئەندامی یەدەگی لیژنەی مەرکەزی،

گومان لەوەیدا نییە کە سەرایی ڕەوتێکی ڕاستڕەو لە ڕیزەکانی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعیی عێراقیدا دەرکەوتبوو. ئەوانیش ئەو هاوڕێیانەبوو کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد بەهەر نرخێک بێ دەبێ هاوکاری لەگەل بەعدا بکرێ. جا هاوڕێ عامر عەبدوڵلا دەیویست حیزب پەلکێشی هەڵوێستە هەڵەکانی حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیستیراکی بکا. ئەو هاوپەیمانییەس پێشەکییەک بوو تا حیزبی بەعس بچێتە باری سۆسیالیزمی زانستی.

بابەتی دووەمی کە هەڵوێستی حیزبی سیوعیی لاواز کرد، هەڵوێستی پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد بوو. ئەو حیزبە لەو دانوستانانەی لەگەڵ حکوومەتی بەعسی دەکرد، حیزبی شیوعیی پشتگوێ دەخست، لەکاتێکدا حیزبی سیوعی هەمیشە فشاری دەخستە سەربەعس تا دانوستان لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد بکا و چارەسەرێکی ئاستییانەی کێشەی کورد بکرێ. جا حیزبی سیوعی پێیوابوو چارەسەری ئاشتییانەی کێشەی نەتەوەیی کورد و کێشەی بەرباویی دیموکراتیبوون لە هەموو عێراقدا جمکەن و دیموکراتیەتیش دەستەبەری بنەڕەتیی پیادەکردنی مافی نەتەوەییە و ئەوەش لەسایەی دەست بسەر ئازادیدا گرتن کاری کردەنی نییە.

پارتی دیموکراتی کوردستان هەوڵیدا تەگەرە بخاتە بەر ڕاگەیاندنی بەرەی نیشتمانی، ئەوەشی بە پێشکەشکردنی رەشنووسیکی پرۆگرامی هاوکاریی نێوان خۆی حیزبی سیوعی کرد و دوورخستنەوەی حیزبی بەعس لە بەرەکە. هەڵوێستی حیزبی سیوعی بەرانبەر پێشنیارەکەی بارزانی نەرێنی نەبوو، بەلام لە بەرانبەردا پێشنیاری ئەوخالانەی خوارەوەی کرد:

١_ فراوانکردنی بنکەی بەرە، تا هەموو حیزب و هێزە نیشتمانییەکانی دیکەش بگرێتەوە، لەوانەش بەعس.

٢_ ئامانجی سەرەکیی ئەو هاوکارییە هاوبەش و دڵسۆزانەیە پاراستنی سەربەخۆیی وڵات وسەلامەتیی خاکەکەی و تێکۆشان بێ دژی پیلانگێڕیی کۆنەپەرستی ئیمپریالیزم لە ناوچەکە.

٣_ پابەندیی چارەسەری ئاشتییانە و دیموکراتییانەی کوردانەی کێشەی کورد.

بەڵام مەلا مستەفای بارزانی سووربوو بەرەکە لەنێوان ئەو دوو حیزبەدا بی و ئامانجی ڕووخاندنی حیزبی بەعس بێ، بەڵام ئەوە وایدەکرد لە بەرەکە دابڕێ.

ڕەنگە خەڵکێک هەبێ بڵێ هاوکاریی نێوان حیزبی سیوعیی عێراقی و حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکی لەڕێی چەندوچوونی نێوانیانەوە هاتەکایەوە، ئەوە ڕاست و بە

---

موکەرەم تالەبانیی تا ئەودەمیوەزیربوو و، بوسرا پرتەو هەڵوێستی هەرە لاواز و خۆدزینەوەیان هەبوو. ینظر: بهاءالدين نوري، مذكرات بهاءالدين نوری، دار الحكمة، لندن، ص٤٧٢-٤٧٣.

پاســـاوه. بەعس، کە بەرەیەکی فراوانی دژی ئیمپریالیزمی خۆی کۆمپانیاکانی نەوت دەنواند، کردەوە و کاتێ ئەو کۆمپانیایانەشـــی لە عێراق خۆماڵی کرد و، کە یاســـای کۆمپیانیاینەوتی نیشـــتمانیی جێبەجێ کرد و نەوتی باکووری ڕومێلەی بە هاوکاریی یەکێتیی سۆڤیەت وەبەرهێنا، پێویستی بە پشتیوانییەکی بەهێزی هێزەکانی دژە ئیمپریالیزم هەبوو چ لە ناوخۆ و چ لەناو عارەبان و چ لەنێودەوڵەتییش، حیزبی ســـیوعییش بۆ ئەو پشتیوانییە دەستنیشان کرابوو و، بەعس ئامادەی هەندێ دەست شلکردن بوو و ئامادەش بوو دەرگای گفتوگۆ لەگەل سیوعییەکان بکاتەوە تا بناغەکانی هاوکاریی نێوانیان دابندرێ.
شـــیوعییەکان، ئەگەرچی بەعیش ئارەزووی دەکرد، بۆ لایەنگیریی حکوومەت مەرجیان ئەوە نەبوو تێیدا بەشـــداربن، بەڵام داوای هەڵوەشـــاندنەوەی ئەو یاســـایانەیان دەکرد کە ئازادییەکان کۆت دەکا و دەیویســـت دیموکراتییس بەرکەمـاڵ بێ و، گرتووخانەکان هەڵوەشێندرێنەوە وکێشەی کوردیش بە ئاشتی و دیموکراتی چارەسەر بکرێ و، پەرە بە چاکســازیی کشــتوکاڵی بدرێ تا ڕەگاژۆتر بێ و یاســایەک بۆ خانەنشــینکردنی کرێکاران دابندرێ و، دەست بە هاوکاریی دامەزراوەی سۆشیالیستیی جیهانی بکرێ، خەبتی دژی ئیمپریالیزم توندتر بکرێ.
بەدەستهێنانی هەموو ئەوانەش بەرەوپێشچوونی شۆڕشی بە ئاشتییانە دەستەبەر دەکرد و، لەڕێی بەدەســـتهێنانی ئەو ئامانجانەش، حیزبی شـــیوعی چەندوچوونی لەگەڵ حیزبی بەعس کرد.
هـاوکاری و هـاوپەیمانیی بۆرژوای بچووک، بۆ چینی کریکار و حیزبە ســـیوعییەکەی، پێویســـتە و لە رووی بابەتییەوە پاســـاوی هەیە و دەبێ بۆ مەودای درێژیش بێ. وەک گوتمان ئەو توێژە بە حوکمی پێگەکەی لە کداری بەهەمهێنانی نێوان بۆرژوا و پرۆلیتاریای جێی ڕاراییە ولەنێوان چەپ و راستدا، لەنێوان پێشکەوتنخوازی و کۆنەپەرستی کە پۆلێن و جیاکردنەوەکەیشـــی هەمیشـــە هەندێ لەتوێژەکانی بەلای ئۆردووگای پرۆلیتاریاد کێل دەکـاتەوە. لەکـاتێکـدا هەنێ توێژی دەدەنە پـاڵ ئۆردووگـایکۆنەپەرســـتی و لەگەل ســـەرمـایەداری ئـاوێتە دەبێ و خزمەتی بەرژەوەنـدییە چینـایەتییەکـانی دەکـا و دژی بەرژەوەنـدییەکـانی جەمـاوەری بەرفراوانی بۆرژوای بچووکە. هەر بۆ نموونە، حیزبی بەعس لە ١٩٧٠ یاسایەکی چاکسازیی کشتوکاڵیی دەرکرد و لە یاسایەکەی ١٩٥٨ بنەبڕترە و، یاســـایەکی تایبەت بە ناوچەی کوردســـتانیشـــی بەدوادا هات و، ئاســـتی هەرەبەرزی موڵکداریی کشتوکاڵیی تارادەیەکی زۆر نزمکردەوە و، ئەو یاسایەس پشتیوانیو لایەنگیریی حیزبی شیوعی عێراقیی بەدەستهێنا، بەڵام لە ماوەی گەرمبوونی ململانێی نێوان ڕاست و چەپی ناو ڕیزەکانی حیزبی بەعس، بەرەی راستڕەو، بەســـەرکردایەتیی ســـەدام حوسێن،

بەرەی جەپی وەلانا، کە عەبدولخالق سامەرایی[54] سەرکردایەتیی دەکرد و، ئەوانیدییشی رەوانەی بەر پەتی سێدارە کرد. هەر ئەودەمای کە سەرکردایەتیی حیزب بۆ پشتیوانیی دەسەڵاتەکەی خۆی لە سەرۆک عەشیرەت و موڵکدارەکان نزیککردەوە، سەدام حوسێن، کە جووتیارێکی پارێزگای قادسیە لەبەردەمیدا گازاندەی لەوەی کرد کە یاسای چاکسازیی کشتوکاڵیی بۆ بەرژەوەندیی جووتیاران داندراوە، کەچی لە بەرژەوەندیی موڵکداران جێبەجێ دەکرێ، بە کابرای جووتیاری گوت: کێ پێیگوتووی یاسای چاکسازیی کشتوکاڵی بۆ بەرژەوەندیی جووتیار داندراوە؟ جا لە دانیشتنەکەی دەرکرد و پاشان کوڕێکی گەورەترین موڵکدار و سەرۆکی عەشیرەتی جافی، کە فەتاحی کەریم بەگی جاف بوو، کردە ئەمینداری گشتیی کستوکاڵ و چاکسازیی کشتوکاڵی ناوچەی ئۆتۆنۆمی و کابراس نەیدەتوانێ بچێتەوە ناوچەکە.

[54] _ عەبدولخالق سامەڕایی: لە ١٩٣٥ لە سامەڕا لەدایکبووە، لە ١٩٦٨-١٩٧٣ ئەندامی هەردوو سەرکردایەتیی قوتری و قەومیی حیزبی بەعس بووە. بە بەشداریکردنی بزاوتەکەی نازم گزاری ١٩٧٣ تۆمەتبار کرا و شەش ساڵ خرایە زیندان. بە بزاوتەکەی محەممەد عایشی ١٩٧٩ تۆمەتبار کرا و لە سێدارە درا. للمزید: حنا بطاطو، الكتاب الثالث،ص٤٠٢.

## چەندوچوونی ڕەوا چییە؟:

چەندوچوون لەوەیدا پوختە دەبێتەوە کە شیوعییەکان واز لەوەی بێنن داوای دەسەڵات بۆ پرۆلیتاریا و جووتیارانی هەژار بکەن. جا ئەگەر لە هەردوولا لە چەندوچووندا هیچیان دەستنەکەوێ، ئیدی چەندوچوون مانایەکی نابێ مەحاڵ دەبی. لەچەندوچووندا، شیوعییەکان ئازادیی هاندان و کارکردنیان لە دۆخێکی باشتردا دەستدەکەوێ، وەک دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی ئاشکرا و گردبوونەوەی حیزبی و چالاکیی حیزبی و جەماوەری. بەڵام، لە سایەی پێکهاتەی جینایەتیی حیزبی بەعس و بەشداریپێکردنی بۆرژوای کوردی لە حکوومەتدا، کە ئەویش هەر لە پێشکەوتنی شۆڕش دەترسا، بەخشینی ئەو ئازادییە کارێکی ئەستەم بوو. شیوعییەکان، لە چەندوچوونێکی لە سای دیموکراتییەکی بەڕاستیدا بکرێ، ناترسن، چونکە ژیان لایەنگیری ئەوانە و هیچ شتێک ناگۆڕێ. لە بارودۆخێکی دیموکراتییەت نەبێ، ڕەوتە دژبەرەکانی شیوعییانی ناو ریزەکانی حیزبی بەعس پەرەدەستێنن. جا ئەگەر چەنجوچوون دەستەبەر ببێ ڕەنگە حیزبی بەعس، توانای تەواوی جێبەجێکردنی بەرامەکانی بۆ دەستەبەر بێ. ئەویش بە پشتبەستن بە زۆرینەی خەڵکی عێراق و بەکارهێنانی ئەو زۆرینەیەش بۆ پشتیوانیی ڕێوشوێنە پێشکەوتنخوازەکانی دەستی بە جێبەجێکردنیان کردووە و، ۆڕاگریی بەرانبەر ئیمپریالیزم و ، زاڵبوون بەسەر ئاستەنگەکاندا و، دەستەبەرکردنی ئەو هەموو کاروبارانەش لە بەرژەوەندیی حیزبی شیوعیدا بوو.

گومان لەوەیدا نییە حیزبی بەعسی حەرەبیی ئیستیراکی هێندەی حیزبی شیوعی و هێندەی بۆرژواس یەک ڕەنگ نییە.ئیدی هەر دەبووایە دوو دەنگی تێدا بەرزببێتەوە، دەنگێکی نەیاری هاوکاریی شیوعییەکان، بەڵام دەبووایە زۆرینەی جووتیاران و خوازیارانی ئاستیی کوردستان بەدەستبێنن و بێ شیوعییەکانیش بچنە شەڕی خۆماڵیکردنی نەوت. ئەو ڕەوتە نەیدەتوانی بەو ڕێیەیدا بڕوا، جونکە ئەوە پێویستی بەوەی بوو چاکسازیی کشتوکاڵی بۆ بەرژەوەندیی جووتیارە هەژارەکان دەستەبەر بکا و کێشەی کورد چارەسەر بکا و گەلیش بۆ شەڕی خۆماڵیکردن و نێوانبڕیی تەواوی ئیمپریالیزم ئامادە بکا و هاوکاریی کۆمەڵی سۆشیالیستی بکا. ئەو ڕەوتە ڕاسترەوە دەیویست هاوکار و هاوڕێی بۆرژوای ڕاسترەوبێ و دژی داواکارییەکانی سەرەوە بێ. ئەو ڕەوتەش برتیبوون لە گەورە پلەدارەکانی سەربازیی پەیوەندییان بە بۆرژوای گەورەوە نەپچڕابوو و پێیانوابوو شیوعییەکان ناتوانن بەرەوڕوویان ببنەوە و، هەرکارێکی بەرانبەریشیان بکرێ ڕێی تێدەچێ پاماڵ بکرێ. هەرچی ڕەوتەکەی دیکەی ریزەکانی حیزبی بەعس بوو، دەیگوت سیوعییەکان لە نووچدانەکانیانەوە شارەزای هەستانەوە بووینە.

هەڵەس لەوەیدا نییە پرۆلیتاریا و بۆرژوای بچووک ببنە هاوپەیمان، بەڵکو هەڵە لەوەیدایە لە پێچ و پەناو بادانەوە توندەکانی مێژوودا تێڕوانینت نەمێنێ. جائەگەر حیزبی سـیوعی تێڕوانینی گشتیی خۆی بپاراستبا و بیتوانیبا،وەک لینین دەڵێ، "دەزووە سوورەکە ببینێ" ئەوا لە مامەڵەکردن لەگەڵ حیزبی بەعسدا تووشی ئەوەندە نوشوستییە نەدەبوو.

تاقیکردنەوەی بەرەی نیسـتمانی و نەتەوەیی پێشـکەوتنخواز ودوورخسـتنەوەی حیزبی سـیوعی لەو بەرەیە لە سـاڵی ١٩٧٩دا، حیزبی شـیوعیی نەدەخسـتە ناو شـیشـبەندی تۆمەتباری وەک ئەوەی سـەرکردایەتیی حیزبی لە کۆنگرەی چواری حیزبدا خسـتە ئەو شـیشـبەندەوە. بەڵکو تۆمەتبار ئەوانەبوون کە ناچارکران بەرە تێکبدەن و خۆیان بخەنە ڕیزی دژبەرانی شیوعییەکان و پێشکەوتنخوازان و، ئەو سیاسەتەش تەنیا بەسەر لاشەی تێکۆشـەرانی شـیوعیدا تێنەپەڕی، بەڵکو بەسـەر ژمارەیەکی زۆری لاشـەی سـەرکردە و کادیرەکانی حیزبی بەعسیشدا ڕۆیی.

## قەیرانی ئاو و شکستی دانوستانی دووقۆڵی:

لە هاوینی ١٩٧٣، لەبەر کۆگەکردنی ئاو لە بەنداوی' کیپان'ی تورکیا و بەنداوی 'تەبەقە'ی سوریا ئاوی فورات بەشێوەیەکی مەترسیدار کەمیکردبوو. بەپێی ڕێککەوتنە دووقۆڵییەکانی پێشتریش دەبوایە بۆ دەست بە بنیاتنانی بەنداوەکانی لای سەوەی ئەو روبارە هاوبەشە ڕەزامەندیی عێراق وەربگیرێ و، بەجۆرێکیس بنیاتبنرێ کە زیان بە بەرژەوەندییەکانی عێراق و مافە مێژووییەکانی نەگەیەنێ. چونکە ڕێککەوتنێکیش لەنێوان ئەو سێ دەوڵەتەدا نەبوو کە ڕووباری فوراتیان پێدا دەڕۆیی و تا ئاوی ڕووبارەکەشیان بە شێوەیەکی دادپەروەرانە بەسەردا دابەس بکا، ئیدی هەردوو حکوومەتی تورکیا و سووریا پێکەوە دەستیان بە کۆگەکردنی ئاو کرد و لە وەرزێکیشدا کە ئاو کەم بوو بێ ئەوەی هیچ حیسابێک بۆ بەرژەوەندی و مافەکانی عێراق بکەن.

کە حکوومەتی عێراق پۆلیسی نەوتی عێراقی خۆماڵیکرد، حکوومەتی سووریاس دەستپێشخەریی لە خۆماڵیکردنی ئەو بۆڕییە نەوتییانەدا کرد کە بە خاکەکەیدا تێدەپەڕی'تابلاین ٩ هەتاهەردوو بەندەری بانیاسی سوریا و تەرابلوسی لوبنان' و ئیدی داوای بڕیپارەیەکی دەکرد لەو داهاتەی پتربوو کە کۆمپانیای نەوتی عێراقی وەردەگرت. ئەوەش وایکرد ناچار شاندێک لە مورتەزا سەعید حەدیسیی وەزیری دەرەوە و موکەڕەم تاڵەبانیی وەزیری ئاودێری و ژمارەیەک پسپۆڕی بواری نەوت و ئاودێری پێکبهێنرێ.

گفتوگۆیەکانمان، نە لە بواری نەوت و نە لە بواری پشکی ئاوی ڕووباری فورات، هیچ ئەنجامێکی باشیان نەبوو و، شاندی سووریا بە سەرۆکایەتیی عەبدولحەلەلیم خەدامی جێگری سەرۆکوەزیران و وەزیری دەرەوەی ئەودەمی بوو.

پێشتریش، سەدام حوسێنی جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش، بە سەرۆکایەتی شاندێک بۆ ڕێککەوتن لەسەر هەندێ بابەتی گیرخوادوو سەردانی دیمەشقی کردبوو. ئەگەرچی ڕێککەوتنێکی سنووورداری لەگەڵ حافز ئەسەدی سەرۆکی سووریا کردبوو، بەڵام سەرۆکی سوریا لە دواچرکەدا پاشگەز بووەوە. ئیدی کێشەی دابەشکردنی ئاوی فورات هەواڵەی دەستەیەک پسپۆڕی یەکێتیی سۆڤیەت کرا کە سەرۆک حافز ئەسەد داوای کردبوون.

ئەو ڕۆژی بڕیاربوو شاندەکەی عێراق بگەڕێنەوە بەغدا، دیدارێکی سێ کەسی لەنێوان عەبدولحەلیم خەدام و مورتەزا عەبدولباقی و من کرا تا بەیاننامەیەکی هاوبەش سەبارەت بە دیدارەکانمان دەرکەین. خەدام قەڵەم و کاغەزێکی هێنا تا شتێک بنووسێ، گوتی: بەخوا نازانم چ بنووسم! بێگومان شتێک نەبوو پێویستی بە نووسین بێ، جا بە گەپجاڕییەوە وەڵامم دایەوە: بۆ نازانی؟ لەسەر یەکێتیی عارەبی و ڕزگارکردنی فەلەستین بنووسە.

چونکە عارەب کە ناتوانن لەسـەر دابەشـکردنی ئاوێش ڕێکبکەون، قسـە لەسـەر یەکێتی و ڕزگارکردنی فەلەسـتین دەکەن. ئەو کێشـانە دەریدەخەن یەکێتیی عارەبی و ڕزگارکردنی فەلەستین چەند دوورەدەستن. کۆبوونەوەکەش بێ دەرکردنی بەیاننامە کۆتایی هات.

## دیدارێک لەگەڵ حافز ئەسەد:

لەبەر کێشەی ئاو، پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و سوریا گرژ بوو و، ئێزگە و ڕۆژنامەکانی ئەو دوو وڵاتە هەریەک لە دژی ئەوی‌دیی دەخوێند و، هەرچەندی گەرما داهاتبا و ئاوی فورات کەمی بکردایە گرژیی نێوانیشـــیان پتر دەبوو. بڕیارمدا وەک ناوبژیوان بێمە ناو بابەتەکە و ئەو ســـەهۆڵبەندانەی نێوانیان بشـــکێنم و وابکەم عێراق بڕی ئاوی پێویســـتی دەســـتکەوێ، تا لانیکەم هەندێ چێندراوی هاوینەی پێ ڕزگار بکەین. کە بیرۆکەکەم بۆ ســـەرۆک بەکر وســـەدام حوسـێن باسـکرد بیرۆکەکەیان پێ باشـبوو و بڕیاریان دافڕۆکە تایبەتەکەی ســـەرۆک بەکرم بخەنە بەردەســـت، چونکە دۆخەکە پێویســـتی بە ســـەفەری مەکووکیی بەپەلەی نێوان بەغدا و دیمەشق و ئەنقەرە هەبوو.

سەفەری دیمەشقم کرد و هەرکە گەیشمەجێیش بەسای عەبدولحەلیم خەدام داوای دیداری سەرۆک حافز ئەسـەدم کرد و، ئەسـەد بە دیدارەکە ڕازیبوو و بە یاوەریی خەدام چوومە کۆشکی کۆماری و لە هەمان ژووردا دیتم کە چەند سـاڵ پێشـتریێ نورەدین ئەتاسیم تێدا دیتبوو.

ئەســـەد بەخێری هێنـام و گوتی: ئەگەر ئەتۆش داوای دیدارت نەکردمـایە من تۆم هەر دەدیت، بۆ ئەوە سوپاسم کرد و گوتم : سەرۆکی بەڕێز، سوریا هەمیشە ئەگەری ئەوەی لەسەرە ئیسرائیل و وڵاتە ئیستیعمارییەکان چەندبارە هێرشی بکرێتەسەر و، لەگەڵ ڕێژم بۆ وڵاتە حارەبییەکانی دیکە، بەلام عێراق بە حوکمی شـــوێنە جوگرافییەکەی بۆ ســـوریا وتوانا دارایی و ســـەربازییەکەی، تاکە دەوڵەتە بەهانای ســـوریاوە بێ ئەگەر بکەوێتە بەر هێرشـــی دوژمنان. لەو حاڵەتەشـــدا پێویســـتە گەلی عێراق بەتەواوی باوەڕی بەوەی هەبێ پێویسـتە ئەرکی بەرگریکردن لە سـووریا جێبەجێ بکا. بەلام، ئەگەر سـووریا وابکا عێراق تێبمێنێ و، زیان لە ملیۆنان خەلکی ســەر ڕووباری فورای بدا، ئەوا ئاســتەنگی راســتەقینە بۆ رازیکردنیان دروست دەکا تا بۆ بەرگری لە دەسەلاتی سوریا قوربانی بدەن. ئەو کێشە بچووکانە دەبنە گرێیەک و لێناگەڕێ کێشـــە گەورەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتە چارەســـەر بکرێن، بۆیە تکاکارم دەەلاتی خۆتان بەکاربێنن بۆ گەیشـــتنە چارەســـەرێکی گونجاوی دبەســـکردنی ئاو لەنێوان ئەو دوو وڵاتە، جا کاتی بێ یان هەمیشـــەیی، بەجۆرێک ئەو دەستکەوتانە ببەخشـێتە گەلی سـوریا کە ئێوە جاوتان تێبڕیوە و، لە هەمان کاتیشـدا زیان بەو ملیۆنان عێراقییە نەگەیەنێ کە لەسەر ڕووباری فورات دەژین.

ســـەرۆک ئەســـەد گوتی: هاوڕێ موکەڕەم، دەزانن ئێمە، جونکە دەوڵەتی ڕووبەڕووی ئیسرائیلین، بارێکی قورسمان لەسەرسانییە و، بەشێکی وڵاتیشمان داگیرکراوە. لەو داهاتە بترازێ، کە لە کشتوکاڵی سەر ڕووباری عاسی و بەلیخ و هەندێ کەناری فورات دەستمان

دەکەوێ، داهاتێکی دیکەمان نییە وامان لێ بکا خۆراگربین. ئێمە کارەبامان کەمە، دەمانەوێ حەوزەکەی تا ئەو ئاستە پڕکەین کە بەزووترین کات کارەبای پێ بەرهەم بهێنین و، کشتوکاڵی سەر فورات فراوان بکەین. هەرچی عێراقە سامانێکی گەورەی نەوتی هەیە، سەرباری رووباری فوراتیش، رووباری دیجلەشتان هەیە. دەتوانرێ لە دۆڵی دیجلەدا کشتوکاڵ فراوان بکەن و، ڕیمان بدەنێ داهاتێک لەسەر رووباری فورات بەدەستبێنین. چۆنیش دەتانەوی ئاستی گوزەرانی گەلی عێراق بەرزکەنەوە و، دەستوانن بیکەن، ئێمەس دەمانەوێ شتێک پێشکەشی گەلی سوریا بکەین. جا لەو پرۆژانەشمان پتر نییە کە لەسەر ْتەبەقەْی فورات لە دەزگای ئاودێریدا جێبەجێیان دەکەین.
گوتم: سەرۆکی بەڕێز، وەک من بزانم، بەڕێزتان ْعەلەویْنبەڕێز مەحمود ئەیوبیی سەرۆکوەزیرتان سوننەیە، بەوەش، لە پێکهاتەی حکوومەتدا شتێکتان لە هاوسەنگیی مەزەبی دروستکردووە. ئەوەش مامەڵەیەکی دروستی واقیعی وڵاتەکەتانە و، لای ئێمەش، سێ ملیۆن کەس پتر لە تایەفەی شیعە لە ناوچەی دۆڵی ئەو رووبارەدا و لەچەند شارێکدا دەژین کە لای موسڵمانان پیرۆزن و زۆریشی شوێنەواری مێژوویی لێیە. مەرقەد و مەزاری ئیمامە گەورەکانی لێیە، عەلیی کوڕی ئەبو تاڵیب و حوسێن و عەباسی کوڕی لە نەجەفی پیرۆز و کەربەلان. شاری کووفەی پایتەختی خەلافەتی ئیسلامیی لێیە، ئەو هەموو بنیادەمە و شوێنە پیرۆزەکانایان بۆ کوی بگوازمەوە، بیانبەمە دۆڵی رووباری دیجلە؟، ئەگەر کەسێکی دی ئەو قسەیە بکا، کە ئەوان دەزانن ئێوە عەلەوین، ئەوە کارەکە ئاسان بوو، بەڵام حافز ئەسەدی عەلەوی داوای وێرانکردنی ئەو ناوچەیە بکا، ئەرێ، کە وڵاتەکە هێرشی دوژمنانی دەکرێتەسەرێ، پێشبینیی ئەوەی دەکا عێراقییەکان هەڕاکەن و بێنە هانای؟ شتێکە و جێی باوەڕ نییە. گوتی: با بابەتە هونەرییەکان بکەینە تەرازوو کە لێناگەڕێ بەرژەوەندیی شتاق وڵاتان زیانی لێ بکەوێ. ئیدی ڕێککەوتین بانگی پسپۆڕە سۆڤیەتییەکان بکەین، تا بێ ئەوەی زیان بە بەرژەوەندیی هەردوو وڵات بگەیەنن راپۆرتێک لەسەر چۆنیەتیی دابەشکردنی ئاوی فورات ئامادەکەن و، دیدارەکە تەواوبوو.

## دیدارێک لەگەڵ سەرۆکوەزیرانی سوریا:

دوای ئەوەی عێراق و سـوریا و تورکیا پێکهاتن پەنا بۆ پسـپۆرە سـۆڤێتییەکان ببەن،پسـپۆرە سـۆڤێتییەکان هاتن و ڕاپۆرتێکی قووڵیان سـەبارەت بە پڕکردنی هەردوو بەنداوی "کیبان"ی تورکی و "تەبەقە"ی سـووری پێشـکەش کرد، ڕاپۆرتەکە بەجۆرێک بوو کە زیانی بۆ عێراق نەبێ و خسـتەیەکی زەمەنییس بوو بۆ فراوانکاریی کشـتوکاڵی لە تورکیا و سـوریا و دوا دابەشـکردنی ئاو لەنێوانیان، بەڵام هەرسـێ وڵاتەکە لەسـەر ناوەرۆکی ڕاپۆرتەکە و جێبەجێکیردنی پێکنەهاتن. لە هەمان کاتیشدا، پسپۆرە عێراقییەکان بە ڕێژەی دابەسـکردنی ئاو لە نێوان عێراق و سـوریا ڕازی نەبوون کە ڕێژەی "٤٠٪-٦٠٪"بوو و، پسـپۆرە سورییەکانیش لەسـەر ڕێژەی بڕیار لەسـەردراوی مەودای کۆتایی سـووربوون و بەو مەرجەی ئەو ڕێژەیە لە ئێسـتاڕا بێ و پابەندی خشـتە زەمەنییەکەی پڕکردنی بەنداوی تەبەقەش نەبوون و، تورکیاش ڕایگەیاند پابەندی هیچ بڕیارێک نابێ، چونکە هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات لە خاکی ئەودا هەڵدەقوڵێن و سەربەستە لەوەی چۆنیان بەکاردێنێ و، پابەندی ئەو مافانە نییە کە سـوریا و عێراق بەدەسـتیان هێناوە و، ئەو دوو دەوڵەتەش لەسـەر کەناری ئەو دووڕووبارە نین و بەڵکو ڕووبارەکان پێیاندا تێدەپەڕن. کە دۆخەکە بۆ عێراق تەنگ بوو، هەوڵمدا بڕە ئاوێکی فورات دەستەبەر بکەم کە لە ١٠٠مەتری سێجا کەمتر نەبێ لە چرکەیەکدا و، لە لە کلکەی بەنداوی تەبەقەوە بۆ عێراق بەربدرێتەوە. کە بڕی سروشتییش لە هاویندا لەوەی کەمتر بوو بۆیە پێویستبوو تورکیا ڕازی بکرێ کە بڕە ئاوی دیکە بەرداتەوە تا یارمەتیی عێراق بدا، ئیدی جوومە ئەنکەرە و چاوم بە "جاهید بەگ"ی وەزیری وزە و"بولەند ئەجاوید"ی سـەرۆکوەزیران کەوت، تورکەکان ڕازیبوون ئەو بڕە ئاوەی باسـکرا بەردەنەوە بەو مەرجەی سـووریا ئەو بڕە زیـادەیە گـل نەداتەوە و کۆگەی نەکـا و بۆ عێراقی بنێرێ. هەر ئەو ڕۆژە گەڕامەوە دیمەشق، مونیر ونوسی وەزیری بانداوی فوراتم دیت، دوای ئەوەی ڕاوێژی بە بەرپرسان کردلەسـەر ڕێککەوتنێکی کاتیی بۆ یەک وەرز بوو ڕێککەوتین تا عێراق ئەو ئاستەبگانەی هەیەتی تێدەپەڕێنێ. لەکاتی واژووکردنی ڕێککەوتنەکە لەهیکرا پێشەکییەکی دوو لاپەڕەییم دیت هەمووی هێرشـکردنە سـەر حکوومەتی تورکیـابوو کە ئەو بڕە ئاوەم لێیـانەوە دەستکەوتبوو، سورییەکان مەبەستیان ئەوەبوو گرژییەک بخەنە پەیوەندیی نێوان عێراق و تورکیا و، پاشـانیش بێبەشـکردنی عێراق لە زیادەیەی تورکیا بەڵێنی بەردانەوەی دابوو، بۆیە ڕازی نەبووم هەتا ئەو پێشەکییە لانەدرێ واژووی بکەم و، گوتم: دەزانن من وەزیری ئاودێریم، ئەگەر ڕێ بەخۆم بدەم جنێو بە تورکیا بدەم، ئەوا وەزیری گەیاندنیش ڕێ بەخۆی دەدا جنێو بە هیندسـتان بدا و، یەکی دی جنێو بە چین بدا. ئەدی ئەرکەکانی

وەزارەتی دەرەوەی وڵاتەکەم چییە؟ دەبێ پێشـــەکییەکە ســـە بارەت بە برایەتیی نێوان هەردوو وڵات بێ، منیش دەرچووی مافم و یاسـای نێودەوڵەتی و دیپلۆماسـیم خوێندووە، ئیـدی گرژبوونی دۆخەکە لەگەڵ تورکیـا لە بەرژەوەنـدیی عێراق نییە، ئێمە دەمـانەوێ دانەخۆرەی بکەین تا ئاوەکەی مافی ســـوریا و عێراق بدا، بەڵام وەزیری بانداوی فوراتی لەســـەر هەڵوێســـتەکەی مکوڕبوو. جانتا و کەلەپەلەکانم خســـتبووە ناو ئۆتۆمۆبیل، بەهیوابووم ڕێککەوتنەکە واژوو بکەم و بەرەو فڕۆکەخـانە بچم و بگەڕێمەوە بەغـدا. چوومە باڵیۆزخـانەی عێراق، زەنگی تەلەفۆن لێیدا، دیتم ئەوەی پەیوەندی دەکا مەحمود ئەیوبیی ســـەرۆکوەزیرانە و داوای من دەکا. داوایکرد لە نووســـینگەکەی لە ئەجوومەنی وەزیران بمبینێ. گوتم: من جانتاکانم کۆکردووەتەوە و بە فڕۆکەخانەم گوتووە فڕۆکەکەم ئامادەکەن.گوتی: منیش بە فڕۆکەخانەم ڕاگەیاندووە تا یەکتر دەبینین با فڕۆکەکە لەوێبێ، چونکە نـامەوی بە زویربوونەوە دیمەشـــق بەجێبێڵی. ڕازی بووم ببینم و هەرکە گەیشمەجێ لە نووسینگەکەی پێشوازیی لێکردم. بەخێرهاتنی کردم و، گوتی: ئێمە دەزانین تۆ نێردەی ئـاشـــتیی نێوانمـانی نەک نوێنەری حکوومەتی عێراقی، ئێمەش ئەو ناوبژیوانییەمان پێ خۆشـــە و، ڕێزت دەگرین و ڕێ بەخۆمان نادەین هیچ شـــتێک ئەو پەیوەندییەمان شـــلوێ بکا. گوتم: پێتوانییە ئەو پێشـــەکییە بۆ تێمانی من و پەکخســـتنی واژووکردنی ڕێککەوتنەکە بووە؟ گوتی نـا... هەتـا ڕازی نەبین و لێمـان ڕازی نەبی لە دیمەشق مەڕۆ، بەڵام سڵاو لە سـەدام حوسێنی برا بکە، ئەو ئێستا دانوستان لەگەڵ تورکان دەکـا تـا بۆڕی نەوت لەجیـاتیی هێڵەکەی ســـووریـا بەخـاکی ئەوانـدا ببـا، ئەرێ ئێمە ڕێککەوتنەکەمان هەر بۆ سـاڵێک بوو و، تۆ بڵێی تورکەکان لە ئێمە دڵسۆزتربن؟ گوتم: گومان لەوەیدا نییە ئەگەر نەوتەکەمان بە سووریادا بڕوا و لەسایەی حکوومەت و سوپای سوریادابێ لەوەی پارێزراوترە کە بە تورکیادا بڕوا. بەڵام هەڵوێســـتە توندەکانی بواری نەوت و ئاوتان قەناعەتی ئەوەی لا دوستکردوویندەبێ بەدوای ڕێوشوێنی دیکەدا بگەڕێی کە بەخاکی سوریادا نەڕوا تا لەو ئاستەنگانە دەرباز بین. گوتی: سووسەم بۆ وەزیری فورات کردووە ڕێککەوتنەکە واژوو بکا و تۆش چۆنت دەوێ پێشـەکییەکەی ئاوا بنووسـە، سـەر سـەر و سـەر جاو هاوڕێ موکەڕەم. سـوپاسـی ئەو دیدارە دۆسـتانەیم کرد و ئەوجا جوومە وەزارەتی فورات. وەزیر داوای لێبووردنی لەوەی کرد کە ڕوویدابوو و دوای دانانی پێشـــەکییەکی کورت ڕێککەوتنەکە واژوو کرا و ئەوجا ئێوارەکەی گەڕامەوە بەغدا و چوومە ســـەرانی ســـەرۆک بەکر و ســـەدام حوســـێن، ســـەدام پرســـی: ئەو ڕێککەوتنە غەدرێک نییە لە عێراق دەکرێ؟، گوتم: با، بەڵام بارودۆخمان ئێســـتا لەبار نییە، دەبێ بۆ ئەم وەرزە لەو تەنگژەیەی دەرچین. ســـەرۆک بەکرد گوتی: ئێمە پێمان دەکرێ شتێکی پترمان دەستکەوێ؟!.

## سەرلەنوێ دانوستان لەگەڵسەرکردە سورياييەکان:

ســـەربارى نـارەزايى پســـپۆرە عێراقيەکـان و خۆگرتنيـان لە راپۆرتەکەى پســـپۆرە سۆڤێتييەکانى سەبارەت بە چۆنيەتيى دابەشکردنى ئاوى زێى فورات بوو لەنێوان هەرسێ دەوڵەت، بەلام من راپۆرتەکەم خوێنـدەوە و گەيشـــتمە ئەو بڕوايەى بێلايەنە و، لێکۆڵينەوەکە زانستى و هاوسـەنگ بوو بۆ بەرژەوەنديى هەرسێ دەوڵەت. هەوڵيشـم دەدا ســـەرۆک بەکر و ســـەدام حوســـين کە راگەياندنى رازيبوونمون بە هەموو راپۆرتەکە سوودێکى هەيە نەک وەک سورييەکان بە بڑار لێى هەڵبژێرين. لە کۆتاييدا قەناعەتيان هات و دەســـتکراوەيان کردم تا رێککەوتنەکە واژوو بکەم کە پێموايە بۆ هەردوولا گونجاو و بەسـوودە و، ئيدى برووسکەيان بۆ وەزارەتى دەرەوەى سـوريا لێدا کە دەسـەڵاتى رەهام لەو بارەيەوە دراوەتێ. کە من تەنيا کەسـيش بووم باوەڕم بە سـوودى راپۆرتەکە هەبوو ئيدى بەتەنيا جوومە ديمەشـــق و داواى ديدارى ســـەرۆک حافز ئەســـەدم کرد، رۆەکەى پێنشـــەممە بوو. گوترا لێرە نييە، پێموابوو داواى لێبووردن لە ديدارەکە دەکا، بەلام رۆژى دواترێ واتە هەينى تەلەفۆنێکم لە کۆشـکى کۆمارييەوە بۆ هات و گوتى سـەرۆک ئەسـەد ســـەعـات دەى بەيـانى چـاوەڕێم دەکـا. کە چوومە ديـدارى داواى لێبووردنى کرد لەو دواکەوتنە لەبەر سەفەرى ناکاوى قاهيرە. هەر کە هەواڵى درابوێ لە ديمەشقم يەکسەر بە ديدارەکە رازى ببوو. منيش ســوپاســـى ئەوەم کرد و بيرۆکەى قبووڵکردنى راپۆرتەکەى پسپۆرە سۆڤێتييەکانم خستە بەردەمى تا عێراق و سوريا لە دانوستانى لەگەڵ توركيايان يەک يەک هەڵويستبن، کە بەتەمايە دوو بەنداوى ديکە لەسەر فورات دروست بکا.

ســـەرۆک ئەســـەد گوتى: وەڵلا هاوڕێ موکەڕەم ئەوەندەمان کێشـــە و ململانێى بێ مانا لەنێوانداە، خەريکە شـــــەرم بکەين بەخۆمـان بڵێين عـارەب. ئەوجـا بيـانووى پەلەکردنى پڕکردنى بەنداوى تەبەقەى بەوە هێنايەوە کە زۆريان پێويست بە وزەى کارەبايە و، ئێستا ئەوان کارەباى لە لوبنان دەکڕن. گوتم: ئەگەر کێشــە تەنيا کێشــەى وزەى کارەبا بێ ئێمە ئـامـادەين لەگەڵ کۆمپـانيـاکـانى کـارەبـاى لوبنـان رێککەوين و ئەو پـارەيەى تێيدەچێ لە وەرزى ئاوکەمى بيدين تا ئەودەمەى دەتوانن لەوەرزى بارانێ بەنداوەکە پڕکەن و کارەبا بەرهەم بهێنن. ئەودەمى ئێوە وزەى کارەباتان دەســـــتدەکەوێ عێراقيش ايى خۆى ئاوى، لەو ئاوەى لە بەنداوەکە بەردەدرێتەوە، دەستدەکەوێ.

ســـەرۆک ئەســـەد گوتى: باشـــە من ســـووســـەيەک بۆ بەرێز عەبدولحەليم خەدام دەکەمتا لەگەڵتـان کۆبێتەوە و لە ئـامـادەکردنى رێککەوتنێکى نێوان هەردوو ولات لەوبـارەيەوە لەگەڵتان رێککەوێ. جا سوپاسى ئەو بەدەمەوە هاتنەيم کرد.

سـەعات دوازدەی نیوەڕۆ، بەڕێز عەبدولحەلیم خەدام، هاتە ئەو هۆتێلەی لێی دابەزیبووم و، من ڕەشـنووسـی ڕێککەوتنەکەم ئامادەکردبوو، خەدام چاوێکی پێدا خسـاند و گوتی: پێموایە ڕێککەوتنەکە هاوسـەنگ و ماقووڵە، بەڵام من لەو ژمارە و گوزارشـتە هونەرییانە تێناگەم، محەممەد حەیدەری جێگری سـەرۆکوەزیرانتان بۆ دەنێرم تا وردەکاریی ئەو ژمارانەتان لەگەڵ بکا، ئەگەر ڕێکیشـکەوتن ئەوا سـەعات پێنجی ئێوارێ ئۆتۆمۆبیلتان بۆ دەنێرم تا بەشێوەیەکی فەرمی لە وەزارەتی دەرەوە ڕێککەوتنەکە واژوو بکەن.
محەممەد حەیدەری جێگری سـەرۆکوەزیران، سـەعات یەکی دوای نیوەڕۆ هات و لەسـەر داڕشـتنی کۆتایی ڕێککەوتنەکە ڕێککەوتین و دانەیەکی لێ برد تا لەسـەر کاغەزەکانی پرۆتۆکۆلان چاپی بکا و لە سەعات پێنج لە وەزارەتی دەرەوە واژووی لەسەر بکرێ.
کە بڕیارم دابوو بە ڕێی وسـکاندیدا بچمە بەیرووت و لەوێش بە فڕۆکە بچمەوە بەغدا، مونیر ونوسـی وەزیری بەنداوی فورات و دکتۆر نورەدین ڕوفاعیی ڕاوێژکاری هاتنە هۆتێلەکە تا هەتا سنووری لەبنان لەگەل بێن. پێمگوتم ڕێککەوتنێکمان کردووە و چاوەڕێی ئۆتۆمۆبیلم تا بچمە وەزارەتی دەەوە و ڕێککەوتنەکە واژوو بکەین. ئەوان ئاگایان لە هیچ نەبوو،بەڵام ئۆتۆمۆبیل نەهـات و هیچ وەڵام و داوای لێبووردنێکیشـم لەسـەر واژوو نەکردنی ڕێککەوتنەکە پێ نەگەیی، نە لە محەممەد حەیـدرییەوە نە لە عەبـدولحەلیم خەدامییەوە. کە پەیوەندیم بە وەزارەتی دەرەوە کرد نکۆڵییان لەوەی کرد ئاگایان لە هیچ شـتێک هەبێ و گوتیان خەدام لە دەرەوەی دیمەشـقە. لامان ڕوون بوو گۆڕانکارییەک روویداوە و ڕێککەوتنەکە لەگەل حکوومەتی بەعسی عێراق ڕەتکراوەتەوە، بەڵام ڕەوشـتی دیپلۆمـاسـی وای پێویسـت دەکرد بێنە هۆتێل و دوای لێبووردن لە واژوونەکردنی ڕێککەوتنەکە بکەن. ئەوجا وەزیر و ڕاوێژکارەکەی لەسـەر سـنووری لوبنانماڵئاواییان لێکردم تا هەمان ڕۆژ بگەڕێمەوە بەغدا.

## دیدار لەگەڵ سێ سەرۆکوەزیرانی تورک:

بەردەوامیی کێشـەی دابەسـکردنی ئاوی فورات لەنێوانهەرسـێ وڵاتی تورکیا و سـوریا و عێراق و نیەتی تورکان لە دروستکردنی چەند بەنداوێکی پێشتریێ باسمان کرد و، هەر لە مەودای بەردەوامیی کێشەی رووباری فورات چەندین جار سەردانی تورکیام کرد و چاوم بە چەند ین سەرۆک حکوومەتی ئەوێ کەوت.

## بوڵەند ئەجاوید:

بەرێز بوڵەند ئەجاوید سـەرۆکی حیزبی گەلی کۆماری بوو"جمهورییەت خەڵک پارتسـی"، ئەو پـارتە جەمـاوەرێکی زۆری هەبوو، بەتـایبەت لەو جێیـانەی زۆرینەی خەڵکەکەی تورکبوون. ئەوەش ئەوحیزبە بوو کە عیسمەت ئینۆنۆ کاتی خۆی دروسـتی کردبوو و، تا ئەوکاتەی لە دەسـەلات مایەوە هەتا سـوپا بە سـەرکردایەتیی سـەرۆک کەنعان ئیڤیرین کودەتای بەسەردا کرد.
ئیوارەکەی گەیشتمە ئەنکەرە و جاهید بەگی وەزیری وزە لە پێشـوازیمدابوو، کە سـەر بە گەلی "لاز"ی بـاکووری تورکیـایە. بەیـانیی ڕۆژی دواتریێ لەگەڵم هـاتە دیـداری بوڵەنـد ئەجاویدی سەرۆکوەزیران.
بوڵەند ئەجاوید خاوەن ڕۆشـنبیرییەکی خۆرئاواییە و، جەماوەرێکی باشـی لە تورکیا هەیە، دیدارەکەم ڕێکەوتی داگیرکردنی بەشی باکووری دوورگەی قوبروسی کرد کە کەمینەیەکی تورکی لێ نیشـــتەجێیە و سـوپای تورکیا ئەودەمی داگیری کردبوو. وادیاربوو عێراق، لەکاتی داگیرکردنەکەدا، بە بەنزین و ڕۆنی فڕۆکە هاریکاریی تورکیای کردبوو و، منیش ئاگام لەوەی نەبوو. جا وەزیری دەرەوە ئامادەی دیدارەکە بوو و تێبینییەکی لەسـەر کاغەزێک نووسـی و تێیداداوای لە سـەرۆکوەزیران کردبوو سـوپاسـێک ئاراسـتەی حکوومەتی عێراق بکا چونکە سـەدهەزار گالۆن بەنزینی فڕۆکەی دابووە تورکیا. منیش لەبەرئەوەی زمانی تورکیم دەزانی زانیم چ نووسـراوە و، هەر بەڕاسـتییش منەتباریی حکوومەتی تورکیی بەرامبەر ئەو یارمەتییە دەربڕی.
تێبینیی ئەوەم کرد سـەرۆکوەزیران دڵخۆشـی و نیگەرانیی پێکەوە بە ڕووانەوە دیارە. دوای بەخێرهێنانم باسـی پاسـاوەکانی داگیرکردنی قوبروسـی کرد و باسـی ئەوەی کرد چۆن قوبروسییە ڕۆمەکان کەمینە تورکەکەیان دەچەوساندەوە.

ویســـتم بخانم ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ و بەخشـــینی ئۆتۆنۆمی بە کوردەکانی عێراق چ کاریگەرییەکی لەســـەری هەیە. جا دوای ســـوپاســـی دیدارەکە و میوانداریی باســـی حکوومەتی تورکیا، گوتم: ئێمە دژی هەر جۆرە چەوســـاندنەوەیەکی نەتەوەیی و بنەچەیی و ئـاینیین و لایەنگیری ئەوەین هەمووان بە ئـازادییەکی تەواوەوە بڕیاری چارەنووسی خۆیان بدەن، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ناڵێین دەستتێوەردانی دەرەکی بۆ چارەسەری کێشەی هەردەوڵەتێک ڕەوایە. لە عێراق کێشەی کورد هەبوو و، کوردەکان، چەندین ســاڵبوو، تووشـی چەوسـاندنەوە و سـەرکوتکردن و زوڵم ببوون، نارەزاییشـیان بەرانبەر بەو چەوساندنەوەیە بە هەڵمەتی سەربازی وەڵامدرایەوە، بەڵام حکوومەتی ئێستا درکی بە کرۆکی کێشـــەکە کرد، کە کوردەکان نەتەوەی دووەمی عێراقن، بەڵام لە هەموو مافە نەتەوەییە ڕەوایەکانیان بێبەشـــن. ئیدی، لەو جێیانەی ئەوان زۆرینەن، دانی بە مافە رۆشنبیری و بەڕێوەبەرییەکانیاندا نا و، دانی بەوەسدا نا کە لە هەموو بوارەکاندا هاوسانی برا عەرەبەکانیانن و ئێستا کورد لە حکوومەتی ناوەندی بەشدارن.
ئەجاوید ویســـتی خۆ لە بابەتەکەی پشـــترێکا و هەر ئەوەندەی گوت: ئەوە مەســـەلەکی ناوخۆی عێراقە و، حکوومەتی عێراق خۆی بڕیاردەدا چۆنی مامەلە لەگەڵ دەکا، بەڵام ئێمە دژی چارەســـەری ئەو کێشـــانە نیین. نەمویســـت پتر بچمە ناو ئەو بابەتەی لە بەرنامەی ســـەردانەکەم نەبوو، وەک باوەگۆیەکی ئەوەی دان بە کاری ســـەربازیدا نانێین ، گوتی: ئێمەش حەزمان لێ نییە ســـوپای تورکیا ڕۆڵێکی لەوەی پتر لە ســـیاســـەتدا بگێڕێ کە دەســـتوور بۆی داناوە، بۆیە دەمانەوێ ســـپا بە زووترین کات بکشـــێنینەوە و ئەو بارە دارایییەمان لەکۆڵبێتەوە کە ئەو کارە سەربازییە بەملیدا هێناوین.
ئەوجا چوومە ناو کرۆکی ئەو بابەتەی بۆی هاتبووم و، ئەویش بەردانەوەی هەندێ ئاوی بەنداوی کیبان بوو تا پێویستییەکانی وەرزی هاوینی عێراقی پێ دەستەبەر بێ. سەبارەت بەوەی ســـووســـەیەکی بۆ وەزیری وزە کرد، بەڵام "بەڕێز کووکمـان"ی بەڕێوەبەری فەرمانگەی ئابووریی وەزارەتی دەرەوەی لەوی بوو، نارەزایی دەربڕی و، روونیکردەوە ولات پێویستی بە بەرهەمهێنانی وە هەیە تا خەرجیی بنیاتنانی بەنداوەکە بدا و قیستەکانی قەرزی بانکی نێودەوڵەتییش بداتەوە.
ئەوجا باسی پەیوەندیی برادەرایەتی و هاوکاریی نێوان تورکیا و عێراقی کرد وگوتی نابێ پەیوەندیی ئەو دوو دەوڵەتە بە دەوڵەتانی دیکەوە ببێتە کۆســـپێک لەبەردەم بەهێزکردنی ئەو پەیوەندییە کۆنانە. گوتم: بەڕێز ســـەرۆکی وەزیران، عێراق لایەنێک بوو لە پەیمانی ناوەندی"پەیمانی بەغدا"و هەندێ هاوکاریی ســەربازی و ئابووریی دەریە، بەڵام وەک بلقی ســەرئاوبوون و هەر زوو وندەبوون و هیچ شـوێنەوارێکی باشـیشـیان لەســەر ئابووریی

عێراق بەجێ نەدەهێشت. ڕاستییەکەیشی، ئەو بارەی لەبەر بەشداریی لەو پەیمانەدا دەکەوتە سەرسانی زۆر لەو سوودانە پتربوون کە لێی دەستدەکەوت، ئەرێ تورکیا سوود لە ئەندامێتیی پەیمانی سەنتۆ و باکووری ئەتڵەسی وەردەگرێ؟ بە زمانی توریی باشی دەزانم قسەم لەگەڵ دەکرد، ساتێک کڕبوو و ئەوجا گوتی: بەڕێز تاڵەبانی، تورکیاتان پێ چییە، ئێمە عێراق نیین کە ژمارەی دانیشتووانی دە ملیۆنە و سەروسامانێکی زۆری هەیە و بە پارەی گرانیش کە داهاتی نەوت دەستی دەکەوێ، ژمارەی دانیشتووانی تورکیا خۆی لە چل ملیۆن دەدا و هیچ داهاتێکیشی نییە، مەگەر ئەو ملیۆن سەربازەی بەکرێ دراوەتە پەیمانی سەنتۆ و باکووری ئەتڵەسی و، "٦٠٠" کرێکاری بەکرێ دراونەتە ئەڵمانیای خۆرئاوا و لەو دوو جێیەی هەندێ دۆلار مارکمان دەستدەکەوێ تا ئەوەی پێ بکڕین کە سکمان تێردەکا، ئەگەر بارودۆخمان وەک بارودۆخی عێراق بووایە، ئێمەش سیاسەتێکی دیکەی جودا لەوەی ئێستامان پەیڕەو دەکرد.

گوتم: دەوڵەتی سەرۆک، عێراق، هەتا مافەکانی خۆی لەچنگی کۆمپانیاکانی نەوت دەرنەهێنا، ئەو داهاتەی نەبوو. حکوومەتی عێراقش، لەوەتەی دەسەڵاتی وەرگرتووە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمپانیاکانی نەوت. سیاسەتی چارەسەرکردنی کێشەکانی ناوخۆ و پێکهێنانی حکوومەتێکی هاوبەشی گرتووەتەبەر و، وەک خۆپارێزییەکیش بۆ بەرگریکردنی کۆمپانیاکان دەستی بە هاوکاریی یەکێتیی سۆڤیەت و بنیاتنان و پەرەپێدانی پیشەسازیی ناوخۆ کردووە و، نەوتیس لە باشووری عێراق وەبەردێنێ، کە لێیشی روون بوو باری سیاسی و ئابووریی پتەوە کۆمپانیاکانی نەوتی خۆماڵی کرد. گوتی: ئەگەر گەلێکی وەک گەلی عێراقم هەبووایە، کە بەدەم بانگێشتی کوومەتەوە هات و "٢٥٪"ی مووچەی فەرمانبەران وکرێکارانی بۆ سەرخستنی کاری خۆماڵیکردن پێشکەش کرد، ئەوا منیش بەشێوەیەکی دی دەجووڵامەوە. گوتم: لە کاری خۆماڵیکردندا گەلی عێراق پشتی حکوومەتەکەی خۆی گرت. چونکە حکوومەت، لە خۆماڵیکردنی کۆمپانیاکانی نەوتدا، بەدەم داوای شێلگیرانەیگەلی عێراقییەوە هات. ئەگەر حکوومەت داوای هەر قوربانیەکی دیی لەگەل بکردایە تا ولاتێکی دی داگیر بکا، گەل بە هەموو هێزی بەرڕوویدا ڕادەوەستا، گەلی عێراق دەزانی خۆماڵیکردن خێروبێرێکی فراوان و گشتگیری بۆ وڵات هەیە، بۆیە ئامادەبوو قوربانیی گەورەتر و زۆرتریش بدا. گوتی: ئێمەس پەیوەندیی سیاسی و ئابووریی باسمان لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا هەیە و، پرۆژەی پیشەسازیی گەورەیشمان هەی کە بە هاوکاریی سۆڤیەت دامەزراون.

ئەوجا هاتە سەر بابەتی تایبەت، پرسیی داخوا سەربە هەمان خانەوادەی شێخ ڕەزای تالەبانیم؟ گوتم: بەڵێ ئەو مامی باوکمە. گوتی: شاعیریکی گەورەیە. گوتم: یەک لە

نەوەکانی، لە کچەکەیەوە، لە تورکیا دەژی و تورکە. پرســـیاریی کرد، گوتم: "محەممەد ڕاسخ"ی شـاعیری تورکی بە بنەجە کەرکووکی، کە خاڵی دایکمە، یەک لە کچەکانی شـێخ ڕەزای تالەبانیی خواســتووە و ئەویش"ڕابیعە خانم"ە و کوڕێکی لێی هەیە و ناوی "عومەر ئۆز تورکمەن"ە و ئێستا لە ئەنکەرەیە. ئەو زانیاریی لەسەر "محەممەد ڕاسخ"یش هەبوو.
ئەوجا لە وەزیری وزەی دووپاتکردەوە، تا ســـەبارەت بە توانای بەردانەوەی ئەو ئاوەی عێراق پێویستیەتی، کۆبوونەوەیەک لەگەڵ کارمەندە هونەرییەکانی بەنداوی کیبان بکا، بەو مەرجەی ســــووریا بەڵێن بدا گلی ناداتەوە و لە کلکەی بەنداوی تەبەقە بەریدەداتەوە. سوپاسی ئەو گرنگی پێدان و ئەو دیدارەیم کرد.

## پرۆفیسۆر سەعدی ئێرماک:

هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی تورکی کرا، هیچکام لە دوو حیزبە سەرەکییەکە، حیزبی گەلێی کۆماریی بولەند ئەجاوید سەرۆکایەتیی دەکا و حیزبی عەدالەی سلێمان دەمیریل سەرۆکایەتیی دەکا، زۆرینەیەکی گەورەیان نەهێنا، دەبووایە ئەنجوومەن لەو خولەیدا سەرۆکی کۆمار هەڵبژێرێ، ئەگەرچی دەستووری تورکی ئەنجوومەن ناچار ناکا سەرۆکی کۆمار لەناو ئەوانە هەڵبژێرێ کە سەرۆکایەتیی ئەکانی سوپایان کردبوو، بەڵام نەریتە دەستوورییەکان ئەوەی سەپاندبوو کە دەبێ سەرۆکی کۆمار لە گەورە سەرکردەکانی سوپا بێ، بەتایبەتییس ەرۆک ئەرکانەکانی سوپا. چونکە هەردوو حیزبەکەس ڕێکنەکەوتن یەک کاندیدیان بۆ سەرۆکایەتیی کۆمار هەبێ و چونکە چەند کاندیدێکیش هەبوون ئیدی دەنگدانی ئەنجوومەن چەندجار دووبارەبووەوە بێ ئەوەی هیچ کام لە کاندیدەکان، بەپێی دەستووری تورکی، دوو لەسەر سێی دەنگەکان بەدەستبێنێ تا ببێتە سەرۆککۆمار. جا لەبەر ئەوە ڕێککەوتن حکوومەتێکی غەیرە حیزبی پێکبهێنرێ تا سەرپەرشتیی هەڵبژاردنێکی نوێی ئەنجوومەنی نیشتمانی بکا، تا سەرۆککۆمار هەڵبژێرێ و حکوومەت لەو حیزبە پێکبهێنێ کە زۆرینەی ڕەهای کورسییەکانی ئەنجوومەن بەدەستدێنێ. ئیدی دەستنیشانکردنەکە کەوتە سەر پرۆفیسۆر سەعدی ئێرماکی سەرۆکی زانکۆی ئەنکەرە، کە کەسایەتییەکی زانستی و کۆمەڵایەتیی بەڕێزی تورکیابوو. ئێرماک حکوومەتەکەی لە مامۆستایانی زانکۆی تایبەتمەند پێکهێنا بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەت و بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنێکی ئازاد و بێلایەن لە مەودای شیش مانگدا.

بە فڕۆکەیەکی تورکی لەڕێی بەیرووتەوە چوومە ئەنکەرە، لە ڕێی چوونە ئەنکەرەیدا لە فڕۆکەخانەی ئەدەنە نیشتەوە. دیتم ژمارەیەکی زۆری بەرپرسی مەدەنی و سەربازی لەبەردەم جێی نیشتنەوەی فڕۆکەخانە وەستاون و دەڵێی لە پێشوازیی میوانێکدان. فڕۆکەکە نیشتەوەی وەرزەکەی زستان بوو و منیش پاڵتۆیەک لەبەر و کڵاوێکم لەسەربوو و جانتایەکی دەستیم بەدەستەوەبوو. لە پێشوایکەران تێپەڕیم و ئەوان خەریکبوون لە پلیکانەی فڕۆکە ڕادەمان، دڵنیابوون من میوانە چاوەڕوانکراوەکەم، کەسێک بەدوامدا رایکرد و بە بنزارێکی حارەبیی سوری دەیپرسی داخوا من وەزیرە عێراقییەکەم، بە بەڵێ وەڵامدایەوە. گوتی والی و بەرپرسەکانهاتوونەتە پێشوازیم و ئامادەی بۆ کردن بێن.

جا والی و بەرپرسانی ویلایەت و بەڕێوەبەری پۆلیس و بەڕێوەبەری دەرەک و سەرکردەی سەربازیی ویلایەت هاتنەپێش و بەخێرهاتنیان کردم. پێمگوتن من پێویستم بە تەرجومان نییە چونکە تورکی دەزانم، نزیکەی بیست دەقیقە لە هۆڵی ئەشرەفی فڕۆکەخانە دانیشتین و باسی ژیانی عێراق و تورکیامان کرد، لای پلیکانەی فڕۆکەکە ماڵئاواییان

لێکردم، شەوێ گەیشتمە ئەنکەرە و وەزیری وزە لەپێشوازیم بوو، کە دکتۆرێکی زانستە ئابوورییەکان بوو و مامۆستای زانکۆ بوو.
لە بەیانیی ڕۆژی دواترێ، لە نووســـینگەکەی ســـەردانی وەزیرم کرد، ئیدی گفتوگۆی بەخێرهێنانی ئساییمان لە نێواندا کرا کە لەو بۆنانەدا هەر وایە، ئەوجا بەرەو سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی وەزیران بەڕێکەوتین و چوینە دیداری سەرۆکوەزیران.
پرۆفیسۆر
ســـەعدی ئێرماک پیاوێکی هێمنی ڕووخۆشـــەو لە دەیەی حەوتەمی تەمەنیدایەســـەروقژ سـپی، کە زانیی من بە تورکییەکی باش دەدوێمزۆر دڵخۆش بوو، جا لێیپرســـیم داخوا من تورکیی عوســـمانلی دەزانم یان تورکیی نوێ، وەزیری وزە پێیگوت من هەردوو زمانی کۆن و نوێ بەباشی دەزانم، ئەوجا قسەی بردەسەر پێویستیی چارەسەرکردنی کێشەی دابەشـــکردنی ئـاو لەنێوان ئەو دەوڵەتـانەی ڕووبـاری فوراتیـان پێـدا دەڕوا و ئەو دابەسکردنەس دەبێ دادپەروانە بی و بەپێی مافە بەدەستهاتووەکان بێ و بەگوێرە عورف و یاســـای نێودەوڵەتی بێ. پرۆفیســـۆر ئێرمـاک هـاتە وەڵام و گوتی حکوومەتەکەی حکوومەتێکی کاتییە و پەرلەمانی هەڵوەشـــاندووەتەوە تا هەڵبژاردنێکی نوێ بکرێ، ئەوجا دەستلەکارکێشانەوەی خۆی دەداتە ئەنجوومەن و ئەندامانی وەزارەت دەچنەوە سەرکاری زانســـتیی خۆیان لە زانکۆکان. هەر ڕێککەوتنێکیش هەر حکوومەتیک بیکا، دەبێ بەپێی دەســـتور ئەنجوومەنی نیســـتمانی ڕەزامەندیی لەســـەر بدا، ئەوەش وادەکا حکوومەتەکەی نەتوانی هیچ ڕێککەوتنێکی لەوجۆرە بکا و، گوتی: ئێمە تا مانگی حوزیران دەمینینەوە، لەو ماوەیەی لە دەســـەڵاتداین ئامادەین هەموو داواکارییەکانی وەرزی داهاتووتان جێبەجێ بکەین، ئەوجا کارەکە بۆ حکوومەتی دادێ بەجێدێڵین کە ئەنجوومەنی نیستمانی پێکیدێنێ.
پێش ســـەفەری تورکیا، تەها یاســـین ڕەمەزانی وەزیری پیشـــەســـازی ڕایســـپاردم داوا لە سەرۆکوەزیران بکەم لە وەزارەتی بازرگانیی تورکیای دووپاتکاتەوە گرێبەستێکی، بۆ بڕە دارێکی تورکی کرابوو تا بدرێتە کارگەی شـــقارتەی عێراقی، جێبەجێ بکا، گوتم: دەوڵەتی سەرۆکوەزیران تکایەکی تایبەتم لێتان هەیە. گوتی: فەرموون بە سوپاسەوە. جا داوایەکەی وەزیری پیشـــەســـــازیی عێراقم پێگوت، گوێدانی تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و پەیوەندیی بە وەزیری تتایبەتمەند کرد و داوای لێکردخێرا گرێبەســـتەکە جێبەجێ بکا.ئەو ڕووی لەمن کرد و گوتی: منیش داوایەکی تایبەتیم لە گەورەییتان هەیە. گوتم: زۆر بە خۆشـــحاڵییەوە. گوتی: لەجیاتیی من ســـەردانی ئیمامی هەرەمەزن ئەبو حەنیفە بکەن. گوتم:بە ســـوپاســـەوە ئەوەی دەکەم، بەڵام من بەناوی حکوومەتی عێراقییەوە ڕوو لە گەورەییتان دەکەم و داواتان لێدەکەم ســـەردانی عێراق بکەن و میوانی بژاردەی ئێمەبن وئیدی بواری

ئەوەتان دەبێ سەردانی هەموو شوێنە پیرۆزەکان و جێگە شوێنەوارییەکان بکەن و لەگەڵ سەرۆککۆمار و جێگرەکەیشی لە بەغدا یەکتر ببینن. گوتی: ئەگەر خودا ئەوەم بە قسمەت بکا. گوتم: داوەتەکە لەرووی پرۆتۆکۆلییەوە بە شـــێوەیەکی فەرمی لەلایەن ســـەدام حوسێنی هاوپایەتان جێگری سـەرۆکی ئەنجوومەنی سـەرکردایەتیی شۆڕشـەوە دووپات دەکرێتەوە و لەڕێی وەزارەتی دەرەوەســـەوە بەدەســـتتان دەگا. گوتی: ئەگەر هەتا دوای هەڵبژاردن بمێنم ئەوا بە خۆشـــحـاڵییەوە داوەکە قبووڵ دەکەم. گوتم: بگرە ئەگەر لە دەسەلاتیش نەمای ئەوا داوەتەکە هەر هەیە و، لەسەرئاستی سەرۆکوەزیران پێشوازیتان لێ دەکرێ، زۆر سوپاسی کردم و بەڵێنی قبووڵکردنی داوەتەکەی دا.
کە گەڕامەوە بەغدا بیرۆکەکەم بۆ سەدام حوسێن باسکرد و، ئەویش پێی باسبوو و گوتی: ئێمە داوەتەکە لەڕێی وەزارەتی دەرەوەرا دووپات دەکەینەوە. منیش ئـامـادەم ، ئەگەر لە ســەرۆکایەتیی وەزیرانیش نەمێنێ، چۆنت وادە پێداوە ئاوا پێشــوازیی بکەم. بەڕاســتییش، دوای ئەوەی لە سەرۆکایەتیی وەزارەت دەرچوو سەردانی عێراقی کرد و سەدام حوسێن لە فڕۆکەخانە پێشوازیی لێکرد و بووە میوانی دەستەبژێری حکوومەتی عێراقی.
وەزیری وزە، ئێوارەی هەمان ڕۆژ، خوانێکی شـــێوخواردنی بۆ ڕێزلێنانی من لە هۆتێلێکی گەشتیاریی دەرەوەیئەنکەرە ئامادەکردبوو و پرسیی داوا لاریم لەوەی نییە نەرمین خانمی وەزیری ڕۆشــنبیرییش داوەت بکا، گوتم: ســـەرباری ئەوەی کە نایناســـم بەلام بێگومان لاریم لەوەی نییە داوەتی بکەی. گوتی: چۆن نایناســـن، کە ئەو ئێوە باس دەناســـێ. گوتم: کێیە؟ گوتی: خـانەوادەی نیزامەدین بەگی نەفتچین. گوتم؛ بەو مەرجەی نیزام بەگیشـــی لەگەل داوەت بکەی، چونکە خزممە و هاوڕێ پۆلمە. ئێوارە گەیستمە دیداریان و ژمارەیەک وەزیری دیکەسم دیت کە هەموویان مامۆستای زانکۆبوون.

## دیدارێکی دیکە لەگەڵ بوڵەند ئەجاوید و سەرکردەکانی حیزبەکەی:

مەحمود عەلی داودی باڵیۆزی عێراق ئێوارە خوانێکی لە باڵیۆزخانەی عێراق بۆ بەڕێز بوڵەند ئەجاوید و ســـەرکردەکانی حیزبەکەی ئامادەکردبوو. تکاا لێکردم منیش بچمم بیانبینم، منیش داوەتەکەم قبووڵکرد. باڵیۆز پێیوابوو پارتی گەلی کۆماری هەڵبژاردن بە زۆرینەی ڕەها دەباتەوە و لە چەند مانگی پاشـــتریش دەتواانێ لەجێی حکوومەتەکەی ســـەعد ئەرماک حکوومەتی تورکی پێکبهێنێ، جا دەیویســـت لە ئێســـتارا پەیوەندیی برادەرایەتیی لەگەڵ پتەو بکا.

لەگەڵ بوڵەند ئەجاوید و جێگرەکەی و ســەرکدەکانی حیزبەکەی یەکدیمان دیت و لەســەر کاروبارەکانی دنیا و ناوچەکە و پەیوەندیی عێراقو تورکیاش قسـەمان کرد. ئەجاوید گوتی ئێمە دڵنیاین، بەتەنیا یان لەگەڵ هەنێ حیزبی بچووک، دەتوانین حکوومەت پێکبهێنین. هەر لەئێســـتاشـــڕا پێوەینە پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەڵ وڵاتە عارەبییەکان پتەو بکەین وبەتایبەتیش عێراق. بەنیازیشـــین پرۆژەی هەندێ هاوبەش لەنێوان خۆمان و عێراق و ئەڵمانیای یەکگرتوو دامەزرێنین. گوتم: باشـــە بۆ ئەڵمانیای یەکگرتوو؟ گوتی: ێوە سەرمایەی پێویستی ئەو جۆرە پرۆژانەتان هەیە، بەڵام پێویستتان بە شارەزایی هونەرییە و ئێمەش بە ســای ئەو هەزاران کرێکار و هەنەرییانەی لە کارگە و کارخانەکانی ئەڵمانیا کاریانکردووە ئەو شــارەزاییەمان هەیە، بەڵام هەردوولامان ئەو تەکنیکە نوێیەمان نییە کە ئەڵمانیا هەیەتی. گوتم: ئێمە ئیستیعمارمان لە دەرگاوە دەرکرد و، قوربانییەکی زۆرمان دا، لێناگەڕێین لە پەنجەرەیڕا بێتەوە. ئێســـتا، تەکنیک وەک هەر کاڵایەکی دی لە بازاڕەکاندا دەفرۆشـــرێ و، کە کارگە و کارخانەیان لێ دەکڕین ئەوان، بڕە پارەیەکی دیکەی گواســتنەوەی کریکا و پسـپۆڕەعێراقییەکان لەگەڵ بیانییەکان دەخەنە ســەر بەها و نرخی ئامێر و کەرەســـتەکان و، جا لەکاتی جێبەجێکردنی پرۆژەکە، تا عێراقییەکان بتوانن پرۆژەکە بەگەڕ بخەن و بنۆرەی بکەن، ڕاهێنانیان پێ دەکرێ.

## کردنەوەی بەنداوی کیبان و سێیەم دیدار لەگەڵ ئەجاوید:

حکوومەتی تورکی لە ١٩٧٤ داوەتنامەیەکی بۆ حکوومەتی عێراقی هەنارد تا ســـاندێک بۆ ئاهەنگی کردنەوەی بەنـداوی کیبـان بنێرێ کە دەکەوێتە ویلایەتی دیـاربەکری "ئـامەد" کوردی. حکوومەت، دکتۆر عیزەت مســـتەفای ئەندامی ئەنجوومەنی شـــۆڕش و وەزیری تەندروســـتیی هەڵبژارد. ئیدی تەگەرەکانی بەردەم گەیشـــتنە ڕێککەوتنێکی دابەســـکردنی ئاوێمـان تـاوتوی کرد و دیتمـان یەک لە تەگەرەکان'کوکمان'ی بەڕێوەبەری فەرمـانگەی ئابووریی وەزارەتی دەرەوەیە. عیزەت مســـتەفا لەگەل ســـەدام حوسـێنی ڕێککەوت هەندێ دیاریی بدەنێ تا بەلای خۆمانیدا ڕاکێشـــین. ئیدی قوتوویکی پڕ خشـــڵی زێڕی هێنا ، تا ئەگەر هەلێک پەیدابوو پێشکەشی بکا.

لە ڕۆژی بڕیاردراو، لە فڕۆکەخانەی موســـەنا، ســـواری فڕۆکەی ســـەرۆکایەتی بووین و ڕوومان لە ئەنکەرە کرد. لە فڕۆکەخانەی ئەنکەرە، جێگری ســـەرۆکی وەزیران و وەزیری وزەی حکوومەتەکەی ئەجاوید پێشـــوازیی لێ کردین و، ڕۆژی دواترێ بە فڕۆکەیەکی تورکی ئێمەیان بردە فڕۆکەخانەی ئەدەنە و لەوێشـــڕا بە ئۆتۆمۆبیل بەرەو دیاربەکر و ئەوجا قەلاتییە و دوایەش سەر بەنداوەکە لە کیبان. لە ڕێگا دەستە دەستە خەڵکمان دەدیت بە پاس و لۆری و بەپێیش دەبردرانە جێی ئاهەنگەکە و دروشـــم و نیشـــانەی پارتی گەلی کۆمـاریـیـان هەڵگرتبوو، بەلام زۆربەیـان بە جلوبەرگی پەلاس و جەســـتەی لاوازیـان، هەژارییان پێوە دیاربوو.

لە شـوێنی ئاهەگی نزیک بەنداوەکە، کورسـیی داوەتکراوان ڕێکخرابوو و سـەکۆیەکیش بۆ خوێندنەوەی وتار داندرابوو. ژمارەیەکی زۆری پۆلیس و دەرەکیش پاسەوانیی جێیەکەیان دەکرد و بەخۆ و بە موتورخەی دەسـتیانەوە هەزارانیان دابڕیبوو کە ئەرزوحاڵێکی سـکالا یان کێشەیەکیان بەدەستەوەبوو و نەیاندەتوانی بگەنە دەسەڵاتە باڵاکان. ئاخر ئەوان، تەنیا ڕۆژانی هەڵبژاردنێ کە بۆ دەنگ لێ وەرگرتنێکی دەیبردنە ســەر کورسـیی دەســەڵات، ئەو بەرپرســـانەیان دەدیت، ئیدی دیتبوویان هەڵەکە هەڵکەوتووە تا ڕاســـتەوخۆ داوایەکانیان بدەنە ســـەرۆکوەزیران، کەچی پۆلیس زۆر بە دڵڕەقی لە جێیەکەی دووردەخســـتنەوە و تەنانەت دەموچاوی هەندێکیان، ئەو کاتەی هەوڵیاندا لە ســـەرۆک وەزیران نزیکببنەوە و ئەرزوحـاڵەکەی بـدەنێ، خوێنیشـــی لێ دەچۆڕا، ئەو کـارەش لەو دۆخەدا ئەجـاویـدی ســـەرمەندە کرد و خۆی هەســـتایەوە تا دەیان ئەرزوحاڵیان لێ وەرگری و بیداتە دەســـت یاوەرەکانی.

کە ئەجاوید دانیشت،

لای ڕاستی سەرۆک ئەرکانی سوپابوو و لای چەپیشی سەرکردەی هێزی ئاسمانی بوو. دوو کورسـییەکەی ئەو تەنیشـت و ئەو تەنیشـتیان بۆ من و دکتۆر عیزەت مسـتەفا دەندرابوو و، ئەوجا سـەرکردەکانی دیکەی دەوڵەت و حیزب و سـوپا و لە پشـتیشـمانەوە داوەتکراوەکان. ئەجاوید داوای لە دوو سـەرکردە سـوپاییەکە کرد جێیەکانیان لەگەڵ ئێمە بگۆڕنەوە تا لەتەنیشـتی دانیشـین و ئەوانیش وایان کرد. چونکە لەگەڵ ئەجاوید پێشـتریش یەکدیمان دەناسـی و تورکیشـم دەزانی، ئیدی من قسـەم دەکردو تەرجومەشـم بۆ ئەو و دکتۆر عیزەت مستەفا دەکرد.
ئەجاوید هەسـتا و وتەیەکی پێشـکەش کرد و تێیدا سـوپاسـی برادەرانی تورکیای کرد، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا و ئەڵمانیای یەکگرتوو، سـوپاسـی بانکی نێودەوڵەتییشـی کرد بۆ ئەو یـارمەتییە بەنرخەی لە خەرجی و بنیـاتنـانی بەنـداوەکە پێشکەشیان کردبوو. ئەوەشی بە گرنگترین دەسکەوتی حیزبەکەی و حکوومەتەکەی دانا پێشـکەشـی گەل کرابێ. ئەوجا وەزیری وزە وتەیەکی پێشـکەش کرد و باسـی گرنگیی بەنداوەکەی لەرووی ئابوورییەوە کرد، نەخاسـمە لە دەسـتەبەرکردنی قزەی کارەبای تورکیا زۆری پێویست پێیەتی و شوێنەواری ئەو وزەیەس لەسەر پەرەپێدانی پیشەسازی و کشـتوکاڵ لە تورکیا. ئەوجا ئاهەنگە هونەرییەکە دەسـتی پێکرد، چونکە بەنداوەکەس لە ناوچەیەکی کوردی بوو، دوو تیپی شـایی دوو سـاییان بە جلی کوردیی ئاسـاییەوە پێشـکەش کرد و جلەکانیان "شـال و شـەپک"بوون و جلی ژنەکانیش کوردیی بە نەخشـو نیگار بوون و، شاییەکەیان بە سایی و سەمای کوردی و لەسەر ڕیتم و ئاوازی دەهۆڵ و زوڕنا دەکرد. بە ئاوازە کوردییەکانیان و جلەبەرگ و مۆسـیقایەکەیانڕا دیاربوو کوردن.
بەڵام من لە ئەجاویدم پرسـی: بەڕێز سـەرۆک وەزیران.....ئەو جلوبەرگانە جلوبەرگی فۆلکلۆریی تورکینە؟ گوتی: نـا، ئەوانە جلوبەرگی نـاوخۆن، بەڵام رازی نەبوو بڵێ جلوبەرگی کوردییە. سەرۆکی ئەرکانی سوپا گوتی ڕات بەرانبەر وتەکەی سەرۆکوەزیران چییە. گوتم: باشـبوو، هەر وڵاتێکیش پەیوەندیی خۆی هەیەو خۆی ئەو پەیوەندییانە هەڵەبژێرێ. بەڵام ئێمە لە عێراق ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا و ئەڵمانیای یەکگرتوو بە دۆسـت دانانێین بەڵکو بە نەیاریان لە قەڵەم دەدەین و، گەل نیو سـەدە خەباتی کردووە تا لەدەستیان دەربازبێ.
کە ئێوارە دەگەڕاینەوە ئەنکەرە ، "کوکمان" تا فڕۆکەخانە لەگەڵمان هات و، لە ڕێگا گوتی: ئێوە سـەردانی وڵاتەکەتان کردین، بەڵام سـەرتان لە ماڵێکی تورکی نەدا، من داواتان لێدەکەم سـەرێک لە ماڵەکەم بدەن کە لەسـەر ڕێمانە. ڕازیبووین و جانتایەکەی دکتۆر عیزەتیش ئەو خشـڵانەی تێدا بوو کە هێنابوونی و، لە ماڵەکەیدا پێشـکەشـی ژنەکەی و

کچەکەیمان کرد، ماڵەکەش ڕێکخراو و پاک بوو و دەتگوت دەزانن میوانیان دێ. کووکمان ڕووی دەمی لە ژنەکەی کرد و گوتی: ئەوڕۆ ئاهەنگی جەژنی هاوسەریمانە و مێردیش لەو بۆنەیەیدا دیارییەک پێشکەشی ژنەکەی دەکا، بەلام من لەو میوانانەم ئازیزتر نەدۆزییەوە تا پێشکەشی تۆیان بکەم. هیوادارم وەک بە بەهاترین دیاری قبووڵیان بکەی. ژنەکەی گوتی: مایەی خۆشحاڵی و بەختەوەریمە کە میوانی ئازیز سەردانمان بکەن و، قەتیش ئەو دیارییە بەنرخە لەیاد ناکەم. ئەوجا دکتۆر عیزەت هەستایەوە و منتیش تەرجومەم بۆ دەکرد، داوای لێبووردنی لە ژنەی کرد چونکە ئێمە سەرقاڵمان کردبوو و ئەو بۆنەیەمان لەبیربردبووەوە و بۆی نەڕیخسابوو دیارییەکی بێنێ. مەئەرکی خۆمانی دەزانین بەو بۆنەیەوە ئەو دیارییەی پێشکەش بکەین. ئیدی خشڵەکانی **پێشکەش** کرد و، ژنەکە و کچەکە خەریکبوو لە خۆشیان بفڕن، لەکاتێکدا "کوکمان"ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، بەلام سوپاسیشی کردین و گوتی: ئەوە زۆرە، ئێمە بەو بۆنەیەوە دیارییەکی ڕەمزی پێشکەش دەکەین. گوتمان:ڕەنگە ئەو بۆنەیە هەلێکی تەمەن بێ و دووبارە نەبێتەوە تا دیاریی تێدا پێشکەش بکەین، با ئەوە پێشەکیی دۆستایەتیی خێزانە بەڕێزەکەتان بێ. ئەوجا گەڕاینەوە هۆتێل و لەوێشڕا بۆ فڕۆکەخانە و گەڕانەوە بەغدا.

لەڕێی گەڕانەوە بەغدامان ڕووداوێکی خۆشمان بەسەرهات، هەرکە هاتینەوە ناو ئاسمانی عێراق فڕۆکەوانەکە پێیگوتین لە پشکنینی دەزگای ڕاگرتنی فڕۆکەکە بۆی دەرکەوتووە لەکار کەوتووە، بۆیە ڕەنگە نەتوانێ لەجێی نیشتنەوەی فڕۆکەخانەی موسەنا ڕایگرێ چونکە گۆڕەکەی کورتە، بۆیە دەبێ لە فڕۆکەخانەی نێودەولەتی بنیشێتەوە، کە پرسیشمان داخوا دەتوانێ لەسەر جێی نیشتنەوەی فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی بنیشێتەوە؟، گوتی: هەوڵدەدەم، گوتمان: ئەدی ئەگەر نەوەستا؟ گوتی: نازانم چ ڕوودەدا، ڕەنگە فڕۆکەکە لە ڕێڕەوەکە بچێتەدەرێ و خۆی بە بینایە دادا. جا دکتۆر عیزەت سەرێکی بادا و بە ساردییەکەوە گوتی:باسە بە بەڕێوەبەریی فڕۆکەخانە بڵێ با ئاگرکوژێنەوە و ئەمبولانس ئامادەکەن و حاڵەتی نکاوی لە فڕۆکەخانە ڕاگەیەنن و فڕۆکە و ئۆتۆمۆبیل لە ڕێی نیشتنەوە دوورخەنەوە. جا بەردەوام لە ئاسمانی بەغدا دەخولایەوە. دیتمان دەیان ئۆتۆمۆبیلی ئاگەکوژێنەوە و ئەمبولانس و دەیان دکتۆر و برینپێچ و هاوڕێ وەزیرەکانمان بە نیگەرانییەوە چاوەڕێمان دەکەن و، ئێمەس بەسەریانەوە دەفڕین و چاوەڕێی چارەنووسێکی نادیار دەکەین، بەلام لەسەرەخۆ و ئارام بووین، نزیکەی بیست خولەک لە ئاسمانی بەغدا سوورراینەوە، ئەوجا فڕۆکەکە لە جێی نیشتنەوە نزیکبووەوە، کە تایەی فڕۆکەکە لە زەویی نیشتنەوەی دا و هێدیهێدی هێواش بووەوە و هەستمان کرد دەزگای ڕاگرتنەکە بە شێوەیەکی ئاسایی کاردەکا و ئەوجا فڕۆکەک ڕاوەستا و هێشتا مەو دایەکی

درێژشـــمان مابوو بگەینە کۆتیی جێی ڕاوەســـتانێ و کە فڕۆکەکە بەرەو هۆڵی پێشـــوازی پێچی کردەوە، ئۆتۆمۆبیل و دەیان بەرپرس و پزیشـــــک و بەرپرســـــانی فڕۆکەخانە بە هەڵەداوان هاتن پیرۆزبایی بەسەلامەتی گەیشتنەوە و نیشتنەوەمان لێ بکەن.

## لەگەڵ سلێمان دیمیریل:

ئەو وەزارەتانەی پارتی گەلی کۆماری پێکیدەهێنان جێگیر نەبوون، چونکە پشتی بە زۆرینەی پەرلەمانیی حیزب قایم نەبوو، ئیدی ناچاردەبوو تا پازدەکورسیی دی لەگەل کورسییەکانی خۆی لێکدا، لەگەڵ دوو حیزبی بچووکی وەک حیزبی" سەلامەتیی وەتەنی" کە حیزبێکی ئیینیی دەمارگیر بوو و "نەجمەدین ئەربەکان " سەرۆکایەتیی دەکرد و حیزبەکە لە بەرنامەی خۆیدا داوای دەکرد دەستووری تورکی بکرێتەوە دەستوورێکی پابەندی شەریعەتی ئیسلامی بێ و ڕژێمی تورکی دەست لەو عەلمانییەتە بەردا کە کەماڵ ئەتاتورک بناغەکانی دامەزراند، هەرچی حیزبەکەی دیکە بوو "حیزبی "نیشتمانی دایک" بوو و "تۆرگۆت ئۆزال سەرۆکایەتیی دەکرد و لەو حیزبە زیدەڕۆیە قەومییانە بوون کە باوەڕیان بە تۆرانیزم هەبوو.

وەزارەتەکەی ئەجاوید لەگەڵ جەمەعاتەکەی ئەربەکان هاوپەیمان بوون و، خودی ئەربەکانیش جێگری سەرۆکوەزیران بوو وتۆرگۆت ئۆزالیش وەزیری کشتوکاڵ بوو. بەڵام هاوپەیمانیی ئەو حیزبە شلۆق بوو، هەوڵی لێکێشانەوەی دەدا"ابتزاز" تا یەک لە دوو حیزبە سەرەکییەکە بتوانن حکوومەت پێکبێنن و، زۆرجارانیش ئەو دوو حیزبە لەنێوان پارتی"عەداله" و "شەعبی کۆماری" هاتوچۆیان بوو. لە دەنگدانێکی متمانە بەخشین بە وەزارەتەکری ئەجاوید،نوێنەرەکانی ئەو حیزبە متمانەی خۆیان بە حکوومەت کێشایەوە، ئەوەش وایکرد ناچاربێ دەست لە کار بکێشێتەوە. ئەوجا سەرۆککۆمار سەرۆکی حیزبی"عەداله"ی راسپارد وەزارەت پێکبێنێ، جا سلێمان دیمیریل لەگەڵحیزبی"سەلامەی وەتەنی" و "نیشتمانی دایک" ڕێککەوت تا حکوومەتێکی ئیئتیلافی پێکبێنێ و لەو حکوومەتە نوێیەدا هەردوو سەرۆکی ئەو حیزبانە بوونە جێگری سەرۆکوەزیران و ژمارەیەک سەرکردەیشییان بوونە وەزیر.

دەبووایە سەفەری تورکیا بکەم و داوا لە حکوومەتی نوێ بکەم دوای بەگەڕخستنی بەنداوی کیپانی زیانی لە بەرژەوەندییەکانی عێراق دەدا هاوکاریمان بکەن. پێش سەفەری منیش، هەریەک لە ڕەئوف دەنکتاشی سەرۆکی تایەفەی تورکی لە قوبروس وقەشە ماکاریۆسی سەرۆککۆماری قوبروس سەردانی عێراقیان کردبوو و مەکاریۆس وەک سەرۆکی کۆمار بە فەرمی پێشوازیی لێکرابوو و هەرچی دەنکتاشیشە تانیا حیسابی کەسایەتئیەکی سیاسیی بۆ کرابوو، جا تورکەکان قینیان لەو کارەی هەستابوو. کە ڕوخسەتی سەفەرم لە سەرۆک ئەحمەد حەسەن بەکر وەرگرت، گوتی: دەمانویست وەزیری دەرەوە رەوانەی تورکیا بکەین تا تێڕوانینی ئێمە سەبارەت بە کێشەی قوبروسو هەڵوێستمان بەرانبەر حکوومەتی قوبروس ڕوونکاتەوە. بەڵام کە تۆ هەر سەردانی تورکیا

دەکەی و بەدڵنیاییەوە ســــەرۆکوەزیران دەبینی، وردەکارییەکانی کێشـــەی قوبروس و سیاسەتی حکوومەتی ئێمەش بەرانبەر کێشەکە دەزانی، ئیدی سیاسەتی ئێمەیان بە باشی بۆ باس بکەن و با دەراویان ڕوون بێ.
کە گەیشــتمە ئەنکەرە، ســەلاحەدین قلیجی وەزیری وزە لە فڕۆکەخانە لە پێشــوازیم بوو؛ ئەو ئەندازیارێکی شـارسـتانی بوو و پلە بەپلە لە فەرمانە هونەرییەکان و پێگە حیزبییەکان ســــەرکەوتبوو تا گەیشـــتبووە ئەو پۆســــتە. ئێوارەکەیە لە وەزارەتیوزە کۆبووینەوە تا تێڕوانینان دەربارەی کێشـــەی پڕکردنی ئەســــتێڵکەکان پرســـوڕا بکەین. تورکیا خۆی لە عێراق نزیکدەکردەوە چونکە بانکی نێودەوڵەتی خەرجیدانی بەنداوی قەرەقایای ســــەر فوراتی بە ڕەزامەندیی عێراقەوە بەستابۆوە. لەکاتی دیدارەکە پێیگوتم سبەی بەیانییەکەی، کۆبوونەوەیەکی گرنگی ئەنجوومەنی وەزیران دەکرێ تا بڕیار لەســــەر دواڕۆژی بنکە ئەمریکییەکانی ناو خاکی تورکیای ســــەر تخووبی یەکێتیی ســــۆڤیەت بدەن کە ژمارەیان "٢٢" بنکەیە و، سەرۆک وەزیرانیش سەعات هەستی بەیانی لە ماڵەکەی خۆیدا بۆ چێشت چاوەڕێم دەکا.
ســەعات هەشــت، بە یاوەریی ســەلاحەدین قلیج چوومە ماڵی دەمیریلی ســەرۆکوەزیران، "ئیحســـان ســــەبری جغلیانکل"ی وەزیری دەرەوەش لەوێبوو و پیاوێکی پیری لە بنچڕا ئەفســــەری پۆلیس بوو، تا ئێســـتاس زمانی تورکی هەر بە پیتی عارەبی دەنووســـێ و لەسەرشێوازی عوسمانلیی کۆن. کەسێکیشم لەوی دیت گوتیان تەرجومانە، کە پرسیاریم کرد، ســەلاحەدین پێیگوتم خەڵکی کەرکووکە. جا بە ســەرۆکوەزیرانم گوت پێویســتم بە تەرجومان نییە، چونکە من بە تورکی قسەیان لەگەڵ دەکەم، ئیدی بەڕێیان کرد.
دەمیریل، لەســـەر خوانی نانی بەیانی بەخێرهاتنی کردم و داوای لێبووردنیشـــی لێ کردم جونکە لەبەر ئەو کۆبوونەوە نائاســــاییەی ئەنجوومنی وەزیرانی ڕەنگە درێژە بکێشـــێ، ناتوانێ ئەوڕۆ لە نووســـینگەکەی پێشـــوازیم لێ بکا. کە قســـەش هاتە ســـەرڕێککەوتنی دابەســـکردنی ئاوی فورات، گوتی: ئێمە ئامادەین هەموو داوایەکانی عێراق جێبەجێ بکەین و من ســــەلاحەدین قلیجی وەزیری وزەم دەســــتکراوە کردووە تا لەو بارەیەوە لەگەڵتان ڕێکبکەوێ. بەڵام دەربارەی ڕێککەوتنی دابەشــکردنی هەمیشـــەیی ئاوی فورات، ئەوا ئەو ڕێککەوتنە دەکەویتە دوای چارەکە ســــەدەیەک، چونکە تورکیا پێش بنیاتنانی هەردوو بەنداوی قەرەقایا و قەرەبابا ناتوانێ کشـتوکاڵەکەی بەرفراوان بکا و، بەپێی دەسـتووریی تورکییش ئەنجوومەنی نیســـتمانی لایەنی تایبەتمەندی بڕیاردانی ڕێککەوتنانە، زۆریش ئەستەمە بۆ هەر حکوومەتێک ئەنجوومەن ڕازیکا بە ڕێککەوتنێک ڕازیبێ کە پەیوەندیی بە نەوەیەکی دیی دوای نەوەی ئێمەوە هەیە. ئەوجا پرســـیی داخوا عێراق بۆ بە بنیاتنانی

بەنداوی قەرەقایا رازی نییە کە تەنیا بەنداوێکی بەرهەمهێنانی وزەیە. گوتم: ئێمە لە داواکارییەکانمان پشت بە دوو شتان دەبەستین، یەکەمیان مافی بەدەستهاتووی دابینکردنی ئاو بۆ ئەو زەوییانەی ئێستا دادەچێندرێن، بپێی عورفی نێودەوڵەتی، نابێ کشتوکاڵتان لەسەر حیسابی کەمکردنەوەی کشتوکاڵی ئێمە بێ. گەلێ بڕیاریش سەبارەت بە ڕووباری هاوبەش لە دادگای دادی نێودەوڵەتی هەیە، یان وەک ەو بڕیارانە پێشتریش دراون وەڕووباری "نیل"ی لەنێوان چەندین دەوڵەت هاوبەشە.

ئەوجا بابەتی قوبروسم کردەوە و گوتم: چەند ڕۆژێک پێش ئێستا ڕەئوف دەنکتاسی سەرۆکی تایەفەی تورکی قوبروس سەردانیعێراقی کرد. دوای ئەویش سەرۆک مەکاریۆس سەردانی عێراقی کرد، ڕەنگە، سەبارەت بە مەغزای ئەو دوو سەردانە، پرسیار لای دۆستە تورکەکانمان دروستبێ؛ دەمیریل بە تووڕەییەوە گوتی: ئێمە سەرمان لەوەی سوڕما چۆن عێراق پێشوازی لە مەکاریۆس دەکا؟ دیسان قسەکەم پێ بڕی و گوتم: چەند هەفتەیە پێش ئێستا، محەممەد ڕەزا پەهلەویی شای ئێران سەردانی تورکیای کرد، دەوڵەتداری سەرۆکوەزیرانیش دەزانێ پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و ئێران شلۆقیی تێکەوتووە، بەڵام ئێمە سەرمان لەوەی سوڕنەما چۆن تورکیا پێشوازی لە شای دەکا، ئەوەش لەبەر دوو هۆ، یەکەمیان: تورکیا دەوڵەتێکی سەربەخۆیە و خۆی بڕیاردەدا پێشوازی لەم یا لەو دەکا. دووەمیان: پەیوەندیی دۆستایەتیی پتەوی نێوان ئێمە و تورکیا متمانەی ئەوەمان لا دروستدەکا کە تورکیا پەیوەندییەکانی لەگەڵ لایەنێکی دی دژی بەرژەوەندییەکانی عێراق بەکارناهێنێ.

هەستی بەو تەنگەتاوییە کرد کە تێیکەوتبوو، جا بەداوای لێبووردنەوە قسەی پێ بڕیمو گوتی:داوای لێبووردن دەکەم ڕەنگە نەمتوانیبێ بە وردی گوزارشت بکەم.عێراق دەوڵەتێکی سەربەخۆیە و خۆی بە تەواوی ئازادییەوە بڕیاری سیاسەتی خۆی دەدات ، بەڵام ئێمە مەکاریۆس بە سەرۆکی قوبروس نازانین. گووتم: ئێمە بە سەرۆکی قوبروسی دادەنێین چونکە نە ئێمە هەڵمانبژاردووە و نە ئێوە، بەڵکو گەلی قوبروس هەڵیبژاردووە. کە متمانەیشی لێ دەستێنێتەوە یەکێکی دی هەڵدەبژێرێ، ئەودەمی وەک سەرۆکی دەوڵەت مامەڵەی لەگەڵ دەکەین. گوتی: لەسەردەمی مەکاریۆس تورکەکان زۆر دەچەوسێنرانەوە. گوتم: ئێمە دژی ئەوەین هەر دەوڵەتێک هەر گەلێک یان کەمینەیەک بچەوسێنێتەوە، ڕەنگە ئێمە کێشەیەکی ئاڵۆزمان هەبێ، ئەویش کێشەی کوردە، کوردەکان بەدرێژایی چەندین ساڵ و لە سایەی حکوومەتەکانی پێشتری دەچەوسانەوە ، تووشی هەلمەتی سەرکوتکردنی سەربازی دەبوون، ڕادەگوێزران و دەگیران و لە سێدارە دەدران.

## پرۆژەی نۆکەندی سەرسار:

هەریەک لە سووریا و تورکیا، لەسەر ڕوباری فورات، بەجیددی دەستیان بە دروستکردنی بەنداو و کۆگەی ئاوان کرد.سوریا توانیی ساڵێک پێش وادەی بڕیاردراو "بەنداوی تەبەقە" دروســـت بکا و، تورکیاس ســـاڵێک لە دروســـتکردنی بەنداوی کیپانی ویلایەتی دیاربەکر دواکەوت. ئەوەش وایکرد لە هاوینی هەمان ســـاڵدا دەســـت بە پڕکردنی هەردوو کۆگەی ئاوەکە بکرێ. تورکیا پلانی ژمارەیەک بەنداوی دیکەی لەســـەر ڕووباری فورات دانابوو، وەک "قەرەقایا" و "قەرە بابا_ بەنداوی ئەتاتورک"، ئەو بەنداوانەشـــی بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا و ئاودانی رووبەرێکی فراوانی ناوچەی ماردین- ســـویرچک بوو کە لە "٨٠٠هەزار هێکتار پتربوو- هەر هێکتارێکیش چوار دۆنمە". ئەوەش مانای خەرجکردنی پتر لە سێیەکی سامانی ئاوی زێی فوراتە و سەرباری ڕووبەرە فراوانەکانی سوریاش.
کێشەی ئەودەمی کاتێک دەستیپێکرد کە بێ ئەوەی لەگەڵ عێراق ڕێککەون و خشتەیەکی زەمەنیی پڕکردنی کۆگەکانی ئاو وەها دابندرێ زیان بەو کشتوکاڵانە نەگەیەنێ لە عێراق لەسەر دۆڵی زێی فورات کراون.
ســـۆڤێتییەکان ســـەرپەرشـــتیی دروســـتکردنی بەنداوی تەبەقەی ســـووریایان دەکرد و خەرجییان بۆ دابین دەکرد وتورکیاش پارەی ئەوەی نەبوو بەنداوی دیکە دروســـت بکا. چونکە عێراقیش ئەندامی بانکی نێودەوڵەتی بوو و دەســـەڵاتی تێیدا هەبوو. ئیدی بە بانکی ناوبراوی ڕاگەیاندبوو ڕازی نییە هیچ بڕە پارەیەک بۆ بنیاتنانی بەنداو بەقەرز بدرێتە تورکیا. بۆیە تورکیا ئامادەیی خۆنیشـــاندا بڕە ئاوی پێویســـت بۆ عێراق بنێرێ تا ئەو ئاســـتەنگانەی لە دروســـتکردنی بەنداوان پەیدا دەبێ تێپەڕێنێ. بەڵام نە تورکیا و نە ســـوریاش دانیان بەو مافە مێژووییە بەدەســـتهاتووانەدا نەدەنا کە عێراق لە ئاوی فوراتدا هەیبوو. پەڵپ و بیانووی تورکیا ئەوەبوو کە هەر ڕێککەوتنێکی دابەشکردنی ئاو پێویستی بە ڕەزامەندیی ئەنجوومەنی نیشـــتمانیی گەورە هەیە" پەرلەمـان". ئەو ئەنجوومەنەش ڕەزامەندی لەســـەر ڕێککەوتنێک نادا کە پەیوەســـتی چارەکە ســـەدەیەک دواتر بێ. هەرچی ســـوریایە بیانگەی ئەوەبوو کە عێراق ئاوێکی زۆری لە ڕووباری دیجلە هەیە و ســـوریا کشتوکاڵی سەر زێی فورات فراوان دەکا و عێراق دەتوانێ بچێتە سەر دەشتی دیجلە.
لە بەرانبەر ئەو مەترســـییانەی چاویان لە کشـــتوکاڵ و خزمەتگوزارییە مرۆییەکانی دانیشـــتووانی ســـەر زێی فورات زەقکردبووەوە، لەوانەش شـــاری گەورەی وەک "عانە و ڕاوە و حیللە و کەربەلا و نەجەف و دیوانییە و ناســـرییە" و ڕووبەرێکی زۆری مەرەزەی لێ دەکرا و ناوچەیەکی فرانی کرابووە بێســـتان، عێراق بیری لەوەی کردەوە لەســـەر هەردوو ڕێچکە براو تا بەردەوامیی کشـــتوکاڵ لەو ڕووبەرانەی ناویان هات بپارێزێ؛

یەکەمیان بڕێک لە ئاوی دیجلە بدرێتە فورات، ئەوەش بە لێدانی نۆکەندێکی گەورەی دریاچەی سەرساری دەستکردی، کە ئاوی دیجلەی دەجووەسەرێ، بە فوراتەوە دەبەستەوە و پێیدەڵێن نۆکەندی سەرسار و دەیتوانی لە چرکەیەکدا "١١٠٠" مەتر سێجا ئاو لە دەریاچەی سەرسارەوە ڕەت بکا کە دوای دەریاچەی دەستکردی"سەد ئەلعالی"ی میسر گەورەتری دەریاچەی دەستکردە و، ٨٥ ملیار مەتر سێجا ئاوی تێدایە و، دەتوانرێ نۆکەندێکی دیکەش لەو دەریاچەیەوە بکرێتەوە بۆ سەر دیجلە خۆی و بۆ ماوەی کەم ئاوی بەکاربهێنرێ.

ڕێگای دووەمیش ئەوەبوو لەگەڵ تورکیا و سوریا لسەر دابەسکردنێکی دادپەروەرانەی ئاوی فورات ڕێککەوێ.

کە پۆستی وەزیری ئاودێری درایە من، دەبوایە بەو ڕێیەی سەرەوەدا بڕۆم کە باسکرا. کە لە چۆنیەتیی هەڵکەندنی نۆکەندی سەرسار- فوراتی پارەیەکی زۆری دەویست، کۆڵرایەوە، لە کاتێکدا عێراق، لەبەر ئەو کێشانەی لەگەڵ ئەو کۆمپانیا نەوتییانەی هەبوو کە لەعێراقدا کاریان دەکرد و، دەکرانە سەر گەلی کورد، بەر ئەو هەڵمەتە سەربازییە سەرکوتکردنانەی دە لە تەنگدەستییەکی دارایی درێژخایەندابوو. عیزەت دووریی ئەوکاتە بەرپرسی "عەمەل شەعبی" بوو، پێشنیاری کرد نۆکەندەکە بە کاری هەرەوەزی"عەمەل شەعبی" لێبدرێ و ملیۆنان کەس بەشداریی تیدا بکەن، بەلام ئەو پێشنیارە ساویلکانە بوو، بیری لە حەواندنەوە و ناندانی ئەو ملیۆنان خەلکە نەکردبووەوە و، دیاریس نەبوو جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیە چەند ی پێ دەچێ، لە ڕۆژانی کۆتایی جێبەجێکردنی جێبەجێکردنی پرۆژەکە، کە خۆمان بۆ ئاهەنگی جێبەجێکردنی پرۆژەکە و کردنەوەی ئامادە دەکرد، داوەتی عیزەت دووریم کرد، کە ئەودەمی وەزیری ناوخۆ بوو و، سەرۆکی ئەنجوومەنی کشتوکاڵیی باڵاش بوو، تا سەردانی پرۆژەکە بکا و سەیری ئەو کارانە بکا کە کراون. پرسیارم لێکرد ئەگەر بە کاری هەرەوەزی ئەو نۆکەندەت لێدابا چەند ی پێ دەچوو؟ گوتی: هەزار ساڵ.

بنیاتنانی پرۆژەکە بە هاوکاریی حکوومەتی یەکێتیی سۆڤیەت جێبەجێ کرا، کە قەرزێکی بۆ بنیاتنانی پرۆژەکە پێشکەش کرد. یەکێتی سیڤیەت بە هەموو ڕێیەک لە هەوڵی ئەوەیدا بوو کێشەی توند لە نێوان عێراق و سوریا روونەدا. ئاوی فوراتیش یەک لە هۆیەکانی کێشەی نێوانیان بوو. وەک دابی ئەوکاتیش، تێچووی بنیاتنانی پرۆژەکە بە "١٠٠"ملیۆن دیناری عێراقی خەملێندرا و هەر دینارێکیش"٣،٣" دۆلار بوو. بەڵام ڕێککەوتن لەگەڵ سۆڤیەت کرا قەرزەکەی لە شێوەی ئامێر و مەکینەی پێویستی لێدانی نۆکەندەکە بێ و بەشداریی ژمارەیەکی گونجاوی پسپۆڕی سۆڤیەتیی بوارە جیاوازەکانی ئەو کارە، بەو

مەرجەی عێراق خەرجییە ناوخۆییە پێویستەکان بگرێتە ئەستۆ. بەڵام من لەگەل سۆڤیەتییەکان هاوڕابووم کە دەکرێ ئەو پرۆژەیە بە دامەزراندنی دامەزراوێکی تایبەتمەند بە هاوکاریی نێوان پسپۆرە عێراقییەکان و سۆڤیەتییەکان جێبەجێ بکرێ.
پرۆژەکە لە ماوەیەکی پێوانەیی جێبەجێ کرا کە سێ ساڵ بوو. وەکچۆن تێچووی پرۆژەکەش دابەزی و تەنیا ٣٥ ملیۆن دیناری تێچوو. ئەوەش دەریدەخا حێراق چەندی زەرەر دەکرد ئەگەر پرۆژەکانی لەڕێی کۆمپانیا بیانییەکانەوە جێبەجێ بکردایە.
لە کاتی کردنەوەی پرۆژەکەدا "نفۆفیکۆف"ی جێگری سەرۆکوەزیرانی سۆڤیەت، بە سەرۆکایەتیی شاندێک لە ئاهەنگەکە ئامادەبوو. وەک ڕێزێک بۆ هەوڵ و ماندووبوونی پسپۆرە سۆڤیەتییەکان، سەرۆکی پسپۆڕەکان میداڵی ڕافیدەینی پلە دووی جۆری مەدەنیی درایە و، بەڕێوەبەری گشتیی دامەزراوەکەش ، بەڕێز محەممەد حەبوبی هەمان میداڵی درایە و پسپۆڕ و ئەندازیارە عێراقییەکانیش میداڵی ئالایان درایە و پشکنەرەکانی پرۆژەکەش خەلاتێکی داراییان درایە کە کۆی مووچەی ساڵێکیان بوو.

## لەگەڵ باباجان غەفورۆڤی ئەکادیمی و بەدەستهێنانی دکتۆرا:

باباجان غەفورۆڤ، کەسایەتییەکی زانستی و کۆمەڵایەتیی ناسراوی یەکێتیی سۆڤیەتە و ئەو خەڵکی کۆماری تاجیکستانە. لە سالانی دوای شەڕێ و بۆ بە خێرایی سەرپێخستنەوەی ئابووریی سۆشیالیستی، پۆستی سەرۆکوەزیرانی ئەو کۆمارەی وەرگرتبوو و، ئەو لە خۆرهەڵاتناسە ناسراوەکانە. لە میهرەجانی هەزارساڵەی شاری بەغدا بەشداریی کرد و لێکۆڵینەوەیەکی پڕبەهایسەبارەت بە پەیوەندییە سیاسی و ڕۆحییەکانی گەلانی ئاسیای ناوەڕاستی لەگەڵ بەغدای پایتەختی خەلافەتی عەباسییەوە پێشکەش کرد. دواترێ کرایە سەرۆکی پەمانگای خۆرهەڵاتناسیی سەر بە ئەکادیمیای زانستەکان لە یەکێتیی سۆڤیەتی لە مۆسکۆ بوو و،پەیمانگاش لەوێ بەرانبەر کۆلێژە یان زانکۆ کە کۆمەڵێ زانستی لێ دەخوێندرێ، جا ەو پەیمانگایە گرنگی بە لێکۆڵینەوە خۆرهەڵاتییەکان دەدا و بەشی ئاداب و مێژوو و ئابووریی تێدایە.

لە ١٩٧٠، کە لەسەرداوەتی یەکێتیی کۆمەڵەکانی دۆستایەتی و پەیوەندییە ڕۆشنبیرییەکان لەگەڵ گەلانی بیانیدا سەردانی یەکێتیی سۆڤیەتم کردبوو، لە بەرنامەی سەردانەکەمدا بوو سەرێک لە پیمانگای خۆرهەڵاتناسی بدەم. سەردانی پەیمانگایەکەم کرد و لەوێ باباجان غەفورۆڤی سەرۆکی پەیمانگایەکە چاوەڕێی دەکردم؛ باباجان پیاوێکی کورتەباڵای تێکسمڕاوی ڕەشتاڵەیە و شەپرە لە هەردوو پەلی لای چەپی داوە، بەڵام ئەوە ڕێی لە نێڵەی زیرەکی و چالاکیە زانستییە ئەکادیمییەکەی بواری خۆرهەڵاتناسیی نەگرتووە.

لە نووسینگەکەی پەیمانگای پێشوازیی لێکردم و بە فارسی قسەمان دەکرد و ناوەناوەس بە سایەی تەرجومانێکی ڕووسی و عارەبیی دەزانی. من هەندێ دانراو و لێکۆڵینەوەی خۆمم سەبارەت بە چاکسازیی کاشوکاڵیی عێراق لەگەڵ خۆم هێنابوو، وەک دیارییەک پێشکەشی کتێبخانەی پەیمانگام کردن. دوای ئەوەی کاروبا و چالاکییە زانستییەکانی پەیمانگامان تاوتوێ کرد، غەفورۆڤ گوتی: هاوڕێ تاڵەبانی، زۆر لێکۆڵەری وڵاتانی جیاجیا نامە و لێکۆڵینەوەیان دەربارەی عێراق پێشکەش کردووە. زۆربەیشییان ئەو لێکۆڵینەوە و توێژینەوانەیان بۆ بیروڕایەکانیان کردووەتە پشتبەند کە ئێوە لە چالاکیی زانستی و کرداریتان لەبواری چاکسازیی کشتوکاڵی لە عێراق پێشکەشتان کردووە. ئەگەر ئارەزووس بکەن بێنە پەیمانگایەکەمان، کە ئەو بوارەشتان لەبەردەمدایە، ئەو لێکۆڵینەوانەی ئەوڕۆ لەگەل خۆتت هێناون بۆ ئەوەی دەشێن ببنە نامەیەک و لێرە لەبەردەم دەستەی زانستیدا بەرگریی لێ بکەن.

پێشنیارەکەیم پێ ماقوول بوو، بەڵام لێکڵینەوەی ئابووری و کۆمەڵایەتی ، بەپێی ئەو ئامار و دراوانەی بەردەوام لە گۆڕاندان، دەبێ هەمیشە نوێبکرێنەوە. گوتم : هاوڕێ گەفورۆڤ

بۆمن جێی شـــانازییە بێمە پەیمانگایەکەتان و ببمە هاوالّێکی خاکەڕای ئەو کۆمەڵە زانا ئەکادیمییە باڵایە.
بەڵام خۆتـان دەزانن لێکۆڵینەوەی زانسـتی، هەرچەنـدی سـتی نوێی لێ بەدەرکەوێ، پێویسـتی بە نوێکردنەوە دەبێ. جا ئەگەر ئەو لێکۆڵینەوەیەم وەک نـامەیەکی بەرانبەر ماستەری ولاتی خۆمان لێ وەربگرن، ئەوا من ئامادەم نامەیەکی نوێی دکتۆرا ئامادە بکەم و لە مەودای دوو سـاڵانیش ئامادە دەکرێ تا لەبەردەم ئەنجوومەنی زانسـتیدا گفتوگۆی لەسـەر بکرێ. غەفورۆڤ هەسـتایەوە و کاغەز و قەڵەمێکی دامێ تا داوای وەرگرتنم لەو پەیمانگایە بنووسـم، بەو مەرجەی ئەو بڕوانامەی بەکالۆریۆسـەی لە کۆلێژی مافی بەغدا وەرمگرتووە بۆیان بنێرم و، داواشـی لێکردم لە دادێیەکی نزیکدا سـەرێکی دیکەی پەیمانگا بدەم تا ڕێوشـوێنە یاسـایی و زانسـتییەکانی وەرگیرانم لە خوێندنی باڵا بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی "کاندیدات"ی بەرانبەر دکتۆرای فەلسەفەیە، تەواو بکەم.
دوای دوو مانگان سـەفەری مۆسـکۆم کرد و سـەردانی غەفورۆڤی ئەکادیمیم کرد و بڕوانامەی پێویست و ناونیشـان و بەرنامەی ەو نامەیەشـم دایە کە بەتەبووم پێشکەشـی بکەم و بەناونیشانی "چاکسازیی کشتوکاڵی و گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان لە لادێی عێراقی" بوو. پەیمانگا، کۆتۆفسکیی پرۆفیسۆر ە سەرۆکی بەشی ئابووری و کۆتلۆڤی پرۆفیسۆر و سەرۆی بەشی مێژووی کردنە دوو سەرپەرشتیاری ئامادەکردنی نامەکە. دوای تاوتوێ لەگەڵیاندا و ڕێککەوتن لەسـەر پرۆگرامی لێکۆڵینەوەکە، گەرامەوە بەغدا تا سـەرچاوە و ئامار و زانیاریی نوێسـەبارەت بە بابەتی نامەکە کۆکەمەوە، کە لەبەر سـەرقاڵیم بەو دانوستانانەی سـەبارەت بە پێکهێنانی بەرەی نیشـتمانیی نێوان حەزبی شـیوعی و حیزبی بەعس کران، کارەکەم دوو سـاڵی خایاند و لە ١٥ی ئـایاری ١٩٧٢ ئەرکی وەزارەتی ئاودێریم درایە و ئەوەش وایکرد نەتوانم نامەکە، وەک ئەوەی بەڵێنم بە مامۆستاغەفورۆڤ دابوو، لەکاتی خۆیدا تەواو بکەم. کە سـەردانیم کرد گوتم: ئەو قوتـابییە تەوەزەلەتـان نەیتوانی بەڵێنەکەی سـەبارەت بە ئامادەکردنی نامەکە بەجێ بهێنێ، جا داوا دەکا ماوەکەی تۆزیک بۆ درێژکەنەوە. گوتی: بەپێچوانەوە، من شـانازی بەو قوتـابییەمەوە دەکەم کە چالاکـانە بەشـداریی لە پیادەکردنی ئەرکێکی جوامێرانە و گەورە کردووە و، ئەویس بەرەی نیسـتمانیی ولاتەکەیەتی و، ئێمە کاری نوێی لە وەرگرتنی ئەرکی وەزارەتی بەرز دەنرخێنین. بەڵێنم دایە کە نامەکە لە ماوەیەکدا تەواو بکەم کە ئەوپەڕەکەی کۆتایی ١٩٧٢ بێ. ئەوجارەیان بەڵێنەکەمم بردەسـەری و، نامەکەم بە زمانی عارەبی و پوختەیەکیش بە زمانی رووسی پێشکەش کرد و تا دابەشی سەر دەستە زانستییەکانی بکەن.

له ۱۹۷۳، که لەسەردانێکی کۆماری کازاخستان بووم، برووسکەیەکم له پەیمانگای خۆرهەڵاتناسییەوە بۆ هات و داوای دەکرد له پەیمانگا ئامادەبم تا گفتوگۆ لەسەر نامەکەم بکەم، غەفورۆڤیش له پەیمانگا نەبوو. بەئەرکێکی زانستی چووبووە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لەکاتی دیاریکراوی گفتوگۆدا جەماوەرێکی زۆری قوتابییە عێراقییەکانی خوێندنی باڵا ئامادەبوون وەکچۆن پاشکۆیی رۆشنبیریی باڵیۆزخانەی عێراقی و فازڵ بەراکی پاشکۆی سەربازییش هاتبوو. له هۆڵێکی دیکەی پایمانگاش کۆبوونەوەی دەستەی سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی ئاشتیی جیهانی دەکرا. ئەوانیش هەر هاتنە گفتەگۆیەکە و لەناویشیاندا مامۆستا عەزیز شەریفی جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنەکە و، کریشن مینۆنی وەزیری دەرەوەی پێشتری هیندستان و خانمە مامۆستایەکی زانکۆی هۆڵەندا و کەسانی دیکەش. لیژنەی گفتوگۆ سێزدە مامۆستا بوون؛ حەوتیان زمانی عارەبییان دەزانی و نامەکەش به زمانی عارەبی بوو، جا ئیڤانۆڤا، خاتوونی دکتۆر، قسەکانی له عارەبیرا دەکردە رووسی و له رووسیشرا دەیکردنە عارەبی، لیژنەکە دوای گفتوگۆ، بۆ چەند ساتێ لەگەڵ خۆیان دانیشتن و ئەوجا هاتنەوە ناو کۆبوونەوەکە تا رای خۆیان لەسەر نامەکە بدەن. یەک له ئەندااانی لیژنەکە قبووڵکردنی نامەکەی به کۆی را راگەیاند و گوتی باشترین توێژینەوەیە لەسەر ئەو بابەتە پێشکەش کرابێ، چ لەناوەوە و چ لەدەرەوەی یەکێتیی سۆڤیەت، به هەوڵە زانستی و کردارییەکانی ئەو بوارەی منیدا هەڵدا و گوتیشی پەیمانگا ئامادەیە به رێککەوتن لەگەڵ من نامەکە چاپ بکا.

چەند مانگێک پێش کۆچی دوایی، نامەیەکی ناسکی باباجان غەفورۆڤی ئەکادیمیم پێگەیی، تێیدا گوتبووی: سڵاوی بێگەردم بۆ تۆ و بۆ خانەوادە بەرێزەکەت، هیوای تەندروستییەکی باش و بەختەوەری و هەموو سەرکەوتنێکی بواری زانستی و کردەنیتان بۆ دەخوازم بۆ پەرەپێدانی زانست و رۆشنبیری و، پتەکردنی پەیوەندیی زانستیتان لەگەڵ خۆرهەڵاتناسە سۆڤیەتییەکان.

که یەکەمجار سەردانی غەفورۆڤم کرد هێشتا ژنم نەهێنابوو، چووە ژوورێکی دیکە و دوو یاریی لەدار دروستکراوی میللیی بۆ هینام و گوتی: دیارییە بۆ منداڵەکانت. گوتم:منداڵم نییە، چونکە هێشتا ژنم نەهێناوە. گوتی: خۆ نابییە رەبەن! ژنێ هەر دێنی و منداڵیشت دەبێ، جا پێیان بڵێ باباجانی مامتان ئەو دیارییانەی بۆ ناردوون. منیش تا ئێستا ئەو دیارییانەم هەڵگرتووە. بیرەوەرییەکانی ئەو زانا گەورە و خاکەرایەی لەگەڵم دادەنیشت و به دەنگێکی لەسەرەخۆی سەنگین به فارسی قسەی لەگەڵ دەکردم قەت له بیرەوەریم ناسرێتەوە ، ناوە ناوە نامەکەی دەخوێنمەوە تا یادگارییەکانی نوێکەمەوە.

که بەشەکانی بەرایی نامەکەم دایە کۆتۆفسکیی مامۆستای سەرپەرشتیار، بەشی یەکەمی لەســـەر گەشـــەی مێژوویی موڵکداریی زەویوزار لە دۆڵی ڕافیدەین"میزۆپۆتامیا" بوو، کۆتۆفســـکی تێبینییەکی لەبـارەوە دەربڕی و، ئـامۆژگـاریی کردم دوای فراوانکردن و پەرەپێدانی ئەو بەشـەی، بیکەمە نامەیەکی دیکە بۆ بڕوانامەی "دکتۆرای ناووک- دکتۆرای زانسـتەکان" هەر لەو پەیمانگەیە. هەر بەڕاسـتییش نامەیەکی دیکەم بۆ بەدەسـتهێنانی ئەو بڕاوانامەیە پێشکەش کرد و ، بە تەقدیرێکی باڵا قبووڵکرا وبڕوانامەی دکتۆرای ناوکم لەو پەیمانگەیە وەرگرت.

## دیدارێک لەگەڵ جێگری وەزیری دەرووەی سۆڤیەت و مشتومڕێکی گرنگ:

لە ١٩٧٤ سەردانێکی یەکێتیی سۆڤیەتم کرد. لەهۆتێل، لیخاچۆڤی بەرپرسی وڵاتانی خۆرئاوای ئەفریقیا ی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤێتیی، پەیوەندییەکی دۆاتایەتیی ئەودەمەمان هەبوو کە ئەو باڵیۆزی ولاتەکەی بوو لە بەغدا، سەردانی کردم. ڕۆژی دواتریٚ لە نووسینگەکەی لە وەزارەتی دەرەوە جوومەوە سەردانی. باسی بارودۆخی عێراقمان کرد و بەتایبەت کوردستان، باسی ئەو بەرپرسیارییە نوێیانەی خۆیشی بۆ کردم کە لە هەندیٚ ولاتی دراوەتیٚ پێشتر هیچی لە بارەوە نەدەزانین. دۆخی کوردستانیس گرژبوو و پەیوەندیی نێوان عێراق و ئێرانیش گرژیی تێکەوتبوو و، کەستییە جەنگییەکانی ئێران بە شەتولعەرەبدا دەسوورانەوە و، تەق و تۆقیش لێرە و لەوی لەگەل بارزانی پەیدا ببوو. حکوومەتی عێراق ڕەخنەی لە هەڵوێستی سۆڤێتی هەبوو لەسەر ئەو ململانێیە، ئاخر سەرباری ئەوەی پایماننامەی دۆستایەتی و هاریکاری لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا هەبوو، دەقی ماددەیەکیشی دەیگوت ئەگەر ولاتێکیان تووشی شەڕ بوو، یان کەوتە ژێر مەترسیی شەڕەوە، ئەوا بۆ کاری پێویست دەبیٚ پرسوڕا بە یەکدی بکەن.
لیخاچۆڤ پێیگوتم جێگری یەکەمی وەزیری دەرەوە زانیویەتی ئێوە لێرەن و، ئەویش پێیگوتووە سەردانی وەزارەتی دەرەوە دەکەم، گوتی ئەگەر لاریتان نەبیٚ ئارەزوو دەکا بتانبینیٚ. بە دیدارەکە رازیبوومئیدی بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ کرد و پێکەوە چووینە نووسینگەکەی.
کۆزینتسۆڤ بەخێرهاتنی کردم و ئەوجا گوتی: پێم باشبوو سوود لەوەی ببینم کە لە مۆسکۆی، تا دەربارەی ئەو گرژییە ترسناکەی لەسەر سنووری عێراق و ئێران دروستبووە و لە کوردستانیش هەیە، پرسورایەکی بکەین. چونکە تۆ کوردی و ئاگات لە وردەکاریی کێشەکە هەیە وسیاسییەکیشی ڕۆڵێکی چالاکت هەبووە لەوەی بارودۆخی ولات، لەڕێی گفتوگۆوە، بەرەو کۆمەڵیٚ چارەسەری ناوخۆ ببەی. پێموایە ڕاگۆڕینەوەمان سوودی بۆ هەردوو وڵات دەبیٚ.
سەبارەت بە کێشەیەی لە ناوچەکەدا هەیە گوێمان لە هەندیٚ بەرپرسی وەزارەتی دەرەوەی عێراق بووە هەندیٚ ڕەخنەیان لە هەڵوێستی حکوومەتەکەمان هەیە. ئەوان ئاماژە بە پەیماننامەی دۆستایەتی و هاوکاری دەکەن و دەپرسن ئەریٚ سۆڤیەت چاوەڕێی چییە؟ چاوەڕێیە بمین و فاتیحە لەسەر گۆڕەکانمان بخوێنیٚ؟ ئەوان ئاماژە بەو ماددە تایبەتەی پرسورای نێوان هەردوو دەوڵەت دەکەن کە پەیوەستی مەترسیی هەڵگیرسانی شەڕە،

بەلام ئەوان، پێش ئەوەی کێشە لە کوردستان دروست بکەن پرسوڕایان پێ نەکردین، تۆ بڵێی ئەو مادەیەلەو پەیماننامەیە هاتووە هەر بۆ یەک لایەن بێ!

ئێمە دەزانین بەرپرپاریی کێشـەنانەوە لە ئەسـتۆی ئێرانە، بەڵام نامانەوێ بە ڕاسـکاوی بڵێین: ئێران تۆ لەو بارگرژییە بەرپرسـیاری، جونکە ئێران ئەندامی هاوپەیمانیی ناوەندییە و پێگەیەکی ستراتیژیی بۆ وڵاتەکەمان هەیە، ئێمە بەدروسـتکردنی پەیوەندییەکی ئاسـایی لەگەڵ حکوومەتی شـای ئەو هاوپەیمانییەمان سـەرکرد و، نەوت بە ئاگرداکردنیش نە لە بەرژەوەنـدیی ئـێمەیە و نە لەبەرژەەنـدیی نـاوچەکەیە و، بیرمـان لە دۆزینەوەی ناوبژیوانییەک کردووەتەوە تا ململانێی نێوان عێراق و ئێران بە ئاشـتی چارەسـەر بکەین. ئیدی باسـترین کەسـمان بۆ ئەو بابەتە دەستنیشـان کردووە و ئەویش زاهیر سای شـای ئەفغانستانە، ئەو پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ شای ئێرانێ هەیە و، پەیوەندییەکی باشیشی لەگەڵ عێراق هەیە و دۆستی ئێمەشە. بەڵام نامانەوێ ئەو ناوبژیوانی و هاوڕێکییەی نێوان عێراق و ئێران لەسەر حیسابی کوردەکانی عێراق بێ. داوامان لە مستەفا بارزانی کردووە، بۆ پرسـوڕای بابەتەکە، بێتە یەکێتیی سـۆڤیەت، هەموو دەسـتەبەرییەکیشـمان بۆئەوەی کردووە بە سەلامەتی لە کوردستان دەرچێ و بە سەلامەتییش بگەڕێتەوە کوردستان، جا لەڕێی ئێران و ئەوروپاوە بێ، یا بەغدا- مۆسکۆ. ڕەزامەندیی حکوومەتی عێراقمان لەسەر ئەو بابەتە وەرگرتووە، بەڵام بارزانی، لەجیاتیی ئەوەی بێتە یەکێتیی سـۆڤیەت و لێرە جاوی بە بەرپرسـانی باڵا بکەوێ، سـاڵح یوسـفی و دارا تۆفیقی بۆ ناردووین، ئێمەش دەزانین ئەو دوو بەرپرسەی پارتی دیموکراتی کوردستان ناتوانن کێشیکان یەکلا بکەنەوە. ڕەنگە بڕیاریشیان لای بارزانی جێبەجێ نەکرێ و، ئەوان لێرە تەنیا جاویان بە بەرپرسانی حیزبیی لە ئاسـتی خۆیـان کەوتووە و نـاتوانن بڕیـاری بنەبڕ بدەن. ئێمە ڕازیبووین پێشـوازی لە هەردوو کوڕەکەی بارزانی، ئیدریس و مەسـعود بکەین کە ڕەنگە قەناعەتی ئەوان لای بەڕێز مسـتەفا بارزانی سـەنگێکی هەبێ، بەڵام بارزانی رازی نەبوو سـەردانی وڵاتەکەمان بکەن. ئەوجا باباجان غەفورۆڤی ئەکادیمیمان نار کە برادەرایەتییکی پتەوی لەگەڵ بارزانی هەیە، بەڵام نەیتوانی ڕازیی بکا، ئێسـتا دەمانەوێ ڕای ئێوە لەو بارەیەوە بزانین.

پێمگوت: ئێمە دەزانین ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئێران حەزیان لە پێشـکەوتنێکی ئاشتییانەی وڵاتەکەمان نییە و ناسیانەوێ دیموکراتییەت لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیی عێراقدا بەرکەماڵ بێ. چارەسەری ئاستییانەی کێشەی کوردیش بەشێکە لەو وەرچەرخانە دیموکراتییە. ئێران پێویسـتی بە کوردەکانە، بەڵام پێویسـتی بەوەی نییە مافە نەتەوەیی ودیموکراتییەکـانیـان بەدەسـتبێنن. ئەو پێویسـتی بەو کەسـانەیە کە دەبنە گرفتی

دەستەبەرکردنی ئەو مافانە، جونکە ترسی لەوەی هەیە. یمە ساندێکی حیزبی شیوعی سەفەری کوردستانمان کرد و لە بنکەکەی کوردستانی دیدارێکی درێژمان لەگەڵمستەفا بارزانی کرد. گوتمان مادام تاوانای ئەوەی لەئارادایە مافە ڕەواکانی گەلی کورد لەچوارچێوەی ئۆتۆنۆمیدا پیادەبکرێ، با پەنا بۆ چەک نەبا. بەلام ئەو نەهاتەڕاێ، پێدەچوو لەژێر فشاری شایدا بووبێ. ئێمە، وەک گوتتان، لەگەڵ چارەسەری کێشەکانی نێوان عێراق و ئێرانین، بەلام بەو مەرجەی لەسەر حیسابی مافە ڕەوایەکانی کوردان نەبێ. منیش پێموایە زاهیر شا، بۆ ئەو کارە، کەسێکی گونجاوە، بەلام بەو مەرجەی لە بەراییڕا مافەکانی کورد لەبەرچاو بگرێ و، بارزانیش داوای دەستەبەریی ئەوەی دەکا کوردەکان مافەکانی خۆیان پیادەبکەن، چونکە متمانەی بەو دەستەبەرییانە نییە کە حکوومەتی عێراقی ڕایگەیانوون.

کۆزنتسۆف گوتی: بارودۆخی نێو دەوڵەتی بەوجۆرە نییە دامەزراوە نێودەوڵەتییەکە سەرپەرشتیی جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانە بکا کە تایبەتن مافی ئەو نەتەوانەی بە کاری ناوخۆی هەر دەوڵەتێک دادەندرێ.

گوتم: نەگبەتیی کوردان لەوەیدایە لەمێژە لەلایەن سێ حکوومەتەوە دەچەوسێندرینەوە و لەنێوان خۆیان دابەشیان کردوون، لە هەموو دەوڵەتێکیش کێشەکەیان بە کێشەی ناوخۆ دادەندرێ، وەک ئەوەی ئاوها دابەسکردنیان لەسەر داوای خۆیان بووبێ. باشە بۆ کێشەی ڕەشپێستەکانی باشووری ئەفریقیا بە کێشەیەکی ناوخۆ داناندرێ؟ بەلام تورکەکان کوردەکان کۆمەڵکوژ دەکەن و مافی ئەوەیشیان نادەنێ بە زمانی خۆیان قسە بکەن، کەچی بە کێشەیەکی ناوخۆ دادەندرێ.

گوتی: تا ئێستش لەهەوڵی ئەوەین بارزانی ببینین و سەبارەت بە هەڵوێستمان بەرانبەر دۆخۆ ناوچەکە بەگشتی پروڕایەکی لەگەل بکەین.

## شەڕی حکوومەت- کورد – شیوعی:

دوای سیاسەتی دوورکەوتنەوە و نێوانبڕیی نێوان حکوومەت و بزووتنەوەی کوردی و هەڵشەقاندنی پەنجەی بەکارهێنانی هێز، حیزبی سیوعی هەوڵیدا دەرووێک بۆ هەڵنەگیرسانی شەڕی نێوان بزووتنەوەی کورد و حکوومەت بدۆزیتەوە، دوو کۆبوونەوەمان لەگەل مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان کرد تا رازییان بکەین بەوەی مادام هیوایەکی چارەسەرکردنی چەندین کێشە هەیە، با پەنا بۆ شەڕ نەبەن. شاندێک بە سەرۆکایەتیی عەزیز محەممەد و کەریم ئەحمەد داود و من پێکهێنرا و هەفتەیەک پێش دەستپێکردنی شەڕ جووینە کوردستان و لە بنکەکەی دیلمانی لەگەل بارزانی کۆبووینەوە تا بیهێنینە رایێ کە گەلی کورد پێویستە بە پاڵپشتیی پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعیی عێراقی ئۆتۆنۆمی وەرگرێ.

دوای گفتوگۆیەکی درێژ و دۆستا نە گەیشتینە ئەو ڕایەی بارزانی سوورە لەسەر ئەوەی جێبەجێکردنی یاسای ئۆتۆنۆمی ساڵێکی دیکە دوابخرێ و، ئەوەش لەژێر فشاری شای ئێراندایە، جونکە سا لەوەی دەترسا جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمی لە کوردستانی باسوور"عێراق" ببیتە هۆی ڕاست بوونەوەیەکی گشتیی جەماوەری کوردی لە ئێران و داواکردنی ئۆتۆنۆمی. بەڕاستییش، بارزانی شاندێکی باڵای بە سەرۆکایەتیی ئیدریس بارزانیی کوڕی ڕەوانەی بەغدا کرد کە حەبیب محەممەد کەریمی سکرتێری پارتی تێیدابوو و لە بەغداس فوئاد عارفی لیوای خانەنشین و وەزیرە کوردەکان تێیدا بەشداربوون. کۆبوونەوەیەکی سێ لایەنی کرا و نوێنەری هەرسێ حیزبەکە تێیدا بەشداربوون حیزبی بەعس و پارتی و حیزبی شیوعی.

شاندی کوردی، بێ ئەوەی ڕوونکردنەوەی هەبێ یان وەڵامێکی ڕازیکەری پسیاری سەدام حوسێن بداتەوە بۆ دەیانەوێ جێبەجێکردنی یاسای ئۆتۆنۆمی دوابخەن، لەسەر ئارەزووی بارزانی داوای ساڵێک دواخستنی یاسای ئۆتۆنۆمییان کرد و، دوای پەرتەکردنی کۆبوونەوەکەش وەزیرە کوردەکان پۆستەکانی خۆیان بەجێهێشت و چوونەوە کوردستان ئەوەش نیشانەیەک نێوانبڕی و دەست بە شەڕکردنەوە بوو.

ئەگەرچی شیوعییەکان لەو دیدارەیاندا کە هەر پێش شەڕ دەستپێکردنەوە کرا و، هەردوو کوڕەکەی، بەڕێزان ئیدریس و مەسعود ئامادەی بوون، نەیانتوانی مەلا مستەفا بارزانیی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان ڕازیکەن، دوای ئەوەی خلیسکابووە پێگەکانی حکوومەتی شای ئێران و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کەچی شیوعییەکان نیەتی ئەوەیان نەبوو چەکی لەدژی هەڵگرن و بگرە هەر خەریکی ئەوەش بوون فسار بخەنە

سەر حکوومەتی بەعس  تا کێشەکە بە ئاشتییانە چارەسەر بکا. بەڵام بارزانی بێ ئەوەی بڵێ لەبەرچی، شـــاندێکی بە ســـەرۆکایەتیی ئیدریس بارزانیی کوڕی هەنارد و داوای دواخستنی جێبەجێکردنی یاسای ئۆتۆنۆمیی دەکرد، کەچی ئاشکرا دیاربوو کە حکوومەتی شـا و دەسـەڵاتی ئەمەریکا دژی ئەوەی بوون بارزانی لەگەڵ حکوومەت ڕێککەوێ و دژی ئەوەش بوون پارتی دیموکراتی کوردســـتان لە ئیئتیلافی حکوومیدا بمێنێتەوە و دژی دەسـتەبەرکردنی ئۆتۆنۆمییش بوون. بەڵام هەڵویسـتی بارزانیی کە فەرمانی دابوو حیزبی شـیوعیتان لە هەر جێیەکدا دیت لێیاندەن، حیزبی شـیوعیی ناچارکرد بە هەمان شـێوازی بارزانی پێ لێیدان ئەوانیش بەرگری لەخۆیان بکەن. ئەو هەڵوێستەی دژی شیوعییەکانیش لەبەر ئەوەی نەبوو کە شـیوعییەکان ئەو خلیسـکانە مەترسـیدارەی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردیـان  ڕەتـدەکردەوە، بەڵکو پـارتی دیموکراتی کوردســـتـان لە ١٩٧٢بەوەی ڕازی نەبووشـــیوعییەکان بەشـــداری لە حکوومەتدا بکەن، لەگەل ئەوەش  پارتی دیموکراتی کوردستان هەر لە ١٩٧٠ڕا بە پێنج وەزیران لەو حکوومەتەیدا بەشدار بوو.

شـەرەکە ئەوەندەی درێژە نەدایە، هەر خێرا ڕێککەوتنی جەزائیر لە ئازاری ١٩٧٥، لەنێوان عێراق و ئێران مۆرکرا.

بەڵام بۆ حکوومەتی عێراق ڕازیبوو دەســـــت لە هەنـدێ خـاکی پڕ نەوت و نیوەی شەتولعەرەب بەردا؟ سەدام حوسین ئەو کارەی بردەوە سەر کەمیی ئەو جبەخانەیەی لە یەکێتیی سـۆڤیەتڕا دەگەیشـتە دەسـتی. جارێکیان بەقســەی خۆی ڕایگەیاندبوو کە بایی ئەوەندەیان جبەخانە نەمابوو شـەڕێکی درێژخایەنی پێ بکەن و، سـوپای عێراقیش لە هیچ شەڕێک هێزەکانی بارزانیی نەبەزاندبوو و، ئەو هێزانە زیانێکی زۆریان لێ نەکەوتبوو.

بارزانی هەستی بەوەی کرد لە سووچێک گەمارۆدراوە، ناتوانێ لە یەک کاتدا شەڕی دوو دەوڵەت بکا، برووســـکەیەکی بۆ بەغدا هەنارد و پێشـــنیاری ئەوەی کردبوو دەســـت بە دانوستانێکی نوی بکرێتەوە، بەڵام دەسەڵاتەکانی عێراق ئەو داوایەیان ڕەتکردەوە.

ئیدی بارزانی، لە وتارەکەی ماڵئاوایی ژیانە پڕ خەبات و سـەرکەوتن و شکسـتەکەیدا، کە لە حاجی ئۆمەران پێشکەشی کرد و، هەرچیی هەیبوو پێشکەشی گەلەکەی کرد، ڕاگرتنی شەڕی ڕاگەیاند و، گوتی با هەرکەسە و بچێتەوە ماڵەکەی خۆی، ئەوەی هەواداری منە با لەگەڵم بێتە ئێران، چونکە ئێمە لەوێ دەژیین، ئەوانەی لەگەڵیشـــم هاوڕانین با بفەرموون بڕۆن و بچنەوە بەغدا یان هەرجێیەکی خۆیان پێیان باشـــە، یان با داوای پەنابەری لە ولاتێکی ئەوروپا بکەن. گوتی: من ئەرکم تەواوبوو.

## دیدارێک لەگەڵ سەرۆکوەزیرانی کۆماری هەنگاریای میللی:

لەســـەر داوەتی 'دیکن'ی وەزیری ســامانە ئاوییەکانی کۆماری هەنگاریای میللی لە ١٩٧٥ چوومە هەنگاریا، لەو ماوەیەی لەوێ مامەوە چەندین پرۆژەی ســامانە ئاوییەکانم دیت، چ بەنداو و چ وێستگەی ئاو ناردن و چ تاقیگەی هایدرۆجینیی چارەســەر کردنی کێشــەکانی دەریاچەی باڵاتوونی بە داهاتێکی گەشتیاری و چارەسەریی گەورەی مەجەڕ دادەندرێ. لە زۆربەی ئەو گەڕانــانەمــدا دیکنم لەگەڵدابوو و، هەنگــاریــا چــاوی لەوەی بوو قۆنــاغی بەرفراوانی موازەنەی'تــا و تــا کردن' ئــاویی عێراقی بــدرێتێ کە یەکێتیی ســـۆڤیەت لێکۆڵینەوەی قۆناغی بەرایی کردبوو.

دوای گەڕان و ســـوورانەکــانی دیتنێ، ێواری دەچمە دیــداری هــاوڕێ 'شـــتوتگــاڵ'ی ســەرۆکوەزیران. دیکن و خانمە تەرجومانەکەیشــی لەگەڵم هاتن، کە بە ئینگلیزی و تورکی قسـەی دەکرد و، بەڕێوەبەری نووسـینگەکەی لە دەرگای دەرەوەی ئەنجوومەنی وەزیران پێشـوازیی لیکردین و جا وەژوورکەوتین و بەخێرهاتنی کردم و پرسـیاری ئەوەی لێکردم داخوا مەجەڕم چۆن دیتووە و رام لەســـەر ئەو پرۆژانە چییە کە چوومەتە ســـەردانیان. وەهام وەڵامداوە کە ســـەرســـوڕماوی ڕێکخســـتنی کاروبارەکانی وەزارەتی ســامانە ئاوییەکانم و، بەتایبەت ڕێوشوێنەکانی خۆپاراستن لە مەترسیی لافاوی ڕووباری دانووبی دەکرێ لەو بوارەیدا شارەزاییان بگوڕینەوە، چونکە هەردوولامان ترسی لە هەردوو وڵات ترسی لافاوێمان لەسەرە.

سەردانەکەم ڕێکەوتی هەڵگیرسانەوەی شەڕی کوردستانی کرد، سەرۆکوەزیران پرسیاری بارودۆخی کوردستانی کرد و گوتیشی حکوومەتەکەی نیگەرانی دووبارە هەڵگیرسانەوەی شـــەڕە لە بــاکووری عێراق و ئەو مەترســـییــانەی ڕەنگە لە فراوانبوونی ململانێیەکە بکەوێتەوە و عێراق و ئێرانیش بگرێتەوە جا وڵاتە ئیستیعمارییەکان و بەتایبەتیش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیای بەرژەوەندیی ســـتراتیژییان لە ناوچەکەدا هەیە، ئەو کارەی دەقۆزنەوە.

ســـەبارەت بەو مەترســـییانە، منیش هاوبەشـــی نیگەرانییەکەی بووم و، بۆم ڕوونکردەوە حیزبمان چەندی هەوڵداوە لێنەگەڕێ شـــەڕ هەڵگیرســـێتەوە و، باســـی دیدارەکانی مســـتەفا بارزانیی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرکردەی بزووتنەوەی گەلی کوردم بۆ کرد و، باســـی ئەوەشـــم بۆ کرد چەندمان هەوڵداوە پارتی دیموکراتی کوردســـتان، سەرباری ئەوەی لە حکوومەتی ئیئتیلافیشدایە، بێتە ناو بەرەی نیشتمانیش.

سەرۆکوەزیران پرسیاری داواکارییەکانی بارزانیی کرد و گوتی داخوا کێشەکە پەیوەندیی بە کەرکووکەوە هەیە؟ گوتم: کەرکووک یەک لە بابەتە ســـەرەکییەکانی ئەودانوســـتانانە

بووە بارزانی لەگەڵ حکوومەتە جیاوازەکانی بەغدای کردووە . بارزانیش، پێشتریێ بەتەنیا لەگەڵ حکوومەت لەسـەر دواڕۆژی پارێزگای کەرکووک ڕێککەوتبوو. بەرەی نیشـتمانیش پێشنیارێکی گونجاوی بۆ ئەو کێشەیە خستەڕوو، ئەویش ئەوەبوو لیژنەیەکی سێ لایەنی لە حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیسـتیراکی و حیزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کوردسـتان ئەو پـارێزگـایە بەڕێوە ببـا ونـاشــــبێ هیچ گۆڕانکـارییەکی دیمۆگرافی و جوگرافی لە پارێزگایەکەدا بکرێ. پێشـدەچی بارزانی چارەسـەری ئاشـتییانەی گەرەک نەبێ و، ئەو بۆ هەڵگیرســاندنەوەی شــەڕ لەگەڵ ئێران و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تێوەگلابێ و، ئێسـتا داوای دواخسـتنی دەرکردنی ئەو یاسـای ئۆتۆنۆمییەی دەکا کە خۆی لە تاکلایەنە لەســــەر بنەمـای بەیـاننـامەی ١٩٧٠ لەگەڵ ســــەرکردایەتیی حیزبی بەعس لەســــەری ڕێککەوتووە.

ســــەرۆکوەزیران تێبینییەکی خســــتەڕوو کە جێی ئاوڕلێدانەوەیە، گوتی: دووخاڵ هەن مەترسی دروستدەکەن، یەکەمیان؛ بارودۆخە ئاڵۆزەکەی ناوچەکە و ئەگەری ئەوەی ئێران لەو ململانێیەوە بگلێ، کە ئەوە دۆخەکەی ئاڵۆزتر دەکا. دووەمیان: دوای ئەوەی بارزانی لە ئیئتیلافی حکوومەت دەکشـێتەوە و هەڵوێسـتی لە بەشـداریی دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمی نەرێنی دەبێ، کێ بە شـێوەیەکی فراوان بەشــداریی تێدا دەکا؟ داخوا حکوومەت ڕێگە بە حیزبی شــــیوعی دەدا ڕۆڵی خۆی لەوێ وەرگرێ، کە تاکە حیزبە لە ناوچە کوردییەکاندا جەماوەری هەیە؟ ئێمە گومانمان لەوەی هەیە.

گوتم: تەواو لەگەڵتان هاوڕام، بەڵام بارزانی حیزبی شــــیوعیی خســــتووەتە بەردەم دوو بژاردان و سـێیەمیان نییە؛ یان دەبێ لەگەڵ ئەو ڕێککەون و دژی حکوومەتبن و لە بەرەی نیشــــتمانی بکشــێنەوە و لە حکوومەتیش و بگرە پێش ئەوەی ئەویش لە حکوومەت بکشـێتەوە و ئەودەمی بەتەنێ هەموو جەندوچوونەکان دەکا. یانیش دەبێ بارزانی لەسـەر بنەمای بەرەیەکی سێ لایەنی و لەسەر بنەمای دوورکەوتنەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئێران ئامادەی هاوکاری بێ و کێشەی کورد نەخاتە تەنگەبەرێکەوە. کەچی پێش دەســــتپێکردنی ســــەڕی **حکوومەتیش** ئەو فەرمانیدا هێرس بکرێتە ســــەر ڕێکخراو و بارەگاکانی حیزبی شیوعی و بێ هیچ پاساوێکیش، ئیدی حیزب ناچاربوو بەرگری لەخۆی بکا.

گوتی: باسە بۆ بارزانی بە حیزبی شیوعی دەستی بە شەڕ کرد؟ پێمگوت، بەرای من لەبەر دوو هۆ؛ یەکەمیان، حیزبی شیوعی لە کوردستان ڕێکخست و لایەنگر و چەکداری هەبوو، ئیدی ویسـتی دوای یەکلاکردنەوەی حیسـاباتەکانی لەگەڵ شـیوعییەکان ئەوجا دەسـت بە شەڕی حکوومەت بکا. دووەمیان؛ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئێران حەزیان لێبوو

دەست لە شیوعییەکانی ناوچەکە بوەشێنن، جا پێش ئەوەی لەگەڵ بارزانی ڕێککەون ئەوکارەیان بکردایە یان دوای ئەوەی لەگەڵی ڕێکدەکەون . بەدڵنیاییشەوە ئەو بارودۆخە هەڵوێستی بارزانیی لە عێراق لاواز دەکرد و هەڵوێستی سیوعییەکانیشی لە بەرە و ئیئتیلافی حکوومی لاواز دەکرد. ئێمە کلێشەیەکی گونچاومان پێشنیار کرد تا بارزانی لە داو و دەهۆی ئێرانی دووربکەوێتەوە، ئەویش بە دامەزراندنی دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمی لە کوردستان و، بەعسیش بەوکارە ڕازیبوو، بە. لام بارزانی ڕەتیکردەوە.
ئەوجا باسی هەوڵەکانی شیوعییانی کرد لە ١٩٧٠بۆ چارەسەری ئاشتییانەی کێشەی کورد دۆخەکەیان بە چ ئاقارێکدا بردووە و بۆ فراوانکردنی ئیئتیلافی حکوومی و بەرەی نیشتمانی لە ١٩٧٣ چییان کردووە و، گوتی: ئێ لەوەی دڵنیاین پێگەیشتنی سیاسیی حیزبی سیوعی دەبێتە دەستەبەری ئەوەی بەسەر ئاستەنگەکاندا زاڵبن و بەسەر کۆسپ و تەگەرەکاندا تێپەڕن و لە وڵاتدا ڕێی ئاشتییانەی پێشکەوتن بگرنەبەر دووبارە بەخێرهاتنی کردم .
سوپاسی ئەو دیدارە و ئەو گفتوگۆ هاوڕییە ڕاشکاوە و ئەو پێشوازی و میوانداریییەی هەنگاریام کرد و بەگەرمی ماڵئاوایی لێکردم.

## نامەی گەرم لەگەڵ بەکر:

باو بوو هەندێ ئاهەنگی هەندێ بۆنە لەژێر سەرپەرشتیی سەرۆککۆماردا بکرێ، بەزۆرییش عیزەت دووری یان تاها یاسین ڕەمەزان یانخەڵکی دی لەجێی سەرۆک ئامادەدەبوون و، بەزۆرییش وەزیرەکان لەو جۆرە ئاهەنگانە بەشدار نەدەبوون.

وارێککەوت لە نیسانی ١٩٧٦ئاهەنگێک بۆ ئاهەنگی وەرزشیی کۆلێژی سەربازی کرا، داوەتنامەیەکم پێگەیی تا ئامادەبم، دەسکەوتە ڕۆژی هەینی. ئیدی نەچوومە ئاهەنگەکە.

ڕرۆژی دواترێ، وەک وەزیرەکانی دیکە و سەرکردەکانی حیزبی بەعس، ئەو نامەیەی خوارەوەم گەیشتە دەستێ و هەڵجوون و تانە و تەشەری تێدابوو.

لە نامەکەدا هاتبووو؛

بۆ دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانیی بەڕێز

سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکاتی خواتان لێبێ

دوێنی هەینی، لە ١٦ی نیسانی ١٩٧٦، کۆلێژی سەربازی وەک نەریتی خۆی، لە دامەزراندنییەوە لە سەردەمی مەلەکی هەتا ئێستا، ئاهەنگی وەرزشیی سالانەی خۆی گێڕا. ئەو کۆلێژەش هەر بەڕاستی دامەزراوەیەکە دەبێ شانازیی پێوە بکرێ چونکە هەندێ سەرکردەی بەرهەمهێناوە کە بەڕاستی جێی شانازیی گەلی عێراقن. ئەو کۆلێژە، هەموو ساڵێک، دوو بۆنەی هەیە کە پێیان دڵخۆش دەبێ، یەکیان ئاهەنگە وەرزشییە سالانەکەیەتی و، دووەمیان ڕۆژی دەرچوونی دەستەیەک لە ڕۆڵەکانییەتی تا بیانداتە سوپا بەدەست و مستەکەمان و شکۆمەندترین پیشە بکەن. هەر بۆ زانین، قوتابییانی بەشداری ئەو بۆنەیە "٢٤٧٧" قوتابی بوون و ئەوەش، لەوەتەی لە ١٩٢٤ دامەزراوە تا ئەوڕۆ، بەرزترین ژمارەیە تییدا خوێندبێتی. ژمارەیەکی وەک ئەو ژمارەیە هیی ئەوەیە ئاهەنگی بۆ بگێڕی و لە بۆنەکانیدا بەشداربی.

برایان... کە گەیشتمە ئەوێ و جوومە سەر سەکۆی سڵاکردن کەسم لە دەورەی خۆم نەدیت، نە لە سەرکردەکانی حیزب و نە لە ئەندامانی حکوومەت، لە عوبەیدوڵڵا بارزانیی برا بترازێ، خوا نموونەی زۆرکا، لەهەموویشی خراپتر ئەوەبوو ئاهەنگەکە ڕاستەوخۆ لە تەلەفزیۆن دەگوازرایەوە و، جا ئەوکاتەی هاوولاتی لە ماڵەکەیدا لەبەردەم تەلەفزیۆن دانیشتووە و دەبینێ سەرۆکی دەوڵەت بەتەنیا لەو سەکۆ پانەدا دانیشتووە و یەک کەس لە سەرکردەکانی حیزب و ئەندامانی حکوومەت لەو خۆشییەی لەگەڵی بەسدار نین و بەدەم داوەتەکەوە نەهاتوون، پێموانییە ئەوەی لە زەینی دەگوزەرا لای ئێوە شاراوەبێ و نەزانن چییە. ئیدی سەرەتس سەرم سوڕما، لە فەرماندەی کۆلێژم پرسی، سەرسام بووم

که بلیتەکان هەموویان دابەشکراون، ئەو کاتە سەرسوڕمانەکەم نەما و قسەی ساعیرم بیرکەوتەوە:
تکاکارت، ئەوەی مێزەر بەسەربێ....کوا وەک ئەوەش کە پێستی خۆی لەبەربێ[55]
دەساڵی تەواو و بۆ پسانەوە لەگەڵ کۆلێژی سەربازی بووم، ئەگەر خولەکانی یەدەگ و پێک ژیانی "اعاشة"ی بخەینەسەر، هەموو ساڵێک خولێک یان دوانی دەردەچواند. هەمو ساڵێکیش وەسیی تەخت و ئەندامانی حکوومەت "خوا لێیان خۆشبێ"، تا دەسەلاتیان لە عێراق تەواوبوو، هەموویان ئامادەدەبوون و، بگرە ئاهەنگی شێوخواردن و راوە ڕێوییشیان دەکرد. واباسترە بەراوردێک لە نێوان من و عەبولئیلا بکرێ و، دەڵێم من ئەحمەدم و ڕەچەڵەکم ڕاستترە و دروستتر پەیوەستی فاتیمەی کچی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلام، کە لەگێڕانەوەیەکدا گومان لە ڕەچەڵەکی عەبدولئیلا دەکرێ.
من لەوی بە بازووترم و سەربردەم پتەوترە و خەباتکارترم و لە خزمەتی ئەوگەلەش ڕاستگۆترم.
من لەسەر ڕێچکە و بەها عەرەبی ئیسلامییەکان پەروەردەکراوم و ئەو لە باوەشی جوکی مەنفی[56] و دارودەستەکەی پەروەردەبووە.
من حیزب بۆ ئەو پێگەیەی بەرزکردوومەوە و ئەو بەریتانییەکان بردبوویانە ئەو پێگەیە.
لێتان ناشارمەوە، ئەو کاتەی بە تەنیا لەو ئاهەنگە دانیشتبووم و،دەمویست بزانم بۆ هەمووان نەهاتوون، لە دلی خۆمدا چیم دەگوت. ئیدی یەک لەو دووەم بەبیردا هات: یان فەیرۆزی گۆرانیبێژ و هاوشێوەکانی لە کۆلێژ بەردڵترن و پتر جێی گرنگین" کە من خۆم هەموو دیار و نادیارێک دەزانم و ئاگام لێیەتی".
یانیش ئەوەی لە ئاهەنگەکەبوو لاژێر چاودێریی ئەو بەڕێوەدەچوو شایانی ئەوەی نییە لە تەنیشتی دانیشن.
نامەکە واژووی بەکری پێوەبوو ڕێکەوتی ١ی نیسانی ١٩٧٦.
خوێنەری بەڕێز دەبینێ کە نامەکە ناوی هەریەکەمانی لەسەرە، ئەگەر گشتگیرکرابا کارەکە ئاسان بوو و ئەوەی گوێی لە فەیروز ڕانەگرتبا نامەکە نەیدەگرتەوە. بەڵام ئەوەی ژیانی هەمووی خۆشی بووە و ئەوەی ژیانی لە ئازار و ڕیی تێکۆشان بەسەربردبوو یەکسان کرابوون، ئەوەش نابێ بێدەنگەی لێ بکرێ، جا بۆ بەرگری لە شکۆی خۆم مێژووی

---

[55] ـ دێڕە عارەبییەکەی دەڵێ: ليس الشفيع الذي يأتيك متزرا مثل الذي يأتيك عريانا..... پێم جوان بوو بە شیعر بیکەمە کوردی"ل-ب"
[56] ـ جووکی مەنفی: لە سەردەمی مەلەکی ناوی کەسایەتییەک نلاو ببووەوە بە "جووکی مەنفی" ناسرابوو و کەسێک بوو سواری ئەسپی پێشبڕکێی ئەس سواری دەبوو کە هەندێ خەلک گرەویان لەسەر بردنەوەی دەکرد.

تێکۆشـــانم بڕیارمدا وەڵامی بدەمەوە، جا هر لەو ڕۆژی نامەکەم گەیشـــتە دەســـتێ ئەو نامەیەم بۆ سرۆککۆمار نووسی:

نهێنی و تایبەت

بەڕێز سەرۆککۆماری قەدرگران

سڵاوێکی بێگەرد....زۆر بە داخ و پەژارەوە نامەکەی ئێوەم لە ١٧ی نیسانی ١٩٧٦ بەدەست گەیی و، دەشبێ لەگەل بەڕێزتان سەرڕاست بین و هەموو مافێکتان بدەینێ سەبارەت بە هەســـتی دوێنێتان کە بەتەنیا ئامادەی ڕۆژی ئاهەنگی وەرزشـــیی ســـالانەی کۆلێژی ســـەربازی ببوون، کە شـــانازیی ئێمەش بەو کۆلێژەوە هیچی لە شـــانازیی ئێوەی بەڕێز کەمتر نییە.

من هەمیشـــە لە بۆنەی ئاوای کۆلێژ ئامادەبوویمە، بەڵام دوێنی لەبەر دوو هۆ نەمتوانی ئامادەبم، ئەو کارتی داوەتەی لە نووسینگەکەم گەیستە دەستم بێ ناو و ناونیسانی من بوو و خرابووە زەرفێکیش هیچی لەســـەر نەنووســـرابوو و، منیش ئەگەر وەزیریش نەبم لەو دەوڵەتەدا، موکەڕەم تالەبانیم، دووەمیان، جارێک لە ئاهەنگێکی دەرچووانی کۆلێژی سەربازی ئامادەبووم و، دڵخۆشبووم کە بانگکرام تا خەڵات بەسەر قوتابییە زیرەکەکاندا دابەس بکەم، بەڵام ئەوەی ســـەیربوو ئەوەبوو کە لیوای خانەنشـین عومەر عەلی و لیوای خانەنشـــین عادل ئەحمەد ڕاغبیش بۆ هەمان مەبەســـت بانگکران، کە ئەو دووە کاتێ سەرکردەی فیرقەبوون، دژی شۆڕشی ١٤ی تەمموززی ١٩٥٨ ڕاوەستان. جا ئەگەر پلەی ســـەربازی، نەک باوەڕی نیســـتمانی و دڵســـۆزی بۆ گەل پێوەری ڕێز و قەدرگرتنێ بن، دەبووایە ئەفســـەرە ئازادیخوازەکان ڕۆژی شـــۆڕش بۆ عەبولئیلا بچەمێنەوە، جونکە ئەو پلەی سەربازیی گەورەتربوو.

سەرۆکی بەڕێز... خۆت دەزانی ئێمە سەردەمی گەنجیمان لەکوی بەسەربرد، لە باوەشی خانمە هونەرمەندانمان بەســـەر نەبرد، نالەی ڕۆلە ئازارچەستەکانی گەلەکەمان وایلێکردین ئاگامان لە دەنگی فەیرۆز هیی دیکەش نەمێنێ، بێدەنگ نەبووین، هەموو شـــتێکمان کردە قوربانی، ئەو هەموو ســـالانەمان لە کونجی زیندانا بەســـەربرد، ئەو هاوڕێیانەی لە ئێمە ئازاتربوون جوونە سـەر داری سێدارە. ئیدی سـەرۆکی بەڕێز بەو جۆرە دەزانن مێژووی تێکۆشـــانمان ئەگەر لە ئێوە پتر نەبی کەمتر نییە، نە ئێمە لە هامێزی خانمە هونەرەندان پەروەردەبووین و نە ئێوەش لە باوەشـــی مەنفی پەروەردەبوون، ئەو قســـانەی لە ئێوەرا هاتووە هیی ئەوەی نییە ســـەرۆک دەوڵەتیک بیکا کە لە ڕیزی تیکۆشـــەران بووە و نابێ ئاراســـتەی کەســـانێکیش بکری ژیانی خۆیان بۆ بەرگری کردن لە گەل تەرخانکردووە و، خۆیان و کەسوکاریان چەندین دەیە لە مەترسیدا بووینە و ئەوەیان لای ئێمە قابیلی قبووڵ

نییە و تەواو ڕەتیدەکەینەوە لەکەســـی قبووڵ ناکەین لە هەر پۆســـتێکدا بی، جا تکایە بیکێشنەوە و سلاوم قبووڵ بفەرموون.
سەرکردایەتیی حیزب، دوای ئەوەی بۆ سەرۆککۆماری بەڕێزم هەنارد، نموونەیەکی ئەو نامەیەیان دیت. ڕایان وابوو بێدەنگەی لێ بکەم و وەڵامی نەدەمەوە جونکە ئەو مەبەســتی هـاوڕییەکـانی خۆی بووە، بەلام نـامەکـان بە نـاو بۆ **ئێمە** هـاتبوون، بێـدرنگیش مـانـای قبوولکردنی ئەو هەموو تـانووتە بوو، کە هـاوڕێ عەزیز محەممەدیش لێپرســـیم داخوا دوای ئەو وەڵامە توندە پێشبینیی ج دەکەم؟ گوتم: سەعات دوو لە ڕێگا ڕادیۆم کردەوە تا گوێم لە مەرســـوومی لەکارلادانم بێ لە وەزارەت، بەلام ئەوە ڕووی نەدا، هاوڕێ ڕەحیم عەجینە گوتی: هاوڕێ موکەڕەم هەر لە بەراییرا ڕایهێناون کە هیچ قســـەیەکی زبریان لێ قبووڵ ناکا و، ئەوانیش ڕاهاتوون گوێیان لەو جۆرە وەڵامانەی بێ.
دوای چەند ڕۆژێک، ســـەرۆک بەکر لەگەڵ وەزیری نەوت و بازرگانی بانگی کردین تا ســـەبارەت بەو بابەتانەی ڕەنگە ســـەرۆکی تورکیای ئەودەمی ســـەردانی عێراقی کردبوو، بیوروژێنێ، پێش پرسوڕایان سەرۆک ئاوڕێکی لێدامەوە و گوتی: با بابەتی شـەڕەکەمان بۆ کاتێکی دی بێ. گوتم: ئەگەر بەرگری لە شکۆمەندی پێویستی بە شەڕ بێ، ترسنۆکییە ئەگەر نەیکەی. گوتی: مەبەســـتم تۆ نەبوو. بەگاڵتەوە گوتم: دەزانم، مەبەســـت حیکمەت عەزاوی بوو. حیکمەت گوتی: ســـەرۆکی بەڕێز، من لە مەغریب بووم و هیچ لەبـارەی بابەتەکەوە نازانم. ئەوجا سەرۆک، سەبارەت بەو قسانەی بەرانبەرە منی کردبوون، داوای لێبووردنی کرد.

## داوای لەسێدارەنەدانی کەسێک لای سەرۆک بەکر:

شـــەوێکیان، کۆمەڵێ ســـــەرۆک عەشـــیرەتی جاف و خانەوادەکانیان لەدەرگایان دام. شپرزەییەکی زۆریان بەڕووانەوە دیاربوو و گوتیان: خۆمان خستووەتە ماڵەکەت تا ژیانی کوڕەکەمان ڕزگار بکەی. ســـەڵحی کوڕی عەبدولڕەحمان بەگ حوکمی ســـێدارەی بۆ دەرچووە و پێیان گوتووین ســـبەی ســـەعات حەوتی ئێواری لەداری دەدەن. دەرگام بۆ کردنەوە و هێورم کردنەوە و، گوتم ناکرێ بەو سەعاتەی شەوێ لەدەرگای سەرۆککۆمار بدەم و لە خەوێی ڕاســـتکەمەوە، وەک دەڵێن بەیانی خوا کەریمە. مادام کارەکە ســـبەی بەیانی نییە هەر ئەوەندەی بێتە کۆشکی کۆماری داوای دیداری سەرۆکی بەڕێز دەکەم و داوای بەزەیی لێ دەکەم تا لێیببووری. تۆزێ هێوربوونەوە و جا جوونەوە ماڵەکانیان.

بەیانیی ڕۆژی دواتری چوومە دیداری ســـەرۆک بەکر، ســـەروبەری شـــەوێ دینێم بۆ گێڕایەوە و، گوتم: سـەرۆکی بەڕێز، ئەو کوڕە لەناو کۆمەڵگا بەهایەکی ئەوتۆی نییە، بەڵام سـەر بە خانەوادەیەکی گەورەی سـەرۆکەکانی عەشـیرەتی جافە. ئەگەر لەسـێدارەی بدەن ئەوان هیچیان لێ کەمنابێتەوە و ئەگەر بیبوورن ئەوا دڵی ســـەدان کەس لەوانە بۆلای خۆتـان رادەکێشـــن و چاکەتـان لەبیرناکەن. گوتی: گوتی بـاوابێ، مـادام تۆداوا دەکەی لێیدەبوورین، ئەوجا داوای یەحیا یاسینی سـەرۆکی دیوانی کرد و سووسـەی دایە هەواڵ بـداتە بەڕێوەبەرایەتیی بەنـدیخـانە جێبەجێکردنی حوکمەکە ڕاگرن و کۆتوبەنـدەکەی بکەنەوە، تا مەرســـوومی لێبووردنەکەیان دەگاتێ. ئەوجا گوتم: بەناوی ئێوەوە مژدەیان بدەمێ؟ گوتی: بەڵێ. سوپاسم کرد و ڕوخسەتم خواست.

مەســـەلەی دەرکردنی مەرســـوومەکە چەند مانگان هەروا مایەوە، ئەوجا خانەوادەکەی لەهیکرا زانییان بێ ئەوەی ڕێیان بدەن بیبینن فەرمانی لەداردانەکە جێبەجێ کراوە. زۆر لەو هەڵســوکەوتە توورەبووم، لەســـەر ســـەفەری دیمەشـقیش بووم بۆ چارەســـەرکردنی کێشـــەی ئاوی فورات، کەچی هەواڵم بۆ هات شـێخ تالیب تاڵەبانیی کوڕ میمکم و ژنەکەی فەرمانی لەســـێدارەدانیان بۆ دەرچووە، چونکە تاڵەبانی تەقەمەنیی بۆ ژنەکەی ناردووە لە کەرکووک و، پێشمەرگە ئەو تەقەمەنییانەیان لە تەقاندنەوەی بۆڕیی نەوت بەکارهێناوە.

لە سەفەرێ بەپەلەبووم و لەبەر ڕووداوی لەداردانی سەلاحیش لە سەرۆککۆماریش دڵگیر ببووم، ئیدی بەڕێز عیزەت دووریم ڕاسپارد کێشـەکەیان بخاتە بەردەم سـەرۆک و داوای لێبووردنیان بۆ بکا.

ئێوارەی ڕۆژی دواتری لە دیمەشق هاتمەوە تا تا پرسـورا لەگەڵ سـەرۆککۆمار و سـەدام حوسـێنی جێگری ئەنجوومەنی سـەرکردایەتیی شـۆڕش بکەم. چوومە کۆشـکی کۆماری، ســـەرۆککۆمار و ســـەدام حوســـێن و عیزەت دووری لەوێبوون. لە عیزەتم پرســـی داخوا

کێشـــەی کوڕە میمنکەکەم و ژنەکەی بە ســـەرۆک ڕاگەیاندووە؟ گوتی: نە بەخوا لەبیرم چووە. ئەو فەرمانی لەداردانانەی لەو دادگا تایبەتانەوە دەردەچوون کە لە کوردستان دژی کوردان پێکهێنرابوون پێویســـتیان بە ڕەزامەندیی ســـەرۆککۆمار نەبوو، بەڵکو کەی بیانویســـتایە جێبەجێیان دەکردن. گوتم من پشـــتم بە تۆ بەســـتا، ڕەنگە ئێســـتا لەسـێدارە درابن. ســـەرۆک گوێی لێمان بوو و گوتی: چتان لەبەینێیە؟ عیزەت گوتی: ڕایســـپاردبووم تکـا لە ئێوە بکەم لە کوڕە میمکەکەی و ژنەکەی ببوورن کە لە کەرکووک فەرمـانی لەســـێدارەدانیان بۆ دەرچووە و، منیش لەبیرم چووبوو. بەکری ڕووی قســـانی لەمن بوو گوتی: بـاشـــە بۆ بەخۆت پێتنەگوتم؟ گوتم: من زویرم. گوتی بۆ؟ گوتم:کە من بەڵێنی لێبووردنی کوڕەکەیانم بە خانەوادەی جافان دا، بەناوی ســـەرۆکەوە بەڵێنم دانێ نەک بەناوی خۆم، ســـەرباری بەڵێنەکەشـــتان هەر لەســـێدارە درا، جا پێمبڵێن ئەگەر بەتەمان کوڕەمیمکەکەم و ژنەکەی لەســـێدارە بدەن ئەوا ئێســـتا من دەچمەوە دیمەشـــق و پەنا بۆ حافز ئەســـەد دەبەم و، نایەمەوە، ئێســـتا خەڵک چیم پێدەڵێن، دەڵێن ناتوانێ تەنانەت خزمەکانیشـــی بپارێزێ چ جای خەڵکەکە. گوتی: هەقی خۆتە و کارەکە بێ ئاگاداریی من کراوە، جونکە ئەو بابەتانە پەیوەندیی بە هاوڕێ سەدامەوە هەیە، ئەوجا ئاوڕی لە سەدام دایەوە و گوتی: براکەم دەهەڵسە، قسە لەگەل بەرپرسـانی کەرکووک بکە با بەریان بدەن و بیاننێرنەوە ماڵەکەیان. ئیدی سەدام هەستا و فەرمانی دانێ یەکسەر بەرەڵایان بکەن و بەردران. دواترێ دەرکەوت، بـارزانی کۆمەڵێ ســـەربـازی عێراقیی بەدیلی لەلابووە و ڕادەستی دەسەڵاتی ئێرانی کردبوون، ئەوەش وای لە سەدام کردبوو هەموو ئەو کوردانە لو سێدارە بدا کە فەرمانی لەسێدارەدانیان هەبووە.

## عیزەت دووری بووەهۆی گواستنەوەم بۆ وەزارەتی گواستنەوە:

کە لە یەکەم ڕۆژی تشـــرینی یەکەمی ١٩٦٨ بڕیاری بردنەوە ســـەرکاری شـــیوعییەکان دەرچوو تا دەســـت بە فەرامنەکانایان بکەنەوە، منیش بە ناونیشـــانی پێشـــتریم، بوومەوە پشـــکنەری گشـــتی لە وەزارەتی چاکســـازیی کشـــتوکاڵی و، ئەودەمای جاســـم عەزاویی ســـکرتێری پێشـــتریی عەبولکەریم قاســـم، وەزیربوو و، چونکە کۆنترین فەرمانبەری ئەو وەزارەتەبووم، داوای لێکردم گەڕانێـک بە هەموو لایەکی عێراقـدا بکەم و ڕاپۆرتێـک سەبارەت بە پرۆژە کستوکاڵییەکان و کارەکانی چاکسازیی کشتوکاڵی **پێشکەش** بکەم، چ کراوە و چییش دەبێ بکرێ. ئەو کـارەم، بە هـاوکـاریی ئەنـدازیـار و هونەرییەکـانی هەر پـارێزگـایەک، کرد. پرۆژەی "مەغیس"ی عیزەت دووری بە "عەمەلە شـــەعبی" جێبەجێی دەکرد تا عەشـیرەتێک لەوێ نیشـتەجێ بکا، یەک لە پرۆژەکان بوو. ڕای ئەندازیارەکانیش وابو ئەو پرۆژەیە لەڕووی هونەرییەوە باش لێنەکۆڵراوەتەوە و سەرناگرێ، جونکە دوای دوو ساڵ کشتوکاڵ دەبێتە "شۆرەکات" وخوێ دایدەپۆشێ و ئەودەمی ئەستەمە دەزگای داشۆرینی بۆ دابندرێ تا خوێ شۆری بکا. ئەوەم لە ڕاپۆرتێکدا تۆمارکرد و داوای ڕاگرتن و لێکۆڵینەوەی ئەو پرۆژەیەم کرد و، ئەوجـا جێبەجێ بکرێ. ئەوە عیزەت دووریی تووڕەکرد، ئیدی پەیوەندیی نێوانمان ئەوەندە دۆستانە نەبوو، سەرباررری ئەوەی سەرۆک بەکرد جەند جارێک هەوڵیدا ئاســتمان بکاتەوە، کەجی تاکۆتاییس ئەو ســاردییەی بەینمان هەر مابوو.

کە دەستی بە پرۆژەی ئاودێریی کەرکووک کرد و، ئەو پرۆژەیە "٤٥٠"هەزار دۆنم زەویی پارێزگای کەرکووکی ئاودەدا، پرۆژەکەم خستە بەردەمی ئەنجوومەنی کشـتوکاڵیی باڵا و، عیزەت دووری سەرۆکی ئەنجوومەنەکە بوو، داوام کرد پرۆژەکە بە قۆناغ جێبەجێ بکرێ، قۆنـاغی یەکەم ئـاو بگەیەنـدرێتە ئەو نـاوچـانەی ئێســـتـا بە دیمەکـار داچێنـدراون تـا جووتیارەکان لەو جێگیر ببن کە دایانچاندووە. ئەوەش بۆ حکوومەتی بەعس مانای وابوو جووتیارە کورد و تورکمانەکانی عەشـیرەتی بەیات لەسـەر زەوی و لە گوندەکانی خۆیان بمێننەوە، بەڵام بەرنامە و ڕێچکەی بەعس بەحەرەبکردنی کەرکووک بوو و ڕاگواســـتنی کورد و تورکمان و نیشتەجێکردنی عارەب لە کەرکووک.

عیزەت دووری ڕاپۆرتێکی نووســـیبوو گوایە موکەڕەم تـاڵەبـانیی وەزیری ئـاودێری بەئەنقەســت پاشـەلی لە جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیە دەکا و دەزانێ نیەتمان وایە ناوجەکە بکەینە عارەب. ئیدی داوای کردبوو بمگوازنەوە وەزارەتێکی دی و بەڕاســـتییش لەهێکرا

دیتم، لە ١٢ی تشرینی دووەمی ١٩٧٧، گواستراومەتەوە وەزارەت گەیاندن تا جێی عەزیز عەقراوی بگرمەوە.[57]

دوای ئەوەی گواسترامەوە وەزارەتی گواستنەوە، پرۆژەکەی ئاودێریی کەرکووک جێبەجێکرا و، گرێبەستەکانی جووتیارە کوردەکان بۆ ئەو زەوییانە کرابوون کە لەدێرزەمانەوە دایاندەچاندن هەڵوەشێنرانەوە تا بیاندەنە ئەو عارەبانەی لە باشووری عێراقرا هێنابوویانن.

ئەوجا بڕیارێک لە ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش دەرچوو، تێیدا هاتبوو یەکەمجار تورکمانەکان و دواتریش کوردەکان لە کەرکوکەوە بگوازنەوە پارێزگای ئەنبار، بەڵام هەڵگیرسانی شەڕی عێراق-ئێران لە ١٩٨٠ لێنەگەرا ئەو پلانە جێبەجێ بکرێ ، کەچیکردارەکانی ئەنفال و وێرانکردنی گوندەکان ناوچە کوردییەکانی گرتەوە.

لە وەزارەتی گەیاندن، کە ویستم هێڵی شەمەندەفەری بەغدا – کەرکووک – هەولێر – موسڵ ڕاکێشم و لە کەرکووکیش لقێک ببەمە سلێمانی، حکوومەت بە بیانگەی بێ پارەییراکێشانی ئەو هێڵەی ڕاگرت، لەکاتێکدا هێلی بەغدا – قائیم جێبەجێ کرا.

جێبەجێکردنی میترۆی بەغداس ڕاگیرا. سەدام حوسین داوایکردبوو دووبارە لێیبکۆڵرێتەوە و هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێ تا بۆئەوەی بگونجێ بکرێتە پەناگەیەکی هێرشی ئەتۆمی.

ئەوەندەی لە وەزارەتی گواستنوە بووم، پرۆژەیەکی گرنگم جێبەجێ کرد ئەویش پرۆژەی گواستنەوەی ڕیبوارانی نێوان پارێزگاکان بوو. پرۆژەیەکی سەرکەوتووش بوو، بەلام، لە شەری دژی ئێراندا، بۆ گواستنەوەی هێزە سەربازییەکان بەکارهێنرا و ئەو پرۆژەیەش وەلانرا.

[57] _عەزیز عەقراوی: لە ١٩٢٤ لەدایکبووە، لە ١٩٤٣ جووەتە کۆلێژی سەربازی و، دوایەش لە ١٩٥٤ چووەتە کۆلێژی ئەرکان. ئەوجا چووە ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و، بووە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی ئەو حیزبە، لە ١٩٧٠ لە حکوومەتی بەعس بووە وەزیری دەوڵەت، ئەوجا بە ڕێنمایی بەعس، بە ئامانجی لاوازکردنی بزووتنەوەی کورد، حیزبێکی بە ناوی پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزراند، دوایە جووە ریزەکانی حیزبی سۆشیالیستی یەکگرتوو و، لە ئایاری ١٩٨١ بووە ئەندامی مەکتەبی سیاسی، دوای ماوەیەکی کورت وازی لە حیزب هێنا و چووە لوبنان. لە ١٩٩٨ کۆچی دوایی کرد. للمزید حان لطیف کاظم الزبیدی، المصدر السابق، ص٤٢١.

## سەردانەکەی وەزیری گواستنەوەی بەریتانیا:

کە لە ناوەراستەکانی تشرینی دووەم وەزیری گواستنەوە بووم، باڵیۆزی بەریتانیا لە بەغدا، هاتەسەردانم. پێیگوتم بەڕێز جۆن هۆرامی وەزیری گواستنەوەی بەریتانی، کە سەر بە پارتی کرێکارانە، سبەی سەردانی بەغدا دەکا و، منەتبار دەبێ ئەگەر بەشێک لە کاتی خۆتانی بۆ تەرخان بکەن و رازین لە دیوانی وەزارەت سەردانتان بکا. وەزارەتەکەی ئێما داوەتنامەی بۆ وەزیرە بەریتانییەکە نەناردبوو تا سەردانێکی فەرمیی عێراق بکا، لەگەڵ ئەوەسدا بە باڵیۆزم گوت من بۆخۆم لە فڕۆکەخانە پێشوازیی لێدەکەم و وەزارەتەکەیسم میوانداریی دەکا و بۆ ڕێزی ئەویش ئێوارەخوانێک دەکەم و لە وەزارەت پێشوازیی لێ دەکەم، باڵیۆزی لە بەرانبەر ئەو گرنگیپێدانەم زۆری سوپاس کردم.
ڕۆژی دواتریّ لە فڕۆکەخانە پێشوازیم لێکرد. گەنجێکی زیرەکی قسەزان بوو، زانیشم سەردانەکەی لەسەرداوای "کۆمپانیای ویمپیی بەریتانی بوو" کە کۆمپانیایەکی بەڵێندەرایەتیی تاایبەتمەندی بنیاتنانی دەزگای گواستنەوەیە"ڕێی ئۆتۆمۆبیل، هێڵی ئاسن، دروستکردنی فڕۆکەخانە". کۆمپانیای ناوبراویش تەندەرێکی دامەزراندنی هێڵی ئانی بەغدا – قایمی پێشکەش کردبوو و، پرۆژەکەش نوێ بوو و شارۆچکەی قائیمی نزیک سنووری سوریای بە بەغداوە دەبەستەوە و، بڕیاریش وابوو سوریا ئەو شارۆچکەیەی بە تۆڕی هێڵی ئاسنی خۆی ببەستێتەوە و، شەمەندەفەرەکان ئەو پەینە فۆسفاتییەی لە " عوکاشات" دەردەهێندرا ببەنە قائیم، کە لەوێ لە کارگەی کیمیاویی بۆ ئەو مەبەستە بنیاتنرابوو خەستدەکرایەوە و دەنێردرایە شارەکانی عێراق و لەڕێی سوریاشەوە ڕەوانەی دەرەوە دەکرا.
بە وەزیرە بەریتانییەکەم گوت ئێمە لە عێراق زانیاری و بۆچوونی جاکمان لەسەر کۆمپانیای ویمپیی بەڵێندەریی بنیاتنان هەیە، جونکە پێشتری ژمارەیەک پرۆژەی لای ئێمە جێبەجێ کردووە، بەلام هەر ولاتە و یاسا و ڕێوشوێنی خۆی هەیە و وەزیر ناتوانێ بەسەریاندا باز بدا. بەلام ئەگەر لە دیاریکردنی تێچووی جێبەجێکردنی پرۆژەکەدا ئەو کۆمپانیایە لەگەڵ کۆمپانیاکانی دیکەدا هاوتابوون، ئەوا وەزیر دەتوانێ لەناو کۆمپانیایان ئەو کۆمپانیایەی هەڵبژێرێ کە پێشتریّ پرۆژەی هاوشێوەی بەشێوەیەکی بەردڵ لە عێراق جێبەجێ کردووە.
ئێوارەکەیشی خوانێکی شێوم لە هۆتێلێک بۆ ئامادەکرد کە ژارەیەک بەرپرسی هەردوولا ئامادەی ببوون لەوانەش باڵیۆزی بەریتانیا لە بەغدا.
باڵیۆزی بەریتانی، بە بۆنەی هاتنی وەزیری بەریتانی، ئێوارەخوانێکی لە ماڵەکەی بۆ ئامادەکردین و من خۆم لەگەڵ بەرپرسانی وەزارەت چوومە داوەتەکە.

که جۆن هۆرامی وەزیری بەریتانی گەرایەوە بەریتانیا، نامەیەکی ســـوپاســـگوزاریی سەبارەت بە جوان بەخێرهێنانی بۆ ناردبووم، تییدا هاتبوو: ئازیزم دکتۆر تالەبانیدڵخۆسم یەکەم هەلی گەڕانەوە لەندەنم بقۆزمەوە تا لە ناخەوە ســوپاســتان بکەم بۆ ئەو یارمەتیی کارەی لەسـەردانەکەمدا بەرانبەر من کردتان و سوودیشی هەبوو. من سوپاسی دیدار و میوانداریيەکەت دەکەمکە بۆ منتان ئامادەکرد و دووبارەس ســوپاســتان دەکەم، هیوادارم زۆری پێ نەچی بتوانم بە دیدارتان بگەمەوە تا دیسان لە ئاوی دیجلەی بخۆمەوە.

## دیدارێک لەگەڵ سەرۆکی ئەڵمانیای دیموکراتی:

ساڵی ١٩٧٨، کە وەزیری گواستنەوەبووم، داوەتنامەیەکی فەرمیم لە "کلایبەر"ی جێگری سەرۆکوەزیرانی کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتەوە بۆ هات تا ئامادەی پێشانگای بەهاریی لایزبک بم ، داوەتەکەم قبووڵکرد. لەو سەفەرەیدا پاشکۆی ئابووریی باڵیۆزخانەی کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتیی بەغدام لەگەڵ هات و، هاوڕێ کلایبەر لە هاتبووە پێشوازیم.

لە یەکەم ڕۆژی کردنەوەی پێشانگایەکە، لە بەشی عێراقی بووم و چاوەڕێی سەردانی ئەریش هۆنیکەری سەرۆکی کۆمار و سکرتێری گشتیی پارتی سۆشیالئستی ئەڵمانیای یەکگرتوومان دەکرد تا سەر لە بەشەکەمان بدا. کە لەناو بەشەکانیش دەسوورایەوە، بەڕێوەبەری پێشانگایەکە تکای لێکردین هیچ دیارییەک پێشکەشی سەرۆک نەکەین، چونکە ئەگەر لەهەر بەشێک دیارییەک وەرگرێ دەبێ لۆرییەکی بۆ باربکەین. گوتم تکادەکەم بە هاوڕێ هۆنیکەر بڵێی من یەکەمجارە بە دیداری دەگەم و، بۆئەوەی ئەو دیدارەس وەک یادگارییەک بمێنێتەوە دیارییەکی بچکۆلەی ڕەمزیی پێشکەش دەکەم، کە پێیشیان گوت، ڕەزامەندیی نیشاندابوو.

هاوڕێ هۆنیکەر سەردانی بەشی عێراقی کرد و سەیرێکی بەرهەمە پیشەسازییەکان ولێکدانی پارچەکانی سارنجۆک و تەلەفزیۆنی ڕەنگاوڕەنگ و بژێر و پایسکلی کرد، پێی جوان بوون، ئەوجا بۆ قاوەخواردنەوەیەک دانیشتین و سەر قسانمان سەبارەت پەیوەندیی هەردوو وڵات دامەزراند، ئەوجا دیارییەکی ڕەمزیم پێشکەش بە خۆی و "فلیچۆڤ"ی سەرۆکوەزیرانی کرد.

ئەگەرچی لە وەزارەتی ئاودێرییەوە چووبوومە وەزارەتی گواستنەوە، بەڵام کە زانییان شەش ساڵ وەک نوێنەری حیزبی شیوعی وەزیی ئاودێری بوویمە، ئیدی هەموو گرنگییەکیان هەر لەسەر بابەتی کشتوکاڵی و پرۆژە ئاودێرییە گەورەکانی عێراق بوو. سەیریشیان بەوەی دەهات، سەرباری ئەوەی ئەو وەزارەتەم بەجێهێشتووە، هەموو ئامارە وردەکانی کشتوکاڵ و بەکارهێنانی ئاو و بەرهەمهێنانی وزەی کارەبای بەنداوەکانم لەبەرە.

ئێوارەکەی، کلایبەر، ئاهەنگێکی شێوی بۆ ڕێزی شاندەکان ئامادەکرد. ئیدی چەندین سەعاتم لەگەڵ سەرۆکوەزیرانی ئەڵمانیای دیموکراتی بەسەر برد. سەبارەت بە کۆمەڵێ بابەتی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابوریی هەردوو وڵات قسەمان کرد. ئەوان دەسکەوتی بەرەی نیشتمانیی عێراقیان بەرز نرخاند، هانی ئەوەیان دەدایـن نەهێڵین درزی تێبکەوێ و پارێزگاریی لیبکەین جونکە بەری رەنجێکی دووروودرێژ و پڕ ماندووبوونە. ئەوان ئاگایشیان لە دەستپێشخەرییەکانی بەرایی و بەشدارییە بێ پسانەوەکانم بوو بۆ

سەرخستنی گرێدانی بەرە لە عێراق. ئیدی داوایان دەکرد کار بۆ پاراستن وفراوانکردنی بکەم بە جۆرێک، سەرباری پێکدادانی چەکداریش، پارتی دیموکراتی کوردستانیش بگرێتەوە جونکە بەرە باشترین جێیە بۆ چارەسەری هەموو کێشەکان.

## دیدارێک لەگەڵ سەرۆکوەزیرانی ئوردونی:

بۆ بەدەمەوەچوونی داوەتی عەلی شـحێماتی وەزیری گواسـتنەوەی ئوردونی، لە بەهاری ١٩٧٨ سـەردانی ئوردونم کرد. لر فڕۆکەخانە خۆی محەممەد دەباسـی وەزیری دارایی پێشـوازییان لێ کردم. لەبەر غافڵکۆژکردنی یوسـفی وەزیری راگەیاندنی میسـری و سکرتێری رێکخراو هاریکاریی ئاسیا- ئەفریقییش، پاسەوانییەکی توندیان بۆ دانابووم و ئەفسـەرێکی بە پلەی رائیدی سـەر بە پاسـەوانیی مەلەکی و ئەفسـەرێکی پۆلیس و ئەفسەرێکی ئاسایشی گشتیم بوونە یاوەر.

بەیانیی رۆژی دواتریدیدارێکم لەگەل هەردوو وەیر محەممەد دەباس و عەلی شـحێمات سـازدا، قسـەو باس لەسـەر تەواوکردنی رێگای خێرای "رێی عەقەبە – عەممان" بوو، کە بەقەرزێکی عێراق دابووی دروسـت دەکرا. جا ئوردونییەکان وازیان لەوەی بوو تەواوی بکەن و هەتا سنووری عێراقی بهێنن و، چاویشیان لەوەی بوو ئەو قەرزەی هەشت ملیۆن دیناربوو برێکیان بۆ زیاد بکرێ.

رۆژی دواترێ، سەبارەت بەو یارمەتییانەی عێراق پێشکەشی ئوردونی کردووە، دیدارێکی تەلەفزیۆنی ئەردنم لەگەڵ کرا و،باسـی ئەو یارمەتییە سـەربازییانەم کرد کە عێراق لە ١٩٧٣ پێشکەشی ئوردونی کردبوو و ئەو هێزە عێراقییەیشی کە لە ئوردون دامەزرابوو تا بەر بە هەر هێرشێکی ئیسرائیلیی چاوەڕوان نەکراو بگرێ و، باسی ئەو یارمەتییانەیشم کرد کە لە جێبەجێکردنی جەنـدین پرۆژەی ئـابووری و خزمەتگوزاریی ئوردون بەکارهێنراون.

رۆژی سێیەمی سەردانەکەم چووینە سەردانی بەندەری عەقەبە تا چاومان بە بەڕێوەبردن و رێکخستنی بەندەرەکە بکەوێ، چووین سەیری ناوچەی گومرگیی ئازادی ئەوێش بکەین کە بەنیازبوون بەشـێکی بە کرێ بدەنە عێراق. رۆژی دواترێ بە ئۆتۆمۆبیل گەراینەوە عەممان و بەلای سـاری مێژوویی کۆنی بەترادا تێپەڕیین کە سـەلاحەدین لە شـەڕی دژی خاچپەرسـتاندا کردبوویە بارەگای خۆی. سـەڵاحەدینیش رێزێکی تایبەتی لای بەرپرسـانی ئوردونی هەبوو و پێچەوانەی سـوورياییەکانی بگرە گۆڕەکەیشـیا پشـتگوێ خسـتبوو، کە پرسـییشـم سـەلاحەدین جۆن توانیبووی ئەو جێیە قایمە لە چنگی خاچپەرسـتان دەرێنێ و بیکاتە بارەگای خۆی، عەلی شـحێمات گوتی: تەنێ کوردەکان دەتوانن ئەو جێیە داگیر بکەن.

ئێوارەی رۆژی دواترێ، لە سەر پردی "لینبی"ی دەکەویتە سەر رووباری ئوردونی خاکی ئوردون و فەلەسـتینی داگیرکراو لێکدەکاتەوە، سـەرمان لە بەرەی پێشـەوەی بەرانبەر ئیسرائیل دا. بە پێ بەسەر پردەکەیدا رۆیستین هەتا گەیشتینە کۆسپەی ناوەندێی لە داری

دروستکرابوو. له بەری لای ئوردون یەک خیوەتم دیت که ژمارەیەک سەربازی تێدابوو و لەبەری لای ئیسـرائیلیش ژمارەیەکی لەوان پتر نەبوون و، سـەربازە ئیسـرائیلییەکان بەرەوڕووومان هاتن و له بەری ئەودیوی کۆسپەکەی سەلامیان لێکردین و گوتیان "بەخێر بێن گەنجینە"، عەبدولتەواب مەلا حوێشـی سـەرۆکی دامەزراوەی گواسـتنەی وسـکانیی وەزارەتی گواسـتنەوە بووله عێراق، وەڵامیدنەوە و گوتی: "برۆ هەتیوی کوڕی قۆندەرەی". محەممەد دەباسـی وەزیری دارایی ئوردونی لێی هاتەپێش و گوتی: "عەبدولتەواب تکایە، ئەگەر ئەوڕۆ شـەرە جنێوێ بکەین دەبێ سـبەینێ بە تۆپان لێکدی بدەین. جا عەبدولتەواب گوتی: ئەدی ڕووبوڕووبوونەوە چییە؟ ئەدی تۆپ لێکدان نییە؟.

له ڕۆژی کۆتـای سـەردانەکەمـان، موزیر بەدرانی سـەرۆکوەزیرانی ئوردون له نووسینگەکەی خۆی پێشوازیی لێ کردین. هەردوو وەزیری ئوردونی، محەممەد دەباس و عەلی شـحێمات ئامادەی ئەو دیدارەبوون، بەڕێز موزیر بەدران بەخێرهاتنی کردین، ئەوجا باسـی ئەوەمان کر عێراق چۆن دەتوانێ سـوود له بەندەری عەقەبە و ڕێگاوبانی ئوردن ببینێ و کەلوپەل بگوازێتەوە و چۆنیش دەکرێ کۆمپـانیـایەکی عێراقی - ئوردنی بۆ گواستنەوەی وشکانی دامەزرێندرێ.

ئەوجا باسی پەیوەندیی نێوان هەردوو ولات کرا، لەگەڵ هەندێ کێشـە و کۆسـپەی ڕێ له پەرەپێدانی دەگرن، سـەرۆکی وەزیران باسـی باسـی ئەوەی کرد دەسـەلاتی عێراق قوتابییەکی ئوردونیی له سـێدارە داوە که لەعێراق دەیخوێند. گوتم: ئەوەندەی من بزانم هەوالگریی ئوردونی ئەو قوتابییەی خزندبووە ناو ڕیزەکانی حیزبی بەعسـی عەرەبیی ئیشـتیراکی، باسـە ئێوە ئەوەتان قبووڵە هەوالگریی عێراقی کەسـێکی ئاوا بخزێنێتە ناو دەزگایەکی هەسـتەوەری ئێوە؟ سـەرباری ئەوەی رازی نیمە لەداردانی سـیاسـی هەبێ، پێموایە ئێوە لەو کارەدا هەڵەتان کردووە. ئەوجا ئاماژەی بۆ هەردوو وەزیرە ئوردونییەکە کرد و گوتی: محەممەد دەباس نیوەی تەمەنی بەعسی بووە و عەلی شحێماتیش هەر ئاوا، لەگەل ئەوەشـدا ئێسـتا ئەوان له بەرپرسـیاریدا لەگەڵمان بەشـدارن. گوتم: پایەداریی سـەرۆکوەزیران، هەر بۆ زانینتان من ڕۆژێکیش بەعسـی نەبوویمە. گوتی: ئێمە باشـتان دەناسـین، بەلام من ویسـتم دووپاتی بکەمەوە تا ئەو رادەیەی ڕقمان له بەعسـییەکان نابێتەوە ئەگەر ڕێکخسـتنەکانیشـیان ئاشـکرا بکەین، لەسـێدارەیان بدەین.ئەوجا گوتی: دەمەوێ بابەتێکت پێ ڕابسپێرم، ئەویش ئەوەیە که عێراق بەڵێنی دا له کۆنگرەی لووتکەی ڕیبات یارمەتیدانێکی دارایی سـالانەی ئوردون بورووژێنێ که چوار ملیۆن و پێنج سـەد هەزار دۆلارە و بەسـای ئەوەی ئێمە له ولاتانی ڕووبەڕووبوونەوەین وم هیچ داهاتێکی داراییشـمان نییە تا سـوپاکەمانی پێ بەهێز بکەین. کەچی عێراق خۆی لەوەی بێدەنگ کرد

و ئێمەش لای خۆمانەوە بابەتەکەمان نەورووژاند. جا دەمانەوێ ئەو ئەرکەمان بۆ جێبەجێکەی و ئەوەش بەبیر حکوومەتی عێراق بێنییەوە.
گوتم دەتانەوێ بە سیفەتی فەرمی وەڵامتان بدەمەوە یان بەسیفەتی تایبەتی؟ خەندەیەکی کرد و گوتی دەمانەوێ بە هەردوو سیفەتان گوێمان لە وەڵامەکەت بێ.
گوتم: بەو سیفەتەی من وەزیری گواستنەوەم لە عێراق، ئەو بابەتە ناچێتە خانەیبەرپرسیاری و ئەرکەکانی وەزارەتەکەم، بەڵام من ئەو داوایەی پایەداریتان بۆ لایەنە تایبەتمەندە عێراقییەکان بەرزدەکەمەوە، تا بەپێی بەڵێنی کۆنگرەی لووتکە، ئەوەی پێویستە بیانکا.
گوتی: ئەدی بە سیفەتی تایبەتتان؟ گوتم: عێراق بەڵێنی داوە یارمەتیی دارایی بداتە ئەو وڵاتانەی بەرەوڕووی ئیسرائیلن و، دوێنێ لەسەر پردی لینبی سەردانی پێگەی سەرەکیی ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان ئوردون و ئیسرائیلمان کرد. بەرەوڕووبوونەوەکە چوار سەربازی ئوردونی بوون و بەرانبەر چوار سەربازی ئیسرائیلی بوون. گومانیشم لەوەی نییە ئەو دووژمارەیەی هەردوولا لە ناوچە چۆلەوانییەی بە تێپەڕینی کات برادەرایەتی پەیدادەکەن و، ڕەنگە چایەش لەگەڵ یەکدی بخۆنەوە. ئەگەر ئێمە لەسەر سنوورەکان بووینایە، ناڵێم بەسەر سنوورەکانمان دادەدا، ڕەنگە ئێمەش بێ بێ کۆی دەوڵەتە عارەبەکاننەتوانین ئەوەی بکەین، بەلام وەک وڵاتانی بەرەوڕوو، ڕەنگە چوار فیرقەی تەواو پڕ چەککراو لەسەر سنوور دامەزرێنین و ئیسرائیلیش هەر وادەکا و هەردووکیشمان لەترسی یەکدی وادەکەین. ئەرێ عێراق وادەی داوە جوار ملیۆن و نیو دۆلار بۆ پڕچەککردنی چوار سەرباز بدا؟! پێشی دوو ڕۆژان لەگەڵ وەزیرەکەتان سەردانی بەندەری عەقەبەم کرد، هەر لەو دیاردانەڕا دیارە هەردوو لا لە یەکدی دڵنیان، سەرۆکوەزیران پێکەنی و گوتی: ئێمە دەوڵەتێکی چکۆلەین و سامانێکی گەورەمان نییە سوپایەکی گەورەی بەو شێوەیەی دەفەرموون بۆ ڕووبەڕووبوونەوە پێ ئامادە بکەین.
گوتم بە دڵنیاییەوە داوایەکەتان دەگەیەنمە حکوومەتەکەم.ئەوجا ڕوخسەتی ڕۆیشتن و سەفەرم خواست.

## هێزەکانی ئاسایش دەوری بارەگاکانی حیزبی شیوعی دەگرن:

لە بەرانبەرئالۆزیی نێوان هەردوو حیزبەکە"بەعس و شیوعی"، کە ئاسایش بارەگایەکانی حیزبی شیوعی و نووسینگەکانی ڕۆژنامەی "طریق الشعب" و گۆڤاری "الثقافة الجدیدة" و چاپخانەی "الرواد"ی گەمارۆدا، گومانێک نەما کە دابڕانەکە بەڕاستییە.[58] ئەگەرچی لەسەرداوای سەرکردایەتیی حیزبی شیوعی نەدەچوومە دەوامی وەزارەت، بەڵام لە بارەگای حیزب و نووسینگەی ڕۆژنامەی حیزب دەوامم دەکرد، تا مافە داراییەکانی کرێکاران و کارگەرانی ڕۆژنامە و چاپخانە یەکلا بکەمەوە و پەرتەیان پێ بکەم. ئەو چەکانەشم کۆکردەوە کە حیزب بۆ پاراستنی بارەگایەکانی لە حکوومەتی وەرگرتبوو و، بەبەرچاوی پیاوانی ئاسایشەوە خستمنە ناو ئۆتۆمۆبیلە "لادایە"کەم و دوامکەوتن تا بزانن ئەو چەکانە دەبەمە کوێ. دیتیان ڕێی بارەگای بەرەی نیشتمانیم گرتووە لە "کەمپ سلێخ" و چەکەکانم ڕادەست کرد کە شازدە تفەنگی کلاشینکۆف بوو و دامنە بەڕێز عەبدولغەفوری نووسیاری بەرەبوو و پسووڵەم لێ وەرگرت.

ئیدی دەوامکردنم لە بارەگای حیزب و نووسینگەی ڕۆژنامە کەڵکی نەمابوو، چونکە بۆ دوو مانگ دەچوو، لەسەر بڵاوکردنەوەی بڕیارێکی کۆبوونەوەی حیزبە شیوعییەکانی وڵاتانی عارەبی ڕەخنەی لە ڕێوشوێنەکانی حیزبی بەعس گرتبوو بەرانبەر حیزبی شیوعیی عێراق، ڕۆژنامە پەکی خرابوو. هەردوو هاوڕێ دکتۆر سەفا ئەلحافز و دکتۆر سەباح ئەلدورە ڕاسپێردرابوون تا لە پاکوپیسکردنی کاروبارەکانی حیزب هاریکاریم بکەن. بەڵام نەیانتوانی ئەوەی بکەن و دواتریش ئاسایش هەردووکی گرتن.

لە سایەی ئەو ڕێوشوێنانە و دەرچوونی مەرسوومێک بۆ دەرکردنی عامر عەبدوڵڵای وەزیرە شیوعییەکەی دیکە لە پۆستەکەی و، کە هیچ کام لە سەرۆک و سەدام حوسێنی جێگریشی ڕازی نەبوون چاوم بە یەکێکیان بکەوێ تا قەیرانەکە چارەسەر بکەین، منیش وازم لە دەوامی وەزارەت هێنا. هەر لەو دەمای بولەند ئەجاوید هاتبوو و داوای کردبوو لە وەزارەتی گواستنەوە بمبینێ، ئیدی عەدنان حەمەدانیی وەزیری پلاندانان پەیوەندیی

---

[58] _ پایزی ١٩٧٨ هەڵمەتێکی فراوان لە ناوچەی بەغدا کرا و لە هەموو لایەکی وڵاتیش هەڵمەت کرایە سەر ڕێکخستنوکانی "حشع". دوازدە کادیری سەرکردایەتیی شیوعی لە ئەندامانی لیژنەی ناوچەی بەغدا گیران و جواریان لە کاتی لێکۆڵینەوە و ئەسکەنجەدا مردن و ئەوانیدی دوای لێکۆڵینەوە بەردران، بەڵام هەر لەژێر چاودێریی دەزگاکانی ئاسایش مانەوە. هەڵمەیەکە لە پارێزگای نەینەوابە گرتنی هێمنانەی ئەندامانی لیژنەی ناوخۆ دەستی پێکرد و دوایە بەردران، کارەکەش هەر بە بەغدا و نەینەوا نەوەستا و پارێزگایەکانی دیکەی عێراقی گرتەوە و وایکردحیزبی سیوعی لە تەمموزێ دروشمی "ڕووخاندنی ڕژێم" بەرزبکاتەوە. للمزید: سیف عدنان القیسي، الحزب الشیوعي العراقي في عهد البکر، ص٥٤٣.

پێوەکردم و هەر بۆ نیوســــەعاتێک دەوامی وەزارەت بکەم و پێوازی لە ئەجاوید بکەم.
گوتم: پێیبڵێن نەخۆشە. گوتی: من لە نەخۆشیتان تێدەگەم، بەڵام ئەو سوورە یان لە ماڵەوە و یان لە نەخۆشخانە سەردانتان بکا. بەڵام من هەر رەتمکردەوە بچمە وەزارەت.

نیشتمانییه پێشکەوتنخوازەکانی ناوەووه و ڕیزەکانی بزووتنەوەی ئازادیخوازی نیشتمانیی عەرەبی و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانییش دروستکردووه. زۆر لایەنی برا و دۆست، بە زۆر شـــێوه ئەو نیگەرانییەیان دەربڕیوه و، داوایان کردووه چیدی شـــیوعییەکان و هاوالانیان ڕاوەدوونەندرێن و کەشـێکی دروسـتی گێڕانەوەی پەیوەندییە هاوپەیمانییەکانی نێوان ئەو دووحیزبە دروسـتبکرێ و، ئەوەش لەبەر سـووربوونی ئەو لایەنانەیە لەسـەر بەردەوامیی خەباتی دژ بە ئیمپریالیزم و بەرەوپێش چوونە بە یەکڕیزی.

٤_ هەر بە ڕاسـتییش لە ٢٤ی کانوونی دووەمی ١٩٧٩، وەک نوێنەری حیزبی شـیوعی، دیدارێکم سـەبارەت بە بابەتی دوارۆژی پەیوەندیی نێوان حیزبی بەعسـی عەرەبیی ئیشـتیراکی و حیزبی شـیوعیی عێراقی لەگەڵ کراوە و، هەموو تێڕوانینەکانی حیزبی بەعسـی عەرەبیی ئیشـتیراکیم دایە سـەرکردایەتیی حیزبمان و، لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعیی عێراقییش، بە نامەیەکی ڕێکەوتی ٩ی شوباتی ١٩٧٩ی لەسەرە، وەڵامی دایەوە و ئەو بنەمایانەی تێدایە کە پێیوایە بۆسـەرکەوتنی هەموو هەوڵێکی مەبەسـتی بێ پەیوەندیی نێوان ئەو دوو حیزبە ئاسـایی بکاتەوە، دەبێ ئەو بنەمایانەی تێدابێ. ئەو بنەمایانەش دەکرێ لەوەیدا کورتبکرێنەوە کە چیدی حیزبی شـیوعی ڕاوەدوو نەندرێ و شـوێنەواری نەسڕێتەوە و کەشێکی تەندروستی پەیوەندیی نێوان جەماوەری هەردوو حیزب بێتەکایەوە و کەشـووهەوایەکی دیموکراتییش بۆ هەموو هێزە پێشـکەوتنخوازە دژە ئیمپریالیزمەکان دەستەبەر بکرێ.

٥_ سـەرکردایەتیی قوتریی حیزبی بەعسـی عەرەبیی ئیشـتیراکی، لە ٨ی ئازاری ١٩٧٩، وەڵامی نـامەکەی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شـیوعیی دایەوە و، بگرە بێ گفتوگۆ لەسـەرکردنیشـی بەکردار هەموو ئەو بنەمایانەی ڕەتکردەوە کە پێشـنیارکرابوون و، هاوشـانی ئەو ڕەتکردنەوەیەش، هەڵمەتێکی فیکری و سـیاسـی دژی حیزبی شـیوعیی عێراقی، بە هەرچی کەرەسـتەکی بەردەسـت بوو ڕووی لە هەڵکشـان کرد و بەرەش لەو هەڵمەتەدا بەکارهێنرا.

٦_ سەرباری ڕوونیی ئەو بنەمایانەی نامەکەی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعیی عێراقی خسـتبوویە ڕوو، نوێنەرانی بەعس هێشـتا داوای وەڵامیان لە حیزبی شـیوعی دەکرد. ئەوجارەیان وەڵامی حیزبم بە زارگۆیی برد، کە پوختەکەی ئەوەبوو ئێمە دووپاتیدەکەینەوە دەبێ پێویسـتە بارودۆخ و کەشـێکی گونجاو دەسـتەبەر بکرێ تا بچینە ناو گفتوگۆیەکی جیدی و ڕاشکاوی چارەسـەرکردنی ئەو کێشـانەی لەنێوان هەردوو حیزب خراوەتە ڕوو و دەبێ بەپێی ئەو بنەمـایـانەی لە نـامەکەی پێشـتریمـان لە ڕێکەوتی شـوبـاتی ١٩٧٩ لێکۆڵینەوە لە بـابەتی پەیوەندییەکـانمـان بکرێ و، شـێلگیریی پیلانەکـانی ئیمپریـالیزم و

زایۆنیزم و کۆنەپەرستیش لەبەر چاو بگیرێ و، دەبێ جیاوازییە سەرەکییەکانیش پتر لەبەرچاوبن نەک لاوەکییەکان.

٧_ بەداخەوە، هاورێ نەعیم حەداد لەقسەکانیدا بابەتی ئەو رونکردنەوانەی لەبەرچاو نەگرتووە، کە من وەک وەلامێک گواستمەوە و، مافی بەخۆی داوە تۆمەتی بێ بنەما بداتە پاڵ حیزبی سیوعی و سەرلەنوێ هەرەشە لە حیزب بکا، کە ئەوەش تەواو پێچەوانەی ئەو هەولانەیە کە بۆ لێکۆلینەوەی کێشەکانی نێوان هەردوو حیزب دەدرێن، تا بگەنە هەلوێستێکی یەکگرتووی لەگەل هەردوو پەیمانی گرنگی کاری نیشتمانیی بگونجێ، ئەو دوو پەیمانەی هەردوو حیزب هەولێکی زۆریان داوە و کاتێکی زۆری چەند سالێشی بردووە تا دەستەبەری بکەن. وەهاش سەنگ و مەن کراوە کە دوو دەستکەوتی گرنگی گەل و بزووتنەوەو نیشتمانییەکەی گەلن و، هەتا ئێشتاش دەکرێ ببنە ئەو بنەمایەی هەردوو حیزب لەوێ بگەنەوە یەکدی و، ئەو پەیمانە هێشتا هەندی ئامانجی تێدایە بەدەست نەهاتوون و دەستەبەرکردنیشیان هەولێکی هاوبەشی هەردوو حیزبی پێویستە. حیزبی سیوعیی عێراقییش ئامادەیە بەتەواوی پابەندی هەر ستێک بێ کە لە گفتوگۆ و بریارداندا بەشداری لە ئامانج و بەلگەنامەکانی پەرەپێدانی رێرەوی گەلەکەمان بکا.

## دەستلەکارکێشانەوەم لە وەزارەت:

لە ٢ی ئایاری ١٩٧٩، دەستلەکارکێشانەوەیەکی نووسراوم پێشکەشی ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆککۆمار کرد. بە وەزارەتی گواستنەوەیشم ڕاگەیاند، هەرکە مەرسوومی قبووڵکردنی دەستلەکارکێشانەوەکەم دەرچوو، ئەوان ڕێوشوێنی پێویست بگرنەبەر. سەرباری ئەوەی سەرۆک دەستلەکارکێشانەوەکەی قبووڵ نەکردم و تارق حەمەد ئەلعەبدوڵلای سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی پەیوەندیی پێوەکردم تا تکای سەرۆکم پێڕاگەیەنێ دەستلەکارکێشانەوەکەم بکێشمەوە و بوارێکی دی بۆ چارەسەری کێشەی نێوان هەردوو حیزب برەخسێنین. پێمڕاگەیاند ئەگر کێشەکانی نێوان هەردوو حیزبیش چارەسەر بکرێ، نە لە هیچ دانوستانێک دەبمە نوێنەری حیزب و نە دەبمە وەزیری حیزب لە حکوومەتدا. دەقی دەستلەکارکێشانەوەکەشم ئاوابوو:

بەڕێز سەرۆککۆماری قەدرگران:

سڵاو و ڕێز.... ئێوە لە ١٩٧٢ ئەرکی وەزارەتی ئاودێریتان بەمن سپارد، جەندی لەدەستم هات کارم بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەی لەسەرشانمە کرد و، پرۆژەی ستراتیژیی گەورە جێبەجێ کران کە جێی سەرسامیی بەڕێزتان و بەرپرسان بوون و، جێبەجێکارانیش بەرزترین میداڵیان لەسەر وەرگرت و، وەزارەتیش جێبەنجەی لە ئامادەکردنی دەزگای نیشتمانیی لێوەشاوە دیاربوو کە لە جێبەجێکردنی پرۆژەکان دەرکەوت و، سەدان ملیۆن دیناریشی بۆ دەولەت گێڕایەوە. بە داخێکی زۆرەوە دەڵێم، ئەو چالاکیانە بە دڵی ئەو کۆمپانیایانە نەبووملیۆنان دۆلاریان دەماشییەوە و، نمایندە و بەکرێگیراویسیان لە جۆرەها دەزگای دەولەت هەیە و، خەریکبوون ڕاستییەکانیان دەشێواند و، توانیشیان دەسەڵاتداران ڕازیکەن لە بەرپرسیاریی وەزارەتی ئاودێری لامدەن، کە ئەرکی وەزارەتی گواستنەوەتان پێ سپاردم، بە هەمان ئاراستەدا ڕۆیستم و خەریکی دروستکردنی دەزگای جێبەجێکار و هونەری بووم و، کارم بۆ چارەسەری ئەو کێشە درێژخایەنانەی گواستنەوە دەکرد کە لەمێژە هەنە.

سەرۆکی بەڕێز:

لەئەنجامی پەرەسەندنی پەیوەندییەکی باشی نێوان حیزبی سیوعی و حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکی، بۆمان ڕەخسا بەسداری لە بەرپرسیاریەتی بکەین. هەر لە واژووکردنی پەیمانی کاری نیشتمانیڕا، کە بنەمای هاوبەش و لیکتیگەیشتنی هەردوولای دەربارەی گرنگترین ئامانجەنیشتمانییەکان لەخۆ گرتبوو، ئەو بەشداریکردنە چاوەڕێ دەکرا. ڕاگەیاندنی لەدایکبوونی بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز دەنگدانەوەیەکی جیهانیی هەبوو و، چاویشمان لەوەی بوو ئەو تاقیکردنەوەیە ببێتە

نموونەیەک و لە ولاتانی دیکەی عارەبیش چاوی لێ بکرێ. ببێتە ئەوزارێکی کاریگەری ئامادەکردنی جەماوەر بۆ پاراستنی سەربەخۆیی نیشتمانیمان وبەرەورووبوونەوەی دوژمنکاریی ئیمپریالیزم و زایۆنیزمی کۆنەپەرست، بۆ بنیاتنانی عێراقێکی پێشکەوتووی گەشاوە. _سەرۆکی بەڕێز- دەشزانن کە پەیوەندیی بەرەییش، وەک لە دەقی پەیمانی بەرەدا هاتووە، دەبێ لەسەر بنەمای هاوکاریی ڕاستگۆیانە و ڕێزی بەرانبەر و هەلی یەکسان بنیات بندرێ. کەچی ئێمە لەو سالانەی دواییدا و لە زۆر بواردا دەماندیت نایەکسانیم بەرانبەر دەکرێ، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کاری زۆربەی وەزارەت و دامەزراوە فەرمییەکان و کۆلێژ و پەیمانگایەکان دەستی بەسەردا بگیرێ. بەو سیفەتەی وەزیری دەوڵەتم و نوێنەری حیزبێکی هاوپەیمانیشم، بەشێکی ئەو بەرپرسیارێتییەم دەکەویتە ئەستۆ، وەڵامێکیشم سەبارەت بە و داوای روونکردنەوانە دەستنەکەوت کە دەربارەی جیاوازیی روونی نێوان گەلان و تایەفەکان و حیزبەکان دەکران. لەو سالانەی پێشتریش، هەزاران هاوڕێمان گیران و ڕاوەدوونران و فشاریان خرایە سەرێ و ئەسکەنجە دران تا واز لە باوەرە نیشتمانی و کۆمەڵایەتییەکانیان بێنن و واز لەو حیزبەس بێنن کە بەو باوەڕەی پەروەدەی کردوون و، زۆربەی ئەو ڕووداوانەشمان خستووەتە بەرچاوی بەڕێزتان و هاوڕێ بەرپرسەکانتان، بەلام لەجیاتیی ڕاگرتنیان کارەکان پتر تەشەنەیان کرد و بە لەداردانی دەیان هاوڕێ و برادەری بێگوناهمان کۆتاییهات.

سەرباری ئەوەی گفتوگۆیەکانی ئەنجوومەنی وەزیران لە سالانی بەرایی هەر لەسەر کارە بەڕێوەبەری و هونەرییەکان چڕدەبوونەوە، کەچی چالاکیی ئەنجوومەنی وەزیران پەکی خرا و کارەکان لە ئەنجوومەنی دیکەی تایبەت بە ئێوە بڕیاریان لەسەر دەدرا، ئیدی هەستمان بەوەی کرد ئێمە تەنیا کارگوزاری ئاساییین و ڕێمان پێنادرێ لە نەخشەکێشیی سیاسەتی ولاتدا بەشداری بکەین و ، هەر ئەوەندەمان لەسەرە بەو بڕیارانە رازیبین کە دوور لەئێمە دەدرێن.

لەمێژیشە کۆبوونەوەکانی لیژنەی بالای بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز سڕکراوە و،زۆربەی بنکەکانی بەرەس بوونەتە بەڕێوەبەریی لێکۆڵینەوە دژی هەندی لایەنی دیکە. سکرتاریەتی بەرەش کراوەتە ئامرازیک بیروڕای بەتەنی دراو بەسەرئەوانیدیدا بسەپێنێ. بگرە بووەتە دەزگایەکی جنێو بە لایەنەکانی دی دەدا و، ئەوەش هەڵمەتێکی ڕاگەیاندنی هەمەجۆی کەرەستەی ڕاگەیاندنی لەگەلدابوو، لەوانەش، دەرکردنی کتێبێک بەناوی'چەند تیشکێک لەسەر بزووتنەوەی سیوعی'ی لە بەڕێوەبەرییەکانی ئاسایش دەرچووە و حیزبی شیوعی وەها وێنا دەکا وەک ئەوەی کار بۆ بەرژەوەندیی و زایۆنیزم بکا و، سووک سەیرکردنی ئەو سەرکردە سیوعییانەی تێدایە کە قوربانییان بە بەنرخترین

ست داوه و، له ڕێی گەل و باوەڕی نیستمانی ژیانی خۆیان بەخشیوە. لەوەس نشیرینتر ئەوەیە دەستیان بۆ ناوبانگ و شکۆی ژن و خوشک و کچەکانیان بردووە کە بێگومان ئابڕوومەندترین ژنن.

بەرانبەر بەو شتانەی لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن دەخوێندرینەوە و دەبیندرێن، خەڵک خەریکە پرسیارێکی ڕەوای مەغزای لە وەزارەت مانەوەی کەشێکی ئاوای ئێمە دەکەن. ئێمەش، کە بەرەوڕووی خانەوادەی هاوڕێ گیراو و حوکمدراوەکانمان دەبینەوە و دەستەپاچەین هاوارەکانیان بگەیەنینە ئێوە یان وەڵامێکی ڕازیکەرمان بۆ ئازاردیتنیان دەستکەوێ و کەچی لە بەرپرسیاریتیشدا هاوبەشین، ئیدی تووشی تێمانێکی گەورە دەبین. تاکە دڵی خۆدانەوەمان ئەوەبوو تا دوا چرکە لە پاککردنەوەی کەشە نیستمانییەکە و گەڕانەوە سەر ڕێی هاوکاری و هاوشانی لەو بارودۆخە ناسکەدا بەردەوامبین، کەچی ئێمەی دوو وەزیر لە هەڵسوکەوتی هەندێ هاوڕێتان دەرباز نەبووین و عامر عەبدوڵڵای هاوڕێم قسەی ئەوتۆی وەبەرگوێ دراوە هەڕەشەیە و دەست بۆ ئازادی و شکۆی دەبا.

سەرۆکی بەڕێز، پێشتێ چەندجاران دۆخی پرکێشەی کوردستانمان بۆ باسکردن و تکامان لێکردن هەڵمەتی ڕاگواستن و لەسێدارەدان ڕاگرن و، وریاشمان کردنەوە کە چ مەترسییەکیان لێ پەیدا دەبێ، کەچی بەوەی تاوانبار دەکراین کە کوردەکان دژی شۆڕش هاندەدەین. هەرچەندی داوای چاککردنی بارودۆخەکەمان بکردایە و، داوای هەڵوەشاندنەوەی ڕێوشوێن و دامەزرا و و دەزگا هەڵاوێردەنمان بکردایە و بمانگوتبا ئازادییەکان بەرکەماڵبن، بە لیبرالیزم و هەوڵی پەکخستنی دەزگاکانی دەوڵەت و شۆڕش تاوانبار دەکراین. بەڵام ئێمە پێمانوایە تەنیا دیموکراتی دەتوانی گەل و هێزە نیستمانییەکان وەها ئامادە بکا بەرەوڕووی مەترسییان ببنەوە و ڕێ لەسەر پیلانگێڕیی ئیمپریالیزم و زایۆنیزمی کۆنەپەرست ببڕێ. ڕێوشوێنە هەڵاوێردەکان و بەربە ئازادییەکانی گەل گرتن حکوومەت لە گەل دادەبڕێ و کەشێکی خراپ گلەییکردن دروستدەکا، ئیدی دوژمن دەتوانێ بە ئاسانی پرۆژە پیلانگێڕییە دوژمنکارانەکانی لە ناوچەکەدا جێبەجێ بکا.

بەرانبەر بەو بارودۆخە شڵەژاوە، وای دەبینم کە بەشداریمان لە سان دانە بەر بەرپرسیاری بێ ئەوەی توانای چاککردنیمان هەبێ، کارێکە ناکرێ لەسەری بەردەوامبین، ئەوەش بەسەرمدا دەسەپێنێداوا بکەم لە ئەرکی وەزارەت بمبوورن، تا لە بواری دیکە بۆم برەخسێ خزمەتی گەل و نیشتمانەکەم بکەم.

بەڵگەنامەکانی هەردوو حیزب دووپاتی دەکەنەوە هەموو سەرکەوتنەکانی گەلەکەمان پەیوەستی هاوپەیمانیمان بووە، هەموو ئەو شکستانەی تووشی بزووتنەوەی نیشتمانی بووینە ئەنجامی داڕووخانیهاوکاری و هاوپەیمانیی نێوان حیزبەکان و هێزە نیشتمانییەکان

بووه و، ئێمه له داهاتووش هەر کار بۆهاوپەیمانیی هێزه نیشتمانییەکان دەکەین و لەسەر بنەمای دروستی ئەوتۆی بتوانێ گەل ئامادەبکا و ئامانج و ئاواتەکانی بینێتەدی.
له ١٠ی ئایاری ١٩٧٩ دەستلەکارکێشانەوەکەم قبووڵکرا.

## هاتنەسەردەسەڵاتی سەدام و هەڵگیرسانی شەڕی عێراق و ئێران:

شـەری عێراق و ئێران ئەو کاتی ڕوویدا کە سـەرۆک ئەحمەد حەسـەن بەکر لە دەسـەڵات کشـایەوە و ڕادەسـتی سـەدام حوسـێنی جێگری سـەرۆکی ئەنجوومەنی سـەرکردایەتیی شۆڕشی کرد. ڕاستییەکەی، سەرۆکایەتیی دەوڵەتلەو دۆخە ئاڵۆزەی هەبوو لەسەرەوەی توانایئەحمەد حەسەن بەکری بوو، نەخاسمە دوای مردنی ژنەکەی و محەممەدی کوڕی و مەزهەری زاوای لە کارەساتێکی پردەکە.

بەڵام ڕادەستکردن و وەرگرتنی دەسەڵات بە بڕیارێکی بەرێوجێی کۆنگرەی سەرکردایەتیی بەعس نەکرا، کەچی لەجێی ئەوە سـێدارە بۆ سـازدە ئەندامی سـەرکردایەتیی حیزب هەڵبەسترا، لەوانەش عەبدولخالق سامەڕاییئەندامی هەردوو سەرکردایەتیی قەومی قوتری و، محەممەد مەحجوبی وەزیری پەروەردە و ئەندامی سـەرکردایەتیی قوتری و، محەممەد عایشـی وەزیری پیشـەسـازی و سـەرۆکی یەکێتیی سـەندیکاکانی کرێکاران و، محێ عەبدولحوسـێنی سـکرتێری ئەنجوومەنی سـەرکردایەتیی شـۆڕش و عەدنان حەمەدانیی وەزیری پلاندانان و لیوا خالد مەحمود سیرەتی سـەرکردەی فیرقەی سـەربازی و خەڵکی دیکەش و، سـەدان کادری بەعیسـیش خرانە بەندیخانە یان لە بەندیخانەدا مردن، لەوانەش مورتەزا عەبدولباقی حەدیسـیی وەزیری دەرەوە و باڵیۆزی عێراق لە مۆسـکۆ و بحەممەد سەبری حەدیسیی باڵیۆزی عێراق لە تاران.

سەرباری ئەوەی سەرکردایەتیی عێرا بەرپرسی هەڵگیرساندنی سەرە لەگەڵ ئێران، باڵام ئێرانیش بەشـێکی گەورەی ئۆباڵی ئەو شـەڕەی لە ئەسـتودایە. ئاخر هەر سـەدام بوو ڕوحوڵڵا خومەینیی بەدەرکردن دا ئەو کـاتەی لە نەجەفی پیرۆز پەنـابەر بوو و دژی حکوومەتی شـا خەریکی چالاکی بوو. ئەوکارە دواترێ شـوێنەوارێکی دەروونیی لەسـەر خومەینی هەبوو و، خومەینییس دروشمی شۆڕشی ئیسلامیی لە دنیادا بەرزکردەوە و، لە عێراقرا دەسـتیپێکرد چونکە ژمارەی شـیعە لە ناوەڕاسـت و باسـووری عێراق زۆربوو، هەردوو دەوڵەتەکەش دەڵێن ئەوەی دی دەستی بە شەڕێ کردووە، بەڵام شەڕ لە ئەیلوولی ١٩٨٠ دەسـتیپێکرد و هەشـت سـاڵ بەردەوام بوو و سـەدان هەزار ڕۆڵەی هەردوو گەلی عێراق ق ئێرانی هاڕی.

لای عێراق، هۆیەکانی هەڵگیرسانی شەڕ دەبەنەوە سەرڕێککەوتنی جەزائیری ساڵی١٩٧٥ی نێوان سەدام حەسێن و محەممەد ڕەزا پەهلەویی شای ئێران، کە لە کۆبوونەوەی لووتکەی ڕێکخراوی وڵاتانی ئۆپێک بەسترا و ڕێککەوتنەکەیشیان دژی شۆڕشی کوردی بوو کە لە

١٩٧٤ دووباره بەســـەرۆکایەتیی مەلا مســـتەفا بارزانی هەڵگیرســـابووەوە، ئەویش دوای ئەوەی بەعس خۆی لە جێبەجێکردنی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ دزییەوە. مەلا مستەفا ئاسانکاری و یارمەتیی لە وڵاتانی دراوسێی عێراق وەردەگرت، نەخاسمە ئێران.
کە شۆڕشی ئێرانی سەرکەوت، سەدام حوسێن دیتی بارودۆخەکە لەبارە تا ئەو خاک و ئاوە وەربگرێتەوە کە لە ســـەردەمی شـــا و لە ڕێککەوتنی جەزائیر دەســـتی لێ بەردابوو. دوای ئەوەی ژمارەیەکی گەورەی ئەفســـەرانی لایەنگری ســـای دەرکران و ژمارەیەکی زۆری فیرقەکـان هەڵوەشـــێنرانەوە، چونکە ســـەرکردە نوێیەکـانی ئێران پێیـانوابوو چەکدارکردنی گەل لەڕێی پێکهاتەکانی پاســدارانی ئیســلامی بەســە بۆ پاراســتنی ئێران، سەدام، لاوازیی سوپای ئێرانی قۆستەوە.
لەوەیدا نیین وردەکارییەکانی شەڕ بگێڕینەوە، بەڵام بووە هۆی دادۆشینی داهاتە دارایی و مرۆییەکـانی هەردوو وڵات. خۆرئـاواش، بە ویلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـاوە، هـانی عێراقیان دەدا لەشەرکردن بەردەوام بێ. جا لەو ڕێوانەیدا خوێنەری بەڕێز دەبەمەوە سەر کاریگەرییە ئابوورییەکانی شەڕی ئێران و داخوا چ کاریگەرییەکی لەسەر دۆخی دارایی و ئـابووری هەبووە. پێش شـــەڕێ، فەوزی ئەلقەیســـی وەزیری دارایی لە ئەنجوومەنی وەزیران دەیگوت تێماوە نازانێ ئەو پارەزۆرەی دراوی بیانی لەکوی دانێ، چونکە یەکجار زۆرە. بەڵام شـــەڕ هەموو پاشـــەکەوتەکانی عێراقی لووشـــدا و بووە قەرزداری چەندین وڵاتیش، بگرە وڵاتێکی بێ داهاتی وەک ئوردنیش.
وڵاتانای خۆرئاوا دەیانویســـت درێژە بە شـــەڕەکە بدرێ ، تا ئەو دوو دەوڵەتەی ســـامانە نەوتییەکانی خۆیان خۆماڵی کردبوو، باستر دادۆشن. ڕاستییەکەی، شەڕ سامانی دارایی و مرۆیی ویران کرد و شوێنەوارێکی وێرانەی گەورەی لەهەردوو وڵات بەجێهێشت. لەبیرمە، جیسکار دیستانی سەرۆکی فەرەنسا بە ڕۆژنامەنووسانی گوتبوو سەبارەت بە گەیشتنە دەســـەڵاتی ئیســـلامییە ئوســـوڵییەکان لە ئێران ، ســـەرۆکی ئەمویکای گەیاندووەتە ئەو باوەڕەی مەرج نییە خۆرئـاوا بەرژەوەندییەکـانی ئێرانی بەمـانەوەی حکوومەتی شـــاوە ببەســـتێتەوە، جونکە دەکرێ لەگەڵ دەوڵەتی نوێیش ڕێکبکەون. خوێنەریش زۆر شـــتان دەربـارەی ڕووداوی "ئێران گێـت" دەزانێ ئەو کـاتەی ویلایەتە یەکگرتووەکـان بەنهێنی چەکی دەدایە ئێران و، لەڕێی مانگە دەســتکردەکانیشــەوە جوولەی ســوپای ئێرانی دەدایە سەرکردایەتیی عێراق.
شەڕ بەوەی کۆتاییات کە سەرکردایەتیی ئێران اچارکرا بە بڕیاری ڕاگرتنی شەڕێ رازیبی و هەردوولا بکشـــێنەوە ســـەر ســـنووری نێودەوڵەتیی هەردوو وڵات. عێراق خۆی بە ســـەرکەوتووی شـــەڕەکە دادەنا. بەڕێز خومەینی راگرتنی ســـەڕی بە "ژەهر خواردنەوە"

وەسفکرد، بەلام راوەستانی شەڕ و کسانەوەی هەردوولا بۆ سنووری نێودەوڵەتییان دەکرێ بە سەرکەوتنی ئاشتیی هەردوو گەلی هەردوو ولاتی دابنێین و. پێشوازییەکی گەرمیشی لێکرا.

یەک لەو ناوچانەی شەڕی لەسەر کرا ئەو ناوچە پڕ نەوتەی هۆڕەکانی نێوان عێراق و ئێران بوو کە پێیدەڵێن 'کێڵگەی مەجنون' و ئەو کۆمەڵە دوورگە ڕۆڵێکی گەورەیان لە ڕووخاندنی حکوومەتەکەی عەبدولڕەحمان عارف هەبوو، چونکە ئەو حکوومەتە ئیمتیازی گەران و دەرهێنانی نەوتی دابووە کۆمپانیای 'ئیراب' فەرەنسی،[60] ئەوەس کۆمپانیا ئەمریکی و بەریتانییەکانی تووڕەکرد و، ئیدی ڕەزامەندیی خۆیان دایە کودەتاچییەکانی ١٩٦٨، دەشگوترێ سەدام حوسێن، کە لە قوبروس بە نهێنی لەگەل نوێنەرانی 'ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا- بەریتانیا' کۆبووەوە و دڵنیای کردن، ئەو ڕەزامەندییەی دەستەبەرکرد. ئەوجا بەشداریی هەریەک لە عەبدولڕەزاق نایف بۆ سەرۆکوەزیران و ئیبراهیم عەبدولڕەحمان داود بۆ وەزیری بەرگری و دکتۆر ناسر ئەلحانی بۆ وەزارەتی دەرەوە. بەلام وادیارە سەرکردایەتیی بەعس ئەو کارەی وەک ڕێوشوێنێکی تاکتیکی قبووڵ کردووە تا ڕەزمەندیی ئەو دوو دەوڵەتە بۆ کودەتا وەرگرن و لە سەرکەوتنیشی دڵنیابن. ئەوجا لە حوزیرانی ١٩٧٢ نەوتی عێراق خۆماڵی کرا کە گورزێکی گەورەبوو بەر کۆمپانیا بیانییەکان کەوت و، ئیدی بە هەمووجۆرێک کاریان بۆ لاوازکردنی عێراق دەکرد.

جا کارەکە هەرچۆنێک بێ ئەوەی شەڕی عێواق ق ئێران لەرووی ئابووری و داراییەوە بەجێیهێشت و ئەوجا لە ڕووی سەربازیشەوە، ئەوا شەڕ هەموو پاشەکەوتەکانی عێراقی لووشدا و، هەموو کارێکی پەرەپێدان لە ٩٨٥ڕا ڕاوەستا و هەموو ئەو توانا داراییە هەواڵەی پێداویستییەکانی شەڕ کرا و، عێراق کە لەشەڕی هاتەدەرێ چەندین ملیار دۆلار قەرزدار بوو، بەڵام هێزی سەربازیی گەیشتبووە هەست فەیلەق، ئیدی بووە یەک لە هێزە گەورەکانی دنیا و گەورەترین هێزی سەربازیی ناوچەکەش.

---

[60] _ چوارەم وەزارەتی تاهیر یەحیا ڕێککەوتنێکی نەوتیی لەگەل کۆمپانیای ئیرابی فەرەنسی کرد و ڕێی پێدا لە ڕووبەرێکی لە دوازدەهەزار کیلۆمەترێ دووجا پتربوو بەدوای نەوتدا بگەڕێ، ڕێککەوتنی کۆتاییش لە ٣ی سوباتی ١٩٦٨ مۆرکرا. للمزید: جعفر عباس حمیدی ،تاریخ الوزارات العراقیة، ج ١٠، چ١٧٠-١٧٥.

## یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ هێرشی کردە سەر حیزبی شیوعی؟:

ماجەرای شـــەڕی عێراق و ێران گۆڕا و لە بەرەکانی شـــەڕ ئیران بووە هێرشـــبەر و هەڕەشـــەی ئەوەی دەکرد بەســـەر ســـنوورەکانی عێراق دابدا و بێگومان بە ســـنووری کوردستانیشـەوە. جا ژمارەیەکی زۆری کەسایەتییە عەرەب و کوردەکان داوایان لە هێزە ئۆپۆزسیۆنەکان کرد هەڵویستیان بەرانبەر شـەڕەکە بگۆڕن، جونکە شـەڕەکە گۆڕابوو و ئێستا ئێران خەریکبوو خاکی عێراقی داگیر دەکرد، ئیدی سـروشـتی شـەڕەکە بۆ عێراق گۆڕا و لە هێرشـــبەرییەوە ببووە بەرگری. ئیدی هێزە نیشـــمانییەکان، ســـەرباری ئەو دژبەرییانەی لەگەڵ ڕژیمی عێراقدا هەیانبوو، دەبووایە بە هەهەرچیی لەدەســـتیان دێ بەر بە داگیرکاریی ئێرانی بگرن.
تەنیا هەندێ هێزی کوردی نەبوون کە ئەو هەڵســـەنگاندنەیان بۆ ســـروشـــتی شـــەڕەکە هەبووبێ، بەڵکو ســـەرکردەی دیار و ناسراوی حیزبی شـیوعیی عێراقیش بانگەشـەیان بۆ ئەو هەڵویستە دەکرد، لەوانەش زەکی خەیریی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حیزبی شیوعی، کە لە ڕەوی زۆرینەی ســـەرکردەکانی حیزب دەرچووبوو و، ئەوان پێیانوابوو شـــەرەکە شـــەڕێکی دوژمکارانەی عێراقە بۆ ســـەر ئێران و کە ئیســـتا ئیرانیش لە بەرەکانی شـــەڕ لەجیاتیی بەرگری خەریکە هێرس دەبا، ئەوە هیچ شـــتێک لە ســـروشـــتی ســـەرەتای شەرانگێزیی شیرەکە ناگۆڕێ.
لە ساڵی ١٩٨٣، بەسای عەبدولرەحمان قاسملووی ئەمینداری گشتیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی بە هاوکاریی عێراق شەڕی سوپای ئێرانی دەکرد، پەیوەندییەک لەنێوان سەرکردایەتیی یەکێتیی نیستمانیی کوردستان و حکوومەت دروستبوو.
حیزبی شـیوعیی عێراقی لە کوردسـتان، لەکاری سـیاسـی و سـەربازیدا، ڕکابەریی لەگەڵ یەکێتیی نیســـتمانیی کوردســـتان دەکرد، بەڵام خۆی لەهێزەکانی تەکێتی دەپاراســـت و نەیدەێشـت بگەنە یەکدی. ئەوکارەش ببووە ڕێگر لێنەدەگەڕا هیچ چارەسـەرێک دووقۆڵیی نێوان یەکێتیی نیشـــتمانی و حکوومەتی عێراقی ســـەربگرێ، ئیدی پێش ئەوەی لەگەڵ حکوومەت بگەنە یەک، یەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتان هێرشـێکی چەکداری کردە سـەر بارەگاکانی حیزبی شـیوعیی عێراقی لە ناوچەکانی خۆیان و، دەیان ئەندامی لێ کوشـتن وژمارەیەک ئەندام کادیریشـــی لێ بەدیل گرتن و دەســـتیشـــی بەســـەر دەزگاکانی ڕاگەیاندنیاندا گرت.

پێدەچێ ئەو کێشە توندەی نێوان هەردوولا، دوژمنارییەکی هەمیشەیی بێ و هیی سالّی ١٩٦٣ بێ، ئەو کاتەی شیوعییەکان لە هەندی ناوچەی کوردستان کۆبوونەوە، کە لەبن دەستی بزووتنەوەی چەکداریی کورد بوو، تا خۆیان لە دڕندەیی کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بپارێزن. شیوعییەکان لەگەڵ هەڵویستی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان بەرەوڕوو دەبوونەوە کە نەیاری حیزبی شیوعی بوون، کەچی مەلا مستەفای بارزانی داوای حکوومەتی ڕەتکردەوە و شیوعییەکانی ڕادەست نەکردەوە. کە کوتلەی ئیبراهیم ئەحمەد ەلال تالّەبانییشلە ١٩٦٤ لە پارتی دیموکراتی کوردستان جودابوونەوە و، چەکیان دژی مەلا مستەفای بارزانی هەلگرت، هەندێ جار و لە هەندێ ناوچە شەڕ لەنێوان ئەو کوتلەیە و دەستە پشتیوانییەکانی شیوعییەکان روویدا. جەلال تالەبانی، لە ڕووی فیکری و سیاسییەوە لەگەل ئەوەی نەبوو حیزبی شیوعی لە کوردستان بێ، جا شەڕەکە، بە دەست تێکەڵکردن لەگەل حکوومەت، لە یەکی ئایاری١٩٨٣ لە ناوچەی پشتئاشان ڕوویدا.

ئەگەرچی ئەو دوو حیزبە لە بەرەی نیشتمانیی نەتەوەیی دیموکراتی "الجبهة الوطنية القومية الديمقراطية- جوقد"[61] هاوپەیمانی یەکدی بوون، کەچی هێرشکرایە سەر حیزبی شیوعی. ئەو هێرشە پتر لە "١٢٠" سەهید و بریندار و بێ سەروشوێنی لێکەوتەوە.

مەبەستی یەکێتی لەو هێرشەدا ئەوەبووبی بەر بە داگیرکاریی ئێران بگرێ، یانیش بەسای هاوکاریی حکوومەتی بەغدا دەست بەسەر دەسەلاّتی کوردستاندا بگرێ، خەلّک سەریان لەو خێرا بەرەوپێشچوونەی دانوستانەکانی نێوان یەکێتیی نیستمانی و حکوومەت سوڕما. بەلاّم ئەو دانوستانانە هەر لەناو خودی یەکێتیی نیستمانیدا بێ نەیار نەبوو، چ بالّی ڕاستڕەوی کە دژی سیوعییەکان بوون و چ بالّی چەپی پێیوانەبوو دوژمنایەتیکردنی سیوعی سوودێکی هەبێ.

---

[61] _ بەرەی نیشتمانیی دیموکراتی:بەرەیەک بوو لە ١٢ای تشرینی دووەمی١٩٨٠ لە دیمەشق دروستبوو بریتیبوو لە هەریەک لەوانەی خوارەوە:

١_ حیزبی شیوعیی عێراقی- عەزیز محەممەد ٢_ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی- جەلال تالّەبانی ٣_ بزووتنەوەی سۆشیالیستی عەرەبی- جەواد ئەلدوش ٤_ سەرکردایەتیی قوتریی عێراقی حیزبی بەعس – جەبار کوبەیسی ٥ _ پارتی سۆشیالیست- ڕەشید مەجید ٦_ بەرەی ڕزگاریخوازی میللی- هانی حەسەن ئەلنەهر ٧_ دیموکراتە سەربەخۆیەکان- حەسەن ئەلنەهر ٨_ حیزبی سۆشیالیستی کوردستان- مەحمود عوسمان.

چونکە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و ڕێکخراوی قوتریی عێراقی حیزبی بەعس رازی نەبوون پارتی دیموکراتی کوردستان بێتە ناو بەرەکەوە، حیزبی شیوعی لە ٢٩ی تسرینی دووەمی ١٩٨٠ بەرەیەکی دیکەی دروستکرد وبە بەرەی دیموکراتیی نیشتمانی ناسرا"الجبهة الوطنية الديمقراطية-جود" ، سەرباری پارتی و شیوعی ، حیزبی سۆشیالیستی کوردستان و پارتی گەلی دیموکراتی کوردستانیشی تیدابوو.

ئەو ڕێککەوتنەی لەنێوان سەدام حوسێنی سەرۆکی عێراق و جەلال تاڵەبانیدا کرا، واژووی لەسـەر نەکرا و، هەریەکەیشـیان ئۆبالەکەی داوێتە ئەسـتۆی ئەویدی. جەلال تالەبانی دەڵێ ئەو فسارانەی تورکیا خستییە سەر حکوومەتی عێراق لێنەگەرا ڕێککەوتنەکە واژوو بکرێ و، عێراقیش پێویسـتی بە تورکیابوو تا پێداویسـتییەکانی شـەڕی لە خاکی تورکیاوە بگاتە دەسـتی. للەکاتێکدا سـەدام مۆرنەکردنەکەی وەها لێکدایەوە و گوتی: "ئێمە ویسـتمان یەکێتیی نیشـتمانی لە بەڕێوەبردنی ئۆتۆنۆمیدا بەشـداربێ، بەڵام دەرچوو جەلال دەیەوێ هەموو دەسـەڵاتی ئەوێی لەبن دەسـتیدابی و جێ پێیەکمان لە کوردسـتان بۆ نەمێنێ". ئێمەش پێمانوایە هەردوولا ڕاستدەکەن.

## یەکەم دیداری دوای دەستلەکارکێشانەوەم، لەگەڵ سەدام حوسێن:

لە بەرایەکانی ١٩٨٧، دادگای تایبەت، بەتۆمەتی ئەوەی ویستوویەتی ژمارەیەک بەعسیی جیابووەوەبە قاچاغ لە کوردستانەوە بباتە دەرەوەی عێراق، حوکمی لە سێدارەدانی بۆ خزمێکم دەرکرد، ئەویش پیرۆت فازڵ تاڵەبانیی پارێزەر بوو. ئەو کەسە یەک لە کەسایەتییە دیارەکانی بەرەبابەکەمان بوو و، لەبەر مکوڕیی خانەوادەکەشمان، لە نامەیەکدا داوام لە سەرۆک کرد ڕێی دیدارم بداتێ و، لەو ماوەیەسدا حکوومەت دەستی بە ڕاگواستنی ژمارەیەکی جووتیارانی کورد کردبوو وگوندەکانی دەڕووخاند و کێڵگەکانی وێران دەکرد و سەرچاوەکانی ئاوی کوێردەکردەوە و، زەرداوی گوندی ئێمەش یەک لە گوندە ڕووخێنراوەکان بوو.

لە شەشی ئایاری ١٩٨٧، تەلەفۆنێکم لە سکرتێری سەرۆک سەدامەوە بۆ هات و سەعات دەی ئەو ڕۆژەی بۆ دیدارەکە دیاری کردبوو و ئۆتۆمۆبیلێکیشی هەنارد تا بمباتە کۆشکی کۆماری.

سەدام حوسین دۆستانە پێشوازیی لەکردم و زۆری بەخێرهێنام. دەستم لێ بە قسان کرد: سەرۆکی بەڕێز بە تکایەک و گازندەیەکەوە هاتووم. خزمێکم لە بەقاچاغ دەرکردنی ژمارەیەک بەعسیی جیابووەوە تێوەگلاوە و هەمووان حوکمی لەسێدارەدانیان بۆ دەرچووە. ئەو لەبەر دژایەتیکردنی ئێوە و بۆ خیانەتی هاوکاریی بێگانە ئەو کارەی نەکردووە تا شایانی مردن بێ، بەڵکو لەبەر دۆستایەتیی نێوان خانەوادەکانمان و، نەخەملاندنی ئاقیبەتەکانی ئەوکارەی کردووە و ئێستا داوادەکەم لێی ببوورن.

گوتی من سەرسام جۆن واستە بۆ ئەو جۆرە کەسانە دەکەی، هەوڵی بە قاچاگ دەرکردنی جیابووەوان و پەیوەندی بە هەڵگەڕاوان و پەیوەندی لەگەل ولاتێکی بیگانەی وەک سوریا!
گوتم: ئەو جۆرە لێپرسینەوانە بۆ من دەشێ کە سەری خۆم لە سیاسەتدا سپی کردووە. بەلام گەنجێکی وەک ئەوی ناسارەزای سیاسەت، ئاسان نییە ئەنجامی کارەکانی لێکبداتەوە.

ئەوجا سەدا حوسێن هاتە سەرباسی هەڵویستی حیزبی سیوعی ورەخنەی لەو هەڵویستەی گرت بەرانبەر دوژمنداریی ئێران هەیەتی و، هاوکاریی هەندی هێزی کۆنەپەرست دەکا. ئیدی مەسەلەی ئەو کابرایەم بۆ گێڕایەوە کە ماڵەکەی دزرابوو و دەروجیران و خزم لە دەری کۆبوونەوە و گوناهەکەیان دەخستە سەر ملی خۆی. یەک دەیگوت دەرگای ماڵەکەت قایم نییە، یەک دەیگوت دیواری حەوسەت نەوییە و....تاد. کابرا

گوتی ڕەخنەکانتان قبووڵ دەکەم، بەلام لێشتان دەپرسم داخوا دزەکە **هیچ** تاوانێکی نییە؟!
جا گوتم: منیش ئەو تێبینییەتان قبووڵ دەکەم، بەلام ئەدی خۆتان لەو ڕووداوەی هیچ سووچێکتان نییە؟ گوتی: سووچی **ئێمە** لەوەیدا چییە؟ گوتم: من لەناوجەرگەی ڕووداوەکان بووم و شووچی خۆمان و ئێووەش دەزانم.
گوتم: باسی ئەو گوندەی بۆ بەڕێزتان دەکەم کە بەشێکی زۆری ژیانم لەوێ بەسەربردووە و گوندەکەش ناوی "زەرداو"ە و سەدو دەماڵی تێدابوو و مزگەوتێک و قوتابخانەیەکی شەش پۆلی و بیرێکی ئێتیوازی و کستوکاڵێکی ڕێکوپێک. سێ کەسی ئەو گوندەی بە سەربازی خزمەت بەسداریی شەڕی ئێرانیان کرد و لەبەر ئازایەتییان مەدالیای ئازایەتییان وەرگرت و پلەیان کرایە ئەفسەر، گوندەکە ١٦ "نائیب زابت" و "٧٢" "زابت سەف" و سەربازی تێدابوو. ئەو گوندە چوار شەهید و دە بێ سەروشوێنی هەیە، ئیدی لەوەی زیاتر چییان لێ داوادەکرێ و چ مەترسییەکیان لەسەر ئاسایشی ولات هەبووە؟!
گوتی: ڕووخێنراوە؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: بۆ هەواڵت نەدامێ؟ئەگەر دۆخی گوندەکەم بزانیبا و بمزانیبا بۆتۆش چییە هەلاوێردەم دەکرد. گوتم: من مەبەستم تەنیا ئەو گوندە نییە، بەڵکو باسی ئەو ڕێوشوێنە سەیرەی بە گشتی دەکەم. گوتی: **ئێمە** بڕیارمانداوە هیچ بەشێکی نیشتمان، هەتا نەیکەینە خاک، نەدەینە دەست دوژمنی ئێرانی. بۆ نموونە ئەگەر بەسرایان هەڵبژارد و ئەگەر نەمانتونی بەرگریی لێ بکەین، ئەوا پێش ئەوەی بیدەینە دەستیان ئەوا لەگەل خاکی ڕاستدەکەین. ئێستاش، ئێرانییەکان کوردستانیان هەڵبژاردووە بیکەنە گۆڕەپانی هێرش، جا ئێمە هەر گوند و شارۆچکەیەکی نەتوانین بیپارێزین تەختی دەکەین. هەرچی گوندەکانی دەوری ئەو شارۆچکانەیەشن کە بڕیارمانداوە بەرگرییان لێ بکەین ڕەنگە گوندەکان زیانیان بۆمان هەبێ، ئەوا لە بەر پێداویستیی شەڕ بڕیارمان داوە بەشێوەیەکی کاتی تەختیان بکەین. گوتم: سەرۆکی بەڕێز ڕێم بدە تا پێتان بڵێم بەو کارەتان گەلی کورد لەدەستدەدەن. گوتی: لەوەی باشترە هەموو عێراقمان لەدەست بچێ، کوردەکانیش گەلی خۆمانن، ئەگەر ئەوڕۆش لێمان توورەبن سبەی لەگەڵمان ئاشتدەبنەوە.
گوتم: بەلام تەنیا دوای لەدەستدانی گەل عێراقتان لەدەستدەچێ.
ئەوجا سووسەیەکی دایە سکرتێرەکەی لێبووردنیک بۆ پیرۆتی پارێزەر و ئەوانەش دەربکا کە لەگەڵی حوکمدراون دەربکا ێدارەوە بۆ بکاتە بەندیی هەتاهەتا. گوتم: سەرۆکی بەڕێز من بۆ ئەوە نەهاتووم تاهەتایە لە بەندیی بێڵییەوە،هاتووم لەگەل خۆمی ببەمەوە. گوتی: ئێستا لە مردنێوە بۆ ژیان و دوایەش لەپشت دەرگای زیندانەوە بۆ دەرەوە. گوتم؛ ئەوە بەڵێنە؟ گوتی: بەڵێ بەڵێنە. گوتم: بەڵێنی مەردان قەرزە. ئەوجا تا دەرگا بەڕێیکردم.

له دیداریکم لەگەڵ سـەرۆک سـەدام حوسـێن، کە لای دەرگای بەڕێی دەکردم، بەڵێنەکەیم بەبیرهێنایەوە. گوتی: ئەوە پێویستی بە بڕیاری ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش هەیە. گوتم: جا چ دەفەرموون، واسـتەیەکتان لە ئەنجوومەنی سـەرکردایەتیی شـۆڕش بۆ بکەم؟ من یاسـاناسـم و دەزانم لێبووردنی تایبەت لە دەسـەڵاتی سـەرۆککۆماردایە و پویسـتی بە بڕیارێکی ئەنجوومەنی سـەرکردایەتیی شـۆڕش نییە. بە سـکرتێرەکەی گوت: بڕیاری لێبووردنەکەی بۆ دەرکە.

کە چوومەوە ماڵەوەش، خزمێکم هەنارد تا مژدەی ئەوەی بداتێ خوایاربی لە ماوەی هەفتەیەکدا مەرسوومی لێبووردنی بۆ دەردەچێ، بەڵام لەگەڵی هاتەوە ماڵی خۆمان، ئەوان بە تەلەفۆن پێیانگوتبوون بەریدەن و دواترێ مەرسوومی لێبووردنەکەی دەردەچێ.

قسەکانی سەرۆک سەدام حوسیم سەبارەت بە حیزبی سیوعی پاڵپێوەنام داوای دیدارێکی تایبەتی دیکەی لەگەڵدا بکەم، تا تاوتوێی ئەوەی بکەین داخوا ئاستبوونەوەیەکی نیشتمانیی گشـتی و گشـتگیر ڕێی تێدەچێ، تا ڕێ بۆ گۆڕانکارییە دیموکراتییەکانی وڵات بکاتەوە، ئاخر ئۆپۆزسیۆن چەندی پێویست بەوەی بوو ڕاوەدوونان و سـەرکوتکردن و گەڕانەوە ناو چالاکیی سیاسیی پێویست بوو، سەدام حوسێن و بەعسیش، ئەوەندە پێویستیان بەو ئاشتبوونەوەیەی هەبوو تا ئەو شەرە تاقەتپرووکێنەی لەگەڵ ئێران کۆتایی پێبێ، نەخاسمە کە وڵاتانی کەنداو ئاشـکرایان کردبوو چیدی ناتوانن خەرجیی شـەڕێکی درێژخایەنی ئاوەها دابین بکەن و، جا ئەو دیدارە بە مەبەسـتی ئەو ئاشـتەواییە نیشـتمانییە کرا کە دەستەبەر نەبوو.

## بەعس بیرۆکەی ئاشتەوایی دەخاتەڕوو:

کە بەڕێز روحوڵڵا خومەینی، لە ١٩٨٤ دوو ملیۆن ئێرانی کۆدەکەینەوە و بەسەرعێراق دادەدەین و شەڕەکە دەبەینەوە و کۆتایی پێدێنین، من بیرۆکەی جێبەجێکردنی ئاشتەواییەکی نیستمانیی گشتیم لە عێراق خستەڕوو. دۆخی بەرەکانی شەڕ شلۆقبوون. کشانەوە و شکستە سەربازییەکانی سوپای عێراق لە ناوچەی ئەهواز شوێنەوارێکی خراپی لەسەر وەی سوپای عێراق بەجێهێشتبوو. وڵاتە زلهێزەکانیش لە هەوڵی درێژکردنەوەی شەڕەکەیدابوون تا توانا سەربازی و ئابوورییەکانی ئەو دوو دەوڵەتەدراوسێیە دادۆشن کە نەوتی وڵاتەکەیان خۆماڵی کردبوو و،بگرە ئێران، لە ناوجەیەکی دەووبەری کەرکووک دەستی بە بۆردوومانی دامەزراوە نەوتییەکانیش کرد و، ئەو وڵاتا عارەبانەی خەرجیی شەڕیاندابین دەکرد درکیان بەوەی کرد شەڕەکەدرێژە دەکێشێ و شەڕ بەشێکی زۆری داهاتە نەوتییەکانیان دەبا، ئیدی بەدوای ڕێ و چارەیەکدا دەگەڕان بۆ کۆتایی بەشەڕەکەی بێنن، ئەگەر بە کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی بەعسیش بێ لەعێراق.

ئیدی داوام لێ کرا ناوبژیوانییەک لەنێوان حکوومەت و هێزەکانی ئۆپۆزسیۆندا بکەم و، ڕاستییەکەی هەردووڵاش رازیبوون و، دەرمخست کە مننوێنەری حکوومەت نیم تا گفتوگۆ لەگەڵ حیزبە کورستانییەکان بکەم، بەڵکو خبەخشانە هاتووم ناوبژیوانی بکەم تا ئاستەواییەکی گشتگیر لە عێراق بەرپابێ و، بەدەنگەوەهاتنی حیزبە کوردستانییەکان و ئەوانیدیش هانیدا کەو کرداری ئاشتەواییە بەردەوام بم.

سەرباری هەڵوێستە باشەکەی حکوومەتی عێراق بەرانبەر ئاشتەوایی نیشتمانی، بەلام هێشتا لە رووخاندنی گوندە سەر تخووبەکانی نێوان حکوومەت و چەکدارە کوردەکانی سەربە حیزبە کوردییەکان بەردەوام بوو و، پاساویشی ئەوەبوو نایەوێ هیچ پارچەیەکی نیشتمان بە ئاوەدانی بداتەدەسەت ئێرانی دوژمن.

پاساوی من، بۆ ئەو بیرۆکەیەی ئاشتەوایی گشتییە، لەوەیدابوو کە کێشەی کورد یەک لەو پەڵپ و بیانووانەبوو دوژمن گرەوی لەسەر دەکرد و، ئاڕاستەیەکی جیهانیی خامۆشکردنی ئاگری شەڕی ناوخۆ و چارەسەری ئاشتییانەی کێشە ناوخۆییەکانیش هاتبووە گۆڕێ. پێموابوو گەڕانەوەسەر ئەو هاوپەیمانییە نیشتمانییەی لە حەفتایەکانی سەدەی بیستەم و پتەوکردنی بەرەی ناوخۆڕێیە دروست و بێکێشەکەی دەرچوونە لەو تەنگژەیەی وڵاتی پێدادەڕوا و، سنوورێکیش بۆ ئەو بارە ئازارووییە دابندرێ کە گەلی کوردی تێدا دەژی.

نامەیەکم بۆ جەلال تاڵەبانی هەنارد و هەرەگرنگی ناوەرۆکەکەی ئەوەبوو: "پێموایە دەبێ پێش هەموو شتێک شەڕ لە کوردستان دوورخەینەوە و، ئازاری گەلەکەمان کەمکەینەوە.

تا گەلەسمان نەبێتە گەلێکی بێ لانەی ئەو دەرک و ئەو دەرکی دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان بکا، دەبێ کار بۆ ئەوە بکەین کورد بچنەوە ســـەرخاکی خۆیان و گوندە رووخاوەکانیان بنیات بنرێتەوە.

لە نامەکەی بۆ حیزبی شـــیوعیم هەنارد، بۆم روونکردنەوە: "هەســـتی خەڵکەکە لەگەل ئاشتبوونەوەیە و، ئامادەنەبوونی شیوعییەکان لەسەر سانۆی سیاسیی بەغدا بۆسایییەکی دوستکردووە کە توێژی ڕاستڕەو و کۆنەپەرست پڕیانکردووەتەوە و، گفتوگۆش کەشـە ســـیاســـییەکەی ناوچەکە دەگۆڕێ و ڕەنگە هەموو پلانەکانی ئیمپریالیزمی، لە هەوڵدایە چاوگەی ململانێ دروستکا، شکست بێنێ و سۆڕسە نیشتمانییەکان لە هامێز بکا، تا بێنەوە ناوچەکە و هەبن".

لەهەمانکاتیشدا، نامەیەکم بۆ بەڕێز مەسعود بارزانی هەنارد، گرنگترین شتی باسمکردبوو ئەوەبوو: "ئێوە ســـەرباری کێشـــەی گەلی کورد، کێشـــەیەکی تایبەتیشـــتان هەیە، ئەویش کێشـــەی ئەو بارزانییانەیە کە جەندین جار تووشـــی پەرتەوازیی و ســـەرکوتکردن بووینە، ئەو کێشـــەیەش تەنیا لەناو چارەســـەری کێشـــەی گشـــتیی کورد و کێشـــەی دیموکراتیی عێراقە".

ســـەرباری ئەوەی وەڵامی باشـــی ئەو نامانەم بۆ هاتەوە کە ناردبوومن. حکوومەت داوای لە حیزبە کوردستانییەکان و حیزبی شیوعی کرد چ ڕێچکەیەکیان بۆ هاوکاری پێ باشە با ڕایگەیەنن، هەرچی حکوومەتیشـــــە، ئەوا لە چوارچێوەی کۆمـاری عێراق و چوارچێوەی یەکێتیی نیشـــتمـانی، پـابەنـدی ئۆتۆنۆمیی گەلی کوردە و، گوتیشـــی پـابەنـدی ڕێوانە کۆمەڵایەتییەکە و ئابووریەکەیشـــی دەبێ. یەکێتیی نیشـــتمانیی کوردســـتان، وەک بەڵگەی نیازپاکی، داوای کرد شـــەڕی نێوان هەردوولا ڕاگیرێ. حیزبی شـیوعییش داوای کۆمەڵێ ڕێوشـوێن و کاری کردەنیی لە حکوومەت کرد، تا بزانرێ کار بۆ کۆتاییهاتنی ڕوالەتەکانی ســـتەم و زۆرداری و ڕاگواســـتن و بەعەرەبکردن و دووپـاتکردنەوەی دیموکراتی و پەرەپێـدانی دامەزراوەکـانی ئۆتۆنۆمی و ڕاگرتنی شـــەڕی دژی گەلی کورد، دەکرێ. ڕێوشـوێنێکی ئەوتۆش بگیرێتەبەر دڵنیاییەکی سـیاسـیی بۆ حیزبەکان و ئەو هێزانە تێدابێ کە پەیوەنـدییـان بە گفتوگۆوە هەیە، وەک ڕاگەیـانـدنی لێبووردنی گشـــتیی بێ مەرج و بەردانی بەندی و گیراوەکان و، بواریش بۆ جووتیاران برەخســـێندرێ بچنەوە ســـەر گونـدەکـانیـان. شـــەڕەکەش، دوای بەکـارهێنـانی چەکی کیمیـایی دژی ئێران، بەلای بەرژەوەندیی عێراقییەکاندا شکابووەوە و، لەبەر ئەو بارە نوێیەش وای لە حکوومەت کرد بەرانبەر مافەکانی گەلی کورد پێی بجەقێنێ و مل نەدا. سـەدام حوسـێنی سـەرۆکی عێراق بە نالەباری و وەڵامی داواکارییەکانی حیزبە کوردستانییەکان دایەوە و بەئەنجەتی ئەوەی

دەســـتیان لەگەڵ بێگانان تێکەڵە ڕازی نەبوو شـــەڕیان لە دژی ڕاگرێ و، لەبیری چووبوو خۆیشی بە دەست لەدەستی سای ئێران نان و دەستبەرداربوونی بەشێک لە خاک و ئاوی عێراق، توانیبووی لە ١٩٧٥ بەســـەر بزووتنەوەی کوردیدا زاڵ بێ و، حکوومەت پێیوابوو کوردەکان ئێرانییەکانیان هێنابووە ناو هەڵەبجە و ئیدی بە چەکی کیمیایی لێیدا و لەناوی برد. جا بەڕێز جەلال تالەبانی دەیگوت گوایە لەگەڵ ءیرانییەکان لەســـەر دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی ڕێککەوتووە، لەکـاتێکـدا ئێرانییەکـان دوژمنی هەرە ســـەرســـەختی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردین.

لەگەڵ ئەوەســـدا، ســـەدام حوســـێنی ســـەرۆکی عێراق، داوای ڕاگەیاندنی ڕێ و ڕێچکەی ئاشـــەتبوونەوەی دەکرد، تا بی ئەوەی ئامادەی گتوگۆیەکی بنیاتنەر بێ، بڵێ "بەڵێ" یان "نەخێر".

ئەو حیزبانەی پەیوەندیم پێوەکردبوون هەریەک لە، حیزبی شـــیوعیی عێراقی و پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و حیزبی سۆشیالیستی دیموکرات بوون، ئەوان هەموویان هەلوێستیان باش بوو، بەڵام سەرۆک سەدام حوسێن، دەیویست چاوەڕێی کۆتاییهاتنی شەڕێ بکا تا لە لە پێگەی بەهێزییەوە گفتوگۆیان لەگەڵ بکا.

ئێمە پێمانوایە، کە یەکێتیی نیسـتمانیی کوردســتان هاریکاریی ئێرانییەکانی کرد تا بێنە ناو شارۆچکەکانی "بیارە وتەوێڵە و خوورماڵ ونەوسوود و هەڵەبجە"، کارێکی هەڵەی کردووە و هەزاران قوربـانیی کوردی لێکەوتەوە و، دیـاریش بوو کە حکوومەتی عێراق بەنیـازە کوردســـتان وێران بکا و، تورکەکان لە ١٩١٥ چییان بەســـەر ئەرمەنەکان هێنا، ئەویش گەلی کورد ئاوا لەناو ببا و ڕایگوێزێ.

هەر بەڕاســـتییس دەســـتی بە ڕاگواســـتنی هەزاران خێزانی کورد کرد و، لەو کۆمەڵگا زۆرەملێیانەی نیشتەجێ کرد کە هاوشێوەی ئەو نیستەجێیانەبوونویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڤێتنام دروستیکردن. سەرباری ئەوەش، جەماوەر هەر پەیوەستی ئەو بیرۆکەیە بوو کار بۆنەهێشـــتنی زۆرداری بکا و بابەتەکان بەرەو چارەســـەرێکی ئاشـــتییانەی دیموکراتی و ئاسەواییەکی هەمەگیر ببا.

دەتوانم دەرەنجامەکانی پەیوەندیکردنی نێوان حکوومەت و بەرەی کوردســـتانی بەوجۆرە کورتکەمەوە[62]:

---

62 _ بەرەی کوردســـتانی: بەرەیەک بوو لە ١٢ی ئایاری ١٩٨٨ بەناوی"بەرەی کوردســـتانیی عێراقی" دامەزرا وهەریەک لە حیزبی شـیوعیی عێراقی و پارتی دیموکراتی کوردســـتان و یەکێتیی نیشـتمانیی کوردســـتان و حیزبی سۆشیالیستی کورد و پارتی گەلی دیموکراتیی کوردستانی تدابوو.

یەکەم: چۆنیەتیی گفتوگۆ، دەکرێ گفتوگۆیەکان لەو خاڵەیڕا دەستپێبکەنەوە کە لە ١٩٨٣ لەنێوان حکوومەت و یەکێتیی نیستمانیی کوردستانیدا ڕاوەستابوو، دەشکرێ لەسەریرا دەستی پێ بکرێتەوە.
دووەم: بنەماسەرەکییەکانی گفتوگۆ ئەوەیە، دەبێ لە کوردستان گفتوگۆ جێی شەڕ بگرێتەوە و، ئەو هەنگاوەش سەرەتای قۆناغێکی نوێی ژیانی گەلی عێراق بێ.
سێیەم:بە دەرکردنی لێبووردنی گشتی و بەردانی هەموو بەندی و گیراوە سیاسییەکان و ڕێدانی ئەو جووتیارانەی ڕاگوێزراون بچنەوە گوندەکانیان و یەکسەر ڕاگرتنی شەڕ، ڕێ بۆ گفتەگۆ خۆشبکرێ.
چوارەم: ئەو کێشانەی دەبێ لە گفتەگۆدا باسیان بکرێ بریتیین لە ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کوردستان و چۆنیەتیی بەشداریکردنی کورد لە حکوومەتی ناوەندی و دامەزراوەکانی و پەرەپێدانی یاسای ئۆتۆنۆمی و بووژاندنەوەی ژیانی حیزبایەتی و ڕێکراوە سیاسی و سەندیکاییەکان و.....تاد.
لە ماجەرای نێوانگیرییەکەیڕا دیاربوو حکوومەت یەک تۆزیش لە هەڵوێستەکانی پێشترێی کەلی نەدەبوو و، ووریشبو لەسەر ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ بەرەی کوردستانیدا نەکرێ چونکە هاوکاریی هەردوو ڕژێمی سووری و ئێرانییان کردووە و، گفتوگۆیەکانیش ڕاستەوخۆ و لە بەغدا بکرێن و، حکوومەت دیاری بەڕێز جەلال تاڵەبنییشی وەلانابوو.
ئاشکرا دیاربوو حکوومەت دەیەوی حیزبە کوردستانییەکان لێککاتەوە و یەکێتیی نیشتمانی دابڕێ، جا ئەگەر ئەو کێشانەی لەناو ڕیزەکانی ئۆپۆزسیۆندا هەبوون، سەرباری ئەوەی لە بەرەی کوردستانیشدابوون، بخەینە سەر ئەو هەموو کێشانە ئەوا دەردەکەوێ دروستکردنی پێکەوە گونجانێک بۆ ئەو هەموو دژیەکییە چەند قورسە.

**هەڵوێستی حیزبی سیوعی بەرانبەر گفتوگۆ لەگەڵ بەعس:**

سەبارەت بە بابەتە نیشتمانییەکان و بابەتی جارەی خۆ نووسینی گەلی کورد و مافەکانی کەمە نەتەوەکان و بەرکەماڵیی دیموکراتیی سیاسی و کۆمەڵایەتی، هەڵوێستی حیزبی سیوعی لە هەڵویستە هەرە روونەکانی حیزبە عێراقییەکان بوو.
لەکاتی خستنەرووی بیرۆکەی ئاشتەوایی نیشتمانیی گشتگیر لە ١٩٨٨، سەرباری ئەو هەموو ڕووداوە پڕ مەینەتییەی لە عێراق بە گشتی و لە کوردستان بە تایبەتی ڕوویدابوو، عەزیز محەممەدی سکرتێری یەکەمی لیژنەی مەرکەزی باوەڕی بەوەی هەبوو دەبێ حیزبی سیوعی لەناوجەرگەی ڕووداوەکان بێ، نەک لە پەراوێز و دیوی پشتەوە. پێیوابوو پەلکێشکردنی حیزبە کوردستانییەکان بۆ هاوکاری و بەرگرتنی ئەو داڕووخانەی باری

سیاسی و دەرکردنی ولات لەو تەنگژەیەی سەرکردایەتیی حیزبی بەعس تێیخستووە، پێویستییەکی هەنووکەییە.
حیزبی شیوعییش، مەینەتی کێشەی ناوخۆ و کوتلەکاری و جیابوونەوەی هەبوو و ئەو کێسانەیشی لەوەیرا سەرچاوەیان گرتبوو کە نەیتوانیبوو لە هەهەنگاوی بەرەو دیموکراتی جوونی عێراق بەردەوام بێ. هەر هەموو ئەو شتانەس کاریگەرییان لەسەر هەڵێنانەوەی هەر هەنگاوێکی بوێرانە هەبوو بتوانی لەو قەیرانەی بینێتەدەرێ و، سەرکردایەتیی حیزبیش ئەو گفتوگۆیانەی سەبارەت بە ئاشتەوایی لەگەڵیدا دەکران، لەترسی پارچە پارچەبوونی دیکە، لە کادیر و ئەندامەکانی خۆی دەشاردنەوە.
چونکە حیزبی سیوعیی عێراقی دووچاری ئەو کوتلەسازی و دابڕانانەی خوارەوە ببوو:
١_ ئەو کوتلەیەی فەخری کەریمی لە دیمەشق دادەنیشت سەرۆکایەتیی دەکرد و، کەوتبووە ژێر فشاری سورییەکان و ئۆپۆزسیۆنە عێراقییەکانی لەوێبوون تا بەهیچ جۆرێک ئاشتەوایی لەگەڵ حیزبی بەعسی عێراقی نەکا، جا فەخری کەریم هەڕەسەی ئەوەی لە حیزب دەکرد، ئەگەر گفتوگۆ لەگەڵ بەعس بکا، ئەوا جیادەبێتەوە حیزبێکی شیوعیی دیکە دادەمەزرێنی.
٢_ کوتلەکەی بەهادین نوری، سەرباری بچووکیی کوتلەکەیش کەچی سورییەکان توانای ئەوەیان بۆ ئامادەکردبوو ڕۆژنامەیەکی جودا لە حیزبی سیوعی دەرکا و هێرش بکاتە سەر سەرکردایەتیی حیزب و بە لادان تاوانباری بکا.
٣_ کوتلەی مینبەر: عامر عەبدوڵڵا و نوری عەبدولڕەزاق حوسین ئەو کوتلەیەیان دامەزراند و ئەو کەسانەی کێشەی سیاسی و تایبەتییان لەگەڵ مەکتەبی سیاسیی حیزبی شیوعی هەبوو لەدەوری کۆبوونەوە.
٤_ کوتلەکەی زەکی خیری کە پەیوەستی دروشمی ئاگربەست بوو لە کاتی شەڕی عێراق و ئێراندا. زەکی خەیری پێیوابوو سروشتی شەڕگۆراوە و لە شەڕێکی شەڕنگێزیی عێراق دەستی پێکردبوو، دوای ئەوەی سوپای ئێران دەستی بە هێرش کرد و سنووری عێراقی بڕی، ئیدی شەڕەکە ببووە شەڕی ڕزگاری. بۆیە پێویستە شیوعییەکان بچنە کانگای شەڕی ڕزگاری و لای حکوومەتی سەدام حوسین بگرن. حیزبیش ئەو هەڵوێستەی بە چەقبەستنێکی بیروباوەڕ و لێکدانەوەیەکی کرچوکاڵی مارکسیزم لینینیزم دانا.
٥_ کوتلەکەی باقر ئیبراهیم: حیزبی سیوعی، بەهادین نوریی ڕاسپاردبوو هەندێ ڕێکخراوی نهێنی بۆ حیزبی سیوعی دامەزرێنی، بەڵام سیاسەتی لەناوبردنیان بەرانبەر پیادەکرا، ئیدی رایگەیاند لەو کارەدا سەرنەکەوتووە و، عێراقی بەجێهێشت و چووە دەرەوە. جا پەنای بۆنووسینی دووردرێژی بیرەوەرییان برد سەبارەت بو "لادانانە"ی

حیزب کە لەوەتیی لەگەڵ بەعس دەستی بە گفتوگۆکردبوو ئەولادانانەی لێ پەیدابیوو، واتە ئەو ماوەیەی خۆی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حیزبی سیوعی بووە و بەشداریی زۆربەی هەڵویست و رووداوەکانی کردووە بێ ئەوەی هەڵوێتێکی پێچەوانەی هەبووبێ.
٦_ ئەگەرچی ئەو رێزیکی لای حیزبەکانی بەرەی کوردســـتانی هەبوو و دەشـکرا رۆڵێکی ناوازەی لەو ماوە ناسـکەی بزووتنەوەی نیشـتمانیی عێراقدا هەبێ، کەچی ئارا خاچادۆری ئەندامی مەکتەبی سـیاسـی، پشـتی ڕای کوتلەیەکی دەگرت کە لەحیزبی سـیوعیی عێراقی هەڵگەڕابوونەوە.
نامەکەی بۆ مەکتەبی سـیاسـیی حیزبی سـیوعیی عێراقیم ناردبوو، بۆی روونکردبوونەوە ئامانج لە گفتوگۆ چییە و گرنگترین شتی لە نامەکەشدا هاتبوو:
"ئەوە خۆ لە حەوت مانگی دەدا لە هەوڵی ئەوەیمە بارودۆخی عێراق بەرەو دەستەبەرکردنی ئاشـتەواییەکی نیسـتمانی ببەم، ئیدی پەیوەندیم بە حیزبەکانی ناو بەرەی کوردسـتانییەوە کردووە و لەوانەس حیزبی سیوعی، نێ بەڵکو بەو رێز و سەنگەی لای حیزبەکانی دیکەی هەیە کارەکان بەرەو چارەســەرێکی گونجاوی ئەو قەیرانەی وڵات ببا و دەرووێک بۆ ئەو تەنگژەیە بدۆزێتەوە کە عێراقی تێخراوە. بارودۆخی کوردســـــتان، گۆڕەپانی ســــەرەکیی چالاکییەکانی بەرەی کوردســـــتانی، تـا بڵێی نـاخۆشـــە. ســــەدان هەزار خانەوادەی پەرتەوازەکراوی کورد لە چۆلەوانییان دەژین و برسـییەتی و سـەرما و نەخۆشـی سـەری تێناون و، دەشـزانن ئەوان بە هەنجەتی هاریکاریکردنی ئەو بزووتنەوەیە ئەوەیان بەسـەر هێنراوە کە لەکوردستان هەیە. دەی با چاوەڕێکەین بزانین کێ دەروویەکی دەرازبوون لەو دۆخە پڕ مەینەتییەیـان بۆ دەدۆزێتەوە کە ئەوانی تێـدان! من پێم راســـت نییە ئەو سـەروبەرکردنانەی ئێسـتا دەکرێن لە کادیرە بنەرەتییەکانی حیزبیان بشـارنەوە و لە نێوان ژمارەیەکی کەمی ئەندامانی مەکتەبی سیاسـیدا بمێنێتەوە. ئێسـتا ترسـی ئەوەی لە ئارادایە هەنگاو بەرەو دەســـتپێکردنی گفتوگۆیەکی پێش وادە لە هەر لایەوە بنرێ و هەردوولا راســتەوخۆ بگەنە یەکدی. راســـتە کە ســـەرایی هەندێ پاشــەکشــە لە هەندی بابەت لە حکوومەت دەرکەوتووە کە لە بەژەوەندیی وڵاتیشـــن، بەلام نابێ جاوەڕێی چارەســـەری ئامـادەکراو لە حکوومەت بکەن، بەڵکو دەبی تواناتـان کۆکەنەوە تـا بارەکە ببەنە جێگەی باشتر.
گۆڕەپانی کوردســتان، ئەگەرچی گۆڕەپانی ســەرەکیی ئێوەیە، بەلام دوا گۆڕەپانتان نییە، چونکە کێشـــەکە لە بەغدا نەبێ چارەســـەر نابێ. من **هیچ** پاســـاوێک بۆ دوودڵیی ســـەرکردایەتیی حیزبی شـــیوعی نابینمەوەســـەبارەت بە قبووکردنی گفتوگۆ، کە تا چاو

هەتەر بکا چارەسەریکی دی لە ئاسۆدا نەبوو، ڕەنگە هەندێ حیزبی دی لەبەر شلۆقیی بارودۆخیان بەتەنیان گفتوگۆ بکەن، ئەوەش هەڵوێستی ئێوە زۆر لاواز دەکا".
ئەگەرچی، عەزیز محەممەدی سکرتێری یەکەمی لیژنەی مەرکەزی قەناعەتی بەوەی هەبوو لەو بارودۆخەدا **هیچ** بژاردەیەکی دیکە بەدەستەوە نییە بەڵام ئەو، کۆتوبەندی ئەو بڕیارانە بوو کە لە کۆنگرەی چواری حیزبی شیوعیی عێراقی لە ۱۹۸۵دەرچووبوو و ڕەخنەی لەو سیاسەتەی هاوپەیمانی گرتبوو کە حیزب لە کۆنگرەی سێ لەسەری ڕۆیشتبوو، لەکاتێکدا ئەو سیاسەتە مایەی پشتگیریی جەماوەری فراوانی عێراق و بەردڵیی هێزە ڕزگاریخوازی و پێشکەوتنی دنیابوو.
حیزبی شیوعی کۆتوبەندی بڕیارێکی پێشتریی لیژنەی مەرکەزیی حیزب بوو کە دەبوایە گفتوگۆ لە دەرەوەی عێراق بێ و، دەبێ لەگەڵ بەرەی کوردستانیش بێ. لیژنەی مەرکەزی لە ئازاری ۱۹۸۹ کۆبوونەوەیەکی دیکەی کرد و لە بابەتەکەی کۆڵییەوە. هەڵوێستیشی ئەوەبوو کە گفتوگۆلە سنووریکەسایەتییە نافەرمییەکان تێنەپەڕیوە و هیچ شتێکی جیددی و بەرچاویشی دەستەبەر نەکردووە. جەختیس لەسەر ئەوەی کرایەوەکە گفتوگۆ، وەک شێوازێکی تێکۆشان بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجەکانمان لەکاتێکدا کە پێداویستییەکان و ڕێخۆشکردنە گونجاوەکانی بەردەست بن، دەبێ بەدەنگەوەهاتنی ئاوات و خواستەکانی گەل و بزووتنەوە نیستمانییەکەمان بێ و دەبێ بە ئاشکرا بکرێ و هەموو لایەنە نیشتمانییەکانیش بگرێتەوە.
ئەو بابەتە بۆ پارتی دیموکراتی کوردستانیش دروستە، کە کێشەی کوردی بە سەرکەوتنی ئێرانەوە بەستابووە وە لە شەڕی عێراق و ئێراندا، ئەو هەڵویستەش تەنیا زیانی بۆکێشەی کورد نەبوو بەس، بەڵکو بەدوای سەربداڕاکردن بوو.
دوای ئەوەی ئێرانییەکان شەڕەکەیان دۆڕاند و ڕازیبوون لە خاکی عێراق بکشێنەوە، هەڵوێستی حکوومەتی عێراقیش گۆڕا.
ئیدی سەدام گفتەگۆی لەگەل دۆڕاوان نەدەکرد و، لەگەل بەرەی کوردستانیشدا نایکا، بەڵکو، وەک دەربڕینی خۆی، گفتوگۆی لەگەڵ "لایەنەکان" دەیکرد، بۆیە داوای لێ نەکردن دان بە دۆڕاویی خۆیاندا بنێن و لە خستنەرووی بابەتەکانیش واقیعی بن.

## بۆ گفتوگۆ لەنێوان حکوومەت و بەرەی کوردستانیدا نەکرا؟:

حیزبە کوردستانییەکان لەگەل گفتوگۆ و چارەسەری ئاستیانەی کێشەی کورد بوون. حیزبی سیوعیی عێراقییش گفتوگۆی ڕەتنەکردەوە، بەڵام خۆی لەوەی گنخاند هەڵویستی وردی خۆی سەبارەت بە بنەماکانی گفتوگۆ دەربڕێ، و پارتی دیموکراتی کوردستانیش، چونکە ژمارەیەکی زۆری بارزانییان لە ئێران بوون، فشاری ئێران و سوریای لەسەربوو، جونکە ئەو بارزانییانە هێزی دەستوەکەری سەرەکیی پارتی بوون و ئێستاتا وەک بارمتەبوون و، حکوومەتی عێراقیش پێش ڕوونبوونەوەی دەراوی ئەنجامی گفتوگۆیەکان لێ نەدەگەرا بگەڕینەوە زیدی خۆیان. یەکێتیی نیستمانیی کوردستاتان ئامادەیی خۆی بۆ دەستپێکردنی گفتوگۆ دەربڕی تا یەکسەر لە بری بەرەی کوردستانی دەست بە گفتوگۆ بکا و دواتریش لە قۆناغەکانی دی حیزبەکانی دیکەیشی ڕەگەل بکەون.

سەرباری ئەوەی حکوومەت رەزامەندیی لەسەر دەستپێکردنی گفتوگۆ دەربڕی، بەلام یەک هەنگاویشی بۆ جاککردنی بارودۆخەکە نەنا و، ئەو لێبووردنە گشتییەی رایشیگەیاندبوو ئەنجامەکانی سنووورداربوون و، ئەو دەیان هەزار بێتاوانانەی لە کردارەکانی ئەنفالدا گیران و ژمارەیەکی زۆری ژن و منداڵ و پیریان تیدابوو، چارەنووسیان هەر بە نادیاری مایەوە و، دەنگوباسی ئەوەش هەبوو کە ژمارەیەکی زۆری فەرمانی لەسیدارەدان دەرهەق بە کوردان جێبەجێکراوە و هەر لە دادگایەکی بەناو دادگای ناياسايی بەڕیوەبەرییەکانی ئاسایشی کەرکووک و بگرە دوای دەرچوونی بڕیاری لێبووردنیش، ئەو حوکمانە دراون. چارەنووسی هەشت هەزار بارزانیش، کە هەواڵی ئەوە هەبوو گوایە هەموویان کوژراون، هەر بە نادیاری مایەوە و، ئەوانەی لەترسی شەڕ رایانکردبوو و پەنایان بۆ ئێران بردبوو و ئیستا گەڕابوونەوە تا سوود لەو بڕیاری لێبووردنە ببینن، هەموویان دەستبەسەر کران.

سەدام حوسێن، لەهەربۆنەیەکی بهاتبا پێش، کینەی خۆی بەرانبەر سەرکردەکانی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی نەدەشاردەوە و، بە مەلا مستەفای بارزانییدا هەلدەدا جونکە قبووڵی نەبوو کەس پیدرێژی بکاتە سەر پێشەوایی ئەو و، ئەگەر کارێکیشی پێ نەکرێ پەنا بۆ بێگانە نابا تا بۆی بکەن. پێیشیوابوو ئەو سەرکردە نوێیانە، ک داڕودەستەی خۆیان دەخەنە ئەو هەلویستەوە، هەر خۆیان کۆتایی بە خۆیان دێنن. پێیشی وابوو حیزبی شیوعی تاکە حیزبی ناویانە کە شانازی بە عێراقیبوونی خۆیەوە دەکا و، ئامادەشە سوود لە شەرعییەت و یاساییبوون وەرگرێ و لە عێراق کاربکا.

هەرچی ئەوانەنە کە دەیانەوێ چاو بە هەڵوێستەکانیاندا بخشێننەوە دەبێ قوربانیدانییشیان قبووڵ بێ، بۆیە پێیوابوو ئەوانە کارەکانیان بەوریک ڕێکدەخەن ترسی بارودۆخێکی دیکەی تیدایە و ئەویس ئەوەی قبووڵ نەبوو.

بەلام پرسیار ئەوەیە داخوا سەدام حوسین داوای دەکرد سەرکردەکانی بزووتنەوەی نیشتمانی چ قوربانیدانێکیان قبووڵبێ، قبووڵیان بێ کوردستان ویران بکا و کورد لە زۆربەی ناوچەکانی نەهێڵێ و عارەبیان لەجێ نیشتەجێکا؟ یان لە کوشتنی بەکۆمەڵی بە چەکی کیمیایی بێدەنگ بن، یان لە "١٨٢" هەزار کوردی لە کردارەکانی ئەنفالدا بێ سەروشوێن کران بێدەنگ بن، یان چاو لە "٨٠٠٠" بارزانی بپۆشن کە لە پارێزگای هەولێر بردران؟

سەدام حوسین، لە قسەیەکیدا، کوردەکان دەکاتە دوو بەش؛ بەشێکی دژی دەسەڵات راوەستان و، بەشێکی رازی نەبوون هاوکاریی بکەن، ئەوەش مانای وایە بەعس نەیتوانیبوو، لە ژمارەیەکی کەمی لە سوود و بەرژەوەندیی تایبەتیان بترازێ هیچی دییان بەلاوە گرنگ نەبوو، هیچ توێژێکی جەماوەری کوردی بەلای خۆیدا راکێشێ و، هۆی نوشوستی بەعسیش لە راکێشانی جەماوەری کورددا ئەوەبوو تەنیا خۆی دەسەڵاتداری کوردستان بوو و کەسی دیکەی لەوانە بەشداری دەسەڵات نەدەکرد کە پەیوەندییان بەو جەماوەرەوە هەبوو و، نەیشیتوانی خۆ لەو بیرۆکە شۆڤێنییانە دەربازکا کە بەرانبەر کورد هەیبوون.

حکوومەت، لەجیاتیی ئەوەی هەندێ ورێوشوێنی ئەوتۆ بگرێتەبەر کرانەوەیەک دروست بکا، هێزێکی گەورەی لە ناوچەی پشدەرێ کۆکردەوە تا ئەو عەشیرەتە بەتەواوی راگوێزێ و ساری قەڵادزەش ویران بکا. فەرمانەکانی درابوونە سوپا، فەرمانی نهێنی بوون و ئەگەر سەرایی هەر بەرگرییەک دەرکەوت زۆر بە توندی مامەلەیان لەگەل بکرێ و، سوپا هێرشی کردە سەرهێزی پشتیوانیی شیوعییان لە چیای قەندیل، بەڵام نەیتونی بیگرێ.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، داوای کرد خانەوادەی پێشمەرگەکانی کە پەنایان بۆ ئێران بردبوو بگەڕێنەوە عێراق تا بۆی بلوێ کۆنگرەیەکی دوور لە فشاری ئێرانی ببەستێ، بەڵام حکوومەت بەوەی رازی نەبوو.

مەسەلەی گفتوگۆ و چارەسەری ئاشتییانەی کێشەی کورد هەرگیز کێەیەکی بیروباوەریی حکوومەت نەبووە، تا لە بنەما نەتەوەیی و مرۆییەکانەوە بیکاتە دەسپێکی چارەسەر، بەڵکو هەمیشە مەسەلەی هاوسەنگیی هێز بووە. کە ناچاربووە دەستی لە هەندێ شت بەرداوە و کە دەستی خۆیشی دیتووە هەوڵیداوە بەدەستیان بێنێتەوە، گفتوگۆیش لەبەر ئەو هۆیانە نەکرا.

## ئەرکی مۆسکۆم:

دوای کۆتاییهاتنی شـــەڕی عێراق و ئێران لە ٨ی ئابی ١٩٨٨، ئەو بارە قورسـەی قەرزی شەڕ لەسەر شانی عێراقی بەجێهێشتبوو و، هەڵوێستی "کوێت"ی ملی بۆ لێخۆشبوونی قەرزەکانی سەر عێراق نەدەدا و، یاریکردنی بە ئاستی بەرهەم و نرخی نەوت، وای لە ڕژێمی بەعس کرد ئەو هەڵویستەی کوێت بە دوژمنداری دابنێ.
لە دووی ئابی ١٩٩٠ هێزە جەکدارەکانی عێراق بەسەر کوێتی دادا و، حکوومەتی عێراق لە بەیاننامەیەکی فەرمی ڕایگەیاند دەسەڵاتی خانەوادەی "ئال سەباح" لە کویت ڕووخا. قسەکەری فەرمیی عێراق گوتی، عێراق لەسەر داوای حکوومەتی کاتیی کوێتی سەربەخۆی دوای شۆڕشێکی میللیی خانەوادەی"ئال سەباح"ی گەندەڵی لەسەر کار لادا، چووەتە کوێت تا هاریکارییان بکا.
دوای ئەو بەسەرهاتانە سەربازییە، وڵاتانی دنیا بەتوندی نارەزاییان لەسەر ئەوکارە دەربڕی. لە ٣ی ئابی ١٩٩٠، دوای کۆبوونەوە لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، بڕیاری سڕکردن و ڕاگرتنی ئەو چەکانە درا کە عێراق لە یەکێتیی سۆڤیەتی کڕیبوو و، داوای لێکرد بێ هیچ مەرجێک لە کوێت بکشێتەوە.
دوای ئاڵۆزی دیمەنە نێودەوڵەتییەکە و پاسەکشەی ڕژێمی عێراق لەو ملەیەی لە بڕیاری داگیرکردندا دەیکرد، دوای دەرچوونی بڕیاری ئەنجوومەنیئاسایشی نێودەوڵەتی لە ٢٥ی ئابی ١٩٩٠ی ڕێی بە بەکارهێنانی هێز دەدا تا ئابلووقەی ئابووریی سەر عێراقی پێ جێبەجێ بکا، بڕیاری ناردنە مۆسکۆم دەرچوو.
لە ٣ی ئەیلوولی ١٩٩٠ بە ئەرکێکی دیپلۆماسیی نافەرمی ڕەوانەی مۆسکۆ کرام تا گفتوگۆیەک دەربارەی قەیرانی کوێت بکەم. ڕاستییەکەی، کە سەدام حوسێن لە ٢٢ی ئابی ١٩٩٠ دەستپێشخەرییە ئاشتییانەکەی ڕاگەیاند و، مەسەلەی کسانەوە لە کوێتی بەوەی بەستەوە کە دەبێ ئیسرائیلیش لە خاکی فەلەستین بکشێتەوە، ئەوە دەرووێک بوو تا شەڕ لە ناوچەکەدا ڕوونەدا.
ئەرکی من ئەوەبوو کارەکان دوورتریش ببەم و، بەرپرسە سۆڤیەتییەکان بەوەی ڕازیکەم ئەو بابەتەی لە کۆبوونەوەی هەردوو سەرۆک، گۆرباچۆڤی سەرۆکی یەکێتیی سۆڤیەت و جۆرج بۆشی سەرۆکی ئەمریکا، کە بڕیاربوو لە هێلسنکیی پایتەختی فینلەندا بکرێ، ئەو بابەتە بخەنە ڕوو و، پێیشم گوترا خشتەی کارەکانی دیداری هەردوو سەرۆک ئەو بابەتەیشی تێدایە. پەیوەندییە حیزبی و فەرمییەکانی مۆسکۆم چەقبەستەی ئەوەی بوون ئەو کێشەیە بدرێتە ئەنجوومەنی ئاسایس و نەخرێتە بەردەستی پەیمانی باکووری ئەتڵەسی، چونکە سۆڤیەت مافی ڤیتۆی هەبوو و دەیتوانی لە ئەنجوومەنی ئاسایش تەگەرە

بخاته هەوڵە ســــەربازییەکانیویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و،ڕییەکی ئاســـتیانەی لە کویت کشـانەوەی عێراقیش دەسـتەبەر بکا و کێشـەی فەلەسـتینیش بخاتە ژێر جاودێریی کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی.
بەڵام جۆرج بۆشــی ســەرۆکی ئەمریکا پێکەوەگرێدانی کشــانەوەی عێراق و کشــانەوەی ئیســـرائیلی لە خاکە عارەبییەکانی فەلەســـتینی بە وا دادەنا خەلاتێک بێ و لەبەرانبەر داگیرکردنی کوێت بدرێتە سەدام حوسێنی سەرۆکی عێراقی.
لە دیدارێک لەگەڵ بەڕێوەبەری بەشـــی خۆرهەڵاتی ناوەڕاســـتی وەزارەتی دەرەوەی ســـۆڤیەتی، لە ١٩ی ئەیلوولی ١٩٩٠، واتە دوای دیاری لووتکەی هێلسـنکی، "کاتۆلاشـــا" سیاسەتی ولاتەکەی دوای کۆبووەوەکەی لووتکە بەو جۆرە بۆ پوختەکردم:
١_ هەوڵ بدرێ کێشـــەکە بەڕێی ئاشـــیانە چارەســـەر بکرێ، ئەویش بە بزواندنی ڕێکخراوەکانی دامەزراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان و، لەژێر ســـەرکردایەتیی دەســـتەی ئەرکانی ئەنجوومەنی ئاسایش نەبێ هیچ ڕێوشوێنێکی توند نەگیرێتەبەر.
٢_ کار بۆ بەستنی کۆنگرەیەکی نێودەولەتی بکرێ بۆ کێشەکانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست و کەنداو، بەلام ئەگەر عێراق ڕاینەگەیەنێ ئامادەیە لەکوێت بکشێتەوە، ئەوا هەوڵەکانییەکێتیی سۆڤیەت سەرکەوتوو نابن.
٣_ ئەگەر هێزی بێگـانە لە نـاوچەکەدا هەبن زیـان بە بەرژەوەنـدییەکـانی دەوڵەتە حارەبییەکان دەگا، جا دەبێ دەوڵەتە حارەبەکان خۆیان کێشەکانی خۆیان چارەسەر بکەم، وەگەرنا لایەنە بێگانەکان ئەو کارەی دەکەن.
هەر لەو ماوەیەیدا کۆنگرەیەکی نوێنەرانی کوردەکانی یەکێتیی سۆڤیەت لە مۆسکۆ بەسترا و، نزیکەی "٨٠٠" نوێنەری کوردەکانی کۆمارەکانی ئەرمینیا و جۆرجیا و ئازەربایجان و ڕووسیا ئامادەی ببوون.
جا نوێنەری حیزبی بزووتنەوە کوردییەکانی هەموو لایەکی کوردستانیش ئامادە ببوون و، دوای کۆنگرەکەش بڕیاردرا کۆبوونەوەیەکی فراوانی بەرەکانی کوردســـتانی لە دیمەشـــق ببەســـترێ، تـا هەڵوێســـتێک بەرانبەر ئەو دۆخە نوییەی نـاوچەکە وەرگرن و، جەلال تاڵەبانیش هەر زوو ڕایگەیاند داگیرکردنی کوێت مەحکووم دەکا.
ناڕەزایی دەربڕین بەرانبەر داگیرکارییەکەی عێراق بۆ حیزبە کوردییە نەیارەکان شـــتێکی ئاســـایی بوو، بەلام کە ڕایگەیەنن لە شـــەڕێکدا لەگەڵ هاوپەیمانانداندا، کە کەروبارێکیان لە کاروانەکەیدا نییە، شتێکی ڕاست نییە.

**ڕاپەڕینی گەل لە کوردستان:**

له ٤ی ئازاری ١٩٩١، ڕاپەڕینێکی میللی، دژی سیاسەتی سەرکوتکەر و سۆڤێنی و ڕەگەزپەرستی بەعس هەڵگیرسا و هەموو باشوور و باکووریعێراقی گرتەوە، بە کوردستانیشەوە. لەو ڕاپەڕینەدا، زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بە شار و سارۆچکە و گوند و لادێیەوە لە دەسەڵاتی حکوومەت ڕزگار کران، ڕاپەڕین تەنیا هەندێ کاری خۆکاوی نەبوو، بەڵکو ڕاپەڕینێکی جەماوەری بوو و حیزبە کوردییەکانی ناو بەرەی کوردستانی پلانیان بۆ دانا و پێشڕەوییان کرد. بەرە بانگی رادێرا لە شار و سارۆچکەکان و کۆمەڵگە زۆرەملێییەکان خۆپیشاندان و یاخیبوون لە دژی سیاسەتی سەرکوتکردن و چەوساندنەوە و ڕاگواستنی گەلی کورد بکرێ و، داوای کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی دیکتاتۆری بکرێ و دیموکراتی جێی بگرێتەوە.

ڕاپەڕین لە سلێمانی و، بە دیاریکراویش لە کۆمەڵگای زۆرەملێی "خەبات" هەڵگیرسا، کە خۆپیساندانێکی هێمنانە بوو و داوایان دەکرد ببردرێنەوە سەر گوندەکانیان. ئیدی حکوومەت ڕێی پی گرتن و تەقەی لە خۆپیشاندەران کرد و هاوولاتییەک ، کە ناوی بەختار بوو، سەهید بوو و ئەو یەکەم سەهیدی ڕاپەڕین بوو، بەڵام جەماوەری توورە بەڕێوەبەرییە حکوومییەکان و بارەگاکانی حیزبی بەعس و دامەزراوە ئاسایشییەکانی پامال کرد و دەستی بەسەردا گرتن.

لە ٥ی ئازار شاری ڕانییە ڕاپەڕی و، لە ٦ی ئازار خۆپیشاندان لە ناوچەکانی "ئازادی و خەبات و سەرچنار" کرا و، حکوومەتیش دەیزانی خۆپیشاندان دەکرێ، ئیدی ڕەشاشی لەسەربانی باڵەخانە و جێیە ستراتیژییەکانی شار دانا و قەدەغەی هاتوچۆی ڕاگەیاند، بەڵام جەماوەری ڕاپەڕیو دەستی بەسەر هەموو بارەگایەکاندا گرت و بەرپرسەکانی حکوومەت لە سلێمانی و هەولێر ڕایان کرد.

دوای داڕووخانە خێرایەکانی هێزەکانی حکوومەت لە کوردستان، حکوومەت عەلی حەسەن مەجیدی کردە وەزیری ناوخۆ تا بە دۆخە هەرەسهێناوەکە ڕابگا.

ڕاپەڕینی کوردستان دەرەنجامی ئەو سیاسەتانەبوو کە حکوومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق پەیڕەویان دەکرد، سیاسەتی وێرانکردنی ئابووریی کوردستان و دوای ڕووخاندنی گوند و وێرانکردنی کێڵگەکانیشیان، کوردیان لەسەر خاکی باب و باپیرانیان ڕادەگواست.

خەبات و ڕاپەڕینی چەکداری کوردی، تەنیا کاری هێزە چەکدارە کوردییەکان"پێشمەرگە" بووە و جەماوەریش لەو خەباتەدا هاریکاریی دەکردن، بەڵام دوای کەڵەکەبوونی کارە بەربەریستییەکان، ڕاپەڕین هەموو کوردستان و هەمووچین و توێژەکانی گرتەوە.

بارودۆخی دەوڵەت یەکجار شلۆق بوو، فشار و گەمارۆی بیانیی دەیویست ناچاری بکا مل بۆ داواکارییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا بدا، کە ئەوە وای لە

حکوومەت کرد داوای لێکحاڵیبوون لە ئۆپۆزسـیۆن بکا، بەڵام لە هەمان کاتیشـدا خۆی هەڵمەتێکی سـەربازیی نوی تەیار دەکرد تا بە هێز دەسـەڵاتی حکوومەت بگێڕێتەوە سـەر کوردستان.

حکوومەت، بەدەسـتێکی لکە زەیتوونی هەڵدەشـەقاند و بەدەسـتەکەی دیکەی شـمشـێرێکی هەڵکێشـراو، ئەوەش هەر لەو کاتی بوو کە منیان وەک ناوبژیوان هەنارد تا بانگی کوردان بکەم بۆ دانوسـتـان و لێکحاڵیبوون. لەلایەکی دیکەش هێزە چەکدارەکانی بەو چەکە قورسـانە تەیار دەکرد کە ڕێیان دابوێ لە ناوچەی حەرامی میحوەری کەرکووک _ سـلێمانی و موسـڵ بیانکشـێنێتەوە و عیزەت دووری کرابووە سـەرپەرشـتیاری گشـتیی شـەڕەکانی بەرەی کەرکووک – سـلێمانی و عەلی حەسـەن مەجیدیش سـەرپەرشـتیاری گشـتیی بەرەی موسـڵ- هەولێر-دهۆک بوو. هێزە کوردییەکانیش، چونکە ئەو فەوجی جاشـانەی حکوومەت پێشـترێ بۆ شـەڕی بەرەی کوردسـتانی دایمەزراندبوون و دەیان هەزارکەس دەبوون و ئێستا چووبوونە ڕیزی پێشمەرگە، هەر زۆر شڕ و وڕ بوون و ئەو هێزانەش ئەوەندە کاریگەر نەبوون و هەر لەگەڵ یەکەم پێکدادانیان لەگەڵ هێزەکانی حکوومەت گۆڕەپانی شەڕیان چۆڵدەکرد. هەر ئەوەس بوو کارەکەی بۆ حکوومەت ئاسان کردبوو تا شارەسەرەکییەکانی وەک کەرکووک و سلێمانی و هەولێر و دهۆک و زۆربەی قەزاو ناحیەکانی سەر بەو شارانەش بگرێتەوە.

## گفیوگۆی حکوومەت لەگەڵ بەرەی کوردستانی:

دوای شەڕی کویت، هەندی هەوڵ درا دانوستان لەنێوان حکوومەت و بەرەی کوردستانی بکرێتەوە. ئەرکی ناوبژی کردنم پێ سپێردرا. هەر بەڕاستییش، ئێوارەی ۲۸ی ئازاری ۱۹۹۱ لەگەڵ هەریەک لە مەسعود بارزانیی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و، نەوشیروان مستەفای جێگری سەرۆکی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و، کەریم ئەحمەد داودی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حیزبی سیوعیی عێراقی و ژمارەیەک سەرکردەی حیزبەکانی دیکە کۆبوومەوە و ڕێککەوتن لەسەر ئەو شتانە کرا:

١_ داوای یەکسەر ڕاگرتنی شەڕ بکرێ.

٢_ بەرەی کوردستانی خۆی ئامادەکا دانوستا لەگەل حکوومەتدا بکا.

حکووەت بۆ ڕاگرتنی هێرشەکانی هێزەکانی عێراق پەیوەندیی بە مەسعود بارزانییەوە کرد، کەچی ئەو هێزانە توانییان سارە سەرەکییەکانی کوردستان داگیربکەنەوە، بەڵام دیتییان دانیشتووانە کوردەکەی تێدا نەماوە و چۆڵن، ئەوەس وایکرد هەڵوێستی بەرەی کوردستانی لە گفتوگۆی حکوومەتدا لاوازبێ و بەپەلەبوون شاندێک بنێرنە بەغدا تا لەسەر بنەماکانی ئاشتبوونەوە ڕێککەون. ساندەکەس پێکهاتبوون لە عومەر فەتاح و فەرەیدوون عەبدولقادری هەردووکیان ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان بوون و فازل مەتنی و جەرجیس حەسەن بارزانی لە پارتی دیموکراتی کوردستان و، دوای چەند ڕۆژێکیش وەفدێکی دی بە سەرۆکایەتیی جەلال تاڵەبانی گەیشتەجێ و ئیدی شاندی دانوستانکەر بوونە چوار حیزب و ئەوانیش "پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی یەکێتیی نیشتمانی و حیزبی سۆشیالیستی کوردستان و پارتی گەلی دیموکراتی"بوون. گەیشتنەجێی وەفدەکە هاوکاتی ڕاوەستانی هێرشی عیراقی و ناچارکردنی کشانەوەی بوو لە لە میحوەری سلێمانی و هەولێر، ئیدی وەفدەکە دەیتوانی لە پێگەی هاوسەنگیی هێزەوە گفتوگۆ بکا.وەفدە عێراقییە حکوومییەکەس پێکهاتبوو لە سەرۆکایەتیی عیزەت دووریی جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش و ئەندامێتیی هەریەک لە عەلی حەسەن مەجیدی وەزیری ناوخۆ و تارق عەزیزی وەزیری دەرەوە و حوسێن کاملی وەزیری بەرگری.

شاندی کوردیی دانوستانکەریش بریتیبوون لە هەریەک لە جەلال تاڵەبانیی سەرۆکی ساند و ئەندامێتیی هەریەک لە نێچیرڤان بارزانی و ڕەسوڵ مامەند و سامی عەبدولڕەحمان.

لەسەر خشتەی کارەکانینگفتوگۆیش ڕێککەوتن کە بریتی بوو لە:

١_ ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کوردستان.

٢_ پەرەپێدانی یاسای ئۆتۆنۆمی.

٣_ دیاریکردنی ئەو ناوچانەی دەکەونە ناو ئۆتۆنۆمی.
٤_ ئازادیی دیموراتی و فرەحیزبی ودانانی دەستوورێکی هەمیشەیی و یاسای حیزبەکان.
شاندی کوردی، لە قسەکانی سەدام حوسێنی سەرۆکی عێراق لەکاتی پێشوازی لێکردنیان و، لە ئاسانیی ڕێککەوتن لەسەر خشتەی کارەکان و چۆنیەتیی بەڕێوەچوونی گفتوگۆ لە ڕۆژانی بەراییدا، گەشبین بوو.
ئەو گەشبینییەی جەلال تالەبانی، سەبارەت بە ئەنجامە بەراییەکانی گفتوگۆ لەگەل شاندی حکوومەت، دەربیریی، هیوایەکی بەوەی دروستکرد کە کە ڕەنگە حکوومەت کەفارەتی ئەو گوناهانە بداتەوە کە بەرانبەر کوردە بێتاوانەکەی کردووە، ئیدی مەسعود بارزانیی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و نەوشیروان مستەفای جێگری سکرتێری گشتیی یەکیتیی نیستمانیی کوردستان و ڕەسوڵ مامەندی سەرۆکی حیزبی سۆشیالیستی کوردستان و سامی عەبدولڕەحمانی سەرۆکی پارتی گەل هاتنە بەغدا و، ئەوجارەیان هەردوولایان حیزبی سیوعییان پشتگوێ خست.
پشتگوێخستنەکەی لەلایەن حکوومەتەوە ڕوون و ئاشکرابوو، ئەویش پەیوەست نەکردنی مەسەلەی دیموکراتی بوو بە مەسەلەی کوردەوە، بەڵام ئەوەی سەیربوو پشتگویخستنەکەی بەرەی کوردستانی بوو، کە حیزبی سیوعی تێیدا ئەندام بوو و ڕۆڵێکی دیاریشی لە پێکهێنانیدا هەبوو و پەیوەندییەکی باشیشی لەگەڵ لایەنەکانی بەرە هەبوو، ئەگەر حیزبی شیوعییش لەگەڵ شاندە کوردستانییەکەدا بووایە سوودێکی زۆری لە لێکنزیکخستنەوەی تیروانینی ئەو کێشانەی تێڕوانینیان لەسەری جودایە و شاندی کوردییش کێشەکانی چۆن بخاتەڕوو و چۆنیش دانوستانەکان بەڕێوە ببا، ساندی حکوومەتیش ئەوەیان بە ڕوونی بە ساندی کوردی گوت و، گوتیان: "بەڕیوەبردنی کوردستنتان دەدەینێ، چۆنی بەڕێوەدەبەن بیکەن و بەشەکەی دیکەی عێراق بۆ ئێمە لێگەڕێن چۆنمان دەوێ ئاوای بەڕیوەببەین" . جا شاندی کوردی لەوەی دەترسا ئەگەر حیزبی شیوعیی عێراقی لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بهێنرێتە ناو باس، ببێتە تەگەرەی گەیشتنە ڕێککەوتنێک دەربارەی کێشەی کورد.
لەگەڵ بەڕێوەچوونی دانوستانەکانیش دەرکەوت شاندی دانوستانکاری حکوومەت لە زۆرخاڵی خرابوونە ڕوو، مل نادا، وەک سووربوونی ساندی کورد لەسەر ئەوەی کەرکووکیش بخرێتەسەر ئۆتۆنۆمی. تارق عەزیز وەڵامیداوە: "ئێمە هەزارساڵە بۆ لەدەستدانی ئەندەلوس دەگرێین، ئێوەس بۆ لەدەستدانی کەرکووک بگریەن". ئەوەش، بۆ شاندی کوردی دانوستانکەر، وەڵامێکی توورەکەر بوو.

دانوســـــتاننه‌كان جوار مانگییان خایاند و، شـــــاندی كوردی له‌و ماوه‌یه‌یدا توانی دوو نووســـــراوی كاری له اشـــــته‌ی كاره‌كانی دانوســـــتاندابوون، ئاماده بكا؛ ئه‌وانیش ئاســـــاییكردنه‌وه‌ی دۆخی كوردســـــتان بوو كه "١٣"خاڵی تێدابوو و له‌وانه‌ش ده‌ركردنی لێبووردنی گشتیی كوردان و گێڕانه‌وه‌ی فه‌رمانبه‌ر و قوتابییان بۆ فه‌رمانبه‌ری و خوێندن و گێڕانه‌وه‌ی دانیشتووانی ئه‌و گوندانه‌ی ڕاگوێزرابوون و چه‌ندین داوای دیكه‌ش.

به‌ڵام دانوستانه‌كان ئه‌وه‌نده‌یان نه‌خایاند، چونكه ساندی حكوومی زۆربه‌ی ئه‌و داوایانه‌ی ڕه‌تكرده‌وه كه شـــــاندی كوردی پێشـــــكه‌شـــــی كردن و، ڕێككه‌وتنه‌كه‌ش هه‌ر له‌ســـــه‌ر ئه‌و دووخاڵه‌ی باسكران كرا.

وه‌ك وه‌ڵامێكی كه‌لله‌ســـــه‌قیی حكوومه‌ت له دانپێـدانـانی مـافه ڕه‌واكـانی كوردان، ســـــه‌ركردایه‌تیی به‌ره‌ی كوردســـــتانیی دســـــه‌ڵاتداری راســـــته‌قینه‌ی ناوچه‌كه‌بوو، یاســـــای ژماره"١"ی ده‌ركرد، كه داوای ده‌كرد هه‌ڵبژاردنێكی گشـــتی و راســـته‌وخۆی ئه‌نجوومه‌نی نیشـتمانیی كوردســـتانی عێراق بكرێ"په‌رله‌مان" و، ژماره‌ی ئه‌ندامه‌كانی "١٠٥" ئه‌ندام بن. ئه‌و هه‌ڵبژاردنه‌س له ١٩ی ئایاری ١٩٩٢دا كرا.

به دڵنیاییشـــــه‌وه، هه‌ردوو لای دانوســـــتانكار، نه‌یانده‌زانی به وردی مامه‌ڵه له‌گه‌ل یه‌كدی بكه‌ن. ؛ حكوومه‌ت یان له ئامانجه‌كانی به‌ره‌ی كوردســـتانی تێنه‌گه‌یشـتبوو یانیش گوێ لێ پشـتڕێ ده‌كرد، چونكه ئه‌وان بۆ ئه‌وه‌ی نه‌هاتبوونه دانوســتانێ تا ببنه به‌شـێك له ڕژێمی به‌عس، به‌ڵكو بۆ ئه‌وه‌ی هاتبوون تا ببنه به‌شـــێك له عێراقێكی كوردســـتان ئۆتۆنۆمییه‌كی راســـــته‌قینه‌ی تێدا هه‌بێ و، له پێناوی دیموكراتیش هـاتبوون. جا حكوومه‌ت، له‌جیاتیی ئه‌وه‌ی له‌وه‌ی تێبگا، خه‌ڵكێكی خســـتبووه ناو شـــانده‌كه‌ی خۆی ڕقێكی تایبه‌تیان به‌رانبه‌ر كورد هه‌بوو و وه‌ك تاكیش به‌شـــداریی ئه‌و نه‌هامه‌تییانه‌یان كردبوو كه به‌ســـه‌ر كورددا هاتبوون.

## شێخ عەتای برا و برادەر و هاوڕێم:

خۆخگەم دەخواست مەرگی نەبینم، بەلام قەدەر قسەیەکی دیکەی هەیە. ئەو لەژیانیشیدا مەزن بوو و لە مردنیشیدا مەزن بوو. ئەو لەپێناو باوەڕە نیشتمانییەکەی بەرگەی گەلێ بەڵا و نەهامەتیی گرت، بەندکرا و دوورخرایەوە، لە سالانی ١٩٦٣- ١٩٦٥، کە سەردەستەی دەستەیەک هێزی پشتیوانیی شیوعییەکان بوو لە کوردستان، وەک قارەمانان جەنگا و، بە دامپێدانانی سەعدون غێدانی ئەودەمی فەرماندەی فەوج بوو، گەورەترین کۆسپی سەر ڕێی بەرەوپێشچوونی ناو کوردستانیان بوو. کە بەرەوپێش هەلمەتیان دەبرد جێی متمانەی هاواڵەکانی بوو و ئەگەر پێویستیشی بکردایە دواکەس بوو کە دەکشایەوە، ئەو پەیوەستی جەماوەربوو و لە هەموو ستێکیس لە دەمی خۆی دەگرتەوە، شێخ حەتای برا و برادەر و هاوڕێم، هەرچەندی هەوڵدەم لەبیری بکەم، چرکەیەکیش لەبیرم ناچێ، زۆرجارانیش کە بەتیا لەگەڵ خۆم دادەنیشم بەبێدەنگی بۆی دەگریەم.

لە ١٩٢٥، لە گوندی زەرداو لەدایکبووە، وەک لە جێیەکی دیکەی ئەو بیرەوەرییانەس باسمکرد، کە لەو ئۆتۆمۆبیلەی دەیبردینە کەرکووک کەوتەخوارەوە خەریکبوو بمرێ. ئەوجاری دایک نەخۆشبوو و ئەویشی لە هامێزێ بوو و بەڕێی چوونە نەخۆشخانەی کەرکووەوەبووین و، شێخ عەتا بە پەرجوو دەربازبوو. ئەوجا سالانی منداڵیی لەو گوندی زەرداوەی لەگەڵ ئێمە بەسەربرد کە هەموومان خۆشماندەویست و خەلکە باشەکەیشیمان خۆشدەویست و ئەوانیش ئێمەیان خۆشدەویست. دواتر چووە قوتابخانەی سەرەتایی لە کەرکووک "قوتابخانەی ئیمام قاسم"، خوێندنی لەوی تەواوکرد تا بچێتە دواناوەندیی "ناوەند"، ئەو لەخوێندنێش لە زیرەکەکان بوو، گەیشتە دواپۆلی ناوەندی لە خوێندنێ. جا بۆ ئەوەی من و ئیحسانی برام خوێندن تەواوبکەین ئەو ناچار قوربانیی بە خوێندنەکەی دا و دەستی لە خوێندن هەڵگرت. کە لە ١٩٤٣یش باوکمان مرد، گەرایەوە گوندی تا بژێویی خێزان دابین بکا و کەشێکی گونجاو بۆ من و ئیحسانی برام دروست بکا تا لەسەر خوێندن جێگیربین.

شێخ عەتا لە بەرایی ئەو کەسانەبوو کە هاتنە ناو ڕیزەکانی حیزبی هیوا، بە خۆی و بە مامۆستا محەممەد قەرەداغیی برادەری چەرخوفەلەکی کاری بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی نەتەوەیی بوون و ئەڵقەی هۆشیاریی حیزبییان بۆ حیزبی هیوا ڕێکدەخست. هەر خێراش مستەفای کەریم بەگی جاف و شێخ محەممەد نەجیب و شێخ عەبدولوەهاب تاڵەبانی و محەممەد عەلی ئاگای زەنگەنە و شێخ ئەحمەد شاکەلی و ژمارەیەکی زۆری کاسبکار و ڕۆشنبیری کوردیان چووە پاڵێ.

شـێخ عەتا، دوای دەسـتلەکارکێشـانەوەی ڕەفیق حیلمیی سـەرۆکی حیزب، دواکەس بوو وازی لە حیزب هێنا و لەگەڵ کۆمەڵێ کەسایەتیی کوردی، لەوانەش شێخ حەسەنی خانەقا و شـێخ قادر مەنسـوری تاڵەبانی و محەممەد قەرەداغی ، ڕێکخراوێکی بەناوی "هیوای ئازاد" دروستکرد و، ڕۆژنامەیەکی نهێنییان بەناوی "شیلان" دەرکرد، کە شیلان جێیەکی شـوێنەواریی کۆنی ناوچەکەیە. کە حیزبی هیوا هەڵوەسـایەوە و "هیوای ئازاد"یش هەڵوەشـێنرایەوە شـێخ عەتا، لەگەڵ ژمارەیەک ئەندامی ئەو ڕێکخراوە، هاتە ڕیزەکانی حیزبی شـیوعیی عێراقی وهەر لە ڕیزەکانی ئەو حیزبە و دواتریش لە ڕیزەکانی حیزبی شیوعیی کوردستان تا دوا ڕۆژی ژیانی پڕ لە تێکۆشانی شۆڕشگێڕانەی خەباتی کرد.
کە عەبدولکەریم قاسـم، بە دنەدانی هەندێ لایەنی کۆنەپەرسـت، لە سـیوعییەکان هەڵگەڕایەوە و هێرشـی کردە سـەریان، ژمارەیەکی زۆری شـیوعییەکانی قەزای کفری گیران و، ئەویش حوکمی بەندکردنی درا و، لەگەڵ ژمارەیەک شـیوعی و برادەرانیشـیان، ڕەوانەی بەندیخانەی عیمارە کران و ئەودەمی، لە وەزارەتی چاکسـازیی کشـتوکاڵی پشـکنەری گشـتیبووم و دەبوایە ئەرکی خۆم بەرانبەر بە خۆی لە بەندیخانە و بەرانبەر خێزان و منداڵەکانیشـیبەجێ بگەیەنم، کە گواسـتبوویانەوە کەرکووک. جا بەشـێکی باشـی مووچە کەمەکەمم جیادەکردەوە و هەندێکیم بۆ دەنارده بەندیخانەی عیمارە و هەندیکیشی بۆ خێزانەکەی لە کەرکووک.
کە لە بەندیخانەش هاتەدەرێ، وەک بەرپرسی ناوچەی کفری، لە ڕیزەکانی حیزبی شیوعی هەر بەردەوام بوو. لە سـاڵی ١٩٤٣ گوندی"زەرداو"ی بەجێهێشـت و چووە پاڵ ئەو سـیوعییانەی لە گوندێکی باکووری شـارۆچکەی کفری کۆببوونەوە و دوایەش یەکەی جەکدارییان بۆ بەرگرتنی کودەتاچییەکانی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ ڕێکخست و، سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردیش کردییە سەردەستەدەستەیەکی هێزی پشتیوانیی شیوعییەکان و لەو شەرانەی لەو جێیانە کردی کە کاری تێدە داکردن، ئازایەتییەکی بێ وێنەی نواند.
لە ١٩٦٥، کە سەرکردایەتیی بزووتنەوەی کورد، لەگەڵ حکوومەت دەستی بە گفتوگۆکرد، شـێخ عەتـا گەڕایەوە گونـدی زەرداو، بەلام هەر خێرا پەیوەنـدیی نێوان حکوومەت و سـەرکردایەتیی بزووتنەوەی کورد تێکچوو، ئیدی گەڕایەوە پێگە سـەرکردایەتییەکەی لە یەکەکانی هێزی پشـتیوانی، جا لەو ماوەیەیدا حکوومەت ماڵەکەی سـووتاند و جەندین جووتیاریشـی کوشـت، سـەعدون غێدانی فەرماندەی فەوج و لیوا حەماد شـیهاب ئەو کارەیان کرد.
لە سـاڵی ١٩٦٨، کە گفتوگۆ لەنێوان حیزبی شـیوعیی عێراقی و حیزبی بەعسـی عەرەبیی ئیستیراکی دەستپێکرد، کە بەعس بە کودەتایەک گەیشتبووە دەسەلات، دواتریش گفتوگۆ

و دانوستان لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد دەستیپێکرد، تا بە ڕاگەیاندنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ چارەسەرێکی ئاستیيانەی کێشەی کورد بکرێ و، هەر لەو ڕێکەوتیدا پارتی دیموکراتی کوردستان هاتە ناو حکوومەت. بەڕێز شوکری حەدیسیی پارێزگاری کەرکووک، سەرسامی ئازایەتی و ئەقڵی شێخ عەتا بوو. داوای لێکرد ببێتە سەرۆکی سارەوانیی کفری، بەڵام شێخ عەتا ڕەزامەندیی خۆ بە ڕەزامەندییمن و ڕەزامەندیی حیزبی سیوعی گرێدا و، بەو ڕەزامەندییەش سەرۆکایەتیی سارەوانیی کفریی وەرگرت. چالاکییەکی زۆری لو ڕێکخستنی شارەکەدا نواند، کە ئەوەش جێی ڕێزی لایەنە بەرپرسەکان بوو و دیاریی ڕێزگرتنیان پێشکەش دەکرد. لە ماوەی کارکردنیدا، سەدان پارچە زەویی دایە کوردەکان تا خانوو و ماڵی لە کفری لەسەر دروستبکەن.
شێخ عەتا، هەتا ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١ لەو کارەی بەردەوام بوو و ڕۆڵێکی کاریگەریشی لە ئازادکردنی شارۆچکەی کفری هەبوو. کە هێزەکانی عێراق، بە هاوکاریی چەلاوخۆرە ئێرانییەکانی بەناو "موجاهیدینی خەلق" هێرشیان کردەوە سەر شارۆچکەکە، شێخ عەتا ڕۆڵێکی سەرکردایەتیی لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو هێزانەدا هەبوو و، دواکەس بوو کە لەژێر فشاری هێزە جەکدارەکانی عێراق لە شارۆچکەکە کشایەوە.
کە زۆربەی هەرەزۆری دانیشتووانەکەش ڕەویان کرد، شێخ عەتاس لەگەل ڕەوکردووان چووە شاری "پاوە"ی کوردستان لە ئێران، کە لقێکی تەکیەی تاڵەبانیی تێدایە، دوای گەڕانەوەی خەڵکەکەش، شێخ لە شاری سلێمانی دانیشت، چونکە سوپای حکوومەت ماڵەکەیان لە کفری تالان کردبوو و تێکیشیاندابوو و، ئیدی لەو سارەدا مایەوە کە خۆشیویست و شارەکەی ئەوی خۆشویست و تا دواهەناسەش لە ڕیزەکانی حیزبی سیوعیی عێراقی هەر خەباتی دەکرد.
کە لە ٤ی ئایاری ٢٠٠٠یش بە خوین مەیینی مێشک "جلطة دماغية" کۆچی دوایی کرد، شاری سلێمانی، وەفاداریی خۆی دەرخست و بە گەل و حکوومەتەوە تەرمەکەیان شکۆمەندانە بەڕێکرد، شکۆمەندییەکی شایانی مێژووە پڕ خەباتەکەی و پێگەکەی ناو دڵی جەماوەری بێ.
شێخ عەتای برا و برادەر و هاوڕێم لەناو دل و ویژدان و هەستی من و گەلەکەیدا دەژی، خوا لێیخۆشبێ و لەبەهەستی بەرینی خۆیدا جێی بکاتەوە.

## دوا دیدارم لەگەڵ سەدام حوسێن:

لە ١٢ی ئازاری ٢٠٠٢، تەلەفۆنێکم لە کۆشکی کۆمارییەوە بۆ کرا، پرسیاری ناونیشانی ماڵەکەی دەکردم چونکە ئەو سوفێرەی ناونیشانەکەی دەزانی لەوێ نەبوو، ئیدی ناونیشانەکەم دانێ. فەرمانبەرێکی کۆشکی کۆماری هات و دۆسییەیەک بەدەستەوە، پارچە کاغەزێکی تێدابوو و بە دەستوخەتی بەڕێز سەرۆککۆمار لێی نووسرابوو و ئاراستەی عەبد حمودی سکرتێری تایبەتی کرابوو و دەیگوت: "دەمێکە لەگەڵ دکتۆر موکەرەم یەکدیمان نەدیوە، تۆ بڵێی لێمان زویر بووبێ؟ ئەگەر زویربوونەکەی لەسەر هەق بێ، ئێمە ئامادەین ئاشیکەینەوە و ئێستا چاوەڕێینە".

گوتم: هیچ هۆیەکم بۆ زویربوون نییە، بەڵام سەرۆک دیوەخانی قاوەخواردنەوەی نییە، جا کەی فەرمانی دیتنی منی دا، من ئامادەم، تکاکارم قسەکانی سڵاویشی بگەیێنێ.

فەرمانبەرەکە ڕۆیی. لە ئێوارەی ١٧ی ئازاری ٢٠٠٢، تەلەفۆنێکم لە کۆشکی کۆماریڕا بۆ کرا و، گوتی، ئۆتۆمۆبیلێک دێ و سەعات هەشتی بەیانی دەمباتە بارەگای سەرۆک و، دیدارەکەس لە سەعات "٨،٣٠" دەبێ.

من، وام خەمڵاندبوو ئەو دیدارە سەبارەت بەو دوا بڕیارەی ئەنجوومەنی ئاسایش دەبی کە بڕیاری پشکنینی هەموو جێیەکی عێراقی داوە و لەوانەس کۆشکەکانی سەرۆکایەتی، بۆ دۆزینەوەی چەکی کۆکوژ یان ئەو بەڵگەنامانەی دەیانباتەوە سەر ئەو چەکانە. سەرۆک بڕیاری ڕەزامەندیی دابووە دەست ئەنجوومەنی نیستمانی تا تا هەڵوێستێکی لەبارەوە وەرگرن و، ئەنجوومەنیس بە کۆی دەنگ بڕیاری ڕەتکردنەوەیان دابوو، جا پێموابوو سەرۆک، هێ لە بڕیاری ئەنجوومەنی نیستمانی، دەیەوێ لەسەر هەڵویستی ئەو بڕیارە پرسوڕایەک بە من بکا.

سەعات هەستی وادەی بڕیاربوو، ئۆتۆمۆبیلێکی پەردەی دادرابووەوە، بە خۆ و بە یاوەرێکی سەرۆککۆمارەوە هات، جووینە پرسگەیەکی تایبەت، جوومە هۆڵێک و کەسێک هات و گوتی من پزیشکم. گوتی تۆ تاکەکەسی، بە فەرمانی سەرۆکی بەڕێز، ناپشکندرێی. بەڵام پرسیارێکی تەندروستیمان هەیە، هەست بە هیچ نەخۆشییەک دەکەی؟ گوتم: وەک چ نەخۆشییەک؟ گوتی: بۆ نموونە نەخۆشیی شەکرە، فساری خوێن. گوتم ئەو پرسیارە دەریدەخا تۆ پزیشک نیت، چونکە ئەو نەخۆشییانە ناپەرنەوە. گوتی هیچ نووسراوێک یا ئاگادارییەک دەدەیتە سەرۆکی بەڕێز؟ کاغەزێکم پێبوو هەندێ تێبینیم لەسەر نووسیبوو، گوتم: بەڵێ ئەو کاغەزە. چوو کۆپیی کرد و کاغەزەکەی بۆ هێنامەوە.

بە هەمان ئۆتۆمۆبیل ڕوومان لەوجێی کرد کە سەرۆک دەمبینێ، بەڕێیەکدا ڕۆیشتین هەستمکرد ناخۆشە، بەڵام لەبەر پەردەکانی بەری دیتنییان گرتبوو هیچم نەدیت. گەیشتینە

کۆشـکێکی سـەرۆکایەتی و، عەبد حمودی سـکرتێری سـەرۆک لە پێشـوازیم بوو. ئیدی بردمییە ئەوجێی سەرک سەدام حوسێنی تێدا دەبینم. لە دەرگا چەند کەسێکم دیت بەڕێز عەبدولتەواب مالا حوێشـی وەزیری پیشـەسـازیی سـەربازییان لە بەرایی بوو. کە من وەزیری گواسـتنەوەبووم ئەو سـەرۆکی دامەزراوەی گواسـتنەوەی وشـکانی بوو، پێشدەچوو لە کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ سەرۆک کرابوو بێنەدەرێ. لە دەرگای کۆشک لەگەڵ عەبدولتەواب سڵاومان لێکدی کرد و چووینە ژوورێ.

کۆشکەکە سادە بوو؛لە بەرایی جوونەژووریێ هۆڵێکی لێبوو بۆ کۆبوونەوان و پێشترێ لە لە تەلەفزیۆن کۆبوونەوەی سـەرۆکم لەگەڵ وەزیران لێ دیتبوو، ئەوجا ئەیوانێکبوو بە هەرچوار سـووچی جێی دانیشـتن هەبوو و هەر سـووچێکیش بە نەخشـی عێراقی و مەغریبی ڕازابووەوە. یاوەرەکە ئاماژەی بۆ کردم تا لە سـووچێک دانیشـم و هەر چەند خولەکێکی برد و سـەرۆک بەخۆ و بە کـاغەزی کۆپیکراوەوە پەیـدابوو. بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم و ئەو کاغەزەی دەخوێندەوە کە لە فەرمانگەی پرسـگە کۆپیکرابوو دەستەواژەی "ئەوە ڕاستییە، ئەوە ڕاستییە"ی دووبارەدەکردەوە، ئاخر ڕوونمکردبووە وە کە ئەمریکییەکان و هاوپەیمانەکانی نزیکە هێرش بکەنە سەر عێراق.

سـەرۆک دەسـتی بە قسـان کرد و گوتی: غەریبیمان دەکردی، ئاخر لەمێژە یەکدیمان نەدیوە، پرسـیم داخوا لێمان زویرە؟ ئەگەر لە زویربوونەکەی لەسـەر هەق بی ئامادەین ئاشـتیکەینەوە. گوتم: بەڵێ زویرم و هۆیەکەیشـی دوایە ڕووندەکەمەوە، بەلام ئێوە بەرپرسیارییەکی زۆرتان هەیە و بەتایبەت لەو بارودۆخە ئاڵۆزانەی عیراقی پێدا تیدەپەڕێ، ئیدی کاتی ئەوەتان نییە بێم و قاوەیەکتان لەگەڵ بخۆمەوە. منیس بەر فەرمانتانم کەی بفەرموون من بۆ دیدارتان ئامادەم.

سـەرۆک گوتی: سـەیری ئەو بیرورایانەتانم کرد کە لەو ڕۆژنامانەی لە لەندەن دەردەچن بڵاوکرابوونەوە، چونکە واقیعبینییەکی زۆریشـیان تێدایە، ئیدی دوو بابەتیان تێدایە ویستم گفتوگۆیەکتان لەبارەیانەوە لەگەل بکەم و ئەوانیش کێشـەی کورد و کێشـەی بارودۆخی ناوچەکە و هەڕەشەکانی ئەمریکایە لە هێرشکردنە سەر عێراق.

ئەوجا، دەربارەی کێشەی کورد، دەستی بە ڕوونکردنەوەی ڕای خۆی کرد و گوتی: ئەوان داوای سیستەمی فیدراڵی دەکەن، یەک لە هۆکارەکانی رازینەبوونمان بەو کڵێشەیە ئەوەیە کە ئێمە نیو سـەدە پترە بانگەشـەی یەککگرتنی وڵاتە عارەبییەکان دەکەین و، لەگەڵتان لەسـەر کڵێشـەی یەکێتیی عارەبی هاوڕا نەبووین. ئەرێ ماقوولە لەگەڵ وڵاتە عارەبییەکان داوای یەککگرتن بکەین و لە هەمان کاتیشـدا رازیبین عێراق بکرێتە دوو دەوڵەتدوو گەل؟!

ئێمە لەسـەر کڵێسـەی ئۆتۆنۆمی مکوڕبووین و، زۆربەی هێزە سـیاسـییەکانیش پێی

رازیبوون و ئێمەش ئامادەین دەسـەڵاتەکانتان لە ئۆتۆنۆمیدا تا ئەوپەڕی فراوان بکەین و، ڕەنگە لە دەسـەڵاتەکانی فیدراڵییش پتربێ. ئەوەشـم گوتووە کە ئامادەین دەسـەلاتەکانی سەرۆککۆماریش دیاری بکرێ و، یاسای ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشیش هەموار بکرێتەوە و دەسـەڵاتەکانی ئۆتۆنۆمی فراوانتر بکری. من پێموایە دەبێ کلێسـەیەک بۆ یاسـای ئۆتۆنۆمی دابندری و، سـەرباری ئەوەش دابەسـکردنی وڵات کێشـەی جیددی بۆ عێراق دروسـت دەکا و بەتایبەتیش بۆ کوردان، خۆشـتان گوێتان لە دەربڕینەکانی بەرپرسـەکانی تورکیایە و ڕەنگە ئێرانیشـیان بچێتە پاڵ و دژی قەوارەیەکی کوردین تەنانەت ئەگەر دەستووریسبێ لەناو عێراقیش بێ.

ئالێرە، قسەکانیم بڕی و گوتم: سەرۆکی بەڕێز فەرمووتان نیەسەدەیە پابەستی دروشمی یەکگرتنن، لەکاتێکدا دروشـمی حیزبی سـیوعی یەکێتی بوو، ئەرێ لەو نیو سـەدەیەی هیچتان بۆ یەکگرتن کردووە؟ ئێوە لە ماوەی نیو سـەدەداهیچتان دەسـتەبەر نەکردووە و، ڕەنگە نیو سەدەی دیکەش هیچتان پێ نەکرێ، بۆ؟ جونکە دروسمێکی کردەنی و کەتواری نییە.

لە عێراق و سـوریا دوو حکوومەتی کۆماریی حیزبی بەعسـی ئیسـتیراکی هەیە و، تەنیا سنوورێکی وەهمییش لێکتادەکاتەوە، باشە بۆ یەکگرتنتان نەکرد؟ باشە ئەگەر دروشـمی یەکگرتن لەنێوان هەردوو باڵی بەعس و هەردوو حکوومەتەکەیان دەسـتەبەر نەبێ، داخوا یەکگرتنی شانشینی مەغریبیی دووری عێراق و خاوەن نیزامێکی مەلەکی شتێکی واقیعییە؟ باشە ئەگەر حکوومەتە عەرەبییەکانی سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتییان جودایە رازی نەبن، دەبێ چەند لەو حکوومەتانە پێویسـت بکا بڕووخێندرین و نیزامی سـیاسـی و دەسـتووری و کۆمەلایەتییان وەها بگۆڕێ تا لەگەل دروشـمی یەکگرتن ڕێکبێتەوە؟ بنیادەمیس لە تاقیکرنەوانەوە فێردەبێ کە دروشـمی یەکگرتن دروشـمێکی پراکتیکی نییە، دەبوایە لە تاقیکردنەوەکانی خۆتانەوە فێرببوونایە و بچووبانایە سـەر دروشـمێکی لە یەکگرتن پتر کاری کردەنی بوایە. جا ئەگەریەکگرتن لەنێوان وڵاتە عارەبییەکان دەسـتەبەر نەبێ، کە وڵات و زێدی تاکە نەتەوەی عارەبە، باشە چۆن یەکێتی بەو کلێشەیەی لەسەری مکوڕن لە وڵاتێکدا دەسەتەبەر دەبێ کە دوو نەتەوەی سەرەکی و چەندین کەمە نەتەوە و ئایین و مەزەبی تێدایە؟ ئەو هەموو کلێشـانە دەسـتکردی بنیادەمانن تا لە هەر وڵاتێکدا کاروبارەکانی پێ بەڕێکەن، کەواتە بنیادەم دەتوانێ روو لە کلێشـەیەکی دی بکا تا چارەی کێشـەیەکی وەک کێشـەی کوردی پێ بکا کە بەرەوڕووی بووەتەوە، ئێمەش لەگەل ئەو کێشـەیەدا تازە نیین، جا ئەگەر کلێشـەی ئۆتۆنۆمی چارەسـەری ئەو کێشـەیەی نەکرد و

بووه هۆی هەندێ ئاڵۆزیی وەک ئەوەی ئێستا ئێمەی تێداین، ئەرێ پێویست نییە بەدوای کلێسەیەکی دیکەدا بگەڕێین ئەو هەموو گرێیانەمان بۆ بکاتەوە؟
سەرۆک گوتی: ئێمە ئامادەین دەسەڵاتەکان ئەوەندە فراوان بکەین لەگەڵیا بتوانن ناوچەکە بە ئاسانی بەڕێوە ببەن و بەو جۆرەی خۆیشیان ئارەزووی دەکەن، بەڵام ئامادە نیین وڵات دابەسبکەین و حکوومەتێکیش"تەفلیش" بکەین عێراقییەکان لێڕاهاتوون.
گوتم: سەرۆکی بەڕێزیەکگرتن شێوەی زۆرە، لە یەکگرتنی دوو دەوڵەتی سەربەخۆ و پتریش کە هەریەکەیان پارێزگاری لە سەربەخۆیی خۆی دەکا و بەلام لە کەسایەتیی سەرۆکی دەوڵەتدا یەکدەگرن، وەک ئەو یەکگرتنەی لەنێوان نەمسا و مەجەڕ کرا و، یەکگرتنێکی کە وڵاتان لە دامەزراوەکانی لووتکەدا یەکدەگرن و بەڵام هەریەکەیان پرێزگاری لە تەواوی دەسەلاتی نیشتمانیی خۆی دەکا، وەک ئەوەی لە سەدەی نۆزدە لەنێوان هۆڵەندا و لۆکسمبۆرگ کرا و، یەکگرتنیش هەیە کە وڵاتەکانی ئەندام دەسەڵاتەکانی دەرەوەیان لەدەستدەدەن بەڵام پارێزگاری لە سەربەخۆیی ناوەوە دەکەن، وەک یەکگرتنی یۆگۆسلاڤی. بەڕێزیشتان بە یەکگرتنێک ڕازی نین لە حکوومەتێکی عارەبی و یەکێکی کوردی پێکهاتبێ و، حکوومەتیکی هاوبەشیش لەسەری سەرەوە هەبی، بەڵکو دەتانەوێ پارێزگاری لە حکوومەتی ناوەندی بکەن. حکوومەتێکی یەکگرتنی لەو جۆرە لە چیکۆسلۆڤاکیان هەبوو و، لەنێوان جیک و سلۆڤاکیا بوو. لەو یەکگرتنەدا سلۆڤاکیا حکوومەتیکی یەکگرتوو بوو، بەلام چیکیا جمکەی نەبوو، بەڵکو بەشێک بوو لەو. دەشکری یەکێتییەک لە عێراق دابهێندرێکوردستان تێیدا حکوومەتیکی فیدراڵی بی و سەربەخۆییەکی ناوەوەی هەبێ، بەلام جمکەی حکوومەتە عارەبییەکەی بەغدا نەبێ، بەڵکو بەشێک بێ لە حکوومەتی ناوەندیی هاوبەش. واتە حکوومەتی هەرێمی کوردستان هەموو دەسەڵاتە دەستووری و یاسایی و بەڕێوەبەری و ڕۆشنبیرییەکانی خۆی بەتەواوی بەڕێوەببا. بەو مەرجەی پێچەوانەی ئەو دەستوورە ناوەندییە نەبی کە لەسەری ڕێککەوتوون و، چاودێرییەکی قەزاییش لەسەر دەستووریبوونی یاساکان هەبێ و،هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێمیش لەلایەن پەرلەمانی هەرێمییەوە بکرێ یانیش راستەوخۆ هەڵبژێردرێ و دوایەش لە حکوومەتی ناوەندی بکرێتە جێگری سەرۆککۆمار و لەوێ نوێنەری هەرێمی کوردستان بێ و، وەزارەتێک لە هەرێم پێکبهێنرێدەسەڵاتی تەواوی لە هەرێم هەبێ و لەبەردەم پەرلەمانی هەرێمدا بەرپرسیار بێ. هەرچی دەسەڵاتەکانن دەبێ بەو جۆرە دابەش بکرێن:
_ ئەو دەسەڵاتانەی تەنیا هیی حکوومەتی هەرێمن و، ئەو دەسەڵاتانەی هیی حکوومەتی یەکگرتووی ناوەندین و، ئەو دەسەڵاتانەی بە گونجان و ڕێکهاتنی نێوانیان هیی هەردوولایانن. بەڕێزیشتان دەزانن من لەسەرداوایسەرۆک ئەحمەد حەسەن بەکر، لە

ســـاڵی ١٩٦٩، کلێشـــەیەکی ئۆتۆنۆمیم پێشـــکەشکرد و بووە بنچینەی ئەو گفتوگۆیەی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ی لێکەوتەوە و، یاســـای ئۆتۆنۆمیی پێ دەرچوو. جا ئەگەر ئێستا ئارەزوو دەکەن،ئەوا کلێشـەیەکیدەسـەڵاتی یەکگرتنی تازە باسـم کرد پێشـکەشـی هەردوولا دەکەم. جا ئەگەر ئەوبیرۆکانەی تێیدا دین قبوول کران ئەوا با ببێتە بنچینەیەک بۆ گفتوگۆیەکی دادێ کە دەکرێ بە ئاڕاسـتەی سـەربەسـتیی پتر و یەکێتیی پتر، بەپێی ڕێککەوتنی هەردوولا، دەوڵەمەندتر بکرێ.
سـەرۆک دەریخسـت ئامادەیە لە پرۆژەکە بکۆڵێتەوە و گوتی: ئێمە ئێسـتا ناچینەوە سـەر گفتوگۆ، تا وا لێکنەدرێتەوە لەبەر ئەوەیە کە لەژێر فسار و هەڕەشەی هێرشی دوژمنین و، ئێمە لاوازین.
گوتم: سەرۆکی بەڕێز، گەلەکەمان گەلێکی وشیارە ودرک بەوەی دەکا دەزانێ بانگەشەی ئێوە بۆ گفتوگۆ، لەهەر بارودۆخێک بێ، کارێکی ئەقڵانی و حەکیمانەیە. ە مرۆڤ دەکەوێتە بەر هەڕەشەی دوژمنکاران خۆی لە قەڵاکەی قایم دەکا و، بەرایی هەموو ستێکیش دەست بە گرتنی کون و کەلەبەرەکانی دەکا. جا ئێستا سەد و یەک کون و کەلەبەر لە قەڵایەکەمان پەیدابووە، کێشـــەی کورد و کێشـــەی مامەڵەکردن لەگەڵ تایەفەی شـــیعە و کێشـــەی دیموکراتی و کێشەی فرەحیزبی لەئارادایە، جا بانگەشەی گفتوگۆ بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشـــانە پێویســـتن و کارێکی حەکیمانە و ئاقڵانەیە. هێزی دەوڵەتیش بەوەی دەســـتەبەر نابێبەرانبەر بەو کێشانە شێلگیرانە پەیوەستی هەڵویستی توند و سەرکوتکردن بی، چونکە ئەنجامەکەی لاوازبوونی هەموو لایەنەکانە و لاوازیی وڵاتە و مانەوەی کێشەکەیە، چ جای ئەوەی ئاڵۆزتریش دەبێ، بەلام چارەسـەری ئەو بابەتانە بە شـێوەیەکی ئاشـتییانە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی هەمووان و پاراستنی وڵاتیش لەبەرانبەر هێرشی بێگانان.
ئالێرەدا، سکرتێرەکەی هات و گوتی گەورەم نانی بەیانی ئامادەیە، بۆ تێشتکردن هەستاین، خوانەکە ئاسـایی بوو. لەسـەر خوانەکەی سـەبارەت بە مامەلردن لەگەل تایەفەی شـیعە دەسـتمان بە قسـان کرد. گوتم: مەرجەعییەتی شـیعەی دنیا لە نەجەفی پیرۆز بوو. ئەبولحەسـەنی ئیسـفەهانی و کاشـیفولغیتا و شـەهرسـتانی و حەکیم، بەلام کە ئەو مەرجەعییەتە باڵایەتان وەلانا، ئەویش چووە شـاری "قوم"ی ئێران، باشـە چ حیکمەتێک لەوەیدابوو لەعێراق وەلانرێ، کە شیعە تایەفەیەکن خۆشەویستی و وەفایان بۆ "ئالولبەیت" هەیە، ئێمەش لە نوێژدا دەڵێین "اللهم صـل علی محمد و علی آل محمد"، شـیعە سـرووتی ئایینیی تایبەتیان هەیە، وەک پرسـە و کەژاوەی بۆنەکان و بەتایبەت عاشـوورا، کە یادی شـەهیدبوونی ئیمام حوسێنە. هەموو ئایین و مەزەبێکیشسرووتی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ نموونە، جارێکیان لە تەلەفزیۆن ســرووتەکانی تایبەت بە موریدانی سـەید ئەحمەد

ڕوفاعیتان پێشـاندا کە زەرگ لەخۆدان و شـمشـێر لە پاڵوو چەقاندنە. باشـە شـمشـێر لە پاڵوو چەقاندن و شمشێر لەسەردانی شیعە چ جیاوازییەکیان هەیە؟ جا قەدەغەکردنی هەر سـرووتێـک، هەر چ رایەکمـان بەرانبەری هەبێ، وانـاکـا لەبەین بچێ بەڵکو تەواو پێچەوانەیەتی.
باشــە حیکمەت لەوەیدا چییە پیاوانی ئایینی شــیعە ، بە پێچەوانەی ئارەزووی خۆیان و ئارەزوی مەرجەعییەتیان، پەیوەستی وەزارەتی ئەوقاف بکرێن ودەستیش بەسەر وەقف و دەرامەتی ئیمامەکاندا بگیرێ؟ دەبوایە بە تەواوی ئازادییەوە ســەرپشــکتان بکردبان داخوا وەک فەرمـانبەرێکی وەزارەتی ئەوقـاف کـاردەکەن، یـان هەر پەیوەســتی مەرجەعە ئایینییەکانیان دەبن و، بێ ئەوەی دەســت لە کاروباری بیروباوەڕیان وەربدرێ. جا ئەگەر بتانەوێ کلێشەیەکی لێکحاڵیبوون لەگەل یاتەفەی شیعەی عێراق بێننەکایە ولەگەڵ نوێنەری ئێســتایان بێ"ئەنجوومەنی باڵا"، ئەوا شـــاندێکتان لە پایانی ئایینی شــیعە و ســوننە و بەرپرسانی وەزارەتی ئەوقاف دەناردە دیداری بەرێز محەممەد باقر ئەلحەکیم و داوات لێ دەکرد بگەڕێتەوە عێراق و هەموو دەســـتەبەرێکیشـــت دەدایە، کاتێ دەیەوێ، بگەڕێتەوە ئێران. جا ئەگەر ەماوەری شـــیعە لە ڕەوزەی ئایینی وەک مەرجەعی باڵا دوایکەوتن، با وابێ و، ئەگەر ویستیشیان کەسێکی دی هەڵبژێرن ئەوا پەیوەندیی بەخۆیانەوە هەیە. ئێستا موریـدانی تەریقەتی قـادری و نەقشــبەنـدی و خەڵکی دیکەس ڕێبەری بـاڵای خۆیـان هەلدەبژێرن، باشە ئەگەر شیعەیش مەرجەعی باڵای خۆیان هەڵبژێرن بۆ نابێ!
ســەرۆک گوتی: ئێمە وەک مەزهەب دژی شـیعە نیین، خەڵکێکی زۆریشــیان لە ڕیزەکانی حیزبەکەماندان و ژمارەیەک شـیعەش لە ســەرکردایەتیدان، بەلام ئێمە بەرەوڕووی ئەوانە دەبینەوە کە هەستی ئایینی دەقۆزنەوە و خەڵکی پێ لە دژمان هاندەدەن، جا شـیعەبن یان ســوننە، کە ئەوانەس هەوڵدەدەن ئەو هەســتە بۆ ڕووخاندنی دەســەڵاتی ئێمە بەکاربێنن ئێمەش سنوورێکیان بۆ دادەنێین.
گوتم: بەڵام دەکرێ ئەو کێشەیەش بە جۆرێکی دی چارەسەر بکرێ.
ئەوجا ســەرۆک هاتەوە ســەر بابەتی کوردان و، گوتی: عێراق بەرەوڕووی دوو شــەڕی گەورە بووەوە بەشدارییان لە چشتاقان نەکرد. گوتم: ئێ باشە کورد ڕۆڵێکیان لە بڕیاری شەڕ یان ئاشتیدا هەبووە تا هەڵوێستێکی ئەرێنییان هەبێ؟ ئێوەن شەڕتان بەرپاکردووە و کورد هیچ ڕۆڵێکیان لە بەشــداری و خۆدوورگرتندا نەبووە. دوای قوربانی لەبەرانبەرچ دا بدەن؟ ئەوەندە بەس نییە پێنج هەزار کەسی بێتاوانیان لە هەڵەبجە بە چەکی کیمیایی مردن و دووســەد هەزاریشــیانلە ئەنفال و هەســت هەزار بارزانیش کوژران، ئەوە بەس نییە؟ لەبەر ئەو ڕێوشـــوێنە ئازاربەخشـــانە، لەگەڵ کوردەکان مەودایەکی قووڵتان لەنێواندایە،

داخوا چەندیشی پێویست بە کاری خێرە تا ئەو نێوانە پڕکاتەوە؟ سەدام گوتی: کورد گەلی ئێمەن، مێژوویەکی خەباتی دووروودرێژیشـیان لەگەڵ ئێمەدا هەیە. ئەوان لە شـەڕی دژی ئێمەدا بەپێش سـوپای ئێرانی کەوتن، دەبوایە بزانن ئەنجامی ئەو کارەیان چ دەبێ. گوتم: ئێوە رووبەرووی کێشـەیەکی هەنووکەیی دیار بوونەتەوە نەک کێشـەیەکی مێژوویی. گفتوگۆش لەگەڵ ئەوانەدا دەکرێ و لەگەڵ ئەم واقیعە نەک لەگەڵ مێژوو. لە مێژووی ئیسـلامیشـدا ڕۆڵی کوردان لاوەکی پەراوێزی نەبووە، بەڵکو هەندێ کات ئەوا لەدژی داگیرکەران سـەرکردایەتیی موسـڵمانانیان کردووە، ئەرێ ئەوانن کە دەبێ چاویان لەو مێژووەی تێکۆشـان بێ یان ئێوە؟ گوتی: ئێمە وەک لەبەرچاوگرتنی ئەو مێژووە تاکە دەولەتین دانمان بە بوونی نەتەوەیی کورددا ناوە. گوتم: لەبەر ئەوان هەر بەڕاسـتی هەن و بوونی خۆیسـیان ڕادەگەیەنن، جا ئەگەر مافە ڕەواکانی خۆیان دەسـتکەوێ ئەوا ئەو بوونەیان دەبێتە هۆکاری بەهێزیی عێراق و ئەگەر خراپیشـیان مامەلە لەگەڵ بکری ئەوا دەبنە هۆی لاوازیی عێراق. ئەگەر لەگەڵیان بجەنگن ڕەنگە لاواز ببن، بەلام ئێوەش پێوە لاواز دەبن و ولاتیش لاوازدەبێ.

سەرۆک گوتی: ئێمە ئێستا گەیستووینە ئەو قەناعەتەی بەکارهێنانی چەک لەو کێشەیەدا کارەکان ئالۆزتر دەکا، بۆیە بڕیارمانداوە توندوتیژی لە چارەسـەری ئەو کێشـەیە وەدەرنێین.ئەو هەڵوێسـتیش هەڵقولاوی قەناعەتی خۆمانە نەک ترسـی ئەمریکییەکان، کە لەسـەر داوای مەسـعود بارزانییش بە هێز جووینە نـاو هەولێر، دەمـانتوانی بچینە سـلێمانییش، ئاخر هەولێر لەناو ناوچەی دژەفڕینە، بەلام سـلێمانی پارێزراو نییە، کەچی پەلمان نەهاویشت.

گوتم: سـەرۆکی بەڕێز، دەزانن من لەگەڵتانا چەندە ڕاشـکاوم، وەک ئەودەمیش گوتم ئەو کارەی هەولێرتان هەڵەبوو و، دژی بەرژەوەندیی عێراق بوو. هەولێر شـارێکی سـتراتیژییە ولەوی هەردوو لقی ئەو ڕێیە سـتراتیژییە دەگەنە یەکدی کە پێیدەگوترێ "ڕێگای هاملتۆن، بۆیە ئەوەی سـوودی لەو کارەتان وەرگرت مەسـعود بارزانی نەبوو، بەڵکو پەیمانی ناتۆ بوو. کە داوای بارزانیشـتان گەیشـتێ تا لە بەدەسـتهێنانەوەی هەولێر لە دژی یەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتان یارمەتیی بدەن، وەها دروسـت بوو ناوبژیتان لەبەینێ بکردبان تا ئـاسـتبینەوە و هەرووک بگەڕابوونـایەوە هەولێر و دوایەش دۆخەکەتـان، دوور لو کـاریگەریی پەیمـانی نـاتۆ یـان هەر لایەنێکی دیکەی بێگـانە، پەلکێشـی گفتوگۆیەکی هەردووکیان و حکوومەت بکردایە. ولاتانی دراوسـێی نە دۆسـتی کوردن و نە دۆسـتی عارەبانن کێشـەی نێوان یەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتان و پارتی دیموکراتیی کوردسـتان دەقۆزنەوە. منیش کە پار جوومە ناوبژیان ڕاگەیاندنی خۆرئاوا هێرشیان کردمە سەرێ و

گوایە ئەو ناوبژیوانییە بە سـووسـەی سـەدام حوسـێنییە. منیش وەلامم ئەوەبوو" ئەگەر سەدام حوسێن ئەو ئەرکەم شکۆمەند و بۆ ولات سوودبەخشەم پی بسپێرێ ئەوا بە پەلە خۆی دەگەیەنمێ. بەلام زۆرم هەولدا و نەمتوانی بۆ ئەو کارە رازیی بکەم". مەبەسـتیشـم لەوەیدا ئەوەیە دوژمنـان بۆیـان گرنگە ئەو کێشـــەیەی نێوان ئەو دوو حیزبە کوردییە بەردەوام بێ و، ئێوەش لەجیاتیی جارەســەرکردنی ئەو کێشـــەیە، نەوتتان بە ئاگرەکەی داکرد.

ئەوجا هاتمە ســەر ئەو ڕووداوە ئازاربەخشـانەی لەو دوو دەیەیەی دوایی لە کوردســتان ڕوویاندابوو مەبەستم ڕووداوەکانی هەلەبجە و ئەنفال و بارزانییەکان و وێرانکردنی گوند و شـارۆچکە و کێلگەکانی کوردسـتان بوو و گوتم: مرۆڤ تەمەننا دەکا و پێموایە ئێوەش ئێســتـا تەمەننـا دەکەن ئەو ڕووداوە کـارەســـاتبـارانە هەر ڕوویـان نەدابـا. ئەوەی ئازاربەخشـترێســە ئەوەیە لەسـایەی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ و یاسـای ئۆتۆنۆمی ڕوویانداوە. بەلام، بە هەموو کارەســـات و ئەنجامە ئالۆزەکانییەوە لە رابردوو ڕوویدا و ڕابردوویش ناگەڕێتەوە بەلام دەکرێ تێیانپەڕێنین و چارەسەری شوێنەوارەکانیان بکەین. ئەو دوو حیزبە کوردییە داوایان کرد چارەنووســی ئەو بێ ســەروشـوێنانە دیاری بکرێ ئەگەر بەڕاستییش لەدەستچووونە ئەوا قەرەبووی کەسوکارین بکرێتەوە. جا ئەوان ئێستا دەیانژمێرن و داوا لە ئەنجوومەنی ئاســایش دەکەن لە ڕێککەوتنی نەوت بەرانبەر خۆراک و دەرمان بۆ عێراق بڕەپارەیەکیش بۆ ئەو قوربانییانە تەرخان بکرێ. جا ئەگەر بەڕێزتان ئەوقەرەبووانە بدەن کە ســەرباری ئەوەی زۆریشــە کەچی دێن بە ملیاران دینار مزگەوت دروســـتدەکەن ئەرێ بێ پاداســـت دەبی ئەگەر پارەی دوو مزگەوتان بۆ ئەوانە تەرخان بکەن کە لەو چۆل و بەڕیایەی نوێژێ دەکەن و مال و کێلگەیان ویران کراوە و ســامان و ئاژەلیان تالان کراوە و پاسانیش ژمارەیەکی زۆریان لە بیابانی عەرعەر نێژران؟

ســەدام حوســێن گوتی: بەو مەرجەی بە شـێوەیەکی فەرمی نەبێ. گوتم: با بەشـێوەیەکی فەرمی نەبێ و بەناوی هاوولاتیبوونێکی مرۆیی دەستەیەک لە نوینەرانی کورد دامەرێ و دوایەش خەلکی دی بەشدارییان پێ بکرێ و ئەو کارەی بکەن.

ئەوجا سەدام هاتە سەر باسی هەلویستی کوردان بەرانبەر هەڕەشەکانی ئەمریکا و گوتی: نێچیروان بارزانیم دیت پێمگوت ئەرکی ئەوە ئەوەبوو خەندەقەکانتان لەتەک سوپا لێدەن و هـاریکـاریی بکەن نەک بەرانبەر خەنـدەقەکـانی ئێمەیـان لێدەن. گوتم: پاییزی چووی، کە ســـەردانی نـاوچەکەم کرد پرســـیـاری ئەو هێزانەیـان لێکردم کە لە هێلەکـانی بەرایی کۆکراونەتەوە، پێمگوتن هەلوێســـتی ئەو هێزانە بەرگرییە نەک هێرش، بەلام لێرەولەوێ گوێیان لێدەبێ ئەو سوپایەی تایبەت داندراوە تا قودس ڕزگار بکا، ئێستا خۆی ئامادەدەکا

تا ســـــلێمانی و هەولێر و دهۆک ڕزگار بکا، هەر ئەوەشـــــە وادەکا پتریان ترس لە نیەتی حکوومەت هەبێ. ئەوان بۆ خەڵکەکەی ڕادەگەیەنن دژی هەر هێرشێکی سەربازین بۆ سەر عێراق و،هەر گۆڕین و گۆڕانکارییەکی دۆخی عێراقیش کاری عێراقە و بێ دســـتتێوەردانی بیانی. ئەوان بە ئاســتییانە کار بۆ گۆڕینی بارودۆخی عێراق دەکەن تا بەرەو دیموکراتی و فرەحیزبی و فیدراڵی بچێ و، داوای دەســـتەبەرییەکی نێودەوڵەتییش بۆ هەر ڕێککەوتنێکی سەبارەت بە کێشەی کورد دەکەن.
ئەو داوایەش هەڵویســـتی حکوومەت لاواز ناکا، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە، ناوبانگ و پێگەی لە ناوەندە نێودەوڵەتییەکان بەرزدەکاتەوە. پێشـــترێش حکوومەتی عێراق لەبەردەم کۆمەڵەی نەتەوەکـان بەڵێنی داوە ڕێز لە مـافەکـانی کوردان بگرێ. جـا ئەو بەڵێنە دەبێتە بەڵێنێکی نێودەوڵەتی ۆ حکوومەتی عێراق، بە ڕەزامەنـدیی کۆمەڵەی نەتەوەکـان نەبێ، ناتوانێ هیچ هەمەوارکردنەوەیەکی بۆ بکا. ئێستاش دەبینن ئەنجوومەنی ئاسایش دەست لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتان وەردەدا کە دەســــەڵاتی نیشـــتمانیی خۆیان هەیە و، دێ و سزایان بەسەردا دەسەپێنێ و داوایان لێدەکا پابەندی بڕیارەکانی بن. باشە چ ڕێ لەوەی دەگرێ حکوومەت لای خۆیەوە دەســـتپێشـــخەری بکا و نموونەیەک لەو ڕێککەوتنانەی لەوبارەیەوە دەکرێن بداتە ئەنجوومەنی ئاسایش، تا ببێتە بەڵگەنامەیەکی فەرمیی دڵنیاییەک بداتە کوردان؟.
چوومە سەر هەڕەشەکانی ئەنگلۆ-ئەمریکی دەیانگوت ڕژێمی ئێستا دەڕووخێنین و گوتم: بە دڵنیاییەوە ئەو دەســــەڵاتەی دوای دەســــەڵاتی ئێســـتا دێ، نە نیشـــتمانی دەبێ و نە دیموکراتی. جا کێێش دەزانێ، ڕەنگە داگیرکەران بەرەوڕووی ڕاپەڕینێکی میللی ببنەوە و بەر بە داگیرکاریی بێگانە بگرێ. ئێوە لە پێگەی لاوازییەوە بەرانگژی داگیرکەران دەبنەوە، بەلام بەرگریی جەماوەریش بەتەنیا هەر لە پێگەی لاوازییەوە دەبێ.
جا ئەگەر ئەو دوو هێزە یەکبگرن ئەوا دەکرێ بەر بە داگیرکاری بگیرێ و بشـــــیبەزێنن. دەســـەڵات گرتنەدەســـتی بەتەنێ مانای وایە پاڵێک بە هێزە نیشـــتمانییەکانی دیکەوە بنێی بچنە بەرەی نەیاران و ئەگەر پەیوەستی هەڵویستەکانیشی نەبێ ئەوا دەکرێ لە دژی ڕژێم یەکبخرێن، بەلام ئەو هێزانە لەو پێکهـاتە نـاجۆرە، خۆیـان بە ئـاوگەلە و غەوارە دەهـاتە بەرچاو، جا ئەمریکییەکانیش هەســـتیان بەوەی کردبوو، ئیدی دەیانەوێ ئەو هێزانە بکەنە کوتلە، حیزبە کوردســـتانییەکان و ئەنجوومەنی بالا و ویفاقی نیشـــتمانی بۆ بەشـــداری و هاریکاری لە گۆڕینی ڕژێم. بەڵام قەناعەتێک هەیە کە ناکرێ هاوگونجانێکیان لەنێواندا دروست ببێ، واتە لەنێوان ئەو پێکهاتەیە و وڵاتە ئیستیعمارییەکان. ئێستا، سـەبارەت بە هێرشـــی ســـەربازی بۆ ســـەرعێراق، ئەمریکی و بەریتانییەکان تەریکن،بەڵام هاوڕاییەکی

عارەبی و نێودەوڵەتی بۆ گەڕانەوەی پشـــکنەرە نێودەوڵەتییەکان و لەناوبردنی چەکی کۆکوژ هەیە. چونکە عێراقیش ئەو چەکانەی دژی ئێران و کوردەکان بەکارهێناوە، سەرباری ئەوەی هەڵوێستیشیان بەرانبەر هێرشی سەربازی نەرێنییە و ڕەنگە بەرەوڕووی داماڵینی چەکی کۆکوژی عێراق نەبنەوە و، ژمارەیەک دەوڵەتیش هەن ئەو جۆرە چەکانەیان نییە، بەلام ماوە و پارێزگاریی لە سەربەخۆیی و دەسەلاتی نیشتمانیی خۆی کردووە.
سەرۆک سەدام حوسێن گوتی: ئێمە هەرچیمان پێ بکرێ دەیکەین تا شەڕ لە عراق دوورخەینەوە و، لەگەڵیشت هاورام کە شەڕ لە پێچ و پەنایەکانیدا هۆیەکانی سەرکەوتن و دۆڕانی هەڵگرتووە.ڕەنگە بە هەندێ داوای نێودەوڵەتی ڕازیبین، بەلام تا ئەو رادەیەی نەبێتە لەدەستدانی سەربەخۆیی ولات، بەلام ئەگەرلە شەڕێ بترازێ هیچی دیکەمان لەپێش نەبێ، ئەوا لەپێناو سەربەخۆیی و یەکێتیی ولات دەجەنگین.
گوتم: ئێوە لەو دوو شەڕەی پێشترێ بە ڕەسادەتەوە شەڕتان کرد و زۆریشتان قوربانی دا، بەلام دەرەنجامەکەی چ بوو؟ ڕاستە ئازایەتی سیفەتێکی باشی بنیادەمە و، ترسنۆکییش سیفەتێکی ناشیرینە، بەلام لە حالەتێکی وەک ئەوەی ئێستا سیفەتێکی ڕاست و دروستتر هەیە و ئەویش ئەقڵ و حیکمەتە. ئەو دووە وا لە بنیادەمی دەکەن بتوانێ مەترسی لە خۆی و خەلکیش دوورخاتەوە.
ئەگەر بەئازایەتییەوە بچیە شەڕێ، ڕەنگە سەربکەوی، بەلام لە حاڵەتێکی ئاوادا ئەگەری سەرکەوتن لاوازە و ڕەنگە ببێتە هۆی شکست و لەدەستدانی هەموو شتێک، جا بە هەموو بارێکدا دەبێ قوربانییەکی مەزن بدەی و، هەندێ حکوومەت ناچاردەبن لە هەندێ بارودۆخی جودادا دەست لە هەندێ دەسەلاتی نیشتمانیی بەردا و، پەیماننامەی "برێست لیتۆفیسک"ی لینین داینا زۆر ڕەق و شکۆشکێن بوو، بەلام جارە نەبوو دەبووایە بۆ چوونەدەرێ لە شەڕقبووڵی بکەن. واژووی کرد و دەستبەرداربییەکی زۆیدەسەلاتی دەوڵەتی سۆڤیەتیی بەسەر ناوچەیەکی فراوانی ولاتەدا تێدا بوو و، بۆئەڵمالنیا دەستی لێ بەردا. بەلام دەوڵەتێکی بەتوانای دامەزراند و دواترێ توانیی خاکەکەی وەرگرێتەوە. ئەوەی ئێستا گەل چاوی لێیەتی دوورخستنەوەی مەترسییەکانی شەڕ و بەلایەکانیەتی و ئەو حیکمەت و عەقڵ بە ترسنۆکی دانانێ خوداش لە کتێبە پیرۆزەکەیدا دەفەرمێ"و لا تلقوا بایدیکم الی التهلکة"، واتە بەدەستی خۆتان خۆتان بە فەتارەت مەدەن. ڕەنگە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی رازی نەبێ گورزێکی سەربازی لە عیراق بدرێ، بەلام لە ڕوودانیدا دەکەوێتە بەر ئەمری واقیع.

سەرۆک سەدام حوسێن گوتی: ئێمە ئەوپەڕی هەوڵی خۆمان دەدەین تا لەگەڵ ئەو وڵاتە عارەبییانە ئاشتبینەوە کە نێوانمان لەگەڵیان تێکچووە و، هەموو هەوڵێکیش دەدەین مەترسیی شەڕ وەلانێین و هاوکاریی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بکەین. بەڵام وەک گوتم، ئەگەر بە سەپاندن شەڕمان بەسەردا بسەپێندرێ، ئەوا قوربانییەکەی هەرچی بێ ناکرێ خۆی لێ لادەین و دەبێ بە ڕەشادەتەوە بیکەین.

کە چاویلکەکانی لەچاوی کردەوە، وامدانا کە ئەوە زەنگی کۆتایی دیدارەکەیە، ئەودەمیش سەعات "١٢:٤٥" هەستامەوە و ئەویش هەستایەوە تا لە دەرگای کۆشک ماڵئاواییم لێ بکا و، پرسیی: داخوا هێشتا لێی زویرم؟ گوتم بەڵێ، من ڕۆژانە بەبەردەم گۆڕستانی ئەو سەربازە بەریتانیاییانەدا ڕەتدەبم کە لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا لە عێراق کوژران، گۆڕەکانیان پاک و ڕێکوپێکە. قسەکەی بڕیم و گوتی: ئەمە ڕاستە و کارێکی مرۆیی و شارستانییە. گوتم: بەڵام من لە بەڕێزتان دەپرسم داخوا مردووەکانی ئێمە لە مردووەکانی داگیرکەرە بەرریتانییەکان بێجوولەترن؟ چ خەبەرە، مەبەستت چییە؟ گوتم: مەبەستم ئەوەیە کە دەستتان بە ویرانکردنی گوندەکانی کوردستان کرد و لەوانەس گوندەکەی ئێمەی باوکم خوسکەکەم لەوی نێژراون، تەنانەت گۆیستانەکانیش تەختکران. گوتی: داخوا ئەوە بە ئاگاداریی بەرپرسە ناوخۆییەکان بووە؟ گوتم: بە فەرمانی ئەوانیش بووە، ئێوە وای دادەنێن عەتای خوالێخۆشبووی برام پەیوەندیی بە کوردەکانی دوژمنی ئێوەوە کردووە. چۆن پەیوەندییان پێوە نەکا کە ڕێز لە مردووەکانیشی ناگیرێ؟

گوتی: بانگی بەڵێندەرێک بکە و نەخشەیەکی بدەرێ با گۆڕێک بۆ باوکت و خوسکەکەت هەڵبەستێ و بەو شێوەیەس بێ کە تۆ دەتەوێ. ئێمە بە دەسەڵات و بەڕێوەبەری رادەگەیەنین کارئاسانیتان بۆ بکەن و ئێمە هەموو تێچووەکەی دەدەین وداوای لێبووردنیشت لی دەکین لەسەر ئەو کارە. کە لای دەرگاش وەستابووین پرسیاری حاڵوباڵی لێکردم و پێموابوو مەبەستی حاڵوباڵی گوزەرانمە. گوتم: باشم سوپاس بۆ خوا. جا بەگەرمی تەوقەی لەگەڵ کردم و ماڵئاوایی لێکردم.

ئەوە دوادیدارم بوو لەگەڵ سەدام حوسێن. تەنیا ئەوکاتی لە کانوونی یەکەم دیتیانەوە لەسەر تەلەفزیۆن دیتم. بەخۆ و بە قژ و ڕیشی چڕییەوە لە کێڵگەیەکی دوورەدەست خۆی ساردبووەوە. دووەم جاریش لەبەردەم دادگایسزای تایبەت دیتمەوە و، جاری سێیەمیش ئەوکاتەی پەتی سێدارەیان دەکردەملی و بەهێمنی پێشوازیی لە مردن دەکرد.

## پێشنیارێک بۆ سەرۆک سەدام سەبارەت بە یاسای یەکگرتن:

لە ٢١ی ئازاری ٢٠٠٢ نامەیەکم بۆ سـەدام حوسـێن هەنارد گرنگترین شـتی لە نامەکەدا هاتبوو:

سەرۆکی بەڕێزی پایەدار

سڵاوێ بۆندار.... دوای دیداریی بەڕێزتان و دوای ئەوەی مۆڵەتم لێ وەرگرتن پێشنیارێک بخەمە ڕوو کە ڕەنگە جێی ڕەزامەندیی هەموو لایەک بێ و ببێتە بنەما و سـەرەتایەک بۆ گفتوگۆیەکی جیدی و بنیاتنەر و خاوەن ئامانج تا تا چارەسـەرێکی دروسـتی کێشـەی کوردی بکا کە نزیکەی سـەدەیەکە بەروڕووی عێراق بووەتەوە، ئەو پێشـنارە لەو گفتوگۆیەوە سەرچاوە دەگرێ کە بەیانیی ١٨ی ئازاری ٢٠٠٢ کردمان و بە پشتبەستن بە بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٩ و ئەو بیروڕایانەی ئێوە کە لە ڕۆژنامەی "الثورة"دا هاتووە.

شێوەی پەیوەندیی نێوان هەرێم و حکوومەتی ناوەند بەجۆرێکە کە نابێتە هۆی کەرتبوونی گەل و وڵات. حکوومەتی ناوچەیی دەبێتە بەشێک لە حکوومەتی ناوەند و نابێتە جمکەی ــ وەک جەڕێزتان فەرمووتان ــ هەندێ دەسەڵاتی پێویستی بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکە تێدایە کە هەموو لایەنەکان ڕازی دەکا و، وەک بەڕێزتان فەرمووتان ئامانجەکە یەکێتیی وڵات و گەلە وهەرچی دەسەڵاتیشە، دەکرێلەسەری ڕێککەوین.

سـەرۆکی بەڕێز، بێ پێچ و پەنا پێتانی دەڵێم، ئەو ڕووداوە ناخۆشـانەی لە بارودۆخی تایبەتدا ڕوویاندا، ترسی کوردەکانی پترکرد و کۆندڕێکی گەورەی خستە بەینی هەردوولا. بەلام ئەو ڕووداوانە کەوتنە ڕابردوو و ڕابردوویش ناگەڕێتەوە، بەڵام، وەک بۆ پایەداریتانم ڕوونکردەوە، دەکرێ بە قەرەبوو چارەیان بکرێ و ئازاری ئەو خەڵکەی پی کەمکرێتەوە کە بەڵا و نەهـامەتییـان بەسـەرهـاتووە و، دەکرێ بە لێبووردەیی هەموو لایەکیش تێپەڕێندرێ و لێنەگەڕێن ئەوکارانە لە دادێدا ڕووبدەنەوە.

زۆرم دڵ بەو دوپاتکردنەوەیەتان خۆشـبوو کە لە داهاتوودا هیچ جۆرە توندوتیژییەک بەرانبەر کوردان بەکارناهێندرێ و، خۆزگە ئەو قسەیە لەسەرزاری بەڕێزتانەوە بە ئاسکرا دەکرا، چونکە قسـەی ئێوە لای ئەوان سـەنگی خۆی هەیە و، نەک هەر ئەو ناوچەیەی دوژمن دەیپارێزی، بەڵکو ڕایگەیەنن کە هەموو کوردستان ناوچەیەکی بێ کێشەیە.

بە ئاشکرا گوتنی هەموو ئەو شتانە و داوای گفتوگۆیەکی دروست بەرپرسانە و بنیاتنەر، بەهیچ جۆرێک بە لاوازیی ئەوەی لێکنادرێتەوە گوایە لەبەر ئەو هەڕەشانەی سـەر عێراقە. گەلەکەمان گەلێکی وسیارە و کارەکان پڕ بەپێسـتی خۆیان هەڵدەسەنگێنێ و ئەو هەنگاوە حەکیمانانەی پێ باشـە و چەپڵەیان بۆ لێدەدا. مرۆڤیس کە هەسـت بە هەڕەشـەی هێرشـی

دوژمن دەکا، لە بەرابیرا بیر لە گرتنی کون و کەلەبەرەکانی ئەو قەلایەی دەکا کە خۆی تێدا قایمکردووە.
من، ئێستا ئاسۆیەکی چارەسەری ئەو کێشەیەم لێ دیارە، چونکە مەترسیی هێرشی دوژمنان تەنیا لەسەر عارەبان نییە و هێ لە کوردان بێ و، دوژمنکارانیش دۆستی هیچ لایەک نینە و، ئازادیی گەل و سەربەخۆیی ولات کراونەتە ئامانج... سلاو و تکاکاریم دووبارەدەکەمەوە.
شێوەکانی یەکێتی:
١_ یەکێتیی کەسایەتی: ئەوەس یەکێتییەکە تەنیا لە کەسایەتیی سەرۆکی دەولەتدایە و، هەموو دەولەتەکانی دیکەی ناو یەکێتییەکە لەوانیدی جودان و لە دەسەلاتی ناوخۆ و دەرەوەیدا ئازادە، ئیدی ئەو دوو دەولەتە سەربەخۆن و دەشکرێ سیستەمی دەستوورییشیان جودابێ. نموونەی ئەوەیش یەکێتیی هۆلەندا و لۆکسمبۆرگە لە"١٨١٥-١٨٩٠".
٢_ یەکێتیی سەربەخۆیی: ئەوە یەکێتیی دوو دەولەت و پترە، کە هێشتا هەر یەکەیان لە هەردوو بواری ناوخۆ و دەرەوەدا سەربەخۆن و هەریەکەیان کەسایەتی و دەسەلاتی ناوخۆ و دەرەوەی خۆی هەیە و، هەریەکەیشیان دەتوانێ راستەوخۆ بچێتە ناو پەیوەندییە نێودەولەتییەکان بەو مەرجەی رێککەوتنی یەکێتییەکە لەبەرچاو بگرێ "یەکێتیی هاشمیی نێوان ئوردون و عێراق".
٣_ یەکێتیی راستەقینە: لە چوونەپال یەکدیی دوو دەولەت یان پتر پێکدی لەژێر ئالا و سایەی پاشایەک یان سەرۆکێک ولە کەسایەتییەکی نێودەولەتیی نوێدا دەردەکەوێ کە دەولەتی یەکێتیی تاکە دەسەلاتێکی نیشتمانیی دەرەوەی هەیە و تەنیا خۆیشی مافی نوێنەرایەتیی دیپلۆماسیی هەیە و دەتوانێ بەناوی هەموو یەکێتییەکەوە قسان بکا. هەرچی لە ناوەوەیە، ئەوا هەر دەولەتێک لەو دەولەتە یەکگرتووانە پارێزگاری لە دەستوور و یاسادانان و حکوومەت و یاسا و سیستەمی سیاسیی تایبەتی خۆی دەکا "یەکێتیی نەمسا و مەجەر".
٤_ یەکێتیی ناوەند: لێرە، ولاتانی ئەندام هەموو دەسەلاتێکی دەرەوە لەدەست دەدەن. ئەو دەسەلاتەی تەنیا هیی ناوەندە نەک دەولەتەکان و، تەنێ ئەو دەولەتەش کەسایەتییەکی دانپێدانراوی نێودەولەتیی هەیە و، مافی نوێنەرایەتیی سیاسیی هەیە و دەتوانێ بەناوی حکوومەتی یەکیتییەوە هەلسوکەوت بکا. هەرچی دەسەلاتی ناوخۆیە، ئەوا لەنێوان ئەندامان و دەولەتی ناوەندی دابەشدەکرێ، وەهاش دابەشدەکرێ هەر دەولەتێکی ئەندامی

یەکێتییەکە سەربەخۆیی دەستووری و یاسادانان و قەزای خۆی هەیە و، دەستووری تایبەت و یاسا و دامەزراوەی نوێنەران و حکوومەتی ناوخۆ و بەڕێوەبەریی خۆی هەیە.
دەشکرێ لەهەمان دەوڵەتی ئەندام، دەستەیەکی بەرانبەر ئەو دەستەیە و سەر بە حکوومەتی ناوەند هەبێ و کاری تەنیا پەیوەستی کاروبارە گشتییەکانیناو حەو حکوومەتە ناوچەییە بی و خۆی لە کاروبارەکانی ناوخۆی حکوومەتە ناوخۆییەکە هەڵنەقورتێنێ و، بەرەزامەندیی دەوڵەتانی ئەندامیش نەبێ ناکرێ دەستووری دەوڵەتی یەکێتی هەموار بکرێتەوە. ناشبێ حکوومەتی ناوەند یاسایەک دەرکا پێچەوانەی یاسای یەکێتییەکە بێ.
تێبینییەک: شێوەکانی یەکێتی لە ولاتان بۆتە و کلێشەیەکی سەپێندراو نییە، بنیادەم بۆ کارئاسانیی کاروبارەکانی و بەپێی بارودۆخی واقیعیی هەستپێکرا و دایناون. جا دکرێ شێوە و ڕواڵەت بگۆڕێ تا پتر لەیەک نزیکبنەوە و سەربەخۆتربن، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ئەو هاوگونجانییەی لە کۆی گشتیی سیستەمی داننداروادا هەیە و، ناکرێ لەو بنەما و ئامانجانەس دوورکەونەوە کە سیستەمەکە بۆ وەدەستێنانیان داندراوە.
سەرۆکایەتیی دەوڵەت: عێراق کۆمارێکی دیموکراتییە و سەرۆککۆمار تێیدا لەڕێی "هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ، هەڵبژاردن لەناو پەرلەمان، ڕاپرسییەکی میلیی گشتی" هەڵدەبژێردرێ.
پەرلەمان: ئەنجوومەنێکی نیشتمانییە و ئەندامەکانی بەپێی یاسا و لەسەر بنەمای هەر نوێنەرێک بۆ "١٠٠٠٠٠ کەس" دادەندرێ، بێ جیاوازیی نەتەوە و ئایین و تایەفە و، ماوەی ئەنجوومەن چوار ساڵ دەبێ و، سەرۆککۆمار دەتوانێ لەبەر ئەو هۆیانەی لەدەستووردا هاتوون ئەنجوومەن هەڵوەشێنێتەوە، بەو مەرجەی ئەنجوومەن دووجاران لەبەر هەمان هۆ هەڵنەوەشێتەوە و، حکوومەتیش لەبەردەمیدا بەرپرسیارە.
دادگای باڵا: بە لەبەرچاوگرتنی ڕێژەی دانیشتوون و پێکهاتەی نەتەوەییان، لەلایەن سەرۆکی دەوڵەتەوە دادەمەزرێن، تایبەتمەندی چارەسەری ئەو کێشە و ململانێیانە دەبێ کە ڕەنگە بکەونە نێوان حکوومەتی ناوەندی و حکوومەتی هەرێم "حکوومەتی یەکێتی و ئۆتۆنۆمی"، لە دەستووریبوونی ئەو یاسایانەس دەکۆڵێتەوەکە لە حکوومەتی ناوەندەوە یان هەرێمەوە دەردەچن.
دابەسکردنی کار و تایبەتمەندییەکان: هەندێ تایبەتمەندی هەن هیی دەوڵەتن "حکوومەتی ناوەند"، هەندێکیش هەن هیی حکوومەتی خۆجێی کوردستانن و هەندێکیشیان هاوبەشن.
کار و تایبەتمەندییەکانی حکوومەتی ناوەندی: حکوومەتی ناوەندی دەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردنی کاروبارەکانی خوارەوەی هەیە:
١_ نوێنەرایەتییە دیپلۆماسی و کونسوڵی و بازرگانییەکان.

٢_ كاروبارەكانی دامەزراوەی نەتەوە یەكگرتووەكان و ئاژانسە تایبەتمەندەكان.
٣_ بەشداریی كۆنگرە نێودەوڵەتییەكان و جێبەجێكردنی بڕیارەكانی.
٤_ كاروبارەكانی پەیوەستی شەڕ و ئاشتی.
٥_ گرێدانی پەیماننامە و ڕێككەوتن لەگەڵ دەوڵەتانی دی و جێبەجێكردنیان.
٦_ ڕێكخستنی گۆڕینەوەی بازرگانی لەگەڵ دەوڵەتانی بێگانە.
٧_ بابەتەكانی قەرز وەرگرتن و قەرزدانی دەرەوە.
٨_ ڕادەستكەردنی تاوانباران.
٩_ دەركردنی پەساپۆرت و ڤیزا.
١٠_ كۆچ لە ولات و بۆ ولات.
١١_ كاروباری پەیوەستی بێگانان "هاتنە ولات و ئاكنجیبوون و دوورخستنەوەیان".
١٢_ كاروباری ڕەگەزنامە.
١٣_ ئامادەكردنی هێزی سەربازی و ڕاهێنان و خەرجییەكانی.
١٤_ پیشەسازییە سەربازییەكان.
١٥_ دامەزراوەكانی هێزە سەربازییەكان.
١٦_ جێگیركردنی هێزی چەكدار بە پرسورای حكوومەتی خۆجێیی كوردستان.
١٧_ ڕاگەیاندنی حوكمی عورفی و كۆتاییپێهێنانی بە پرسوڕای حكوومەتی خۆجێی.
١٨_ سەرچاوەكانی وزە، لەناویشیاندا وزەی ئەتۆمی.
١٩_ هێڵی ئاسمانی و هێڵی ئاسن و ڕێككەوتنەكانی پەیوەست بەو هێڵانە.
٢٠_ كەسناسی.
٢١_ بەرید و برووسكە و ئەوازارەكانی دیكەی پەیوەندی.
٢٢_ ڕێوبانەكانی یەكێتی و ڕێوبانەكانی خۆجێیی، دوای پرسورای حكوومەتی خۆجێیی.
٢٣_ كاروبارەكانی گومرگ.
٢٤_ سەپاندنی باج، دوای پرسورای حكوومەتی خۆجێی كوردستان.
٢٥_ بانكی ناوەندی.
٢٦_ كاروبارەكانی پارە و سكەلێدانی دراو و دەركردنی بانكەنۆت.
٢٧_ دارایی گشتی.
٢٨_ كاروباری بۆرسەكان.
٢٩_ كاروبارەكانی ئامار.
٣٠_ كاروباری فەرمانبەرانی حكوومەتی ناوەندی و یاساكانی خزمەتی گشتی.
٣١_ مولكەكانی حكوومەتی ناوەندی؛ بەدەستهێنان و بەڕێوەبردن و سەروكاركردنیان.

٣٢_ كـاروبـارەكـانی پۆلیســـی نێودەولەتی"ئینتەرپۆل" و ڕاوەدوونـانی تـاوانبـارە نێودەوڵەتییەكان بە هاوكاریی هەرێم لەناو سنوورەكەیدا.

تایبەتمەندییە هاوبەشەكان:

حكوومەتی ناوەندی، بە هاوكاریی حكوومەتی هەرێم، ئەركەكانی هەماهەنگیی ســیاســی یەكخستنی سیاسی لەو كاروبارانەی خوارەوەدا دەكا : "سیستەمی كۆمپانیاكان، بانكەكان، ڕێكخســـتنی هێنا و بردنی كالا، باجی دەرامەت، كێش و پێوانە و پێوەرەكان، كردارەكانی دەســـتەبەری "تآمین" بەهەموو جۆرەكانییەوە، هێڵە ئاســمانییەكانی ناوخۆ و دامەزراندنی فڕۆكەخانە و ڕێكخستنی بزاوتی فڕۆكان و بەڕێوەبردنی فڕۆكەخانەكان، دانانی سیستەمی گشـتیی قەزا، یاســای باری شـارســتانی و بازرگانی و یاســای ســزادان و ڕێوشـوێنە مەدەنییەكـان و تـاوان و ئیشـــوكـاری پـارێزەری، خـاوەنـداریێتیی ئەدەبی و هونەری و داهێنانەكان و تۆماركردنیان و ئارمی پیشـــەســازی و بازرگانی، ڕۆژنامە و چاپەمەنی و ئێزگەكان، حیزب و كۆمەڵەكان، كێشـــەی مولكداری، كارە تایبەتەكانی ئالا و ســـروودی نیشـــتمانی و پشـــووە فەرمییەكان، مەرجەكانی كاركردن لە پیشـــەی ئازادی زانســـتی و هونەری، كـاروبـاری كرێكـاران و دەســـتەبەریی كۆمەلایەتی، چوارچێوەی فێركـاری، شـــوێنەوار و وشـــوێنە شـــوێنەوارییەكان و مووزەخانە و كتێبخانەكان، كاروبارەكانی تەندروســـتیی گشـــتی، بەرەزامەندیی حكوومەتی ناوەندی و حكوومەتی هەریم نەبێ، ڕێنەدرێ لە هەرێمەوە و بۆ هەرێم كۆچ بكرێ.

دەسەلاتەكانی هەرێم:

١_ هەرێم، لەناو ســـنووری خۆیدا، هەموو ئەو دەســـەلاتانە وەردەگرێ كە نەدراوەتە حكوومەتی ناوەندی.

٢_ هەرێم یاسای تایبەتیی خۆی دادەنێ، بەومەرجەی دژی بنەماكانی دەستوور نەبێ.

٣_ هەرێم ڕێز لە بەندە دەستوورییەكان دەگرێ و یاسا ناوەندییەكان جێبەجێ دەكا.

٤_ هەرێم ســەرۆكێكی دەبێ كە جێگری ســەرۆككۆماریشــە لە حكوومەتی ناوەند، دەبێ كورد بێ و پەرلەمانی هەرێم كاندیدی دەكا و بە مەرسوومێكی سەرۆككۆماری حكوومەتی ناوەد دادەمەزرێ و جێگری ســەرۆككۆماریش ســـەرۆكی هەرێمە و ســـەرپەرشـــتیی جێبەجیكردنی دەستوور و یاساكی یەكێتی دەكا.

٥_ ئەنجوومەنیكی نیشمانیی خۆجێی و ئەنجوومەنێكی جێبەجێكردن "وەزارەتێكی خۆجێی" لە هەرێمدا دەبێ.

٦_ بەیاساش كارەكانی"دەسەلاتەكانی" جێگری سەرۆككۆمار و ئەنجوومەنی جێبەجێكردن و ئەنجوومەنی نیشتمانیی خۆجێی دیاری دەكرێ.

## پێشنیاری ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بۆ پێکهێنانی حکوومەتی ئیئتیلافی :

ئەودەمی کە ئۆپۆزسیۆن لە لەندەن و لە "١٤-١٧"ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٢ کۆببوونەوە، پەیوەندی بە دوو حیزبەکەی کوردستانەوە کرا"پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانی" لەو کۆبوونەوەیەسدا جەلال تاڵەبانی نوێنەری یەکێتی بوو و هۆشیار زێباریی بەرپرسی پەیوەندییەکانی دەرەوەی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان نوێنەری پارتی بوو و، "ویفاقی قەومییش" ئەیاد عەلاویی سەرۆکی بزووتنەوەکە لە کۆبوونەوەکە نوینەری بوو.

لە ڕێی باڵیۆزخانەی عێراقی لە ئەڵمانیا پەیوەندییان پێوەکرا و داوایان لێکرا، لەجیاتیی ئەوەی لەگەل ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کار بۆ ڕووخاندنی ڕژێم بکەن، ئەو کێشانەی هەن لەگەل حکوومەتی بەغدا چارەسەریان بکەن.

وەڵامی حیزبەکان بۆ ئەو دەستپێشخەرییە ئەوەبوو کە پێویستە حکوومەتێکی ئیئتیلافی دامەزرێ و هێزە سەرەکییە بەکارەکان تێیدا بەشدار بن، جا ئەو حکوومەتە لە کێشەکانی ولات دەکۆڵێتەوە و چارەسەری گونجاویان بۆ دادەنێ. کە پرسیاری چۆنیەتیی پێکهێنانی ئەو حکوومەتەش کرا، وەلام ئەوەبوو کە کەسێکی نیشتمانیی جێی قبوولی هەموو لایەنەکان بێ، ڕاسپێردرێ پەیوەندی بە حیزبەکانەوە بکا، حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکی و پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی و ویفاقی نیشتمانی و کەسایەتییە نیستمانییەکان، تا بگاتە پێکهاتەیەک بۆ پێهێنانی ئەوحکوومەتە. کە پرسیاری ئەوەیش کرا داخوا کێیان لە خەیاڵدایە بۆ پێکهێنانی ئەو حکوومەتە، وەلام کەسایەتیی نیستمانیی ناسراو دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی بوو، کە ڕێزی لای هەمووان هەیە و بەدڵسۆزییەوە کار بۆ ئەوەی دەکا عێراق لەو قەیرانە دەرکا. کەسایەتییەکەی دیکە بەڕێز ئەدیب ئەلجادر بوو[63]، بەڵام چونکە

---

[63] _ ئەدیب ئەلجادر: لە ١٩٢٧ لە موسڵ لەدایک بووە، لە١٩٤٩ ئەندازەی لە ئەستانبۆڵ تەواوکردووە، ئەوجا لە ١٩٥٤ لە بەغدا جووە کۆلێژی بازرگانی و ئابووری. لە ١٩٦٣ بووە سەرۆکی ئەندازیاران و سەرۆکی یەکێتیی پیشەسازیی عێراق و لە ١٩٦٤ بووە وەزیری پیشەسازی. بەوەی ناسرابوو مەیلی نەتەوایەتیی هەیە. لەسەردەمی دەسەڵاتی عەبدولسەلام عارف هاوڕای بڕیارەکانی خۆماڵی بوو، یان وەک بە "یەکێتیی سۆشیالیستی" دەناسرا. دوای کودەتای ١٧ی تەممووزی ١٩٦٨ گیرا و بە گەندەڵی تۆمەتبار کرا، ساڵی ١٩٦٩ بەردرا، جووە قاهیرە. ئەوجا کرایە بەرپرسی کۆنگرەی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ بازرگانی و پەرەپێدان" لە ژنێف تا خانەنشین بوو. لە ١٠ی ئازاری ٢٠١٩ لە ژنێف کۆچی دوایی کرد. للمزيد:مازن ابراهيم خليل، اديب الجادر و دوره السياسي و المهني في العراق حتى عام ١٩٩٧، كلية التربية الاساسية، جامعة المستنصرية،٢٠٢١.

نەتەوەییەکی عارەبی سوننەبوو، شیعەکان سڵیان لێ دەکردەوە، بەڵام هیچ پارێزیکیان بەرانبەر موکورەم تاڵەبانی نەبوو.
دوای پەیوەندی بە حکوومەتی بەغداوە ، وەڵام ئەوەبوو کە سەرکردایەتی لە بابەتی پێکهێنانی حکوومەتێکی ئیئتیلافی دەکۆڵێتەوەولەسەر ئەوکەسەی بە نیازن ڕیبسپێرن ئەو حکوومەتە پێکبێنێ، واتە بەڕێز ئەدیب ئەلجادر، هەندێ پارێزی هەیە، چونکە ئەو لەمێژە لەدەرەوەی عێراق دەژی و گومان هەیە پەیوەندیی بە دەوڵەتە ئەوروپییەکانەوە هەبێ، بەڵام هیچ خۆپارێزییەکی لەسەر دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی نییە.
کە لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢ سەردانی سلێمانیم کرد و، بە ئامادەبوونی دکتۆر کەمال فوئاد و سەلاح عومەر ئەلعەلی، چاوم بە جەلال تاڵەبانی کەوت، باسی ئەوەی بۆ کردم چ لە نێوان هەردوولا ڕوویداوە و، داوای لێکردم ئەگەر حکوومەت ڕازیبێ حکوومەتێکی ئیئتیلافی پێکبێنێ و، ئەگەر ڕاسپێردرام بۆ پێکهێنانی ئەو حکوومەتە، ئەوا ئەو حیزبانەی لەسەرەوە ناویان هات هەڵوێستیان ئەرێنی دەبێ و هاوکاریتان دەکەن تا وڵات لەو تەنگژەیە دەرچێ، جا داوای رای منی لەسەر ئەو بابەتە کرد.
وەڵامی من ئەرێنی بوو، بەڵام دەزگا ئاسایشی و سەرکوتکەرە حکوومییەکان هێشتا بەدەستی سەرکردایەتیی حیزبی بەعسەوە دەبێ، جا دەستەبەر چییە ئەو سەرکردایەتییە ئەو دەزگایانە دژی یەک لە لایەنەکانی ئەو ئیئتیلافە بەکارناهێنێ؟ گرنگترین شتێکی لەو وڵاتەیدا نییە دیموکراتی و هەبوونی ئەو دەزگا سەرکوتکەرە ئاڵۆزانەی دژی ئازادییەکانی گەلە. ئیدی سڵکردنەوەی خۆم سەبارەت بەوەی دەربڕی کە سەرکردایەتیی بەعس چۆن ئەو هەموو هەڵوێستانەی تێدەپەڕێنێ و بە پێکهێنانی حکوومەتێکی ئیئتیلافی ڕازی دەبێ، چونکە ئەو لەوەی دەترسێ ئەگەر ئەو حکوومەتە بەپێی تێڕوانینی خۆی بۆ چارەسەری کێشەکانی وڵات دەستکراوە بکا، ڕەنگە سەرکردایەتیی لەدەست دەربچێ و، پێموایە لە باشترین حاڵەتیشدا کار بۆ بەشداری پێکردنی حیزبە سەرەکییەکان دەکا لە حکوومەتێکی بە سەرۆکایەتیی خۆی پێکبێ و دەستەبەری ئەوەسی تیدابێ کە وەزارەتە سەرەکییەکان بەدەست خۆیەوەبێ لەگەڵ ئەو هەموو دەزگا سەرکوتکەرەی بە ئەوزاری سەرەکیی دەست بەسەر دەسەلاتدا کێشانی دادەنێ.
لە دیداری دووەمم لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، لە کۆتاییەکانی تشرینی یەکەم و عەزیز محەممەدی کەسایەتیی نیشتمانی و سکرتێری پێشتریی حیزبی شیوعی تێیدا بەشداربوو، زانیمان کە حکوومەتی ناوەند خەریکە پەیوەندی بە هەندێ کەسایەتیی نەتەوەیی سەربەخۆ دەکا کە لە بنەڕەتدا لەسەر حیزبی بەعس حسێبن و دەیەوێ لەو حکوومەتەی بە نیازن پێکی بهێنن بەشدارییان پێ بکا.

ئەو ڕێوشوێنەش دوو ئەگەری هەیە دوو ئەگەری هەیە؛یەکەمیان تێکدانی بیرۆکەی ئیئتیلافی نیستمانی بە پێکهێنانی حکوومەتێکی بەعسیی تێیدا بەشداری بە چەند کەسایەتییەکی سەربەخۆ بکا، وەک بەڕێز سەلاح عومەر ئەلعەلی[64] و وەمیز عومەر نەزمی[65] و ڕاگەیاندنی پێکهێنانی "حکوومەتێکی ئیئتیلافی" و، تا بەعسیس تاکە لایەنی دانوستانەکانی پێهێنانی حکوومەتێکی ئیئتیلافی بی کە بەنیازن پێکی بهێنن، بەڵکو بانگێشتکردنی کەسایەتیی سەربەخۆی پشتگیری بەعسن تا بەشداریی ئەو پرسوڕایانە بکەن کە ڕەنگی بۆ پێکهێنانی حکوومەتی نوی بکرێن و، پێشتریش، لە دانوستانی نێوان حیزبی بەعس و حیزبی شیوعیی عێراقی، بۆ پێکهێنانی بەرەی نیشتمانی و قەومیی پێشکەوتنخواز هەر وایکردبوو و، تا لە دانوستانەکاندا بەتەنیا نەبێ، کەسایەتیی سەربەخۆی وەک لایەن لە دانوستانەکانی بەرە و حکوومەتی ئیئتیلافی نیشتمانیدا

---

[64] _ سەلاح عومەر ئەلعەلی: لە ١٧ی تەمموزی ١٩٣٨ لەدایکبووە، لە ١٩٦٨ ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی سۆڕس بووە. لە ١٩٦٨-١٩٧٠ وەزیری ڕۆشنبیری و زانیاری بووە. دواتری لە ١٩٧٢-١٩٨١بووە باڵیۆز لە سوێد، ئیسپانیا و نەتەوە یەکگرتووەکان. کە کە لە ١٩٩١بەشداریی لە دروستکردنی بزووتنەوەی ویفاقی نیشتمانیی عێراقی کرد، هاتە ڕیزی ئۆپۆزسیۆنی دژی ڕژێمی بەعس بوو لە عیراق. بەلام کێشەی نێوان ئەیاد عەلاوی و سەلاح شێخلی وایلێکرد ئەیاد حەلاوی بەهەندێک سەرپێچیی داوایی و بەڕێوەبردن تۆمەتبار بکا و داوای کرد لە بزووتنەوەکە دەربکری، بەلام عەلاوی لە ١٧ی شوباتی ١٩٩٢، بڕیارێکی بە هەڵپەساردنی ئەندامێتیی شێخلی دەرکرد و، لە ١٣ی ئایاری١٩٩٢ ئەلعەلی دامەزراندنی کۆبوونەوەی ویفاقی نیشتمانیی دیموکراتیی عێراقیی ڕاگەیاند، کە لەندەنی کردە بارەگای خۆی و ڕۆژنامەیەکی بە ناوی"ویفاق" دەرکرد، بەلام دوای ٢٠٠٢ هیچ پێگەیەکی سیاسیی وەرنەگرت. للمزید: حسن لطيف الزبيدی، المصدر السابق، ص ٣٤٥- ٣٤٦.

[65] _ ومیض عومەر نەزمی: لە ١١ی کانوونی دووەمی ١٩٤١ لە بەغدا لەدایکبووە. باوەڕە بنچینەییە سیاسییەکانی بەرەو ئەوەیان برد نەیاری هەموو ئەو ڕژێمە سیاسییانە بێ کە لە پەنجایەکانڕا حوکمی عێراقیان کردووە و ئیدی بە لەی جودا کەوتەبەر چەوساندنەوەی ئەو ڕژێمانە. بیرورا بنچینەییەکانی لە باوەڕە جێگیرەکانی بە یەکێتیی عارەبی و دیموکراتی و دادپەروەریی کۆمەلایەتی و فرەحیزبیی سیاسی خۆ دەنوێنێ، سەرباری دژایەتیکردنی ئیمپریالیزم و تایەفەگەری و خۆسەپێنیی سیاسی. پستیوانی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ی کرد کە ڕژێمی مەلەکیی ڕاالخاند و، لە ١٩٦٢ بەسداریی لە دامەزراندنی بزووتنەوەی یەکێتیخوازانی سۆشیالیستەکانی چەپڕەوی عێراقی کرد، کە داوای یەکێتیی عارەبیی و دەستەبەرکردنی دادپەروەریی کۆمەلایەتی و ڕزگارکردنی فەلەستینی دەکرد. لەسەر دەستی ڕژێمی بەعسی بەهۆی کودەتای سەربازیی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ دەستی بەسەر دەسەلاتی عێراقدا گرت، گیرا و ئەشکەنجە درا. دوای بەردانیشی ناچاربوو عێراق بەجێبێلێ هەتا جارێکی دی نەیگرنەوە. لە کۆتاییەکانی ١٩٦٣، دوای ئەوەی بەعس لە دەسەلات دوورخرایەوە، گەڕایەوە عێراق وخوێندنی لە کۆلێژی مافی زانکۆی بەغدا تەواوکرد و لە ١٩٦٤ دەرچوو. لە ١٩٦٦ چووە مەملەکەتی یەکگرتوو"بەریتانیا" تا لە زانکۆی دۆرهام خوێندنی بالا تەواو بکا. لە ١٠٧٠ بڕوانامەی دکتۆرای لە زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی دۆرهایم وەرگرت. لە ١٩٧٥ لە کۆلێژی یاسا و زانستە سیاسییەکانی زانکۆی بەغدا بووە مامۆستا. ئەوجا لە ١٩٧٦ هەتا ١٩٨٢ بووە سەرۆکی بەشی زانستە سیاسییەکان. دووجاران بۆ سەرۆکایەتیی کۆمەڵەی زانستە سیاسییەکانی عارەبی ، لە ١٩٨٥ و ١٩٨٧، هەڵبژێردراوە. لە ١٩٨٩ش وەک سەرۆکی شکۆ "سرف" هەڵبژێردراوە. لە ١١ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٦ کۆچی دوایی کرد.

بەشــداری پێ کردبوو، کە ئەوانیش بەڕێزان عەبدوللەتیف شــەواف و هیشــام شــاوی و عەزیز شەریف بوون.

## نامەکەم بۆ سەدام سەبارەت بە هەڵوێستی ئۆپۆزسیۆن:

کە گەڕامەوە بەغدا، نامەیەکم بۆ سەدام حوسێنی سەرۆککۆمار هەنارد، ئەودەم لەبەردەم دوو بژاردەدا بوو؛ یەکەم: بە بڕیارە نوێیەکەی ئەنجوومەنی ئاسایشی سەبارەت بە کاری لیژنەکانی پشکنین و گەران بەدوای جەکە کۆکوژەکان بوو، رازیبێ. دووەم: رووبەڕووبوونەوەی سەربازی لەگەل ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیای ، لەبەر هەڵوێستی لاوازی حکوومەتی هیی دابەسبوونی ناوخۆ بوو و ئەو نابەرابەرییە سەربازییەی بەئاسکرا دیاربوو، هۆکاری شکست و دۆرانی لە قەد و لۆچەکانیدا شاردبووەوە. لە نامەکەشدا هاتبوو؛ مەرجەکانی ئەو بڕیارەی بەتەمان لە ئەنجوومەنی ئاسایش دەریکەن زۆر رەق ق شکۆشکێنە، بەڵام ناکرێ خۆ لە رازیبوون لادرێ. پشتریش دۆخێکی لەو شێوەیەی ئەو مەرجە ڕەق و شکۆشکێنانەم هێنایەوە کە پەیماننامەی "برێست لیتۆفیسک"ی نێوان ڕووسیای سۆڤێتی و ولاتانی هاوپەیمان بوو.جا ڕووسیا لەبەر لاوازیی سەربازیی و لەبەر ئەوەی ئەو شەڕەی رووسیای قەیسەری خۆی تێهاویشتبوو هەر لەبنجڕا شەڕێکی یستیعماری بوو، رووسیا دەیویست بە هەر نرخێک بێ لەو شەڕەی بێتەدەرێ و، لینین پێیوابوو پێویستە لەو شەڕەی بکشێنەوە.
جا لە نامەکەدا هاتووە:ڕیزبوون و ڕەگەڵکەوتنێکی هەڕەمەکی لە ڕیزەکانی دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆنیش هەیە و، پێموانییە تاوانبارکردنی لایەک بۆ ئەویدی دی کارێکی دروست بێ و خۆدزینەوەبێ لە بەرپرسیاری و، هەر لایەکیش لەو دۆخەی ئێستا بەرپرسیارە، بەڵام ئەو لایەنەی دەتوانێ واقیعەکە بگۆڕێ و نایکا، ئەوەیان بەرپرسیاریی هەرەگەورەی لەسەرشانە.
ئێستا، دوژمن هەندێ دروشم بەرزدەکاتەوە کە لە ئەرکە سەرەکییەکانی دەسەڵاتی نیشتمانی بوون، ئەو دروشمانەش بریتین لە: دیموکراتی و فرەحیزبی و حکوومەتی ئیئتیلافی و ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ و مافی نەتەوەکان و ئایینەکان، بەڵام ئەو دروشمانە جێگرەوەی نیشتمانیی ئەوتۆیان هەیە یەکێتیی ولات و گەل دەستەبەردەکا و ئەو هەلەش لەکیس ئەو دوژمنەی دەبا کە دانەچیرەی لەناوبردنی سەربەخۆیی ولاتیەتی.
ئێستا گوێم لەوەی دەبی کە هەوڵی فراوانکردنی حکوومەت لەئارادایە، تا هەندێ خەڵکی تێ بکەوێ کە لەبنجڕا لەسەر دەسەڵات حیسابن، ئەلتەرناتیڤی نیشتمانی دامەزراندنی حکوومەتێکە هەموو ئەو هێز و حیزبانەی تێدابێ کە مێژوویکی دەوڵەمەندیان لە بەسداریی دەستەبەرکردنی سەربەخۆیی ولاتدا هەیە و ئێستاش پێویستییەکی نیشتمانیی گۆڕینی بارودۆخەکان هەیە. مانەوەی دەسەڵات و ڕژێم بەو جۆرەی ئێستا هەیە وا لە زۆربەی هێزە سیاسییەکان دەکا کار بۆ گۆڕینی ڕژێم بکەن، ئیدی ئەگەر خۆیشی نەیتوانی ئەوا، بۆ

ئەو گۆڕینە، داوای یارمەتی لە هەر کەسێک بێ دەکا، دوژمنیش زیرەکانە ئەوەی بۆ قووڵکردنەوەی ئەو دابەسبوونە دەقۆزیتەوە، کە دەکرێ هەمووان لاواز بکا و ئیدی بۆی دەرەخسێ ئازادیی ولات غافلکوژ بکا و گەلەکەشمان بکاتە کۆیلە و، ئیشتاش خەریکە کارەکانی بۆدامەزراندنی دەسەلاتێکی سەربازیی ئەمریکی ڕێکدەخا، کە ئەوەش داوامان لێ دەکا، بۆ شکستپێهێنانی پلانەکانی، خێراتر و زیرەکانەتر بجزووین.
ترستان، لەوەی کارەکانتان لەدەست دەربچێ و گوایە ئەگەر هێزەنیشتمانییەکانی دیکە لە دەسەلات بەشداری پێبکەن سەرکردایەتیتان لەدەست دەچێ، لەجێی خۆی نییە. ئازر ئەو حیزبەی جڵەوی دەسەلاتی بەدەستەوەیە و داوا لەوانیدیش دەکا بەشداری بکەن، ئەوا هێزی ئەوانیش دەخاتە سەرهێزی خۆی و، ئەوەس لاوازی ناکا و بگرە بەهێزیشی دەکا.
دوایەش، دەرمخست کە قبوولکردنی بڕیارەکە، سەرباری مەرجە ڕەق و ناخۆشەکانی، ڕەنگە ڕەوابێ و، کارێکی حەکیمانەشە. گەلیش درک بە راستی و هۆکارەکانی ئەو دەستبەرارییانە دەکا و لێیحاڵییە و، ئەوەی لە پێگەی ئێوە لای گەل کەمناکاتەوە.
سەرباری ئەوەی بڕیارێکی بە کۆی دەنگ لە ئەنجوومەنی نیشتمانی دەرچوو و ڕەتیدەکاتەوە بڕیاری "١٤٤١"[66] قبوول بکا کە لە ئەنجوومەنی ئاسایش دەرچووە. جا ئەگەر ئەوە نواندنێکیش بێ تا دەریخا کە سەرکردە، ئەگەر لێیگەڕێن رای خۆی دەربارەی بڕیارەکە دەربڕێ، لە ئەنجوومەن داناترە، بۆیە ئەنجوومەی بێ ئەوەی بیخەملێنی سەرکردایەتی چیی لە مێشکیدایە، بڕیارەکەی دەرکردووە. بۆیە پێموابوو سەرۆک سەدام حوسێن بە بڕیارەکەی ئەنجوومەنی ئاسایش رازی دەبێ و ئەوەش جێگرەوەی ئەو بەرەوڕووبوونەوە سەربازییەی بوو کە خۆی لێ لادەدا.
ڕەنگە بۆ مانەوەی لەسەر دەسەلات مەرجی گرانتریش قبووڵ بکا. لە تاقیکردنەوەی پێشتریش دیاربوو سەرۆک سەدام حوسێن لەبەردەم فشارەکانی ولاتانی دیکەدا پاشەکشەدەکا،بەلام دەستبەرداری هیچ شتێک نابێ بۆ هێزە نیشتمانییەکانی دیکە ئەگەر ئەو هێزانە ڕۆڵێکی ئەوتۆیان لە سیناریۆی گۆڕینی ڕژێمدا نەبێ. بەلام ئەگەر ڕۆڵێکی گرنگیان هەبێ، ئەوا دەیەوێ لەگەڵیان ڕێککەوێ بەو مەرجەی سەرکردایەتی بەدەسەخۆیەوە بمێنێ.

---

[66] _ بڕیاری ژمارە ١٤٤١ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیی لە ٨ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢ بە کۆی دەنگ پەسەند کرا، دواهەلی دەدا عێراق تا پابەندییەکانی داماڵینی چەک جێبەجێ بکا، کە لە بڕیارەکانی پێشتری بە درێژی باسیان کرابوو. جا بڕیارەکە عێراق ئاگادار دەکاتەوە ئەگەر مل بۆ ڕێوشوێنە پێویستەکانی نەدا" دەبێ بەرەورووی ئاقیبەتێکی خراپ ببێتەوە".

له برۆکسل یان لەندەن، له مەودای مانگی تشرینی دووەمدا دیداریکی نویّ له نیّوان هیّزە ئۆپۆزسیۆنەکاندا دەکریّ و لەویّ له دۆخی دوای ڕۆیشتنی دەسەلاتی ئیّستای عیّراق دەکۆلّنەوە. بەلاّم هیّشتا دیار نییە داخوا هەلّویّستی حکوومەت بەرانبەر بڕیاری "١٤٤١" و ئەو بڕیارانەی دیکەی له ئەنجوومەنی ئاسایش دەرچووینە، به تایبەت بڕیاری ژمارە "٦٨٨"[67]ی پەیوەست به ئازادییە دیموکراتییەکان و مافی کەمینەکان و مافی مرۆڤ، چ دەبیّ و چەندیش ئامادەیە بۆ جیّبەجیّکردنی هاریکار بیّ.

[67] _ بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجوومەنی ئاسایشی سەر به نەتەوە یەکگرتووەکان: ئەو بڕیارەیە که له ٥ی نیسانی ١٩٩١ پەسەند کرا، بەتایبەتیش دوای ئەو نامانەی له نویّنەرانی فەرەنسا و ئیّران و تورکیاوە هاتن، نیگەرانیی خۆیان بەرانبەر ئەو سەرکوتکردنوە سیاسییە دەردەبڕی تووسی گەلی عیّراق ببوو، بەتایبەتی ئەوانەی له کوردستانی عیراق بوون. ئەنجوومەن سەرکوتکردنی شەرمەزار کرد و، داوای کرد عیّراق، وەک بەشدارییەک له نەهیّشتنی ئەو مەترسییەی هەڕەشە له ئاشتی و ئەمان دەکا، سنووریّک بۆ سەرکوتکردن دانیّ و، ڕیّز له مافە مرۆییەکانی گەلەکەی بگریّ. ئەنجوومەن سووریش بوو دەبیّ عیّراق لیّگەڕیّ ڕیّکخراوە مرۆییە نیّودەولّەتییەکان بگەنە ناوچە زیان لیّ کەوتووەکان. سکرتیّری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانیش داوای کرد ڕاپۆرتیّکی کرد سەبارەت بەو دانیشتووانە عیّراقی و کوردانەی لەبەر سەرکوتکردنەکانی دەسەلاتە عیّراقییەکان زیانیان بەرکەوتبوو، تا هەموو ئەو داهاتانەی لەبەردەستدان بۆ پڕکردنەوەی پیّداویستییەکانیان بەکار بهیّندریّ. بڕیارەکە داواشی له عیّراق دەکرد هاوکاریی سکرتیّری گشتی و ئەو ڕیّکخاراوە نیّودەولّەتییانە بکا که له هەولّی هاریکاریی مرۆییدا بوون. بڕیارەکەش به دە دەنگی ڕازی و سیّ دەنگی ناڕازی "یەمەن و زیمبابۆی و کوبا" و دوو ئەندامی دەنگیان نەدا "چین و هیندستان" پەسەند کرا. " فەرەنسا و بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بڕیاری ٦٦٨یان بەکارهیّنا تا ناوجەیەکی دژەفڕین بۆ پاراستنی کردارە مرۆییەکانی ناو عیّراق دروست بکەن، ئەگەرچی بڕیارەکە به ئاسکرا ئاماژەی بۆ ناوچەی دژەفڕین نەکردبوو"

## یاسای ڕزگارکردنی عێراق یان داگیرکردنی عێراق:

کۆنگرێسی ئەمریکی یاسایەکی بەناوی"یاسای ڕزگارکردنی عێراق"[68] دەرکرد و، پێشبارێک بوو بۆبەسەرداڵنی عێراق و داگیرکردنی سەربازیی لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانە ئیستیعمارییەکانی. دوای نەمانی یەکێتیی سۆڤیەت و دەوڵەتە ئیشتیراکییەکانی دیکەی ئەورووپاش لە ئەنجامی خیانەت و هەڵگەڕانەوەی دەستەیەک لە دنەدەر و هەڵگەراوان و گێڕانەوەی سەرمایەداری بۆ ڕووسیای یەکگرتوو، دەوڵەتە ئیمپریالییەکان شەڕانگێزتر بوون.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پلانێکی ئیستیعماریی لەژێر ناونیشانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە دانا، ئامانجی ئەوەبوو دەست بەسەر سامانەکانی وزەی ئەو ولاتانەدا بگرێ کە ئەو وزەیەیان تێدایە، سەرەتا لە وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاستەوە کە نەوت و گازێکی زۆریان تیدایە، تا ئەو سەروسامانانە بە هاسانی بگەنە بەندەرەکانی دەریای ڕەش و زەریای هیندی. ئیدی دەسەڵاتی لە جۆرجیا گۆڕی تا نەوتی ئازەربایجان بگاتە بەندەرەکانی دەریای ڕەش و، لە ٢٠٠١ دەستی بە داگیرکردنی ئەفغانستان کرد تا دەوڵەتێکی لایەنگری خۆی تێدا دامەزرێنێ و کودەتایەکی سەربازییس لە پاکستان و ئەوجا لە ٩ی نیسانی ٢٠٠٣ عیراقی داگیرکرد.

هۆی ڕاستەقینەی داگیرکردنی عێراق و ڕووخاندنی دەسەڵاتی سەدام حوسێن ئەوەبوو کە سەرۆک سەدام حوسێن مافی گەران بەدوای نەوتی دایە کۆمپانیا ڕووسی و چینی و فەرەنسییەکان و بەشداریی بە کۆمپانیا ئەمریکی و بەریتانییەکان نەکرد و، پێشتریش سەدام لە حوزەیرانی ١٩٧٢ کۆمپانیای نەوتی عێراقی خۆماڵی کرد.

سەدام، دوای ئەوەی بە ئاستییانە دەسەڵاتی سەرۆک ئەحمەد حەسەن بەکری لەناوبرد، دەسەڵاتێکی دیکتاتۆریی خوێنڕێژی سەپاند. ئەو کارەس وایکرد نەیارەکانی ببنە جەندین کوتلە و زۆربەیشییان پەیوەندی بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە بکەن تا پێکەوە

---

[68] _ یاسای ڕزگارکردنی عیراق: بەیاننامەیەکی کونگریسی ئەمەریکییە، لە دەقەکەیدا هاتووە " دەبێ سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەوەکانی ئەمریکاپشتیوانیی ئەو هەولانەبێ کە دەیەوێ ئەو ڕژێمە لە دەسەڵاتی عیراق لادا کە سەدام حوسێن سەرۆکایەتیی دەکا... سەرۆک بیل کلینتۆنیش وەک یاسا واژووی لەسەر کرد و، دەقی یاسایەکە بای ئەوە دەکا کە سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان پشتیوانییهێزە دیموکراتییەکانی ناو عیراق دەکا. یاسایەکە لە تشرینی دووەمی ٢٠٠٢ باسی ڕێگەدانی هێزی سەربازیی دژی حکومەتی عیراقی کرد. لە پێشکەشکردنی پرۆژە یاسایەکەشدا بنجامین .ا . گیلمان بەشداربوو و کریستۆفەر کۆکسی ئەندامیش چاودێریی دەکرد. پرۆژە یاسایەکەیس بەناوی مافەکانی مرۆڤ به ژمارە "٤٦٥٥" لە ٢٩ی ئەیلوولی ١٩٩٨پێشکەش کرا. ئەنجوومەنی نوێنەرانیش لە ٥ی تشرینی یەکەم بڕیاری پرۆژە یاسای ٣٦٠-٣٨ ی دا ئەنجوومەنی پیرانیش دووڕۆژ دواترێ بە کۆی دەنگ پەسەندی کرد. سەرۆک کلینتۆنیش لە ٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ واژووی لەسەر یاسای ڕزگارکردنی عێراق کرد.

کار بۆ ڕووخاندنی دەسـەڵاتی سـەدام حوسـێن بکەن. ئیدی لە لەندەن کۆبوونەوە تا بەرنامەیەک بۆ ئەو حکوومەتە دانێن کە دوای حکوومەتەکەی سـەام دێتە سـەرکار، بەلام ویلایەتە یەکگرتووەکانی، بە بەشـدارکردنی نزیکەی "٣٠" دەوڵەت، کردارێکی بەسـەردادان و داگیرکردنی ڕێکخسـت و، بەڵێنی ئەوەی دابوونێ، بەوەی"پاداشـت بە پێی ماندووبوونە" و، سـوود لە سـەروسـامانی عێراق وەردەگرن، هەموو ئەو سـتانەی پشـتگوێخسـت و پۆل بریمەری باڵیۆزی کردە نوێنەری دەوڵەتی داگیرکە تا بەتەنیا حوکمی عێراق بگێڕێ، ئەوجا ئەنجوومەنێکی حوکمی لە ئۆپۆزسـیۆن دروسـتکرد" کە هیچی بەدەسـت نەبوو"، بریمەر بەپێی ئەقڵگرتنی خۆی ئەو وەزارەتە یـان ئەوێهێی هەڵـدەوەسـانـدەوە، کە ئەوەش بەرەوڕووی بەرگریی حیزبی بەعس و بزووتنەوە ئیسـلامییە توندڕەوەکانی کردەوە و، بۆ بە"ڕەگەزیکردن"ی شـەڕ و کەمکردنەوەی زیانەکانی سـوپای ئەمریکا دەوڵەتێکی لە ئۆپۆزسیۆن دامەراند، نەخاسمە لە تایەفەی شیعە و کوردەکان، کە هەردوولایان، لەلایەن ڕژێمی سەدام حوسێنەوە، دووچاری چەوساندنەوە و ستەمێک ببوون گەیشتبووە ئاستی کرداری کۆمەڵکوژی.
بۆ ئەو مەبەستەش پێکهاتەی هێزی ئاسایشیی دامەزراند و لە زۆربەی شارە عێراقییەکان کشـایەوە و خۆی لە سـەربازگە پارێزراوەکان قایم کرد و لێگەڕان وەک مەسـەلەکە دەڵێ "با ئاگریان هێزمی خۆیان بخوا"، زیانەکانی ئەو شـەڕە ناوخۆیی و تایفییەی لەسـالانی داگیرکاری لە ٢٠٠٦ڕا لەنێوان عێراقییەکان هەڵگیرسـا، بە سـەدان هەارکەس دەخەملێندرێ و ئەوەندە و پتریش لە گرتووخانەکاندا فەرمانی مردنیان بەسەردا جێبەجێ کرا.
ویلایەتە یەکگرتووەکـان، لە ژێر دروشـمی ڕووخـانـدنی دیکتـاتۆری و دامەزرانـدنی دیموکراتی و بەرگریکردن لە مافی مرۆڤ عێراقی داگیرکرد. ئەو دروشمانەی بوونە جێی گاڵتەجاڕیی عێراقییەکان، چونکە جەماوەری عەرەبو کورد سـاڵی ١٩٩١ ڕاپەڕینیان بۆ ڕووخاندنی دەسـەڵاتی سـەدام حوسێن کرد و، خەریکبوو لەناویشی ببەن، بەلام ویلایەتە یەککگرتووەکان ڕێی دایە ئەو هەموو چەکانەی بکێشیتەوە کە لەکاتی کشـانەوەی لە کوێت لەژێر گورزی سوپای ئەمریکی بەجێیهێشتبوون و، ئەو چەکانەس بۆ پامالکردنی ڕاپەڕینی عەرەب لە باشوور و کوردەکان لە کوردستان بەکاربێنێ. کەواتە، ویلایەتە یەککگرتووەکان ڕووخانی ڕژێمی سەدام حوسێنی گەرەک بوو، بەلام لەسەردەستی گەلی عێراق نا، بەڵکو ڕاسـتوخۆ داگیرکردنی عێراق ولەبەر دیموکراتی و مـافی مرۆڤیش نـا، بەڵکو بۆ دەستبەسەرداگرتنی سامانەکانی عێراق، جۆربۆشی سەرۆکی پێشتریش ڕاست و ڕەوان ئەوەی لەبەردەم کۆنگریسدا ڕاگەیاند و گوتی: "من زەمینەم بۆ وەبەرهێنەرە ئەمریکییەکان

ڕەخســـاند تا ســـامانەکانیان لە بواری کارەبا و نەوت وەبەربێنن، بەڵام تێکچوونی باری ئاسایش لێناگەڕێ.

کەواتە، بەرکەماڵیی ئاســـایس و ئەو دیموکراتییەی گوایە دەیهێنن، ئامانج لێیان ئەفراندنی کەشـێکی ئاســایشــی بوو بۆ وەبەرهێنەرە ئەمریکییەکان تا ســەرمایەکانیان لە عێراق لە بواری نەوت و کارەبا وەبەربێنن و، عێراقییەکانیش بەردەوام داوای کارەبا و بانزین و غاز بکەن. بەلام ئەگەر ئاســایش ســەقامگیر نەبێ و ئەگەر ئەمریکییەکان ســەرمایەکانیان بەگەر نەخەن ئەوا شـــارەکانی عێراق هەر تاریک دەبن و ئۆتۆمۆبیلەکانی عێراقییانیش چەندین سەعات و ڕۆژ لە ڕیز ڕادەوەستن تا چەند لیترە بەنزینێکیان دەستکەوێ.

ئەو بۆرژوایەی داوای ســـەربەخۆیی و دەســـەلاتی نیشـــتمانیی ولاتی دەکرد و داوای دیموکراتی و ئازادیی گەلی دەکرد، دەستی لەو سەربەخۆیی و دەسەلاتە نیستمانییە بەردا کە ســەدام لەســـەریان مکوڕبوو و، داوای ئەو دیموکراتییەتە دەکا کە ســەدام بەری لێ گرتبوون و بووە هۆی ڕووخانی. دەسـەلاتی نیشـتمانی و سـەربەخۆیی، ئەگەر جەماوەری گەل بەرگرییان لێ نەکا و گەل دیموکراتییەتی نەبی تاهێزەکانی خۆی پێ تەیار بکا، ئەوا هەردووکیان لەبەین دەچن وەکچۆن لە هەموو حکوومەتەکانی عێراق، لە شـۆڕشــی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ڕا لەبەین چوون. ئاخر ئەو حکوومەتانەی، بێ دەســـەلاتی نیشـــتمانی و ســـەربەخۆیی، دروشـــمی دیموکراتی بەرزدەکەنەوە دووجاری تووڕەیی گەل دەبن و دەڕووخێن وەکچۆن زۆربەی دەوڵەتەکانی ناوچەکە ڕووخان.

ویلایەتە یەکگرتووەکان داوا لە حکوومەتەکانی ناوچەکە دەکا، پێش ئەوەی ڕاســـتبەوە و داوای ســەربەخۆیی و دەســـەلاتی نیســتمانی بکەن، خێرا بەدەم داوایەکانی گەلەوە بێن و، چاکسـازییان بکەن. مادام ئەو چاکسـازییانەش دەسـتکاریی بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزم ناکەن، کێشەیان نییە ئەگەر حکوومەتانیش بڕووخێنن.

ئەوەی ســـەیرە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی عێراقی داگیرکردووە وهەاران کیلۆمەتر لێیەوە دوورەکە هەست دەکا کۆماری ئیسلامیی ئێران دەست لە کاروباری عێراق وەردەدا، دنیا دەهەژێنێ، ئەو ولاتەی دژی هەبوونی ئیســـتیعمارە لە ناوچەکە. هەوڵم لەگەل ســـەدام حوسێنیش دا تا لەگەڵ ئێران و سووریا ئاشتبێتەوە و ڕێکخراوێک لەو ولاتانە پێکبێنن کە لەژێر فشار و دوژمنداریی ئیستیعماردان، بەلام بزاوتی ئیستیعمارییەکان خێراتربوو.

گومانیش لەوەیدا نییە کە عێراقییەکان دەگەنە ئەو ڕاسـتییەی ســەربەخۆیی و دەســەلاتی نیشتمانی و ئازادی و دیموکراتی جمکەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی گەلن و، دەرچوونی هێزە بیانییەکان و بەدەســـتهێنانی ســـەربەخۆیی نیســـتمانی و بەربلاویی دیموکراتی و چارەســەری کێشــەکانی ولات و، لەســەرووی هەموویشـیانەوە کێشــەی کورد، تاکە ڕێگای

دروســتی جەنەدەرە لەو گێژاوە. بوونی حکوومەتێکی هەرێمی کوردســتانیش لە ســایەی دەوڵەتێکی سەربەخۆی دیموکراتیدا لەوەی باشترە لە سایەی داگیرکەردا هەبێ.

## ڕزگارکردن یان داگیرکردنی ئیستیعماری؟:

دوای داگیرکردن، ڕۆژنامەی "القاسم المشترک" پەیوەندیی پێوەکردم، کە تەنیا یەک ژمارەی لێ دەرچووبوو، چونکە لایەنەکانی ئۆپۆزسینی لەڕێی داگیرکردنەوە گەیشتبوونە دەسەلات، کۆلکەیەکی هاوبەش لەنێوان نەبوو و، دیارترین لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنیش بریتیبوون لە حیزبی شیوعیی عێراقی و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعیی کوردستان و حیزبی دەعوەی ئیسلامی و ئەنجوومەنی بالای شۆڕشی ئیسلامی و کۆنگرەی نیشتمانیی یەکگرتوو و .....تاد.
حیزبی شیوعیی عێراقی، کە بە هەنجەتی بەشداری لە دامەزراندنی حکوومەت، وەزارەتی ڕۆشنبیریی پێ سپێردرا، بەشداریی دەسەلاتی کرد، بەلام چ حکوومەتێک کە کەسێکی ئیستیعماری حوکمی ولات دەکا و ئەویش بریمەری بالیۆزە. وا باشتربوو حیزبی شیوعی، وەک جۆن دژی دیکتاتۆری بوو، ببوایە ئۆپۆزسیۆنی نیشتمانیی دژە ئیستیعمار و داگیرکەر.
ئەگەرچی حیزبە کوردستانییەکان بەشێکی کوردستانیان ڕزگارکرد و حکوومەتێکی هەرێمییان لێ دامەزراند، بەلام هەر لەژێر هەڕەشەی هێزە سەربازییەکانی سەدام حوسێندا بوو کە لە دەوروبەری شارەکانی کوردستان بوو، ئەوە باسی ئەوەی هەرمەکە کە هەموو جۆرە چەکێکیشی بەکارهێنابوو، لەوانەس چەکی کۆکوژی قەدەغەی نێودەولەتی بوون و دژی مەدەنییان بەکاریهێنابوو وەک ئەوەی لە هەلەبجە و گۆپتەپە و دۆلی شەهیدان و جێی دیکە ڕوویدا. وەکچۆن سەدام تاوانێکی بەرانبەرپیاو و ژن و مندالی کورد کرد و لە کردارەکانی "ئەنفال" کۆمەلکوژی کردن و، کوردیش بە ڕاپەڕینە جەماوەرییەکەی بەهاری ١٩٩١ی تاجی لەسەر خەباتە خەباتەکەی نا کە لە دژی دیکتاتۆری خوێنڕێژی کردبوو. ڕژێمی سەدامیش، لەژێر گورزەکانی جەماوەری عارەبیی باشوور و کوردیی کوردستان، خەریکبوو دابڕووخێ، کەچی ویلایەتە یەکگرتووەکان ، کە ڕێیدا هەموو چەکە قورسەکانی سوپا لە گۆڕەپانی شەڕی کوێت بەجێیهێشتبوو بکێشێتەوە و، بەوەش هاریکارییەکی گەورەی کرد و، دواترێ ئەو چەکانەی دژی شیعەی باشوور و کوردی باکوور بەکارهێنا، سەدامیش سیفەتی"لاپەڕەی غەدر و خیانەت"ی دەدایەپال ئەو ڕاپەڕینە جەماوەرییەی عارەب و کوردان.
ئەو حیزبە عارەبییانەی قوربانییەکی زۆریان دا حیزبی "دەعوەی ئیسلامی"بوو، حیزبی سیوعییس قوربانیی زۆر گەورەی دا و، سەدام لیستی ناوی شیوعییەکانی واژوودەکرد تا لە سێدارە بدرێن و، ناونیشانی لیستەکە ئەوەبوو "چونکە ئەندامی حیزبی شیوعین".

حیزبە کوردستانییەکان، دوای ئەو نوشوستییەی تووسی هات، جارێکی دی هاتەوە مەیدان و گەرایەوە سارەکانی سلێمانی و هەولێر و دهۆک و شارۆچکەکانی سەر بەو شارانە بوون، کە دانوستانیش لەگەڵ حکوومەت سەری نەگرت، هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەران کرا و، پەرلەمان بڕیاری پێکهێنانی حکوومەتێکی هەرێمیی لە کوردستان دا، تا دوای رووخانی دیکتاتورییەت لەسەر سیستەمی فیدرالی بێ و، ئەو حکوومەتەس نزیکەی دەسالان جالاکیی خۆی بەرێوەبرد تا بە داگیرکردنی ئەمەریکی ڕژێم ڕووخا و دەوڵەتێکی لایەنگری ویلایەتە یەککگرتووەکان دامەزرا.
بەڕێز مەسعود بازانیی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنییەکاندا چەند جار گوتوویەتی: 'ئێمە، پێشتری پەیوەندیمان لەگەڵ ویلایەتە یەککگرتووەکان ەبووە، بەڵام ئێستا پەیوەندییەکەمان ستراتیژییە".
سەرکردەکانی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، دوای ئەوەی فێرە بازرگانی بوون و ئیمتیازیان دایە کۆمپانیا بیانییەکانی و پشک و دەلالیی گەورەیان وەرگرت، پێیانوایە پەیوەندیی ستراتیژی لەگەڵ گەورەترین دەوڵەتی ئیمپریالی ، واتە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا، دەستەبەرێکی بەهێزی لە دەسەلات مانەوە و پاراستنی ئیمتیازەکانیانە کە جەماوەری کورد داوادەکا سنوورێکی بۆ دابندرێ و چ سامانێکی دەوڵەت و گەلیشیان بردووە بیگەڕێننەوە.
کوردەکان بوون هێزەکانی سەدامیان لە پارێزگاکانی کەرکووک و مووسڵ و قەزا و ناحیەکانی پارێزگای دیالە دەرکرد. ئەگەر ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا مافە ڕەوایەکانی کوردان لەبەرچاو دەگرێ، با یارمەتییان بدا تا ئەو ناوجانە وەرگرنەوە کە حکوومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق لێیان دابڕیوە. هێزە ئەمریکییەکان بوون ئاڵای کوردستانیان لەو جێیانە هێنا خوارێ، وەک ڕۆژنامەیەکی ئەمریکیش دەڵێ: "نابێ ویلایەتە یەککگرتووەکان، لەبەر بەرژەوەندیی چەند ملیۆن کوردێک رووله ملیۆنەها تورک و عارەب وەرگێڕێ" . ئەوەش ڕاستییە، ئاخر کە سوپای تورکان کوردان کۆمەڵکوژ دەکا، ویلایەتە یەککگرتووەکان کڕ و بێدەنگە، لەکاتێکدا پارتی کرێکارانی کوردستانیی"پێکەکە"ی لە لیستی دەستە تیرۆریستییەکان داناوە و، ئەگەرچی هەشت تۆن بەڵگەنامەیشی وەرگرتبوو کە ئەوەیان دەسەلماند، کەچی بەهەموو ڕێیەکیش هەوڵیدا حکوومەتی سەدام حوسێن لە کۆمەڵکوژکردنی کوردان بە چەکی کیمیایی ئەستۆپاک بکا. ئیدی لەبەر کام هۆی دروستە دەبێ کورد هاوپەیمانی ستراتیژیی ویلایەتە یەککگرتووەکان بن؟!
تاکە هەڵوێستی دروست ئەوەیە جەماوەر بۆ خەباتی دژی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی و دیکتاتورییەت یەکبخرێ و لەپێناوی سەربەخۆیی و دیموکراتی. کە بۆرژوای نیشتمانی لە

زۆربەی ولاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاســت گەیشــتنە دەســەڵات، جا لەڕێی شــۆڕشــێکی میللییەوە بووبێ"جەزائیر" یان کودەتایەکی سەربازیی جەماوەری گەل پشتی گرتبێ"میسر و عێراق"، کە دۆخی دەســــەڵاتی بۆ جێگیربوو پێیوابووە لەڕێی دەزگـا بەڕێوەبەری و ئاســایشــییەکانەوەدەتوانێ ســەربەخۆیی ولات بپارێزێ و پشــتی لە بەرژەوەندییەکانی جەمـاوەری گەل کردووە. زۆرجـارانیش ئەو دەزگـایـانەی بۆ ســـەرکوتکردنی گەلـک بەکارهێناوە کاتی داوای دیموکراتی و باشــترکردنی باری گوزەران و باری ڕۆشــنبیریی کردووە، کە ئەوەس وایکردووە جەمـاوەر لیی دوورکەوێتەوە و، ئیدی بووەتە پـارێکی چەوری ئیستیعماری و کۆنەپەرستان.
ئەو بۆرژوایەی لەڕێی ســـەربەخۆیی ئابووری و کۆمەلایەتی و ئایدیۆلۆژییەوە کاری بۆ ســەربەخۆیی وڵات دەکرد، ئێســتا هەردوو شــیپانی دەرگای ولاتی بۆ کۆمپانیا بێگانەکان خستووەتە سەرپشت تا بێنسەرمایەگوزاریی تێدا بکەن، ئەوەش وایکرد ئابووریی ناوخۆ بەشێوەیەکی کاتی ببووژێتەوە. کەچی ئەوە بووەهۆی ئەوەی ئابووریی ولات بە ئابووریی وڵاتە ئیستیعمارییەنەوە ببەسترێتەوە کە مەرجی ئەوتۆ دەسەپێنن لە چاکەی بەرژەوەندییە نیشتمانییەکان نییە و، بەڵکو لە بەرژەوەندیی خۆیەتی، ئیدی هەرخێرا تووشی ئەو قەیرانە دارایی و ئابوورییانە دەبێ کە لە ســـەرمایەداریدا درێژخایەنن و، دەشـــیەوێ بارگرانیی کێشەکانی بخاتە سەر شانی ئەو وڵاتانە.
جەماوەری کرێکار وجووتیار و کاسبکار و ڕۆشنبیرانی ولاتانی تازە پێگەیشتوو هەردوو تالاوی چەوســـاندنەوەی بۆرژوای ناوخۆ و چەوســـاندنەوەی مۆنۆپۆلەکانی بێگانەی جەشــتووە، بۆرژوای نیشــتمـانی لەو حـاڵەتەدا بوونە دەڵاڵ و نمـایندەی کۆمپـانیـا ئیســتیعمارییەکان و، بەلای پتریش دەتی لە بنیاتنانی ئابووریی نیشـتمانی بەردا و، ڕووی لە ســوودی ئەو مووچە و پۆســت و دەلالی و بەشـدارییانەی ئەو کۆمپانیایانە کرد. ئیدی گەندەڵیی دارایی و بەڕێوەبەری و کۆمەلایەتی وڵاتیان تەنییەوە ئەوش بووە هۆی ئەوەی جەمـاوەر ڕقی لە حکوومەتە نـاوخۆییەکـان ببێتەوە و لەبیری بچێ خەوش و کەموکوورییەکە لە دزەکردنی مۆنۆپۆلە ئیمپریالییەکانەوەیە کە خۆیان لە هەموو جومگە و لایەکی ولاتانی تازەپێگەیشتوو کوتاوە و دەستیان بەسەر سامانە نیشتمانییەکەیدا گرتووە. ئیســتیعمارییەکان، هەتا داواکارییە جەماوەرییەکانی گەل کێشــەی بۆ بەرژەوەندیی ئەوان نەبێ، خۆیان وا نیشــاندەدەن پشــتیوانییان لێ دەکەن، داوا لە حکوومەتەکان دەکەن بەدەم داوایەکانی گەلەوە بێن و، ئەگەر کارەکەش پێویستی کرد ئەو حکوومەتانەی گەل نایانەوێن دەڕووخێنن و، هەموو ئەوەیشیان بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندیی خۆیانە.

هێنری کیسنجەری وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە دوای دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکانی مۆنۆپۆلەکانی نەوت پشتی تێکرد، لە ١٩٧٥، بە مەلا مستەفا بارزانیی گوت: "بەڕێز بارزانی، خۆت مەخەڵەتێنە، ویلایەتە یەکگرتووەکان دوژمنی هەمیشەیی نییە و دۆستی هەمیشەییشی نییە، بەڵکو بەرژەوەندیی هەمیشەیی هەیە"[69]. جا ئەو بەرژەوەندییانە بوونە هۆی نوشوستییەکی گەورەی شۆڕشی کوردی، کاتێ سەدام حوسێن و شای ئێران لە جەزائیر لەسەر ئەوەی ڕێککەوتن پێکەوە لە بزووتنەوەی کوردیی کوردستانی عێراق بدەن.

زۆرجاران تووڕەیی جەماوەی گەل لەو ولاتانەدا خۆکاوانەیە و، ئۆپۆزسیۆنیش خێرا دەیەوێ سواری ئەو جالاکییە خۆکاوانە ببێ تا بەرژەوەندییەکانی خۆی دابین بکا و، زۆرجارانیش بۆ دەوڵەتە ئیستیعمارییەکان دەخوێنێ تا لەو کارەیدا هاریکاریی بکەن و بەڵێنی ئەوەیشیان دەداتێ بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیان دەستەبەر بکا و، جا بەرژەوەندیی دەوڵەتە ئیستیعمارییەکان لەو ولاتانەدا دەکەونە ململانێ، ئەویش ئەو کاتەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی بەهێزترین دەولەتی ئیستیعمارییە، کار بۆ ئەوەی دەکا جێی دەوڵەتە ئیستیعمارییە لاوازەکان بگرێتەوە لەو کۆلۆنیال و ئەو ولاتانەی پێشتری سەر بەوان بووینە و دوای شەڕی دووەمی جیهانی سەربەخۆیی سیاسییان وەرگرتووە نەک ئابووری.

ئەو کێشە کەڵەکەبووانەی لەو وڵاتانەدا چارەسەرێکیان نییە، وایکردووە ئەو حکوومەتانە لە چارەسەریاندا دەستەپاچەبن، جا ئەوەس وایکردووە حکوومەت لاچن و حکوومەت بێن، بەلام لەوان چاتر نا، تا وا ببەنەمێشی جەماوەری تووڕە گوایە داواکارییەکانیان جێبەجێ دەکەن، یانیش هێز دژی جەماوەر بەکاردێنن تا هەر داوایەکیئازادی و پاروەنانێک سەرکوت بکەن. لە زۆربەی ئەو وڵاتانەی ناوچەکەی ویلایەتە یەکگرتووەکان تێیدا چالاکە، هەر ئەوە ڕوویداوە یان ڕوودەدا، ئەگەر پێویستیس بکا ئەوا بە سوپا داگیری دەکەن، وەک ئەوەی لە ئەفغانستان و عێراق ڕوویدا و خەریکە لە لیبیاش ڕوودەدا.

کاری دروستی هێزە نیشتمانییەکان لەوەیدایە ئەو جەماوەرە دژی هۆکارە ڕاستەقینەکانی کێشەی گەل تەیار بکەن، واتە دژی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی و دیکتاتۆرییەت ، لەپێناوی سەربەخۆییەکی ڕاستەقینەی ولات و دەسەلاتی نیشتمانی و دەستەبەرکردنیدیموکراتی بۆ گەل و دابڕینی لە دوژمنان.

---

69 _ ئەو قسەیە لە بنەڕەتەوە هیی وینستۆن چەرچلی سەرۆکوەزیرانی بەریتانیایە ، کە دەڵێ لە سیاسەتدا نە دۆستی هەمیشەیی هەیە و نە دوژمنی هەمیشەیی، بەڵکو بەرژەوەندیی هەمیشەیی هەیە. ئەوەش سەرەتای پەیڕەوکردنی فەلسەفەی پراگماتیزمە لە سیاسەت، کە هەموو شتێک دەکرێتە قوربانیی سوود و بەرژەوەندی- ل. ب.

## لەدایکبوونی حیزب و گەشە و مردنی حیزب:

حیزب وەک بوونەوەری زیندووە، کە پێویستیی هەبوونی دێتەگۆڕێ ئیدی لەدایک دەبێ و کە جەماوەریس بۆ دەســـتەبەکردنی داواکارییەکانی لەدەوری کۆدەبێتەوە گەشـــەدەکا و گەورەدەبێ و، جا ئەگەر نوێ نەکرێتەوە و خۆی لەگەل بارودۆخی نوی نەگونجێنێ ئەوا پیردەبێ پیر و کەنەفت دەبی، پاشـــان کە پێویســـتیی مێژوویی هاتەگۆڕێ ئەوا دەمرێ. حیزب و پێشـــەنگی ڕێکخراوی هەر چینێک، هەرچەندی بانگەشـەی ئەوەی بکا کە نوێنەری هەموو گەلە کەچی ئەوە راســـتییەکە نییە. ئـاخر حیزبی بۆرژوایی حیزبی بۆرژوایە و حیزبی کریکاری حیزبی کرێکارییە و کەسیدی نا. ڕەنگە شۆڕش شۆڕشی گەل بێ و چین و توێژە جیاوازەکان بیکەن کە بەرژەوەندییان لە گۆڕینی ئەو بارودۆخە ســـیاســـی و کۆمەلایەتییەکەدا هەبێ کە نوێنەری چینێکە خۆی ســـەربەو چینە نییە، بەڵام لەو بەرەیەدا حیزب نوێنەری چینێکە کە ســـەر بەو چینە نییە و دەربڕی بەرژەوەنـدییەکـانیەتی و، ململانێی نێوان جینەکانیش هەر بەردەوامە بەڵام شـــێوەیەکی دیکە وەردەگرێ. دەشـــکرێ هەندێ لە دژبەرییەکان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەڕێی ئاشـــتی و دیموکراتی چارەســـەر بکرێن، ئـــاخر دیموکراتی مـــانـــاو مەدلوولاتی جیـــاوازی هەیە، بەپێی پەیوەنـدییە کۆمەڵایەتییەکـانی کۆمەڵگـایەکی دیـاریکرا و و بۆ مـاوەیەکی دیـاریکراو دەگۆڕێ.ئەو دیموکراتییەتە ڕوو لە فراوانی نیی، بەڵکو بە پێچەوانەوە کرژ و بەرتەســـک دەبێتەوە. هەرچەندی شـۆڕشیش گەشـە بکا و بەرەوپێش بچێ ئەوا، لەناو پێکهاتە شـۆڕشگێڕییەکە، دەســـەڵاتی چینێک تەســـکدەبێتەوە و دەســـەڵاتی چینێکی دیکە فراوان دەبێ. ڕەنگە ئەو چینەی بەرژەوەندییەکانی بەرتەسـک بووەتەوە، هەوڵدا ئەو دیموکراتییە لە دژی چینەکانی دیکە و لە بەرژەوەنـدیی خۆی بەکاربێنێ. ئا لێرەدا، دژبەرییەکـان دەبنە دژایەتیی ڕەنگە، چینێک یان دەســـتەیەکی پێداویســـتیی مێژوویی وا بخوازێ بە ئاشـــتییانە لە مەیدانی ململانییەکە بچێتەدەرێ، بێ و هەوڵدا ئەو دژیەکییانە بە شـێوەیەکی نائاشـتییانە چارەسـەر بکـا و، زۆرجـارانیش بەرەوڕووی گۆڕانی بەرەو بـاشـــتری کۆمەڵگا دەبێتەوە. جا لەو مـاوەیەدا ئەو حیزبەی نوینەرایەتیی دەکـا لەگەل مردن دەکەوێتە ملە و پێویســـتیی مێژووییش وا دەخوازێ گۆڕەپانەکە بۆ ئەو حیزبانە بەجێبێڵێ کە هێشتا لە باری گەشە و پێشکەوتندان.

عێراق و کوردســـتـان، ئێســـتـا لەلایەن دەوڵەتێکی بەهێزی ئیمپریـالییەوە روونمـان و هەرچەندی حیزبە عێراقییەکانیش هەوڵدەن ناوی"داگیرکردن" بگۆڕن و بیکەنە "ئازادکردن" ئەوا هیچ لە واقیعەکە ناگۆڕێ و، حیزبە عێراقییەکانیش پێگەی جودا و جیاوازیان هەیە، هەندێکیـان لە جەنگەی ململانێ نیســـتمـانییەکـانی دژی ئیســـتیعمـار و کۆنەپەرســـتی

لەدایکبووینە و، چالاکانەش بەشـداریی گۆڕینی بارودۆخە سـیاسـی و کۆمەلایەتییەکانیان کردووە، لەو حیزبـانەی هێشـــتا مـاون حیزبی شـــیوعیی عێراقی و پارتی دیموکراتی کوردســـتانن و، حیزبی وەهاش هەیە لە جەنگەی ململانێیە ناوخۆییەکان لەدایکبووە ئەو کاتەی هەندی توێژی گەل، لەلایەن ئەو حیزبانەی بەهەرجۆرێکبێ گەیشتوونەتە دەسەلات، دووچاری چەوســـانەوە هاتوون، وەک حیزبی دەعوەی ئیســـلامیٔ و ئەنجوومەنی بالای شۆڕشی ئیسلامی و هەندی حیزبی ئایینی و عەلمانیی کوردسـتان و، هەندێ حیزبیش لە ئەنجامی ململانێی فیکری و سـیاسـیی ناو حیزبەکان پەیدابووینە، وەکیەکێتیی نیشـتمانیی کوردســـتانی کە لە پارتی دیموکراتی کوردســـتان جودابووەوە تا حیزبێکی ســـەربەخۆ دامەزرینێ و، حیزبی گۆڕانی لە یەکێتیی نیشـــتمانیی کوردســـتان جودابووەوە و، هەندێ حیزبی لە هامێزیدەســـتەودایەرەکانی ئیســـتیعمار لەدایکبوون و بۆ رووخاندنی ڕژێمی سـەدام حوسـێن بەکاریهێنان و حیزبێکی نوێنەری چینی دەرەبەگ بوو و شـۆڕشـی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ ڕووخاندی و، پارتی پارێزگارانی کوردســـتانی هەرێمی کوردســـتان و، وەکچۆن دابرانی بـاری بەڕێوەبەری لە عێراق و دامەزرانـدنی حکوومەتی هەرێمی کوردســـاتـان بووە هۆی دووبڕبوونێکی بە خوایشـــتی حیزبی شـــیوعیی عێراقی و لەدایکبوونی حیزبی سیوعیی کوردستان.

ئەو حیزبانەی گەیشـــتنە دەســـەلات، چ پێش داگیرکردن و چ دواترێ، پێکهاتە چینایەتی و ســـیاســـی و فیکرییەکەیان گۆڕا، کە پێشـــترێ حیزبی تێکۆشـــەربوون و خەباتیان بۆ ســـەربەخۆیی عێراق و ئازادیی گەل و دەســـتەبەرکردنی دادپەروەریی کۆمەلایەتی دەکرد، ســـەرکردەکانیان لە ماوەی داگیرکاریدا یەکجار دەوڵەمەند بوون و، لە بۆرژوای نیشـتمانی و بۆرژوای بچووکەوە بوونە بۆرژوایەکی بەرژەوەنـدییـان لەگەل کۆمپـانیـا مۆنۆپۆلییە بیانییەکان تێکچڕژا و، ئیدی بوونە دەلێکی لەبەرانبەر دەلالی یان بەشـــداریی قازانج یان بازرگانی، بوونە دەلالی بەخشـــینی ئیمتیازاتی ئابووری. بۆیە دەســـەلاتەکەی بە مانەوەی ئیســـتیعمار و داگیرکەرانەوە بەســـتراوەتەوە، جا بە هەموو ڕێگا و پەلپ و بیانووێک هەولدەدا داگیرکاری بەردەوام بێ تا بەرژەوەندییەکانی پارێزراو بێ و، بە هەناسەبڕاوییش بەدوای دیموکراتییەکی درۆزنـدا ڕادەکـا کە گوایە بەرژەوەنـدییەکـانی زۆرینەی گەل لە کرێکار و جووتیار و ڕۆشـنبیر و کاسـبکاران دەپارێزێ و، هەر ئەوەندەش پێیەوە پابەندە هەتا خزمەتی بوون و بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکا و، ئەو کێشـانەی دەکەوێتە نێوان ئەو حیزبـانەش خۆ لەقەرەی بەرژەوەنـدییەکـانی ئیســـتیعمـار نـادا و، تەنیـا هـاتوهـاوارێکی گەرمداهاتنە و لە کرۆکی بابەتەکان نزیک نابێتەوە. ئەو کێشـــانەش هەندێ کات لەئەنجامی ئەو کێشـە شـاراوە ئیسـتیعمارییانەی نێوان ئەمریکییەکان و بەریتانییەکان دێتە ئاراوە، کە

بەردەوام دەیانەوێ جێی ئیستیعمارە بەریتانییەکانی لەوان لاوازترن بگرنەوە، ئیدی گرەو لەسەر ئەم حیزب و ئەو حیزب دەکەن.
ئێستا با قسەیەکی هاوڕێیانەی ناو حیزبی شیوعیی عێراقی و حیزبی شیوعیی کوردستانی بکەین. حیزبی شیوعی لە ٣١ی ئازاری ١٩٣٤ دامەزراوە. بو دەسپێشخەریی هاوڕێ فەهد و هاوڕێکانی لە سەردەمێکدا دامەزراوە کە ئیمپریالیزم کەوتبووە ناو قەیرانێکی ئابووریی ئەوتووە ڕەنگە شەڕێکی جیهانیی بۆ دابەشکردنەوەی کۆلۆنیالییەکان لێ بکەویتەوە. لە عێراقیش دەوڵەتیک هەبوو کە دەستوورەکەی دەیگوت عێراق دەوڵەتێکی سەربەخۆی پەرلەمانییە. بەڵام سەربەخۆیی هەر ڕواڵەت بوو، ئاخر ئەو وابەستەی پەیماننامەی ١٩٣٠ بوو کە ڕێیدەدا بەریتانیا بنکەی سەربازیی هەمیشەیی تیدا دامەزرێنێ و لە حالەتی شەڕ و ئەگەری هەڵگیرسانیشی بۆی هەبوو بێتەوە عێراق.
ئابووریی عێراق و داراییەکەی بە تەواوی سەر بە بەریتانیابوون. مفتەپارەی عێراق ئەسپاردەی بانکەکانی بەریتانی کرابوون تا حکوومەتی عێراقی نەتوانێ لە بنیاتنانی ئابوورییەکی نیشتمانیدا لە ولات بەکاریان بهێنێ. پەرلەمانی، ئەگەر نەشڵێین هەرهەموویان، زۆربەی ئەندامەکانی لە بەکرێگیراوانی ئیستیعمار و هیی خانەوادە ئەرستۆکراتی و دەرەبەگەکان بوون. دەستوور پەکی خرابوو و، گەل لە سایەی حوکمی عورفیدا دەژیا و مافە دیموکراتییەکانی گەل پامال کرابوون.
حیزبی سیوعی لەو قۆناغەی لە چەندین ئاڵقەی مارکسی پێکهاتبوو کە دواتری بەپێی ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم- لینینزم، کۆکرانەوە، کە ئەودەمی لە کانگای ململانێی فیکری و سیاسیدابوون لەگەل ئەو ئاڵقە مارکسییانەی باوەڕیان بە چاکسازی هەبوو نەک شۆڕشگێڕی.
بەلام چ چاکسازییەکی سایەی حکوومەتێکی لایەنگری ئیستیعماری لە بۆرژوا و خانەوادە ئەرستۆکراتەکان و شێخ و ئاغا دەرەبەگەکانی عەشیرەتەکان پێکهاتبوو و، کارەکانیان بەپێی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بەڕێودەبرد و کرێکار و جووتیار و بۆرژوای نیشتمانی وڕۆشنبیرە نیشتمانییەکان شوێنەوارێکیان بەو حکوومەتەوە دیار نەبوو. فەهد لە وەلامێ پرسیاری هاوڕێیەکی لەژێر ناونیشانی "حیزبی شیوعی نەک سۆشیالیستی دیموکراتی" بلاوکرایەوە، ئەوەی روونکردەوە کە پێویستە لەو قۆناغەدا، قۆناغی ئیمپریالیزم و ئیستیعمار، حیزبێکی شۆڕشگێڕ هەبێ نەک چاکسازی خواز. بەپێی ئەو هەڵوێستە شۆڕشگێڕییانە و تێکۆشانی بێ پسانەوە توانیی حیزب بکاتە حیزبێکی بەهێزی پتەو و، جەماوەرێکی زۆری کرێکار و جووتیار و ڕۆشنبیر و کاسبکار لەدەوری کۆبوونەوە و، لە

ڕاســتییشــدا ببووه چەتری حیزبە بۆرژوازییە نیشــتمانییەکانیش کە بە پارێزەری خۆیان دادەنا لە خەباتی ڕێی سەربەخۆیی تەواو و دیموکراتی.
لە ساڵانی شەڕی دووەمی جیهانیی بەشێکی زۆری بارگرانیی شەڕەکە کەوتبووە سەر شــانی گەلی عێراق، حیزب توانیی جەماوەرێکی بەرفراوانی کرێکاران لەو ســەندیکایانە ڕێکخا کە ســەرباری تێکۆشــانی بۆ بەدەســتهێنانی ئامانجە نیشــتمانییەکان، هەوڵی دەدا لەڕێی مانگرتن و خۆپیشـــاندان و پەناگیری زۆربەی مافەکانی خۆی داپچڕێ،حیزبی شیوعی جەماوەری قوتابییانی لە یەکێتییەکی تێکۆشەر کۆکردەوە و، کۆمەڵەی جووتیارانی دامەزراند وهەر بەڕاســتی بووە پێشـــەوای بزووتنەوەی نیشــتمانی و کۆمەلایەتی و لە شــۆڕشـــی ١٤ی تومموزی ١٩٥٨ ڕۆڵێکی دیاری هەبوو و لە قایمکردنی باغەکەیشـــی بەشداربوو.
ســەرباری ئەوەی لە کودەتای ٨ی شــوباتی ١٩٦٣ ی دژە شــۆڕش و پشــتبەســتوو بە ئیستیعماری ئەمریکی، گورزێکی قووڵی بەرکەوت، بەلام تەنیا دووساڵی پێچوو و چاکەی ئەوەی بەرکەوت کە ڕێنوێنیی ســیاســەتی بەعس بکا، دوای ئەوەی بەعس خۆی لە خەڵکە بەکرێگیراوەکەی ئیســتیعمار پاککردەوە، تا دەگاتە ئەوەی کێشــەی کوردی لەســە ڕێی چارەســەری دروســت دانا و دان بە ئۆتۆنۆمیی کوردســتاندا نرا و یاســای نوێی لە بەرژەوەندیی کرێکاران و جووتیاران بوون داندران و بانگەســەی دامەزراندنی بەرەیەکی نیشتمانی و حوکمێکی ئیئتیلافی کرا.
لادانی حیزبی بەعس لە ڕێچکە پێشـــکەوتنخوازییەکەی، نەخاســـمە دوای ســـەرگرتنی خۆماڵیکردنی نەوت، وای لە بەرەی نیشـــتمانی و دەســـەلاتی ئیئتیلافی کرد لاواز ببن و، بەعس بەرەو دیکتاتۆرییەت چوو و دوایەش ئەو دەرەنجامانەی لێیکەوتەوە.
کە جیـابوونەوەی کوردســـتـان لە دەســـەلاتی دیکتـاتوریی دژە گەلی کورد بووە پێداویســـتییەکی نیشـــتمانی و لە ســـایەی ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١ هەر بە ڕاســـتی جودابووەوەلقی کوردیی حیزبی شـیوعیی عێراقی بووە حیزبی شـیوعیی کوردســتانی و پەیوەندییەکی پتەوی بە حیزبی ســیوعیی عێراقییەوە هەبوو و ئەو حیزبە لە ســـالاکانی دواترێ لە حکوومەتی هەرێمی کوردستاندا بەشداربوو.
دوای خیانەتی لادەر و هەڵگەڕاوەکانی حیزبی شـیوعیی سـۆڤیەتی و گێڕانەوەی یەکێتیی ســـۆڤیەت بەرەو ڕێگای ســـەرمایەداری، حیزبی ســـیوعیی عێراقی و دواتریش حیزبی شیوعیی کوردستانی، لەگەل گەلێ حیزبی سیوعیی دیکە ئایدیۆلۆژیایان گۆڕا و لە سـەر ڕێچکەی لینینیزم لایاندا و وەک حیزبە ســۆشــیال دیموکراتەکان ڕێچکەی چاکســازییان گرتەبەر و، بگرە کونگرەی پێنجەمی حیزبیش هەوڵی ئەەی تێدا درا ناوی حیزب بگۆڕدرێ

و وشەی شیوعیی لێ لابدرێ و دروشمی "کرێکارانی جیهان یەکگرن" لە ڕۆژنامەی حیزب و ئەدەبیاتەکەی لابدرێ، بەڵام نارەزایی توندی زۆرینەی ئەندامانی کونگرە لێنەگەڕا ئەو کارە بکرێ، بەلام حیزب هەر لەسەر ڕێچکە چاکسازییەکەی مایەوە و ناوی شیوعیی تەنیا وەک ناوێکی مێژوویی هەڵگرتووە.

حیزبە سـوعییەکان ئەوکاتەی دامەزران کە سـەرمایەدارییینایە قۆناغی ئیمپریالیزم و، ئێسـتاش ئیمپریالیزمی سـەردەم هیچی لەوەی پێشـترێ جودا نییە، هێندە نەبێ درترە. گەراوەتەوە سەر شەڕەکانی داگیرکردن و دەستبەسەرداگرتنی کۆلۆنیالەکان و ولاتەکانی پێشترێ کلکی بوون و بارودۆخەکان دەباتەوە سەر ئەو دۆخەی بە پێش شەڕی دووەمی جیهـان دەچێ، لەگەڵ گۆڕینی دەوڵەتە ئیسـتعمـارییە لاوازەکەی جـارانیش بووەتە دەوڵەتیکی ئیستیعماریی بەهێز.

عێراق ئێسـتا لەژێر داگیرکاریی ئەمریکادایە و حکوومەتی ئەمریکا فشـار دەخاتەسـەر حکوومەتی عێراق تا رازیبێ سـوپای داگیرکەر بە ناوێکی دیکە لە ولاتدا بمێنێتەوە تا پارێزگاری لە ڕسـتێک ئیمتیازاتی خۆی بکا. دیموکراتییە ڕواڵەتی و کاتییەکەیش ئەوەندە فراوان نییە تا چینی کرێکار و هاوپەیمانەکانی بتوانن خۆیان لە حیزب و سـەندیکای تێکۆشەر ڕێکبخەن و، بەقەدەر قەبارەی ئێستایشی ڕێ بە حیزبی شیوعیی عێراقی دەدرێ کاربکا، واتە ئەو قەوارەبەندییەی سـەدام حوسـین بەرانبەری پیادەی دەکرد. ئەگەر ئەو حیزبە ئێسـتـا بگۆڕێ و ببێتە حیزبێکی شـۆڕشـگێڕی کـار بۆ کۆتـایی داگیرکـاری ودەستەبەرکردنی دەسەلاتی نیشتمانی بکا، بێگومان دەبێ بە بەرەیەکی دیموکراتییەوە بێ. کەواتە، چینی کرێکار و گەلی عێراق ئێستا پێویستیان بە حیزبێکی شیوعییە نەک سۆشیال دیموکرات، حیزبێکی شۆڕشگێڕی سەرکردایەتیی ئەو جەماوەرە تووڕەیە بکا کە خەباتێکی خۆکاوی دەکەن و، دوژمنی راسـتەقینە دەسـتنیشـان ناکەن و ئەوەش دیاری ناکەن گەل چیی دەوێ. ئیدی دەبنە پاروێکی بیگرێی ئەو حیزبە بۆرژوایە یان ئەوێهێی ئایینی یان ئەوەی عەلمانی، تا لەسـایەی هەبوونی ئیسـتیعماردا داوای هەندێ چاکسـازی بکا. هەر ئەوەش هۆی راسـتەقینەی ئەوەیە کە ئەو دوو حیزبە شـیوعییە نەبوونەتە دوو حیزبی پێشـڕەویی جەماوەری تووڕە بکەن و ئاراسـتەی ڕێی دروسـتی بکەن. جەماوەرێکی تووڕەی بەخۆکاوی هەڵچووە و بێسـرکردەیەکی شـۆڕشـگێڕی خاوەن ڕێچکەیەکی نیشتمانی و چینایەتیی ڕوون بێ. دوو حیزبی چاکسازی خوازی خۆیان بەو سیستەمانەوە هەڵواسیوە کە نازانن چ بکەن، ئەگەر مل بۆ داواکارییەکانی داگیرکەران بدەن دەکەونە بەر تووڕەیی گەل و ئەگەر جەمـاوەری تووڕە کێشـمەکێشـی لەگەڵ کرد و بەرەوڕووی داگیرکەران بووەوە، ئەوا دەسـەلات و ئیمتیازاتەکانی لەکیس دەچێ و، ڕەنگە ئەگەر بە

داوای ئیســـــتیعمارییەکانیش ڕازیبێ، وەک عەبدولموحســــین الســـەعدون خۆی بکوژێ. ڕاکردنی حیزبی ســـیوعییش بەدوای جەماوەردا، نەک ســـەرکردایەتیکردنی بەرەو ئامانجە نیشـــتمانییە دروســـتەکان ســـوودێکی نییە و، حیزبە ئایینییەکان بەیداغەکەی لەدەســـتی دەردێنن و بۆ بەرژەوەندیی خۆیانی دەقۆزنەوە.

کەواتە، تـاکە ڕێی دروســــت گەڕانەوەیە بۆ جەمـاوەر نەک خۆ هەڵواســـین بە چەنـد کورسییەکی لەرزۆکەوە یان بەستە دینارێکی دەبێتە بەرگرێک لە نێوان ئەو و جەماوەردا.

## وانەیەک لە مێژووەوە:

ڕژێمی ئیستیعماری، لە کاتی شەڕی دووەمی جیهانیدا، لەژێر گورزی شۆڕشەکانی ڕزگاریخوازی نیشتمانی، هەرەسی هێنا، بەڵام ئیستیعمار هەر ما وخۆی لەگەڵ ئەو بارودۆخە نێودەوڵەتییەی دوای کۆتایی شەڕ گونجاند. ئەو بارودۆخەس ئەوەبوو کە سیستەمی سۆشیالیستی لە یەک وڵاتەوە گۆڕا و بوو بە سیستەمێکی جیهانیی ڕووبەرێکی زۆری دنیای داپۆشیبوو و، هاوسەنگییەکی نێودەوڵەتیی لە بەرژەوەندیی سەرکەوتنی شۆڕشە نیشتمانییەکان بەرپاکرد. ئیستیعمارییەکان، لەو قۆناغەیدا، شێوازی لە شێوازی وڵاتانی تازە ئازادبوو ئۆیندبازانەتریان گرتەبەر، سیاسەتی قەرز و یارمەتیدانی ئەو وڵاتانەی پەیوەندییان پێیانەوە هێشتبووەوە و گەمارۆی ئابووریی ئەو دەوڵەت و وڵاتانەیبەرەوڕوویی ئیستیعماری نوی ببوونەوە، تا بارودۆخێکی گوزەرانی ناخۆش لەو وڵاتانە دروستکەن و ئۆباڵەکەیشی بخەنە ئەستۆی حکوومەتەکانیان.

هەرەسی سیستەمی سۆشیالیستی لە یەکێتیی سۆڤیەت[70] و لاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات، کەشێکی گونجاوی هێنایەپێش تا ولاتانی ئیمپریالی لە کاری نەرێنییەوە بێنە سەر کاری ئەرێنی، مەبەستم ڕووخاندنی حکوومەتە نیشتمانییەکانە لەڕێی کودەتای سەربازیی کۆنەپەرستانە و شۆڕشی پێچەوانە و، دوای ئەوەش داگیرکاریی سەربازیی ئیستیعماری و ڕووخاندنی ئەو ڕژێمانەی نەیارن یان دوژمنن و ئەوەش بە هێزی سەربازی بکا و، تا ڕەنگێکی شەرعییەتی نێودەولەتییش لە کارەکانی هەڵسوێ ئەو ولاتانە پەنایان بۆ بەکارهێنانی ئالای دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکان برد و دەوڵەمەندکردنی ژمارەیەکی پتری سەرکردە نیشتمانییەکان و چەند توێژێکی گەل لەژێر دروشمی دەستەبەرکردنی دیموکراتی و پاراستنی مافی مرۆڤ.

دروشمی پاراستنی سەربەخۆیی نیشتمانی ، ئەو سەربەخۆییەی کەوتبووە ژێر فشار و هەڕەشە و هێرشی ئیستیعماری، ئێستا دروشمی دیموکراتی و مافی مرۆڤ بەپێشیکەوتبوو و، زۆربەی ئەو وڵاتانەش پشتیان بە تاک حیزبی دەبەستا و خاوەنی دامەزراوەی بەڕێوەبردن و ئاسایش و سەربازی بوون و پێیانوابوو کە ئەو دامەزراوانە دەتوانن سەربەخۆیی وڵات بپارێزن و، هەرچەندی گەلیش داوای دیموکراتی و ڕێزگرتن و ئازادیی مافی مرۆڤی بکردایە، هەمیشە ئەو گوزارشتەیان دووبارەدەکردەوە کە

---

70 _ ئاماژەیەکە بۆ کۆتاییهاتنی بوونە یاساییەکەی دەوڵەتی یەکێتیی کۆمارە سۆڤیەتییە سۆشیالیستەکان. ئەو لێکهەڵوەشانەوەیەش لە ٢٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٩١ ڕوویدا، دوای ئەوەی ئەنجوومەنی سۆڤیەتی بالای یەکێتیی سۆڤیەت ڕاگەیاندنی ژمارە '١٤٢- H'ی دەرکرد و تێیدا رایگەیاند دان بە سەربەخۆیی کۆمارەکانی سۆڤیەتی پێشتریدا دەنێ و، یەکێتیی ولاتە سەربەخۆیەکانی دامەزراند تا جێی یەکێتیی سۆڤیەت بگرێتەوە.

لەبارودۆخێکی بکەوێتە بەر هەڕەشەی ئیستیعمار "وڵات پێویستی بە حکوومەتێکی بەهێزە نەک حکوومەتێکی دیموکراتی".
ڕاسـته دیموکراتی، بەپێی خوو و نەریتی گەل و قۆناغی پەرەسـەندنی شـۆڕشـی ئازادیخوازی نیشـتمانی، چەندین مانای هەیە. ئەو وڵاتانەی درکیان بەوەی کرد سەربەخۆیی نیشتمانی و دیموکراتی دوو جمکەن و ناکرێ لێکبکرێنەوە، دیموکراتییەتی وا لێکداوەتەوە کە دەکرێ بدرێتە گەل و نەدرێتە دوژمنانی گەل، تا ڕووی ئەو دیموکراتییەتەی پێ هەڵماڵن کە وڵاتە ئیسـتیعمارییەکان بەو ئامانجە بەرزیان کردووەتەوە تا بارودۆخێک بۆ هێزە کۆنەپەرسـتەکان برەخسـێنن خۆیان ڕێکخەن و پردەنە سـەربەخۆیی وڵات و دەستکەوتەکانی گەل.
گوزارشـتی گەل و دوژمنانی گەل،گوزارشـتێکی زۆر ورد و ناسـکە، فراوانکردنی بوار دەداتە کۆنەپەرستی تاسیستەم لە ناوەوەڕا داشکێنێ و هەڵیگێڕێتەوە و، تەسکردنەوەیشی وادەکا توێژێکی فراوانی گەل لیی بێبەش بن و وڵاتیش لە چەندین ناوەندی فراوانی هێزە نیشتمانییەکان بێبەش بێ و چینی دەسـەڵاتدا پتر و پتر تەریک بێ و، جا ئەو یزانە لەکاتی بێبەشـبوون لە ئازادی و سـەرکوتکردنیان دەچێتە بەری ئۆپۆزسـیۆنی کار بۆ ڕووخاندنی ڕژێمە نادیموکراتییەکان دەکا. لە حاڵەتێکی نەیشـتوانێ، لەبەر هەر هۆیەک بێ، گەل ئامادە و تەیار بکا تا ئیرادەی خۆی بەسـەر ئەو حکوومەتانەدا بسـەپێنێ، ئەگەر ملیشـی بۆ ئیرادەی گەل نەدا ئەوا بیڕووخێنێ، ئا لەو کاتی بێ توانایيەدا لاریی لەوەی نییە پەنا بۆ هێزە بێگانە دژەگەلەکان ببا، چونکە پێیوایە دەسـتەبەرکردنی دیموکراسـی لەسـەر یسـابی نەبوونی سـەربەخۆیی نیشـتمانی وای لێدەکا بتوانێ هێزە نیشـتمانییەکان ڕێکخاتەوە و خەبات بۆ وەرگرتنەوەی سـەربەخۆیی نیشـتمانی بکا، بەڵام هەرکەسـێکی دەسـتی بە سـەربەخۆیی نیشـتمـانییەوە گرت ودیموکراتییەتی وەلانـا، ئیـدی لە ئیرادەی گەل دووردەکەوێتەوە. دەسـت لە سـەربەخۆیی نیشـتمانی بەردانیش وڵات تووشـی مەترسـیی ڕاستەقینە دەکا و دەبێ بۆ وەدەستهێنانی ئامانجەکانی قوربانییەکی زۆر بدا.
ئەو ڕژێمانەی لەسـەر سـەربەخۆیی نیسـتمانی سـووربوون و دیموکراتییەتیان وەلادەنا، پێیانوابوو هەرکەسـێکی داوای دیموکراتییەت بکا دکی سـەربەخۆیی نیشـتمانییە و بەکرێگیراوی ئیستیعمارە. ئیدی، مافی ئەوەی دەدایە خۆی توندوتیژی و سەرکوتکردن بە ناشیرینترین شێوە بەرانبەر نەیارەکانی بەکاربێنێ.
ئەو هێزانەشی دیموکراتی دەکەنە دروشمی سەرەکییان و ئەوەندە گرنگی بە سەربەخۆیی نیشتمانی نادەن، ئەو حکوومەتانەی دژە دیموکراتین بە ڕژێمی دیکتاتۆریی سەرکوتکەریان دادەنێ و پێیوایە بەهەرجۆرێـک بی دەبێ بڕووخێنـدرێن بگرە ئەگەر قوربـانی بە

سەربەخۆیی دەسەڵاتی نیشتمانییش بدرێ. جا ئەگەرپەیوەستی دەربڕینە دەستووری و یاساییە رووتەکان بین و ئەوسا سەیرێکی هەڵویستی هەردوو لا بکەین، دەبینین هەردوولایان لەسەر هەقن.بەڵام راستی رووی زۆرە و بەبێ زانینی ئەو ڕووانەی و تەنها بە سیفەتی راستی ناتوانین حوکمی لەسەر بدەین. ئاخر سەربەخۆیی نیستمانی ئەوەندەی قوربانی لە گەل ویستووە نە دەژمێردرێ و نە هەژماری هەیە. دەبێ گەل بیپارێزێ، بەلام گەلی ڕێکنەخراو ناتوانێ ئەو کارە بکا، تابشتوانی خۆی ڕێکخا دەبێ ئازادیی بدرێتێ، واتە ئازادی بدرێتە هەموو ئەو هێزانەی پاراستنی سەربەخۆیی نیستمانی و بەرژەوەندیی زۆرینەی گەلیان بەلاوە گرنگە. کەواتە، سەربەخۆیی نیستمانی و دیموکراتی دوو جمکەن و لێکدی جودا ناکرێنەوە، لە کۆلۆنیالەکاندا گەل بۆ سەربەخۆیی نیشتمانی خەباتی دەکرد، جا کە ئەوەی دەستدەکەوێ دەبێ خەبات بۆ پتەوکردن و پاراستنی بکا، ئەودەمی پێویستی بە دیموکراتییەتە تا گەلی پێ تەیار بکا و ئەوەس لەڕێی حیزبەکان و کۆمەڵە و سەندیکا و ڕێکخراوەکانەوە دەکرێ، تا سەربەخۆیی پێ بپارێزێ و ڕەوڕەوەی بزووتنەوەی سەربەخۆیی نیشتمانیی، لەبەرژەوەندیی زۆرینەی گەل، پێ بەرەوپێش ببا.

من ئەو شتانەم هەموو لەبەرچاو گرتبوو، داوام لە سەدام حوسێن کرد بانگەشە بۆ بەستنی کۆنگرەیەکی نیستمانیی فراوان بکا تا لە کێشەکانی ولات بکۆڵدرێتەوە و چارەسەری دروستی بۆ بدۆزرێتەوە. داوام لێ کرد چارەسەرێکی ئاستییانەی کێشەی کورد بدۆزێتەوە لەسەر ئەو بنەمایەی گەلی کورد بتوانێ خۆی بڕیاری چارەنووسی خۆی بدا، داوام لێکرد چارەسەرێک بۆ کێشەی تایەفەی شیعە بدۆزێتەوە، واز لە هەڵویستی دژایەتی و قەدەغەکاری بهێنێ، داوام لێکرد پەیوەندیی برایانە لەگەڵ حکوومەتە حارەبەکان دابنێ و پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ ولاتانی دراوسێ دروستکا. مێژووی کۆن و نوییش نموونەی زۆری تێدایە کە دەکرێ لێیان فێربین و خۆمان لەسەرەوەی مێژوو دانەنێین، ئاخر مێژوو بەزەیی پێماندا نایەتەوە، هەر بەڕاستییش بەزەیی بەوانەدا نەهاتووەتەوە کە لێی فێرنەبووینە و، ئەوەی بەزەیی بە گەلەکەیدا نەیەتەوە مێژوو بەزەیی پێیدا نایەتەوە.

■

**چەند پەڕەیەک لە بیرەوەرییەکانی**
**موکەڕەم تاڵەبانی،**
**وەزیرە شیوعییەکەی ناو حکوومەتی بەعس**

بێگومان لاپەڕە و یادەوەرییەکانی ڕۆژانە بەهای خۆیان هەر دەمێنن، بە تایبەتییش ئەو شتانەی توێژەرەکان و ئەوانەی لەسەر کەسایەتیی موکەڕەم تاڵەبانییان نووسیوە، نەیاندیتووە و ئێستا دەتوانن هەموو ئەو شتانەی تێدا هەڵێنجن، کە موکەڕەم تاڵەبانی بە دەستوخەتی خۆی، لە ڕێوانێکی حەفتا ساڵ پتری خایاندووە، نووسیویەتی و تێیدا بیرەوەریی منداڵی و سەرەتای نەشونمای سیاسی و فیکریی خۆی و چوونە ناو کاری سیاسی و پیشەیی خۆی تۆمار کردووە، دوایەش دێتە سەر ساڵانی زیندانیکردنی، کە بەسەر ئەو هاواڵە سیاسییانەشی ڕاگەیشت بیرۆکەی چەپ و شیوعییان هەبوو، تا دەگاتە ئەوەی، وەک نوێنەری حیزبی شیوعیی عێراقی و لە سەروبەندی هاوپەیمانیی بەرەیی "حیزبی شیوعی - حیزبی بەعس"دا لە ١٩٧٣ پۆستی وەزارەتی ئاودێری و دواتریش پۆستی وەزارەتی گواستنەوە و گەیاندن وەرگرێ. دواتریش ببێتە گەواهیدەری سەر مەودایەکی هەرە گرنگ و ئاڵۆزی مێژوویی کە عێراقی پێدا تێپەڕیوە و لە بەرایی ١٩٧٩ بە شکستی هاوپەیمانیی بەرەیی و لێکترازانی کۆتایی هات. ڕاستییەکەی، دوای لێکترازانی هاوپەیمانیی بەرەییش، ڕۆڵی موکەڕەم تاڵەبانی کۆتایی نەهات. ئەو، زۆر جاران پێناوی نێوان ڕژێمی بەعس و حیزبە نەیارەکان بوو، چونکە بە هۆی نیازپاکی و خستنەرووی بابەت و پەنجەخستنەسەر کێشەکان، دوور لە ئاسۆی حیزبی و ئایدیۆلۆژیی خۆی، کەسایەتییەک بوو لای هەمووان جێی ڕەزامەندی بوو.